# کورد کێیە؟

## مێژووی کورد و ڕەچەڵەکی زمانەکەی لە سەرەتای شارستانیەتەوە هەتاوەکو سەدەی دەیەمی زاینی

سۆران حەمەڕەش

# کورد کێیە؟

مێژووی کورد و ڕەچەڵەکی زمانەکەی لە سەرەتای شارستانیەتەوە هەتاوەکو سەدەی دەیەمی زایینی

نووسینی

**سۆران حەمەڕەش**

**لەندەن ٢٠١٣**

## ئەم کتێبە پێشکەشە

بە باوکم، محەمەد حەمەڕەش مارف، ئەو کەسەی کە بە وتە سادەکانی دەیویست شتێکی گەورەم پێ بڵێت؛
بە باپیرم، موفتی پێنجوێنی شاعیر، ئەو کەسەی کە هەرچەندە نەم بینیوە، بەڵام لە ڕێگای شیعرەکانیەوە هەمیشە لەگەڵمدا ژیاوە و مانای دادوەری و کوردبوونی لە مێشکمدا چەسپاندووە؛
بە مێژوونوسی کورد، ئەمین زەکی، ئەو کەسەی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ دەوڵەمەندترین کتێبی مێژووی کورد و کوردستانی نووسیوە.

# ناوەرۆک



## بەشی ١

**سۆمەریەکان**



## بەشی ٢



## بەشی ٣

## بەشی ٤



## بەشی ٥

**کورتەیەکی گێرانەوەی مێژووی کورد لە سەرەتای شارستانیەتەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ**

## نەخشەكان

-(نەخشەی ژمارە ١) نەخشەكەی مەحمود كاشغەری كە لە ساڵی ١٠٧٦ دا كراوە و تێیدا وڵاتی كورد بە (ارض الاكراد) ناوهێنراوە.
-(نەخشەی ژمارە ٢) ناوچەكانی میدە، مانی، ئاشوری، ئیلام، پارسواش و بابل.
-(نەخشەی ژمارە ٣) ناوچەی ژێر دەسەڵاتی میدەكان دوای ڕوخانی ئاشوریەكان (ئیمپراتوریەتی میدی) و میدیای ئازەربایجان و میدیای گەورە.
-(نەخشەی ژمارە ٤) ناوچەی لوڤیەكان.
-(نەخشەی ژمارە ٥) نەخشەی وڵاتی هیتیەكان و پایتەختەكەی، هاتوسە.
-(نەخشەی ژمارە ٦) نەخشەی وڵاتی هوریەكان.
-(نەخشەی ژمارە ٧) ئەو ناوچانەی كوردستان كە ئەمڕۆ زاراوەكەیان زۆر لە زمانی سۆمەری نزیكە.
-(نەخشەی ژمارە ٨) شاری كوسا (كوثە/كوسامی) و سیپەرە (سفریس) و سنجار و جودی و بابل.
-(نەخشەی ژمارە ٩) نەخشەی ناوچەكانی هەزمبان لەوپەڕی بەهێزی و میدیای ئازەربایجان و كوردیان لە سەرەتای سەدەكانی زاییندا.
-(نەخشەی ژمارە ١٠) سەنتەری دەسەڵاتی هەزمبان و ناوچەی گەرمیان لە سەرەتای سەدەكانی زاییندا.
-(نەخشەی ژمارە ١١) ناوچەی كاریەكان، سراسیەكان و لیدیەكان.
-(نەخشەی ژمارە a١٢) یەكێك لە نەخشە كۆنە ئەوروپیەكان كە لە ساڵی ١٦٨٤ز لە ئەوروپادا دروستكراوە و كوردستانی تێدا دەستنیشان كراوە، ئەوەی كە جێی سەرنجە عێراق كەوتوتە خواروی شاری بەغدا و توركیا لە نێوان كوردستان و ئەرمینیادایە. لە ساڵی ١٧١٩ ز دا لە فرانكفورت/ئەڵمانیا، لەلایەن دەزگای Mallet وە بڵاوكراوەتەوە.
- (نەخشەی ژمارە b١٢) نەخشەی كوردستان، دوای چەندین هەزار ساڵ لە هاتنی نەتەوە نوێكان و بچوك كردنەوەی وڵاتەكە.
-(نەخشەی ژمارە ١٣) نەخشەی وڵاتی ئاریا (هاریا)
-(نەخشەی ژمارە ١٤) ناوچەكانی چەرمو، جودی و گیرە ناڤۆكی.

## وێنەی بەرگ

وێنەی بەرگی پێشی كتێبەكە، وێنەی پاشای سۆمەری، گودیا، كە لە هەمان سەرچاوەی وێنەی ١٢ وەرگیراوە.
وێنەی بەرگی پشتی كتێبەكە، وێنەی بزنێك كە لە شوێنەواری مانیەكان لە نزیك سەقز دۆزراوەتەوە. هەمان سەرچاوە وێنەی ٢.
دیزانی بەرگ: ڕەوەند قەرەداخی

## وێنەكان

- (وێنەی ١) پیاوێكی میدی كە بە كەلوپەلەكانی دەستیەوە وەك موغێك دەردەكەوێت. دەستكردی ڕێژەو قەرەداخی، وەرگیراوە لە:
Rawlinson, George (1865) *The Seven Great Monarchies of the Ancient Eastern World, Volume 3* *John Murray*, London.
-(وێنەی ٢) وەرگیراوە لە بزنێكی ڕەنگ كراوی مانیەكان كە لە ئاسەوارێك وەرگیراوە، لەسەر بەرد بە ڕەنگاو ڕەنگ نەخشێنراوە و لە مۆزەخانەی تاران هەڵگیراوە، دەستكردی: ڕێژەو قەرەداخی.
-(وێنەی ٣) تێكستی هێرۆگلێفی لوڤیەكان لەسەر بەردی ناسراو بە سوڵتانە، مۆزەخانەی شارستانی ئەناتۆڵیا، توركیا. وێنەگر: جۆرج جانسۆن (Georges Jansoone) . سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Museum_of_Anatolian_Civilizations057_kopie1.jpg

-(وێنەی ٤) پاشماوەی دەروازەی شاری هاتوسە کە دەکەوێتە باکوری کوردستانەوە. وێنەگر: China_Crisis. سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/File:Hattusa.liongate.jpg.
-(وێنەی ٥) کەسێک بە جلوبەرگی کوردیەوە لە دەستی ڕاست و ئەوەی چەپ بە جلوبەرگی تورکومانیەوە، ساڵی ١٨٢٠ز. سەرچاوە: Asiatische Turkei, Sophien Kirche.
-(وێنەی ٦) نەخشی هەڵکەندراوی یەزیلیکایە لە هاتوسەی پایتەختی هیتیەکان، دەستکردی چارلس دیکستەر (Charles Dexter) ساڵی ١٨٦١. سەرچاوە: http://fr.wikipedia.org/wiki/Fichier:YazilikayaTexier.jpg.
-(وێنەی ٧) نامەی پاشای میتانی، توشراتا بۆ پاشای میسر، ئەمێن هۆرێبی سێ، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەی پێش زایین. وێنەگر: Mr. Jon Bodsworth. سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Cuneiform_letter_to_Amenhotep_III.jpg
-(وێنەی ٨a) وێنەی دەستکردی تێشوب/تاشوب، خوای گەردەلولی هوری/هیتی. دەستکردی ڕەوەند قەرەداخی.
-(وێنەی ٨b) وێنەی هەڵکەندراوی خوای گەردەلولی هوریەکان تێشوب/تاشوب، مۆزەخانەی لوڤەر، وێنەگر: کەمال حەمەڕەش.
-(وێنەی ٩) زەقورەتێکی سۆمەری لە نزیک شاری ناسریە لە خوارووی عێراقی ئەمڕۆدا. وێنەگر: Hardnfast.سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Ancient_ziggurat_at_Ali_Air_Base_Iraq_2005.jpg
-(وێنەی ١٠) تێکستێکی سۆمەری، مۆزەخانەی بەریتانی. وێنەگر: سۆران حەمەڕەش.
-(وێنەی ١١) تێکستێکی سۆمەری سەبارەت چیرۆکی لافاوەکە. وێنەگر: سۆران حەمەڕەش.
-(وێنەی ١٢) گودیا، یەکێک لە پاشا هەرە ناودارەکانی سۆمەریەکان. وێنەگر: Marie-Lan Nguyen. سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/File:Gudea_of_Lagash_Girsu.jpg
-(وێنەی ١٣a، ١٣b، ١٣c) نابگەڵ (ئۆوانیس (Oanes)) ئەو بونەوارانەی کە نیوە ماسی و نیوە مرۆڤ بوون بەشێک لە داستانی ناو سۆمەریەکان بووە. وێنەکانی a و b وێنەی دەستکردیی هەڵگەندراوەکانی بابل و نەینەوان، وەرگیراون لە کتێبی:

Simpson, William (1899) *The Jonah Legend*, Grant Richard, London.

وێنەی c، لە هەڵکەندراوی سۆمەری وەرگیراوە، دەستکردی: ڕێژەو قەرەداخی.
- (وێنەی ١٤) وێنەی گۆڕستانی شاژن هێلینا و کوڕەکانی لە ئورشەلیم (قودس)، لە ساڵی ١٩٠٣ ز دا گیراوە. سەرچاوە: Sacred sites of the gospels Oxford : Clarendon Press (1903).
- (وێنەی ١٥) تابوتی بەردینی شاژن، هێلینای هەزەبانی کە ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی لوڤەر هەڵگیراوە. وێنەگر: Hanay. سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Helena_of_Adiabene_Sarcophagus_1.JPG
- (وێنەی ١٦) وێنەی پاشایەکی هەزەبانی کە لای هەریر/هەولێر لەسەر شاخەکە هەڵکەندراوە، هەندێک پێی وایە ئەوە وێنەی پادشا، ئێزد یان مەنوبازی هەزەبانیە. دەستکردی: ڕێژەو قەرەداخی.
- (وێنەی ١٧) وێنەی دەستکردی قەشەی باڵای سالزبری لەبەردەم سەلاحەدینی ئەیوبیدا.
- (وێنەی ١٨) خوای نێرگەڵ (Nergal) کە لە شێوەی خەنجەرێکی چەقیو لە خاکدا بووە. دەستکردی: ڕێژەو قەرەداخی.
- (وێنەی ١٩) ئەو ئەلف و بێیەی کە فارسی کۆنی پێ نووسراوە و لە بنەچەدا میدی بووە.
- (وێنەی ٢٠) ئەلف و بێی کوردی کە ئیبن وەحشیە لە سەدەی نۆهەمی زاییندا ئاماژەی پێ کردووە. سەرچاوە:

Bin Wahshih, Ahmad Bin Abubek (1806) *Ancient alphabets and hieroglyphic characters explained: with an account of the Egyptian priests, their classes, initiation, and sacrifices*, Bulmer , London.

- (وێنەی ٢١) ئەلف و بێی کوردی کە تێکستی ئاینی ئێزدی پێ نووسراوە. سەرچاوە: عەبدوڵا، نەجات (٢٠٠٦)، کتێبی ئێزدیەکان، بنکەی ژین، سلێمانی، کوردستان.
- (وێنەی ٢٢) بەرهەمێک لە کتێبی ڕووەک (کتاب النبات) ی دینەوەری. سەرچاوە: .http://www.kurdistanica.com
- (وێنەی ٢٣) پەرەیەک لە کتێبی (*کتاب* الجامع بين *العلم* والعمل النافع في صناعة الحيل) ی ئەلجەزیری کورد. سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/File:Al-jazari_water_device.jpg
- (وێنەی ٢٤) وێنەیەکی دەستکردی فاتمە ڕەش. سەرچاوە: The Illustrated London News,1854
- (وێنەی ٢٥) وێنەیەکی دەستکردی فاتمە ڕەش. سەرچاوە: L'Illustration Journal Universel'den, April-1854
- (وێنەی ٢٦) دوو وێنەی حەپسەخانی نەقیب.
- (وێنەی ٢٧) پەیکەری مەستورە خانمی کوردستانی. ، دەستکردی پەیکەرتاش، هادی زیائەدینی- سنە.
- (وێنەی ٢٨) وێنەی عادیلە خان لە گەڵ ئەفسەر و سەرباز و ئافرەتێکی ئینگلیزدا، لە سەرەتای سەدەی بیستەم گیراوە.
- (وێنەی ٢٩) وێنەیەکی خەیاڵی دەستکردیی داستانی شاژن سالستەری ئەمەزۆنەکان کە سەردانی ئەلێکسەندەر دەکات. لە ساڵی ١٦٩٦ دا کێشراوە. سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Thalestris,_Queen_of_the_Amazons,_visits_Alexander_(1696).jpg
- (وێنەی ٣٠) وێنەیەکی دەستکردیی ئافرەتێکی کورد بە جلیماڵەوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ساڵی ١٨٨٥ ز. سەرچاوە:
The Illustrated London News, Persia Illustrated, London, 1885.
-(وێنەی ٣١a) کۆمەڵێک ئافرەتی کورد لە ناوچەی موکریان بە جلی کوردیەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گیراوە.
-(وێنەی ٣١b) ڕەشبەڵەکێکی ناوچەی موکریان، سەرەتای سەدەی بیستەمی زاینی.
-(وێنەی ٣١ c) وێنەیەکی دەستکردی ڕەشبەڵەکێک، ساڵی ١٨٩٥ز. وەرگیراوە لە کتێبی: .London Illustrated News, 2nd November 1895
-(وێنەی ٣١d) ڕەشبەڵەکێکی کوردی سەرەتای سەدەی بیستەم.
-(وێنەی ٣٢) وێنەی دەستکردیی سوپایەکی کوردی لە ساڵی ١٨٥٦ ز، لە کاتی جەنگدا دوو تەپڵ لێدەر پێشڕەوی دەکەن، وەرگیراوە لە کتێبی:
. Lady Sheil (1856) *Life and Manners of Persia*, John Murray, London
-(وێنەی ٣٣a) دوو پەڕە لە کتێبی (الرسالة الشرفية) ی سەفیەدینی ورمێی (صفي الدين الارموي) (١٢١٦ز-١٢٩٤ز) کە لەسەر تیۆری مۆسیقا دایناوە. وێنەگر: Daniel Iness. سەرچاوە: http://en.wikipedia.org/wiki/Safi_al-Din_Urmawi
-(وێنەی ٣٣b) عود ژەن و مۆسیقاناسی کوردی سەدەی نۆهەمی زاینی، زەریاب، وێنەکە لە سەدەی سیانزە لە ئەوروپادا کێشراوە. سەرچاوە:
http://upload.wikimedia.org/wikipedia/commons/d/d1/Maler_der_Geschichte_von_Bay%C3%A2d_und_Riy%C3%A2d_002.jpg
-(وێنەی ٣٣c) وێنەی دەستکردی چوار قەواڵی ئێزدی لە کاتی مۆسیقا لێداندا، ساڵی ١٨٥٣ ز. وەرگیراوە لە کتێبی: Yezidi Cawals. Illustration for Discoveries in the Ruins of Nineveh and Babylon by Austen Layard (John Murray, 1853).
- (وێنەی ٣٤) وێنەی شاعیری کوردی سەدەی دوانزەهەمی زاینی، نیزامی گەنجەوی، لەسەر پارەی وڵاتی ئازەربایجان دروستکراوە.

-(وێنەی ٣٥ و ٣٦) دوو وێنەی شارستانیەتی "گرێ ناڤۆکێ "Girê Navokê" (Göbekli Tepe) کە تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ ١٢٠٠٠ ساڵ. وێنەگر: Erkcan. سەرچاوە:
. http://en.wikipedia.org/wiki/File:G%C3%B6bekli_Tepe,_Urfa.jpg
-(وێنەی ٣٧) پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی دەربەند گاورە. وێنەگر: ئاسۆ عەبدوڵا کەریم.
-(وێنەی ٣٨) پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی ئانوبانینی پاشای لۆلۆبی لە سەرپێلی زەهاو. دەستکردی گەڕۆک، پاسکاڵ کۆست (Pascal Coste)، ساڵی ١٨٤٠ز. سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Relief_Anubanini_Sar-e_Pol_-_Zahab.JPEG
-(وێنەی ٣٩) پەیکەری نارام سین مۆزەخانەی لۆڤەر. وێنەگر: Rama. سەرچاوە:
http://en.wikipedia.org/wiki/File:Victory_stele_of_Naram_Sin_9062.jpg
-(وێنەی ٤٠) پارچەیەکی چەرم کە بە زمانی یۆنانی گریبەستێکی لەسەر نووسراوە و لە ناوچەی هەورامان دۆزراوەتەوە کە تەمەنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێهەمی پ.ز. وەگیراوە لە کتێبی:
Minns, E.H. (1915) Parchments of the Parthian Period from Avroman in Kurdistan, The Journal of Hellenic Studies., Volume XXXV, Published by the Council, London.

-(وێنەی ٤١) لیستی کتێبەکانی زانا و سۆفیگەری کورد، ئیبراهیم شارەزووری کوردی گۆرانی (ابراهيم الشهرزوري الكردي الكوراني) کۆچکردووی ساڵی ١٦٨٩ ز، کە ژمارەیان ٥٧ کتێبە و لەلایەن قوتابیەکەی، عەبدولقادر کوڕی ئەبوبەکر لە ساڵی ١٧١٠ ز دا نووسراوە، ئەرشیفی زانکۆی ڕیاز، سعودیە.
-(وێنەی ٤٢) دوو پەڕە لە کتێبی (الجواهر النقية)، کە کتێب و دەستنوسی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم کوردی (احمد بن ابراهيم الكردي) یە و لە سەدەی پانزەی زاینیدا ژیاوە، ئەرشیفی زانکۆی مەلیک سعود-سعودیە.
-(وێنەی ٤٣) قەڵای کوردان (حصن الاكراد) کە ئەمڕۆ دەکەوێتە وڵاتی سوریا و لەسەر دەریای سپیە و لە ژێر دەستی ئەیوبیە کوردەکاندا بووە. وێنەگر: Jerzy Strzelecki. سەرچاوە:
http://ar.wikipedia.org/w/index.php?title=%D9%85%D9%84%D9%81:Krak_des_chevaliers15(js).jpg&filetimestamp=20071226135704
-(وێنەی ٤٤) کەریم خانی زەند، سەرکردەی زەندەکان و حوکمڕانی ئێران، ئەو بنەماڵەیەی کە لە نێوان ١٧٥٠ ز- ١٧٩٤ ز حوکمی ئێرانیان دەکرد. دەستکردی موحەمەد سدیق، دوای ١٧٧٩ ز. سەرچاوە:
Royal Persian Paintings: the Qajar Epoch, 1785–1925, New York: 1998, cat. No. 25.
-(وێنەی ٤٥) وێنەیەکی دەستکردیی حەمامێکی شاری کرماشان کە لە نێوان ساڵی ١٧٧٦ز-١٨٥٩ز دا لەلایەن ئەفسەر و هونەرمەندی ئینگلیز، چارلس هاملتون سمس- مۆە کێشراوە. هەڵگیراوی تایبەتی.
-(وێنەی ٤٦) وێنەی دەستکردیی فەرمانبەرێکی دەوڵەتی بابانیەکان لە سلێمانی، ساڵی ١٨٢٠ ز. سەرچاوە:

Rich, Claudius James (1836) *Narrative of a residence in Koordistan : and on the site of ancient Nineveh; with journal of a voyage down the Tigris to Bagdad and an account of a visit to Shirauz and Persepolis*, James Duncan, London.
-(وێنەی ٤٧) وێنەی دەستکردیی سەلیم پاشای ئامێدی (عەمادیە) ، ساڵی ١٨٤٧ز. سەرچاوە:
Perkins, Justin (1843) *A Residence of Eight Years in Persia, Among the Nestorian Christians: with Notices of the Muhammedans*, Allen, Morrill & Wardwell, New York, US

## سوپاس و پێزانین

وەک زۆر پرۆژەی تری ژیان، بە بێ پشتگیری کەسوکار و هاوڕێیان، هەرگیز نەدەتوانرا ئەم کتێبە بگەیەنرێتە ئەنجام. لە نووسینی ئەم کتێبەدا چەند هاوڕێ و کەسوکارێک بە شێوەی جیاواز هاوکاریان کردووم و دریغیان لێ نەکردووم. دەبێت سوپاسی تایبەتی برای گەورەم، کاک کەمال حەمەڕەش بکەم، کە کارێکی زۆری لە پێداچوونەوەدا کردووە لەگەڵمدا و بە درێژایی ماوەی نووسینی ئەم کتێبە، هەنگاو بە هەنگاو بەشەکانی ئەم کتێبەی بۆ نێردراوە و ئەو پێیدا چووەتەوە و چەندین سەرنجی زۆر گرنگی داوە سەبارەت بابەتەکان و سەدان کاتژمێر لەسەر ئەم پرۆژەیە کاری کردووە و بە شێوەیەکی تەواو خۆی بۆ پێداچوونەوە تەرخان کردووە و لە زمانی فەرەنسی و فارسیدا هاوکاری کردووم.
دەبێت سوپاسی زۆری کاکە ڕەوەند قەرەداخی بکەم کە بەرگی ئەم کتێبەی زۆر وەستایانە بۆ داڕشتووم و وێنەیەکی بۆ کێشاوم و لە دیزاینی ناو کتێبەکە و کاری گرافیکی نەخشەکان و دیزایندا هاوکاری زۆری کردووم. سوپاسی زۆری کاکە ڕێژەو قەرەداخی دەکەم کە زۆربەی کاری گرافیکی وێنە و نەخشەکان ئەو بە ئەنجامی گەیاندووە. هەروەها ئەم هاوڕێ و برا و کەسوکارە بەڕێزانەی خوارەوە کە ناوەکانیان بە ئەلف و بێ ڕیزبەند کراوە و بۆ ڕاوێژکاری زاراوە و زمان و بە شێوەی جیاوازی تر هاوکاریان کردووم ، دەبێت سوپاسیان بکەم:
کاک ئاری جەمیل، کاک ئەمیر قورخی، کاک ئاوات نامیق ئاغا، کاک ئەنوەر سوڵتانی، کاک بژار عەبدوڵا ڕەسوڵ، کاک بلێسە عومەر محێدین، خاتوو پەری قەرەداغی، خاتوو تارا جاف، کاک جوان نەبی، کاک حسەین جەلیلیان، (دایکم) رابعە موفتی، کاک سەروەر حەمەڕەش، کاک سێدات ڕۆمێد یەزدان، کاک شاهۆ ئەمین، کاک عەتا موفتی، کاک کەمال نەجمەدین، کاک موقەدەم لهۆنی، Ms Branislava Topic، Ms Paola Ceccarelli, Ms vnika Polovinkina.
زۆر جار هەندێک هاوکاری بڕبڕەی بەهێزی مانەوە و بەردەوامی پرۆژەیەکە، بۆیە دەبێت سوپاسی تایبەت و بێ کۆتایی ژوان خانی هاوسەرم بکەم کە بە درێژایی نووسینی ئەم کتێبە بە شێوەی جیاواز پشتگیری کردووم و زۆر جار بۆ پرسیاری وشەی زمانی فارسی، پەنام بۆ بردووە و هەندێک جار لە کاتی بێ هیوابووندا لە دۆزینەوەی شتەکان، هیوای خستۆتە دڵمەوە و هەمیشە هاندەرم بووە بۆ تەواوکردنی کارەکەم. دەبێت سوپاسی تایبەت و بێ پایانی بکەم و بە دڵنیایی بێ ئەو ئەم کارە مەحاڵ بوو ئەنجام بدرێت.
هیوام وایە کەسم لە سوپاسکردنندا لە یاد نەکردبێت، ئەگەر ناوی کەسێکم لەیاد کردبێت، لێرەدا داوای لێبووردوونی لێ دەکەم و سوپاسی هاوکاری دەکەم.

## ژیانی نووسەر لە چەند دێڕێکدا

-لە ساڵی ١٩٦٧ لە شاری سلێمانی لە دایکبووە؛
-خوێندنی ئامادەیی لە سلێمانی تەواوکردووە؛
-لە زانکۆی تەکنەلۆژیی بەغدا لە بەشی ئەندازیاری بیناسازی وەرگیراوە؛
-لە ١٩٩١ وە کوردستانی بەجێهشێتووە لە ساڵی ١٩٩٢ وە لە بەریتانیا دەژی؛
-لە ساڵی ٢٠٠١ وە وەک فەرمانبەر لە مەڵبەندی ڕۆشنبیری کوردی کاری کردووە و بۆ نزیکی دوو ساڵ بەڕێوەبەری ئەو دەزگایە بووە هەتاوەکو لە ساڵی ٢٠٠٩ ئەو دەزگایەی بەجێهشێتووە؛
-هاوکاری دەیان ڕۆژنامەنووس، لێکۆڵەر و کەسانی ئەکادیمی ئەورووپی کردووە کە لە بواری کورد دا کاریان کردووە

-بەشداری دەیان پرۆگرامی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی کردووە سەبارەت بە ڕەوشی سیاسی و کۆمەڵایەتی کورد و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە میدیای بەریتانی و میدیای جیهانیدا و چەندین بابەتی لە میدیای کوردیدا بڵاوکردۆتەوە.

-بڕوانامەی ماستەری لە بواری ڕێکخراوەکان و گەشەسەندنی کۆمەڵگەدا هێناوە و بڕوانامەی لە بابەتەکانی تەرجومە، مۆسیقا، یاساکانی کۆچبەری و خانووبەرە، بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن، هتد. دا هێناوە.

## چەند سەرنجێک و زانیاری لەسەر فەرهەنگەکان

لەم کتێبەدا کۆمەڵێک فەرهەنگ دانراون و هەر کام لە فەرهەنگەکان، لە سێ خانە پێکهاتوون. خانەی یەکەم وشەی زمانە دێرینەکەیە، خانەی دووهەم تەرجومە ئینگلیزی وشەکەیە کە ڕاستەوخۆ لە فەرهەنگە جیهانیەکانەوە وەرگیراوە و لە تەنیشتیدا تەرجومە کوردیەکەی دانراوە و لە خانەی سێهەمدا وشە کوردیە پەیوەستەکە و کۆمەڵێک ڕوونکردنەوە خراوەتە ڕوو. لە ناو هەر فەرهەنگێکدا پەیوەندی نێوان زمانی کوردی و ئەو زمانەی کە فەرهەنگەکەی لەسەر دانراوە ڕوونکراوەتەوە، لە هەمان کاتدا بە مەبەستی دەرخستنی ئەو پەیوەندیە مێژووییەی کە لە نێوان ئەو نەتەوە و زمانانەدا هەبووە، پەیوەندی ئەو وشەیە بە زمانە دێرینەکانی تر و زمانە هیندۆئەورووپیە دێرین و نوێکانیشەوە خراوەتە ڕوو.

دانانی تەرجومەی وشەی زمانە دێرینەکە بە کوردی لەگەڵ تەرجومە ئینگلیزیەکەی، تەنها بە مەبەستی دڵنیاکردنەوەی تەرجومەی وشەی زمانە دێرینەکە کراوە، هەتاوەکو خوێنەر بزانێت کە تەرجومەی وشەکە لە سەرچاوە ئینگلیزیەکەوە هێنراوە.

لە کاتی بەراوردکردنی وشەکاندا هەمیشە دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە وشەی زمانە دێرینەکان هەندێک جار لە زمانی نوێدا مەرج نیە کتومت هەمان مانای مابێت. بۆ نموونە وشەی (پیلان) لە کوردیدا وشەیەکی دێرینە، لە زمانی ئینگلیزی و زۆر لە زمانە هندۆئەورووپیەکاندا ئەو وشەیە دەردەکەوێتەوە بەشێوەی plan. هەرچەندە وشەکە ماناکەی لە کوردی و ئینگلیزیدا نزیکە، بەڵام سەد لە سەد هەمان مانای نەماوە. واتە لە کوردیدا مانای (نەخشە، موئامەرە) دەدات. لە ئینگلیزیدا تەنها مانای (نەخشە) دەدات و لە کوردیدا ئەمڕۆ کەمتر بە مانای (نەخشە) بەکار دێت و زیاتر بە مانای (موئامەرە) بەکاری دەهێنێت. بۆیە زۆر جار لە کوردی نوێدا ئەگەر باسی نەخشە بکرێت، کورد خەریکە واز لە وشەی (پیلان) ی خۆی دەهێنێت و وشەی plan ی ئینگلیزی بەکاردەهێنێت. زۆر وشە لە کاتی گوێزانەوەدا گۆڕانی لەو شێوەیەی بەسەردا دێت. بۆیە زۆر جار وشەکان بەو شێوەیە زیاتر پرنسیپی مانا بنەڕەتیەکەیان دەمێنێت و هەندێک گۆڕانیان بەسەردا دێت. بۆ نموونە فارس وشەی (انقلاب) ی لە عەرەب وەرگرتووە، کەچی سەرەڕای ئەوەی کە وشەکە عەرەبیە، فارس ماناکەی گۆڕیوە و بە مانای (شۆڕش) بەکاری دەهێنێت، هەرچەندە وشەکە لە بنەڕەتدا لە زمانی عەرەبیدا مانای (هەڵگێڕانەوە، هەڵگێڕانەوەی کتوپڕی دەسەڵات) دەدات. پرۆسەی گوێزانەوەی وشە، بە گۆڕانکاری هاوشێوەدا دەڕوات.

لە بەشی ڕوونکردنەوەی وشە کوردیەکانی هەر فەرهەنگێکدا، وشەکان بە شێوەی فۆنەتیک نووسراون نەک بە شێوەی پیتی لاتینی کوردی، بەو مەبەستەی کە پەیڕەوی سیستەمێکی فۆنەتیکی جیهانی بکرێت و هەروەها بتوانرێت ئاسان بەراورد لە نێوان وشە کوردیەکان و وشەی زمانە دێرینەکاندا بکرێت کە ئەوانیش هەر بە شێوەی فۆنەتیکی نووسراون. وشەی زمانە دێرینەکان لە سەرچاوەی جیاوازەوە وەرگیراون و هەندێک لە سەرچاوەکان پابەندن بە شێوە نووسینی فۆنەتیکی و هەندێکی تریان پابەند نین. بۆیە دەبینرێت بۆ نموونە لە فەرهەنگە ئاڤێستاییەکەدا، وشەکان هەمان پەیڕەوی فۆنەتیکی تێدا بەدی ناکرێت، بەڵام بۆ پابەند بوون بە سەرچاوەکان، بە ناچاری هیچ دەستکاریەکی فۆنەتیکی وشە ئاڤێستاییەکە نەکراوە و وشەکان وەک خۆیان چۆن لە فەرهەنگە ئەسڵیەکەدا بوون، هەر ئاوا هێڵراونەتەوە.

بۆ هەر کام لە فەرهەنگەکان سەرچاوەی جیاواز بەکارهاتوون و هەندێک لە زمانە دێرینەکان وەک زمانی سۆمەری، سەرچاوەی زۆر و چاک سەبارەتیان هەیە، هەندێکی تریان وەک زمانی هوری سەرچاوەکان زۆر دەگمەنن و زانیاریەکان کەمن. بە داخەوە بۆ زمانی هوری نەتوانرا هەمان کار بکرێت، لەبەر ئەوەی کە هێندە وشەی هوری نەدۆزراوەتەوە و فەرهەنگی هوری لە سەرچاوەی ئینگلیزیدا زۆر دەگمەنە و بە زمانی ئەڵمانی سەرچاوە زیاترە، بۆیە سەرەڕای ئەو پەیوەندیە پتەوەی نێوان زمانی کوردی و هوری، بەڵام نەتوانرا بەپێی پێویست کار لەسەر زمانی هوری بکرێت.

لەم کتێبەدا هەندێک لە زمانەکانی وەک کاری، لیدی و سراسی فەرهەنگی زۆر بچووکیان بۆ دانراوە، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چەند وشەیەکی زۆر کەم لەو زمانانە لەبەر دەستدان و نەتوانراوە زیاتر کاریان لەسەر بکرێت.

وەک کەسێک کە ئاشناییەکی گشتیم لەزاراوە کوردیەکاندا هەیە، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە زاراوەی دایکم زاراوەی کرمانجی خوارو (سۆرانی) ە، بۆیە بە گشتی متمانەم کردۆتە سەر ئەو زاراوایە و بە دڵنیایی لە داهاتوودا دەتوانرێت کاری ووردتر بکرێت. بۆ نموونە زمانی ناوچەی هیتی و لوڤیەکان کە ئەمڕۆ دەکەوێتە کوردستانی ڕۆژئاواو و باکورەوە، ئەگەر بتوانرێت لێکۆڵینەوە لەسەر زمانی لادێکانی ئەو دەڤەرانە بکرێت، ئەوا چاوەڕوان دەکرێت کە نزیکیەکی زیاتر ببینرێت و زۆر ڕووی مێژوویی و زمانەوانی لەگەڵیاندا ڕوون ببێتەوە.
بەهۆی هەلومەرجی کوردستانەوە بە هەزاران وشەی ناوچەیی هەتاوەکو ئەمڕۆ تۆمار نەکراون و لەژێر مەترسی لەناوچووندان. مامۆستا هەژاری پایەبەرز گەورەترین کاری کردووە بە دانانی ئەو فەرهەنگە دەوڵەمەندە کوردیە کە سەرەڕای مەزنی کارەکە، چەندین وشەی گرنگی تێدا نیە و دەبێت برەو بەو کارە بدرێت و وشەی ڕەسەنی لادێکانی بۆ زیاد بکرێت.
بۆ وشە کوردیەکان زیاتر متمانەم کردۆتە سەر ڕادەی شارەزایی خۆم لە زمانی کوردی و بەکارهێنانی فەرهەنگە بەنرخەکەی مامۆستا هەژار کە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەوانی باشترین کتێبە. هەروەها متمانەم کردۆتە سەر هەموو ئەو کەسوکار و هاوڕێیانەی کە لە دەورم بوون و بەهۆی ئەوەی کە باب و باپیرانم خەڵکی شارۆچکەی پێنجوێنن و ئاشنایی تایبەتم لەگەڵ شێوەی قسەکردنی ئەو ناوچەیەدا هەیە، بۆیە چەند جارێک ئاماژەم پێکردووە، دەنا جگە لەوەی کە پێنجوێن بە هۆی شاخاوی بوونیەوە چەند وشەیەکی کۆنی کوردی پاراستووە، هیچ جیاوازیەکی تری لەگەڵ شوێنێکی تری کوردستاندا نیە. هەندێک جار بۆ دڵنیاکردنەوەی وشەکان، پەیوەندیم بە دەیان خەڵکی کوردی سەر بە دەڤەر و ناوچەی جیاوازی کوردستانەوە کردووە. جاری وا هەبووە پەیوەندیم بە چەندین کەسی شارەزا و خەڵکی ناوچەیەکی تایبەتەوە کردووە، بۆ لێکۆڵینەوە و دڵنیاکردنەوەی مانا و چۆنێتی بەکارهێنانی وشەکان و پەیوەندی ڕێزمانی زاراوە جیاوازەکان.
هەروەها جگە لە بەکارهێنانی فەرهەنگی زمانەکانی فەرەنسی، فارسی، عەرەبی، ئینگلیزی، یۆنانی، لاتین، ئیسپانی، پۆرتوگالی، کرواتی، ئەڵمانی و ئیتاڵی، پەیوەندی کراوە بە فارسی و سویدی و فەرەنسی زان و پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی ڕوسی، یۆنانی، کرواتی، سربی، ئیسپانی، پورتوگالی، ئیتاڵی و ئەڵمانی کراوە بۆ ڕاوێژکاری سەبارەت بە هەندێک ڕووی وشەکاری و ڕێزمانی ئەو زمانانە.
بۆ نووسینی هەر کام لە فەرهەنگەکان، هەندیك جار زیاتر لە سەرچاوەیەک بەکارهاتووە و کۆمەڵێک لە سەرچاوەکان لە لەلایەن دەزگای ئەکادیمی و زانکۆی جیهانیەوە خراونەتە سەر ئەنتەرنێت و هەندێک جار کتێبێک بەکارهاتووە کە لەسەر ماڵپەڕەکان دابەزێنراوە و ژمارەی پەڕەی نەبووە، بۆیە نەتوانراوە هەمیشە لە پەنای وشەکاندا لاپەڕەی وەرگرتنی وشەکان لە سەرچاوەکاندا بخرێنە ڕوو. لیستی هەموو ئەو کتێب و سەرچاوانەی کە بۆ فەرهەنگەکان بەکارهاتوون لە کۆتایی ئەم کتێبەدا لە بەشی سەرچاوەکاندا، خراونەتە ڕوو.

## سەبارەت سەرچاوەکان و چۆنێتی بەکارهێنانیان

بۆ ئەم کتێبە سوود لە سەرچاوەی جیاوازی ئەکادیمی وەرگیراوە کە بە زمانەکانی کوردی، ئینگلیزی، عەرەبی و فارسی نووسراون و بە شێوەی کتێب و ماڵپەڕ دانراون. لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا هەمیشە بۆ هەر بۆچوونێک و زانیاریەکی تایبەت، سەرچاوەکانیان خراوەتە ڕوو. لە دانانی سەرچاوەدا پەیڕەوی سیستەمی سەرچاوەدانانی هارڤرد (Harvard System of Referencing) کراوە و بە مەبەستی ئاسانکاری بۆ خوێنەر و گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکان، سەرچاوەکان هەر بە زمانی خۆیان نوسراونەتەوە. بۆ زیاتر زانیاری سەبارەت ئەو سیستەمە دەتوانرێت، ڕێنمایی سیستەمی هارفرد بۆ سەرچاوەدانان (Harvard System of Referencing Guide ) بخوێنرێتەوە. بە گشتی بۆ هەر بابەتێک کە ڕاستەوخۆ دێڕێک یان بیرۆکەیەک لە کتێبێک وەرگیرابێت، ئەوا ناوی خێزانیی کەسەکە و ساڵی بڵاوکردنەوەی کتێبەکە لە ناو تێکستەکەدا دانراوە و لە بەشی سەرچاوەکاندا ووردەکاری هەر کام لەو کتێب و ماڵپەڕ و گۆڤارانە خراونەتە ڕوو. هەندێک جار کتێبی سەرچاوە، بە تەواوی لە ئەنتەرنێتەوە دابەزێنراوە، لەبەر ئەوە ناوی سەرچاوەکە نووسراوە لەگەڵ ساڵی دابەزاندنی، بەڵام نەتوانراوە پەڕەی کتێبەکە دەستنیشان بکرێت و ئەمەش شتێکی قبوڵکراوە لە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمیدا. ئەمە زۆر جار لەگەڵ کتێبە مێژووییە ئیسلامیەکاندا

ڕوویداوە کە زۆربەیان ئەمڕۆ دەتوانرێت لەسەر ئەنتەرنێت دابەزێنرێن، بەهۆی نەبوونی ژمارەی تەواوی لاپەڕەوە لەگەڵ کتێبە بنەڕەتیەکەدا، نەتوانراوە ژمارەی لاپەڕەکە بنووسرێت. سەرەڕای ئەوە لە لیستی سەرچاوەکاندا و وەک پابەندبوونێک بە سیستم و ستانداردی سەرچاوەدانانی هارڤرد، لینک و زانیاری هەموو سەرچاوەکان خراونەتە ڕوو.
ئەگەر سەرنج بدرێت هەوڵێکی زۆر دراوە کە هەمیشە ئاماژە بە سەرچاوەی زانیاریەکان بکرێت و هیچ شتێک بێ سەرچاوە نەخراوەتە ڕوو؛ هەندێک جاریش دانانی ژمارەی زۆری سەرچاوەکان لە سنوور لای داوە. ئەم هەوڵە بەو مەبەستە دراوە کە خوێنەر بزانێت لە کاتێکدا کە زۆر لە دەرئەنجامەکانی ئەم کتێبە ناکۆکە لەگەڵ ئەو بۆچوونانەی کە ئەمڕۆ لە کتێبە مێژووییەکاندا باون، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆچوونەکان بێ بناغە نین و زانیاریەکان هەموویان سەرچاوەیان هەیە و هیچ زانیاریەک بێ سەرچاوە لەم کتێبەدا دانەنراوە.
ئەو وێنانەی کە لەم کتێبەدا بەکارهاتوون، بەشێکی زۆریان لە کتێبی کۆن وەرگیراون کە مافی چاپکردنی بەخشراوە و زۆر جار بۆ هەندێک لە وێنە نوێکانی تر، سوو لە ماڵپەڕی ویکی پیدیا وەرگیراوە؛ ئەویش لەبەر ئەوەی کە مافی چاپکردنی بەخشراوە بە مەرجەوە.

### لابردنی دەستەواژەی "زمانە ئێرانیەکان" و گۆڕینی بە "زمانە زاگرۆسیەکان"

بە درێژایی ئەم کتێبە دەستەواژەی "زمانە ئێرانیەکان" لابرا و لەبری ئەوە "زمانە زاگرۆسیەکان" بەکارهات. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئەم دەستەواژەیە لە سەردەمێکدا دانراوە کە بۆچوونەکان سەبارەت ڕەچەڵەکی زمانەکانی ناوچەکە لەسەر بنەمایەکی هەڵە بووە و مانەوەی ئەو ناوە بەو شێوەیەی ئەمڕۆ، زیاتر دەبێتە هۆی سەرلێشێوانی خوێنەر و مانایەکی پێ دەدا کە پێچەوانەی ڕاستیە مێژووییەکانە. بە هیچ جۆرێک زمانی کوردی لە خۆرهەڵاتەوە نەهاتۆتە ناوچەکە، بەڵکو زمانی ڕەسەنی میسۆپۆتامیایە و لە بنەچەدا لە چیاکانی زاگرۆسەوە پەیدا بووە و دوایی بووەتە بناغەی هەموو زمانە هیندۆئەوروپیەکان. دەستەواژەی "زمانە زاگرۆسیەکان" بەکارهات چونکە بە تەواوی ئەو ناوە ڕەنگدانەوەی ڕاستیە زمانەوانی و مێژووییەکانە. نابێت ئەوە لە یاد بکرێت کە دەستەواژەی (زمانە ئێرانیەکان) پێشینەیەکی مێژوویی دێرینی نیە و تەنها لەلایەن لێکۆڵەرە ئەوروپیەکانەوە دانراوە و هەموو کاتێک دەتوانرێت بگوردرێت، بەتایبەتی ئەگەر گۆڕینی دەستەواژەکە، زیاتر خزمەت بە ڕاستیە مێژووییەکان بگەیەنێت (بڕوانە کێشەی تێکەڵکردنی ناوی ئێران). دانان و بەکارهێنانی ئەو دەستەواژەیە زۆر جار بە مەبەستی سیاسی بەکارهاتووە و گەورەترین زیانی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی گەیاندووە و بەردەوام بوون لەسەر ئەو دەستەواژەیە جۆرێکە لە درێژەدان بە لێڵکردنی ڕاستیەکان و بە سیاسەتەکردنی مێژوو. بۆ ئەو مەبەستە بە درێژایی ئەم کتێبە (زمانە زاگرۆسیەکان) لەم کتێبەدا بەکارهاتووە و لە تەنیشتیەوە لە نێوان دوو کەوانەدا (زمانە ئێرانیەکان) دانراوە.

### گرنگترین دەرئەنجامەکانی ئەم کتێبە

مەبەست لە پرۆژەی ئەم کتێبە سەرەتا دۆزینەوەی ڕەچەڵەکی کورد و مێژووی کوردستان بوو؛ لە ئەنجامدا بنەچەی زمانی کوردی و مێژووی کوردستان بە پاڵپشت بە هەزاران بەڵگەی زمانەوانی و مێژوویی و ئارکیۆلۆجی ڕوونکرایەوە. شانبەشانی ئەو ئامانجە سەرەکیە کۆمەڵێک بۆچوونی نوێ سەبارەت مێژووی ڕۆژهەڵات و بنەچەی زمانە هندۆئەوروپیەکان هاتە ئاراوە کە لە خوارەوە ڕوونکراونەتەوە:

١. نەتەوەی ئاریەکان بەو شێوەیەی ئەمڕۆ لە هەندێک لە کتێبە ئەکادیمیەکاندا باسی لێوە دەکرێت، زیاتر ئەفسانەیە و هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی لە ئارادا نیە کە پاڵپشت لەو بۆچوونانە بکات. هەڵەی ئەم تیۆریە ئەفسانەییە یەکێکە لە هۆکارە سەرەکیەکانی تێکدانی مێژووی کورد و کوردستان و ڕەچەڵەکی زمانە هیندۆئەوروپیەکان.
٢. کورد وەک نەتەوە پێکهاتووە لە کۆی کۆمەڵێک گروپی ناسامی میسۆپۆتامیا و ئەناتۆلی وەک میدی، مانی، لوڤی، سۆمەری، هوری، کاسی، گوتی، ئیلامی و هیتی. لە دوای سەدەکانی زایینەوە ناوی کورد دراوە بە هەموو خەڵکە ناسامیە ڕەسەنەکانی میسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵ و بوونی چەندین دیالێکتی کوردی

ئەمڕۆ هەر بۆ ئەو ڕابردووە هەمەڕەنگەی نەتەوەی کورد دەگەڕێتەوە و هۆکاری سەرەکی نەدۆزینەوەی مێژووی نەتەوەی کورد، دەرک نەکردنە بەم ڕاستیە.
٣. ڕەگی زمانی کوردی سۆمەریە و ئەو زمانە بە کۆنترین زمانی کوردی نوسراو دادەنرێت. لە هەمان کاتدا لە ناو زاراوە کوردیەکاندا دەتوانرێت پاشماوەی هەموو زمانە ڕەسەنەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆلیا بدۆزرێتەوە. بەو جۆرە زمانی کوردی نوێ، وەک مۆزەخانەیەکە بۆ هەموو زمانە دێرینەکانی وەک سۆمەری، هوری، هیتی، میدی، لوڤی، ئیلامی، کاسی، مانی، هتد.
٤. ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت زمانی سۆمەری هیندۆئەورووپی نیە، بۆچوونێکی هەڵەیە و ئەگەر بە پێی بۆچوونەکانی ئەمڕۆ بێت و زمانی سۆمەری هیندۆئەوروپی نەبێت، ئەوا دەبێت بە دڵنیایی زمانی کوردیش لە دەرەوەی خانەی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دابنرێت. لەبەر ئەوەی کە زمانی سۆمەری و کوردی لە ڕووی ڕێزمان و وشەکاریەوە هەر هەمان زمانن. سەدان بەڵگەی زمانەوانی ناو ئەم کتێبە دەری دەخەن کە زمانی سۆمەری کۆنترین زمانی هیندۆئەوروپیە و هێشتا سەدان وشەی هاوبەش لە نێوان سۆمەری و زمانە هیندۆئەوروپیە نوێکاندا وەکو خۆیان ماون و پەیوەندی ڕێزمانیش بەدی دەکرێت.
٥. بنەچەی زمانە هیندۆئەوروپیەکان هەر مێسۆپۆتامیا و کوردستانی ئەمڕۆیە و زۆربەی کاراکتەرە سەرەتاییەکانی زمانی هیندۆئەوروپی لە زمانی کوردیدا هەر ماوە و زمانی کوردی ڕۆڵی دایک دەبینێت بۆ هەموو ئەو زمانانە.
٦- هەردوو سۆمەریەکان ومیدیەکان یەک نەتەوەن و لە سەرچاوە بابلیەکاندا بە هەمان شێوە هەر بە یەک نەتەوە سەیرکراون.
٧- سەرەتای نوسینەوەی مێژووی خۆرهەڵات و کوردستان و نەتەوەی کورد، لەژێر کاریگەری بۆچوونی سیاسی و ئاینی سەدەی حەڤدە و هەژدەی ئەوروپیەکاندا نوسراوە و هەتا ئێستاش مێژوونوسان نەیانتوانیوە لەو کریگەریە ڕزگاریان ببێت. زۆر لەو بۆچوونە مێژووییانەی کە ئەمڕۆ لە ئارادان و وەک ڕاستی مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، بناغەکەی بەو ناڕاستیە دارێژراوە.
٨. بۆ زیاتر لە سەد ساڵە لە ئەوروپا و ڕۆژهەلاتدا مێژوویەک بۆ کورد دەنووسرێت کە زۆربەی لە لایەن خەڵکانی ترەوە نووسراون و بە تەواوی ڕوخسارێکی شەڕانگێزی و ناشارستانی بۆ کورد دروستکراوە کە نەک جیهان بەڵکو کورد خۆشی بڕوای پێکردووە و لێی بووە بەڕاستی، کەچی هەموو بەڵگە مێژووییەکان لە هەموو سەردەمێکدا ئەو بۆچوونە بەدرۆ دەخەنەوە.
٩- فاکتەری سیاسی و دابەشکردنی کوردستان یەکێکە لە فاکتەرە گرنگەکانی تێکدانی مێژووی کوردستان و کردنی ئەو مێژووە بە بابەتێکی گاڵتەجاری لەبری بابەتێکی ئەکادیمی جدی.
١٠- ناوی کورد لە مێژوودا لە نزیکی سەدەی سێهەمی زاییەوە زۆربەی جار وەک چەترێک بەکارهاتووە بۆ ئاماژەکردن بە هەموو گروپە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵ. لە پێش ئەو مێژووەدا هەندێک جار ناوی گووت و هەندێک جار ناوی مید بە هەمان مەبەست بەکارهاتووە.
١١- هەمەجۆری زاراوە کوردیەکانی ئەمڕۆ هەر ڕەنگدانەوەی هەمان زمانی خەڵکە ڕەسەنەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵن وەک سۆمەری، هوری، هیتی، میدی، ئیلامی، لوڤی، کاسی، لیدی، هتد.
١٢- میدەکان خەڵکی ڕەسەنی مێسۆپۆتامیان و هیچ بەڵگەیەک لە ئارادا نیە بیسەلمێنێت کە لە جێگای ترەوە هاتبنە ناوچەکە، بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆربەی بەڵگەکان وای دەردەخەن کە میدەکان خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بن و لەگەڵ سۆمەریەکاندا هەمان نەتەوە بن. دەبینرێت لە سەرچاوە بابلیەکانیشدا هەر بە هەمان نەتەوە سەیکراون.
١٣- پەیوەندیەکی زۆر بەهێز لە نێوان زمانەکانی سۆمەری، هیتی، لوڤی، هوری، میدی، مانی، هتد. هەیە و زۆر لە وشە سۆمەریەکان بە شێوەیەکی تۆزێک گۆڕاو لە هەموو ئەو زمانانەدا دووبارە دەبنەوە و هەموویان بە شێوە جیاوازەکانیان لە زمانی کوردی نوێدا دەردەکەونەوە، واتە زمانی کوردی نوێ وەک چەتری کۆکەرەوەی هەموو زمانە ناسامیە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵە.

## پێشەکیەک سەبارەت بە پرۆژەی ئەم کتێبە

لە بیرم دێت تەمەنم نزیکی شەش حەوت ساڵان بوو، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٧٥دا حکومەتی بەعس بە فڕۆکە و زرێ پۆش دەستی کردبوو بە کۆمەڵێک هێرش بۆ سەر گوندەکانی کوردستان. منیش وەک منداڵێکی ئەو سەردەمە و ئەو ژینگەیە، گوێم لە کەسوکار و ڕادیۆ بوو کە باسی ئەو ڕوداوانەیان دەکرد. ڕووداوەکان تووشی دڵە ڕاوکێیان کردبووم و لە دایکم پرسی "دایە بۆ ئێمەش دەبابە و فڕۆکەمان نیە شەڕی پێ بکەین؟" لە وەڵامدا دایکم گوتی "کوڕم ئێمە حکومەتمان نیە" منیش وەکو هەموو منداڵێکی ئەو تەمەنە کە دەبێت ووردتر لە شتەکان بگات پرسیم "ئەی بۆچی ئێمە حکومەتمان نیە؟" دایکیشم کۆمەڵێک قسەی کرد، کە ئەمڕۆ هیچیم بیر نەماوە، لەبەر ئەوەی کە قسەکانی دایکم بە قەناعەتەوە نەکرا و بۆ ئەویش ڕوون نەبوو کە بۆچی حکومەتمان نیە.

بۆ من ئەوە یەکەمین جار بوو کە بەشێوەیەکی ڕوون هەست بە نادادوەری بکەم کە هەتاوەکو ئەمڕۆ لە یادەوەریم دا ماوە، دیارە لەبەر ئەوە بوو کە هیچ پاساوێکم بۆ ئەو نادادوەرییە چنگ نەکەوت. من لەو ژینگەیەدا چاوم کرایەوە، بۆیە لە کاتێکدا وەکو هەموو منداڵێکی تر یاری و ڕاکردنم دەکرد و خۆشیم دەبینی، لە هەمان کاتدا لەگەڵ گەورەبوونی تەمەندا کۆمەڵێک پرسیاری وەک، بۆ ئێمە دەکوژرێین؟ ئێمەی کورد کێین؟ بۆ ئێمە ژێر دەستین؟ و پرسیاری تری لەوجۆرە سەرقاڵیان کردبووم و دەمویست لەو ناعەدالەتیە تێ بگەم. ژینگەی جەنگ، ژینگەیەکی ئاسایی نیە و کاریگەری جیاوازی دەبێت لەسەر تاکەکان و کاریگەریەکە لەسەر من بوو بووە هەمیشە پرسیارکردن و قوڵبوونەوە لە ژیان و ماناکەی و ناسنامەی تاکیی خۆم و پرسیارکردن لە نادادوەری.

تەمەنی منداڵیم وەکو منداڵانی کورد پڕ بوو لە پرسیارکردن لەو ژینگە ناهەموارە، بۆیە هەر لە منداڵیەوە زۆر خەریکی خوێندنەوە بووم. بەهۆی برا گەورەکانمەوە، کە هەمیشە خەریکی گفتوگۆ و مشتومڕی سیاسی ئەو سەردەمە بوون، لە ناویاندا وەک بچووکترین برا خەریکی فێربوون و گفتوگۆی سیاسی بووم و هەر بەهۆی ئەوانەوە کتێبخانەیەکی گەورەم لەبەردەستدا بوو کە زۆربەی کتێبە سیاسیە چەپەکانی ئەو سەرەمەم دەخوێندەوە. لە ناو گۆڤارەکانی وەک هیوا و ڕۆژی کورد، هتد دا چاوم دەکرایەوە. کتێبەکانی مامە یارە، یاداشتەکانی رەفیق حیلمی، مێژووی فەلسەفە، تیۆریەکانی مارکسیزم، هتد. زۆر لە کتێبەکانی وەک قەڵای دمدم و مادەکان و شتی ترم لەو تەمەنەدا خوێندەوە و تەمەنم نزیکی ١٤ ساڵان بوو کە کتێبی گەلگامیشی سۆمەریم خوێندەوە. زۆر حەزم دەکرد لە ناو کتێبە مێژووییەکاندا شتێکی ڕوونم سەبارەت کورد چنگ بکەوێت، بەڵام ئەو کتێبە مێژووییانە نەیاندەتوانی وەڵامێکی ڕوونی پرسیارەکانم بدەنەوە. ئەوەی کە لەبەر دەستدا بوو تەنها کۆمەڵێک زانیاری ناڕوون بوو سەبارەت بە مید و گوتی و کاردۆخی کە هیچ مانایەکی ئەوتۆی نەدەدا.

لە ساڵی ١٩٩١ کوردستانم بەجێهێشت و لە ساڵی ١٩٩٢ لە بەریتانیا نیشتەجێبووم. بەریتانیا، دەرفەتێکی باش بوو بۆم، لەبەر ئەوەی کە زۆر لە سەرچاوە مێژوویەکان بە زمانی ئینگلیزی نووسراون یان پێی تەرجومەکراون. بەو هۆیەوە توانیم زۆر لە کتێبە مێژووییەکان بخوێنمەوە. لەڕاستیدا کە دەمخوێندەوە نیازی پرۆژەیەکی دیاری کراوم نەبوو، جگە لەو ئارەزووەی کە لە منداڵیەوە پاڵنەرم بوو بۆ تێگەیشتن لە ڕابردووی کورد. بۆیە مۆسیقا، تەکنەلۆژیای مۆسیقا، یاساکانی خانوبەرە، یاساکانی کۆچبەری، ماستەر لە ڕێکخراوە ناحکومیەکان، بەڕێوەبردنی هەڵبژاردن، نەخۆشیە دەروونیەکان، بڕوانامەی تەرجومەکردن.... زۆر شتی ترم خوێند وەک بەشێک لە پاڵپشت بۆ کار و بژێوی ژیان و بەشداری دەیان پرۆگرامی سیاسی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی بەریتانی و جیهانم سەبارەت بە کورد دەکرد، کەچی سەرەڕای ئەوەی کە ئارەزووی دڵم هەمیشە مێژوو بوو، هیچ خوێندنێکی فەرمیم لەو بوارەدا نەکرد.

توانیم لە بەریتانیادا ئاشنای زۆر لە سەرچاوە مێژوویەکان ببم، بەڵام هەمیشە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا سەبارەت بە کورد و ناوچەکە، نەگونجانێکم بەدی دەکرد، بێ ئەوەی کە لە سەرچاوەی ئەو نەگونجانە تێ بگەم. لە دوای ساڵی دوو هەزارەوە و بە هۆی ئەنتەرنێتەوە، توانیم سەرچاوەی زۆر زیاترم لە جاران دەست بکەوێت و زۆر کتێبی نوێم بینیەوە کە پێشتر نەمبیستبوون. بەڵام لە کاتێکدا کە مێژووەکە هەندێک ڕووی ڕوونتر دەبووەوە لە هەمان کاتدا بەشێکی تری ئەو مێژووە ئاڵۆز تر دەبوو. قوڵبوونەوەم لە مێژوو گەیشتە

ئاستێک کە لەم ساڵانەی دواییدا زۆر لایەنی تری ژیانم بەتەواوی پشت گوێ خست و کاتی خۆم بە تەواوی تەرخان کردبوو بۆ ئەو بوارە.
لەو گەڕان و خوێندنەوەیەدا گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە مێژوو بە دوو جۆر نووسراوە؛ مێژوویەک کە سۆمەریەکان، ئاشوریەکان، بابلیەکان و موسولمانەکان نووسیویانە و مێژوویەکی تر کە یۆنانەکان، ڕۆمانەکان و دوایی ئەوروپییەکان نووسیویانە. موسولمانەکانی وەک مەسعودی، یەعقوبی، عومەری، ئەلقەشقەندی، هتد. هەموویان بە ڕوونی کوردیان لە هەموو کتێبەکاندا باس دەکرد و زانیاری باشیان سەبارەت بە جوگرافیای کوردستان دەدا، کەچی لەگەڵ ئەوەی کە لە شیعری شاعیرە یارسانەکاندا زۆر لایەنی ژیانی کوردەواری لە سەدەکانی نۆهەمەوە ڕوون کرابووەوە، بەڵام ئەوروپییەکان هەتاوەکو نزیکی سەدەی دوانزەهەم باسی کورد یان کوردستانیان نەکردبوو. هەروەها سەرنجم دا کە ئەو کتێبە ئەوروپیانەی لە دوای ساڵەکانی چلەوە سەبارەت خۆرهەڵات و کورد نووسراون، زۆربەیان دووبارە کردنەوەن و پرسیار لە ڕاستی و دروستی مێژوو ناکەن. بۆیە لە سەرچاوە ئەوروپییەکاندا، زۆر زیاتر لە هەندێک کتێبی نوێ، بایەخم بە کتێبە کۆنە ئەوروپییەکان دا و بەڵگە سۆمەری، ئاشوری، هیتی، هتد. بۆم بوونە سەرچاوەی زیاتر بڕوا پێکراو. لە سەروو هەموویانەوە ئەو کۆمەڵگەیە،کە من دەمناسی و تێیدا چاوم کرابووەوە کە کوردستان بوو لەگەڵ ئەو مێژووەی کە من سەبارەتیم دەخوێندەوە هەمیشە نەگونجاو دەردەکەوت.
گومان هاوکارێکی گرنگم بوو لەم کارەمدا؛ هیچ نوسینێکم بەڕاستیەکی موتڵەق نەدەخوێندەوە. بەردەوام بە گومانەوە سەیری هەموو بابەتێکی مێژوویم دەکرد. کە کاری مێژوونوسێکم دەخوێندەوە دەبوو بزانم کێیە و لە بنەچەدا خەڵکی کام وڵاتە و بۆ ئەو مێژووەی نووسیوە. لەبەر ئەوەی زۆربەی جار ڕەچەڵەک و باری کۆمەلایەتی و بۆچوونی سیاسی مێژوونوسەکان کاریگەریان لەسەر نوسینەکان هەیە. هەروەها لە شیکردنەوەی بابەتەکاندا هەوڵم دەدا خۆم بەدوور بگرم لە دەمارگیری و هیچ شتێکم بە هەند وەرنەدەگرت ئەگەر چەند بەڵگەیەک پاڵپشتی نەکردایە. خۆم بەهەر نەتەوە یان گروپێکەوە خەریک دەکرد، هەوڵم دەدا چەند بتوانم لە دێرینترین بنەچەیان تێبگەم و ڕەگەکەیان بدۆزمەوە.
بۆ ئەوەی کە لە هەموو ڕوداوە مێژووییەکان تێبگەم، گەڕانەکەم بە تەنها بە دوای کورد دا نەبوو، بەڵکو هەوڵم دەدا تا ڕادەیەکی باش ئاشنای هەموو ئەو نەتەوە و ئاینانەی کە پەیوەندیان بە خۆرهەڵاتەوە هەیە، ببم.
لە هەمان کاتدا خۆم ئاشنای هەندێک لە زمانە هیندۆئەوروپییەکان و ئاینەکانی وەک کریستیان، جو، ئیسلام، مەزداکی، یارسان (ئەهلی حەق)، ئێزدی، مانی، زەردەشتی، هوری و سۆمەری دەکرد. ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە بتوانم مێژووی ناوچەکە بە شێوەیەکی ڕوون تر و فراوانتر ببینم و ڕووداوەکان لە گۆشەی ئاینی، زمانەوانی، ڕەگەزیەوە سەیر بکەم. شارەزایشم لە بواری مۆسیقادا، بە پاڵپشتی ئەو زانیاریانەی کە لەسەر مێژووی ناوچەکە و کوردستان بەدرێژایی چەندان ساڵ کۆمکردنەوە، یارمەتیان دام لە تێگەیشتن لە جیاوازی فەرهەنگی مۆسیقای کوردستان لە ڕووی جوگرافی و مێژووییەوە. بۆ نموونە ناوچەی موکریان لە ڕووی مۆسیقا و زاراوەوە لەگەڵ ناوچەی هەولێر، کۆیە، ڕانیە و قەڵادزە و سەردەشتدا یەک ناوچەی فەرهەنگین و ئەو لێکچوونە تەنانەت هەندێک جار لە جلوبەرگی کوردی و هەندێک لە دابونەریتی تایبەتیشدا لە ناوچەکەدا ڕەنگی داوەتەوە.
بۆ گەیشتن بەو ئەنجامانە ڕۆژ هەبوو ١٤ سەعات دەمخوێندەوە، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵانە، هەندێک جار بێ هیوا دەبووم لەوەی کە بتوانم ئەو لێڵیە لەسەر مێژووی ناوچەکە لابدەم و لەگەڵیدا کەمێک ڕونتر ڕەچەڵەکی کورد ببینم و لە مێژووەکەی تێ بگەم. کەچی پاش ماوەیەک لە سست بوون، دیسان ماخۆلانی گەڕان دەیخستمەوە سەر کار و ووردە زانیاریەک هیوایەکی نوێی لا دروست دەکردمەوە.
لە پاش لێکۆڵینەوەی زۆر گەیشتمە ئەو ئەنجامەی کە هەندێ لە ناوی ناوچە کوردیەکان لە سەردەمی ئاشوریەکاندا لە زمانی کوردیەوە تەرجومەکراوە بۆ زمانی ئاشوری . یەکێک لەو ناوانەی کە سەرنجمی ڕاکێشا، ناوی دەربەندی بازیان بوو. ئەو دەربەندە ئەمڕۆ دەکەوێتە نێوان سلێمانی و کەرکوکەوە. ئاشوریەکان کە لە نزیکی سەدەی نۆهەمی پێش زاییندا هاتنە ئەو ناوچەیە، بە بازیانیان دەگووت (بابیت).
ئەم ناوە لەلایەن زۆر لە مێژوونوسانەوە سەرنج دراوە، بەڵام هەموویان بە هەڵە ماناکەیان لەیەکداوەتەوە. بەڵام ئەگەر سەرنج لە ناوەکە بدرێت، دەبینرێت کە بازیان لە دووبەش پێک دێت (باز +یان)، (باز) لە کوردیدا بە مانای کردنەوە دێت و (یان) لە کوردیدا هەمان مانای (بیت) ی ئارامی هەیە. هەڵبەت

هەردووکیان مانای (ستان) یش دەدەن کە وەک (شوێن، ناوچە، مەڵبەند، وڵات) مانا دەدەن. ئەمڕۆ (یان) لە کوردیدا وەک پاشگر مانای (شوێن) دەدات و وشەی (یانە) ش هەر مانای (خانوو، شوێن) دەدات. لە ناوەکاندا بۆم دەرکەوت کە بازیان بە کوردی مانای (شوێنی دەرگا) دەدا و (بابیت) ی ئاشوریش پێک هاتووە لە (باب +بیت) کە دیسان مانای (شوێنی دەرگا) ی هەبووە. جگە لەوەش لە سەدەی یەکەمی زاینەوە باسی ناوچەی گەرمیان کرابوو، وەک (بیت گەرمای). گەرمیانیش بە کوردی مانای وڵات/ ناوچە/ دەڤەری گەرمایی دەدا کە دەبێتە پێچەوانەی ناوچەی (کوێستان (کێو+ستان). ئەو دوو ناوە بوون کە بەشێوەیەکی زانستیانە بۆمیان سەلماند کە زمانی کوردی ئەمڕۆ هەر لەو ناوچەیەدا قسەی پێ کراوە و کورد خۆی ناوی شوێنەکانی ناوە و ئاشوریەکان ناوە کوردیەکەیان تەرجومە کردۆتە سەر زمانی خۆیان. پاشتر ناوێکی تریش بە هەمان شێوە خۆی خستە ڕوو کە ناوی ناوچەی (کوردیان) بوو کە لە کتێبە مێژوویەکاندا بە شێوەی Cardyene, Gorduene, Cordyene ،Carduene, Gordyene, Gordian, Karduchi نووسراوە و لەلایەن ئارامیەکانەوە ناوەکە تەرجومە کراوەتە (بیت کاردو/قاردو) و وشەی (کورد)یش بە شێوەی (قاردو/کاردو) لای ئەوان نووسراوە. دوایش لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا هێندەم زانیاری کۆکردبووەوە کە پێم وابوو دەتوانم دەست بکەم بە نووسینی زۆر بابەت سەبارەت مێژووی کورد و کوردستان. هەندێک جار دەمویست ئەو زانیاریانەی کە دەستم کەوتوون وەک بابەت لە بڵاوکراوە کوردیەکان و لە بلۆگێکی تایبەتی ئینگلیزیدا بڵاو بکەمەوە، بەڵام هەر زوو بە زوو پەشیمان دەبوومەوە و دەمویست پێش ئەوەی کە بابەتی لەسەر بنووسم، زیاتر لەسەر ڕەگ و ڕیشەی کورد قوڵ ببمەوە.

هێندەم سەرچاوە و زانیاری نوێ کۆکردەوە و هەڵەم لە تۆمارکردنی مێژووی کورد و کوردستان دا بینی، بۆیە بیرۆکەی بابەت نووسین لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و کۆکردنەوەی زانیاریدا گۆڕا و بڕیارم دا کتێبێک سەبارەت مێژووی کورد و کوردستان و زمانەکەی بنووسم. وردە ووردە دەستم کرد بە نووسینی بابەتەکانم و لە کاتی داڕشتنی قۆناغی کۆتایی سەدەکانی پێش زایندا هەوڵم دەدا کە ناوچەکانی کوردستان لە سێ ناوچەی میدیا و هەزەبان و کوردیاندا بخەمە ڕوو. بابەتەکانم کردبوو بە بەش بەش و ویستم لە ناوچەو دەوڵەتی هەزەبانەوە دەست پێبکەم، ئیتر دەستم کرد بە کۆکردنەوەی بابەت لە سەر هەزەبان کە دەسەڵاتیان لە ناوچەی هەولێری ئەمڕۆ بووە. بەڵام ئەو بەڵگە و سەرچاوانەی کە سەبارەت بە هەزەبانیەکان لەبەر دەستدا بوون تەنها لە سەدەی چوارەمی پێش زاینیەوە هەبوون. هەرچەندە ئەوە مێژوویەکی دێرین بوو، بەڵام دەمویست بزانم پێش ئەو سەردەمە ڕەگی هەزەبانیەکان لە کوێوە هاتوە. ئەمە یەکێ بوو لەو کێشانەی کە دەکەوتە ڕێگام؛ هەمیشە دەمویست کە لە ڕەگی هەموو شتێک بگەم، زۆر جاریش ئەوە ماندووی دەکردم، بەڵام لە هەمان کاتدا هاوکاری دەکردم کە باشتر لە شتەکان بگەم.

لەو ماوەیەدا خاڵێک سەرنجمی ڕاکێشا، ئەوەی کە هەولێر کە سەنتەری ناوچەی هەزەبان بووە لە مێژوودا، لە ڕووی قسەکردنەوە وەک ناوچەکانی موکریان و کۆیە و ڕانیە و قەڵادزێ قسە دەکەن و شێوەی گۆرانی فۆلکلۆری ئەو ناوچانەش هەر پەیوەندیان هەیە. بۆیە دیسان کەوتمەوە خوێندنەوە لەسەر نەتەوە کۆنەکانی ئەو ناوچەیە. نەتەوەیەکی وەک مانی لە ناوچەی موکریاندا باڵا دەست بوون و پێش میدەکان ئەوان دەسەڵاتیان هەبووە و هەر ئەوانیش دوایی بوونە پێکهاتەیەکی گرنگی دەوڵەتی میدەکان. هەوڵم دا زیاتر سەبارەتیان بزانم، ئیتر دەستم کرد بە خوێندنەوەی زیاتر و لێکدانەوەی ناوی پاشا و ناوچەکانیان. ڕۆژێک لە کاتی خوێندنەوەدا لەسەر مانیەکان، چەند ناوێکم بینی کە زۆر سەرسامیان کردم. ئەم ناوانە بریتی بوون لە (شوانەدۆڵ، سێوە، ئازا، سوریکەش، وەستاڕییەر)، بۆمیان سەلماند کە مانیەکان، کە هەزار ساڵ پێش زایین و لە پێش میدەکان ناویان هاتوە، هەر بە کوردی قسەیان کردوە. ئەوە گەورەترین بەڵگەبوو کە بەدەستی بهێنم و بووە پشتگیریەکی بەهێزتر بۆ بۆچوونەکانی پێشووم. هەروەها بینیم کە کاتێک ئاینی کریستیانی لە سەدەی یەکەمی زاینییەوە هێنراوەتە کوردستان، ناوی خەڵک و شارەکان هەمووی کوردی بوون وەک (دۆستی، زەردەشت، کوردەوا، زۆزان).

لە هەمان کاتدا دوای دۆزینەوەی ناوەکان دەمویست لە ڕەچەڵەکی ڕەگەزی مانیەکان تێبگەم. دەمبینی مێژوونوسان مانیەکان بە هوری و هەندێک جار بە گوتی لە قەڵەم دەدەن. لەبەر نەبوونی زانیاری سەبارەت بە زمانی گوتیەکان، پەنام بۆ زمانی هوری برد. لەسەرەتادا بینیم کە چەند وشەیەک لە زمانی هوریدا کوردی بوون، لە گەڕانی زیاتردا ژمارەیەکی زۆرم لە وشە هوریەکان دۆزیەوە کە کوردین. گرنگی

دۆزینەوەی وشە کوردی/مانیەکان بۆ من ئەوە بوون کە ڕوانگە و بۆچوونی منیان گۆڕی بەرامبەر زمانە دێرینەکان، پێشتر لێکۆڵینەوەم لەسەر زمانانە کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نەگەیشتبوومە ئەو بڕوایەی کە زمانی کوردی هێندە دێرین بێت، بۆیە وشە کوردیەکانم بەدی نەدەکرد، بۆیە دۆزینەوەی وشە مانیە کوردیەکان گەورەترین هاوکارم بوون لە دوای وشەکانی بازیان و گەرمیان.
بە ڕاستی ئەو دۆزینەوانە خستبوومیانە حاڵەتێکی دەروونی سەیرەوە. لە لایەکەوە دڵم زۆر خۆش بوو بە دۆزینەوەکان و لەلایەکی ترەوە نەم دەتوانی بحەوێمەوە، شەو و ڕۆژ خەریکی گەڕان و لێکدانەوە بووم.
زمانەوانەکان زمانی هوری و سۆمەری بە زمانی سەربەخۆ دادەنێن و نایانخەنە ڕیزی هیچ کام لە خێزانە زمانیەکانەوە. پێشتر ماوەیک خۆم بە سۆمەریەوە خەریک کردبوو، بەڵام جگە لە دوو وشە، شتێکی ئەوتۆم تێدا بەدی نەدەکرد. هۆکارەکەشی ئەوەبوو، کە بڕوام نەدەکرد زمانەکەیان هێندە لە کوردیەوە نزیک بێت.
بەڵام دۆزینەوەی وشە هوری و مانیەکان بۆچوونمی بە تەواوی بەرامبەر ڕابردوو گۆڕی. بۆیە دیسان گەڕامەوە سەر زمانی سۆمەری و لە لێکۆڵینەوەدا بۆم دەرکەوت کە زمانی سۆمەری هەر زمانی کوردیە.
هەتاوەکو زیاتر قوڵ دەبوومەوە، شتی نوێم دەدۆزیەوە. دۆزینەوەکان هێندە شپرزەیان کردبووم کە چیتر نەم دەزانی چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکەم. بۆم ڕوون بووەوە کە وشە کوردیەکانی وەک (ئایش) و (ئارەزوو) و (هەش بەسەر) و چەندین وشەی تر، کە لە منداڵیەوە گوێم لێیان بووە، هەموویان سۆمەری بوون؛ لای لایەی کوردی و سەرەتای ئەو گۆرانیانەی کە بە (لێ لێ، لۆ لۆ،هتد) دەست پێ دەکەن، هەمووی سۆمەرین.
یا کاتێک کە ئەمڕۆ بە زمانی کوردی دەگووترێت "هەی دا و بێ دا" وەک گازندەکردن لە نادادوەری، کورد خۆی نازانێت کە ئەو ڕستەیەی دەیڵێت هەموو پێکهاتەی دێرەکە سۆمەریە. وورده وورده بۆم ڕوون بووەوە، کە ئەمڕۆ لە لادێکانی کوردستاندا زۆر لە ووشەکان کە بەکاردەهێنرێن سۆمەری بوون.
ئیتر جارێکی تر بە تەواوی خۆم خەریک کردەوە بە ڕێزمان و فەرهەنگ و مێژووی هەموو نەتەوە دێرینەکانی وەک سۆمەری، هیتی، هوری، لوڤی، ئاڤێستا، سانسکریت، ئەشکانیەکان و هەر بەوانە قایل نەبووم، بەڵکو خۆم ئاشنا کرد بە مێژووی دێرینی یۆنانەکان، ڕۆمانەکان، فەرەنسیەکان، ئەڵمانەکان، فارسەکان و لەگەڵ ڕەچەڵەکی زمانە هیندۆئەورووپیەکان و دەیان زمانی کۆن و تازەدا کارم دەکرد. دەمویست لە ڕەچەڵەکی هەموو زمانە هیندۆئەورووپیەکان و زمانەکانی تریش تێبگەم. هەروەها دەمویست جارێکی تر تێ بگەم چۆن ئاینەکانی وەک جودایزم، کرسیتان، ئیسلام، هتد هاتوونەتە کوردستان و لە هەمان کاتدا دەمویست لە ڕوانگەی زمان و ئاین و مێژووەوە ئاشنای هەموو ئەو نەتەوانە ببم کە لە ڕابردوودا هاتوونەتە کوردستان. بە کورتی دەمویست تا ڕادەیەک بۆشایی لە زانیاریمدا بەرامبەر مێژوو و زمانی ئەورووپا و خۆرهەڵات نەمێنێت. لە هەمان کاتدا خۆم بە ڕێزمان و زاراوە جیاوازە کوردیەکانەوە زیاتر ئاشنا دەکرد.
دۆزینەوەکان لە ڕاستی نەدەچوون، ئەو نەتەوەیەی کە هەندێک لایەنی ئەکادیمی بە نەتەوە و خاوەن مێژووی نازانێت، لە پڕ بینیم بە بەڵگەوە باوکی شارستانیەتی مرۆڤایەتی بووە. شتەکان هێندە کەڵەکە بوون، نەمدەزانی چیان لێ بکەم، لە تاوا ڕۆژانە ڕام دەکرد بۆ ئەوەی کە لە ڕووی دەروونیەوە بحەوێمەوە و کەمێک مانا بدەم بەو خۆشی و یادەوەریە تاڵانەی کە هەمبوون. ئەو هەستی ناعەدالەتی و کوردی بوونەم لەپڕ کەوتە قۆناغێکی سەیرەوە، قۆناغێک کە وشە زەحمەتە بتوانێت گوزارشی لێ بکات. بەشێک لە پرۆسەی لێکۆڵینەوەکانم لە کاتێکدا پێک هاتبوو لە فێربوونی زمانی سۆمەری، لە هەمان کاتدا بەهۆی زمانی سۆمەریەوە شارەزای وشە کوردیەکان دەبووم و لە ڕەگی وشە کوردیەکان باشتر تێ دەگەیشتم. بۆ نموونە ناوی دەربەندی (بازیان) کە سەرەتا ئاماژەی پێ کرا. وشەکە بنەچەکەی سۆمەری وهوری و کوردیشە. بە هەمان شێوە ناوی (گەرمیان) نیوەی سۆمەریە و نیوەکەی تری هوریە.
زۆر جار دۆزینەوەی هەندێک لە وشە و دەربڕینە سۆمەریەکان دەیانخستمە حاڵەتی ڕۆحی سەیرەوە. هەندێک لە دەربڕینی گازندەی سۆمەریەکان بۆ چەندین ڕۆژ ڕایان دەچڵەکانم و لەگەڵ ڕستە سۆمەریەکاندا دەژیام و باو و باپیرانم بیر دەکەوتەوە. کاتێک بینیم کە نزیکەی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر سۆمەریەکان گازندەیان کردووە لە نادادوەری و گوتویانە "ئی وتو" (i utu) کە ماناکەی بە کوردی ئەمڕۆ بریتیە لە (ئای هەتاو āi hatāu). لەبەر ئەوەی هەتاو (utu) خوای ڕۆژ و عەدالەتی سۆمەری بووە.

بۆیە ئیتر کارەکە لە لێکۆڵینەوە دەرچوو بوو، تێکەڵی ژیانی خۆم بوو بوو؛ تێکەڵی هەموو یادەوەری منداڵی و پەروەردەی خێزانەکەم بوو بوو. ئالێرەدا کاریگەری ڕستە بە ڕواڵەت ساکارەکانی باوکم بیردەکەوتەوە کە دەیگوت و دەی گوتەوە "کوڕم کوردی، کوردی، کوردی، کورد بە!". سەنتەری بۆچوونی باوکم لە دێڕێکدا بەرجەستە دەکرا، کاتێک کە دەیگوت "کوڕم سیاسەت هەمووی درۆیە، گرنگ نیە سەر بە کام لایەن بیت، بەڵام ئەبێت کوردی، کوردی، کوردی، کورد بیت" هەموو ماوە ماوەیەک ئەمەی دەگووتەوە. ئاخۆ ئەو هەستەی باوکم بوو کە بەرەو ئەم ڕێگایەی هێنام؟ ئایا چی وای لە باوکم دەکرد کە ئەو دێرە هێندە دووبارە بکاتەوە؟ یاخود شیعرەکانی موفتی پێنجوێنی باپیرم بوو کە دایکم هەر لە منداڵیمەوە پێی لەبەر دەکردم و لە قوتابخانە دەم خوێندەوە. موفتی شیعرەکانی پڕن لە هەستێکی بەرزی کوردایەتی و ڕەتکردنەوەی ناعەدالەتی بە هەمووشێوەکانیەوە. لە تەمەنی شەش ساڵیدا بووم کە دەبوو لە قوتابخانەدا ئەم شیعرە بڵێم "کوردم و ئەولادی کوردم بیش مرم وەسێت دەکەم پێم بڵێن ئەی کوردە هۆشت بێ لە جێی تەڵقینمە".
پرسیارم لە خۆم دەکرد و دەمویست تێ بگەم ئایا قسەکانی باوکم بەردەوامیەکی ڕۆحی باو و باپیرانمان بوو کە لەو دێرە سادەیەدا بەرجەستە دەبوو یان ئەوانە تەنها بیر و بۆچوونی باوکم خۆی بوون؟ بۆیە کارەکەم لە مێژوو دەرچوو بوو؛ بیرکردنەوەی ڕۆحی خۆم، مێژوو، باوکم، دایکم، باپیرم هەمووی تێکەڵی یەکتری بوو بوون. ژیان هەمووی مانایەکی نوێی پەیداکرد و هەمووی وەک شتی زیندوو خۆیان دەنواند. بەیانیان سەعات شەش کە بۆ وەرزشکردن ڕام دەکرد، لە خوێندنی باڵندەکان و لە بۆنی ئاونگی بەیانیاندا هەستم بە مانایەکی ڕۆحی دەکرد؛ هەموو شتەکان لەبەرچاوما خۆیان بەیەکەوە دەبەستەوە. مێژوو، باوکم، بۆچوونی ڕۆحی خۆم و ئەو بۆشاییەی کە لە ناو پرسیارەکانی منداڵیمدا مابوون، ڕۆژ بە ڕۆژ کەم دەبوونەوە. شانبەشانی ڕەوانەوەی ماخۆلانی پرسیارەکانی منداڵیم، پرسیاری تر دروست دەبوون؛ مرۆڤ چەند مەزنە و چەند بچووکە، چەند زانایە و چەند گێلە، چەند دادوەرە و چەند تاوانبارە و چۆن مێژوو خۆی یەکەم زۆردار بووە بەسەر میللەتی کوردەوە و چۆن کورد دێرینترین مێژووی نوسراوی هەیە، کەچی ئێستاکە خاوەنی سەروەری خۆی نیە. چۆن ئەو هەموو زانکۆیە لە جیهاندا کوردیان بە شایانی ئەوە نەزانیوە کە بەراوردی زمانەکەی لەگەڵ سۆمەریدا بکەن و لە هەمان کاتدا بیرم دەکردەوە کە چۆن ئەم دۆزینەوانە کاریگەری دەبێت لەسەر ژیانی خەڵکی لیقەوماوی کورد.
یەکێک لە کێشە گرانەکانی ئەم کارە ئەوە بوو کە چۆن ئەم بابەتە بخەمە ڕوو. سەرەتا ویستم کە لە سیمینارێکدا ئەو زانیاریانە باس بکەم، بەڵام وەک کوردێک زۆر بە گومانم لە جیهان. خەمم بوو گەر زانیاریەکان بە نیوەچڵی بخرێنە ڕوو، جارێکی تر خەڵکانێکی "ئەکادیمی" بە پەلە ئەو ڕاستیانە بشێوێنن. لە قۆناغێکدا ئەو دۆزینەوە و بەڵگانە بیرۆکەی دکتۆرایەکی لە مێشکمدا لەسەر ئەو بابەتە دروست کرد. کە بابەتەکەم، بێ خستنە ڕووی بەڵگەکان، پێشکەشی مامۆستایەکی زانکۆی سەواس (SOAS) ی بەریتانی کرد، داوای کرد کە دانیشتنێک بکەین. دوای گفتوگۆکردن، پرۆژەکەمی قبوڵکرد بە مەرجەوە. بەڵام پاش ماوەیەکی کەم، لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز، لە بڕیارەکەم پەشیمان بوومەوە. ئینجا بڕیارم دا کە هەموو ئەو بابەتە و هۆکاری تێکدانی مێژووی کورد و کوردستان لە کتێبێکدا جێ بکەمەوە. ئیتر ئاراستەی کارە سەرەتاییەکانم سەبارەت کتێبەکە گۆڕی، بۆ ئەوەی کە بۆشاییەکی ئەوتۆ لە کارەکاندا نەبێت کە بتوانرێت ئەوەی کە لە ڕابردوودا لەگەڵ مێژووی کورد دا کراوە، جارێکی تر دووبارەبکرێتەوە و خەڵکانێک بە مەبەست وئارەزوو یان بە نەزانی ڕاستیەکان بشوێننەوە. ماوەیەک لە دوودڵیدا بووم کە ئایا بابەتەکە بە زمانی ئینگیزی یان بە کوردی بنووسم؛ سەرەتا بە ئینگلیزی دەستم پێکرد، بەڵام لە دواییدا لەبەر چەند هۆیەکی جیاواز وازم لە ئینگلیزیەکە هێناو بڕیارم دا بە کوردی بینووسم و دوایی تەرجومەی بکەم بۆ زمانی ئینگلیزی.
لە سەرەتادا کارەکە زۆر گران بوو، لەبەر ئەوەی کە دەرئەنجامەکانی ئەم کتێبە ناسازە لەگەڵ هەموو ئەو بۆچوون و تیۆریانەی کە سەبارەت ڕەچەڵەکی زمانە ئەوروپیەکان و مێسۆپۆتامیا لە ئارادایە. زۆر لە مێژە کۆمەڵێک تیۆری سەبارەت بە ڕەچەڵەکی زمانە هیندۆ ئەوروپییەکان و ئایینی زەردەشتی و زمانی فارسی خراوەتە ڕوو کە کراونەتە ڕاستیەکی نەگۆڕ و قوبوڵکراو. چۆن بە خەڵک بگووترێت ئەو نەتەوە ئاریەی کە مێژوونوسان باسی لێوە دەکەن و زیاتر لە سەدەیەکە کوردی پێوە سەرقاڵ کراوە، بەشێکی زۆری ئەفسانەیە و بەشێکی زۆری لەلایەن هەندێک لە مێژوو نوسانەوە دروست کراون و لە ژێر کاریگەری

بۆچوونی ئاینی و سیاسی مێژوونوسانی دوای سەدەی حەڤدەی زاینی ئەوروپادا نووسراوە و بناغەی دانراوە کە بەڵگە و دۆزینەوەکانی ئەم کتێبە زوربەیان بە درۆ دەخاتەوە. لەبەر ئەوە دەرکردنی کتێبێک کە پێچەوانەی هەموو ئەوانە بێت، بۆ من کارێکی ئاسان نەبوو؛ دەبوو بە ناخی نووسینەوەی مێژوودا بڕۆمەوە و بزانم بۆ ئەم هەلانە ڕووی داوە و چۆن ئەو هەموو ڕاستیە لە مێژوودا بزر بووە و کێ مێژووی نوسیوە و بۆ بەم جۆرە نووسراوە.

هەوڵێکی زۆرم دا کە تا ڕادەیەک لێکۆڵینەوە لەسەر زۆربەی ئەو نەتەوە و گروپە دێرینانە بکەم کە پەیوەندیان بە کوردەوە هەیە. بەڵام لەبەر نەبوونی زانیاری زمانەوانی، هەندێک لە نەتەوەکانی وەک کاسی و ئیلامی کە بە دڵنیایی پەلێکی تری پێکهاتەی کوردن، نەتوانرا لەم کتێبەدا باس بکرێن. هەندێک جار بەهۆی ئەوەی کە ویستم هاوسەنگیەک بکەم لە نێوان پێدانی زۆرترین زانیاری و دەرکردنی کتێبەکە لە کاتی گونجاودا، بۆیە نەتەوەیەکی وەک ئورارتو کە هەندێک پەیوەندی زمانەوانەیان لەگەڵ کورد دا هەیە، نەتوانرا کاری لەسەر بکرێت. هەروەها لەبەر هەمان هۆ بابەتی ئاین کە بابەتێکی گرنگی مێژووی کورد و کوردستانە و زۆر ڕووی بە تەواوی شێوێنراوە، سەرەتا دانرابوو لەم کتێبەدا باس بکرێت، دوایی بڕیارم دا کە بابەتەکە بکەم بە پرۆژەی کتێبێکی تایبەت بە مێژووی ئاینە کوردیەکان لە داهاتوودا. هەروەها ویستم مێژووی کورد تەنها هەتاوەکو هاتنی ئیسلام بنوسمەوە، یەکەم لەبەر ئەوەی کە دوای ئیسلام مێژوی کورد زۆر ڕوونترە و دووهەم ویستم ئەم کارە چەندین ساڵ نەخایەنێت و زانیاریەکان چیتر لە کورد و مرۆڤایەتی نەشاردرێتەوە.

بۆ ئەوەی کە بە تەواوی لە پەیوەندی زمانی سۆمەری و کوردی بگەم، نزیکی سێ ساڵم ویست. بە هەمان شێوە تەنها بۆ تێگەیشتن لە زانیاریەکان و لێکدانەوەی ناوە دێرینەکان کە ئیبن وەحشیە سەبارەت بە کورد خستوونیەتە ڕوو، نزیکی دوو ساڵم پێویست بوو؛ بەو جۆرە هیچ کام لە دەرئەنجامەکان لە شەوو ڕۆژێکدا بەدەست نەهێنراون. ئەم پرۆژەیە پرۆژەیەکی زۆر بەرفروان بوو و بۆ گەیشتن بە دەرئەنجامەکان، سەدان کتێبی مێژوویی بە زمانەکانی ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی و کوردی بەکارهاتوون، تەنها ئەوانەیان لە لیستی سەرچاوەکاندا نوسراون کە بەشێوەیەکی ڕاستەخۆ لە کتێبەکەدا ناوهێنراون. لە هەمان کاتدا مامەڵە لەگەڵ لایەنی وشەسازی و فەرهەنگی زمانەوانی سیانزە زمانی مردووی وەک سۆمەری، هوری، هیتی، لوڤی، میدی، سراسی، لیدی، کاری، پەهلەوی، فارسی کۆن، سانسکریت، ئاڤێستا و لاتین و لێکۆڵینەوە لەسەر ڕێزمانی زۆربەیان کراوە و کارکراوە لەسەر فەرهەنگ و ڕێزمانی نزیکی بیست زمانی زیندووی وەک کوردی بە زاراوە جیاوازەکانیەوە، فارسی نوێ، عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی، یۆنانی، سربی، کرواتی، سویدی، ئیتاڵی، نەرویجی، دانیمارکی، ئیسپانی، پورتوگالی، ڕوسی، ئەڵمانی، هتد. بۆیە لە کاتێکدا ئەوپەڕی هەوڵ دراوە کە زانیاری و وشەکان بە دروستی بگوێزرێنەوە، لە هەمان کاتدا مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگەنامە مێژووییە دەمخاتە گومانی ئەوەی کە لە ناو ئەو هەموو زانیاری و زمانەدا تۆ بڵێی هەڵەی بچووکم بەسەردا نەڕۆیشتبێت، بۆیە بە مەبەستی نەهێشتنی ئەگەری ئەو کەموکوڕیانە، هەوڵێکی زۆر خراوەتە گەڕ و چەندین مانگ تەرخان کراوە بۆ پێداچوونەوەی زانیاری و فەرهەنگەکان و هیوام وایە کە لەوەدا سەرکەتوو بووبێتم.

زۆر لە مێژوونوسە ئەوروپیەکان و ڕۆشنبیرە کوردەکان دەرکیان بە گرانی دۆزینەوەی ڕەچەڵەکی کورد کردووە و هەندێک جار دۆزینەوەشی بە کارێکی مەحاڵ دانراوە. نزیکی چل ساڵ لەمەوبەر مامۆستای پایەبەرز، مەسعود محەمەد، دەرکی بە گرانی دۆزینەوەی ڕەچەڵەکی زمانی کوردی کردووە و پێی وابووە کە گەیشتن بەو ئامانجە لەلایەن یەک کەسەوە کارێکی مەحاڵە و ئەو پێی وا بووە تەنانەت بۆ نەوەیەکی تەواویش مەحاڵە ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنرێت و دەڵێت "ئەمن دەڵێم خۆشم دەزانم دۆزینەوەی داوی پەیوەندی میانی کوردی کۆن و لەهجەکانی ئێستاکەی، کارێکە لێی دەوەشێتەوە پەیکەری زێری بۆ داڕێژرێ و خاوەنەکەی بە پێشەوای سەرلەبەری ڕۆشنبیر و نووسەر و زانایانی کورد لە قەڵەم بدرێت و وەک ئەحمەد شەوقی بکرێ بە میری کوردستانی، تاج و گۆچانی ئیمارەتی پێ بدرێت. بەڵام حەزکردن و خۆش ئامەد کردنی من لە شتێک نابێتە پێکهێنەری ئەو شتە ... کوێر حەز لە دوو چاوی ساغ دەکا و نیوەی چاوێکی ساغیشی پێ نابڕێ ... هەر وەک دەزانم کەس نییە بتوانێ قورسایی ۱۰ تەن هەڵگرێ وە یا بە دەست لێکدان ڕەهەوا کەوێ و بفڕێ، وەیا بە بازێک لە دیجلە ببپەڕێتەوە هەر وەهاش دەزانم، تۆش دەزانیت، بە کەس

ناکرێ لەهجەکانی ئێستاکەی کوردی بە ڕێی شەقامەڕێدا بپەڕێتەوە بۆ سەردەمی زەردەشت و پێشتر: ئەم هەموو زانستەی فیلۆلۆجی و کوردناسی و ئارکیۆلۆجی و مێژووی ڕۆژهەڵاتی نێزیک و ساغ کردنەوەی تاو و تەئسیری تێکەڵ بوون و تێک هەڵقژان و تێک چرمسانی میللەتان و زمانەکانی ئەم ناوچە پان و بەرینە لە ماوەی دوو سێ هەزار ساڵدا کاری تاکە کەس نییە، کاری جیلێکی سەر لەبەریش نییە: نەفەسی ئەم کارە لە عومری تاکەکەس و تاکە جیل یەکجار درێژترە". (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٩، پ.٥ و ٦).
وەک ڕوونکرایەوە، ئەم کتێبە و دەرئەنجامەکانی بەرهەمی هەوڵ و کوششێکی زۆرە و ئەوپەڕی هەوڵ دراوە کە زۆرترین زانیاری سەبارەت کورد بخرێتە ڕوو؛ بە تەواوکردنی ئەم کتێبە هیوام وایە توانیبێتم زۆر ڕووی مێژووی کورد و کوردستانم ڕوونکردبێتەوە و ڕزگارم کردبێت لە کاریگەری سیاسی و لایەنی تری سەردەمە جیاوازەکان کە بە تەواوی مێژووەکەی شێواندووە و هەروەها ئەو هیوایەی کە لە منداڵیەوە هەم بووە بۆ دۆزینەوەی مێژوو و ڕەچەڵەکی کورد، توانیبێتم لە ڕێگای ئەم کتێبەوە بە ئەنجامم گەیاندبێت.

# بەشی ١
# سەرەتایەک سەبارەت کورد و زمانەکەی

زمانەکانی جیهان پۆلێنکراون و هەر گروپێک لەم زمانانە ناوێکی بۆ دانراوە لەسەر ئەو بنەمایەی کە ئەو گروپە زمانیە لە بنەڕەتدا بنەچەیەکیان هەبووە. بۆ نموونە گروپی زمانە سامیەکان ( Semitic Languages)، ئەمڕۆ زمانەکانی وەک عەرەبی، عیبری، ئارامی، ئەمهەری، هتد، دەگرێتە خۆی. زمانی تورکی دەکەوێتە ژێر گروپی زمانە ئەڵتاییەکان. ئەو گروپە پێک دێت لە کۆمەڵێک لقە گروپ کە یەکێکیان بریتیە لە لقەگروپی تورکیک (Turkic)، کە زمانەکانی تورکی، ئازەری، تاتار، هتد. دەگرێتە خۆی.

زمانی کوردی لە بنەڕەتەوە لە هەردوو زمانی نەتەوەکانی دراوسێی وەک عەرەبی و تورکی جیاوازە، بەڵام هاوبەشی هەیە لەگەڵ زمانی فارسی و ئەفغانی و بەلوچێ، هتد. ئەم زمانانە بە زمانی هیندۆئەوروپی دەژمێردرێن و دەکەونە ناو لقە گروپی زمانە زاگرۆسی (ئێرانی)[1] مکانەوە. پەیوەندی نێوان زمانی کوردی و فارسی و ئەفغانی و بەلوچی، وەک پەیوەندی نێوان ئیسپانی و پورتوگالی و ئیتالی و فەرەنسی وایە. کەلپێپێر[2] (Culpeper, 2005, p.90) نەخشەیەکی بۆ زمانە هیندۆئەوروپیەکان بە گشتی کردووە (بڕوانە نەخشەی دابەشکردنی زمانە هیندۆئەوروپیەکان) کە تێیدا شوێنی زمانی کوردیش لە ناو زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا خراوەتە ڕوو. لە خوارەوە لقی زاگرۆس (ئێران) ی و چەند لقێکی تر لە ناو زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا بە نموونە خراونەتە ڕوو:

لقی زاگرۆسی (ئێرانی): کوردی، پشتو، بەلوچی، فارسی، تالیش، هتد.

لقی جێرمانیک (Germanic): ئەڵمانی، ئینگلیزی، هۆڵەندی، سویدی، دانیمارکی، نەرویجی، ئایسلاندی، فلێمیش، هتد.

لقی ئیتاڵیک (Italic): فەرەنسی، ئیتاڵی، پورتوگالی، ئیسپانی، هتد.

لقی سلاڤی: ڕوسی، پۆڵۆنی، سربی، بولگاری، هتد.

تیۆری زمانە هیندۆئەوروپیەکان لەسەر بناغەی لە یەکچوونێکی زۆر لە نێوان زمانەکانی هەر کام لەو گروپە زمانانە داڕێژراوە و دابەشکردنی زمانە هیندۆئەوروپیەکانیش بە پشت بەستن بەو تیۆریە کراوە. واتە بەگشتی هاوبەشی و لەیەکچوونێک بەدی دەکرێت لە نێوان زمانەکانی هەر کام لە گروپەکان و بەتایبەتی پەیوەندیەکی بەهێز تر لە نێوان زمانەکانی ناو لقە گروپەکاندا هەیە. بۆیە زمانی کوردی لە کاتێکدا کە هاوبەشی زیاترە لەگەڵ زمانی ئەفغانی، بەلوچی و فارسیدا، بەڵام پەیوەندی لەگەڵ زمانی سویدی و ئینگلیزیشدا هەیە. بۆ نموونە ئەگەر ڕستە بەناوبانگەکەی شکسپیر بە ئینگلیزی و کوردی بنوسرێت و بەراوردی ئەو زمانە لەو ڕستەیەدا بکرێت، ئەوا دەبێتە:

to **be** or **not** to **be**

**bi** ya **na** **bi**

دەبینرێت هەردوو (نە، بی) ی زمانی کوردی دەبێتە (not, be) لە ئینگلیزیدا و لێکچوونی زۆر بەدی دەکرێت لە نێوانیاندا. هەروەها ئەگەر ڕستەی سادە لە ناوچەی جیاوازی کوردستاندا بەراورد بکرێت لەگەڵ هەندێک لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا، ئەو پەیوەندیە لە ڕووی ڕێزمانیشەوە زۆر بەڕوونی دەردەکەوێت.

---

[1]. بە درێژایی ئەم کتێبە لەبری "زمانە ئێرانیەکان" ناوی "زمانە زاگرۆسیەکان" بەکارهات و لە بەشی کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان و لە سەرەتای ئەم کتێبەدا هۆکارەکەی ڕوونکراوەتەوە.

[2]. نەخشەکەی کەلپێپێر سەبارەت زمانە هیندۆئەوروپیەکان بە کەمێک دەستکاریەوە دانراوە؛ دەستەواژەی ئینگلیزی (هیندۆ زاگرۆسیان) لەبری (هیندۆئێرانیان) بەکارهات و (زاگرۆسیک) لەبری (ئێرانیک) بەکارهات.

نەخشەی دابەشکردنی زمانە هێندۆئەورووپیەکان

| | | |
|---|---|---|
| هەسی hasi<br>(has+i)<br>he has | کوردی<br>ئینگلیزی | لە ناوچەی سنەو دەوروبەری، کاتێک کە دەگوترێت هەیەتی، دەڵێن هەسی. لە ڕاستیدا ئەو وشەیە لە دووبەش پێک دێت (هەس +ی)، وشەی (هەس) ڕەگی هەبوونە و (ی) ڕاناوە بۆ ئاماژە بە کەسی سێهەمی تاک. لە ئینگلیزیدا دەبێتە he has، وشەی (هەس) ی کوردی دەبێتە has لە ئینگلیزیدا و ڕاناوی (ی) ی کوردی دەبێتە (he) لە ئینگلیزیدا. لەم ڕستە کورتەدا تەنها شوێنی کردار و ڕاناوەکە ئاڵوگۆڕی پێ کراوە دەنا یەکن. |
| he has two bonds<br>du band i has<br>دوو بەندی هەس | ئینگلیزی<br>کوردی | دەبینرێت وەک نموونەکەی ڕابردوو هەمان پەیوەندی دەردەکەوێتەوە؛ جیاوازی نێوان زمانی ئینگلیزی و کوردی تەنها گۆڕانی شوێنی ڕاناو و کردارەکەیە. |
| ha due piedi<br>has two foot<br>du peī haīa<br>دوو پێی هەیە<br>du pei has<br>دوو پێێ هەس | ئیتاڵی<br>ئینگلیزی<br>کوردی | دەبینرێت لەم ڕستەیەدا زمانی ئیتالی و کوردی و ئینگلیزی تەنها شوێنی وشەکانیان گۆڕاون، دەنا دیسان بە نزیکی وەک یەکن. ئەو پەیوەندیە لەم ڕستەیەدا نەک هەر لە نێوان ئەو سێ زمانەدا، بەڵکو لە زمانی ئاڤێستاشدا هەر دەردەکەوێت. وشەی (هە/هەس ha/ha) کە لە کوردیدا بۆ خاوەندارێتی بەکاردێت لە ئیتاڵیدا دەبێتە ha و لە ئاڤێستادا h'a و لە ئینگلزید has. وشەی (پێ) ی کوردی لە ئیتاڵیدا piedi و ئاڤێستادا pâdha و لە ئینگلیزی feet. ژمارە (دوو) ی کوردی لە ئیتاڵیدا دەبێتە due و ئاڤێستا duua ولە ئینگلیزیدا two. |

هەروەها ئەو پەیوەندیە لەچەندین وشەی جیاوازدا باشتر دەردەکەوێت و لە خشتەکەی خوارەوەدا چەندین وشە بە نموونە دەخرێنە پێش چاو:

| کوردی | ئینگلیزی | فەرەنسی | زمانە هیندوئەوروپییەکانی تر | تێبینی |
|---|---|---|---|---|
| خواست<br>xuāst | quest | quête | | |
| ماسولکە<br>māsulka | muscle | muscle | musculus لاتینی | |
| šand,<br>šandin<br>شاند، شاندن<br>(بە مانای<br>ناردن) | send | | senden ئەڵمانی<br>sända سویدی<br>sende نەرویجی و<br>دانیمارکی<br>zenden هۆلەندی | |
| قورگ qurg | gorge | gorge | garganta ئیسپانی و<br>پورتوگالی | |
| غەرغەرە<br>ĝarĝara | gurgle | gargouillis | gurgeln ئەڵمانی | |
| ئاسن/ئاهین<br>āsin/āhīn | iron | | eisen ئەڵمانی | |
| joga جۆگە | gouge | gouge | | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| چەنە cana | chin | | kinn ئەڵمانی | |
| جو (جوین) ju/juīn | chew | chique | kauen ئەڵمانی | |
| قاز qāz | goose | | gås سویدی | |
| ڕێ re | road | rue | | |
| بەند band | band | bande | band ئەڵمانی<br>banda ئیسپانی | |
| پرد pird | bridge | | brug هۆڵەندی | |
| چەقەڵ caqal | jackal | chacal | | |
| گری grī | cry | cri ( بەمانای هاوار) | piangere ئیتالی<br>gråt سویدی | |
| ناو/نام nāu/nām | name | nom | nome ئیتالی<br>naam هۆڵەندی | |
| دۆڵ dol | dale | val | tal ئەڵمانی | |
| مێش meš | | mouche | moscas ئیسپانی | |
| موش/مشک muš/mišk | mice | | mäuse ئەڵمانی<br>moss سویدی | |
| پێیا peīā | pay | paie | | (بە مانای پارە پێدان و بایەخ پێدان) |
| پەپولە papula | | papillon | papilio لاتین<br>papallona کەتەلان<br>borboleta پورتوگالی | |
| مەمە mama | mamilla (مانای گۆی مەمک دەدات) | mamelon (مانای گۆی مەمک دەدات) | mamma لاتینی (مانای مەمک دەدات) | |
| کەرت kart | | | corte پوروتگالی و ئیسپانی<br>kreta سویدی | |
| مارە/مارەیی māraīy | marry | marier | marito لاتین | |
| کوت kut | cut | | | |
| برۆ bro | brow | | | |
| ژن žin | | | žena چیکی و کرواتی | |
| برا brā | brother | | brat کرواتی<br>bruder ئەڵمانی | |
| سور sur (بە مانای تەئکید بوون) | sure | sûr | | |
| سوتو sutu | soot | suie | sot سویدی | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| درووست<br>drust | truth | droit | | |
| ڕاس/ڕاست<br>rās/rāst | right | | rechts ئەڵمانی<br>verus لاتینی | |
| šeua شێوە | shape | | | |
| šuān شوان | shepherd | | schäfer ئەڵمانی | |
| هەنگوین<br>hanguīn | honey | | honig ئەڵمانی<br>honing هۆڵەندی<br>honung سویدی | |
| لێو/لەپ<br>leu/lap | lip | levre | labrum لاتینی<br>labio ئیسپانی | |
| lāq لاق | leg | | lägg سویدی | |
| āu ئاو | | eau | agua ئیسپانی | |
| ažno ئەژنۆ | knee | genou | genoll کەتەلانی،<br>ginocchio ئیتالی | |
| زان<br>zān(ڕەگی<br>زانین) | know | | znati کرواتی،<br>wissen ئەڵمانی<br>znat′ ڕووسی<br>znać پۆلۆنی | |
| tapa تەپە | tap | tapement | | |
| gir گر | grip | | agarro ئیسپانی | بە مانای گرتن |
| ئەگەڕێ<br>agare | | | vagare ئیتالی<br>vagar ئیسپانی | (بەمانای "يتجول"ی<br>عەرەبی) |
| part پەرت | part | partie | parte ئیسپانی،<br>ئیتالی، پۆرتوگالی | |
| pe/pāh پێ/پا | | pied | piede ئیتالی | |
| šak شەک | shake | secousse | skaka سویدی<br>scossa ئیتالی | (ڕەگی وشەی<br>شەکانەوە) |
| tak تەک (بە<br>مانای لە<br>تەنیشت) | touch | | toque ئیسپانی<br>tocco ئیتالی | لەزمانەکانی تردا بە<br>مانای (بەریەک کەوتن)<br>دێت |
| era ئێرە | here | | hier ئەڵمانی و<br>هۆڵەندی<br>här سویدی | |
| deu دێو | demon | démon | | (بڕوانە وشەی "ئاو") |
| kara کەرە | cream | crème | grädde سویدی | |
| āgā ئاگا | wake | | wecken ئەڵمانی | |
| هەراس<br>harās<br>هەراسان<br>harasān | harass | harceler | | |
| duet دوێت | daughter | | dochter هۆڵەندی | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| قورواقه quruāqa | croaker | | | به مانای بۆق |
| گەمە gama | game | | | |
| ڕوبار rubār | river | rivière | لاتینی riparius | |
| ئەستێره astera | star | astre | پورتوگالی estrela<br>لاتینی astri | |
| مانگ māng | moon | | ئەڵمانی mond<br>هۆڵەندی maan | |
| کێ ke | | qui | ئیتاڵی che<br>ئیسپانی quién<br>پۆرتوگالی que<br>لاتین qui | |
| چەندە؟ canda? | | | ئیتاڵی quanto?<br>ئیسپانی cuánto?<br>پورتوگالی quanto? | |
| تۆ/تە to/ta | | toi | ئیسپانی te<br>کرواتی ti | |
| من min | me | moi | کرواتی mene | |
| ئەز az | | | ئەڵمانی ich<br>هۆڵەندی ik<br>دانیمارکی و نەرویجی jeg<br>سویدی jag | |
| پیاسه pīāsa | | | به ئیتاڵی و پورتوگالی passo<br>به ئیسپانی paso | له زمانەکانی تردا به مانای (هەنگاو، هەنگاونان) دێت |
| هێگ heg | egg | | سویدی ägg | |
| ڕێک rek | | recte | لاتینی recta<br>سویدی rekt<br>ئیسپانی recto<br>دانیمارکی recht | |
| سۆنه sona (به مانای مراوی) | swan (به باڵدارێکی گەورەی ئاوی دەڵێن) | cygne | ئەڵمانی schwan<br>دانیمارکی svane<br>سویدی svan<br>هۆڵەندی zwaan | |
| مردن mirden | murder | mort (به مانای مردن و مردو دێت) | ئەڵمانی mord<br>هۆڵەندی moord<br>دانیمارکی mord<br>ئیسپانی muerte | له زمانه هیندۆ ئەورووپیەکانی تردا به مانای کوشتن دێت |
| تار، تاریک tārīk, tār | dark | | لاتینی atra | |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| مات māt (بە مانای ڕەنگێکی بێ شەوق) | matt | mate | ئەڵمانی matt | لە کوردیدا هەمان مانا و مانای کەسێکی زیز و بێ زەوقیش دەدات. |
| kita کتە (پشیلە) | cat | | سویدی katt<br>دانیمارکی kat<br>ئیسپانی gato<br>ئیتاڵی gatto | |
| dān دان | | dent | لاتینی dens<br>ئیتاڵی dente<br>ئەڵمانی zahn | |
| پشت pišt | post ( بەمانای پاش، پاشو دێت) | post ( بەمانای پاش، پاشو دێت) | لاتینی post | |
| سەیر/سەح saīr/sah | see | | سویدی se<br>ئەڵمانی seh<br>هۆڵەندی zie | |
| lec لێچ (ڕەگی لێچوون) | leak | | ئەڵمانی leck<br>هۆڵەندی lek<br>دانیمارکی lække | |
| کاروان kāruān | caravan | caravane | | |
| rag ڕەگ | root | racine | raiz بە ئیسپانی و پۆرتوگالی<br>لاتینی radix<br>ئیتاڵی radice<br>یۆنانی riza | |
| sipil سپڵ | spleen | spleen | ئیسپانی esplín | |
| pān پان | pan | panne | pan بە یۆنانی<br>لاتینی pando | لە کوردیدا مانای پانایی دەدات. لە ئینگلیزیدا وەک پێشگر مانای (هەموو) ی دەگرێتەوە |
| cuān جوان (بە مانای لاو) | juvenile | jeune | ئیتاڵی giovane<br>ئیسپانی joven<br>لاتین iuvenis | |
| haītī هەیتی (هەیەتی) | has | | ئەڵمانی hat<br>هۆڵەندی het | |
| barāz بەراز | boar | verrat | ئیسپانی verraco<br>لاتینی verres | |
| پاساری pāsārī | sparrow | passereau | لاتین passer<br>ئیتاڵی passero | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| نەتەوە nataua | nation | nation | natio لاتینی |
| pārez پارێز (بە مانای پاراستن) | | | praeses لاتینی |
| پارێزگاری pārezgārī | protect | protéger | protežirati کرواتی<br>proteger ئیسپانی و پورتوگالی<br>proteggere ئیتالی |
| pāta پاتە | boot | patin | |
| urc ورچ | | ours | orso ئیتالی<br>urso پورتوگالی |
| rasan ڕەسەن | race | race | razza ئیتالی |
| مرەمر miramir | murmur | murmure (فەرەنسی کۆن) | mormorio ئیتالی<br>murmur لاتین |
| kurt کورت | short | courte | kort سویدی، دانیمارکی، هۆڵەندی و نەرویجی<br>kurz ئەڵمانی<br>curto لاتین و پورتوگالی |
| galī گەلی (جۆگەی نێوان دوو شاخ) | gully | | |
| lo لۆ (ئەو، فلانەکەس بۆ پیاو) | | lui | lui ئیتالی<br>ille لاتین |
| le لێ (ئەو بۆ کچ) | | elle | lei ئیتالی<br>ella ئیسپانی |
| ordu ئۆردو | horde | horde | orda ئیتالی<br>horda ئیسپانی و پۆرتوگالی<br>horde ئەڵمانی |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| تارا tārā | tiara | tiare | tiara ئیسپانی<br>tiara ئیتالی | لە کوردیدا بۆ ئەو پارچە قوماشە رەنگ سورە تەنکە بەکار دێت کە دەدرێت بەسەر بوکدا. لە زمانە ئەوروپیەکاندا بە مانای نزیک و جیاواز دێت. |
| خوگ xug (بەراز) | hog | | | |

هەر وەک لە سەرەتادا باسکرا و بە نموونە روونکرایەوە، لەیەکچوون لە رووی وشەکاری و رێزمانیەوە لە نێوان زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا بە روونی دەبینرێت. ئەم لێکچوونەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە ئەم زمانانە پەیوەندیەکی مێژوویی لە نێوانیاندا هەیە و ئەمرۆ ئەم گروپە زمانیە پێی دەگووترێت زمانە هیندۆئەوروپیەکان. بەڵام هەتا ئێستا سەرچاوەی هۆکارەکانی ئەو پەیوەندی و لەیەکچوونە روون نیە. ئایا دەکرێت هەموو ئەو زمانانە بۆ یەک نەتەوە بگەرێنرێتەوە؟ هەڵبەت مەسەلەی رەچەڵەکی زمانە هیندۆئەوروپیەکان بابەتێکە کە زۆر لایەنی روون نیە. لە کاتێکدا کە پەیوەندی نێوان ئەو زمانانە سەلمێنراوە، بەڵام هیچ بەڵگەیەک نەدۆزراوەتەوە دەربارەی نیشتمانی سەرەتایی ئەم زمانانە.

هەتاوەکو ئەمرۆ زۆربەی زمانەوانەکان کۆکن لەسەر ئەوەی کە کۆنترین زمانی هیندۆئەوروپی لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراستدا هیتیەکانن و ئەو مێژووەش بۆ ١٤٠٠ پ.ز دەگەرێننەوە کە مێژووی دەرکەوتنی دەسەڵاتی هیتیەکانە. هیچ زمانێکی تری کۆنتر لەوان، بە شێوەیەکی جدی نەکەوتۆتە ژێر گومانی ئەوەی کە هیندۆئەوروپی بێت. ئەم بۆچوونە هەتاوەکو ئەمرۆ چەسپیوە و هیچ بەڵگەیەک نەخراوەتە روو کە ئەو روانگەیە رەتبکاتەوە.

بۆچوونەکانی ئەمرۆ سەبارەت بە زمانی کوردی تیۆرین و بەڵگەی روون پاڵپشتیان ناکات و نازانرێت چۆنێتی پرۆسەی گۆران و گەشەکردنی زمانی کوردی بۆ ئەم زمانەی ئەمرۆ چۆن روویداوە. زۆربەی سەرچاوەکان پێیان وایە کە کورد لەگەڵ پەلێک لە نەتەوەی خاوەن زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا هاتووەتە ناوچەکە و زیاتر وا مەزندە دەکەن کە گوایا ئەم نەتەوەیە میدەکانە.

لەبەر ئەوەی کە هیچ تێکستێکی کوردی لە سەدەکانی پێش زاییندا نەدۆزراوەتەوە، دەستنیشانکردنی رەچەڵەک و پرۆسەی گۆرانکاریەکانی زمانی کوردی زۆر ئاڵۆزە. هەندێک لە لێکۆڵەرەکان سەبارەت بە زمانی کوردی، بێ پاڵپشتکردنی تیۆریەکەیان بە بەڵگەی مێژوویی، زمانەوانی یان ئارکیۆلۆژی، دەڵێن گوایا کورد تێکەڵی کۆمەڵێک نەتەوەی زاگرۆسە. بەو جۆرە هێشتا ریشەی زمانی کوردی و مێژووەکەی هەر مایەی مشتومرە.

ئەم بۆشاییە بووەتە هۆی دروستبوونی کۆمەڵێک بۆچوون، کە بوونی کورد تەنانەت لە سەدەکانی ناوەراستیشدا رەت دەکاتەوە. بۆ نموونە مینۆرسکی (مینۆرسکی،٢٠٠٦، پ. ١٤٥) دەڵێت "نوسەرانی دیکەی عەرەب و ئێرانی سەدەی دەهەمی زایینی، کاتێ دەیانگوت "کورد" مەبەستیان هەموو کۆچەرانی ئێرانی رۆژئاوای ئێران بووە، بۆ نموونە، دەوارنیشینەکانی ئوستانی فارس". ئەم بۆچوونەی مینۆرسکی زۆر کتێب وەک سەرچاوە بەکاری دەهێنن و کەسیش پرسیار لە راستی و دروستی ئەم روانگەیە ناکات. هەتاوەکو ئەمرۆش ئەم بۆچوونە لە چەندین کتێبدا دووبارە دەکرێتەوە. کەسێکی وەک O'Shea (2004)، کە دکتۆرای لە بابەتی کورد دا وەرگرتووە، بوونی وڵاتی کوردستان هەتاوەکو مێژوویەکی نزیک وەک وڵات، دەخاتە ژێر گومانەوە. هەندێکی تریش وەک Hennerbichler (2010) رەچەڵەکی کورد دەگەرێننەوە بۆ زیاتر لە ٥٠٠٠ ساڵ.

کێشەکە لەوەدایە کە هەموو بۆچوونە جیاوازەکان، هەتاوەکو رادەیەک زیاتر وەک تیۆری ماونەتەوە و زۆر کەم پشت بە بەڵگەی زمانەوانی و ئارکیۆلۆجی و مێژوویی ناوچەکە دەبەستن. بۆیە جیاوازیەکی زۆر هەیە

لە بۆچوونەکاندا سەبارەت بە مێژوو و ڕەچەڵەکی کورد. مێژوونوسان نەک هەر کۆک نین لەسەر ڕەچەڵەکی کورد بەڵکو بۆچوونەکانیان هەندێک جار تەواو پێچەوانەی یەکترین. لە ئەنجامدا ڕابردووی نەتەوەی کورد بۆ مێژوونوسان و بۆ تاکی کوردیش ناڕوونە و جاری واهەیە مێژووی کورد و کوردستان وەک گاڵتەجاڕی لێ هاتووە.
بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە و بەمەبەستی ڕونکردنەوەی لایەنی زمانەوانی نەتەوەی کورد، هەوڵ دەدرێت لە بەشەکانی داهاتوودا ئاراستەیەکی نوێ بگیرێتەبەر، بە بەراورد کردنی زمانی کوردی لەگەڵ هەموو ئەو زمانانەدا کە بە درێژایی مێژوو لەسەر خاکی کوردستانی ئەمڕۆ و مێسۆپۆتامیا و ئەناتوڵدا ژیاون. لەوانە زمانەکانی میدی، مانی، هوری، سۆمەری، هیتی، ئاڤێستا، لوڤی، کاری، سراسی و لیدی و هەندێک زمانی تریش کە پەیوەندیان بە زمانی کوردیەوە هەیە. بە مەبەستی ئەوەی کە بزانرێت ئایا ئەو شوێنەی کە لە نەخشەی دابەشکردنی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا بۆ زمانی کوردی دانراوە، شوێنێکی دروستە. لە هەمان کاتیشدا بۆ ووردبوونەوە لە مێژووی زمانە هێندۆئەورووپیەکان، سەیری پەیوەندی ئەو زمانە دێرینانە لەگەڵ یەکتری و زمانە هیندۆئەورووپیە نوێکاندا دەکرێت. شانبەشانی ئەو هەوڵە و بە متمانە بە بەڵگە مێژوویی و ئارکیلۆژیەکان پەیوەندی مێژوویی ئەو گروپانە بە نەتەوەی کوردەوە سەیر دەکرێت.

# میدەکان

**ناوی میدەکان:**

لە نزیکی سەدەی نۆهەمی پێش زایینەوە ئاشوریەکان ئاماژە بە خەڵکانێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوچەکانی دەسەڵاتیان دەکەن بە ناوی mada (مادا). وشەی (مادا Mada) لە زمانە زاگرۆسی (ئێرانی) ەکاندا مانای (مەزن، گەورە) دەدات، بەڵام بەپێی فەرهەنگی زمانە زاگرۆسی (ئێرانی) مکان لە زمانی میدی خۆیدا وشەکانی (Mada) و (Masa) هەمان مانایان هەیە (Tavernier, 2007, 558). هەروەها لە کارنامەی ئەردشیری پاپەگاندا، میدەکان بە ماسی (Masi) ناوبراون (وەهبی، ٢٠٠٦، پ.١٧) کە دیسان لە ناوە میدەکە خۆی نزیکە. جگە لەوە لە تێکستی ئاشوریەکاندا کە باسی میدەکان دەکەن جگە لە ناوی مید خۆی بە "خەڵکە بەهێزەکان" یش ناویان هێناون (Diankonoff, 1985, p.75)، هەروەها دوای هاتنی ئیسلامیش، سەنتەری دەسەڵاتی میدەکان بە (ماهات (ماه+ات))[3] ناو دەهێنرا، براون پێی وایە کە (ماه mah ) ی سەردەمی ئیسلام هەر هەمان ناوە بۆ میدەکان (Browne, 1919, p.19).

وەک لەسەرەوە خرایە ڕوو، هەرچەندە ناوی میدەکان بەشێوەی جیاوازی وەک ([4]Mada, Masi, Mahi) دەردەکەوێت، بەڵام ناوەکان هەر هەمان مانا یاخود مانایەکی نزیک و بە شێوەیەکی لەیەکچوو دەردەکەون. لەوە دەچێت کە میدەکان بە خۆیان گوتبێت (مەسە Masa) لەبەر ئەوەی بە زمانی میدی ئەو وشەیە مانای (گەورە، پایەبەرز) دەدات (بڕوانە فەرهەنگی میدی). شایانی باسە کە بە سۆمەری massu بە مانای سەرکردە و mes بە مانای پاڵەوان دێت. بە زمانی لوڤی masana بە مانای خوا و mashani بە مانای مەزن کردن دێت. هەروەها لە ئاوێستادا masan بە مانای مەزن دێت و لە کوردی نوێدا (مەس، مەزن) هەردووکیان هەمان مانایان هەیە.

---

[3]. بەلازەری (البلاذري) لە کتێبی (فتوح البلدان، ٢٠١٠، پ.٣٧٥) دا دەڵێت کە عەرەبەکان هاتنە ناوچەکە و دەسەڵاتیان گرتە دەست، هەندێک لە ناوچەکانیان کردە چەند بەشێکەوە و باجی هەریەک لەو ناوچانە بۆ ئیسلامەکانی ناوچە جیاجیاکان دەچوو. بۆیە بە دینەوەر و دەروبەریان دەگووت (ماه الکوفة) کە باجەکەی بۆ موسوڵمانە تازە هاتووە کوفیەکان دەچوو. هەروەها بە نەهاوەند و دەروبەری دەگووترا (ماه البصرة) کە باجەکەی بۆ موسوڵمانە تازە هاتووەکانی بەسرە دەچوو و سەنتەری وڵاتی میدەکان دابەشکرا بەسەر موسوڵمانەکاندا و (میدیای کوفە) و (میدیای بەسرە) ی لێ ناونرا. وەک دەردەکەوێت عەرەبەکان ناوچەی میدەکانیان بە کۆ داناوە بۆیە بە (ماه+ات) ناوی دەبەن.

[4]. زیاتر وا دەردەکەوێت کە میدەکان بە خۆیان گووتبێت ماسا/مەسە (Masa) و وەک ئاماژەی پێکرا لە (کارنامەی ئەردشیری پاپەگان) دا کە بە زمانی پەهلەوی نووسراوە، بە (ماسی) باس کراون، هەرچەندە پیتی (س) ی میدی دەبێتە (ها) لە زمانی پەهلەویدا، بەڵام دیارە ئەوان ناوە دروستەکەی میدەکان خۆیانیان لەو تێکستەدا بەکارهێناوە. دەبێت ئەوە بزانرێت کە هەندێک پیتی (س) ی کوردی و سۆمەری لە زاراوە کوردیەکان و زمانی ناوچەکانی خوار و ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا دەبنە (ها). بۆ نموونە (ماسی) ی کوردی لە پەهلەویدا دەبێتە māhig و (ئاسن) کە لە ئەڵمانیشدا هاوشێوەی کوردیە و دەبێتە eisen لە پەهلەویدا دەبێتە āhan؛ ئەم دیاردەیە لە زاراوە کوردیەکانی ڕۆژهەڵاتیشدا ڕەنگدەداتەوە. بەوجۆرە ناوی میدەکان کە هەتاوەکو سەدەی دوانزەهەمی زایینی لەسەرچاوە ئیسلامیەکان بۆ ئاماژەکردن بە وڵاتەکەیان بە (ماە) باسکراوە و عەرەبەکان کردویانەتە کۆ و بە (ماهات) ناویان هێناوە، لە بنەچەدا ناوەکە پەهلەویە و عەرەبەکان لە زمانی پەهلەوی وەریان گرتووە بۆ ئاماژەکردن بە وڵاتی میدەکان، لەبەر ئەوەی لەکاتی هاتنی عەرەبەکاندا هێشتا لە هەندێک ناوچەدا زۆر لە تێکستەکان پەهلەوی بوون و ئەو زمانە هێشتا وەک زمانی نووسین بەکار دەهات؛ بۆیە مەرج نیە خەڵکەکە لە زمانی ڕۆژانە و قسەکردندا هەر هەمان ناویان بۆ ئەو ناوچەیە بەکارهێنابێت. بەڵام لەبەر هۆکاری زاڵبوون و بەکارهێنانی زمانی پەهلەوی لە نووسیندا، شێوە پەهلەویەکەی لە سەردەمی ئیسلامیدا بەکارهاتووە. دەبێت ئەوەش بزانرێت کە وشەی masa ی میدی/کوردی/سۆمەری کە مانای مەزن دەدا و ناوی میدەکان بووە لە زمانی پەهلەویدا دەبێتە meh، کە ئەوە دیسان پشتگیری لەو بۆچوونە دەکات.

**ڕەگەزی میدەکان:**
ئەمڕۆ کۆمەڵێک بۆچوونی گشتی سەبارەت بە میدەکان هەیە کە لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا قبوڵکراون و بە ڕاستیەکی مێژوویی سەیر دەکرێن. گوایا وەکو بەشێک لە کۆچی نەتەوە ئاریەکان یان هیندۆئەوروپیەکان، فارسەکان و میدەکان بەیەکەوە هاتونەتە ناوچەکە. میدەکان بە سەرەتای شەپۆلێک لە نەتەوەی نوێ دادەنرێن کە لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا ڕویان کردبێتە ئەو دەڤەرە و لە سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا توانیویانە لەگەڵ بابلیەکاندا دەسەڵاتی ئاشوریەکان بۆ هەتایی کۆتایی پێ بهێنن. سەرەتا فارسەکان لە ژێر دەستی میدەکاندا بوون و دوایی فارسەکان توانیویانە، لە کۆتایی سەدەی شەشەمی زاییندا، دەسەڵاتی پاشای پاشاکان لە میدەکان وەربگرن و کۆتایی بە دەسەڵاتیان بهێنن.

(وێنەی ١) پیاوێکی میدی، بە کەلوپەلەکانی دەستیەوە وەک موغێک دەردەکەوێت.

ئەو بۆچوونانەی باسکران وەک جۆرێک لە ڕاستی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت و هەتاوەکو ئێستا میدەکان بە نەتەوەیەک سەیر کراون کە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتوونەتە ناوچەی کوردستانی ئەمڕۆ. هەڵبەت ئەم بۆچوونەش لەسەر بناغەی تیۆری ئاریەکان دانراوە کە لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا، میدەکان بە بەشێک لە نەتەوە ئاریە سەرەتاییەکە دادەنرێت و لای زۆر لەوانەی کە بە توندی بڕوایان بەو تیۆریە هەیە، ئەم نەتەوەیە مانایەکی زۆر گرنگ و ئەفسانەیی پێ دراوە.
بەڵام بۆ ئەوەی کە ئەو بۆچوونە بسەلمێنرێت، بێ گومان پێویستی بە بەڵگەی ئارکیۆلۆژی و مێژوویی هەیە کە لە ڕێگای چەند وشەیەکیشەوە بێت بتوانرێت لە تێکستە دێرینەکاندا ئاماژە بە هاتنی میدەکان بکرێت. لەبەر ئەوەی کە میدەکان نەتەوەیەکی هێندە بەهێز بوون، زۆر زەحمەتە کە گەلێکی وا گەورە هاتبنە ناوچەکە و پاشماوەی ئارکیۆلۆژی و مێژوویی هاتنیان نەمابێت.
کەچی سەرەڕای قبوڵکردنی ئەو تیۆریەی سەرەوە، هەتاوەکو ئەمڕۆ جگە لە ڕوانگە و بۆچوون و لێکدانەوەی مێژوونوسەکان خۆیان، بەڵگەیەک نەخراوەتە ڕوو کە ئاماژە بە هاتنی میدەکان بۆ ناوچەکە بکات.
نە بوونی هیچ بەڵگەیەکی ئارکیۆلۆژی یان مێژوویی، پرسیارێکی ڕەوا لە مێشکی مرۆڤدا دروست دەکات؛ ئایا دەشێت کە میدەکان خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بووبێتن و ئەو تیۆریانەی سەرەوە هەمووی بێ مانا دەربچن؟ چونکە ئەگەر سەیری سەرچاوە مێژوویەکان بکرێت، ئەوا بەڵگە مێژوویەکان و دەرئەنجامەکان،

ئەو بۆچوونانە بەدرۆدەخەنەوە کە میدەکان لەدەرەوەی ناوچەکەوە هاتبن، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەیسەلمێنن کە ئەوان خەڵکی ڕەسەنی میسۆپتامیا بوون.

دەبینرێت کە لەسەرچاوە ئاشوریەکاندا میدەکان زۆر جار بە گوتی ناو دەبرێن. بۆ نمونە یەکێک لە خێڵە میدەکان کە هیرۆدۆت بە میدی باسی کردوە و ناوی باودی (Boudii) بووە، سەدان ساڵ پێش هیرۆدۆت لە سەرچاوە ئاشوریەکاندا بە ناوی بودی (Budi) ی و بە خێڵێکی گوتی باسکراوە، دیاکۆنۆف-یش وای بۆدەچێت کە ڕەنگە ئەو دوو ناوە ئاماژە بن بە هەمان خەڵک (Diakonoff, 1985, p.78). هەروەها یەکێک لە مێژوونووسە بابلیەکان کە زۆربەی مێژووی ناوچەی بابل ومێسۆپۆتامیای نووسیوەتەوە، کە ناوی بیرۆسوس (Berosus)[5] بووە و لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا ژیاوە، کاتێک کە مێژووی سەرەتای دروستبوونی مرۆڤ و دوایی مێژووی بابل دەگێڕێتەوە، ئەو ڕابردووە دەگەڕێنێتەوە بۆ زیاتر لە سێ هەزار ساڵ پ.ز. ئەم مێژوونوسە دەڵێت کە لە سەرەتای حوکمڕانی بابلدا میدەکان دەسەڵاتدار بوون و لە کۆی هەشتا و شەش پاشای ئەو وڵاتە، هەشتا و چواریان لە میدەکان بوون وتەنها دوانیان کلدانی بوون. هەروەها بیرۆسوس دەڵێت کە دوای حوکمڕانیکردنی ئەو دەستەیە دیسان میدەکان بابلیان گرتەوە و دەستەی دووهەمی حوکمڕانەکان مید بوون کە هەشت پاشایان حوکمڕانیان بۆ ماوەی ٢٢٤ ساڵ گرتبووە دەست (Lewis, 1862, p.403) (Niebuhr, 1852, p.241).

بێ گومان ئەم نوسینانەی بیرۆسوس زۆر جیاواز و نەگونجاون لەگەڵ ئەو بۆچوونەی ئەمڕۆ کە سەبارەت بە میدەکان هەیە؛ کە گوایە لە هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا هاتوونەتە ناوچەکە. لەبەر ئەوەی کە ئەو بەڵگانە دەریدەخەن میدەکان لە سەرەتای شارستانیەتی بابلدا کۆنترین حوکمڕان بوون و بەر لە هەزارەی سێهەمی پێش زاین لە بابلدا حوکمیان کردووە. ئەمەش دەیسەلمێنێت کە میدەکان خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بوون. چونکە ئەو بەڵگانە دەریدەخەن کە هەزاران ساڵ پێش نەتەوە سامیەکان میدەکان حوکمی بابلیان کردووە و دەسەڵاتداری ئەو شارە بوون. ڕاولنسن لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە میدەکان تێبینی ئەو نەگونجانە دەکات بێ ئەوەی کە بگاتە دەرئەنجامێکی روون و لێکدانەوەیەک بۆ ئەو جیاوازیە (Rawlinson, 1865, 159).

جگە لە بیرۆسوس، لە هیچ تۆمارێکی مێژوویی نوێدا کە لەم دوو سەد ساڵەدا نووسراوە، ئاماژە بەوە نەکراوە کە میدەکان بەر لە سێ هەزار ساڵ لە پێش زاییندا بابل و ناوچەکەیان بەدەستەوە بووبێت. هەروەها ئەوەی کە جێی سەرنجە، بیرۆسوس باسی دوو دەستەی حوکمڕانی میدی دەکات کە حوکمڕانی بابل بوون و لەیەکتریان جوادا دەکاتەوە و دەڵێت دەستەی دووهەمی پاشا میدیەکان هەشت دانە بوون و بۆ ماوەی ٢٢٤ ساڵ حوکمڕانیان کردووە.

بیرۆسوس، کە خۆی کلدانی و بابلی بووە و مێژوونوسیش بووە، بەبێ بناغە ئەو بۆچونانەی نەگووتووە. ئەو خۆی پێشڕەوێکی ئاینی بابل بووە و دەستی بە بەڵگەنامە مێژویەکانی بابل گەیشتووە، بە دڵنیایی پەیڕەوی تۆماری مێژوویی بابلیەکانی کردووە. جگە لەوە بۆ لێکۆڵەران، بیرۆسوس بەوە ناسراوە کە زانیاری ڕەچەڵەکی بابلی گوێزاوەتەوە بۆ ناو یۆنانیەکان (Encyclopaedia Britannica, 2011)، ئەمەش دەیسەلمێنێت کە بیرۆسوس بە بێ بنەما ئەو ڕابوردوەی نەنوسیوە.

دیارە کە بیرۆسوس ئاماژە بە تۆمارێکی مێژوو دەکات و سەرچاوەیەکی هەبووە کە ئەو زانیاریانەی لێوە وەرگرتبێت. لە کاتێکدا کە سەرچاوەی مێژوویی سەبارەت بە هاتنی میدەکان نیە، بەڵام ئەو بەڵگانەی کە ئەمڕۆ لەبەردەستدایە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکەنەوە کە سۆمەریەکان لە سەرەتادا حوکمڕانی بابل بوون، دوایی ئەکەدیەکان بابلیان گرت، بەڵام پاش ماوەیەک گوتیەکان هاتن و ناوچەکەیان گرت و بۆ ماوەی ٢٢٠

[5]. بیرۆسوس (Berosus) پیاوێکی کلدانی ئاینی پەرستگەکانی بابل بووە و زمانی یۆنانی زانیوە. ئەم مێژوونوسە لە سێ بەشدا مێژوو و فەرهەنگی بابلی بە یۆنانی نووسیوە و پێشکەشی ئەنتیۆخۆسی پاشای سەلوسی کردووە. تێکستی کتێبەکەی بیرۆسوس نەماوە، بەشەکانی کتێبەکەی لەلایەن مێژوو نووسە یۆنانی و ڕۆمانەکانەوە وەک سەرچاوە بەکارهاتووە. بیرۆسوس بە یەکێک لەو کەسانە دادەنرێت کە مێژووی بابلی گوێزاوەتەوە بۆ ناو یۆنانەکان (Encyclopaedia Britannica, 2011).

ساڵ حوکمیان کرد. لە خشتەکەی داهاتوودا تۆماری سۆمەری و بۆچوونی بیرۆسوس بۆ مەبەستی بەراوردکردن خراونەتە ڕوو:

| [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|
| سۆمەریەکان کۆنترین حوکمرانی بابل بوون و لە پێش هەزارەی سێهەمەوە حوکمرانی ناوچەکەیان دەکرد هەتاوەکو هاتنی ئەکەدیەکان | میدیەکان کۆنترین حوکمرانی بابل بوون ٨٤ لە پاشاکانیان حوکمرانی بابلیان کردووە. | گومان لەوەدا نیە کە بیرۆسوس، میدەکان و سۆمەریەکانی بە یەک نەتەوە داناوە. بۆیە سەرەتای حوکمرانی بابلی بە میدی داناوە. |
| ئەکەدیەکان لە نێوان ٢٣٦٠ پ.ز.-٢١٨٠ پ.ز حوکمرانیان کردووە. | لە ٨٦ پاشای حوکمرانی بابل، تەنها ٢ لەوانە کلدانی بوون و ئەوانەی تریان میدی بوو. | وا دەردەکەوێت کە بیرۆسوس ئەکەدی و کلدانیەکان کە هەردووکیان دوو نەتەوەی سامی بوون، بە یەک نەتەوەی لە قەڵەم داون و تەنها حوکمرانی دوو پاشاکانی وەک سەنحاریب و نارام سینی ئەکەدی بە حوکمرانی تەواوی ناوچەکە داناوە. |
| گوتیەکان بابلیان لە ٢١٨٠ پ.ز گرت و دوایی سەردەمی بوژانەوەی سۆمەریەکان هاتە کایەوە، کە هەتاوەکو ١٩٦٠پ.ز حوکمرانیان بەردەوام بوو، کە نزیکی ٢٢٠ ساڵ دەکات. | میدەکان لە پێش هەزارەی دووهەمی پێش زایینداد بابلیان گرت و بۆ ماوەی ٢٢٤ ساڵ حوکمرانیان کرد. | بەپێی تۆماری سۆمەریەکان کۆی ماوەی حوکمرانی هەردوو گوتیەکان و بوژانەوەی سۆمەریەکان نزیکی ٢٢٠ ساڵ بووە، کە تەنها ٤ ساڵ جیاوازە لەگەڵ بۆچوونی بیرۆسوسدا کە پێی وایە میدەکان بابلیان گرت و بۆ ماوەی ٢٢٤ ساڵ حوکمرانیان کرد. کە ئەوە دیسان دەیسەلمێنێت کە بیرۆسوس هەردوو بوژانەوەی سۆمەریەکان و گوتیەکانی بە مید داناوە. |

بۆیە کە بیرۆسوس حوکمی میدەکان دەگەڕێنێتەوە بۆ بەر لە هەزارەی سێهەمی پێش زایین و دوایی هاتنەوەی میدەکان باس دەکات، لە ڕاستیدا ئەو سەردەمەی ئەو باسی لێوە دەکات، سەردەمی سۆمەریەکان و دوایی هاتنی گوتیەکانە. دەبینرێت کە بیرۆسوس هەرچەندە بە دوو دەستەی حوکمرانی جیاوازی میدی دایناون، بەڵام هەردووکیانی بە یەک نەتەوە داناوە. جیاکردنەوەی دوو دەستەی حوکمڕانە میدەکان و ناوهێنانی هەردووکیشان بە میدی، شتێکی ئاسایی نیە. لە کاتێکدا کە هەردووکیان میدی بووبێتن، بۆچی دوو دەستەی جیاواز بن؟

بە دڵنیایی ئەو ٢٢٤ ساڵەی کە بیرۆسوس وەک ماوەی حوکمرانی دەستەی دووهەمی پاشاکان، باسی لێوە دەکات ، وا دەردەکەوێت کە ئاماژە بێت بۆ کۆی ماوەی حوکمرانی گوتیەکان و دوایی دامەزراندنەوەی سۆمەریەکان کە بە (بوژانەوەی سۆمەریەکان Sumerian Renicance) ناسراوە. لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ مێژووی هاتنی گوتیەکان لە نێوان (٢١٨٠پ.ز- ٢٠٧٠پ.ز)[6] و بوژانەوەی سۆمەریەکان لە نێوان (٢٠٧٠پ.ز-١٩٦٠پ.ز) دەخەمڵێنترێت (Elwell and Beitzel, 1988, p.48) کە بە هەمووی دەکاتە ٢٢٠ ساڵ و لەگەڵ بۆچوونەکانی بیرۆسوسدا تەنها چوار ساڵ جیاوازە کە ئەو بە ٢٢٤ ساڵی داناوە.

[6]. هەندێک سەرچاوە بە ٢١٥٠ پ.ز دادەنێ بەڵام جیاوازیەکە زۆر نیە.

**چاکردنەوەی هەڵەی چاپ**

**تکایە ناوی پاشای مید گۆبریار (Gobryar) لە پەڕەکانی 15، 17 و 22 دا ڕاست بکەرەوە و بیگۆڕە بۆ گۆبریاس (Gobryas)**

ئەمەش دیسانەوە ئەو راستیە دووبارە دەکاتەوە کە بابلیەکان لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا میدەکان و گوتەکان و سۆمەریەکانیان بە یەک نەتەوە سەیر کردووە. بێگومان ئەوەش دەیسەلمێنێت کە لە یەکچوونی زمانی سۆمەری و میدی و کوردی و زمانەکانی تر هەر لە خۆیەوە نەهاتووە و مێژوو نوسان لە ڕابردوودا دەرکیان پێ کردووە. هەروەها کورد خۆشی بەڕوونی هەتاوەکو سەدەی نۆهەمی زاینیش خۆی بە میراتگری یەکەم پاشای سۆمەری زانیوە کە بە زیوسودرا ناسراوە (بڕوانە سۆمەریەکان). تەنانەت ئەگەر سەرنجی (وێنەی ١) بدرێت کە پیاوێکی موغی میدیە و بەراورد بکرێت لەگەڵ (وێنەی ١٣) کە یەکێک لە بونەوەرە ئەفسانەییە سۆمەریەکانە کە لای سۆمەریەکان بە سەرچاوەی زانستی خۆیان دانراون، دەبینرێت هەردووکیان هەر هەمان کەلوپەلیان بە دەستەوەیە.

بە داخەوە هیچ کام لە بەرهەمەکانی بیرۆسوس نەماون، بەڵام زۆر لە سەرچاوە مێژووییە یۆنانی و ڕۆمانیە کۆنەکان ئاماژەیان پێ کردووە. پێدەچێت کە بیرۆسوس لەبەر ئەوەی کە کتێبەکەی بۆ یۆنانیەکان نووسیوە و یۆنانیەکانیش بەهۆی نوێ بوونیان لە ناوچەکەدا، هەر تەنها ئاشنای مید بوون کە لەو سەردەمەدا دەسەڵاتی بەهێزی کورد بوون، ڕابردووی بابلی هەر بە میدی لەقەڵەم داوە. واتا لەبەر ئەوەی کە لە ڕوی نەتەوەییەوە هەر بە یەک نەتەوەی زانیون، بەلایەوە گرنگ نەبووە کە بە میدی باسی هەموویان بکات. هەروەها وەک پێشتریش باسکرا، ئەمانە هەمووی ڕاستیەکی تر دەسەلمێنن، کە میدەکان نەتەوە نەبوون بەڵکو بنەماڵەیەکی حوکمڕانی کورد بوون. لەبەر ئەوەی کە بابلیەکان زۆربەی جار ناوی نەتەوەیان بەکارهێناوە، نەک ناوی بنەماڵە[7]، بۆیە زۆرجار لەبری میدی دەڵێن گوتی. هەر لەبەر هەمان هۆ پەیوەندی زمانەوانی نێوان سۆمەری و گوتی و میدیان لە یەک نەتەوەدا بینیوەتەوە و بیرۆسوس بە هەڵەی نەزانیوە کە هەموویان بە مید ناو بەرێت. ئەمەش لە تۆمارکردنی هاتنی پاشای میدیدا بۆ ناو بابل بە ئاشکرا دەبینرێت. کاتێک کە پاشای فارس بڕیاری داگیرکردنی بابلی دا، سەرەتا داوای لە پاشای مید کرد کە بچێتە ناو بابلەوە و ئەو پاشایە کە لە تۆماری یۆنان و فارسەکاندا بە میدی لە قەڵەم دراوە و ناوی گۆبریار (Gobryar) بووە، لەلایەن بابلیەکان خۆیانەوە بە پاشای گوتی تۆمارکراوە (Horner, 1901). لەلایەن جومەکانیش هەر بە مید لە قەڵەم دراوە.

جگە لەوانەش هیرۆدۆت لە ئاماژە کردنیدا بە میدەکان دەڵێت "میدەکان لە سەردەمی کۆندا، هەموو خەڵک پێی دەگووتن ئاری" (Herodotus, 1860, p.61). دەبێت ئەم ناوە بە وریایی لێکدانەوەی بۆ بکرێت. زۆر جار یۆنان و ڕۆمانەکان پیتی (ها) دەکەنە (ئەلف). بۆ نموونە هەزبانیەکان کە هەولێریان حوکم دەکرد لەلایەن یۆنان و ڕۆمانەکانەوە ناوەکەیان بە شێوەی (ئەدیابان Adiabene) دەنووسرا و هەروەها لێکۆڵەرێکی وەک دیاکۆنۆف سەرنجی داوە کە ناوی وەک (هاریا Haria) کە ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی میدی بووە، لەلایەن یۆنانەکانەوە کراوەتە (ئاریا Aria) (Diakonoff, 1985, p.127). لەبەر ئەوە ئەگەرێکی زۆر هەیە کە ناوەکە خۆی (هوری/هۆریا) بووبێت و هیرۆدۆت کردبێتیە (ئاری) و میدەکان لە ڕابردوودا بە خۆیان گووتبێت (هوری). لە کوردیدا (هوری) دەبێتە (خۆری) و مانای ئەو وشەیەش لە کوردیدا دەبێتە (خۆر پەرست، ئەو کەسەی کە لە خۆرەوە هاتووە). زۆر ئەگەری ئەوە هەیە کە میدەکان بنەماڵەیەکی هوری حوکمڕان بووبێتن و لەلایەن نەتەوە سامیەکانەوە، ئەم بنەماڵانە یان ئەم خێڵانە هەموویان بە یەک نەتەوە سەیر کراون، بۆیە سۆمەری و گوتی و هوری و میدی تێکەڵ کراون. جا هەرچەندە لە دوای هەزارەی یەکەمی زاینەوە، بەڵگەنامەی خەڵکی ناوچەکە زۆر دەگمەنن، بەڵام یەکێک لەو بەڵگەنامە دەگمەنانە، کارنامەی ئەردەشیری پاپەگانە (Karname Ardashir Papagan) کە بە زمانی پەهلەوی و لە نزیکی سەدەی شەشەمی زاییندا نوسراوە. بەڵگەنامەکە باسی یەکەم شەڕی ئەردەشیری

[7]. لەگەڵ ئەوەی کە هەزبانیەکان بنەماڵە و خێڵێکی گەورەی کورد بوون، بەڵام هەمیشە یۆنان و ڕۆمانەکان بە نەتەوە لە قەڵەمیان داون. هەمان ئەو هەزبانیانە بوون کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە هەتاوەکو نزیکی سەدەی دوانزەهەمی زایین، دەسەڵاتی ناوچەی هەولێر و دەوروبەریان بە دەستەوە بووە و تیرەی ڕەوەندی سەلاحەدین بەشێک بووە لە خێڵی هەزبانیەکان. هەروەها زۆر لە پاشاکانیان جگە لە ناوی هەزبانی ناوی کوردیشیان دەخستە سەر ناوەکانیان. بە هەمان شێوە ئەوەی کە بابلیەکان بە گوت/کورد ناویان هێناوە، یۆنان و ڕۆمانەکان بە میدی ناویان هێناوە.

پاپەگان دەکات، لە سەدەی سێهەمی زاییندا، لەگەڵ پاشای کورد دا ڕویداوە و دەڵێت : "ئەردەشیر دوای ئەوەی کە ئەردەوانی پێنجەمی پاشای ئەشکانی (پارت) یەکانی کوشت، سوپایەکی گەورەی لە زابۆل کۆکردەوە و چوو بۆ جەنگ لەگەڵ پاشای میدی کوردان (کردان شاهی ماسی) (وەبی، ٢٠٠٦، پ.١٧)"[8].
لەو بەڵگەنامەیەدا دەبینرێت کە پرۆسەی گۆڕینی ناوەکە لە گوت/مید گۆڕا بۆ کورد/مید.
لە سەرچاوە ئەرمەنیەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا ئاماژە بە کورد دەکرێت وەک "خێڵە میدیەکان" و لە تێکستێکدا هاتووە "من باسی ئەو خێڵە میدیانە ناکەم کە لە کوردن" (Asatrian, 2009, P.21 & 22)[9].
تەنانەت هەندێک لە تێکستە کوردیەکانیش لەلای ئەرمەنیەکان لە ژێر ناوی مید دا دانراون (بڕوانە زمانی میدەکان). دەبینرێت لە دوای سەدەی سێهەمی زاینەوە سەرچاوەکانی خەڵکی ناوچەکە، گوتیان کردۆتە کورد و لە سەرچاوە ئەرمەنیەکانیشدا بە هەمان شێوە لە بری گوت، کورد و میدیان بەکارهێناوە. لە ڕاستیدا لەوانەیە پێشتریش ئەو بۆچوونە هەبووبێت، بەڵام هیچ شتێک لە میدەکان نەدۆزراوەتەوە هەتاوەکو بزانرێت کە میدەکان خۆیان بە کێ زانیوە.
ناوی میدەکان دوای هاتنی ئیسلامیش و هەتاوەکو سەدەکانی ناوەڕاست هەر لە ناوچەکانی کرماشان و هەمەدان و دینەوەر مابوو. ئەو ناوچانە بە ماهی کوفە و ماهی بەسرە ناسرابوون (بڕوانە جوگرافیای میدیا).
وەک باسکرا مید هەرگیز نەتەوە نەبووە، بەڵکو لەلایەن یۆنانیەکانەوە بە نەتەوە سەیر کراوە. بۆ نموونە ئەگەر سەیری ناوی فارسەکان بکەین، دەبینین فارسەکان خۆیان لە ژێر ناوی هەخامەنی و نەتەوەی فارسدا باسکردوە، کە ئەخامەنی بنەماڵەی حوکمڕان و فارس نەتەوەکە بووە. بەڵام بە پێی سەرچاوە یۆنانیەکان بێت، میدەکان هەر مید بوون و هیچی تر کە ئەمە لەگەڵ سیستمی ئەو سەردەمەدا ناگونجێت. هەر بۆیەش بابلی و ئاشوریەکان کە بەردەوام مامەڵەی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ میدەکان هەبووە، مید و گوتیان تێکەڵ کردووە و دوایی لە سەرچاوەی پەهلەوی و ئەرمەنیدا، مید و کورد تێکەڵ کراوە. ئەمەش لۆجیکێکی ڕاستە و وەکو ئەوەیە کە لە بری ئەوەی بگووترێت عوسمانیەکان، بڵێی تورکەکان. جا هەرچەندە کە هەردوو ناوەکە جیاوازن، بەڵام ڕاستن و دەتوانرێت بەکاربهێنرێن و لە مێژووشدا بەکارهێنراوە. لە ڕاستیدا چۆن ئەخامەنیەکان فارس بوون و بنەماڵەی حوکمڕانی نەتەوەی فارس بوون، بە هەمان شێوە، میدەکان بنەماڵەی حوکمڕانی کورد/گوتی بوون. بۆیە میدەکان بۆ کورد، وەک عوسمانیەکان بوون بۆ تورک یان زەندیەکان بۆ کورد، ئەردەلانیەکان بۆ کورد، بەدرخانیەکان بۆ کورد.
هۆکارەکەشی ئەوەیە کە کوردستان لە پێش هەزارەی یەکەمی پ.ز و پێشترەوە، سیستمی کۆمەڵایەتی گۆڕاوە و بە شێوەی چینایەتی بووە و چینی حوکمڕان و پیاوە ئاینیەکان، خۆیان لە ڕووی ناویشەوە بە تەواوی لە خەڵکی ئاسایی جیا کردۆتەوە. هەر ئەمەشە کە بووەتە هۆکاری ئەوەی کە موغەکان بە خێڵێکی میدی دابنرێن. زۆر جار ئەم دیاردەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە مێژوونوسان نەتوانن مێژووی گوتیەکان

---

[8]. تۆفیق وەهبی ناوەکەی لە سەرچاوە پەهلەویەکە وەریگرتووە و وەک خۆی دایناوە. لە تەرجومە ئینگلیزیەکەی کارنامەی ئەردەشیری پاپەگاندا کە هۆرن (Horne) پێی هەستاوە، موتەرجیم تووشی هەڵەیەک بووە و تەرجومەی کردووە بە "Madig, the King of the Kurds" (Horne, 1917, p. 235). پێ دەچێت موتەرجیم ویستبێتی بڵێت "The Madic king of the Kurds" کە لەوێدا هاوشێوەی وشەی Germanic وشەکە دەبێتە ناوی میدەکان و تەرجومەکە دروست دەکات. هەرچۆنێک بێت، ئەم هەڵەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەمڕۆ زۆربەی سەرچاوەکان کە لەو تەرجومە ئینگلزیەوە وەرگیراوە، لە بری "پاشای میدی کوردان" دەڵێن "مادیگی پاشای کوردان" کە ئەمە بابەتە مێژووییەکە بە تەواوی دەگۆڕێت. لەبری ئەوەی بگووترێت پاشای میدی، ناوی پاشاکە بە "مادیگ" ناو دەبات. بەپێی ئەوەی کە تۆفیق وەهبی زانیاریەکەی ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە پەهلەویەکەوە وەرگرتووە، زانیاریەکەی ئەو دروست ترە. جگە لەوەش لە بەشی بنەچەی ناوی میدەکاندا باسکرا وشەی (ماسا) هەمان مانای (مادا) دەدات لە زمانی میدیدا کە ماناکەشی دەبێتە (گەورە، پایەبەرز)، کەواتە ئەوە ئەو ڕاستیە جارێکی تر دەسەلمێنێت. هەروەها سەرچاوەیەکی دێرینی کریستیانی لە ژێر ناوی The Chronicle of Arbela، ئەوە دوویات دەکاتەوە کە لە کاتی بەهێزبوونی ئەردەشیری ساسانیدا، پاشای مید هەر هێشتا دەسەڵاتدار بووە. سەرەتا ئەو پاشایە هاوپەیمانی ئەردەشیر بووە شانبەشانی پاشای هەزەبان و کەرکوک (Karwerau and Kroll, 1985, p.16 and 17) کە ئەوەش دیسان پشتگیری لەو ڕاستیە دەکاتەوە.

[9]. لێکۆڵەر ئاساتریان، سەرەڕای دەرخستنی ئەو هەموو زانیاریانە لە لێکۆڵینەوەکەیدا، بەڵام پێی وا نیە کە میدی کورد بێت، لەسەر بناغەی ئەوەی کە ئەم هەموو بەڵگانە تەنها یادەوەری ئەرمەنیەکانە لەگەڵ میدەکان کە جاران لە شوێنی کوردەکاندا ژیاون و ئەو ناو هێنانە تەنها پەیوەستە بەو دیاردەیەوە (بڕوانە کێشەی مێژوونوسان).

بنووسن، بە هەمان ئەو شێوەیەی کە هەتاوەکو ئەمڕۆ نەتوانراوە مێژووی کورد بە تەواوی بنووسرێت.
شایانی ئاماژە پێکردنە مستوفی لە سەدەی سیانزەهەمی زایندا، لە کتێبی (نزهة القلوب في المسالك و الممالك) دا دەڵێت کە لە ڕابردوودا پایتەختی کوردستان شاری (بەهار) بووە. ئەم شارە لە ڕووی جوگرافیەوە نزیکی هەشت میل لە باکوری شاری هەمەداندا بووە (امین ذكي، ١٩٦١، پ. ٥). بێگومان شاری هەمەدانیش پێشتر پایتەختی دەسەڵاتی میدەکان بوو کە دیسان دەردەکەوێت سەنتەری دەسەڵاتی کوردستان هەر نزیک پایتەختە کۆنەکەی میدەکان بووە. هەروەها لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا، میراتگری میدەکان دەوڵەتی حەسنەوی بوو، کە لە نزیکی هەمان سەنتەری دەسەڵاتی کۆنی میدەکانەوە حوکمیان دەکرد. ئەم دەوڵەتە هێندە بەهێز بوو کە چەندین جار لەگەڵ خەلیفەی ئیسلامدا جەنگی گەورەی بەرپا کردوە.
لە هەمان کاتدا گەشتیارێکی وەک بنیامینی تودێلا کە لە نێوانی ١١٦٠ز-١١٧٣ ز دا هاتوتە کوردستان و ناوچەکە، سەرای ئەوەی کە زۆر بە کوردستاندا گەڕاوە و زانیاری وورد سەبارەت بە ناوچەکە دەدات، کەچی نە ناوی کورد و نە کوردستانیش ناهێنێت (Wright, 1848). تودێلا لەبری وشەی کورد و کوردستان، مید و میدیا بەکاردەهێنێت. دیارە ئەم گەشتیارە ئاگاداری ئەوە بووە کە ئەوانەی ئەو پێیان دەڵێت مید و میدیەکان، خەڵکەکە خۆی پێی گوتوون کورد. لەبەر ئەوەی لە سەرچاوە مێژووییەکانی ئەو سەردەمەشدا ئەو خەڵکەی کە ئەو پێیان دەڵێت مید، سەرچاوە ئیسلامیەکان پێیان دەڵێن کورد. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە تودێلا ویستویەتی کتێب بۆ ئەوروپیەکان بنووسێت و لە ئەورووپاش ئەو سەردەمە، خەڵکی ئەو ناوچەیان تەنها بە مید ناسیبوو. دەنا کەسێکی وەک ئیبن ئەثیر (١١٦٠ز- ١٢٣٣ ز) کە نزیکی هەمان سەردەمی تودێلا یە، بەهیچ جۆرێک باسی میدەکان ناکات و ئەو خەڵکەی تودێلا بە مید باسیان دەکات، ئیبن ئەثیر بە کورد باسیان دەکات. هەروەها ناوچەکەش لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە لە سەرچاوە ئەرمەنیەکاندا بە کوردستان باس دەکرێت (Asatrian, 2009, p.19). تەنانەت پێش تودێلا-ش زمانەوانێکی وەکو مەحمود کاشغەری لە ساڵی (١٠٧٢ز-١٠٧٤ز) دا لە نەخشەکەیدا، ئەو ناوچەیەی تودێلا پێی دەڵێت میدیا، ئەو پێی دەڵێت وڵاتی کوردان (ارض الاكراد) (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١)
ئەگەر تابلۆیەکی کرۆنۆلۆژی تێکەڵکردنی ناوەکان بکەین، دەبینرێت کە لە سەرچاوەکاندا سۆمەری و گوتی ومید و کورد بەپێی سەردەمەکان ناوەکیان گۆڕاوە یان تێکەڵکراوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

| سەرچاوە | ڕوونکردنەوە |
|---|---|
| ئاشوری | ئاشوریەکان لە سەدەی نۆهەمی پێش زاینەوە گوت و میدیان تێکەڵ کردووە، کە وا دەردەکەوێت مید بنەماڵە و گوت بە نەتەوە سەیر کرابێت. |
| بابلی | لە تۆماری بابلیەکاندا لە نزیکی ٥٣٩ پ.ز دا (گۆبریار) ی پاشای مید، بە گوت لەقەڵەم دراوە و لە سەدەی سێهەمی پ.ز دا بیرۆسوس ڕابردووی سۆمەری و گوتی بە میدی لەقەڵەم داوە. |
| یۆنانی | لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا هێرۆدۆت دەڵێت میدەکان ئیمپراتوریەتێکی گەورەیان هەبووە و لە ڕابردوودا بە ناری (هوری) ناسرابوون و حوکمڕانی هەموو نەتەوەکانی ئاسیایان خستوتە ژێر دەستی خۆیان (Cook, 1985, p.212). |
| پەهلەوی | لە کارنامەی ئەردەشیری پاپەگاندا کە بە زمانی پەهلەوی نووسراوە، باسی ڕووداوێک دەکات کە لە سەدەی سێهەمی زاینیدا ڕووی داوە و بڕوا دەکرێت کە بەڵگە نامەکە لە دواتردا نووسرابێتەوە، باسی پاشای میدی کورد دەکات و تێیدا بۆ یەکەم جار (گوت) لەگەڵ (مید) دا دەگۆڕدرێت بۆ (کورد/مید). |
| ئیسلامی | لە دوای هاتنی ئیسلام، لە سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکاندا ناوچە گرنگەکانی میدیای کۆن، بە (ماهات) دەناسرا (Browne, 1919, p.19) و خەڵکەکەی چیتر بە مید باس نەدەکرا، بەڵکو وەک کورد دەناسران. بۆ نموونە یەعقوبی لە کاتی باسکردنی وڵاتی نەتەوەکاندا، هەرێمی چیا (اقليم الجبل) لە سەدەی نۆهەمدا بە وڵاتی کوردان دادەنێت کە هەمان وڵاتی میدەکانە و هەمان ناوچە لە سەدەی یانزەهەمی زاییندا لەلایەن کەسێکی وەک |

| | |
|---|---|
| | مەحمود کاشغەریەوە لە ناو نەخشەی جیهاندا بە خاکی کوردان (ارض الاکراد) ناوی هێناوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە١). |
| ئەرمەنی | لە دوای سەدەکانی ناوەڕاستەوە سەرچاوە ئەرمەنیەکان، چەندین جار ئاماژە بە کوردە میدەکان دەکەن و تەنانەت هەندێک جار تێکستی کوردیش لە ژێر ناوی مید دا هەڵگیراوە. |
| ڕۆژئاوایی | سەرچاوە ڕۆژئاواییەکانی وەک کتێبی بنیامینی تێدولا، هەموو کوردستان بە وڵاتی میدەکان ناو دەبات و بە هیچ جۆرێک ناوی کورد ناهێنێت و لەبری کورد ناوی مید دەهێنێت. لە هەمان سەردەمدا زۆربەی کتێبە مێژووییە ئیسلامیەکان ئەو خەڵکەی کە تێدولا پێیان دەڵێت مید، ئەوان بە کورد ناوی دەهێنن و ئەو ناوچانەی کە تێدولا پێیان دەڵێت میدیا، سەرچاوەکانی تر بە کوردستان ناوی دەهێنن و لە دەوروبەری سەدەی سیانزەی زاییندا مارکۆ پۆڵۆ بۆ یەکەم جار لە مێژووی ڕۆژئاوادا ناوی کوردستان دەهێنێت (Marco Polo and Murray 1845, p.229). |

هەموو ئەو ڕوونکردنەوانەی سەرەوە ئەوە دەخەنە ڕوو، کە میدەکان خێڵێکی گەورەی حوکمڕانی کورد بوون و لە سەردەمی جیاوازدا حوکمی کوردستان و مێسۆپۆتامیایان گرتوتە دەست، هۆکاری بزربوونی ناویان هاوشێوەی مانیەکان، هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە وورده وورده ناوی کورد، شوێنی ناوی میدی گرتەوە.

(نەخشەی ژمارە ١) نەخشەکەی مەحمود کاشغەری کە لە ساڵی ١٠٧٦ دا کراوە و تێیدا وڵاتی کورد بە (ارض الاکراد) ناوهێنراوە.

**جوگرافیای وڵاتی میدیا**

لە سەردەمێکدا میدەکان سەنتەری دەسەڵاتیان لە ناوچەی دەوروبەری هەمەداندا بووە، واتا بە گشتی قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان کەوتبووە باشوری وڵاتی مانیەکانەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢). لە دوای ڕوخاندنی دەوڵەتی ئاشوری، میدەکان بەهێز بوون وڵاتەکەیان فراوان کرد و هەموو ناوچەی ژێر دەسەڵاتی مانیەکان و زۆربەی ئەو شوێنەی کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن ئێران و زۆر لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئاشوریەکانیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان.

سترابۆ (Strabo, 1856, p.262)[10] لە سەدەی یەکەمی زاییندا بە ووردی باسی جوگرافیای میدیای کردووە و ناوچەکەیان دەکاتە دوو بەشەوە، یەکەمیان میدیای گەورە (Greater Media) و دووەمیان میدیای ئازربایجان/ئاتروپاتیان (Atropatian Media). میدیای گەورە پایتەختەکەی هەمەدان بووە. جیاکردنەوەی میدیای ئازربایجان، لە میدیای گەورە، ڕەنگدانەوەی رابردووی میدەکان و مانیەکانە لە سەردەمی ئاشوریەکاندا (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٣). میدیای گەورە، هەتاوەکو سەدەی دوانزەهەمی زاینیش، سەرچاوە ئیسلامیەکان بە (ماهات) ناویان بردووە. لەبەر ئەوەی کاتێک کە ئیسلامەکان گەیشتنە کوردستان، وڵاتەکەیان بەش کرد و ئەو ناوچەیەی کە لە لایەن سترابۆوە بە میدیای گەورە ناسرابوو، دابەشکرا بە دووبەشەوە، باجی بەشێکیان دەچوو بۆ موسڵمانەکانی کوفە و بەشەکەی تریان بۆ موسڵمانەکانی بەسرە. بۆیە بە دینەوەر و دەروبەری دەگووترا ماهولکوفە (ماه الكوفة) و بە نەهەروان و دەروبەری دەگووترا ماهولبەسرە (ماه البصرة). کە مانای میدیای کوفە و میدیای بەسرە دەدات. ئەم ڕاستیە لە سەرچاوەی جیاواز و بەشێوەی جیاواز ئاماژەی پێکراوە.

وڵاتی میدەکان لەکات و سەردەمی جیاوازدا سنوورەکەی لە هەڵکشان و داکشاندا بووە. ڕاولسن پێی وایە کە لە کاتی ئەوپەڕی دەسەڵاتیاندا زۆر لە نەتەوەکانی تریشیان خستبووە ژێر دەستیان و بەرەو باشور، هەتاوەکو ئۆقیانوسی هیندی و لە ڕۆژهەڵاتەوە، هەتاوەکو وڵاتی ئەفغانستان و بەرەو ڕۆژئاوا، هەتاوەکو سوریای ئەمڕۆ و لە باکورەوە سنوورەکەی بەرەو هەموو وڵاتی ئازەربایجان ڕۆیشتبوو (Rawlinson, 1865, p.1,2). ناوچەی بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی میدەکان هەر ڕەنگدانەوەی ناوچە هوری، سۆمەری، میتانی، هیتی، گوتی و کاسیەکانی ڕابردوو بوو و ئەمان ناوچەی دەسەڵاتیان بەرەو ڕۆژهەڵات و باشور بۆ زیادکردبوو. لە کاتێکیشدا کە میدەکان باڵا دەست نەبوون، هەر ناوچەیەکی بەرفراوان بە ناوی وڵاتی میدەوە ناوهێنراوە. ئەو ناوچەیەش پایتەختەکەی هەمەدان بووە و بەرەوخوار هەتاوەکو ئیلامی ئەمڕۆ و بەرەو باکور ئازربایجانیشی دەگرتە خۆی و بەرەو ڕۆژهەڵات هەتاوەکو کێوی دەماوەند و تارانی ئەمڕۆ دەڕۆیشت. بە گشتی زۆربەی جار ناوچەی دەسەڵاتی میدەکان لە ناو کوردستاندا بووە.

**مێژوویەکی گشتی میدەکان**

سەرچاوەکان وای دەردەخەن کە میدیەکان هەر خێڵێکی گەورەی دەسەڵاتداری کورد بووبێتن و تەواوکەری ئەو خەڵکانە بن کە لە ڕابردوودا بە هوری و گوتی و سۆمەری باسکراون. چەند سەدەیەک پێش میدەکان، میتانیەکان لە دوای سەدەی پانزەی پێش زایینەوە دەسەڵاتیان بەرەو زۆربەی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات ڕۆیشتوە و هەتاوەکو نزیک میسر دەسەڵاتیان هەبووە. لە هەزارەی دووهەمی پێش زاییندا تاقە هێز کە ڕێگر بوو لە فراوانبوونی دەسەڵاتی میسریەکان، بریتی بوو لە هێزی میتانیەکان و دەوڵەتێکی بەهێزیان لە ناوچەکەدا دروست کرد. میتانیەکان دەسەڵاتێکی ناوچەیی بوون و سەرکردەیی هوریەکانیان دەکرد و پاشای گەورەی میتانی لەوان بوون، لە ڕاستیدا مانیەکان و میدەکان- یش هەر بە هەمان شێوەی میتانیەکان دوو دەسەڵاتی ناوچەیی بوون. بە دوور نازانرێت میدەکان هەر پەلێکی میتانیەکان بووبێتن و لە ژێر فشار و هاتنی ئاشوریەکاندا ڕوویان کردبێتە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی دەسەڵاتی ئاشوریەکان.

---

[10]. سترابۆ (٦٤/٦٣ پ.ز- ٢٣ز) جوگرافی ناسێکی یۆنانی بووە و لە نێوان سەدەی یەکەمی پ.ز هەتاوەکو سەدەی یەکەمی ز ژیاوە و بە کتێبی گەورەی جوگرافیا ناوبانگی دەرکردووە کە پێکهاتووە لە ١٧ بەش، تێیدا مێژوو و جوگرافیای جیهانی ناسراوی ئەو سەردەمەی تێدا باسکردووە.

میدەکان لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاییندا هێزێکی گرنگی ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتی ئاشوریەکان بوون، بەڵام دەسەڵاتەکەیان دەسەلاتێکی شل بوو، زیاتر لە شێوەی یەکەی ناوچەیی و دەسەڵاتداری ناوچەییدا دەردەکەوت. وڵاتی میدەکان وەک سەردەمی میتانیە کۆنەکان هەر لە یەکەی دەسەڵاتی ناوچەیی پێکهاتبوو کە پێیان دەگووت کۆمێ/کۆما (Kome) (Diakonoff, 1985, p.89). ئەمڕۆ وشەی (کۆما) ماناکەی لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و دەبێتە (کۆمەڵ، گروپ، کۆ). لە سەردەمی بەهێزبوونی دەسەڵاتی ئاشوریدا، وڵاتی میدەکان وەک جاران لە چەند (کۆمە)یەک پێکهاتبوو کە زۆر یەکگرتوو نەبوون.
ئاشوریەکان وەک نەتەوەیەکی نوێ، لە کاتی بەرفراوانکردنی دەسەلاتیان بەرەو کوردستان، فشاریان دەخستە سەر نەتەوە و خەڵکە ڕەسەنەکانی وڵاتەکە و فروانبوونی دەسەلاتی ئاشوریەکان لەسەر حسابی وڵاتی کوردەکان بوو. لەوە دەچێت کە لە سەرەتاوە میدەکان بەرهەڵستی باشی ئاشوریەکانیان کردبێت و بە شێوەیەکی چاک جەنگابن، بۆیە ئاشوریەکان بە ئاسانی دەستیان بە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتیان نەگەیشتووە. چونکە دەبینرێت، زۆر جار لە تێکستە ئاشوریەکاندا،جگە لە نازناوی "خەڵکە دوورەکان" ئاشوریەکان بە "خەڵکە بەهێزەکان" یش ناویان هێناون (Diankonoff, 1985, p.75).
هیرۆدۆت کە لەوە دەچێت زانیاریەکانی لە میدەکان بیستبێت، بە دورودرێژی باسی پرۆسەی گەورەبوون و بە سەنترالکردنی دەسەڵات دەکات لە ناو میدەکاندا. بە پێی هیرۆدۆت ناوچەی میدەکان لە کۆمەڵێک ناوچەی دەسەڵات پێکهاتبوو. دیاکۆ دەسەڵاتداری یەکێک لەو ناوچانە بوو. دیاکۆ دەسەلاتدارێکی سەر ڕاست و پیاو چاک بووە هەوڵی بەرپابوونی دادوەری داوە لە ناوچەکەی خۆیدا، بە شێوەیەک کە ناوبانگی ڕۆیشتبووە دەڤەرەکانی دەروبەری و هەموو ماوە ماوەیەک وەک دادوەرێک کێشەی خەڵکی ناوچەی خۆی و ناوچەکانی تریشی چارسەر دەکرد. دوایی بڕیاری داوە کە چیتر کێشەی ناوچەکانی دەروبەری چارسەر نەکات، بەو جۆرە کێشە ڕووی کردۆتە ناوچەی میدەکان و ناکۆکی بڵاوبووەتەوە. بۆیە کۆبوونەوەیەکی گشتی هەموو ناوچەکانی مید کراوە و تێیدا لەوێدا پێشنیار کراوە کە پاشایەک بۆ حوکمڕانی هەموو میدەکان هەڵبژێردرێت بۆ ئەوەی کە لەو ئاڵۆزی و نا ئارامیە ڕزگاریان ببێت. دوای مشتومڕێکی زۆر، دیاکۆ وەک پاشای هەمووان هەڵبژێردراوە. دیاکۆ سەرەتا داوای کرد کە بینایەکی پتەوی بۆ دروست بکەن و پاسەوانەکانی لە هەموو ناوچەکانی مید هەڵبژاردبوو. ئەمجا داوای کرد کە شارێک دروست بکرێت لە شوێنێکدا کە ئەو خۆی شوێنەکەی هەڵبژارد و ئەو شوێنە شاری هەمەدان بوو. لەوێدا شارێک دروستکرا کە بازنەیی بوو و حەوت شورای بە دەوردا کرا و هەر کام لەو شورایانە بە ڕەنگ و نەخشی تایبەتی کراوە. کۆشکی دیاکۆ لە دوایەمین بازنەدا بووە. بەو جۆرە حوکمڕانی میدەکان بەهێز بووە و لە کۆمەڵێک دەسەڵاتی ناوچەیی بێ هێزەوە بوونەتە دەوڵەتێکی سەنتەر بەهێز و خاوەنی پاشای بەهێز و سوپایەکی بەهێز (Herodotus, 1860, p.147, 148,149,150).
لە سەدەی حەوتەمی پێش زاییندا دەسەڵاتی ئاشوریەکان ڕووی لە لاوازی کرد. دوای زنجیرەیەک شەڕ لەو ساڵانەدا، لە ٦١٢ ی پ.ز دا مید و بابلیەکان توانیان بە تەواوی کۆتایی بە ئاشوریەکان بهێنن، کە بەپێی هیرۆدۆت بۆ نزیکی پێنج سەد ساڵ بوو لەو ناوچەیەدا حوکمڕانییان دەکرد و هەردوو مید و بابلیەکانییان هەراسان کردبوو. بۆیە ڕوخانی ئەو دەوڵەتە لەو سەردەمەدا لە بەرژەوەندی هەردوو بابلی و میدەکاندا بوو.
لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی ئاشوری، میدەکان زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ئاشوریان خستەوە ژێر دەستی خۆیان و بوونە پاشای گەورەی ناوچەکە. ناوچەی فارس و وڵاتی ئاشوری پێشوویان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان و دیسان تا ڕادەیەک بەشێک لە دەسەڵاتە کۆنەکەی میتانیەکانیان دروستکردەوە. بۆیە موسای خورین کە مێژوونوسێکی ئەرمەنی بوو، دەڵێت بە درێژایی سەردەمی دەسەڵاتی میدەکان، ئەرمەنیەکان وەک دەسەڵاتێکی ژێر دەستی میدەکان مابوونەوە (Rawlinson, 2002, p.72) .
لە دوای ڕوخانی ئاشوریەکان و دوای نزیکی شەست و دوو ساڵ لە حوکمڕانی ناوچەکە، وا پێ دەچێت کە میدەکان ئەو گوڕ و تینەی جارانیان کەم بووبێتەوە . بۆیە وردە وردە یەکێک لە دەسەڵاتە ناوچەییەکانی ژێر دەستیان کە بنەماڵەی ئەخامەنی و خێڵێکی حوکمڕانی فارسەکان بوو، خۆی بەهێز کرد و بە سەرکردایەتی

(نەخشەی ژمارە ٢) نەخشەی ناوچەکانی مید، مانی، ئاشوری، ئیلام، پارسواش و بابل

کۆرشی پاشایان لە ٥٥٠ پ.ز دا ئەستیاگ (Astyages)[11] ی دوایەمین پاشای میدیان شکاند. ئیتر لەو مێژووەوە فارسەکان بوونە دەسەڵاتداری گەورە و پاشای پاشاکان و پاشای میدی بووە پاشایەکی بچووکتر. بەڵام میدەکان لەگەڵ ئەوەی کە بوونە پاشای بچووکتر لە فارسەکان، هەر هێشتا وەک پاشا حوکمی وڵاتی خۆیان دەکرد. ئەوەتا سترابۆ لە نزیکی سەدەی یەکەمی زایینیدا، واتە دوای نزیکی شەش سەد ساڵ لە سەرکەوتنی فارسەکان، سەبارەت بە میدەکان دەڵێت "دوای ڕوخاندنی ئیمپراتۆریەتی ئاشوریەکان، میدیای مەزن لە سەردەمی کۆندا حوکمڕانی هەموو ئاسیای دەکرد، بەڵام دوایی لە سەردەمی ئەستیاگ دا میدەکان ئەو وڵاتە گەورەیەیان لەلایەن کۆرش و فارسەکان لێ وەرگیرایەوە، بەڵام هەمان گرنگی سەردەمی کۆنیان بۆ خۆیان هەر هێشتەوە" (Strabo, 1856, p.264). بەو جۆرە میدەکان وڵاتەکانی دەرەوەی نەتەوەی خۆیان لە دەست دا، بەڵام هەر خۆیان حوکمڕانی وڵاتی خۆیان کردووە و هەر هێشتا یەکێک لە پاشا گرنگەکانی ناوچەکە بوون. تەنانەت لە شەڕی گرتنی بابلدا، پاشای فارس، داوای لە گۆبریار-ی پاشای مید کرد کە سەرەتا ئەو بچێتە ناو بابل و شارەکە کۆنترۆڵ بکات (Horner, 1901) . دیارە هۆکارەکەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە میدەکان خەڵکی ناوچەکە بوون و ئاشنای بابل بوون و بەشێکی خەڵکەکە هەر کورد بوون و بۆ پاشای میدی ئاسانتر بوو کە مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بابل بکات وەک لە پاشای فارس کە خەڵکێکی نوێ بوون لە ناوچەکە. دوای دەسەڵاتداربوونی فارسەکان، میدەکان هەروا بێ دەنگ و دەستەوسان نەبوون، بەڵکو چەندین جار هەوڵی وەرگرتنەوەی دەسەڵاتی گەورەترین پاشای ناوچەکەیان داو هەندێک جار لە ڕێگای موغەکانەوە دژی فارسەکان هەڵ دەگەڕانەوە و دەیانویست کە دەسەڵاتەکەی سەردەمی پێشتر وەربگرنەوە. یەکێ لە سەرکردە گرنگەکانی میدەکان موغێک بوو بە ناوی گاوماتا (Gaumata)[12]؛ ئەم موغە بەنیاز بوو وردە وردە دەسەڵات بگرێتەوە دەست و زۆر لە ناوچەکانی مید و دوورووبەری خستەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و ویستی دەسەڵات بۆ میدەکان وەربگرێتەوە. پاش ماوەیەکی کەم گاوماتا زۆربەی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی سەردەمی میدەکانی وەرگرتەوە. ئەم هەوڵەی گاوماتا مەترسیەکی گەورەبوو بۆ فارسەکان کە تازە دەسەڵاتی گەورەی ناوچەکەیان گرتبووە دەست. بۆیە داریوش لەم هەڵگەڕانەوەیە ترسا و بۆ ئەو مەبەستە جگە لە خۆی، سەرکردەی شەش خێڵی فارسی هەڵبژارد کە هاوکاری بکەن لە کوشتنی گاوماتادا. پێ دەچێت کە کاریگەری ئاینی موغەکان لەسەر ناوچەکە گەورەبووبێت و داریوش لەبەر هۆی ئاینی نەیوێرابێت بە تەنها بە کوشتنی گاوماتا هەستێت. لە ئەنجامدا هێرشیان کردە سەر گاوماتا و لە یەکێک لە قەڵای میدەکاندا لە ڕۆژی ٢٢ی مانگی نۆی ساڵی ٥٢٢ ی پ.ز دا کوشتیان (young, 1988, p.54). ئەم ڕووداوە فارسەکانی هاندا و ئەو ڕۆژە دەستیان کرد بە سەربڕینی موغ. لەو بارەیەوە هیرۆدۆت دەڵێت کە فارسەکان ئەو ڕۆژەیان وەک جەژنێک لێکرد و هەموو ساڵێک یادیان دەکردەوە و لەو ڕۆژەدا موغەکان نەیاندەتوانی سەر دەربهێنن (Boyce, 1982 ,p.86 & 87). تەنانەت هیرۆدۆت سەبارەت کوشتنی گاوماتا، دەڵێت لە هەموو ئاسیادا خەڵک تازیەبار بوو، جگە لە ناوچەی فارس(Cook, 1985, 218) . ئەمەش دیسان ئەوە نیشان دەدات کە فارسەکان هاودین و هاوفەرهەنگی خەڵکی ناوچەکە نەبوون و جیاواز بوون، واتە لە کاتێکدا کە هەموو خەڵکی ناوچەکە پابەندی ئاینی میدی بوون، فارسەکان ئاین وبیروبڕوایان جیاواز بووە. دیارە گاوماتا، جگە لەوەی کە خۆی وەک پاشای مید ڕاگەیاندبوو، کاریگەری ئاینی لەسەر خەڵکی ناوچەکە هەبووە بۆیە خەڵکی ناوچەکە، جگە لە فارسەکان، هەمووی تازیەبار بووە. بەڵام فارسەکان هەموو هەوڵیان کەمکردنەوەی دەسەڵاتی میدەکان بووە و بێهێزکردنی موغەکانیش لە هەمان کاتدا بێ هێزکردنی میدەکان بوو. هەروەها لە ساڵی ٥٢٢ پ.ز دا یەکێک لە پاشای میدەکان بە ناوی (فەرڤەرتیش)[13]

---

[11]. ئەم ناوە لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا تۆمارکراوە. لەوە دەچێت لە بنەڕاتدا (هەستیاو/هەستیاگ) ی کوردی بێت. وەک پێشتر باسکرا، یۆنانیەکان پیتی (ها) دەکەنە (ئەلف).

[12]. ئەم ناوە مشتومڕی لەسەرە و هەندێک ئەم کەسە هەر بە Bardya (بەرزیە) دەزانێت کە هەندیک سەرچاوەی تر ئاماژەی پێکردووە.

[13]. هەڵبژاردنی ئەم ناوە لە لایەن ئەو میدەوە بە مەبەستی بەبیرهێنانەوەی باوکی کەیخەسرە و بووە لای میدەکان کە ناوی فرەوەرتیس/فرەهاوردە (Fravartish/Phraortes) بووە.

(نەخشەی ژمارە ٣) ناوچەی ژێر دەسەڵاتی میدەکان دوای ڕوخانی ئاشوریەکان (ئیمبراتۆریەتی میدی) و میدیای ئازەربایجان و میدیای گەورە.

ڕایگەیاند کە ئەو لە نەوەی کەیخەسرەوە و دەیەوێت ئەو بنەماڵەیە زیندوو بکاتەوە. ئیتر خۆی کردەوە بە پاشای میدەکان و هەموو ئەشکانی و هەرکانی و ئەرمەنیەکان پشتگیریان لێکرد و هێندە بەهێز بوو کە بەرامبەر فارسەکان وەستا. بەڵام سوپاکەی داریوشی فارس، لای شاری ڕەی، نزیک تارانی ئەمڕۆ، لەگەڵی کەوتە جەنگ و دەستگیری کرد. لە تێکستێکدا داریوش دەڵێت "فەرڤەرتیش دەستگیرکرا و بۆمیان هێنا. من لوت و گوێ و زمانیم بڕی و چاویم دەرهێنا. بە دەروازەکانمەوە هەڵمواسی؛ هەموو خەڵک ئەویان بینی. دوای ئەوە بە دارێکەوە لە هەمەدان هەڵمواسی و سەبارەت یاریدەدەرەکانی؛ ئەوانم لە ناو قەلای هەمەداندا سووتاند" (Burn, 1984,p.102). بەو جۆرە ئەو بەربەرەکانیە لە نێوان فارس و میدەکاندا بەردەوام بوو هەتاوەکو ڕوخانی دەوڵەتی فارسی لەلایەن یۆنانیەکانەوە. وەک هیرۆدۆت باسی دەکات، کامبیاسیس(Cambyses) ی پاشای فارس لە سەرەمەرگیدا گوتەیەک بۆ دەروبەرەکەی دەڵێت "داوا لە هەمووتان دەکەم، بە تایبەتی ئەوانەتان کە ئەخامەنیە، نەکەن بترسن و ڕێ بدەن جارێکی تر پاشایەتی بگەڕێتەوە بۆ میدەکان" (Young, 1988, p.55).

میدەکان، فارسەکانیان وەک هێزێکی بێگانە سەیردەکرد، بۆیە کاتێک کە ئەلێکسەندەری مەقدونی ڕووی کردە ناوچەکە بۆ شکاندنی فارسەکان، یەکێک لە سەرکردە میدەکان بە ناوی (ئاتەرپاتیس Atropates)[14]، ئەوەی بە دەرفەت زانی و هاوپەیمانی ئەلێکسەندەری کرد و (ئاتەرپاس)ی میدی سەرکردەی سوپایەکی لە مید، ئەلبانی، کادوشی و سیسەکانی کرد و لە شەڕی گاوگامێلا (Gaugamela) ی نزیک هەولێردا، بەیەکەوە سوپای فارسەکانیان شکاند. دوایی لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی فارسەکان لە ٣٣٠ پ.ز لەلایەن ئەسکەندەرەوە، ناوچەی میدیای ئازەربایجان درا بە (ئاتەرپاس) ی سەرکردەی میدی هەتاوەکو حوکمڕانی بکات. بۆ پتەوکردنی هاوپەیمانێتیەکە، کچی (ئاتەرپاس) درا بە یەکێک لە سەرکردەکانی سوپای ئەلێکسەندەر. ئەلێکسەندەر هاوپەیمانیەکی دۆستانەی لەگەڵ ئاتەرپاس-دا هێشتەوە و دوای مردنی ئەلێکسەندەر لە ٣٢٣ پ.ز دا، وڵاتی میدیا لە نێوان ئاتەرپاس و جەنەڕاڵێکی یۆنانیدا بە ناوی پیسۆن (Pithon)، بەشکرا. بەشەکەی سەرەوە هەر بە ناوی میدیای ئاتەرپاسیان (Media Atropatene) مایەوە. ئەمڕۆناوەکە کراوەتە ئازەربایجان. بەشەکەی خوارەوە ناونرا میدیای گەورە (Media Major). هەرچەندە سەرەتا ئاتەرپاسی میدی و ناوچەکەی وابەستەی دەسەڵاتی یۆنانی بوون، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم ئاتەرپاس ناوچەکەی بە تەواوی لە یۆنانیەکان سەربەخۆ کرد و نازناوی پاشای وەرگرتەوە (Gmirkin, 2006, p.153). سترابۆ (٦٤ پ.ز-٢٤ز) سەبارەت بەم ناوچەیە و سەرکردە میدیەکەی دەڵێت "بەشەکەی تر بریتیە لە میدیای ئاتەروپاتیان. ناوەکەی لە ئاتەروپاتیسەوە هاتووە، کە سەرکردەیەک بوو نەیهێشت وڵاتەکەی بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی مەسیدۆنی (یۆنانی) ەکانەوە، کە بەشێکە لە ولاتی میدیای گەورە. ئاتەرپاسیس کە کرا بە پاشا، سەربەخۆیی ئەو وڵاتەی هێشتەوە؛ ئەوانەی دوای ئەو هەتاوەکو ئەمڕۆ لە حوکمڕانیدا بەردەوامن و هەندێک کات ژن و ژنخوازیان لەگەڵ پاشای ئەرمەنی، سوری و ئەشکانیدا کردووە" (Strabo, 1856, p.262).

بێگومان میدەکان دەیانویست کە کۆتایی بە دەسەلاتی فارسەکان بهێنن. بەڵام هەروەک پێشتر ئاماژەی پێکرا فارسەکان هەموو هەوڵێکیان ئەوە بوو کە نەهێڵن میدەکان جارێکی تر ببنەوە بە گەورەترین پاشای ناوچەکە و وەک پاشای بچووک بمێننەوە. بە دڵنیایی میدەکانیش بۆچوونیان بە هەمان شێوەی فارسەکان بووە، بۆیە ئەلێکسەندەر بۆ ئەو سەردەمە ڕۆڵی دۆستی بۆ میدە کوردەکان دەبینی و ئەو بۆچوونە تەنانەت لە کتێبی زانا

---

[14]. ئەگەر پاشگری (یس) ی یۆنانی لە ناوەکە بکرێتەوە، ئەوە ناوەکە دەبێتە (ئاتەر پات) کە بەپێی فەرهەنگی وشە میدیەکان، ناوەکە میدیە. بە کوردی ئەمڕۆ ئەو ناوە دەبێتە (ئاتەرپاس/ئاگرپاس) واتە (پارێزەری ئاگر). وشەی atr ی میدی بە مانای (ئاگر) لە کوردیدا دەبێتە ātar و بە هوری tari، هەروەها وشەی pat ی میدی کە مانای (پارێزگاری) دەدات، لە کوردیدا دەبێتە pās و لە هیتیدا pahš. هەر ناوی ئەم پاشا کوردە میدیە بوو کە ناوی (ئازربایجان) ی ئەمڕۆی لێ دروستکراوە و لە سەردەمی یۆنانەکاندا ناوەکە بووەتە Atropatian و لەبەر ئەوەی کە ناوەکە پاشگری (یان ian) ی کوردی/هوری وەرگرتووە کە بە مانای (وڵات، ناوچە) دەدات. دوایی لە کاتی هاتنی ئیسلامدا بە کوردی و بەشێوەکانی (ئاگرپاسیان/ئاتەرپاسیان/ئادرپاسیان) خوێنراوەتەوە کە ماناکەی دەبێتە (وڵاتی ئاگرپاس) و عەرەبەکان کردوویانەتە (اذربیجان).

کوردەکانی سەدەی دوانزەهەمی زاینیشدا بە تەواوی ڕوونە. شەمسەدینی شارەزوری[15] کە هاوڕێی سورەوەردی بووە لە کتێبەکەیدا بە ناوی (نزهة الارواح و روضة الافراح في تاريخ الحكماء والفلاسفة) کە لەسەر مێژووی فەلسەفە نووسیویەتی، زۆر بە درێژی باس لە هاتنی ئەلێکسەندەر دەکات و بە کابرایەکی مرۆڤ دۆستی خوا پەرستی زیرەکی لە قەڵەم دەدات و بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش وەسفی دەکات، لە بەرامبەردا دارای پاشای فارس بە کابرایەکی لەخۆبایی و خۆ بەزل زان دادەنێت (الشهرزوري، ١٩٧٦، پ.٢٥٠-٢٦١).

بۆ چەندین سەدە دوای هاتنی یۆنانیەکان، میدەکان وەک حوکمڕانی سەربەخۆ مانەوە و میدیای ئاتەرپاسیان (ئازەربایجان) تاقە ناوچەی سەربەخۆی ناوچەکە بوو. لە هەمان کاتدا فارسەکان بە تەواوی بێ پاشا مانەوە و کەوتنە ژێر دەسەڵاتی یۆنانیەکانەوە. میدەکان لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا زۆر چالاک بوون و بەشداریان لە چەندین شەڕی گەورەی ئەو سەردەمە کردووە و زۆرجار دەیانویست دەسەڵاتیان گەورەتر و بەهێز تر بکەن. لە دوای کەمبوونەوەی دەسەڵاتی یۆنانەکان لە ناوچەکەدا و گەورەبوونی ئەشکانیەکان، هەندێک جار پاشای میدی، کە ناوچەکەی کەوتبووە نێوان ناوچەی دەسەڵاتی ئەشکانی و ڕۆمەکان، سوودی لە پەیوەندی خراپی نێوان ئەشکانیەکان و ڕۆمانەکان دەبینی. لە هەموو سەردەمێکدا هاوپەیمانیەکان بەپێی هەڵکشان و داکشانی هێزەکانی ناوچەکە گۆڕاوە و ئەوەش بەشێک بووە لەو پرۆسەیە.

هەندێک جاریش پاشای مید وابەستەیی هەبوو بەرامبەر پاشای ئەشکانی کە ئەو لە سەردەمێکدا لە دەسەڵاتدا لە میدەکان گەورەتر بوو. بۆیە لە کاتی جەنگەکاندا ئەشکانیەکان پاشای مید و پاشاکانی تری ناوچەکەیان بانگهێشت دەکرد بۆ جەنگ بەرامبەر ڕۆمانەکان کە هەر چەند ساڵ جارێک بەرپا دەبوو.

لە کۆتایی سەدەی یەکەمی پ.ز دا پەیوەندی نێوان میدەکان و ئەشکانیەکان تێک چوو و هاوپەیمانیەکەیان هەڵوەشایەوە و لە هەمان کاتدا پەیوەندی ڕۆم و ئەرمەنیەکان تێکچوو، هاوپەیمانی نێوان دەوڵەتەکان لە ناوچەکەدا شێوەیەکی نوێی وەردەگرت. مارک ئەنتۆنی، سەرکردەی سوپای ڕۆمەکان و مێردی کیلیۆپاترای شاژنی میسر، ڕێکەوتنامەیەکی لەگەڵ پاشای میدەکاندا مۆرکرد و بەو جۆرە میدەکان بوونە هاوپەیمانی ڕۆم. بۆ پتەوکردنی هاوپەیمانێتیەکە، گوتاپا (Jotapa) ی کچی پاشای میدەکان، شووی کرد بە ئەلێکسەندەری کوڕی ئەنتۆنی سەرکردەی سوپای ڕۆم. وەک بەشێک لەو هاوپەیمانێتیە، بۆ ماوەیەک ئەرمینیا لە نێوان پاشای مید و ڕۆمەکاندا دابەشکرا. ئەو هاوپەیمانێتیە ماوەیەکی کورتی خایاندوو و لە ئەنجامی بەهێزبوونی ئەشکانیەکاندا، وڵاتی میدەکان لە لایەن ئەشکانیەکانەوە دەستی بەسەردا گیرا و یەکێکی تر لە بنەماڵەی میدەکان هەڵبژێردرا بە پاشا کە لە ئەشکانیەکان نزیکتر بوو (Rawlinson, 2002).

لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زاییندا، ئەشکانیەکان چەند پاشایەکیان لەبەر چەند هۆکارێکی ناوخۆیی کوژران و لەناوبران. بۆیە دوای کوشتنی یەکێک لە پاشاکانی ئەشکانیەکان، لەلایەن ئەشکانیەکان خۆیانەوە، داوا لە ڕۆم کرا کە یەکێک لە برای پاشای پێشوو بنێرێتەوە و بکرێتە پاشا. ڕۆم ئەمەی پێ خۆش بوو، بەڵام پاش ماوەیەک ئەشکانیەکان هەستیان بە هەڵەی خۆیان کرد و بینیان کە پاشا نوێکەیان بە تەواوی نامۆیە بە

[15]. شەمسەدینی شارەزوری: ناوی تەواوی محەمەدی کوڕی مەحمود بووە و بە شەمسەدینی شارەزووری ناوی دەرکردووە. ئەم زاتە هاو بیر و هاوڕێی سورەوەردی بووە و هەندێک سەرچاوە بە خزمیشی دادەنێن و تەنانەت دەڵێن لە کاتی گرتنی سورەوەردیدا لەگەڵیدا بووە (الشهرزوري، ١٩٧٦، پ.ح). شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە ڕۆژی لەدایکبوونی نازانرێت و بۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت ئەو مێژووە، بەڵام بەوەی کە دەزانرێت هاوڕێی سورەوەردی بووە، بۆیە وا دەردەکەوێت کە لە سەدەی دوانزەی زاییندا ژیابێت. شارەزووری پەیرەوی فەلسەفە و تەریقەی (حكمة الاشراق) ی کردووە کە لەلایەن سورەوەردیەوە داهێنراوە و بنەماکەی تێکەڵکردنی فەلسەفەی یۆنانی و تەسەوفی ڕۆژهەڵاتی بووە. شارەزووری شارەزاییەکی زۆری لە فەلسەفەدا هەبووە و لە کتێبی (نزهة الارواح و روضة الافراح في تاريخ الحكماء والفلاسفة) بە تەواوی ئەو توانایەی ڕوون دەبێتەوە کە نەک تەنها مێژووی فەلسەفەی لە سەرەتای دروستبوونیەوە نووسیوە، بەڵکو هەرکام لە بۆچوونی فەیلسوفەکانی ڕوونکردۆتەوە و سەرنجی لەسەر داون. شارەزووری خاوەنی پێنج کتێب بووە کە بریتین لە:
١. نزهة الارواح و روضة الافراح في تاريخ الحكماء والفلاسفة، ٢. الشجرة الالهية في علوم الحقائق الربانية، ٣. الرموز و الامثال الالهية في الانوار المجودة الملكوتية، ٤. مدينة الحكماء، ٥. التنقيحات. (الشهرزوري، ١٩٧٦).

داب و نەریتی وڵاتەکەیان و لەگەڵ هەڵسوکەوتی وڵاتەکەدا نەدەگونجا و بە چاوی نزم سەیری خەڵکەکەی دەکرد. بۆیە ئەشکانیەکان لە ساڵی ١٦ پ.ز دا داوایان لە پاشای میدی کرد کە حوکمڕانی بگرێتە دەست. ئەویش بە سوپایەکەوە هاتە سەر پایتەختی ئەشکانیەکان و بەو جۆرە ڤۆنۆنیس (Vonones) ی پاشای ئەشکانی هەڵهات و هەرتەبانوس[16] (Artabanus) ی پاشای میدی کرایە پاشای ئەشکانیەکان.
بە داخەوە لە سەدەکانی زاینیدا جگە لە چەند سەرچاوەیەکی بچڕ پچڕ، شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە میدەکان نازانرێت. لە سەدەی یەکەمی پێش زایین و لە نێوان ٧٣ پ.ز- ٦٣ پ.ز دا ناوی پاشای هەزەبان و پاشای مید و پاشای کوردیان[17] بەیەکەوە چەند جارێک هاتوون کە هاوکاری تیگران-ی پاشای ئەرمەنی و میسرادات-ی پاشای پۆنتۆسیان کردووە لە جەنگیاندا کە بەرامبەر لوکولوس (Lucullus) ی سەرکردەی ڕۆمانەکان بەرپاکراوە.
لە نزیکی ناوەڕاستی سەدەی سێهەمی زاینیدا پاشای مید بە هاوکاری پاشای هەولێر و پاشای کەرکوک کە ناوی دۆمژدانە (Domjtana) بووە لەگەڵ پاشای ساسانیدا بەیەکەوە هێزیان کرد بەیەک و کۆتاییان بە حوکمی ئەشکانیەکان هێنا کە چەند سەدەیەک بوو حوکمڕانی گەورەی ناوچەکە بوون (Kawerau and Kroll, 1985, p.16 and 17).
کە کۆتایی بە دەسەڵاتی میدەکان هاتووە و ناویان بۆ دوایین جار لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هاتووە، لە کۆتایی سەدەی سێهەمی زاینیدایە؛ کاتێک کە ئەردەشیری ساسانی لە جەنگێکدا هێرشی کردۆتە سەر پاشای مید. سەرەتا پاشای مید وسوپاکەی ئەردەشیریان شکاندووە، بەڵام دوایی ئەردەشیر سوپایەکی گەورەتری پێکهێناوە و چووەتەوە سەر پاشای مید و خۆی و بنەماڵەکەی دەستگیر کردووە (Farrokh, 2007, p.183). ئەوە کۆنترین و یەکەم تۆمارە لە مێژوودا کە تێیدا پاشای مید بە کورد ناوببرێت (Wahbi, 2006, p.17). بەو جۆرە وەک ڕوون کرایەوە، میدەکان هەتاوەکو سەدەی سێهەمی زاینی دەسەڵاتیان هەر مابوو. لە دوای ئەو مێژووەوە، بنەماڵەی میدەکان کۆتاییان پێ هاتووە و چیتر بەڵگە لەبەردەستدا نیە کە میدەکان وەک پاشا و دەسەڵاتدار حوکمڕانیان کردبێت.
لە سەدەی شەشەمی پێش زاییندا و دوای سەرکەوتنی فارسە ئەخامەنیەکان بەسەر میدەکان، میدەکان وەک پاشا هەتاوەکو سەدەی سێهەمی زاینی حوکمڕانیان هەر بەردەوام بووە، بەڵام دەسەڵاتەکەیان لە هەڵکشان و داکشاندا بووە. واتە میدەکان لە دوای ئەو مێژووەوە بۆ نزیکی هەشت سەد ساڵ حوکمڕانیان کردووە. ئەمە بە تەواوی بە پێچەوانەی زۆربەی ئەو بۆچوونانەیە کە وای دادەنێت میدەکان لە دوای بەهێزبوونی ئەخامەنیەکان لە ناوچوون، لە ڕاستیدا ئەو بۆچوونە بە تەواوی هەڵەیە و بە بەراورد بە میدەکان، فارسەکان ماوەیەکی زۆر کورت حوکمیان کردووە و ماوەی حوکمڕانی میدەکان زۆر درێژتر بووە لە حوکڕانی فارسەکان.

**پەیوەندی زمانی کوردی لەگەڵ زمانی میدی**

لە ڕووی زمانەوانیەوە وەک لە بەشی زمانیی ئەم کتێبەدا دەردەکەوێت، زمانی میدەکان زمانی کوردی بووە و هاوبەشی تەواوی هەیە لەگەڵ سۆمەری، هوری، مانی، لوڤی، هیتی، ئاڤێستا، هتد. لە ڕووی جوگرافیشەوە وەک لە نەخشەکەدا دەردەکەوێت میدەکان کورد بوون و بە زمانی کوردی قسەیان کردووە. واتە کوردێکی ئەم سەردەمە دەتوانی لە قسەکردنی زمانی میدەکان تێ بگات. بە داخەوە جگە لە کۆمەڵێک وشە کە دوایی لە فەرهەنگەکەدا ئاماژەی پێ دەکرێت، تێکستی تەواوی میدی نەدۆزراوەتەوە، بەڵام لە یەکێک لە کەنیسە ئەرمەنیەکانی سەدەی پانزەهەمی زاییندا[18] ، تێکستێکی کوردی کە بە ئەلف و بێی ئەرمەنی نووسراوە، لە ژێر ناوی زمانی میدەکاندا هەڵگیراوە و دەڵێت:

---

[16]. ئەم ناوە لە بنەچەدا هەر بریتی بووە لە (ئەردەوان/هەردەوان) و لەلایەن سەرچاوە یۆنانیەکانەوە ناوەکە گۆڕاوە.
[17]. هەزەبان و کوردیان دوو دەوڵەتی کوردی تر بوون و لە بەشەکانی داهاتوودا بە ووردی باس دەکرێن.
[18]. بەپێی ئاساتریان، مێژووی تێکستەکە دەگەڕێتەوە بۆ (١٤٣١ز-١٤٤٦ز) (Asatrian, 2009, p.16) بەڵام تێکستەکە لە بنەڕەتدا لەبەر نوسخەیەکی کۆنتر گیراوە، واتە مێژووەکەی کۆنترە لە مێژووی نوسینەوەکەی (Minorsky, 1953).

(پاکژ) "pākiž xude, pākiž zahm, pākiž vemarg, kōy hātī xāce iž kir ma, rah'mate" خودێ، پاکژ زاهم، پاکژ ڤەمەرگ، کۆی هاتی خاچێ ئژ کر مە، ڕەحمەتێ)" ماناکەی دەبێتە "پاکژی خوا، پاکژی بەهێز، پاکژی نەمر، کە لەبەر ئێمە لە خاچ درا، ڕەحمێکمان پێ بکە"، کە ئەوە بەڵگەیەکی ڕوونە زمانی کوردی بە زمانی میدەکان دانراوە. جگە لەوە ئەگەر سەیری تێکستە میتانیە/هیتیەکەی کەیکوڵی بکرێت کە تەمەنی نزیکی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵە و سەبارەت بە ڕاهێنانی ئەسپ نووسراوە (بڕوانە هیتیەکان)، دەبینرێت کە زمانی میتانیەکان و میدیەکانیش هەر کوردین و هەر یەکن.

سەرەڕای ئەوەی جگە لەو تێکستەی کە ئاماژەی پێکرا، هەتاوەکو ئەمڕۆ تێکستی تر نەدۆزراوەتەوە، بەڵام بە دڵنیایی میدەکان خاوەنی نوسینێکی دارێژراوی خۆیان بوون. کۆمەڵێک لە مێژوونوسان پێیان وایە کە ئەو تێکستانەی بە فارسی کۆن نوسراون، ئەگەرچی زمانەکەی فارسی کۆنە، بەڵام ئەلف وبێکەی میدی بووە و فارسەکان لەوانیان وەرگرتوە بۆ نوسینی زمانەکەیان. سروشتی ئەلف و بێ کوردیە نوێکانی دوای سەردەمی میدەکان بە تەواوی پشتگیری لەو بۆچونە دەکەن و دەیسەلمێنن کە ئەو ئەلف و بێیەی فارسی کۆنی پێ نوسراوە، ئەلف و بێی میدەکان بووە و فارسەکان لەوانیان وەرگرتوە (بڕوانە تێکستی کوردی).

زمانەوانەکان پێیان وایە کە لە هەندێک لە تێکستە کۆنەکاندا ژمارەیەک وشەی میدیان دۆزیوەتەوە. لێکۆڵەر تاڤێرنیێ (Tavernier, 2007)[19] لە فەرهەنگێکدا زۆربەی وشە زاگرۆسی (ئێرانی) یە کۆنەکانی کۆکردۆتەوە و لە ناویاندا کۆمەڵێک وشەی زمانە جیاوازەکانی فارسی کۆن، میدی، ئیلامی، ساگارسی، هتد. ی خستۆتە ڕوو. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت ئەوەیە کە وشە میدیەکان زۆربەیان ئەمڕۆ تەنها لە زمانی کوردیدا ماون. بۆ نموونە (پەراسو، بەرز، بەراز، ساوا، زێڕ، ئاتەر، کۆمە، هتد).

بە داخەوە جگە لە وشەکان، کە زۆربەیان کوردین، شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە ڕێزمانی زمانی میدی دەرناکەوێت. بەڵام لە ناو وشەکاندا هەندێک لایەنی تایبەتمەندی ڕێزمانی زمانی کوردی دەبینرێت. بۆ نموونە، ئامرازی ناسین (اداة التعريف) لە زمانی میدیدا وەک زمانی کوردی بووە. میدیەکان دەڵێن saiva-ka[20] کە لە کوریدا دەبێتە (ساواکە/ساڤاکە).

هەروەها دەبینرێت کە پاشگری (ە) لە میدیدا وەک کوردی بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە لە میدیدا suxra مانای (ئەوەی کە سورە) دەدات. وشەکە پێک دێت لە (suxr + a) و لە کوردیدا بە هەمان شێوە ئەو وشەیە دەبێتە (سورە) کە پێک دێت لە (سور+ە) و ماناکەی وەک وشە میدیەکەی لێ دێت. ئەو بزوێنە لە وشەی تریشدا بەکاردێت بۆ نموونە کاتێک کە دەگووترێت (zary-aspa) کە ماناکەی دەبێتە (خاوەندارێتی ئەسپێکی ڕەنگ زێڕین) و لە کوردیدا دەبێتە (زەڕی ئەسپە) و دیسان پاشگرە میدی و کوردیەکە بە هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێت.

لە دەربڕینێکی میدی وەک Aspan- jira دا کە مانای (خاوەنداری ئەسپی ژیر) دەدات و بە کوردی دەبێتە (ئەسپان ژیرە)، زیاتر لایەنی ڕێزمانی دەردەکەوێت. سەرنج دەدرێت لە وشە میدیەکەدا، (ئەسپ) بەهۆی ئامرازی بەکۆکردنی (ان) کراوەتە کۆ و ئەم جۆرە قسەکردنە ئەمڕۆ لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا بەو شێوەیە دەگووترێت. لە هەندێک ناوچەی تردا دەگووترێت (ئەسپ ژیرە). پێکهاتەی وشە میدیەکە کە بریتیە لە (ئەسپ+ان+ ژیر+ە)، هەر چوار بەشەکانی بە هەمان مانا و هەمان مەبەست دوای زیاتر لە ٢٥٠٠ لە

[19]. ئەم کتێبە بە ناونیشانی Iranica in the Achaemenid period (ca. 550-330 B.C.): lexicon of old Iranian (ئینسایکلۆپیدیای ئێرانی لە سەردەمی ئەخامەنیدا (لە نێوان ٥٥٠-٣٣٠ پ.ز): فەرهەنگی زمانی ئێرانی کۆن)) نوسراوە و چەندین وشەی میدی و ئیلامی و فارسی کۆن لەخۆ دەگرێت.

[20]. بەپێی تەرجومەی کتێبەکەی تاڤێرنیێ، مانای وشەی sava-ka بە ئینگلیزی دەبێتە the orphan کە لە کوردیدا مانای (هەتیوەکە) دەدات. بەڵام مەرج نیە تەرجومەی ئەو وشانە لە سەدا سەد تەواو بن؛ هەندێک جار بە هەڵە مانای وشەکان لێک دەدرێتەوە. ئەم هەڵەیە بەرامبەر وشەی (پەراسو) ش کراوە؛ لە فەرهەنگەکەدا بە مانای (نەرمایی ژێر پەراسو) لێکدراوەتەوە. بەڵام وشەی پەراسو لە زمانی ئاوێستاشدا هاوشێوەی کوردی بە مانای ئێسکەکانی قەفەزەی سنگ بەکار دەهێنرێت. دیارە کە بۆ لێکدانەوەی وشەی sava-ka هەمان هەڵە کراوە. دەبینرێت کە لە زمانی کوردی دا وشەی ( ساوا/ساڤا) بەمانای منداڵی بچوک دێت و (کە) ئامرازی ناسینە؛ واتە وشەکە لە کوردیدا مانای ( ساواکە/ساڤاکە) دەدات و هەمان مانا میدیەکەی لە زمانی کوردی ئەمڕۆ دا وەکو خۆی ماوە.

کوردیدا بەکار دێت.  زۆر لە تایبەتمەندی ڕێزمانیی میدی و سۆمەری لە داڕشتنی ڕستە و بە کۆکردن وەکو یەکن و دەری دەخن کە هەردووکیان هەمان زمانن و بە کەمێک جیاوازی ناوچەییەوە هەمان زاراوەشن. جگە لەوە سەرنج دەدرێت کە هەندێک جیاوازی بەدی دەکرێت لە نێوانی ئەو تێکستانەدا کە لە کڵێسا ئەرمەنیەکەدا لەژێر ناوی زمانی میدیدا هەڵگیراون و ئەو وشانەی کە لە ناو فەرهەنگی میدی-کوردیدا نوسراون و لە کتێبەکەی تاڤێرنی وەرگیراوان؛ یەکەمیان زیاتر کرمانجی سەرو- ە و دووەمیان کرمانجی خوارو. ئەمەش دیسان بەڵگەیەکە کە زاراوە کوردیەکان سەرەڕای جیاوازیان هەموویان هەر بە میدی دانراون.

# فەرهەنگی میدی- کوردی

| وشەی میدی | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| arva-saxta (Tavernier, 2007, p.114) | گورج و بەهێز swift and strong | hara-saxta هەرە- سەختە: لە کوردیدا مانای ئەوپەڕی بەهێز و گرانی دەدات. وشەی hara لە زمانی ئاڤێستاشدا هەیە و هەر بە هەمان مانای کوردی بەکاردەهێنرێت کە بریتیە لە (ئەوپەڕی، زۆر). |
| aspa (Tavernier, 2007, P.119) | ئەسپ horse | asp ئەسپ: لە دوو بەش پێک دێت (هەس+پا) کە لە بنەڕەتدا هەردوو پێکهاتەکانی وشەکە کوردی و سۆمەرین. (بڕوانە وشەی sisi (ئەسپ) لە فەرهەنگی سۆمەریدا). |
| aspa dasta (Tavernier, 2007, P.119) | ئەو کەسەی کە ئەسپ لە ژێر دەستیدا مەشقی پێ دەکرێت He by whom horses are trained | aspi dasta ئەسپی دەستە: هەمان مانای (ئەسپی دەستە، ئەسپی بە دەستە) ی هەیە، واتە (ئەسپ لە ژێر کۆنترۆڵیدایە) و وشەی (دەستەمۆ) کە مانای (ڕاهاتنی ئاژەڵ و ملدانی دەدات) هەر لە وشەی (دەست) دروستکراوە. لە کوردیدا (دەست) مانای ئەو ئەندامەی لەش دەدات کە کاری پێ دەکرێت بەڵام وەک پێکهاتەی ناو، هەمیشە مانای (کۆنترۆڵکردن) ی هەیە. بۆ نموونە (باڵا دەست، بە دەستیەتی، دەستی بەسەرا گرت). |
| aspa-ča (Tavernier, 2007, P.119) | ناوێکی تایبەتە بۆ ئەسپ hypocoristic retrenchment of an aspa name | aspa-še ئەسپە شێ: بە گشتی بە ئەسپی سپی تنۆک تنۆک دەگووترێت (ئەسپە شێ)، ئەم ئاوەڵ ناوە بۆ ڕەنگی تنۆک تنۆکی تریش بەکار دەهێنرێت. |
| aspa- čina (Tavernier, 2007, P.119) | ئارەزووی ئەسپی هەیە desiring for horses | asp kina ئەسپ کنە: وشەی (کنە) مانای (توێژینەوە) دەدات. هەمووی دەبێتە (لە ئەسپ دەکۆڵێتەوە). وشەی (کنە) لە سۆمەریدا دەبێتە kin کە هەمان مانای وشە میدیەکەی هەیە. |
| aspam-iša (Tavernier, 2007, p.120) | بەدوای ئەسپدا دەگەڕێت looking for a horse | īšim aspa ئیشم ئەسپە: واتە (ئیشم بە ئەسپە، واتە پێویستیم بە ئەسپە). ئەگەر سەرنج بدرێت تەنها ڕاناوی (م) ی موڵکداری بۆ کەسی یەکەمی تاک، شوێنەکەی گۆڕاوە. دەنا ئەوانەی تری هەمووی وەک خۆیەتی. ئەم ڕاناوە لە زمانی سۆمەریدا بە mu دەنووسرێت و بە هەمان شێوە بەکاردێت. |
| asp-asta | بە ئێسکی ئەسپێک | asp-hastī ئەسپ- هەستی: وشەی ئێسک لە |

| | | |
|---|---|---|
| (Tavernier, 2007, p.120) | with the bones of horse | کوردیدا پێشی دەگووترێت (ئێسقان، ئێستک، ئێسک، هەستی) (هەژار،پ.٣١). بەو جۆرە ماناکەی دەبێتە (ئێسکی ئەسپ). بە زمانی هیتی بە ئێسقان دەگووترێت hastāi و بە زمانی ئاڤێستا دەبێتە asta و بە زمانی فەرەنسی دەبێتە os، ئیتالی وپورتوگالی osso، ئیسپانی hueso. |
| aspa-bara (Tavernier, 2007, ) p.119 | ئەسپ سوار horseman | aspa-bāra ئەسپە بارە: مانای وشەی (بار) لە کوردیدا دەبێتە (ئەو شتەی کە لەسەر پشتی بارەبەری دادەنێن) (هەژار، پ.٣٩). واتە ئەو کەسەی کە (بارە بەسەر ئەسپەوە، ئەسپ باری کردووە). ئەمڕۆ کورد بەو گیاندارانەی کە شتیان پێ بار دەکرێت دەڵێت (بارەبەر) واتە (ئەوەی کە بار دەبات). وشەی bur لە سۆمەریدا هەمان مانای (بار) ی لە کوردیدا هەیە، کە بریتیە لە کێش و قەبارە و وەک تێبینی دەکرێت لە زمانی میدیدا دووبارە کراوەتەوە. وشەی (بار) لە زمانەکانی تردا دەردەکەوێتەوە. لە زمانی ئینگلیزیدا کرداری bear مانای هەڵگرتن دەدات و bar یەکەی پاڵەپەستۆیە کە لە ئنلیزەکان لە یۆنانیەوە وەریان گرتووە و بە baros دەنوسرێت و بە مانای (کێش) بەکاری دەهێنن. |
| aspa-drda (Tavernier, 2007,p.119) | دڵە - ئەسپە horse-heart | aspa-zirda ئەسپە - زردە: لە زمانی کوردیدا وشەی دڵ دەشبێتە (زرد zird ) (مینۆرسکی،٢٠٠٦، پ. ١٢)[21]. بەو جۆرە وشەکە مانای دڵە ئەسپ دەدات. |
| (aspa-gu-š) aspaguš (Tavernier, 2007, p.119) | ئەسپ و گا horse and cattle | aspu-gā-š ئەسپ و گاش: وەک لە تەرجومەی وشەکەدا دەردەکەوێت، پاشگری (ش) وەک کوردی بەکارهاتووە. جگە لەوەش، وشەی (گا) وەکو خۆی لە کوریدا ماوە و لە سۆمەریشدا هەر وەک میدی، بریتی بووە لە gu. |
| aspan-jira (Tavernier, 2007, p.120) | ئەسپەکانی ژیرن having a smart horses | aspan- žīra ئەسپان - ژیرە: هەمان مانای ماوە. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت، ئامرازی بە کۆکردنی (ان) لە میدی و کوردیدا وەک یەکن. هەروەها ئەم ئامرازە لە زمانی سۆمەریشدا بەکاردێت بەشێوەی ene. پیتی (ە) کە ڕاناوە بۆ ئاماژەکردن بە کەسی سێهەمی تاک لە نێوان کوردی و میدیدا |

---

[21]. زۆر لە وشە کوردیە ڕەسەنەکان، لە ناو لادێ و ناوچە شاخاویەکاندا ماون و لە فەرهەنگە کوردیەکاندا تۆمار نەکراون. بۆ نموونە وشەیەکی وەک (زرد) کە مینۆرسکی تۆماری کردووە، لە فەرهەنگی هەژاردا نیە. نووسەری ئەم کتێبە لەبەر ئەوەی کە ڕەچەڵەکی باووباپیرانی پێنجوێن بووە، هەندێک وشەی لەوێوە دۆزیوەتەوە کە لە هیچ فەرهەنگێکی کوردیدا نەبینراوە و لە کەم ناوچەدا بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە وشەی (قونتس) کە مانای (چیچکە کردن) دەدات، لە زمانی هوریدا بەکارهاتووە کەچی لە فەرهەنگە بەنرخەکەی هەژاردا نیە.

| | | |
|---|---|---|
| | | یەکن، بۆیە دەگووترێت (ژێر+ە).<br>لە هەندێک ناوچەی کوردستان دەگووترێت (ئەسپ ژێرە) لەوێدا دەشێت وشەی (ئەسپ) تاک بێت یان کۆ، بەڵام لە هەندێک ناوچەی وەک (موکریان، هەولێر، پشدەر،هتد) دا دەگووترێت (ئەسپان ژێرە) و بەوجۆرە (ئەسپ) دەکرێتە کۆ بۆ ئەوەی کە مانای مەبەست بدات. |
| asa(n) (Tavernier, 2007, p.584) | بەرد<br>stone | hasān هەسان: جۆرە بەردێکە کە بۆ تیژکردنی چەقۆ بەکاردەهێنرێت. هەروەها تاشە بەردی لوسی شاخ پێی دەگووترێت (سان). بە زمانی لوڤی دەبێتە asu. |
| aspa-naxva (Tavernier, 2007, p.120) | ئەو کەسەی کە لە مێشکی ئەسپدایە<br>he who is at the head of horses | aspa-ñāxa ئەسپە- ناخە: لە کوردیدا (ناخ) مانای (ناوەوەی هەر شتێک) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (لە ناخی دڵمەوە، لە ناخی ئەرزەوە، لە ناخیەوە دێت) بەو جۆرە مانای وشەکە دەبێتە (ناخی ئەسپە). |
| aspa sri (Tavernier, 2007, p.120) | خاوەنداریتی ئەسپێکی جوان<br>having a beautiful horse | asp saira ئەسپ سەیرە: واتە (کەسێکی خاوەن ئەسپی سەرسوڕ هێنەرە). |
| aspa-stana (Tavernier, 2007, p.120) | ئەو کەسەی کە شوێنەکەی لەگەڵ ئەسپدایە<br>he whose place is with horses | aspa- stāna ئەسپە- ستانی: دەشێت مەبەستی لە خەڵکی وڵات یان جیهانی ئەسپ بێت. لە سۆمەریشدا (ستان) بە شێوەی ašte نوسراوە. بۆ نموونە لە کوردیدا ئەمڕۆ دەگووترێت (شارستانی، شاخستانی، کوێستانی، گەرمستانی، کافرستانی) کە لە سەر هەمان بناغە داڕێژراون. |
| aspa-šuna (Tavernier, 2007,121) | قامچی بەدەستی ئەسپ<br>having a horse-whip | aspa-šuāna ئەسپە- شوانە: لەوە دەچێت وشەکە هەر پێکهاتبێت لە (ئەسپە شوانە) لەبەر ئەوەی، ناوی شوان لە کوردستاندا لەو سەردەمەدا بەکارهاتووە و ناوی ناوچەیەکی مانیەکان بریتی بووە لە šuan-dahul کە (شوانەدۆڵ) ی ئەمڕۆیە (بڕوانە زمانی مانیەکان). |
| asp ušta | ئەسپ وەسف کراوە<br>horse praised | asp ušta ئەسپ وشتە: وشەی (وشتە) مانای (جوانی دڵکێش) دەدات (هەژار، پ.٩٢٤). |
| asp-vaiθana (Tavernier, 2007, p.121) | ئەو کەسەی کە ئەسپ دەناسێت (ئەسپ ناسە)<br>he who knows horses | asp-uasena ئەسپ وەسێنە: واتە ئەو کەسەی کە کۆنترۆڵی ئەسپ دەکات. لە ڕاستیدا هەمان وشە لەلای میتانیەکان بە شێوەی assuussanni نوسراوە کە بە (ڕاهێنەری ئەسپ) تەرجومە کراوە. ئەمیش دیسان مانای وشەی (ئەسپ وەسێن/ئەسو وەسێن) ی کوردیە. (بڕوانە پەیوەندی زمانی هیتی و کوردی). زۆربەی ناوە کۆنەکانی پەیوەست بە ئەسپ کوردین، بۆ نموونە |

| | | |
|---|---|---|
| | | هوریەکان بە (ئەسپ سواری) دەڵێن assuwanni کە لە کوردیدا دەبێتە (ئەسپەوانی). (بڕوانە هیتیەکان). |
| aspa-yauda (Tavernier, 2007, p.121) | شەڕکردن لەسەر پشتی ئەسپەوە Fighting on horseback | asp-haudā ئەسپ - هەودا: وشەی (هەودا) لە کوردیدا مانای (پەلامار ، شاڵاو) دەدات (هەژار، پ.١٠٠٨). |
| aspa-zanta (Tavernier, 2007, p.121) | کەسێک کە بەهۆی ئەسپەکەیەوە دەناسرێتەوە He who is recognized because of his horse | zānte زانتێ: هەمان مانای (ئەزانێ) ی هەیە لە کوردیدا و لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا دەگووترێت (وامزانتێ) لەبری (وامزانی). (زانتێ) لەوێدا (ئەزانێ) دەگرێتەوە. بەو جۆرە ماناکەی دەبێتە (بە ئەسپەکەدا ئەزانرێت، ئەناسرێتەوە). لە زمانی سۆمەریدا ناسینەوە دەبێتە zu . |
| atr-brzana (Tavernier,2007, p.124) | بەرزکردنەوەی ئاگر exalting the fire | ātar-barzāna ئاتەر بەرزانە: وشەی (بەرزان) و (ئاتەر)هەمان مانای وەک خۆی ماوە لە کوردیدا. وشەی (بەرز) لە ئاڤێستادا بە شێوەی barz نووسراوە. هەروەها ئەو وشانەی کە ئەمڕۆ لە کوردیدا بۆ ئاماژەکردن بە ئاگر (ئایر، ئاگر، ئاتەر، تایر) بەکاردەهێنرێن، بنەچەکەیان لە سۆمەری و میدی و هوری و ئاڤێستادا هەن. میدی atr، سۆمەری gir، هوری tari مانای (ئاگر) دەدات. لە لاتینیدا aduro کرداری سوتاندن و گڕ تێبەردانە وشەی ئاگر لە ئینگلیزیدا بووەتە fire و لە هۆڵەندیدا vuur و سوتاندن لە ئیسپانیدا دەبێتە ardour. لە کرواتیدا vatra مانای (ئاگر) دەدات. ئەم وشەیە بە مانای (تەقەکردن) لە زمانی ئیتاڵیدا بەشێوەی tiro و لە فەرەنسیدا tir دەردەکەوێت. لە فەرەنسیدا âtre مانای (ئاگردان) دەدات. |
| atr-bazu (Tavernier, 2007, P.124) | قۆڵ- ئاگر fire-arm | ātar-bāzu ئاتەر- بازو: لە ئاڤێستا و کوردیدا وشەی (بازو) وەک خۆی ماوە و هەردوو وشەکە مانایان نەگۆڕاوە. |
| baga-banda (Tavernier, 2007, p.131) | ئەو کەسەی کە خزمەت/ پشتگیری بەگ دەکات، بەندە بە خواوە he who serves/supports baga, bound to god | baga- banda بەگە- بەندە: لە کوردیدا وشەی (بەگ) مانای (نازناوی دەسەڵاتداری کوردە). وشەی (بەندە) وەک خۆی و بە هەمان مانا بەکاردێت و لە سۆمەریدا بەشێوەی banda نووسراوە و لە ئینگلیزیدا وشەی (بەندە)ی کوردی دەبێتە bound. |

| | | |
|---|---|---|
| baga-bazu (Tavernier, 2007, p.131) | بازوی بەگە- خوا arm of Baga-God | bag-bāzu بەگ بازو: وەک خۆی ماوە بەڵام وشەی بەگ/بەگە (baga) لە کوردیدا چیتر مانای خوای نەماوە و مانای دووهەمی میدی ماوە، کە نازناوی پایەبەرزی کوردە. ئەم وشەیە لە ناو مانیەکانیشدا بەکارهاتووە, وا دیارە بنەچەکەی هوریە. شایانی باسە کە بەگایەتی لە کوردستاندا تەنها بە خوێن دەبێت. یەکێک لە خوای مانیەکان ناوی بەگ بەردو (bagbartu) بووە، کە مانای (خوای بەرد) دەگرێتەوە (بروانە پەیوەندی زمانی مانی وکوردی). ئەم وشەیە ئەمڕۆ چووتە ناو زمانی نەتەوەکانی تر، عەرەبەکانی میسر لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکاری دەهێنن بە شێوەی (بێ) دەیڵێن و تورکەکانیش لەگەڵ هاتنیان بۆ ناوچەکە وەریان گرتووە و زیاتر بۆ ئاماژەکردن بە پایەبەرزی کەسێک بەکاری دەهێنن. بەڵام لە کوردیدا تەنها مانا ڕەسەنەکەی ماوە و کەسێک دەبێت بە ڕەچەڵەک بەگ بێت، دەنا ناتوانرێت پێی بگوترێت بەگ. |
| baga-zušta (Tavernier, 2007, 144) | دۆستی بەگە Loved by Baga | baga-dosta بەگە- دۆستە: وەک خۆی ماوە تەنها پیتی (ش)ی میدی، بووەتە (س) لە کوردیدا. بە سۆمەری بە (دۆست) دەگووترێت dusa. ئەمڕۆ لە کوردیدا (دۆس/دۆست) هەردووکیان بەکاردەهێنرێن. |
| baratvahuš (barat-vahu-š) (Tavernier, 2007, p.147) | هەڵگری باشی (شتی باش) Carrying the good | barātī-has بەراتی- هەس: ماناکەی دەبێتە (ئەو کەسەی کە بەرات/خۆشی هەیە/لایە). |
| barzimanah (Tavernier, 2007, p.151) | هزر بەرزە high-minded | barzīmānā بەرزی مانا: لە کوردیدا ئەمڕۆ ماناکەی زۆر نزیکە. (بروانە وشەی razumana). |
| brza (Tavernier, 2007, p.151) | کەسێکی بالابەرز، بەرز The tall one, high | barza بەرزە : لە کوردی و ئاوێستادا وەک خۆی ماوە. |
| brzi (Tavernier, 2007,P.14) | بەرز/بەرزی High | barz/barzī بەرز/بەرزی: ئەم وشەیە وەک خۆی ماوە و لە کوردیدا وشەی (بەرێز) یشی لێ دروستکراوە کە لە بنەچەی بەرزبوونەوە هاتووە. لە زمانی ئاڤێستادا وەک خۆی ماوە و بە زمانی میدی وشەی barziya ی لێ دروستکراوە و لە هەمان فەرهەنگی وشە زاگرۆسی (ئێرانی) مکاندا باسکراوە. بەرزیە (Barziya/ Bardiya) ناوی یەکێک لە موغە میدیەکان بووە کە لەلایەن |

| | | |
|---|---|---|
| | | فارسەکانەوە کوژراوە. لەو بارەیەوە ، هیرۆدۆت دەڵێت: کاتێک کە بەردیە (بەرزیە) کوژرا، هەموو ناوچەکان تازیَ بار بوون ، جگە لە ناوچەی فارس کە هۆکاریان هەبوو ئاهەنگ بگێرن (Daniel, 2001, p.40). هێرۆدۆت مەبەستی لەوەیە کە فارسەکان بە کوشتنی ئەو موغە میدیە خۆشحاڵ بوون، بەڵام ناوچەکانی تر کە لە ژێر کاریگەریی فەرهەنگی ئاینی میدەکاندا بوون، هەموویان تازیە بار بوون. |
| čitaya-gauθra (Tavernier, 2007, p.157) | تامەزرۆی و حەسەرەتی پەیداکردنی گەوهەرەوە Intent upon jewels | šetī gauhara شێتی گەوهەرە: هەمان مانای ئەمرۆی ماوە. |
| čarp aspa (Tavernier, 2007, p.376) | ئەسپی قەڵەو fat horse | xirpin aspa, xirta aspa خرپن ئەسپە، خرتە ئەسپە: (خرتە ئەسپە) واتە ئەسپێکی قەڵەوە و (خرپن ئەسپە) واتە ئەسپێکی گۆشتنە. |
| čiθra-brzana (Tavernier, 2007, p.157) | لە ڕەچەڵەکێکی بەرزە exalting his lineage | sajara-barzāna سەجەرە بەرزانە: وشەی (سەجەرە) لە کوردیدا بریتیە لە ڕەگەزنامەی بنەماڵە یان کەسێک؛ هەردوو وشەکە لە کوردیدا وەک خۆیان ماون. |
| dahyu-vraisa (Tavernier, 2007, p.164) | ئەو کەسەی کە بە شوێناندا دەگەڕێت (دەروێش، قەڵەندەر) he wanders in the land | dorīš / darueš دۆریش، دەروێش: هەردوو وشە کوردیەکە بە گوتنی جیاواز هەمان مانای (عەودال، گەریدە، گەڕۆک، قەڵەندەر) دەدەن (هەژار،پ،٣٠٢). هەڵبەت نابێت ئەم وشەیە تێکەڵی وشەی Dārayavauš بکرێت، کە ناوی پاشای فارسەکان بووە. چونکە ماناکەی و نووسینەکەی لەم وشەیە جیاوازە . |
| dasa-pāθra-auka | دە جۆر پاسراوە (پارێزگاری کراوە) having ten kinds of protection | dasa pasra auaka دەسە پاسراوەکە: ئەمڕۆ ژمارە (١٠) بە گشتی لە کوردیدا بە (دە) دەخوێنرێتەوە، بەڵام لە زاراوەی دملی (زازاکی) دا دەبێتە (دەس). بەشی (پاسراوەکە) هەتاوەکو ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا وەک خۆی ماوە. |
| fra-vraza (Tavernier, 2007, 183) | فرە دڵخۆشە very joyful | fira-firāza فرە فرازە: (فرە) لە ژیانی ڕۆژانەدا زۆر بەکاردەهێنرێت و مانای (زۆر، گەلێک) دەدات و (فراز) مانای (بێ کێشەیی و ئاسودەیی) دەدات. |
| ganja (Tavernier, 2007, p.554) | گەنج (زێڕ و زیو) Treasure | ganj گەنج: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە . |

| | | |
|---|---|---|
| ganza-bara (Tavernier, 2007, p.422) | بەرپرسی دارایی Treasurer | ganj-bar گەنج بەر: لە کوردیدا مانای کارمەندی گەنج و سامان دەدات. لەبەر ئەوەی لە کوردیدا وشەی (ڕەنج بەر) هەیە، کە ئاماژەیە بۆ کەسێک کە ئەرکی گران دەکێشێت کە لە سەر هەمان پرنسیپ بە زیادکردنی پاشگری (بەر) دروسکراوە کە بۆ پیشە بەکاردێت. بەو جۆرە وشەی (گەنج بەر) هەر لە هەمان پرەنسیپەوە هاتووە، لەبری کارمەکەی (ڕەنج) بێت، دەبێتە (گەنج) کە سەروەت و سامانە. |
| gauθra (Tavernier, 2007, p.544) | گەوهەر Jewil | gauhar گەوهەر: ئەم وشەیە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و عەرەب وەری گرتووە و کردوێتیە (جوهرة) و نزیکی هەیە لەگەڵ زمانەکانی وەک ئینگلیزی jewil ، فەرەنسی joaillier ، ئەڵمانی juwel . |
| hambrza (Tavernier, 2007, p.194) | بەیەکەوە بەرزن high together | hāmbarza/hāubarza هام بەرزە/هاوبەرزە: هەمان مانای هەیە. وشەی (هەم، هەموو) ی لە زمانی هیتیشدا دەردەکەوێت. ئەوان بە هەمان شت دەڵێن himma. |
| haθya (Tavernier, 2007, p.555) | ڕاستی truth | haqīaهەقیە: لە کوردیدا وشەکە مانای (ڕاستیە) دەدات. ئەمە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە وشەی (هەق)، لە بنەڕەتدا کوردیە و دوایی چوەتە زمانی عەرەبیەوە و بووەتە (حق). لەبەر ئەوەی کە بە زمانی هیتییش بە سوێنخواردن یان قسەکردن لەژێر سوێندا دەگووترێت huek، کە لە مانادا زۆر نزیکە. تەنها پیتی (ث) ی میدی بووە بە (ق) لە کوردیدا. |
| haθe-baduš (Tavernier, 2007, p.197) | بازوی ڕاستی true arm | haqa bāzu هەقە بازو: هەمان مانا دەدات |
| haθya-vanya (Tavernier, 2007, p.197) | لە ڕێگای حەقەوە باشترە better through truth | haq hania حەق هانیە: واتە (حەق هانیویەتی) کە ماناکەی وەک یەکە لەبەر ئەوەی مەبەستەکە دەبێتە (لە ڕێگای حەقەوە هاتووە). |
| haθya-vista (Tavernier, 2007, p.198) | ئەو کەسەی کە ڕاهێنراوە لە سەر ڕاستی He who is trained in truth | haqa-uīstā هەقە- ویستە: مانای (ئەو کەسەی کە حەقی دەوێت) دەگرێتەوە. |
| hezahra (Tavernier, 2007, p.555) | هەزار thounsand | hazār هەزار: هەمان مانا دەدات. |
| hiθ-yauna | شوێنی هاوڕێیایەتی | haz-yāna حەز-یانە: وشەی (یانە) لە کوردی |

| | | |
|---|---|---|
| (Tavernier, 2007, p.203) | place of fellowship | نوێ و میدیدا هەمان مانا دەدات کە بریتە لە (شوێن) و بەو جۆرە ناوەکە هەمووی هەر هەمان مانا دەدات. |
| hu-spa-asta (Tavernier, 2007, p.211) | ئێسقانی سەگی باشی هەیە With the bones of a good dog | haī-sipar-hastī هەی- سپەر- هەستی: وشەی (هەی) مانای (هەیەتی) دەگرێتەوە و وشەی (سپەر، سپڵۆت) لە کوردیدا دوو وشەی ترن بۆ (سەگ) و (هەستی) مانای (ئێسک) دەدات. ڕستەکە دەبێتە (هەیەتی ئێسکی سەگ). |
| kome (Diakonoff, 1985, ) p.89 | دەسەڵاتی ناوچەیی township | komā/kom کۆما/کۆم: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (کۆ، تۆپەڵ، کۆگە) دەدات و دەبێتە پێکهاتەی وشەکانی (کۆمەڵ، کۆمار) کە هەمیشە پرەنسیپەکانی کۆبوونەوە و کۆمەڵی تێدایە. لە زمانی سۆمەریدا gu مانای (کۆ) ی کوردی هەیە. وشەکە ڕاستەوخۆ لە هەندێک لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دەبینرێت و لەوێ وەک پێشگر بە هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێت بۆ نموونە لە وشە ئینگلیزیەکانی وەک community, company, combine. هەتاوەکو ئەمڕۆ commune یەکەیەکی ئیدارییە لە وڵاتی فەرەنسادا. |
| masa (Tavernier, 2007, p.242) | مەزن great, big | mas, mazin مەس، مەزن: هەردوو وشەکە لە کوردیدا مانای (گەورە، سەرکردە) دەدەن. لە سۆمەریدا massu مانای (سەرکردە) و mes مانای (پاڵەوان) دەدات . لە لوڤیدا mashana مانای (مەزنکردن) و masana مانای (خوادا) دەدات. لە ئاڤێستادا دەبێتە masan کە هەمان مانای وشە میدی و کوردیەکەی هەیە. ئەم وشەیە چووەتە زمانی ئینگلیزیەوە بە شێوەی mass کە مانای ژمارەی زۆری خەڵک یان شت دەدات و لە لاتیندا دەبێتە missa. لە فەرەنسیدا جگەلەوەی کە وشەی masse مانای ژمارەی زۆری هەیە کرداری masser-یش مانای (زۆرکردن، کۆکردنەوە، پێکەوە لکان) دەدات. |
| miθra-pana (Tavernier, 2007, p.250) | میسرای پارێزگارکار Mithra protecting | mīsrā panā میسرا- پەنا: لە کوردیدا وشەی (پەنا) هەمان مانای هەیە. |
| miθra-pata (Tavernier, 2007, p.251) | میسرا پارێزگاریِ دەکات Protected by mithra | mīsrā pāsa میسرا پاسە: وشەی (پاس) لە کوردیدا مانای پارێزگاریکردنی هەیە و لە زمانی هیتیدا بریتیە لە pahš. ناوی (ئازەربایجان) لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە Atropatene کە بە ناوی پاشایەکی میدیەوە ناونراوە و ناوەکەی مانای (ئاتەر پات/ئاتەر پاس/ئاگر پارێز) ی داوە. ئەو |

| | | |
|---|---|---|
| | | وڵاتە کە لەو سەردەمەدا لە ژێر دەستی میدەکاندا بووە، بە ناوی ئەوەوە ناونراوە و دوایی عەرەبەکان ناوەکەیان کردۆتە (ئازەربیجان) (بڕوانە میدەکان). |
| miθra-upasta (Tavernier, 2007, p.252) | بە هاوکاری میسرا (بە پشتی میسرا) With the assistant of mithra | uapištī- mīsrā/mīsrā uapišta و میشتی میسرا/میسرا ومپشتە: هەمان مانا دەدەن. |
| miθra- vahišta (Tavernier, 2007, p.252) | باشترین لە ڕێگای میسراوە The best through mithra | mīsrā-bahašta میسرا بەهەشتە: ماناکەیان نزیکە. |
| miθra-vasa (Tavernier, 2007, p.253) | ویستی میسرا mithra willing | mīsrā-uīsī میسرا ویسی : واتە ئەوەی کە میسرا دەیخوازێت. لە زمانی کوردیدا وشەی (ویست) بە شێوەکانی (خواست، ویس) یش دەنووسرێت و بە سۆمەری دەبێتە ašte و بە لوڤی دەبێتە wazi، لە کوردیدا بە شێوەکانی میدی،سۆمەری و لوڤی (ویست/ویس) ماوە. لە زمانی ئیسپانیدا دەبێتە istanza و بە مانایەکی نزیک لە زمانی ئینگلیزی و لاتینیدا دەبێتە quest و بە فەرەنسی دەبێتە . quête |
| miθra yazna (Tavernier, 2007, p.253) | ئەو کەسەیە کە میسرا دەپەرستێ he who worships Mithra | mīsrā pasina میسرا پەسنە: وشەی (یەزن) لە کوردیدا بەو مانایە نەماوە. بەڵام وشەی (پەسن) مانای (وەسفکردن، چاکەگوتن، پیا هەڵدان) دەدات. هەروەها وشەی (پەسەن) یش هەیە کە مانای (هەڵبژاردن و بە باشزانین) ی هەیە. |
| nugu, nugi'u (Diakonoff, 1985, p.91) | تەواوی دەڤەرێک/ناوچەیەک Entire district | nāujī/nāuca ناوجی/ناوچە: هەردووکی مانای (دەڤەر، مەڵبەند) دەدەن. بە زمانی سۆمەری دەگووترێت niĝin کە لە (ناوەن/ناوەند) نزیکە. |
| ori (Tavernier, 2007, p.561) | ژمارە سێ three | هیرێ hire: بە زاراوەی زازاکی وەک زمانی میدی ماوە. لە زمانی هیتیدا دەبێتە teri. ئەم ژمارەیە لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا دووبارە دەبێتەوە. |
| par(u)v-aspa (Tavernier, 2007, p.391) | دەوڵەمەندە لە ئەسپدا rich in horses | pra/prī-aspa پرە/پری- ئەسپە: وشەی (پڕ) لە کوردیدا مانای (زۆر، گەلێك) دەدات. و وشەکە دەبێتە (پڕی ئەسپە)، کە هەمان مانا دەدات. لە زمانی ئاڤێستادا وشەی (پڕ) ی کوردی بە شێوەی pere/par نووسراوە. |
| paθra (Tavernier, 2007, p.561) | پاراستن protection | pāsra پاسرا: ڕەگی وشەکە پێک دێت لە (پاس) کە مانای پاراستن دەدات و پاشگری (را) ی وەرگرتووە هاوشێوەی وشەکانی وەک |

| | | |
|---|---|---|
| | | (کوژرا/کوژرا-گۆڕ/گۆڕرا-هاڕرا- بڕرا). وشەی (پاس) ی کوردی کە مانای (پاراستن) دەدات، لە زمانی هیتیدا دەبێتە pahš. بەڵام لەوە دەچێت کە لە کوردیدا ئەم وشە میدیە گۆڕانێکی تێدا کرابێت و کرابێتە (پارێز parez) کە دەبێتە ڕەگی (پاراستن). ئەم وشەیە لە زمانی لاتینیدا بە شێوەی patronus دەرکەتووە کە مانای (پاراستن) دەدات و لە زمانی ئینگلیزی و فەرەنسیدا بووەتە patron. |
| prsu (Tavernier, 2007, p.561) | ئەو بەشەی لەش لە نێوان کەمەر و پەراسودایە (قەپەرغە) flank | parāsu پەراسو: لە کوردیدا (پەراسو) ئەو ئێسقانانەن کە پێکهاتەی قەفەزەی سنگن. لەوە دەچێت کە تەرجومەکە بە دروستی نەکرابێت[22] لەبەر ئەوەی کە وشەی (پەراسو)ی کوردی، لە ئاڤێستادا دەبێتە peresu. |
| rašta (Tavernier, 2007, p.283) | ڕاستە true | rāsta ڕاستە: لە زمانی کوردیدا وەک خۆی ماوە بەڵام ئەوەی کە تێبینی دەکرێت کە زۆر جار پیتی (ش) لە زمانی میدی و سۆمەریشدا دەبێتە (س) لە کوردیدا. بۆنمونە بە سۆمەری دەگووترێت abaraša ، کە ماناکەی بە کوردی دەبێتە (بەڕاستی). ئەوەی جێی سەرنجە لە کوردیدا بەشێوەی (ڕاس/ڕاست) دەنووسرێن، کە هاوشێوەی میدی و سۆمەریەکەیە. |
| raz (Tavernier, 2007, p.562) | ئاراستە کردن to point | ārāsa/ārāsta ئاراستە/ئاراسە: هەمان مانا دەدات. |
| razumana (Tavernier, 2007, P.12) | هزر/بیر ڕاست upright mind | rāsamānā ڕاسەمانا: لە کوردیدا وشەی (ڕاست) بە شێوەی (ڕاس) یش دەگووترێت و لە زمانی سۆمەریشدا هەر هەبووە و لە وشەی وەک abaraša دا دەبینرێت کە مانای (بەڕاستی) کوردی دەدات. وشەی mānā لە کوردیدا مانای (مەعنا) دەدات و لە ئینگلیزیشدا وشەی (مانا) ی کوردی دەبێتە mean. هەروەها لە کوردیدا بە شێوەی (مینە mīna) مانای (توێژینەوە، پشکنین، شیکردنەوە) دەدات (هەژار، پ، ٨٤٦). ئەم وشەیە ناوی یەکێک لە بنەماڵە گەورەکانی کوردستان بووە کە ناوی (مانی) یان لە خۆیان ناوە و نیشتەجێی ناوچەی موکریان بوون. هەروەها یەکێک لە پێغەمبەرە گەورەکان کە لە کوردستاندا سەری هەڵداوە، هەمان ناوی (مانی) |

[22]. تەرجومەی زمانە کۆنەکان هەندێک جار مەرج نیە لە سەدا سەد ڕاست بێت و زمانەوانی جیاواز بە شێوەی جیاواز وشەکان تەرجومە دەکەن.

| | | |
|---|---|---|
| | | لە خۆی ناوە. بە مانا میدیەکەی، ئەم وشەیە لە زمانی لاتینیدا بووەتە mens و بە ئینگلیزی بووەتە mind بە مانای (هزر، هۆش). |
| saiva-ka (Tavernier, 2007, p.160) | هەتیوەکە<br>The orphan | sāvā-ka/sāuā-ka ساوا/ساڤاکە: لە کوردیدا (ساوا/ساڤا) مانای منداڵی بچووک دەدات. ئەوەی کە تێبینی دەکرێت،ئامرازی (کە) لە زمانی میدیدا وەکو کوردی ئەمڕۆ هەبووە و هەمان ڕۆڵی ئامرازی ناسینی هەبووە. ئەم پاشگرە لەلای مانیەکانیش بە هەمان مەبەست بەکارهاتووە (بڕوانە پەیوەندی زمانی مانی و کوردی) |
| sata-aspa (Tavernier, 2007, p.311) | خاوەنی سەد ئەسپە<br>Possessing hundred horses | sat- aspa سەت- ئەسپە: وەک خۆی ماوە. |
| sata maiša (Tavernier, 2007, p.310) | ١٠٠ مەڕی نەخەسێنراوی هەیە<br>possessing 100 rams | sat mih/mar سەد مەهـ/مەڕ: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی (مەهـ/مەڕ) دەگووترێت. |
| spa (Tavernier, 2007, p.314) | سەگ<br>dog | spar, splot سپەر، سپڵۆت: ئەمانە لە کوردیدا دوو ناوی ترن بۆ سەگ (هەژار، پ.٤١١). بە زمانی لوڤی دەبێتە suwan. لە زمانی ئاڤێستادا بە هەردوو شێوەی span, spâ دەردەکەوێت. |
| suxra (Tavernier, 2007, P.20) | ئەوەی کە سورە<br>The red one | sura سورە: ئەم وشەیە پێک دێت لە (سور+ ە)، تەنانەت بزوێنەکەش لە کوردیدا وەک خۆی و بەهەمان مانا بەکاردەهێنرێت. لەبەر ئەوەی بەهۆی پاشگری (ە) وە، وشەی (سور) ماناکەی دەبێتە (ئەوەی کە سورە).<br>ڕەنگی سور بە زمانی سۆمەری دەبێتە su و بە زمانی هوری بە خوێن دەگووترێت tsurgi کە لێرەدا وا دەردەکەوێت لە هیتیدا زیاتر ئاماژە بێت بە ڕەنگەکەی. |
| sar (Tavernier, 2007, p.309) | سەر<br>head | sar سەر: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە هوری و هیتی بەشێوەی sarri بە مانای (پاشا) دەردەکەوێت و لە زمانی لیدیدا sarli مانای (سەرکردە) دەدات. لە کوردیدا هەموو مانا کۆنەکانی ماوە. |
| šara-gauz-iya (Tavernier, 2007, p.309) | سەر داپۆشین<br>covering the head | sar-gauzāua سەر گەوزاوە: وشەی (گەوزا) لە کوردیدا کردارێکە بەمانای (خۆ هەڵکێشان لە شتێک). بۆ نموونە دەگووترێت (سەری لە خوڵەکەدا گەوزان، خۆی لە قوڕەکەدا گەوزان). |
| šya-brzana (Tavernier, 2007, | بەرزراگتنی دڵخۆشەکان | šāiī-barzāna شایی- بەرزانە: واتە (ئاهەنگ بەرزکردنەوە). |

| | | |
|---|---|---|
| p.318) | exalting the happy ones | |
| taxma (Tavernier, 2007, p.323) | ئازا<br>brave | tokma تۆکمە: لە کوردیدا مانای (بەهێز و توند) دەدات. لە ئاڤێستادا taxma هەمان مانای وشە میدیەکەی هەیە. |
| taxma-bara (Tavernier, 2007, p.323) | سوارە ئازاکە<br>the valiant horseman | tokma-bāra تۆکمە بارە: واتە (ئەو بارەی کە توند و تۆڵ و بەهێزە). |
| taxma-spada (Tavernier, 2007, P.20) | (ئەندامە لە) سوپایەکی ئازا<br>(belonging to) a brave army | tokma-supadā تۆکمە- سوپادا: واتە (لە ناو سوپایەکی پتەو/بەهێز) دا. |
| varaza (Tavernier, 2007, p.338) | بەراز<br>boar | baraz بەراز: لە کوردیدا بە نزیکی وەک خۆی ماوە و لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە boar و بە ئیسپانی verraco و بەفەرەنسی verrat. |
| varya-zata (Tavernier, 2007, p.340) | وەک منداڵێکی پەسەند لەدایک بووە<br>born as the desired child | urīā-zāda وریا- زادە: واتە لە کەسێکی زیت و زرنگ بووە. |
| vasa (Tavernier, 2007, p.340) | ویستن، حەسرەتی بوون<br>longing for, desiring | uīsa/usīta ویسە/ویستە: لە کوردیدا (ویس/ویست) هەر هەمان وشەن و ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە ašte لە زمانی لوڤیدا دەبێتە wazi. تێبینی ئەوە دەکرێت کە لە زمانی کوردیدا وشەکە بە هەردو جۆرەکەی ماوە و ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزی و لاتینیدا دەبێتە quest و بە فەرەنسی دەبێتە quête. |
| vasa-raza (Tavernier, 2007, p.340) | بەرێوەبردن بەپێی خواستی ئەو<br>Commanding according to his wish | uīsa/usīta rāza ویسە/ویستە ڕاز: لە کوردیدا (ڕاز) بەکاردەهێنرێت کاتێک کە دەگووترێت (ڕازی دڵ). واتە (نیازی دڵ)، بەو جۆرە وشەکە دەبێتە (ڕازی ویستراو). |
| yauna (Tavernier, 2007, p.203) | شوێن<br>place | yāna یانە: لە کوردی نوێدا دوو وشە هەن یەکێکیان بە مانای (شوێنی حەسانەوە، خانوو) بەکاردێت و دەبێتە (یانە) ئەوی تریان بریتیە لە (یان) کە بامانای (شوێن، دەڤەر، ناوچە) بەکاردێت و ئەویش لە ناوچەکانی وەک (گەرمیان، موکریان، ئاکۆیان) دا دەبینرێتەوە و بنەچەکەی هوریە؛ هوریەکان بە شێوەکانی inu, inna نووسیویانە. |
| xšaθra (Tavernier, 2007, p.569) | شانشین<br>Kingdom | xištarī خشتەری: ئەم وشەیە هەتاوەکو سەدەی سیانزەهەمی زاینی لە زمانی کوردیدا بەکارهاتووە. کاتێک کە نەوشیروان بەغدادی |

| | | |
|---|---|---|
| | | شاعیر، سەردانی هەولێر دەکات، شیعرێکی هەجوو دەنێرێت و لە شیعرەکەدا دوو دێڕی وشەی کوردی تێکشکاوی تێ دەکات و دەڵێت (والكردُ لا تسمع إلا جيَا، أو نجيَا أو نَتوَى زَنكلا، كلا وبوبو علكوا خشتري، خِيلوا وميلوا مُوسَكا مَنكلا) (ياقوت الحموي، ٢٠١٠،پ.١/٨٨) دەبینرێت وشەکە لەگەڵ وشەکانی (خێڵ، علک/خەڵک) دا بەکارهاتووە و هەر بە هەمان مانا بەکارهاتووە. |
| xšaθrazata (Tavernier, 2007, p.309) | لەدایکبووی مەملەکەت<br>Born in the kingdom | xštarī zāda خشتەری زادە: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| zrdiyavauš (zrd-iya-vau-š) (Tavernier, 2007, p.371) | دڵی باشە<br>With a good heart | zirdī has زردی هەس: بەوجۆرە ماناکەی دەبێتە (دڵی هەس)، کە ئەمڕۆ هەمان مانای وەک خۆی ماوە. بە زمانی هیتی بە (دڵ) دەگووترێت kard، ئەم وشەیە بە زمانی لاتینی دەبێتە cordis و بە ئینگلیزی heart. |
| zarniya (Tavernier, 2007, p.370) | ڕەنگ زێڕینیە، زەرد<br>Gold-coloured, yellow | zerīna, zar زێڕینە، زەر: لە کوردیدا (زێڕینە) واتە (وەک زێڕە) و (زەر) مانای ڕەنگی زەرد دەدات. وشەی (زێڕ) لە زمانی هوریدا دەبێتە hijari، کە ئەمیش نزیکە لە وشەی (aīar/عەیار)- ەوە کە پلەی چۆنایەتی زێڕە لە کوردیدا. لە زمانی سۆمەریدا بە (برۆنز) دەگووترێت zabar. وشەی (زێڕ) لە زمانەکانی تردا دەبینرێتەوە، بۆ نموونە ئیسپانی و ئیتاڵی oro و پورتوگالی ouro و لاتینی aurum و فەرەنسی or.<br>ئەم ناوە کوردی/میدیە و وەکو ناوی ئافرەت، لە سەردەمی میدەکانەوە لە هەموو ناوچەکەدا بەکار دەهاتوە. بۆ نموونە لە سەردەمی دەسەڵاتی میدەکاندا، شاژنی ساکا (Saka) کان ناوی Zarina بووە (Diakonoff, 1985, p.132)، و بە هەمان شێوە یەکێک لەو شاژنە کوردانەی کە لە سەدەی شەشەمی زاینیدا حوکمڕانی کردوە و کە بەرامبەر هێرشی سوپای عەرەبە موسوڵمانەکان شەڕی کردووە، ناوی (زێڕینای ئامێدی) بوو. |
| zary-aspa (Tavernier, 2007, p.370) | خاوەنداریتی ئەسپێکی ڕەنگ زێڕین<br>Having a | zerī-aspa زێڕی- ئەسپە: هەمان مانا دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| | golden-coloured horse | |
| zrutoxma (Tavernier, 2007, p.371) | لە توخمی زراڤە [زرو/زرڤان تەنها ناوە] (born) of zrvan's seed | ziru-tuxma زڕو- توخمە: وشەی (توخم) وەک خۆی بەکاردەهێنرێت، بەڵام لە کوردیدا پێشی دەگووترێت (تۆم، تۆو). بۆیە سۆمەریەکان بە منداڵ دەڵێن dumu کە لەگەڵ وشەی (تۆم) ی کوردیدا یەکن. |
| zantu (Tavernier, 2007, p.368) | خێڵ (عەشیرەت) tribe | زاند zānd: لە کوردیدا (زاند) مانای (منداڵ هێنان، منداڵ پەیدابوون)[23] دەدات (هەژار، پ.٣٧٤) و لە زمانی پەهلەویدا دەبێتە zand.<br>بنەچەی وشەکە لە (زێ، زا، وەچە) وە هاتووە کە لە کوردیدا مانای (بەرە، زایین) دەدات و zi بە زمانی سۆمەری مانای (ژیان) دەدات کە لە کوردیدا دەبێتە (ژی).<br>لە کوردیدا (زان) یش هەر مانای (منداڵ هێنان) دەدات و ئەوەش لە زمانەکانی تردا دەبینرێتەوە.<br>لە زمانی یۆنانیدا وشەی منداڵ خستنەوە دەبێتە genno و بە وشەی (زیندو) ی کوردی دەڵێن zontanos. |

[23]. ئەوەی کە دڵنیای دەکات کە ئەم وشەیە هەمان بنەچەی هەیە، وشەی (بنو) ی ئارامی بە هەردوو مانای (خێڵ، منداڵ، وەچە) بەکارهاتووە. (بڕوانە ڕوونکردنەوەی زان سودو (Zan sudu) ی سۆمەری و (بینو شاد) ی ئیبن وەحشیە).

# مانیەکان (Mannaeans)

سەنتەری دەوڵەتی مانیەکان ناوچەی موکریان بووە. هەرچەندە سەرچاوە ئاشوریەکان لە سەدەی نۆهەمەوە ئاماژەیان پێ کردوون، بەڵام هەندێک لەو ئاسەوارانەی کە لە ناوچەی حەسەنلو دۆزراوەنەتەوە وا نیشان دەدەن کە پەیوەندی هەیە لە نێوان ئەو شوێنەوارانە و ئەوانەی کە پەیوەستن بە مانیەکان؛ ئاسەوارەکانی حەسەنلو دەگەڕێنەوە بۆ ٨٠٠ پ.ز-١٤٥٠ پ.ز (Nobari and Mollazadeh, 2004, P.82). بە پێی ناوی پاشا و لادێ و شارەکانیان، وا دەردەکەوێت کە بەزاراوەی زمانی کوردی موکری قسەیان کردبێت.

مانیەکان یەکێکن لەو دەوڵەتانەی پێش گەورە بوونی میدەکان ڕۆڵێکی گرنگیان هەبووە لە کوردستاندا. بە بەراورد لەگەڵ ڕۆڵی مێژوییان لە ناوچەکەدا و سەرەرای ئەوەی کە پاشماوەکانیان لە ناوچەکانی وەک سەقز و بۆکاندا دۆزراوەتەوە، کەچی ئەم دەوڵەتە لە سەرچاوە مێژوویەکاندا تا ڕادەیەک پشت گوێ خراوە. بەشێ لە هۆکارەکانی زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە زۆربەی ئەو سەرچاوانەی ئاماژەی پێ کردوون، سەرچاوەی ئاشورین کە درەنگ و دوای ئەوەی کە شوێنەوارناسی لە ناوچەی ڕۆژهەلاتدا بەرەو پێش چووە، توانراوە بخوێنرێتەوە و زانیاری سەبارەت بەم دەوڵەتە بزانرێت. بە پێچەوانەی ئەمانەوە، دەوڵەتی میدەکان تا سەردەمێکی نوێ بەو ناوەوە بەردەوام بووە و لە سەردەمی یۆنانەکاندا هێشتا هێزیان مابوو. بۆیە سەرچاوەیەکی زۆری یۆنانی، ڕۆمانی، جو و فارسی کۆن ئاماژەی پێ کردوون. لەبەر ئەوە دەبینرێت کە پێش خوێندنەوەی ئەرشیفە ئاشوریەکان، هێندە زانیاری سەبارەت بە مێژووی میدەکان هەبوو کە توانراوە مێژوویان بنووسرێت.

ئاشوریەکان ساڵانە هێرشیان دەکردە سەر ناوچەکانی دەوروبەری خۆیان و میللەتەکانی دەوروبەریان هەراسان دەکرد بەو هێرش و باجە سەختەی کە دایان نابوو لەسەریان. دوای هەر هێرشێکیش ئاشوریەکان ووردەکاری شەڕەکان و تالانیەکانیان بە فراوانی باس کردووە و هەندێک لە نامەی دیپلۆماسی و ڕێکەوتنی سیاسی دۆزراوەتەوە. لە ناو تۆماری ئەو جەنگانەدا ناوی زۆر کەسایەتی و گوند و شارۆچکەی کوردستان تۆمار کراون. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە هەتاوەکو ئێستا هیچ تێکستێکی وا نە دۆزراوەتەوە کە لەلایەن مانیەکان خۆیانەوە نووسرابێت و ڕوانگەی ئەوان سەبارەت بە خۆیان و ناوچەکەیان بدات بەدەستەوە. لەبەر ئەوە هەتا ئێستا شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە بیروباوەڕی ئاینی و ژیانی ڕۆژانەی مانیەکان نازانرێت چونکە سەرچاوەکان زیاتر بریتین لە هێرشی ساڵانەی ئاشوریەکان و هەندێک لە نامەی دیپلۆماسی و ڕێکەوتنی سیاسی.

لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە مانیەکان پێگەیەکی گرنگیان هەبووە لە ناوچەکەدا بەڵام ئەم دەوڵەتە زۆر جار نەیتوانیوە ببێتە کیانێکی زۆر بەهێز، بەشێکی بەهۆی جەنگی بەردەوامی بەرامبەر ئاشوریەکان و ئورارتوەوە بووە. زۆر جار مانیەکان و ئاشوریەکان لەیەک بەرەدا هاوپەیمانی یەک بوون، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە دوژمنێکی هاوبەشیان هەبووە کە ئورارتو بوو. لە ساڵی ٧٤٣ پ.ز دا مانیەکان بە هاوکاری ئاشوریەکان توانیان وڵاتە داگیرکراوەکەیان لە چنگی سەردوری دووهەم، پاشای ئورارتو ڕزگار بکەن، کە پێشتر زۆربەی ناوچەی مانیەکان و بەشێک لە ناوچەی میدەکانی داگیر کردبوو. ئیتر دوای ئەو شکاندنە، ئورارتو بە شێوەیەک بێ هێز کرا کە چیتر نەیتوانی هێرشی بەو جۆرە بکاتەوە سەر مانیەکان .(Diakonoff, 1985, p.71)

دوای بەرفراوانبوونی ناوچەی میدەکان، ناوچەی مانیەکانیش بوو بە بەشێک لە وڵاتی میدەکان. هیچ بەڵگەی مێژوویی سەبارەت بە ووردەکاری پرۆسەی تێکەڵبوونی مانی و میدەکانمان لەبەر دەستدا نیە. وا دەردەکەوێت کە لە ڕوی زمانەوانی وکۆمەڵایەتیەوە زۆر نزیک بووبن و تەنها دوو زاراوەی کوردی قسەیان کردبێت، بەجۆرێک کە ناوی پاشاکانیان لەوە دەچێت لە سەرچاوە مێژووییەکاندا تێکەڵ کرابن. دەبینرێت کە هیرۆدۆت سەبارەت مێژووی میدەکان، دیاکۆ (Deioces)، بە پاشای گەورەی میدەکان ئاماژە

پێ دەکات. کەچی لە سەرچاوە ئاشوریەکاندا نزیکی سێ سەد ساڵ پێش هیرۆدۆت، دیاکۆ (Daiukku)[24] بە پاشایەکی مانی باسکراوە.
هیرۆدۆت دەڵێت دیاکۆ میدەکانی لە ساڵی ٧٠٠ پ.ز دا یەک پێگرتووە، کەچی بە پێی تۆماری ئاشوریەکان، دیاکۆ پاشای مانی بووە و لە ساڵی ٧١٥ پ.ز دا دەستگیر کراوە و خۆی و ماڵ و منداڵی نەفی کراوە بۆ ناوچەی حەما (Hamath) لە سوریا (Boardman,1988, p.19). وا دەردەکەوێت کە بنەماڵەی حوکمڕانی مانی و میدەکان بە شێوەیەک نزیک بووبێتن کە ڕابردووی مانی و میدەکان تێکەڵ بووە. بۆیە هیرۆدۆت بە میدی ناوی هێناوە، یاخود کە میدەکان بنەچەی پاشاکانی خۆیان بۆ گێڕاوەتەوە، لەوێدا ئەوان هەردوو بنەماڵەی پاشاکانی مانی و میدیان بەیەک زانیووە. بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە جیاوازی نیە لە سەردەمی هەردوو پاشاکەدا و هەردووکیان لە کۆتایی هەشت سەدی پێش زایندا باسکراون و جیاوازی چەند ساڵێک لە نێوانیاندایە، بە دڵنیایی ئەو دوو پاشایە هەر هەمان کەسن.
مێژوونوسان سەبارەت بە ڕەگەزی مانیەکان زۆر ڕوون نین و زۆر جار بە هوری و هەندێک جار بە کاسی یان گوتی باسیان دەکەن. لە ڕاستیدا مانی ناوی میللەت نەبووە، بە هەمان شێوەی میدەکان، مانی ناوی بنەماڵەی حوکمڕان بووە ، بۆیە زۆر جاریش ناوی مانی، میدی و هوری لەگەڵ گوتیدا تێکەڵ دەکرێت. لەبەر ئەوە هەڵە نیە گەر بە مانیەکان بگووترێت کاسی، هوری، یان گوتی. تەنانەت دەتوانرێت بە میدیش دابنرێن، چونکە لە دوای بەرفراوانبوون و گەورەبوونی میدەکان، مانیەکان بوون بە بەشێکی جیانەکراوە لە میدەکان.

(وێنەی ٢) وێنەی بزنێک کە لە بنەچەدا ئاسەواری ڕەنگ کراوی مانیەکان بووە و لەسەر بەرد بە ڕەنگاو ڕەنگ نەخشێنراوە و لە مۆزەخانەی تاران هەڵگیراوە

**ناوی مانیەکان:**

ئەمڕۆ لە کتێبە مێژوویەکاندا ئەم دەوڵەتە و خەڵکەکەی بە Mannean (مانیەکان) ناو دەبرێن و ئاشوریەکان یەکەمجار لە ساڵی ٨٤٣ پ.ز دا ئاماژەیان پێ کردوون و خاکەکەیان بە مات مەنای (Mat Mannai) ناوهێناوە. ئورارتو بەمانانا (Manna.nə) ناوی بردوون و بە خاکەکەیان گوتوە ئیبانیا (ebanə.iə) (Diakonoff, 1985, p.73). لە تەوراتدا مەملەکەتەکەیان بە مینی (Mini) باسکراوە (Richard, 2001, p.75) . زادۆک ( Zadok, 2006) دەڵێت ئەکەدیەکان بە مانیەکانیان گوتووە Manaikānu.

---

[24]. بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ناوە مانی پاشاکە سەرچاوەکەی ئاشوریە و ناوە میدیەکە سەرچاوەکەی یۆنانیە، بۆیە ئەو جیاوازیە کەمە دەبینرێت لە نێوان دوو ناوەکەدا، دەنا بە دڵنیایی هەردووکیان یەک ناون.

مانای ناوی مانیەکان لە زمانی ناوچەکە و زمانی کوردی ئەمڕۆشدا هەیە و مانای هەبووە. وشەی مانا (manah) لە زمانی میدیدا واتای (هزر، هۆش) دەدات، لە کوردیدا وشەی (مینە mina) مانای (توێژینەوە، پشکنین، شیکردنەوە) دەدات و (مانا) مانای (لێکدانەوەی شتێک) دەدات و پێ دەچێت مەبەستی ناوەکە خاوەن هۆش و زانایی و هزر بێت. ئەم ناوە لە ناوی پێغەمبەر مانی (٢١٦ز-٢٧٤ز)[25] دا دیسان دەرکەوتووە. بەڵام ئەوەی کە یەکلاکەرەوەیە لە ناوی مانیەکاندا، ئەو ناوەیە کە ئەکەدیەکان ئاماژەیان پێ کردوون Manaikānu. لەبەر ئەوەی کە ئەم وشەیە لە زمانی کوردیدا پێک دێت لە (مانی+ە +ک+ان). (مانی) ناوی خۆیان بووە و (ک) ئامرازی ناسینە و (ان) پاشگری کۆیە لە زمانی کوردیدا. شایانی ئاماژەیە کە ئەم پاشگری بە کۆ کردنەی ناو لە زمانی سۆمەریدا بە شێوەی ene و بە an لە زمانی میدا دەردەکەوێت.

**جوگرافیای وڵاتی مانیەکان:**

زۆر زەحمەتە بتوانرێت قەڵەمڕەوی دەسەڵات و ناوچەی حوکمڕانی مانیەکان بە تەواوی دەستنیشان بکرێت. لەبەر ئەوەی کە هەمیشە بەربەرەکانیەکی زۆر هەبووە لە نێوان ئاشوری و مانی و ئورارتودا. فراوانبوونی ناوچەکەیان هاو شێوەی دەوڵەتەکانی دراوسێیان هەمیشە جێگیر نەبووە و زۆر جار لە فراوانبوون و تەسکبوونەوەدا بووە بەڵام بە گشتی ناوچەیەکیان لە باکوری ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیادا بە دەستەوە بووە و ئازەربایجانی ئەمڕۆشی گرتۆتەوە. لە کاتی لاوازبوونی ئورارتودا کە کەوتبووە باکوری دەوڵەتی مانیەکانەوە، مانیەکان توانیویانە لەو ناوچانەدا قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان بەرفراوان بکەن و بە پێچەوانەشەوە. هەروەها لەگەڵ کزبوونی دەسەڵاتی ئاشوریەکاندا مانیەکان قەڵەمڕەوی دەسەلاتیان بەرەو ناوچەی ئاشوریەکان بەرفرانکردووە. هەندێک جار ناوچەی زاموا (سلێمانی ئەمڕۆ) و دیالەی ئەمڕۆش لە ژێر حوکمی مانیەکاندا بووە و پێش ڕوخانی دەوڵەتی ئاشوری, دەسەڵاتیان نزیک سەنتەری دەوڵەتی ئاشوری بوو بوومەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢).

زادۆک (Zadok, 2006) ناوچەی مانیەکانی کردۆتە دوو ناوچەوە، یەکەم مانیای تەواو ( Manea Proper) و دووەم مانیای گەورە (Greater Mannea). مانیای تەواو، شوێنی دەسەڵاتی هەمیشەیی مانیەکان بووە و مانیای گەورە ئەو ناوچانە بووە کە لە کاتی هەڵکشانی دەسەلاتیاندا دەیانخستە سەر ناوچەکانیان.

پایتەختی وڵاتەکەیان بریتی بووە لە زەردە/زەرتە (Zirta) و شوێنی پایتەختەکەیان هەتاوەکو ئەمڕۆ نەدۆزراوەتەوە. زادۆک پێی وایە کە سەنتەری مانیەکان ناوچەی سەقزە؛ ئەوەی کە ڕوونە ئەوەیە کە پایتەختی مانیەکان دەکەوێتە شوێنێک لە نێوان مهاباد، سەقز و بۆکان.

**سیستەمی حوکمڕانی و ئابوری مانیەکان:**

پاشای مانیەکان بە تەنها حوکمیان نەکردووە و دەسەڵاتی بێ سنوریان نەبووە، بەڵکو دەسەڵاتیان سنوردار بووە و بە بەشداری دەستەی پیران و کۆمەڵێک لە سەرکردە و ڕاوێژکاران حوکمڕانیان کردووە. دەبینرێت لە یەکێک لە تێکستە ئاشوریەکاندا نوسراوە کە پاشا بەیاوەری "گەورەکان، پیران، ڕاوێژکاران، بنەماڵەی پاشا، حوکمڕانەکان و سەرکردە دەسەلاتدارەکانی وڵاتەکەی بوو". لە نامەیەکی دیپلۆماسیدا کە پاشای مانیەکان بۆ پاشای ئاشوری ناردووە و هەندێک داواکاری هەبووە، پاشای مانیەکان باسی خۆی بە تەنها ناکات، بەڵکو لەگەڵ "گەورە پیاوەکان و ڕاوێژکارانی وڵاتەکەی" دا ناوی خۆی دەهێنێت (Diakonoff, 1985, p.73). ئەمە یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی شێوەی حوکمڕانی مانیەکان. لەلای میدەکانیش زۆر جار حوکمڕانی هەر بەو شێوەیە بووە و لە کاتی دەسەڵاتداری گوتیەکان و لە نزیکی دوو هەزار و دووسەد ساڵی پێش زاییندا کە مێسۆپۆتامیایان گرت، هەر بە هەمان شێوە حوکمڕانیان دەکرد و هەتاوەکو بۆیان دەرکەوت

---

[25]. مانی پێغەمبەری ئاینێک بوو بە ناوی ئاینی مانیەوە. ئاینەکەی لەلایەن سەرچاوە کرسیتیانەکانەوە بە لادەری ئاینی کرسیتیان دانراوە بەڵام زۆر سەرچاوە بە ئاینێکی سەربەخۆی دادەنێت. دایکوباوکی مانی خەڵکی هەمەدان بوون (Encyclopaedia Britannica, 2012)، ئەو ناوچەیە ی کە بە درێژایی مێژوو بە ناوچەیەکی کوردی دانراوە.

کە وڵاتی تەختایی زیاتر پێویستی بە سەنتەری بەهێز هەبوو، هەوڵی گۆڕانکاریان دا بێ ئەوەی کە بە تەواوی بتوانن لەوەدا سەرکەتوو بن. میتانیەکانیش هەر پەیڕەوی هەمان سیستەمیان دەکرد، بە پێچەوانەی ئەکەدی و ئاشوریەکانەوە، کە هەمیشە پاشایەکی بەهێزی دەسەڵات بێ سنووریان هەبووە.
دەوڵەتی مانیەکان لە کۆمەڵێک ناوچەی سەرەکی پێکهاتبوو لەوانە: زەردە/زیرتە (Zirta) کە پایتەخت بوو، Zibiya (ناوچەی زیویەی ئەمڕۆ)، ئەرمێتە (Armeta)، سەنها (Sanha)، شمێری/شامێری (Shimeri)، هتد. مانیەکان بە دەسەلاتدارە ناوچییەکانیان دەگووت šaknu (شاکنو)[26]( Diakonoff, 1985, p.73) کە وەک (شاکان) ی کوردی ئەمڕۆ دەردەکەوێت. ئەوانە دەسەڵاتێکی نیمچە سەربەخۆیان لە ناوچەکانی خۆیاندا هەبووە و لەوە دەچێت هەر بە میرات دەسەڵاتیان بۆ مابێتەوە.
وەک پێشتر باسکرا ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە هەمیشە یەک پاشای بەهێزی تەواو لەناو مانیەکاندا دەرنەکەوێت بە پێچەوانەی سیستەمی ئاشوریەکان کە پاشاکان دەسەڵاتیان نیمچە بێ سنوور بووە. هەروەها زۆر جار خەڵکە مانیەکان کە پاشایان بە دڵ نەبووبێت لایان بردووە و هەندێک جار کوشتوشیانە. دەبینرێت پاشایەکی وەک ئاهشێری (Ahšeri) کاتێک کە شێوەی حوکمڕانی بووەتە مایەی ناڕەزایی، خەڵکی ناوچەکە ڕاپەڕیون و پەلاماریان داوە و خۆی و بنەماڵەکەی لە لایەن خەڵکەکەوە لە ناو براوە (Diakonoff, 1985, p.116). ئەم سیستەمی حوکمڕانیە بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆر جار دەوڵەتەکانی دەوروبەری مانیەکان بتوانن لە ڕێگەی ئەو دەسەڵاتە شلەوە دەست بخەنە ناو کاروباری وڵاتەکەیان و ئاشوریەکان و ئورارتوش زۆر جار سودیان لەم شێوەی حوکمڕانیە وەرگرتووە.
خەڵکی مانیەکان بۆ بژێوی ژیانیان متمانەیان کردۆتە سەر بەخێوکردنی مەڕوماڵات و ئەسپ. شانبەشانی ئەوانە کشتوکاڵیش بەشێکی گرنگی بژێوی مانیەکان بووە و لە ناوچەکەدا ترێ، گەنم، جۆی، هتد. کراوە. بەشێوەیەک کە گەنمی مانیەکان هەندێک سەرچاوەی وەک تەورات ئاماژەی پێ کردووە وەک جۆرێکی نایاب لە گەنم (Bromiley, 1986, p.370 and 371). ئەمانە هەمووی بە ڕێگایەکی بازرگانی مێژوویدا گوێزراونەتەوە بۆ ناوچەی دیالە و لەوێوە بەرەو ناوەڕاستی ڕێچکەی ڕوباری فورات و دیمەشق و هەتاوەکو ئیسرائیل ڕۆیشتووە. هەروەها ئەو کەلوپەلانەی کە لە حەسەن لو دۆزراونەتەوە، نیشانی دەدەن کە مانیەکان لە کاری دەستیشدا زۆر بەتوانا بوون و کەلوپەلی کانزایی و گڵی نایابیان دروست کردووە .(Diakonoff,1985,p.72)

**زمان و نووسینی مانیەکان**

هەتاوەکو ئێستا هیچ تێکستێکی مانیەکان نەخوێنراوەتەوە. ئەوەی کە دڵنیای دەکات کە مانیەکان نووسینیان هەبووە، ئەو نوسینە هێرۆگلیفیەیە کە لە سەر قاپێکی زێڕین نەخشێنراوە. ئەو قاپە لە ناوچەی زێوێ، لە نزیک شارۆچکەی سەقز دۆزراوەتەوە و شوێنەوار و ئاسەواری مانیەکان بووە. بەداخەوە ئەو نووسینە نەخوێنراوەتەوە و هەتا ئێستا نازانرێت چی لەسەر نووسراوە (Bromiley,1986, p.371). بەڵام ئەرشیفی ئاشوریەکان ناوی پاشا و پلەو پایەی سەرکردەکانیان و ناوی شوێنەکانیانی پاراستووە. زادۆک (Zadok, 2006) لە لێکۆڵینەوەیەکدا بە تێروتەسەلی باسی ناوی پاشای مانیەکان و پەیوەندیان لەگەڵ ئاشوریەکاندا دەکات. لەو لێکۆڵینەوەیەدا کۆمەڵێک ناوی کەسایەتی و شوێنەکانی ناوچەی مانیەکان باس دەکات. لەو ناوانەدا دەردەکەوێت کە مانیەکان نەك بە سەرەتای زمانی کوردی، بەڵکو بە زمانێکی زۆر نزیک لە کوردی ئیمڕۆ قسەیان کردووە.
لەم خشتەیەی داهاتوودا هەندێک لەو ناوانە ڕوونکراونەتەوە کە زادۆک سەبارەت بە مانیەکان خستونیەتە ڕوو:

[26]. ئەم ناوە لە خشتەی ناوە مانیەکاندا بە ووردی ڕوونکراوەتەوە.

| [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|
| aza | ناوی پاشایەکی مانی بووە | āzā ئازا: ئەم وشەیە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە زمانی هوری دەبێتە ada، بە هەردوو زمانی کورد و هوری هەمان مانایان هەیە کە مانای (کەسێکی بوێر/بەهێز) دەدات. |
| bagdatti | ناوی پاشایەکی مانی بووە | bagzāda بەگزادە: ئەم وشەیە مانای وەچە/زادەی بەگ دەدات. وشەی بەگ بە زمانی میدی مانای (خوا،دەسەلاتدار) ی هەیە. ئەمڕۆ خێڵێکی گەورەی دەسەلاتدار هەر بە ناوی (بەگزادە) لە ناوچەی ورمێیە و ئەندامەکانی بوونەتە سەرکردەی زۆرێک لە خێڵە هەرە گەورەکانی کوردستان. وەک هەورامی لهۆن، جافەکان، هتد. بەگزادەکان دوای نزیکی ٣٠٠٠ ساڵ هەر لە هەمان ناوچەدا دەژین و ئەمڕۆش وەک بنەماڵەیەکی دەسەلاتدار هەر لە هەمان ناوچەدا ماون. بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە بەگزادەکان هەیە و هەندێکیان دەڵێن کە بەگزادەکان هەموویان لەو بنەماڵەیە و لە ورمێوە هاتوون و بەگزادەکانی تر، کە لە هەموو کوردستاندا بڵاوبوونەوەتەوە، هەر لەوانن. |
| ahsheri | ناوی پاشایەکی مانی بووە | hušīar /hišīar, ahšeri هشیار/هوشیار، ئاهشێری: لە کوردیدا ئاماژەیە بە کەسێکی (ئاگادار، وریا). دەشێت ناوەکەش بە مانای (ئاهشێری) لێک بدرێتەوە. |
| šuandahul | ناوی ناوچەیەک بووە | šuānadol شوانەدۆڵ: ماناکەی وەک خۆی ماوە. ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە، ناوە مانیەکان هەتاوەکو ئەمڕۆ بە هیندۆئەوروپی دانەنراون. بەڵام ئەگەر (شوانە دۆڵ) تەرجومە بکرێتە سەر زمانی ئینگلیزی، دەبینرێت زۆر کەم دەگۆڕێت و دەبێتە shepherd-dale. هەردوو بەشی وشەکەش لە بنەڕەتدا سۆمەرین. سۆمەریەکان بە (شوان) دەڵێن šuba و بە (شوێنێکی شەقکراو) دەڵێن dul. واتە ئەگەر ئەو وشەیە بە سۆمەری بنووسرایە، دەبوە šuba dul. |
| aukane | ناوی شوێنە | āukānī ئاوکانی: بە زمانی کوردی واتە (کانی ئاو). وشەی (ئاو) بە زمانی سۆمەری دەبێتە a و (کانی) بە زمانی هیتی هەر هەمان وشەیە وەک کوردی. دەشێت بە (ئاوکەنە) ش لێکبدرێتەوە، کە مانای (ئەو شوێنەیە کە ئاو کەندوویەتی) دەدات. |
| manaikānu | ئەو ناوە بووە کە ئەکەدیەکان بۆ ئاماژەکردن بە مانیەکان بەکاریان هێناوە | mānīakān مانیەکان: ئەم ناوە پێک دێت لە (مانی+ە ک+ان). (مانی) ناوی خۆیان بووە و (ە ک) ئامرازی ناسینە کە لە ناو میدەکانیشدا هەمان ڕۆڵی هەبووە و لە کوردی ئەمڕۆشدا وەک خۆی ماوە. ئامرازی بەکۆکردنی (ان) لە زمانی کوردی و سۆمەری و هیتی و هوریشدا بە تۆزێک گۆڕینەوە بە هەمان مەبەست بەکارهاتووە. بۆ نموونە لە سۆمەریدا دەبێتە ne/ene. ئەم ئامرازە لە وشەی وەک šarrena دا دەردەکەوێت، کە هوری و هیتیە و لای هەردووکیان مانای (پاشاکان) دەدات کە هەمان وشەی (سەران) ی کوردی ئەمڕۆیە. |
| ustaribar | ناوی پیشەی پایەدارێکی مانی بووە | uastārebar وەستا ڕێبەر: ئەم ناوە بە ئینگلیزی تەرجومە کراوە بە foreman کە مانای (وەستا) ی کوردی دەدات و ئەم پیشەیە ڕێکخەری زەوی و زار (land administrator) بووە. وشەکە لە (وەستا+ ڕێبەر) پێک دێت. وشەی (وەستای) کوردی |

| | | |
|---|---|---|
| | | چووەتە زمانی قسەکردنی عەرەبیەوە و کردویانەتە (اوصطة) کە لە عێراقەوە هەتاوەکو میسر لە زمانی قسەکردندا بەکاری دەهێنن، بێ ئەوەی بزانن کە وشەکە کوردیە. (ڕێبەر) لە کوردیدا مانای (سەرکردە، پێشڕەو) دەدات. |
| sihua | ناوی ناوچەیە | seua سێوە: لە کوردیدا هەتاوەکو ئەمڕۆ وەک ناوی کەسیش بەکار دێت. یەکێک لە مەقام بێژە گەورەکانی کورد ناوی (سێوە) یە و بۆ ناوی کچیش بەکاردەهێنرێت. ئێستاش ناوی چەندان گوند لە پیران شار (خانێ)، کە دەکەوێتە ناوچەی موکریان، بەشێک لە ناوەکەیان وشەی (سێوێ) ی تێدایە. بۆ نمونە، (سێوێ گەدەی خوارێ، سێوێ گەدەی سەرێ). |
| missi | ناوی ناوچەیە | misī مسی: لە کوردیدا ناوی کانزایەکە و وا دەردەکەوێت کە لە ڕەنگی ناوچەکەوە هاتبێت. وشەی (مس) لە زمانی پۆڵەندیدا دەبێتە miedź و بە ڕوسی med′. |
| surikash | ناوی ناوچەیە | surakaš سورەکەش: ئەم ناوە لە کوردیدا مانای (شاخی سور) دەدات. لەوانەیە هەمان ئەو ناوەبێت کە ئەمڕۆ کراوەتە سورکێو (سور+کێو) کە نزیکی ناوچەی مانیەکانە و هەر هەمان مانای هەیە. هەروەها لە ناو هوریەکاندا یەکێک لە شاخەکانی مێسۆپۆتامیا بە kazijari (کەژی یاری) ناوبراوە (بڕوانە فەرهەنگی هوری) . ئەمڕۆ لە کوردیدا وشەی (کەژ) شانبەشانی (کێو، شاخ، چیا) بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بە شاخ. |
| kumurdi | ناوی ناوچەیەکە | komardī کۆمەردی: لە کوردیدا دوو مانای هەیە (کۆمەڵەی پیاوان، کۆمەڵەی ئازاکان)، ناوەکە بۆ ئەمڕۆی کوردستان هەر گونجاوە. ئەوەی کە جێی سەرنجە Diakonoff (1985,p.73) پێی وایە ئەم شوێنە لەوانەیە هەر هەمان ئەو شوێنە بێت کە لە سەردەمی سۆمەریەکاندا پێی گوتراوە Humurtu. ئەم ناوە سۆمەریە ڕێک مانای (کۆمەرد) دەدات لەبەر ئەوەی دەبێتە (هەموو مەرد) و هەردوو ناوەکە لە هەردوو حاڵەتدا هەر کوردین. |
| zirta | پایتەختی مانیەکان بووە | zarda زەردە: وەسفی ڕەنگە و هەمان وشە لە ناو میدەکانیشدا هەبووە بە هەمان مانا. ناوی هاوشێوەی ئەوە لە کوردستان هەیە، شارۆچکەی قەرەداخی نزیک شاری سلێمانی لە بنەڕەتدا ناوی (زەردی ئاوا) بووە، کە مانای (ئاوایی/شارۆچکەی زەردی) دەدات و ئەم ناوچەیەش هەندێک جار کەوتوتە ژێر دەسەڵاتی مانیەکانەوە. هەر چەندە بڕوا ناکرێت کە ناوچەی قەرەداخ پایتەختی مانیەکان |

| | | |
|---|---|---|
| | | بێت، لەبەر دووری لە سەنتەری مانیەکانەوە، بەڵام بوونی هەمان ناو لە ناوچەکەدا ڕاستی کوردی بوونی ناوەکە دەسەلمێنێت. |
| bagbartu | ناوی خوایەکی مانی بووە | bagbard بەگبەرد[27]: لە دووبەش پێک هاتووە و (بەگ+بەرد)، بە زمانی میدی (بەگ) مانای (خوا، دەسەڵاتدار) دەدات. بەوجۆرە مانای ناوەکە دەبێتە (خوای بەرد) و بە کوردی ئەمڕۆ دەبێتە (ئاغا/بەگی بەرد). ئەو ناوە بۆ بیروباوەڕی ئەو سەردەمە گونجاوە و زۆربەی شتە هەمیشەییەکانی وەک بەرد، شاخ، دەریا، ئاو، هتد. هەموویان خوای خۆیان هەبووە. |
| zibiya /izibya | ناوچەیەکە کە دەکەوێتە خواروی ورمێ | zīwīa زیویە: زادۆک (Zadok, 2006) پێی وایە ئەو ناوە زیویەی ئەمڕۆیە. لەوە دەچێت ناوەکە لە وەسفی ڕەنگیی زیوەوە هاتبێت. هەندێک سەرچاوە مانیەکان بە هوری لەقەڵەم دەدەن و بە زمانی هوری بە وشەی کوردی (زیو) دەڵێن izuγni کە لەگەڵ ناوەکەدا نزیکە. |
| azaqaiana | ناوچەیەکە لە نێوان سنوری ئاشوریەکان و مانیەکاندا | āzāgīāna ئازاگیانە: واتە (ئازارۆح/ئازالەش). وشەی (ئازا) ی کوردی لە زمانی هوریدا پێی دەگووترێت (ada) و بە (گیان) دەگوترێت (jiani)، ئەوەش لە ناوی (زرێپۆش) دا دەردەکەوێت کە ئەوان پێی دەڵێن sarijanni. واتە ئەگەر ئەو ناوە لە سەردەمی هوریەکاندا بنووسرایە ناوەکە دەبووە adajanna، بەو جۆرە ناوەکە بۆ ئەو سەردەمەو ئەم سەردەمەش هەر گونجاوە. |
| bala | ناوچەیەکە نزیک سنوری ئورارتو | bālā باڵا: لە کوردیدا مانای (بەرز، سەروو) دەگرێتەوە. لەگەڵ سروشتی ناوچەکەدا دەگونجێت کە کەوتۆتە باکوری دەسەڵاتی مانیەکانەوە. |
| ushqaia | قەڵایەکە | uškaiī وشکەیی: کە ئاماژەیە بە وشکی شوێنەکە. |
| zaranda | ناوچەیە | zerīnde زێرین دێ: واتە (دێی زێرین). وشەی (زێڕ) بە زمانی میدی و ئاڤێستاش هەر هەمان مانای وشە کوردیەکەی هەیە. |
| darbane | ناوچەیە | darbana دەربەنە: ئەم ناوە هەر وەک خۆی ماوە و ئەمڕۆ بە هەموو دەروازەیەکی شاخیی تەنگ دەگووترێت (دەربەن/دەربەند) بۆ نموونە (دەربەنی بازیان/دەربەنی خان) کە دوو دەربەنن هەندێک جار لە ژێر دەسەڵاتی مانیەکاندا بوون. |
| kilzanu | ناوچەیە | kalzānā کەڵ زانا: وشەی kil ی هوری هەمان مانای (کەڵ) ی ئەمڕۆی کوردی هەیە و بە سۆمەری بە gal نووسراوە. هەروەها zu بە زمانی سۆمەری هەمان مانای (زانین) ی هەیە و مانای ناوەکە دەبێتە (زانای کەڵ). لە کوردیدا هەمان شێوە ناو هەر ماوە |

[27]. پێ دەچێت کە بنەچەی ناوی (بەغداد) یش هەر بە هەمان شێوە پێک هێنرابێت لە (بەگ/بەغ+داد). چونکە وشەی (داد) لە زمانی سۆمەریدا بە شێوەی did نوسراوە و هەر هەمان مانای ئەمڕۆی (داد) ی کوردی هەیە کە عەدالەتە. بەو شێوەیە ناوی بەغدا دەبێتە (خوای عەدالەت) کە دەشێت ئەو خوایە لەو شوێنەی ئەمڕۆی بەغداد دا جێگیر کرابێت. سەرنجی ئەوە دەدرێت کە کورد ئەو شارە جگە لە (بەغداد) بە (بەغدا) ش ناوی دەهێنێت، کە ئەوە دیسان ئەو بۆچوونە بەهێز تر دەکات لەبەر ئەوەی کە هەردوو وشەی (داد، دا) لە زمانی سۆمەری و کوردیدا هەر هەمان مانایان هەیە، کە ئەویش مانای (دادوەری) یە. نابێت لە یاد بکرێت کە شاری بەغداد شانبەشانی ناوی خۆی، نازناوێکی عەرەبیشی بۆ دانراوە کە بریتیە لە (مدینة السلام) کە مانای (شاری ئاشتی) دەدات. کە ئەو ناوە عەرەبیەش دیسان لە مانای (شاری عەدالەت) نزیکە.

| | | |
|---|---|---|
| | | (کەڵەژن، کەڵەپیاو، کەلەگا، کەڵەمێرد، هتد). |
| rupira | ناوچەیە | rupīra ڕوپیرە: مانای (ڕوخسار پیر) دەدات. ناوی هاوشێوەی ئەوە بۆ ناونانی ناوچە، لە کوردیدا هەیە. |
| sanha | ناوچەیەکە | sina سنە: ئەمڕۆ شارێکی گرنگە لە کوردستاندا. |
| sitera | ناوچەیە | sitera ستێرە: مانای (ئەستێرە) دەدا و وشەیەکە ئەمڕۆش هەر بەکار دەهێنرێت. هەروەها لە کوردیدا ( ستێر) بە مانای (گۆلی ئاو) یش دێت. |
| šaknu | ناوی دەسەڵاتدارە ناوچەییەکان بووە | šākān شاکان: ئەم وشەیە پێک دێت لە (شا+ک+ان). (کە ئامرازی ناسینە لە کوردیدا و لە زمانی میدیشدا بە هەمان بەکارهێنان دەرکەتووە. لە کوردیدا ئامرازی (ان) پاشگرە بۆ بەکۆکردن و لە زمانی سۆمەریدا هەمان پاشگر بەشێوەی ene بەکارهێنراوە. هەتاوەکو ئەمڕۆ، وشەی (شا) سەرەرای مانای (پادشا) بە مانای (گەورە) بەکار دەهێنرێت. بۆ نموونە بە کوردی دەگووترێت (شاتوو، شاپەڕ، شاباز، شاناز، شاکەڵ، شادەمار، شەنگەسورە (شاهەنگەسورە)، شاژن، شاجوان، هتد) و ئەو ناوە خراوەتە پێش ناوی هەندێک لە کەسایەتیە ئاینیەکانی وەک شاخۆشین و لەوێدا بە مانای گەورە و مەزن بەکارهاتووە. |

# لوڤیەکان

زمانی لوڤی بە لقێکی زمانی هیندۆئەوروپی کۆن دادەنرێت. زمانەکە لە ناوچەیەکی بەرفراوان و خواروی دەسەڵاتی هیتیدا قسەی پێ دەکراوە و زۆربەی ناوچەکانی ئەناتۆلیای ئەمڕۆی دەگرتەوە. هەندێک بەڵگە هەیە سەبارەت بەوەی کە شاری Troy [28] (ترۆی) بەم زمانە قسەیان کردووە. لە سەنتەری ئەناتۆلیاشدا تێکستیان دۆزراوەتەوە، بەڵام بە گشتی وا دادەنرێت کە ناوچەی سەرەکی لوڤیەکان بریتی بووە لە باشور و باشوری ڕۆژئاوای ئەناتۆلیای ئەمڕۆ، کە دەکەوێتە باشور و باشوری ڕۆژئاوای تورکیا و باکوری سوریا (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٤). ئەم زمانە سەردەمانێک یەکێک لە زمانە گرنگەکانی باکوری کوردستان بووە. زمانەوانان پێیان وایە کە هیتیەکان لەگەڵ بەرفراوانبوونیاندا بۆ ناوچەکانی لوڤیەکان، زۆر وشەشیان لێ وەرگرتوون و کاریگەری فەرهەنگی و ئاینیشیان هەبووە لەسەر هیتیەکان (Fortson, 2011, p.58). هەندێک سەرچاوەی تر پێی وایە کە بە هۆی نزیکی ئەو دوو زمانەوە و تێکەڵبوونی زۆر وشە لە نێوانیاندا، زەحمەتە بزانرێت کە ئەو کاریگەریە چۆنە و تا چ ڕادەیەک بووە (Woodard, 2008, p.31). زۆربەی تێکستەکان کە بە زمانی لوڤین سەردەمەکەیان بۆ سەدەی سیانزە و شانزەی پێش زایین دەگەڕێتەوە، بەڵام زۆر تێکستی تریش دوای ئەو مێژووە دۆزراوەتەوە. یەکێک لەو بەڵگانەی کە وەک سەرچاوە بۆ تێکستی لوڤی سوودی لێ وەردەگیرێت، بریتیە لەو تێکستانەی کە بە زمانی هیرۆگلیفی ناوچەی ئەناتۆلیا نووسراون کە شێوە نووسینی تایبەت بە ناوچەکە بووە (بڕوانە وێنەی ٣).

(وێنەی ٣) تێکستی هێرۆگلیفی لوڤیەکان لەسەر بەردی ناسراو بە سوڵتانە

هەتاوەکو ئەمڕۆ شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە مێژووی لوڤیەکان نە نووسراوە. وا دەردەکەوێت کە مێژووەکەیان، هاوشێوەی زمان و فەرهەنگەکەیان لە ژێر ناوی هیتیەکاندا بزر بووبێت و ئاوێتەی ئەو کرابێت. دەنا بە دڵنیایی لوڤیەکان شوێنێکی گرنگیان لە مێژووی دێرینی ناوچەکەدا هەبووە.

[28]. ئەم شارە کە دەکەوێتە باکوری ڕۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆوە، بە داستانێکی مێژوویی یۆنانی، بە ناوی شەڕی ترۆجان (Trojan War) کە هۆمیرۆسی شاعیر لە ئەلیازە و لە ئۆدیسەدا بە درێژی دەیگێڕێتەوە، ناوبانگی دەرکردووە. یۆنانەکان پێیان وابووە کە بەسەرهاتی ئەو داستانە ڕووداوێکی ڕاستی بووە و لە سەدەی ١٢ و ١٣ ی پێش زاییندا ڕوویداوە.

بە داخەوە ژمارەیەکی کەم وشەی لوڤی دۆزراوەتەوە و ئێستاکە شتێکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نیە کە بتوانرێت لێکۆڵینەوەی چڕو پڕ لەسەر زمانەکە بکرێت. بەڵام سەرەرای ئەو ژمارە کەمە وشەیەی زمانی لوڤی کە ئەمڕۆ لەبەردەستدان، دەبینرێت کە لە رووی وشەکاریەوە پەیوەندیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێت لە نێوان زمانی کوردی و زمانی لوڤیەکاندا و ئەو زمانە وەک پەلێکی زمانی کوردی دەردەکەوێ.
یەکێک لەو تایبەتمەندانەی کە لە زمانی لۆڤیدا سەرنج دەدرێت ئەوەیە کە پیتی (و/ە) کە لە پێشەوەی چەند وشەیەکی لوڤیدا بەکار دەهێنرێت لە زمانی کوردیدا دەکرێتە (ز). بۆ نموونە وشەی uni/unai ی لوڤی دەبێتە (زان/زانین) لە کوردیدا هەروەها وشەی ahar دەبێتە (ئازار) لە کوردیدا. هەندێک لە وشەکان بە هیچ جۆرێک گۆڕانیان بەسەردا نەهاتووە یان گۆڕانی کەمیان بە خۆیانەوە دیوە. بۆ نموونە وشەکانی وەک (ئاشتی، زەوا، زەرت (دڵ)، شاهانە، نوێ، نەوە، نەوەی نەوە، یاری، هتد) هەمووی وەک خۆیان ماون. لە فەرهەنگەکەدا زۆر لەو وشە لوڤیانە ڕوونکراونەتەوە کە لە زمانی کوردی نوێدا ماون.

(نەخشەی ژمارە ٤) نەخشەی ناوچەی لوڤیەکان

# فەرهەنگی لوڤی - کوردی

| وشەی لوڤی (Luvian) | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| ahar | ئازار pain | āzār ئازار: هەمان مانای هەیە. |
| ahrušhit | censer قاپی سوتانی ئەو شتانەی کە بۆ بۆن دەسووتێنرێن | āīrsut ئایر سوت: لەوە دەچێت وشەکە لە (ئایرسوت) واتە (ئاگرسوتێنەر) پێکهاتبێت. لە زمانی هوریدا ahari مانای (سوتاندن) ی کوردی دەدات. |
| akkušša | چاڵی تەڵە Pit-trap | akuša/akuža ئەکوژە/ئەکوشە: ماناکەی دەبێتە (ئەو شتەی کە کوژەرە). وشەی kuš لە زمانی سۆمەریدا ماناکەی دەبێتە (ڕوخاندن، وێرانکردن) |
| ala/i | بەرز high | hal, ālā هەڵ: لە کوردیدا (هەڵ) مانای (بەرزکردنەوە) دەدات، بۆ نموونە (هەڵ کردن، هەڵچوون، هەڵخستن). لە زمانی سۆمەریدا a il مانای بەرزکردنەوە و هەڵگرتن. (ئاڵا) مانای (پەیداخ) دەدات کە هەر بەرزکردنەوەیە. |
| ama/i, amiya | هی من my | m م: هەمان مانای لە کوردیدا هەیە. بۆ نموونە (دەفتەرەکەم جوانە)، لەوێدا (م) هەمان ڕۆڵ دەبینێت. لە هیتیدا دەبێتە ma و لە سۆمەریدا mu مانای (هی من) دەدا و men مانای (من) دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە my و لە فەرەنسیدا mon/ma. |
| an | ئەو (بۆ کور و بۆ کچ) him, her, it | āna/au ئەو/ئانە: لە کوردیدا بە دوو شێوە هەیە و بە سۆمەری دەبێتە ane. |
| annar/i | بەهێز، نێر forceful, virile | ner/ī نێر/ی: وشەکە بەکوردی مانای (بەهێز، ئازا، سیفاتی پیاو) دەدات و لە سۆمەریدا nir ماناکەی دەبێتە (ئاغایانە، پیاوانە). |
| anta | لەناو inside | handru هەندرو: لە کوردیدا مانای (ژووری ماڵەوە، ناو هەرشتێک) دەدات (هەژار، پ.١٠٠٦). لە هیتیدا دەبێتە andurza و هەمان مانا کوردیەکەی هەیە و لە زمانی لیدیدا دەبێتە endo. |
| apa | ئەو (بۆ نێر و مێ)، ئەوە he, she, it, that | aua/ava ئەوە/ئەڤە: ئەم وشەیە لە کوردیدا ئاماژەیە بە ڕەگەزی نێر و مێ. لە ئاڤێستادا دەبێتە hva. |
| arai | جوڵەکردن و هەستان rise | hara هەرە: لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (بجوڵێ و بڕۆ). ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا بە شێوەی ere دەردەکەوێت و مانای (بڕۆ) دەدات و ri مانای (ڕۆیشتن، چوون) دەدات. لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | هیتیدا ar ماناکەی نزیکە و لە ئاڤێستادا ar مانای (بڕۆ، بجوڵێ، وەرە) دەدات. |
| appai | ئاو<br>water | āu/āv ئاو/ئاڤ: ئەم وشەیە بە زمانی سۆمەری دەبێتە a و لە زمانی فەرەنسیدا دەبێتە eau. |
| assa | قسە<br>say, speak | qisa قسە: ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە za و لە ئاڤێستاشدا دەبێتە gatha کە جۆرێکن لە (گوتەی ئاینی زەردەشتی. |
| aššata | ئاشتی<br>peace | āštī ئاشتی: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە و بە زمانی ئاڤێستا دەبێتە âxshti، بەڵام لە زمانی هوریدا ašti مانای (ئافرەت) دەدات. |
| ašhar | خوێن<br>blood | hašir, šar حەشر، شەڕ: وشەی (شەڕ) پێچەوانەی وشەی (ئاشتیە) و مانای (جەنگ، ناخۆشی، ڕۆژی خراپ) دەدات و (حەشر) مانای (ڕۆژی قیامەت، هەراو هوریای تێکەڵ) دەدات. بە زمانی هیتی ešarnu مانای خوێن ڕشتن دەدات و بە سۆمەری šar مانای (ڕەشەکوژی) دەدات و šara خوای جەنگی سۆمەری بووە. |
| ašrahit | ئافرەتانە<br>femininity | hašarī حەشەری: وەسفێکە بۆ ئافرەتێک کە ئارەزوی سێکسکردنی هەبێت. |
| asu | بەرد<br>stone | hasān هەسان: جۆرە بەردێکە کە بۆ تیژکردنی چەقۆ بەکاردەهێنرێت و تاشە بەردی لوسی شاخیش پێی دەگوترێت (سان). وشەکە بە زمانی میدی دەبێتە asa(n). |
| ati | ئەبێتە<br>become | hātia هاتیە: هەمان مانا دەدات. (هات) وەک پاشگر لە زۆر وشەدا بەو مانایە دەردەکەوێت وەک (پێک هات، دەرهات، هتد). |
| az | خواردن (وەک کردار)<br>eat | aju ئەجو: مانای (دان نان بەخواردن) دا دەدات. لە زمانی هوریدا azuɣi مانای (کاتی خواردن، ژەمی خۆراک) دەدات. |
| aza | خۆشویستن<br>to love | haz/haž حەز/حەژ: (حەزلێکردن) هەمان مانا دەدات. بە هیتی دەبێتە assiya. |
| a-zu-za | ئێمە<br>we | az ئەز: لە کوردیەدا مانای (من) دەدات و لە هوریدا izas مانای (ئەز) ی کوردی دەدات. لە ئەڵمانیدا بووەتە ich و لە هۆڵەندیدا بووەتە ik. |
| awa | سەیری ئەوە بکە، سەیرکە<br>Behold, look here! | aua/ava ئەوە، ئەڤە: هەمان مانایە. لە لیدیدا دەبێتە av. |
| awi | هاتن<br>to come | ye یێ: لە کوردیدا مانای (دێ) دەدات. بۆ نموونە (ئەو کابرایە یێ بۆ لام). لە زمانی هیتیدا دەبێت بە ue, uwa. |
| azzuwa | ئەسپ<br>horse | (بڕوانە وشەی (ئەسپ) sisi ی سۆمەری ). |
| dumu | کوڕ، منداڵ<br>son, child | tom تۆم: لە کوردیدا مانای (تۆو) دەدات و لە سۆمەریدا dumu مانای (منداڵ) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| geštin | شەرابی تری<br>grapevine | geštin گێشتن: لە کوردیدا مانای (پێگەیینی شەراب، ترشیات یان میوە) دەدات. لە سۆمەریدا هەمان مانای زمانی لۆڤیانە. |
| geštu | هی گوێ<br>of the ear | gue ،guš گوش، گوێ: هەردووکیان لە کوردیدا مانای (گوێ) دەدەن، لە سۆمەریدا وەک زمانی لوڤیانە. |
| gi | ڕوەکی قامیش<br>reed | ga گە: مانای بەندی قامیش دەدات (هەژار، پ.٧٣٨). کە ماناکەی نەگۆڕاوە و لە زمانی سۆمەریشدا هەمان مانای هەیە. |
| gun | کێش، بارێکی قورس<br>weight, burden | guenī ،gunī گونی، گوینی: لە کوردیدا وشەیەکە بۆ ئاماژەکردن بە کیسەیەک کە لە بەن دروستکراوە و برنج، شەکر، چا یان هەر شتێکی تری تێ دەکرێت، زیاتر بە مەبەستی گوێزانەوە و بارکردن. لە زمانی سۆمەریدا gun مانای (بار) دەدات. |
| ha, a | و (ئامرازی پەیوەندی)<br>and | u و: لە سۆمەریشدا وەک کوردی دەبێتە u. |
| hali(ya) | ڕۆژ<br>day | halā هەڵا: مانای (هەڵهاتن) دێت بۆ ڕۆژ یان هەر شتێکی تر. |
| happaliya | برین<br>wound | pala پەڵە: مانای (لەکە) دەدات لە کوردیدا کە لە پرنسیپدا لە وشە لوڤیەکە نزیکە. |
| harra | هاڕین<br>crush | hārā هاڕا: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە هیتیدا دەبێتە harr و لە سۆمەریدا دەبێتە are. |
| harra | بەردی هاڕین<br>grindstone | (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| harwa | ڕێ<br>path | re ڕێ: لە کوردیدا نزیکە و لە هوریدا دەبێتە hári و لە سۆمەریدا دەبێتە ara و لە فەرەنسیشدا بوەتە rue و لە ئینگلیزیدا road کە هەمان مانای ڕێی هەیە. |
| harwani | ناردن<br>to send | rawāna ڕەوانە: هەمان مانای (ناردن) دەدات. |
| has | ئێسک<br>bone | hastī هەستی: هەمان مانا دەدات و بە زمانی هیتی دەبێتە hastāi و بە میدی و ئاڤێستا دەبێتە asta و بە زمانی فەرەنسی دەبێتە os، ئیتالی وپورتوگالی osso، ئیسپانی hueso. |
| hasu | خێزان<br>family | xezān, xasu خێزان، خەسو: (خێزان) هەمان مانا دەدات و بە زمانی هیتی دەبێتە hassannā. (خەسو) دایکی ژن یان مێردا لە کوردیدا. |
| hati | قسەکردن<br>to speak | utī, uta وتی، وتە: (وتی) حاڵەتی ڕابوردوە بۆ کەسی سێهەم لە کرداری (قسەکردن) دا و (وتە) هەمان مانای (قسە کردنێک کە پێشکەش خەڵک بکرێت) ی هەیە. لە زمانی هێتیدا te مانای (قسەکردن) دەدات و لە هوریدا دەبێتە ti. |
| hata | تێکشکاندن<br>destroy | adā ئەدا: لە کوردیدا مانای (کێشان بە شتێکدا) دەدات. بۆ نموونە (چەکوشەکەی دا بەسەریدا). بە زمانی سۆمەری |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەبێتە du و بە هوری id هەمان مانای (ئەدا) ی کوردی دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە hit کە مانای پێداکێشانی هەیە. |
| hinu(wa) | بردن بە شوێنێکدا<br>to cause to pass | henā هێنا: هەمان مانا دەدات. |
| hishi | بەستنەوە بەیەکەوە<br>to bind | hez, heziyā هێز، هێزی یا: (هێز) لە کوردیدا مانای (قوەت و توانا) دەدات و (هێزی یا) ماناکەی دەبێتە (هێزی پێدا). بە زمانی سۆمەری بە (هێز) دەڵێن usu. بە زمانی هوری eγeps مانای (ماسولکە گرژبوون) دەدات. بە زمانی لوڤیان wiši مانای (پەستان) دەدات. کە هەموویان لەیەک نزیکن و هاوبەشن لەگەڵ کوردیدا. بە هیتی بە (پاڵنان) دەگووترێت hazziya. |
| huillari | خوارکردنەوە، لارکردنەوە<br>winding, twisting | lārī لاری: مانای (خواری) دەدات و نەگۆڕاوە. |
| huišti | هاوار لە تاو ئازار<br>cry of pain | āiš, eš ئایش، ئێش: (ئایش) هاوارکردنە لە ئازار و (ئێش) مانای (ئازار) دەدات. |
| huntariya | تڕ لێدان<br>break wind | trīīā[29] تڕی یا: بە کوردی مانای (تڕی لێدا) دەدات و بە زمانی سۆمەری بە (تڕ) دەڵێن dur و بە ئازاری سک بە هۆی هەواوە دەڵێن šagtahar کە بە کوردی دەبێتە (سکتڕی). |
| huta | گورجوگۆڵ<br>haste | hātua هاتووە: مانای (ئامادەبووە) دەدات. |
| isanu | دانیشاندن، حەوانەوە<br>to make it sit, settle | hasānaua حەسانەوە: هەمان مانا دەدات. |
| izi(ya) | زیاکردن<br>to increase | ziā زیا: هەمان مانا دەدا و بە سۆمەری دەبێتە zi کە مانای (بەرزبوونەوە) دەدات و بە هوری دەبێتە tia. |
| karš | لەتکردن<br>cut | kart,qārs, qaš قاش،کەرت، قارس: (قاش) و(کەرت) بە مانای پارچەیەکی دابڕاو لە شتێک دەدەن و بە شێوەی جیاواز بەکاردەهێنرێن. (قارس) چاوگی کرداری ( قارس کردن)ە کە مانای (کورتکردنەوە بە دوروماں) دێت و بە زمانی هیتیش هەمان مانا دەدات. |

[29]. زۆربەی جار جیاوازی وشە کوردیەکان و لوڤیان لە پێشگرێکدایە کە لە زمانی لوڤیدا بەشێوەی hu و هەندێک جار لەگەڵ وشەیەکی تردا بۆی زیاد کراوە.

| | | |
|---|---|---|
| kīša(i) | شانە<br>comb | kazi ,kiš ,qiž, gīs گیس، کش، قژ، کەزی: لە کوردیدا (گیس) مانای (پرچ) دەدات (جەلیلیان، پ. ٣٦). وشەی (کەزی) مانای (قژی هۆنراوە یان هەر جۆرێک لەبەن کە هۆنرابێتەوە، زوڵف، گیای حەسیر) دەدات. (کش) لە کاتی داهێنانی قژی منداڵدا بەکار دەهێنرێت بۆ ئەوەی کە نەگری. (قژ) مانای (توکی سەر) دەدات. لە زمانی سۆمەریدا guz مانای (قژی درێژ، پڕ) و ki-iz مانای (قژ یان گیا کورتکردنەوە، پاکردنەوە) ی هەیە. لە سانسکریتدا (قژ) دەبێتە keza و لە زمانی سربی و کرواتی و بولگاریدا دەبێتە kosa. ئەم وشەیە لە کوردی/لوڤی/سۆمەریەوە راستەوخۆ چووەتە زمانی لاتینیەوە. وشەی قەیسەرلە لاتینیدا بە شێوەی caesar دەنووسرێت و بە مانای (قژار، سەرێکی توکن) دێت. زۆربەی سەرچاوەکان بناغەی ئەو مانایە بۆ دروستبوونی نازناوی قەیسەری رۆم دەگەڕێننەوە .(Schwager, 1991, p.22) |
| karmali | لەتکردن<br>to hack | kirman کرمان: مانای (لەتکردن بە دان) دەدات. |
| ku | هەروەها؛ زیاتر<br>also; furthermore | ka کە: مانای (تر) دەدات. بۆ نموونە (یەکێکی کە بهێنە). |
| k(u)war(i) | کوێ<br>Where | kurā/ ku کو/کورا: ئەم وشەیە لە ناوچەی خانەقین هەتاوەکو کرماشان وەک خۆی ماوە و دەڵێن (کورا) و لە هەولێر و دەروبەری دەڵێن (کودەرێ/کو). |
| kwati | کەواتە<br>wherefore | kauāta کەواتە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات و لە زمانی هیتیدا وشەکە دەبێتە katta. |
| kwaza | بڕین، هەڵکۆڵین<br>to cut, engrave | gāz گاز: لە کوردیدا ماناکەی (بەدان بڕین، قەپگرتن) دەدات. لە سۆمەریدا guz ماناکەی دەبێتە (دان جیڕکردنەوە، دان دەرخستن، بڕین). |
| kwi | کێ<br>who | ke کێ: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زمانی لیدیدا دەبێتە qe و لە زمانە هیندۆ ئەورووپیەکاندا دەردەکەوێتەوە. بە ئیتالی chi، ئیسپانی و پورتوگالی que فەرەنسی qui. |
| kwi | کەی<br>when | kai کەی: هەمان مانا دەدات. |
| kwabi | کەوابێ<br>so | kawābe کەوابێ: هەمان مانا دەدات. |
| kwita | کوێ<br>where | kue, kuedā کوێ، کوێدا: وشەی (کوێ) پرسیارە بۆ دەستنیشانکردنی شوێن. (کوێدا) هەمان ڕۆڵی هەیە و زیاتر بۆ داوای دەستنیشانکردنی شوێنەکەی پرسیار دەکرێت. لە زمانی کرواتیدا دەبێتە kuda. |
| la | لێ لابردن<br>to take away from | lā لا: هەمان مانا دەدات و بە زمانی سۆمەری و هیتی-ش هەر دەبێتە la. |

| | | |
|---|---|---|
| lala/i | زمان؛ قسەو قسەڵۆک<br>tongue; gossip | le ,lal لی ،لال: (لاڵ) بە کەسێک دەگووترێت کە نەتوانێت بە تەواوی قسە بکات. هەروەها بە مانای (وورتەکردن) دێت. دەوترێت (ئیتر لەلە نەکەیت ، لەلە بکەیت لەلەت ئەبرم) هەروەها دەوترێت ( دەمت داخەو لەلە لەل مەکە ). وشەی (لَی) دەبێتە رەگی (ئەلَی) و لە زمانی هوریدا (قسەکردن) دەبێتە al. لە زمانی هیتیدا ماناکەی نزیکە. |
| lu gal | پاشا<br>king | lo kal لۆ کەڵ : لە کوردیدا (لۆ) مانای (کابرا) دەدات (هەژار، پ.٧٦٠) دەدات و وشەکە بە کوردی ئەمرۆ ماناکەی دەبێتە (کابرای مەزن، کابرای گەورە) کە لە بنەچەدا سۆمەریە. |
| marati | خواست<br>request | mirāz مراز: مانای (نیازی دڵ، خواست) دەدات و زۆر کەم گۆڕاوە. |
| masana | خودا<br>God | mazin مەزن: مانای (گەورە، پایەبەرز) دەدات. بە سۆمەری massu مانای (سەرکردە) دەدات. |
| mashani | مەزنکردن<br>to make grow | mazin مەزن: مانای (گەورە، پایەبەرز) دەدات. بە زمانی میدی دەبێتە masa و بە سۆمەری massu مانای (سەرکردە) و mes مانای (پاڵەوان) دەدات و لە ئاڤێستادا دەبێتە masan. |
| matu | شەراب<br>wine | mas/mast مەس/مەست: مانای (سەرخۆش) دەدات. |
| mi/mu | هی/بۆ من<br>for/to me | ma مە: هەمان مانا دەدات. لە زمانی سۆمەریدا mu بەکاردەهێنرێت. بە فەرەنسی mon/ma و لە زمانە هیندۆ ئەورووپیەکانی تردا دووبارە دەبێتەوە. |
| na, nawa | نا، نە<br>not | na نە: نە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و (نە) لە سۆمەریشدا دەبێتە nu. ئەم وشەیە لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا هاوشێوەی ئەوەیە. بە فەرەنسی non، ئینگلیزی و ئیسپانی و ئیتالی no، ئەڵمانی nein. |
| nawa | بەرەی دووهەمی کوڕ<br>great-great grandson | naua نەوە: هەمان مانا دەدات بەڵام لە کوردیدا دەشێت کوڕ یان کچ بێت. |
| nawanawa | بەرەی سێهەمینی کوڕ<br>great-great-great grandson | nauaīnaua نەوەی نەوە: هەمان مانا دەدات بەڵام لە کوردیدا دەشێت کوڕ یان کچ بێت. |
| nanun | ئێستا<br>now | niho, hanuka, naua نهۆ، هەنوکە: هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی هوریدا دەبێتە hínnu هیتی nu بە ئینگلیزی دەبێتە now، دانیمارکی و سویدی و هۆڵەندی nu. |
| nawa | نوێ<br>new | nu, nue نو، نوێ: لە کوردیدا نەگۆڕاوە و بە زمانی هیتی دەبێتە newa و بە ئینگلیزی دەبێتە new و بە فەرەنسی nouveau . |

| nawila | لاو، گیانداری تەمەن کەم youth, young animal | nuela نوێلە : لەوە دەچێت وشەکە بەهۆی پاشگری la وە مانای بچووکی وەرگرتبێت. لە زمانی کوردیدا هەمان پاشگر بە هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە (مێروو/مێرولە، بچک/بچکۆلە، بەرخ/بەرخۆلە، کورت/کورتەلە). بەو جۆرە وشەکە پێک دێت لە (نوێ+لە)، کە لە ڕووی ڕێزمانیەوە لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (شتە نوێ بچوکەکە). |
|---|---|---|
| ninda | نان bread | nān نان: لە زمانی سۆمەریشدا وەک خۆیەتی و چووەتە زمانی هیندی و فارسیشەوە. |
| nuwa | ژمارە نۆ nine | no نۆ: هەمان مانا دەدات. |
| pahur | ئاگر fire | āhir ئاهر: لە ڕاستیدا ئەو وشانەی ئەمڕۆ لە کوردیدا بۆ ئاماژەکردن بە ئاگر (ئایر، ئاگر، ئاتەر، تایر، ئادر) بەکاردەهێنرێن، بنەچەکەیان لە سۆمەری و میدی و هوری و ئاڤێستادا هەن. میدی atr، لە سۆمەریدا gir دەبێتە خوای ئاگر، بە هوری ahari مانای سوتاندنی هەیە tari مانای ئاگر دەدات. وشەی ئاگر لە ئینگلیزیدا بووەتە fire و لە هۆڵەندیدا vuur و سوتاندن لە ئیسپانیدا دەبێتە ardor |
| pai, pī(ya) | پێیا give | peīā پێیا: لە کوردی و هیتیدا وەک یەکە و لە زمانی کاریدا دەبێتە pi و لە لیدیدا دەبێتە bi. لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە pay و لە فەرەنسیدا کرداری payer. ئەو وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا ، وەکو کوردی بۆ (پارەدان، بایەخ پێ دان) بەکاردەهێنرێت. بەڵام لە زمانی فەرەنسیدا بۆ(پارە دان یان دانی شتێکی مەعنەوی) بەکار دەهێنرێت. |
| palha | تەخت بوون، بڵاوکردنەوە make flat, spread out | pālā پاڵا: ئەم وشەیە پێکهاتەی وشەی (پاڵخستن، پاڵکەوتن، پاڵدانەوەیە) کە مانای نزیکی هەیە. لە ئینگلیزیدا وشەی pillow مانای (سەرین) دەدات. |
| paran, pari | پێشتر، لەبەردەم before, in front | bar, pār, pere بەر ، پار، پێرێ: (بەر) مانای (پێشوو) و بەردەم دەدا (ئەو لەبەر منەوە بوو، ئەو بەر من چوو) یان (لە بەردەمما مابوو). هەروەها (پار) مانای (ساڵی ڕابردوو دەدات) و (پێرێ) مانای دوو ڕۆژ لەمەوبەر. لە زمانی هیتیدا peran مانای (پێشتر، لە پێش) دەدات. وشەی (بەر) لە کوردیدا وەک پێشگریش سەدان وشەی لێ دروسکراوە بە مانای (پێش) بۆ نموونە (بەرکوڵ، بەردەم، بەرپێ، بەرچاو، بەرکۆش، هتد). ئەم پێشگرە لە کوردیدا بە هەمان مانا و هەمان شێوە بەکاردەهێنرێت . لە زمانەکانی تردا دەبێتە praeلە لاتینیدا و pre پێشگرە بۆ سەدان وشەی ئینگلیزی وەک بناغەی وشەکانی<br>pre-book, prearrange, precast, precouctin و زۆر وشەی هاوشێوەی وشە ئینگلیزیەکان لە فەرەنسی و زمانە هیندۆئەوروپیەکانی تریشدا دووبارە دەبنەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| parī | پەڕین، دوورکەوتنەوە forth, away | parī پەڕی: هەمان مانای هەیە و لە زمانی کاریدا دەبێتە para و لە هیتیدا parean مانای (پەڕینەوە) دەدات. |
| parkuwa(i) | پاکردنەوە، پاکژکردن cleanse, purify | pākaua پاکەوە: دەبێتە پێکهاتەی وشەی (پاکەوە کردن) و لە زمانی هیتیدا نەگۆڕاوە. |
| paršul | وردەی نان crumb | pirzol پرزۆڵ: مانای پارچە پارچەکردن دەدات (هەژار، پ.١٠٦) |
| pāta | پێ foot | pāta, pe پاتە، پێ: لە کوردیدا (پاتە) مانای (پێڵاو)دەدات. (پێلاو) لە زمانی فەرەنسی کۆندا بووەتە botte و لە ئینگلیزیدا بووەتە boot. بەڵام وشەی (پێ/پا) لە کوردی و لە سۆمەریدا هەمان مانای (قاچ) دەدات pah. |
| paza | پیاسەکردن to walk | piāsa پیاسە: هەمان مانا دەدات و بە ئیتاڵی و پورتوگالی دەبێتە passo. |
| piya | پێدان to give | peīā پێیا: بەکارهێنانی ئەو وشانە لەم رستانەدا دەبینرێت: (پارەکەی پێیا، زەویەکەی دا پێ، بایەخی پێ دا). لە زمانی هیتیدا وەک لوڤیان دەبێتە piya و لە زمانی کاریدا دەبێتە pi. لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە pay و لە فەرەنسیدا payer. ئەو وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا ، وەکو کوردی بۆ (پارەدان، بایەخ پێ دان) بەکاردەهێنرێت. |
| pūna | هەموو یان گشت all or totality | pān پان: لە کوردیدا (پان) مانای (فراوان) دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی هیتیدا وەک پێکهاتەی وشەی لێکدراو دەردەکەوێت بۆ نموونە pangariya کە مانای (بەربڵاوبوونەوە) ی هەیە، هاوشێوەی وشەی (پانگەری) کوردیە. لە ئینگلیزیدا pan وەک پێشگر بە مانای (گشتگیری و پانایی) دێت، بۆ نموونە pan-African، وشەکەیان لە لاتینەوە گرتووە. pana بە زمانی سۆمەری مانای (کەوان)ی هەیە، هەروەها لە زمانی ئینگلیزیدا pan مانای تاوە دەدات کە لە مانای (بەربڵاوبوونەوە، پان بوونەوە)وە هاتووە. |
| puškant(i) | پارەکۆکردنەوەی زۆر و سەرفنەکردنی (ڕەزیلی) miserly | pašakauti پاشەکەوتی: بریتیە لە حاڵەتی پارە کۆکردنەوە. |
| pūwā(i) | پیایا، پیاکێشان pound, crush | pīāīā پیایا: هەمان مانای (پیایدا) دەدات کە ماناکەی یەکە لەگەڵ وشە لوڤیانەکەدا. |
| šahhan | بێگاری ئاغایانە feudal service | šāhāna شاهانە: لە کوردیدا (شاهانە) هاو شێوەی وشەی (سەرانە) یە و لە بنەڕەتدا ئەو پارەیە کە دراوە بە خەڵکی خاوەن زەوی یان هەر شتێکی تر و لە هیتیشدا هەر هەمان وشە لوڤیەکەیە و ماناکەی نزیکە. وشەی هاوشێوەی تر لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کوردیدا بریتین لە (سەرانە، بەگانە، سەرفوترانە، کەرانە، ئاشانە) کە هەمووی ئاماژەن بە جۆرێک لە باج دان یان باج وەرگرتن. بۆ نموونە (بەگانە) ئەو باجەیە کە جوتیار ساڵانە دەیدات بە بەگ یان بە ئاغا. هەندێک جار ئەو بەگانەیە پارە نیە بەڵکو کارکردنە بە خۆڕایی بۆ بەگ یان بۆ ئاغا. |
| šahhanni(ya) | خزمەتگوزاریەکی سەپێنراوی دەرەبەگانە<br>impose feudal service on | šāhāna شاهانە: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| šakaldamman | زیان پێگەیشتن، وێرانکردن<br>harm, destruction | šaqaldā شەقەڵدا: کە مانای بە (قاچ لێدان) دەدات و لە زمانی هیتیدا šakuwai جۆرێکە لە سزادان و بە سۆمەری بە (شەق) ی کوردی دەڵێن sag. |
| šapp(a) | توێکڵ لێکردنەوە<br>peel | spī سپی: دەبێتە بناغەی وشەی (سپیکردن) کە مانای (توێکڵ لێکردنەوە) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (پێویست ناکات ڕێواسەکە سپی بکەیت، خۆی ناسکە). وشەی (سافکردن) ی کوردی بە سۆمەری دەبێتە sub و بە هیتی دەبێتە šapiya و پێ دەچێت وشەکە بناغەی وشەی soap ی ئینگلیزی و seife ی ئەڵمانی بێت کە مانای (سابوون) دەدەن. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت لە کوردیدا مانای زمانە کۆنەکانی بزر نەکردووە. |
| šapiya | مادەی پاکژکردنەوە<br>cleansing agent | sāfī سافی: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| šari | لە سەر؛ سەرو<br>above; up | sar سەر: هەمان ماناکەی لە کوردیدا ماوە و لە هیتیدا دەبێتە šara و لە فەرەنسیدا بووەتە sur. |
| šara | لەسەر؛ لەوێوە<br>(up)on; thereon | (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| sarku | پایەبەرزەکە (مەزنەکە)<br>the mighty (one) | sarko سەرکۆ: مانای (سەرکردەی کۆمەڵ) دەدات. |
| šaruš | تاڵانی<br>booty | šar، šoriš شەڕ، شۆڕش: لە کوردیدا (شەڕ) مانای (جەنگ، گیانی خراپ، ئاژاوە) دەدات. (شۆڕش) لە کوردیدا مانای (هەستانی خەڵک) دەدات. لە سۆمەریدا šar هەمان مانای وەکو کوردی هەیە. |
| suri | زۆر<br>plenty | zor زۆر: هەمان مانا دەدات. |
| suwan | سەگ | sa, saān سە، سەان: لە کوردیدا چەندین ناو هەیە بۆ سەگ |

| | | |
|---|---|---|
| | dog | لەوانە (سە، سەگ، سپلۆت، سپەر). (سەان) بریتیە لە کۆی (سە/سەگ). وشەی (سەگ) لە میدیدا دەبێتە spa و لە ئاڤێستادا دەبێتە span, spâ. |
| tappa | تفکردن spit (on)' | tif تف: هەمان مانای هەیە. |
| taru | تەختە wood | dār دار: لە کوردیدا مانای (تەختە) ش دەدات. بە زمانی سۆمەریش بە (تەختە دار) دەگووترێت dur و لە ئاڤێستادا بە (داری دەست) دەگووترێت dru و لە زمانی هیتیدا هەر دەبێتە taru . ئەم وشەیە لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا بە شێوەی جیاواز دەرکەوتووە. ئینگلیزی tree، سلۆڤینی drevo، کرواتی drvo، دانیمارکی træ. |
| tarsa | گەڵا leaf | tarz تەرز: (تەرز) لە کوردیدا ئاماژەیە بەو لکانەی کە رووەکی گەڵامێو، کاڵەک، شوتی دەیهاون بۆ خۆهەڵواسین بە دار یان شتی تردا. لە سۆمەریدا pešturzi مانای لا لقی درەخت دەدات کە وەک وشەی (پێش تەرز) ی کوردی دەردەکەوێت لەبەر ئەوەی کە وشەی (پێش) هەر هەمان مانای هەیە لە سۆمەری وکوردیدا. |
| tāta/i | باوک father | tāta تاتە: بە زاراوەی هەورامی مانای (باوک) دەدات و لە زمانی هوریدا دەبێتە ata و لە لاتینیدا دەبێتە atta. لە زمانی رۆمانیدا دەبێتە tată . |
| tāwa/ī | چاو eye | cāua/cāu/cāv چاوە/چاو/چاڤ: بە هەر سێ شێوەکەی هەمان مانا دەدات. |
| tī | تۆ you | ta/to تۆ/تە: لە هیتیدا هەمان مانا دەدات و لە زۆربەی زمانە هیندۆ ئەورووپیەکاندا وەک یەکن بۆ نموونە بە زمانی فەرەنسی دەبێتە toi/tu، بە ئیسپانی te و بە کرواتی ti. |
| tup(a)i | پێداکێشانی توند to smite | tapa تەپە: مانای (پێداکێشان) دەدات و (تەپ) دەبێتە رەگی (تەپان) کە مانای (رووخاندنی کتوپڕ) دەدات. |
| tūwa/i | هی تۆ (تۆیە) your | toīa/taīa تۆیە/تەیە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. بە فەرەنسی دەبێتە ton/ta. |
| uni/unai | زانین (کردار) know | zānī زانی: دەبێتە فەرمانی (زانین). |
| urazza | گەورە، مەزن great | barz, haurāz بەرز، هەوراز: لە کوردیدا وشەی (بەرز) مانای (بڵند) دەدات و هەوراز مانای بەرەوژوورە. لە زمانی میدیدا (بەرز) دەبێتە brzi و لە ئاڤێستاشدا دەبێتە barez. |
| usala | ساڵی/ساڵانە yearly | sāli, sālāna ساڵی، ساڵانە: بە هەردوو شێوەکەی هەر هەمان مانای وشە لوڤیانەکەیان هەیە. بە هیتی بە (ساڵ) دەگووترێت šapli و بە هوری دەبێتە sawaal. |
| utar/utn | وشە؛ پیتسازی word; spell | uitār, uitin وتار، وتن: لە کوردیدا (وتار) تێکست یان قسەکردنێکی داڕێژراوە ، (وتن) مانای (گووتن) دەدات و بە زمانی هیتی uttar مانای (وتار) ی کوردی دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا utter مانای (گووتنی شتێک) دەدات. |
| uru | شار | uār/hauār وار/هەوار: (بڕوانە هەمان وشە لە زمانی |

| | | |
|---|---|---|
| | city | سۆمەریدا) |
| walli(ya) | بەرزکردنەوە، بڵندکردن. raise, lift | (بڕوانە وشەی ala/i). |
| wariya | هاریکاری help | yārī یاری: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. |
| wašhay(a) | پیرۆزکردن sacralised | ašhuā ئەشوا: لە کوردیدا مانای پاکردنەوە دەدا. لە زمانی سۆمەریدا atua مانای پاکردنەوەی ئاینی دەدات و بە زمانی هوری tuw مانای (پاک) دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا کرداری wash مانای (شتن) دەدات و بە ئەڵمانی Wäsche وەک ناو مانای (شتن) دەدات. |
| wašš(a) | پۆشین wear | pošā/poš پۆشا/پۆش: لە کوردیدا هەمان مانا دەدا و بە زمانی هیتی وشەی puš مانای (شاردنەوە، داپۆشین) دەدات. |
| wasu | باش good | uaš/bāš/xas/xoš باش/وەش/خاس/خۆش: لە کوردیدا هەر چوار شێوەکەی بەکاردەهێنرێت. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە ašša و لە هیتیدا دەبێتە assu لە زمانی لیدیدا دەبێتە wiśśi. |
| wida(i) | لێدان strike | adā ئەدا: لە کوردیدا هەمان مانای ماوە و لە هوریدا دەبێتە id. |
| wiši | پەستان press | hez, uišī هێز، وشی: لە کوردیدا (وشی) برێتیە لە کرداری (وشین/گوشین) لە حاڵەتی ڕابوردودا کە هەمان مانای پەستان دەدات و (هێز) مانای (قوەت) دەدات. لە زمانی سۆمەریدا وشەی usu دەبێتە (هێز) لە کوردیدا و لە هوریدا eγeps مانای ماسولکە گرژبوون دەدات. لە زمانی هیتیدا hazziya مانای پاڵنان دەدات. |
| wazi | ویست request | uīst/ uīs ویست/ویس: لە کوردیدا هەردوو شێوەکەی هەیە. لە سۆمەریدا دەبێتە ašte و بە میدی دەبێتە vas/vasa. شێوەی میدی و سۆمەری و لوڤی وشەی (ویست/ویس) ئەمڕۆ لە کوردیدا ماوە . بە مانایەکی نزیک لە زمانی ئینگلیزی و لاتینیدا دەبێتە quest و بە فەرەنسی دەبێتە quête. |
| zārt | دڵ heart | zird زرد: لە زمانی کوردیدا وشەی دڵ دەشبێتە (زرد zird ). مینۆرسکی لە یەکێک لە بابەتەکانیدا سەبارەت بە کورد و تایبەتمەندی زمانەکەی دەڵێت (وشەی گشتی هیندۆئەورووپی بۆ (دڵ) لە کوردیدا (زرد) و لە فارسیدا (دڵ)ە.)(مینۆرسکی،٢٠٠٦، پ. ٢٤). وشەکە بە زمانی میدی دەبێتە zrd و بەهیتی دەبێتە kard، بە چیکی srdce، ڕوسی دەبێتە serdtse، بە پۆڵۆنی serce، کرواتی srce، لاتینی دەبێتە cordis و بە یۆنانی kardiá، ئینگلیزی heart. |
| zidāhit | نێرایەتی، پیاوەتی virility, manhood | zāt زات: لە کوردیدا مانای (ئازایەتی) دەدات. هەروەها وشەی (زیت) مانای (چالاک، گورج و گۆڵ) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| zita/i | پیاو<br>man | zāt زات: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| zuhrit ،zuhrit | گیا، کا<br>grass, hay | zarāt زەرات: ڕووەکێکە بەرەکەی زۆر ووردە و لە سەردەمی هەژاریدا لەگەڵ گەنم تێکەڵ کراوە بۆ نان. |
| zūwa | نان<br>bead | zauā زەوا: ناوێکی ترە بۆ ئاماژەکردن بە (نان) زیاتر لە کاتی ئاماژەکردن بە نان بەشێوەیەکی پیرۆز و بەڕێزەوە بەکاردەهێنرێت. |

# هیتیەکان (Hittites)

**سەرەتایەک سەبارەت هیتیەکان**

هیتیەکان یەکێکن لەو نەتەوانەی کە نیشتەجێی باکوری کوردستان بوون، لە ناوچەیەکدا کە بە خاکی هیتی (Hatti) دەناسرا. لە نزیکی ١٨٠٠ پ.ز دا ناویان هاتووە و لە ماوەی ٥٠٠ ساڵدا ئیمپراتۆریەتێکی بەهێزیان لە باکوری خۆرئاوای کوردستاندا دروست کرد کە بەشێک لە سوریا و تورکیا و عێراقی ئەمڕۆی گرتبووەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٥). پایەتەختی هیتیەکان شاری هاتوسە (Hattusa)[30] بووە کە بنەماڵەی پاشایی و سەنتەرە ئاینیەکەیانی تێدا جێگیر بوو بوو. هیتیەکان بە هۆی پێگەی جوگرافیانەوە، کە کەوتبووە ناوچەی دەسەڵات و ژیانی هوریەکان و لوڤیەکان، زۆر تێکەڵی ئەو دوو گروپە بوون و زۆر لایەنی ئاینی و زمانەوانیان ئاوێتەی یەک بووە.

لەوپەڕی بەهێزبوونیاندا، هیتیەکان لە ساڵی ١٥٩٥ پ.ز دا شاری بابلیان گرت و تاڵانیان کرد، بەڵام هەوڵیان نەدا حوکمڕانی بکەن و گەڕانەوە بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆیان لە ئەناتۆلیا. هیتیەکان هەتاوەکو نزیکی کۆتایی سەدەی هەشتەمی پێش زایین مابوون، دوای بەهێز بوونی ئاشوریەکان، لەو سەردەمەدا هەر لەلایەن ئەوانەوە، کۆتایی بە دەسەڵاتیان هێنرا.

(نەخشەی ژمارە ٥) وڵاتی هیتیەکان و پایەتەختەکەی، هاتوسە.

زۆر لە مێژوونوسان قۆناغی حوکمڕانی هیتیەکان دەکەن بە سێ بەشەوە و هەندێک دەیکەنە دوو بەش. لە دوو بەشەکەدا قۆناغی یەکەمی هیتیەکان بریتیە لەو یەکەم دەوڵەتە کۆنەی کە لە سەرەتای دامەزراندنیانەوە هەتاوەکو ساڵی ١٤٠٠ پ.ز بەردوام بوو، ئەوی تریان، کە بە قۆناغی ئیمبراتۆریەت ناو دەبرێت، لە ساڵی

[30] ئەم شارە دەکەوێتە ناوەڕاستی تورکیای ئەمڕۆوە و تورکەکان ناوەکەیان گۆڕیوە و کردوویانەتە Boğazkale.

١٤٠٠ پ.ز هەتاوەکو کۆتاییەکانی سەدەی دوانزەهەمی پێش زایین دەڕوات. هیتیەکان خاوەنی شارستانیەتێکی زۆر ئاڵۆز و پێشکەتوو بوون و چەندین تێکست و شوێنەواری قەڵا پتەوەکانیان ئەمڕۆ لە باکوری کوردستاندا ماون.

**زمانی هیتی**

هیتیەکان بە زمانی خۆیان گووتووە Nesite (نێسایت). بەڵام ئەمڕۆ زمانەوانەکان ناوی زمانی هیتی (Hittite) یان بۆ داناوە و بە کۆنترین زمانی هیندۆئەوروپی دادەنێن. مێژوونوسان پێیان وایە کە زۆر پێش ئەوان نەتەوەیەکی تر بە ناوی Hatti هەبووە لە ناوچەکەدا و بەهۆی تێکەڵبوونیان بەوانەوە ئەم ناوەیان وەرگرتووە (Bryce, 2004, p.8) .

پاشماوەی زمانەکەیان لەسەر گڵی سورەوەکراو نووسراوە و ژمارەیەک تێکستی جیاوازی هیتی ماونەتەوە کە بریتین لە تێکستی پەیوەست بە سەرەمۆنی ئاینی، فیستیڤاڵ و جادوگەری. هەروەها تێکستی ئەرشیفی پەیوەندی دیپلۆماسی، سیاسی، ڕێکەوتننامەکان و نامەی شەخسیان لێ جێماوە. هیتیەکانیش، بۆ نووسین، هەر هەمان سیستمی نووسینی مێسۆپۆتامیایان بەکارهێناوە.

(وێنەی ٤)
پاشماوەی دەروازەی شاری هاتوسە کە دەکەوێتە باکوری کوردستانەوە.

یەکێک لەو تێکستانەی کە بایەخێکی زۆری پێدراوە و لە زمانی هیتی بەجێماوە، بریتیە لە ڕێنماییەک کە لە لایەن ڕاهێنەرێکی ئەسپەوە نووسراوە بە ناوی Kikkuli (کیکوڵی) و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەمی پێش زایین. زمانەوانەوانەکان ئەم تێکستەیان بە زمانی هیتی داناوە لەگەڵ تێکەڵی وشەی میتانی. کیکوڵی خۆی بە ڕەگەز میتانی بووە و لە تێکستەکەیدا بە ووردی باس لە ڕاهێنانی ئەسپ و چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵیدا دەخاتە ڕوو. ئەم تێکستە بە یەکێک لە گرنگترین تێکستەکان دادەنرێت لە مێژووی ناوچەکەدا، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کۆنترین تێکستە دۆزرابێتەوە سەبارەت بە مەشق پێکردنی ئەسپ، بۆیە لێکۆڵینەوەیەکی زۆری لەسەر کراوە و هەوڵی زۆر دراوە کە لە ڕێگای دەستەواژەکانەوە بنەچەی زمانەکە بدۆزرێتەوە. ئەوەی مایەی سەرنجە، بێ ئەوەی کە لێکۆڵەرەکان بزانن، تێکستەکە کوردی کۆنە، لێکۆڵینەوەیان لەسەر کردووە. Raulwing (2009) لێکۆڵینەوەیەکی درێژی سەبارەت بەو ڕێنماییە نووسیوە و زۆر لە وشەکانی شی کردۆتەوە. تێکستەکە سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێ دەکات:

UM-MA Ki-ik-ku-li li LÚ a-aš-šu-uš-ša-an-ni
ŠA KUR URU Mi-it-ta-an-ni

کە دەبێتە

UM-MA Kiikkulili lu aaššuuššaanni

ša kur URU Miittaanni
بە ئینگلیزی تەرجومە کراوە بە
Thus [speaks] Kikkuli, the horse trainer, from the land of Mittani. واتە "کیکولی ڕاهێنەری ئەسپ بەم جۆرە [قسە دەکات]، کە سەر بە وڵاتی میتانیە). بەڵام (قسە دەکات) خراوەتە نێوان دوو کەوانەی داخراوەوە. بەو دوو کەوانەیە لەوێدا، موتەرجیم دەیەوێت بڵێت، تێکستەکە وای نەگووتووە یان ئەو وشەیە لە نوسینەکەدا نیە و موتەرجیم دەیەوێت بڵێت کە ڕستەکە بە هەمووی ئەو مانایە دەدات یان لەوانەیە مەبەستی لەوە بوو بێت.
بۆ لێکدانەوەی وشەکە، ڕۆلین وەک زۆر لە لێکۆڵەرەکانی تر، سەرەتا هاتووە باسی ئاری و هیندۆ ئاریەکان دەکات ولە وشەی asva (ئەسپ) دەکۆڵێتەوە. بۆ ڕوونکردنەوەی وشەی aššuuššaanni، پەنای بۆ سەرچاوەی تر بردووە و کردویەتیە دوو بەشەوە assu+ssanni. ڕۆلین دەڵێت asva بنەچەی وشەی (ئەسپ) مو گەڕاندویەتەوە بۆ هیندۆئاری. ئەمجا دەڵێت ssanni لە šami وە هاتووە کە سانسکریتە و مانای (شەکەتکردن، هیلاککردن) دەدات. بەڵام ئایا وشەی ssami، چۆن گۆڕا بە ssanni؟ ڕۆلین ڕوونی نەکردۆتەوە. بە گشتی لێکدانەوەکانی ڕۆلین وەک زۆر لە لێکۆلەرەکانی تر، زمانی سانسکریتی کۆن دەکەنە ئامراز بۆ ڕوونکردنەوەی هەموو شتێک کە نازناوی ئاری و هیندۆئاری لێ دەنێن، سەرەڕای ئەوە ئەم شێوە لێکدانەوەیە ئەمڕۆ بووەتە ستاندارد و کەسی تر بۆچوونێکی جیاوازتری ئەوتۆی نەداوە بە دەستەوە.
بەڵام ئەگەر لە گۆشەی زمانی کوردی و زمانە دێرینەکانی ناوچەکەوە سەیری ئەم تێکستە بکەین ئەوا کارەکە زۆر ئاسانتر دەبێت و دەبینرێت بنەچەی وشەکان هەر سۆمەری/هوری/میدی/کوردیە.
دەبینرێت کە ناوی کەسەکە کە بریتیە لە kikkuli، کە لەگەڵ سروشتی زمانی کوردیدا نامۆ نیە. دەشێت ئەو ناوە بە چەند شێوەیەک لە کوردیدا لێک بدرێتەوە. ناوی کاکەڵ/کاکڵ (kākil/kākal) پێک دێت لە دوو وشەی (کا+کەڵ). وشەی (کا) ئەمڕۆ لە کوردیدا بۆ ڕێز بەکاردێت و زۆر کەس (کا) بووەتە بەشێک لە ناوەکەیان و ناوی (کاکەڵ/کاکڵ) بە هەمووی لە زمانی کوردیدا ماناکەی دەبێتە بەڕێزی گەورە یان بەڕێزی نایاب. لەوە دەچێت کە وشەی (کا) لە ناوی (کەیخەسرەو) ی پاشای میدیدا هەر بە هەمان مانا بەکارهاتبێت لەبەر ئەوەی کە (خەسرەو) بە تەنها ناوە و بە ڕوونی دەردەکەوێت (کەی) پێشگرە بۆ ناوەکە کە پێک دێت لە (کەی+خەسسرەو) و وا دەردەکەوێت لەو سەردەمەدا بە شێوەی (کەی) گووترابێت.
جگە لەوەش لە کوردیدا وشەی کاکۆڵ (kakol) مانای (موی درێژی پێشی سەر، پۆپنەی بەرزی باڵندە) دەدات (هەژار، پ.٦٠٢)، وشەی کاکڵ (kakil) یش بەمانای ناوەرۆکی گوێز و بادەم دێت. هەروەها ناوی کاکڵ (kakil) یش هەیە کە ناوێکی کوردیە بۆ پیاوان، بەڵام ماناکەی نازانرێت.
کیکولی سەرەتای تێکستەکەی بە um ma دەست پێ دەکات. لەوە دەچێت کیکولی مەبەستی لە amma (ئەممە/ئەمەم) بێت. بەو جۆرە سەرەتای ڕستەکە دەبێتە "ئەممە کیکولی".
وشەی lu کە لە سۆمەریدا هەر هەمان شتە و لە کوردیدا دەبێتە (لۆ)، مانای (کابرا، فلانەکەس) دەدات و هیتیەکان ئەو وشە سۆمەری/کوردیەیان بەکارهێناوە بە هەمان مانا.
ئەگەر سەرنج بدرێت ئەوا aššuuššaanni دەتوانرێت شی بکرێتەوە بە شێوەی aššu+ušša+anni. وشەکە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە ڕووی ڕێزمانیەوە وشەی aššuuššaanni لە کوردیدا دەتوانرێت شی بکرێتەوە و پێکهاتووە لە (ئەسپ+وەس/وێس+ێن).
هەردوو وشە کوردیەکانی (ئەسپ) و (وێس) ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ زمانی سۆمەری. بە زمانی سۆمەری بە ئەسپ دەڵێن sisi. لە بنەڕەتدا si بە تەنها لە سۆمەریدا مانای (هەسا) ی کوردی دەدات کە ڕەگی وشەکە لە کوریدا دەبێتە (هەس). واتا sisi دووبارە بوونەوەی وشەکەیە و بە کوردی دەبێتە (هەس هەس). ئەم وشەیە لە هوریشدا دەردەکەوێتەوە، ئەوان بە ئەسپ دەڵێن isi. کە وا دەردەکەوێت هەر یەکجار پێیان گوتووە (هەساو) و نزیکترە لە کوردی. میتانیەکان پێیان گوتووە aššu کە خۆیان دەڤەرێکی هوری بوون و لە زمانی لوڤیشدا دەبێتە azzuwa کە هەمووی لەگەڵ وشە سۆمەریەکەدا یەک دەگرێتەوە. تەنانەت فارسی کۆن کە وشەکەیان هەر لە خەڵکی ناوچەکە وەرگرتووە بە وشەکە دەڵێن asa. بەڵام لە سەردەمێکدا ئەو ناوە لە زمانی میدیدا کراوە بە aspa (ئەسپا) کە شی دەکرێتەوە بە شێوەی (هەس+پا) کە ماناکەی دەبێتە (پێی هەستاو، پێ هەستێنەر). ئەگەر دوو وشەی (هەس+پا) ی زمانی کوردی تەرجومە بکرێت بۆ

زمانی سۆمەری، ئەوا وشەکە دەبێتە sipah (si+pah) لەبەر ئەوەی کە ئەو دوو وشە سۆمەریە تەرجومەی (هەس+پا) ی کوردین بۆ سۆمەری.
بەوجۆرە ماناکەی لە (هەساو/هەستاو) وە وە بووتە (پێی هەساو/هەسپا)[31]. ئەمرۆ لە کوردیدا کە داوا لە کەسێک دەکرێت کە هەستێتە سەر پێی، دەگووترێت (هەسپا hasapā)، واتە هەستە سەر پێ. بەو جۆرە (ئەسپ/هەسپ) لە بنەڕەتدا مانای (هەساو/هەستاو) ی داوە و دوایی مانای (پێی هەستاو) ی داوە کە گونجاوە لەگەڵ سروشتی گیانداری ئەسپدا. لە زمانی ئینگلیزیدا هەتاوەکو ئەمرۆ بە (کەر) دەگووترێت ass کە لە بنەڕەتدا و لە ئینگلیزی کۆندا بریتی بووە لە assa. جگە لەوەش لە هەردوو زمانی فەرەنسی و سویدیدا وشەی si ی سۆمەری کە دەبێتە (هەسا) ی کوردی، بە شێوەی hausse دەردەکەوێت، کە مانای بەرزبوونەوە دەدات.
سەبارەت بەشی دووهەمی وشەکە کە بریتیە لە ussana، وشەی (وێس) ی کوردی لە سۆمەریدا بە شێوەی us نوسراوە. بۆیە لە سۆمەریدا gue'usa ئاماژەیە بە کەسێک کە ڕەوە ئاژەڵ بەرێوە دەبات. ئەگەر ئەم وشەیە لە سۆمەریدا شیبکرێتەوە پێک دێت لە (gu+us+a) و لە کوردیدا دەبێتە (گا+وێس+ە). دەبینرێت لە هەردوو زمانی کوردی و سۆمەریدا وشەکە پێک هاتووە لە (ناوی گا+ڕەگی کرداری (وەسان)+ پاشگری (ە) کە ڕەگی کردار دەکاتە ناو). بۆیە لە کوردیدا هەردوو شێوەی سۆمەری و میتانیەکە دروستە و دەتوانرێت بگووترێت (ئەسپ وەسێن، ئەسپ وێسە)؛ هەردووکیان هەمان مانا دەدەن.
وشەی (ئەسوە وەسێن) مانای (ئەو کەسەیە کە ئەسپ ئەوەستێنێت و ڕادەگرێت) کە لەگەڵ سروشتی ئەسپ ڕاهێنەردا دەگوونجێت لەبەر ئەوەی کە هەتا ئێستاش یەکەمین هەنگاو بۆ فێربونی ئەسپ بە توانای وەستاندنی ئەسپ دەست پێ دەکات. ئەوەی کە ئەم ڕاستیە دووپات دەکاتەوە ئەوەیە کە ئەم وشەیە لە زمانی میدیدا وەک خۆی ماوە و بووەتە aspvaiθana (ئەسپ ڤەیسانە/ئەسپ وەیسانە) (Tavernier, 2007, p.121) و بە کەسێکی ئاشنای ئەسپ تەرجومەکراوە (بڕوانە فەرهەنگی میدی).
زۆربەی وشەکان کە پەیوەستن بە ئەسپەوە، لە زمانی هوری و میدی و کوردیدا یەکن. بۆ نموونە ئەگەر سەرنجی فەرهەنگی زمانی هوری بدەین، وشەی assuwanni لە هوریدا مانای (ئەسپەوانی) کوردی دەدا، لە میدیدا وشەکانی aspa dasta مانای (کەسێک کە ئەسپی لە ژێر دەستیدا ڕادەهێنرێت)، aspa-ča نازناوێکە بۆ ئەسپ کە بە کوردی دەبێتە (ئەسپەشێ)، aspan-jira مانای (کەسێکی خاوەن ئەسپی ژیر) و بە کوردی دەبێتە (ئەسپان ژیرە) کە هیچ نەگۆڕاوە و چەنین وشەی تر.
واتە وشەی (ئەسوەوەسانی) ئەگەر بە شێوەی جیاوازی کوردی و زمانەکانی سۆمەری و هیتی و میدی بنووسرێت. یەکبوونی وشەکە و ئەو زمانانە دەردەکەوێت.

| زمانی کوردی نوێ و تێبینی | زمانی میتانی/هیتی | زمانی سۆمەری و تێبینی | زمانی میدی |
|---|---|---|---|
| aspuesen, aspuesa<br>ئەسپ وێسێن، ئەسپ وێسە<br><br>ئەوانەی سەرەوە دوو شێوەی جیاوازی کوردین بۆ هەمان | aššuuššaanni<br>ئەسو سانی /ئەشو شانی | sisiusa(sisi+usa)<br>سیسی وسە<br><br>ئەم ناوە لێکدراوە لە زمانی زمانی سۆمەریدا نیە بەڵام بە بەش بەش هەمان مانا دەدات. بۆیە دەتوانرێت لە زمانی سۆمەریدا ئەو وشەیە دروست | aspvaiθana<br>ئەسپ وەیثانە<br><br>ئەم وشەیە لە زمانی میدیدا هەیە و بە مانای (کەسێکی ئاشنای ئەسپ) تەرجومەکراوە. (بڕوانە فەرهەنگی |

[31]. هەتا ئێستاش لە کوردیدا بە ئەسپ و ئێستر و بارگیر دەگوترێت "بەرزە وڵاخ". هەڵبەتە دەبێت ئەوە بزانرێت کە لە هەندێک ناوچەدا، بەرزبونەوە بە مانای هەستانیش بەکاردێت. دەڵێن (دە بەرزۆبە، واتا دە هەستە سەر پێ). کە لەوێدا دیسان ئەوە دەردەکەوێت کە ناوی گیاندارەکە لە ڕووی ماناوە، بە شێوەی تریش هەر ئەو پرنسیپەی تێدایە.

| وشە. | بکرێت. | میدی ـکوردی) |
|---|---|---|

ئەم شێوە شیکردنەوەیە لە وشەی تری کوردیشدا دەردەکەوێت. بۆ نموونە (شێربەزێن، باوشێن، دوژمن شکێن، هتد). ئەگەر بۆ مەبەستی بەراورد بە پیتی لاتینی بنووسرێنەوە ئەوا وشەکان دەبنە:

| aspuesen | asp+ues+en | ئەو کەسەیە کە ئەسپ دەوەستێنێت یان ڕا دەگرێت. |
|---|---|---|
| šerbazen | šer+baz+en | ئەو کەسەیە کە شێر دەبەزێنێت. |
| dužminšiken | dužmin+šik+en | ئەو کەسەیە کە دوژمن دەشکێنێت |
| bāuašen | bā+uaš+en | ئەو شتەیە کە بای پێ ڕائەوەشێنرێت. |

بەشی دووهەمی تێکستەکە پێکهاتووە لە šа kur ṲRU Miittaanni. وشەی ša لە کوردیدا ئەمڕۆ بەشێوەی žā (ژا) ماوە، کە ماناکەی دەبێتە (لەوێوە) (هەژار، پ.٣٩٧). وشەی kur لە بنەڕەتدا سۆمەریە و هەتاوەکو سەدەکانی چواردەی زاینیش لە کتێبە مێژووییە ئیسلامیەکاندا بە مانای (دەڤەر، ناوچە، وڵات) بەکار دەهات و بەشێوەی (کور) نوسراوە، بۆ نموونە یەعقوبی لە سەدەی نۆهەمی زانینیدا لە کتێبی (البلدان) دا، باسی وڵاتی شاخ (کور الجبل) بە وڵاتی کوردان دەکات (الیعقوبي، ١٨٨٣، پ.٧).
وشەی uru دیسان وشەیەکی سۆمەریە و لە کوریدا دەبێتە (وار uār) کە مانای (شار، شارۆچکە، گوند، شوێن) دەدات و هەمان مانا سۆمەریەکەی لە کوردیدا ماوە.
ئەگەر ئەو ڕستەیە بە کوردی نوێ بنوسرێت و ماناکەی کەم و زیاد وەک تێسکتە میتانی/هیتیەکە بێت، ئەوا دەبێتە (ئەمەم/ئەممە کەیکولی لۆ ئەسوە وەسێنی، ژا کور وارێ میتانی) و بە پیتی لاتینی دەبێتە:
amma kaikuli lo aspueseni, žā kur uāre mitāni
ئەم ڕستەیە، دوای نزیکی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵ، ئەگەر کوردێکی ئەمڕۆ بیخوێنێتەوە، کەم و زیاد، هەمان مانای پێ دەدات کە ئەو سەردەمە هەیبووە.
کیکولی بەردەوام دەبێت و بە شوێنی ڕاهێنانی ئەسپەکان دەڵێت uesanna کە لە وشەی (وێس) us ی سۆمەری/ کوردیە وە دروستکراوە بەهۆی پاشگری (انە) وە. ئەمڕۆ وشەکانی (ues+ana) ماناکەی دەبێتە ئەو شوێنەی کە تێدا دەوەستێنرێت.
لە چەند شوێنێکدا کەیکولی ڕێنمایی دەدات سەبارەت بە ژمارەی ئەو جارانەی کە دەبێت ئەسپەکە غار بدرێت. لە تێکستەکەدا نووسراوە:
aika-uartanna ئێکا وارتانە. ئەمە تەرجومە کراوە بە one turn (of the course) کە ماناکەی دەبێتە (یەک جار (لەو ئاراستەیە) tera-uartanna (Fournet & Bomhard, 2010,p.3) . تێرا وارتانە، واتە (سێ جار). panza-uartanna پەنزە وارتانە، واتە (پێنج جار). nawa-uartanna نەوا وارتانە، واتە (نۆ جار)

uartanna بریتیە لە وشەیەکی کوردی لێکدراو .وشەی (جار/بار) لە کوردیدا مانای (کەرەت) دەدات و لە سۆمەریشدا دەبێتە ara. وشەی uartanna ی میتانی لە کوردیدا دەبێتە هەردوو شێوەی bārtāna/jārdāna.
بەداخەوە هەر ئەوەندە لە تێکستەکەی کیکولی چنگ کەوت کە لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت. تێبینی دەکرێت کە هەموو وشەکانی ناو تێکستەکە بنەچەکەیان لە زمانەکانی سۆمەری/هوری/هیتی/لوڤی/ میدی/کوردیدا دەدۆزرێتەوە کە تەواو جیاوازە لەو بۆچوونەی لێکۆڵەرە ئەوروپیەکان کە هەموو شتێک بەزۆر دەگەڕێننەوە بۆ سانسکریت، بێ ئەوەی کە سانسکریت ئەو ڕۆڵەی هەبێت کە ئەمڕۆ لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا باوە (بڕوانە کێشەی ئاریەکان). لە ڕاستیدا ئەو زمانەی تێکستەکەی پێ نووسراوە دەتوانرێت دابنرێت بە زمانی میتانی، میدی، سۆمەری و کوردی نوێ؛ لەبەر ئەوەی هەموو ئەو زمانانەیە.
هەروەها ئەگەر سەرنجی ژمارە سەرەتاییەکانی ناو زمانە کۆنەکانی ناوچەکەدا بدرێت، دەبینرێت لە هیتی/میتانی، میدی، هور و سۆمەریدا بە نزیکی زۆربەی ژمارە کوردیەکانی ئەمڕۆی لێ دروستکراوە:

| ژمارە | زمانی هیتی/میتانی | زمانی سۆمەری | زمانی میدی | زمانی هووری | زمانی کوردیی نوێ |
|---|---|---|---|---|---|
| ١ | aika | iku (بە مانای یەکە هاتووە) | | | yak/ek |
| ٢ | | | | | |
| ٣ | teri | eš | ori | | se, hire: لە زۆربەی زاراوە کوردیەکاندا دەبێتە (سێ). لە زاراوەی زازادا دەبێتە hire. |
| ٤ | | | | | |
| ٥ | panza | | | | penj |
| ٦ | | aš | | sizi | šaš |
| ٧ | | imin | | | haīnī[32]/īn: بە هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا ناوی حەوتەم ڕۆژی هەفتەیە. |
| ٨ | | ussu | | | haš/hašt |
| ٩ | nawa | | | niz | no/nah |
| ١٠ | | | dasa | | das/da بە زاراوەی دملی (زازاکی) دەبێتە (دەس) و بە گشتی لە کوردیدا دەبێتە (دە). |
| دووەم | dān لە هیتیدا مانای دووەم دەدات | | | | duān لە کوردیدا مانای دوو دانە دەدات. |
| شەشەم | | šuš | | | šašam |
| ٣٠ | | ušu | | | sī |
| ٦٠ | | geštu | | | šest, šast |
| ١٠٠ | | | sata | | sat/sad |
| ١٠٠٠ | | | hezahra | | hazār/hezār |

جگە لەو تێکستە، لە فەرهەنگی وشە هیتیەکاندا هەندێک وشەی کوردی لە زمانی هیتیدا لە حاڵەتی جیاوازدا دەردەکەوێت. وشەی (شل) کە لە کوردیدا مانای (نەرم، شتێک کە بە ئاسانی بێتە خوارێ) دەدات. لە کوردیدا وشەی (شێلان) ی لێ دروسکراوە کە لە سۆمەریشدا هەیە و لە هیتیدا وشەی šallanu ی لێ دروستکراوە بە مانای (شل بوونەوە). وشەی šalliya ی هیتی مانای (شل بوونەوە) دەدا و وشەی šalakar

[32]. ڕۆژانی هەفتە لە زمانی کوردیدا دەست پێ دەکات بە شەممە، یەکشممە، ........ هەتاوەکو پێنجشەممە، هەینی/ئین دەبێتە دوایەمین و حەوتەمین ڕۆژی هەفتە. زۆر جار پیتی (م) ی وشەکان لە کوردیدا دەکرێتە (و)، کە لەوە دەچێت ناوەکە ئەو گۆڕانەی بەسەردا هاتبێت و لە imin ی سۆمەریەوە بووبێتە (ئین/هەینی) ی کوردی. ئەم گۆڕینە لە وشەکانی وەک (هەتیم/هەتیو، کەمان/کەوان، زاما/زاوا) دەردەکەوێت.

ی لێ دروستکراوە کە جۆرێک نان بووە لای هیتیەکان و ئەمڕۆش لای کورد (شلکی) هەیە کە جۆرێکە لە نان. ئەم وشە هیتی/کوردیانە بە شێوەی جیاوازیش لە سۆمەریدا دووبارە بوونەتەوە.
تەنانەت سڵاوکردنی هیتیەکان ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا بە نزیکی وەک خۆی ماوە. هیتیەکان بۆ سڵاوکردن دەڵێن assu و ئەمڕۆ کورد بە چوار شێوە بۆ سڵاوکردن دەڵێت "خاسی، وەشی، باشی، خۆشی" ( xāsī, uaši , xosī, bāsī).

مانەوەی وشەی زمانە کۆنەکان لە کوردی نوێدا، مایەی سەرسوڕمانێکی زۆرە. بۆ نموونە یەکێک لەو وشانەی کە سەرنج ڕادەکێشێت و لە فەرهەنگی هیتی- ئینگلیزیدایە و لە لەلایەن پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتی زانکۆی شیکاگۆ (The Oriental Institute of Chicago University) وە ئامادە کراوە، ئەوەیە کە بۆ وشەی mill دەڵێت:

“In the enumerations of body parts m. seems to be located between the head and shoulders”
ماناکەی دەبێتە "لە ناوهێنانی بەشەکانی لەشدا وا دەردەکەوێت کە(مل) بکەوێتە نێوان سەر و شانەکانەوە".
بەو جۆرە سەرەڕای ئەوەی زمانەوانەکان دەزانن کە وشەی mill لە زمانی هیتیدا ئاماژەکردن بووە بۆ شوێنێک لە نێوان سەر و شاندا، بەڵام هەتاوەکو ئەمڕۆ بۆیان یەکلانەبۆتەوە کە بە تەواوی لە زمانی هیتیدا مەبەست لە کوێ بووە. ئەوان ئاگاداری ئەوە نین کە کورد بە کام بەشەی لەش دەڵێت (مل mil). ئەوەی کە دڵنیای دەکات کە وشەکە هەر هەمان مانای وشە کوردیەکەی هەیە ئەوەیە کە بە زمانی سۆمەریش بە (مل) ی کوردی هەر دەگوترێت meli. دیاردەی ناوا، ڕەسەنی و پەیوەندی توندوتۆڵی زمانی کوردی بە زمانە کۆنەکانەوە دووپات دەکاتەوە و هەموو گومانێک لەسەری لادەبات.

(وێنەی ٥) کەسێک بە جلوبەرگی کوردیەوە لە دەستی ڕاست و ئەوەی چەپ بە جلوبەرگی تورکومانیەوە، ساڵی ١٨٢٠ز.

تەنانەت ئەگەر سەرنجی ئەو دوو وێنەیە بدرێت کە یەکێکیان لە ساڵی ١٨٢٠ز دا لەلایەن ئەوروپیەکانەوە بە دەست کراوە و وێنەی کوردێکە بە جلوبەرگی کوردیەوە لەگەڵ ئەوەی تریان کە پاشماوەی بەردێکی هەڵکەندراوی ناوچەی هیتیەکانە و ئەمڕۆ لە باکوری کوردستاندا بە یەزلیکیە (Yazılıkaya) دەناسرێت و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ١٣٠٠ پ.ز، سەرەڕای ئەوەی زیاتر لە سێ هەزار ساڵ لە نێوانیاندایە، ڕوون دەبێتەوە کە لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا دوای نزیکی سێ هەزار ساڵ تەنانەت جلوبەرگ و چەکی هیتیەکان گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە (بڕوانە وێنەکانی ٥ و ٦).

(وێنەی ٦) وێنەی هەڵکەندراوی یەزیلیکایە لە هاتوسەی پایتەختی هیتیەکان، کە نزیکی سی هەزار و پێنج سەد ساڵ کۆنە، لە ساڵی ١٨٦١ ز بە دەست کێشراوەتەوە.

ئەوەی کە جێگای سەر سورمانە، لێکۆڵەران، لە کاتی مینە کردندا، لە بری ئەوەی کە لەسەرەتادا لە ناوچەکەدا بەدوای وەڵام و مانای تێکستە هیتیەکاندا بگەڕێن، ڕۆیشتون پەنایان بۆ زمانەکانی تر بردوە. تەنانەت پەنایان بۆ سانسکریتیش بردوە، کە بەکارهێنانی ئەو زمانە بە هەزاران کیلۆمەتر لە ناوچەی هیتی و میتانیەکانەوە دوورە، کەچی بچووکترین هەڵوێستەیان لەسەر زمانی کوردی نەکردوە کە خەڵکی ناوچەکە و دانیشتوی خاکەکەیە. ئەم ئاراستەی لێکۆڵینەوەیە هەمیشە بۆتە هۆی ئەوەی کە زمانەوانەکان نەتوانن لە بنەچەی زمانە هیندۆ ئەوروپیەکان تێبگەن و بە هەڵە بنەمای زۆرێک لە وشەکانی ئەوزمانانە بۆ سانسکریت بگەڕێننەوە.

# فەرهەنگی هیتی - کوردی

| وشەی هیتی | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
| --- | --- | --- |
| a | ئەو (بۆ نێر و مێ)<br>he, she, it | au ئەو: هەمان مانا دەدات. |
| aku | خواردنەوە (کردار)<br>to drink | axuā ئەخوا: لە کوردیدا (ئەخوا) بۆ هەردوو خواردن و خواردنەوە بەکاردێت. بە سۆمەری بە بیرە دەگووترێت kurum و بە زمانی هوری بە شاخی هەڵکۆڵراوی بەکارهاتوو بۆ خواردنەوە دەگووترێت xúruwwi . |
| an | ئەو (بۆ نێر و مێ)<br>he, she, it | āna ئانە: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە و بە زمانی لوڤی-ش هەر وەک هیتیە و بە سۆمەری دەبێتە ane. |
| andurza | ژوورەوە، ناوەوە<br>inside | handru هەندرو: لە کوردیدا مانای (ژووری ماڵەوە، ناو هەرشتێک) دەدات (هەژار، پ.١٠٠٦). دەبینرێت ماناکەی لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە ئینگلیزیدا under ی لێ دروستکراوە کە مانای (لە ژێر) دەدات. |
| aniya | گەورەکردنی ڕووەک<br>to make grow (a plant) | henā/ānīa/hānīa, nā/nāīa هێنا/هانیە/ئانیە، نا/نایە: (هێنا) مانای (گەیاندن، گەیاندن بە ئامانج) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (باشی هانیوە هانیە/ئانیە)، هەروەها دەبێتە پێکهاتەی (هێنا بەر، هێنانە بەر، هانیە/ئانیە بەر) کە مانای (گەورەکردنی درەخت/منداڵ، گەیاندنی شتێک بە ئامانج) دەدات. (نا) لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (نان) یان ناشتن کە مانای (چاندن) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (دوو داری تازەی ناوە). (نایە) ماناکەی دەبێتە (ناویە، چاندوویە). |
| aniya | کردن، داهێنان، کار، بەجێهێنان<br>to act, create, achieve | henā/henāīa/ānīa/hānīa هێنا/هێنایە/هانیە/ئانیە: (هێنان/هانین/ئانین) مانای (داهێنان، گوێزانەوەی شتێک بۆ بەردەم). لە زمانی لوڤیدا anniti هەمان مانای هەیە. |
| antuhha, antuwahha | مرۆڤ<br>human being | nataua نەتەوە: مانای (میللەت) دەدات و لە پرنسیپدا نزیکن. ئەم وشەیە لە لاتیندا بە مانای (میللەت) بە شێوەی natio دەردەکەوێت و دوایی لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا بە شێوەی جیاواز nation دەردەکەوێت. |

| | | |
|---|---|---|
| apiya | ئەویا<br>there | auiā ئەویا: هەمان مانا دەدات. |
| appezzi | دوایەمین، پشت/پشتەوە<br>back, last | pāš پاش: مانای (پشتەوە، دواوە) دەدات و بە سۆمەریش دەبێتە þaš . لە ئینگلیزی و فەرەنسی و لاتینیدا دەبێتە post. |
| appezziyan | پاشان، ئەمجا<br>after, then | pašan پاشان: هەمان مانا دەدات. |
| ar | ڕۆیشتن (کردار)<br>to walk | hara, ro هەرە، ڕۆ: (هەرە) مانای (بڕۆ، وەرە) دەدات. (ڕۆ) دەبێتە ڕەگی (ڕۆیین/ڕۆیشتن) و لە سۆمەریدا ri هەمان مانای وشە هیتیەکەی هەیە. لە ئاڤێستادا ar مانای (بڕۆ، وەرە) دەدات. |
| ara | هاوڕێ، هاوکار<br>comrade, friend | hāure, ārā هاوڕێ، ئارا: لە کوردیدا وشەی (هاوڕێ) بە مانای (دۆست) دێت و (ئارا) بە مانای (دۆستی و نێوان خۆشی) دێت (هەژار، پ.٣). |
| arāi | یاخی بوون؛ ڕاگرتن<br>revolt; to halt | harā هەرا: لە کوردیدا بە مانای (شەڕ و ئاژاوە، کێشە) دێت. |
| arhaya | هەروەها، جگە لەوە<br>moreother, furthermore | haruahā هەروەها: هەمان مانای هەیە. |
| arsina | نان<br>bread | harzin هەرزن: دانەوێڵەیەکە کە لە ڕابردوودا زۆربەی جار نانی کوردی لێ دروستکراوە. بە زمانی سۆمەری بە هەرزن دەگووترێت arzig. وشەی (هەرزن) لە هەندێک زمانی هیندۆئەورووپی تردا دەردەکەوێت و بە ئەڵمانی و دانیمارکی و نەرویجی دەبێتە hirse و بە سویدی hirs. |
| arsiya | چاک خواردن<br>to eat well | hars هەرس: دەبێتە ڕەگی (هەرسکردن) کە مانای (تواندنەوەی خۆراک لە لەشدا) دەدات. |
| atta | باوک<br>father | tāta تاتە: بە زاراوەی هەورامی بە باوک دەڵێن (تاتە). لە زمانی لوڤیدا دەبێتە tāta و لە زمانی هوریدا دەبێتە ata و لە لاتینیدا دەبێتە atta. |
| assiya | خۆشویستن<br>to love | hazīa/hažīa حەزیە/حەژیە: (حەزلێکرد) هەمان مانا دەدات. بە زمانی لوڤیان دەبێتە aza . |
| assiyatar | خۆشەویستی<br>love | hazīadārī حەزیەداری: وشەی هاوشێوەی ئەوە بریتیە لە (دڵداری) کە هەمان پاشگری هەیە لەگەڵ وشە هیتیەکەدا. بەو جۆرە وشەکە لە (hazīa + dari) پێکهاتووە. پاشگری (tar) ی هیتی و هوری لە زۆربەی کاتدا دەبێتە پاشگری (دار) لە زمانی کوردیدا. |
| assu | خاسی! (سڵاوکردن) | xāsī/uašī/bāšī/xošī خاسی، وەشی، باشی، |

| | | |
|---|---|---|
| | hello! (greeting) | خۆشی: هەمان مانا دەدەن و هەتاوەکو ئەمڕۆ لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا هەر چوار شێوەکەی بۆ سڵاوکردن بەکاردەهێنرێن. |
| assu | باش، خاس<br>good, well | uaš/bāš/xās باش/وەش/خاس: هەرسێکی بەکاردەهێنرێن. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە ašša و لە لوڤیدا wasu و لە زمانی لیدیدا wiśśi. |
| asu, aswa | ئەسپ<br>horse | hasāu هەساو: لەوە دەچێت بناغەی ناوی ئەسپ لە وشەی (هەساو) ەوە هاتبێت. بە زمانی هوری پێی دەگووترێت isi/asi. میدیەکان پێیان گووتووە (هەسپا) و ئەمڕۆ لە کوردیدا کە بە کەسێک دەگووترێت هەستەرە سەرپێ پێی دەڵێن (هەسە پا) کە ئەوەش دیسان ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە ناوی ئەسپ مانای (پێ هەستاو) دەدات و گونجاوە لەگەڵ سروشتی ئەسپدا. وەک لە سەرەوە باسکرا بە هوری بە ئەسپ دەگووترێت isi و بە سۆمەری sisi. بەڵام ئەوەی سۆمەری پێک دێت لە دووبارەکردنەوەی si کە مانای (هەسا/هەستا)ی کوردی دەدات (بڕوانە وشەی ئەسپ (sisi) لە زمانی سۆمەریدا). |
| ašta | نوشتە<br>charm | nušta نوشتە: هەمان مانا دەدات. |
| bašta | نەخشکاری بە دەرزی و دەزوو<br>filigree, embroidery | pašt پەشت: بریتیە لە بەن یان دەزووی بادراو (هەژار، پ.١٢١). |
| da | پێدان<br>to give | dā دا: دەبێتە ڕەگی (دان) کە هەمان مانای هەیە. لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە dâ لە لاتینیدا بە da دەردەکەوێت. |
| dān | دووەم<br>second | duān دووان: دوان لە کوردیدا مانای (دوو دانە) ی هەیە و لە یەکتری نزیکن. لە فەرەنسیدا بە ژمارە دوو دەوترێت deux. |
| eni | ئەو شتەی کە پێشتر باسکرا<br>the one afore mentioned | hīn هین: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. |
| ep | ئەبیات<br>to take | abā ئەبا: هەمان مانا دەدات. |
| es | بوون<br>exist | has هەس: هەمان مانا دەدات. |
| esha | ئاغا، سەرگەورە<br>lord, master | ša/šah شا: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە. دەبینرێت کە کەسایەتیە ئاینیە گەورەکان پێیان دەگوترێت (شا)، بۆ نموونە گەورەی یارسانەکان بە (شاخۆشین) دەناسرێت. ئەم وشەیە بەکاردەهێنرێت بۆ هەر شتێک کە گەورە و |

| | | |
|---|---|---|
| | | مەزن بێت. بۆ نموونە (شاپەڕ، شاکار، شاتوو، شاناز، شادەمار، ...). مانیەکان بە دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی خۆیان دەگووت šaknu کە وا دەردەکەوێت بە مانای (شاکان) بەکاریان هێنابێت (بڕوانە مانیەکان). |
| ešarnu | خوێن ڕشتن<br>to make bloody | šar شەڕ: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە زمانی سۆمەری دەبێتە šar کە نزیکی هەمان مانا دەدات. لە زمانی لوڤیدا šaruš مانای (تاڵانی) دەدات. |
| gadu | ڕەشەوڵاخ، مانگا<br>bovin, cow | gā گا: نێرەی ئەو ئاژەڵە دەگرێتەوە و هەندێک جار بە گشتی بۆ هەردوو نێرە و مێ بەکاردەهێنرێت و زیاتر بە مانای (ڕەشەوڵاخ) دێت. بە زمانی سۆمەری بە گا دەگووترێت gud/gu و بە زمانی میدی gu. |
| genu | ئەژنۆ<br>knee | žino/ažno ژنۆ/ئەژنۆ: ئەم وشەیە لە زۆر لە زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا وەک یەکە. لە زمانی ئاڤیستادا دەبێتە zhnu بە ئینگلیزی knee بە فەرەنسی genou و بە ئیتاڵی ginocchio و بە لاتینی دەبێتە genua. |
| gulš | هەڵکۆڵین یان نووسین لەسەر شتێک<br>inscribe | kol کۆڵ: دەبێتە ڕەگی (کۆڵین). لە زمانی هوریدا بە (کۆڵین) دەڵێن agul و لە سۆمەریدا دەبێتە gul. |
| ḫališšiya | داپۆشین بە چینێک (بۆ نموونە بە زێڕ یان بە زیو)<br>to coat | halkešīā هەڵکێشیا: مانای داپۆشین بە چینێک دەدات، (هەڵکێشیا لە زێڕ) ئەو مانایە دەدات. |
| ḫulle | شەڕکردن/ئاژاوە<br>to fight, contravene | halā هەڵا: مانای (شەڕو کێشە، دنیای بێ خۆر) دەدات و بە زمانی سومەریش دەبێتە ula و ulu، کە یەکەمیان مانای جەنگ و دووەمیان مانای دێو و ڕۆحی شەڕ دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا بە شێوەی hell دەردەکەوێت و بە ئەڵمانی hölle کە مانای (دۆزەخ) دەدەن. |
| ḫimma | هەمان کۆپی<br>replica | ham, hāu هەم، هاو: لە کوردیدا مانای (وەک یەک، هەمان شت) دەدەن. بە زمانی سۆمەری hamun مانای هارمۆنی دەدات و لە زمانی ئاڤیستادا hama و لە زمانی میدیدا بە شێوەی ham دەبینرێت و لە زمانی یۆنانیدا دەبێتە homos. پرنسیپی مانای وشەکە لە هەموو زمانەکاندا نزیکە. |
| handa | ئەنجا<br>then | anjā ئەنجا: لە کوردیدا نەگۆڕاوە. ئەم وشەیە بە زمانی سۆمەری دەبێتە anga، بە زمانی هوری دەبێتە undu؛ هەموویان هەمان مانا کوردیەکەیان هەیە. بەشێوەی جیاواز و مانای |

نزیک لە زمانی ئینگلیزیدا بە شێوەی and و لە ئەڵمانیدا und و لە ئیتاڵیدا anche دەردەکەوێت.

| | | |
|---|---|---|
| hapina | ئاگری بێ دەورو سەر نەگیراو<br>open flame | hāuīn,hap هەپ، هاوین: وشەی (هەپ) مانای (بۆخی زەمینی تەڕ لە بەرگەرمای ڕۆژ) دەدات (هەژار، پ.٩٦٢) . (هاوین) لە کوردیدا وەرزی دوای بەهارە و دەشێت ناوی وەرزی هاوین لە مانای گەرمیەکەیەوە هاتبێت. |
| hartakka | ورچ<br>bear | hirc/urc هرچ/ورچ: لە کوردیدا هەردووکی بەکار دەهێنرێت. ئەم وشەیە لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە arša و بە لاتینی ursu و بەفەرەنسی ours و بە ئیتاڵی orso . |
| harr | هاڕین<br>to crush | hār هاڕ: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی کرداری (هاڕین) و لە سۆمەریشدا دەبێتە ara و لە لوڤیدا دەبێتە harra ، هەمووی وەک کوردیەکەیە. |
| harranu | ووردکردن، هاڕین<br>to crumble, crush | hārīn هاڕین: هەمان مانا دەدات. تێبینی دەکرێت کە پاشگری (ین) لە کوردیدا کردار دەکاتە ناو. لەوە دەچێت کە لە زمانی هیتیشدا بە هەمان مەبەست بەکار هێنرابێت (بڕوانە وشەی harr ). |
| has | کردنەوە<br>to open | uāz, baz واز، باز: هەمان مانا دەدات و بە زمانی سۆمەری دەبێتە bad و مانای (کراوە) دەدا. وشەی baz لە هوریدا مانای (چوونە ژوورەوە) دەدات. لە ئینگلیزیدا بەشێوەی pass دەردەکەوێت کە ئاماژەیە بە (دەروازەی نێوان دوو شاخ). |
| harsiharsi | ڕەشەبا<br>storm | haras, hers هەرەس، هێرس: (هەرەس) مانای هاتنەخوارەوەی بە گوڕم یان ڕوخان دەدات. بۆ نموونە ئەو بەفرەی کە کتوپڕ لە شاخ دێتە خوارەوە پێی دەگووترێت هەرەس. (هێرس) بەمانای (توڕەبوون) دێت (هەژار، پ.١٠١٥). لە زمانی هوریدا hers مانای (جوڵەکردنێکی خێرا) دەدات. وا دەردەکەوێت کە لە زمانی هیتیدا وشەکە دووبارەکردنەوەی هەمان وشەی harsi بێت، لەبەر ئەوەی کە وشە دووبارە کردنەوە لە زمانی هیتی و سۆمەری و کوردیدا زۆر بەکارهاتووە و ئەمڕۆش بەکاردێت. |
| haster | ئەستێرە<br>star | astera ئەستێرە: لە کوردیدا زۆر نزیکە و لە ئاڤێستا و ئینگلیزیدا دەبێتە star و بە لاتینی astir. |
| hassannā | خێزان<br>family | xezān خێزان: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. بە زمانی لوڤی دەبێتە hasu . |
| haššu | شا (پاشا)<br>King | ša شا: هەمان مانا دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| haššuššara | شاژن<br>queen | šāhāusara شاهاوسەرە: وشەکە پێک هاتووە لە (شا+هاوسەرە). لە زمانی سۆمەریشدا بە (ژنی دوو هەمین) دەگووترێت usar کە نزیکە لە وشەی (هاوسەر) ی کوردیەوە. بەو جۆرە مانای وشە هیتیەکە دەبێتە (هاوسەری شا). |
| hastāi | ئێسقان<br>bone | hastī هەستی: لە کوردیدا وەک یەکە و بە زمانی میدی دەبێتە asta و ئاڤێستا asta. ئەم وشەیە بە زمانی فەرەنسی دەبێتە os، ئیتاڵی وپورتوگالی osso و ئیسپانی hueso. |
| hazziya | پاڵنان<br>to push | hez, hezīyā هێز، هێزیا: (هێز) لە کوردیدا مانای (قوەت و توانا) دەدات و (هێزیا) واتە (هێزی پێ دا). بە زمانی سۆمەری وشەی (هێز) ی کوردی دەبێتە usu. بە زمانی هوری eγeps مانای ماسولکە گرژبوون دەدات. بە زمانی لوڤی wiši مانای پەستان دەدات. کە هەموویان لەیەک نزیکن و هاوبەشن لەگەڵ کوردیدا. |
| huek | سوێنخواردن، قسەکردن لە دوای سوێنخواردن، بڕیاردانی کوشتن<br>to swear, talk under oath, to put to death | haq هەق: ئەم وشەیە لە هیتیدا هەمان پرەنسیپی زمانی کوردی هەیە و لە زمانی میدیدا دەبێتە haθ کە مانای (ڕاستی) دەدات و بووەتە بنەچەی ناوی یەکێک لە ئاینە کوردیە کۆنەکان کە پێی دەگووترێت ( حەقە). |
| hulliya | لابردنی (فەرمانێک)<br>to topple (a decree). | halīā هەڵیا: لە کوردیدا مانای لابردن دەدات. لە زمانی سۆمەریدا la مانای (لاخراو) دەدات وەکو کوردی. |
| hūmant | هەموو<br>all | hamuān هەموان: لە زمانی میدیدا وشەی ham وەک پێشگر بە هەمان مانا بەکاردەهێنرێت، (بڕوانە وشەی ḫimma ). |
| huisnu | هێشتنەوە بە زیندوویی<br>to keep alive | zīnu زینوو: مانای (زیندوو) دەدات و ماناکەی نەگۆڕاوە. لە زمانی سۆمەریدا بە ژیانێکی بەهەشتیانە دەگووترێت ziana. |
| huinu | بردنە پێشەوە<br>to make go forward | henāu هێناو: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات، ئەم وشەیە لە سۆمەریدا بەشێوەی ahan هاتووە کە مانای (ڕشانەوە/هانینەوە) دەدات. |
| iwaru | دیاری، میرات، مارەیی<br>gift, inheritance, dowry | uer,uār وێر، وار: (وێر) ئەو پارەیە کە کەسێک بۆ کەسێکی تری دەدات وەک پیاوەتی کە لە مانای دیاریەوە نزیکە. (وار) ئەو پارەیە کە خانەخوێی قومار لە قومارچیەکانی وەردەگرێت. لە زمانی سۆمەریدا urra مانای (چاکە) دەدات و لە هوریدا iwuru مانای (میراتگر) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| kakkapi | کەو<br>partridge | kaw کەو: ئەوەی جێی سەرنجە لە ناو کورد دا کە کەو بانگ دەکەن دەڵێن (کاکبە کاکبە). لە زمانی سۆمەریدا بە جۆرێک لە باڵندە دەڵێن kabkab. بەخێوکردنی ئەم باڵندەیە دیاردەیەکی گرنگە لە فەرهەنگی کوردیدا. |
| kan | لە تەک، لەگەڵ<br>alongside, with | kin کن: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە ku-nu و هەمان مانا دێت. |
| DUGkappi | جۆرێکە لە قاپ<br>(a pot) | qāp قاپ: هەمان مانا دەدات. |
| kard | دڵ<br>heart | zird زرد: بە کوردی وشەیەکی تر هەیە بۆ (دڵ) کە بریتیە لە (زرد) (مینۆرسی، ٢٠٠٦، پ. ٢٤). بە زمانی میدی پێی دەڵێن zrd/drd، بە لاتینی دەبێتە cordis و بە ئینگلیزی heart. |
| karš | کەرتکردن<br>to cut | qāš,kart,qārs قاش،کەرت، قارس: (قاش) و(کەرت) بە مانای (پارچەیەکی دابڕاو لە شتێک) دەدەن و بە شێوەی جیاواز بەکاردەهێنرێن. (قارس) چاوگی کرداری (قارس کردن)ە کە بە مانای (کورتکردنەوە بە دورومان) دێت. بە زمانی لوڤیش هەمان مانای وشە هیتیەکە دەدات. |
| katta | کەواتە<br>hence | kauāta کەواتە: هەمان مانا دەدات و لە زمانی لوڤیدا دەبێتە kwat . |
| kikla | گیا<br>grass | gīākala گیاکەڵە: مانای (گیای نەویستراو لە کێڵگەدا) دەدات. بە سۆمەریش بە جۆرێک لە گیاکەڵە دەگووترێت ukul. |
| kištanu | کوژانەوەی ئاگر، کۆتایی پێ هێنان<br>to extinguish | kužān, kuštin کوژان،کوشتن: وشەی (کوژان) دەبێتە ڕەگی (کوژانەوە) کە مانای (ئاگر کوژانەوە، سڕینەوەی شتێک، کۆتایی پێ هێنانی جەنگ) دەدات. (کوشتن) مانای (کۆتایی پێ هێنانی ژیان) دەدات. |
| kuwapi | کەی؛ کوێ<br>when; where | kaī, kue کەی، کوێ: لە کوردیدا ئەم دوو وشەیە تۆزێک جیاواز دەنوسرێت. |
| kuez | لە کوێ<br>where from | kue کوێ: هەمان مانا دەدات. |
| kui | کێ<br>who | ke کێ: هەمان مانا دەدات. بەفەرەنسی دەبێتە qui. |
| kui | چی<br>what | cī چی: هەمان مانا دەدات. لە ئاظیستادا دەبێتە ci. بە ئیسپانی qué، ئیتاڵی che و فەرەنسی que. |
| kuiski | کەسێک<br>someone | kasekī/kasakī/kasek کەسێکی/کەسەکی،کەسێک: هەمان مانا دەدەن. لە زمانی لیدیا دەبێتە qisk. |

| | | |
|---|---|---|
| kuitki | شتێک<br>something | štekī/štek شتێکی/شتێک: هەمان مانا دەدەن. |
| kuli | بەکارنەهێنراو<br>unused | kul کول: نموونە (چەقۆکە کولە)، (دەمم کول بوو بەڵام گوێی لێ نەگرتم) هەمووی مانای (لەکەڵک کەوتن) دەدەن. ئەم وشەیە بە زمانی هوریش هەر دەبێتە kul و هەر هەمان مانای کوردی و هیتی هەیە. |
| kur | بڕین<br>to cut | kur کوڕ: لە کوردیدا مانای (تاشین لەبندا) دەدات (هەژار، ٦٢٨) و لە سۆمەریدا یەکێک لە ماناکانی دەبێتە (بڕین). |
| lahlahhima | خەفەت خواردن، غەمباری<br>grief, affliction | laīlāīa,uāuaīlān,lāuānaua لاوانەوە/لەیلایە/واومیلان: لە کوردیدا (لاوانەوە) مانای شینکردن دەدات. (لەیلایە) جۆرێکە لە گۆرانی خەمناک بۆ خەواندنی منداڵ و شینکردن و گریان و لاوانەوشە بۆ مردوو. هەروەها دەگووترێت (شین و واومیلانیەتی) کە ئاماژەکردنە بۆ (شینکردن و گریان). ئەم وشەیە بە زمانی هوریش دەبێتە alilan کە مانای (گریان و شیوەن) ی هەیە و بەسۆمەریش بە جۆرێک لە شینکردن دەگووترێت ilu. بە زمانی لاتینی شیوەن دەبێتە eiulo و بە ئینگلیزی دەبێتە wail. |
| la | لابردن<br>remove | lā لا: ئەم وشەیە بۆ (لابردن، لەسەر هەڵگرتن، لاخستن) بەکاردەهێنرێت و لای سۆمەریەکان la مانای (لاخراو) دەدات و لە زمانی لوڤیشدا هەمان مانای هەیە. |
| lak | کەوتنی دان، وەرگێڕانی گوێ یان چاو بەرەو شوێنێک، کەوتن<br>to knock out (a tooth), to fall | laq لەق: مانای (شل بوونی دان یان شل بوونی هەر شتێک لە جێگاکەیدا) دەدات. (لەقین) بەکاردێت بۆ وەسفکردنی حاڵەتی جوڵە و نزیکبوونەوەی کەوتنی شتێک. (گوێ لەق کردن) بەمانای گوێ جوڵاندن بەرەو ئەو جێگایەی کە دەنگی لێوە دێت. |
| lagan | نوشتانەوە، خواری<br>bent, inclination, | laqān لەقان: مانای (جوڵەکردن، لادان لە شوێنی خۆ) دەدات. دەبینرێت کە پاشگری (ان) لە کوردی و هوریدا بە هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێت. لە زمانی سۆمەریدا lug هەمان مانا دەدات. تەنها جیاوازی ئەوەیە laq لە کوردیدا ڕەگی کردارەکەیە و laqān دەبێتە ناو یان چاوگی کردارەکە. |
| lala | زمان (زمان خۆی)، جۆرێکە لە قسەکردن، قسەکردنێکی بەزیان | le, lāl, lal لێ،لاڵ، لەل: (لاڵ) بە کەسێک دەگووترێت کە نەتوانێت بە تەواوی قسە بکات. (لەل) مانای (کەمترین دەنگ) دەدات. دەوترێت |

| Word | Meaning | Explanation |
|---|---|---|
| | tongue (body part), model of tongue, (true or correct) speech, harmful ,(speech, | (ئێتر لەلە نەکەیت ، لەلە بکەیت لەلەت ئەبڕم ) هەروەها دەوترێت (دەمت داخەو لەلە لەل مەکە). وشەی (لَیَ) دەبێتە ڕەگی (ئەلَیَ) و لە زمانی هوریدا (قسەکردن) دەبێتە al. لە زمانی لوڤیدا ماناکەی نزیکە. |
| lalami | پسولەی حساب<br>accounting receipt | lalāma لەلامە: ئەو پارەیەی کە لە لای من ماوە. بۆ نموونە دەگووترێت (قەرزم لەلای فلانە). لە سۆمەریدا la'u مانای قەرز دەدات و و la ia مانای (لایەتی) دەدات. |
| lalu | کێر<br>penis | lala لەلە: لە ژێر سەری کێر هەتا گون ئەو ناوەی پێ دەگووترێت (هەژار، پ.٧٧٥). لە زمانی لیدیدا lalou مانای (کێری مندال) دەدات. |
| lalukkešš | ڕۆشنبوونەوە، پرشنگدانەوە، گەشانەوە، تیشکدانەوە ، بلێسە<br>to become bright, shine, glow, gleam, blaze | lālāgaš لالاگەش: واتە هەموو لاکانی گەشاوەتەوە. ئەمە مانای (پرشنگدانەوە، گەشانەوەی خەڵوز ئاگر و بلێسە) دەدات. بە زمانی سۆمەری ĝešnu مانای (ڕۆشنایی) دەدات و ماناکەی وەک مانای (گەشانۆ) ی کوردیە. |
| lalukkešnu | ڕووناکی بەخشین، پرشنگدانەوە<br>to give light, illuminate | lālāgašāno لالاگەشانۆ: هەموو لاکانی دەگەشێتەوە. (بڕوانە وشەی lalukkešš ). |
| lapana | مێرگی هاوین<br>summer pasture | lāpanā لاپەنا: واتە شوێنێک کە دەستی پێ نەگەیشتبێت و بەو مانایەی کە کەوتبێتە پەناوە و گیا و لەوەڕی باشی هەبوو بێت. |
| latar | بزرکردن، لابردن (لەبەرچاو یان لە مێشکدا)<br>loosing, dispelling | lader, lat لات ،لادەر: (لات) مانای (لەکیسچوونی هەموو شتێک، دۆڕاندن لە قوماردا) دەدات. (لادەر) لە کوردیدا دەبێتە بکەری لابردن. |
| lipai | لێسانەوە<br>to lick | leupīā لێوپیا: (لێو پیاهێنان) هەمان مانای لێسانەوەی هەیە. |
| luppašti | شتێکی ناخۆش، مایەی نیگەرانی، بێزارکەر<br>something unpleasant, displeasing, offensive, annoying | lapištī لە پشتی: واتە (شتێک کە دەکرێت لە پشتەوە) یان (شتێک کە دەخرێتە پشتەوە). |

| | | |
|---|---|---|
| luri | کەرامەت لەدەست دان، شەرمەزاری، حاڵەتێکی خراپ، کەموکوڕی، تەمەن کورتی<br>loss of honor, humiliation, embarrassing predicament, deficiency, short-age | lār, lārī,larī لار، لاری، لەڕی: (لار) مانای (خواروخێچ، چەوت) دەدات و هەروەها سەبارەت بە ئاماژەکردن بە کەسێک دەگوترێت (کەسێکی لارە) واتە (ڕاستگۆ نیە). هەروەها کە دەڵێن (باری لارە) واتە (لە حاڵێکی باشدا نیە). (لاری) مانای (دوژمنایەتیکردن، بە قسەنەکردن، خواری، چەوتی) دەدات (هەژار ، پ.٧٥١). (لەڕی) مانای (لاوازی و بێ گۆشتی) دەدات. |
| ma | هی من<br>my | m م: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە. بۆ نموونە (دەفتەرەکەم جوانە) کە لەوێدا (م) هەمان ڕۆڵ دەبینێت. لە سۆمەریدا دەبێتە mu. لەفەرەنسیدا تەواو وەکو خۆیەتی و هەر بریتیە لە ma. |
| maša | کولە، کولەبارین<br>locust, swarm of locusts | maša مەشە: مانای مێشی هەیە. بە سۆمەری muš مانای (مێرووییەکی گازگر) دەدات و بە فەرەنسیش بە (مێش) ی کوردی دەوترێت . mouche |
| mašḫuil | مشک<br>mouse | mišk, muš مشک، موش: لە کوردیدا ئەو دووناوەی پێ دەڵێن و ئەم وشەیە لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا وەک یەکن بە ئینگلیزی mice بە ئەڵمانی mäuse . |
| maškiške | دیاری پێشکەشکردن<br>to give presents | peškeš/peškaš پێشکێش/پێشکەش: هەمان مانای هەیە |
| miyatar | زیادبوون، گەشەسەندن، زۆربوون<br>growth, increase, proliferation | māīadār مایەدار: مانای (خاوەن سامانی زۆر) دەدات و (مایەداری) مانای (خاوەندارێتی سامان) دەدات. |
| meḫur | کات<br>time | māua ماوە: هەمان مانا دەدات |
| mienu, minu | لەسەرخۆ (هێمن)، خۆش، دۆستانە<br>gentle, pleasant, friendly | hemin هێمن: هەمان مانا دەدات. |
| mieššar | گەشانەوەی دارایی<br>prosperity | maīsar مەیسەر: لە کوردیدا وشەکە مانای (شیاوی دەسکەوتن بە ئاسانی) دەدات ( هەژار، پ.٨٣٨). هەروەها ئەگەر هەردوو پێکهاتەی وشە لێکدراوەکە پێچەوانە بکرێتەوە، ئەوا (māīa+sar) دەبێتە sarmāīa کە لە کوردیدا مانای (سەروەت و سامان) دەدات. پێ دەچێت تەنها پێکهاتەکانی وشەکە ئاڵوگۆڕیان پێکرابێت. |
| mill, m(i)eli | بەشێکی لەشە<br>a body part | mil مل: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. ئەوەی کە جێی سەرنجە لە فەرهەنگی هیتی- ئینگلیزی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئامادەکراو لە لایەن پەیمانگەی ڕۆژهەڵاتیی زانکۆی شیکاگۆ، مانای وشەکە بە ڕوونی نازانن و دەڵێن بەشێکە لە لەش لە نێوان شان و سەردا، لەبەر ئەوەی هەتاوەکو ئەمڕۆ نازانرێت مەبەست لە کوێیە. بە زمانی سۆمەرییش بە (مل) ی وکوردی دەگوترێت meli. سەرنج دەدرێت ئەم وشەیە لە کوردی و سۆمەری و هیتیدا یەک وشەیە. |
| mišāri | مێروویەکی زیانبەخش<br>an insect pest | meš مێش : (بڕوانە وشەی maša ). |
| mišti | بەشێکی لەشی مرۆڤە<br>a part of the body | mišt مشت: لە کوردیدا بە دەست دەگووترێت (مشت). |
| mu | من، بۆ من، هی من، هی منە<br>me, to me, my, mine | m م: ڕاناوێکە کە مانای (هی من) دەدات بۆ نموونە (ئەو دارەم بۆ بێنە). لە سۆمەریدا mu هەمان مانا دەدات. لە فەرەنسیدا moi و ma مانای ( من ،هی من) دەدەن. ئەم وشەیە لە هەموو زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا بە شێوەی جیاواز دەردەکەوێت. |
| muri-, murin-, muriyan | بۆڵی ترێ یان میوەی تر<br>cluster of grapes or other fruit | murī/muriān/muru موری/موریان/مورو: لە کوردیدا بە خشڵی خڕ دەگووترێت (موری) و (موریان) کۆی وشەکەیە. هەروەها (مورو) مانای هەرمێ دەدات (هەژار، پ.٨١٧). لە فەرەنسیدا بە (میوەی تو) دەوترێت mûre . |
| mušgalla | کرمە گەرای پەپولە<br>caterpillar | mešula, moz, mužlā مێشولە، مۆز، موژلا: (مێشولە) ئەو مێرووە باڵدارەیە کە خوێن دەمژێت. (مۆز) مێروویەکی باڵدارە لە خێزانی زەردەواڵە و بە ڕەنگی زەرد و سەوز هەن. (موژلا) ناوێکی ترە بۆ مێروولە (هەژار، پ، ٨١٨). ئەگەر سەیری سروشتی ناوەکە بکەین، هاوجووتە لەگەڵ ناوە کوردیەکاندا. سەرەڕای ئەو ناوە کوردیانە وشە هیتیەکە لە زمانی کوردیدا دەتوانرێت پێکهاتەکەی ببینرێت (muš+galla) کە بە کوردی ماناکەی دەبێتە (مێشی گەڵا) لەبەر ئەوەی کە وشەی muš لە زمانی هیتیدا بەشێکە لە ناوی مێروو، دەشێت وشەکە لەو مانایەوە دروست کرابێت. |
| nakkes | کەسێکی نالەبار، کەسێک کە لەبارێکی باشدا نەبێت<br>to become difficult, be bad for morale | nakas /nākas نەکەس/ ناکەس: مانای (کەسێکی نارەسەن، کەسێکی نانەجیب) دەگرێتەوە (هەژار، پ.٨٨٦). (بڕوانە وشەی kuiski). |
| nakki | زەحمەت، زەحمەت دەستی پێ بگات پیا سەرکەوێت | nāgaī, nākre, nākai ناگەی، ناکرێ،ناکەی: وشەی (ناکرێ) مانای (شتێکی |

| | | |
|---|---|---|
| | یان گەشتی بۆ بکەیت (ئەمانە هەندێک لە ماناکانی ئەم وشەیەن) difficult, hard to reach, climb or traverse | زەحمەت) دەدات و لەگەڵ وشەی (ناکا) یەکن، لەبەر ئەوەی وشەی (ناکا) پێچەوانەی (ئەکا) یە کە وشەکە بە کوردی و سۆمەری بە هەمان شێوەیە. هەروەها (ناگەی) مانای (نەگەیشتن بە بەرزی یان هەر شوێنێک) دەدات. |
| nakkuš | شت لە دەست دان، زیان یان هەڵە یان نارێکی loss, damage, or fault | nāxoš,naxoš ناخۆش، نەخۆش: وشەی (ناخۆش) مانای (نەهامەتی و زیان، بێ تامی...) هەیە و (نەخۆش) مانای (ناساغی لەش، تووشبوونی کێشەی تەندروستی) دەدات. |
| na(k)kušši-, UDUna(k)kušši-, nakkušša | پیشەیە (بۆ دورخستنەوەی شەیتان)، بوون بە قۆچی قوربانی carrier (to remove evils), to be a scapegoat | nākuža/nakuša نەکوژە/نەکوشە: واتە (ئەوەی ڕێ لە مردن دەگرێت). |
| na(m)mulli | قەنەفە couch | nāmmālī/nāumālī نام ماڵی/ناوماڵی: ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا هوریە و لە کوردیدا مانای (کەلوپەلی ناوماڵ) دەدات و بە زمانی سۆمەری وشەی immal مانای (کەلوپەل، ماڵ، موڵک) دەدات. |
| negatar | خوشک بوون، خوشکایەتی sister-status, sisterhood | dār دار: دەبینرێت کە پاشگری (دار) لە کوردی و هیتی و زمانەکانی تردا هەمان ڕۆڵی هەیە و هیتیەکان کردویانەتە tar. |
| nagappi | قاپ nagappi | qāp قاپ: لە بەشێکی ناوەکەدا بەدی دەکرێت. |
| newa | نوێ new | nue نوێ: لە کوردیدا نەگۆڕاوە. ئەم وشەیە لە زمانی لوڤیدا وەک خۆیەتی و لە زۆربەی زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا بەو شێوەیەیە. بە ئینگلیزی new بە ئەڵمانی neu بە فەرەنسی nouveau وچەند زمانێکی تریش هاوشێوەی ئەوەن. |
| nikku | بە هیچ جۆرێک، بە دڵنیایی نا by any chance, surely not | naku نەکو: هەمان مانا دەدات. دەبێت ئەوە بزانرێت کە بنەچەی وشەکە سۆمەری و کوردیە لەبەر ئەوەی کە وشەی tuku ی سۆمەری بە کوردی دەبێتە (تاکو). وشەی (نەکو) دەبێتە پێچەوانەی (تاکو). |

| | | |
|---|---|---|
| ninda harsi | نانێکی ئەستور<br>thick bread loaf | nan harzin نان هەرزن: (هەرزن) دانەوێڵەیەکە ئەمڕۆ زۆرتر دەدرێت بە باڵندەی ناو ماڵ. بە سۆمەری بە هەرزن دەگووترێت arzig. لە سۆمەری و هیتیدا بە (نان) دەگووترێت ninda. هەروەها هەرزن لە زۆربەی زمانە ئەوروپیەکاندا دەردەکەوێتەوە. بە ئەڵمانی و دانیمارکی و نەرویجی دەبێتە hirse و بە سویدی hirs. لە کوردەواریدا جاران ئەو نانە زۆر دروستکراوە و زیاتر بۆ هەژاران بووە، لەبەر ئەوەی کە هەرزن هەمیشە لە گەنم هەرزان تر بووە. |
| ninda. gur | نانی ئەستور<br>thick bread | nań gaura نان گەورە: واتە نانێک کە قەبارەی زل بێت. ئەم وشەیە لە سۆمەری و کوردی و هیتیدا یەکە. |
| ninda.sig | نانی تەنک<br>Thin bread | nan suk نان سوک: واتە نانێک کە کێشی کەم بێت. ئەم وشەیە لە سۆمەری و کوردی و هیتیدا یەکە. |
| nu | ئێستا<br>now | nuka/nihā/niho نوکە/نها/نهۆ: ئەم وشەیە بە زمانی هوری دەبێتە hínnu کە دیسان نزیکە لەگەڵ کوردی و بە ئینگلیزی دەبێتە now، دانیمارکی و سویدی و هۆڵەندی nu. |
| nūman, nūwan | ناوێ، ناوێت<br>(ڕەتکردنەوەی ویستنی شتێک)<br>not want to | nāwe ناوێ: هەر هەمان مانا دەدات. |
| nuwašši | باڵندەیەکە<br>a bird | wāša واشە: باڵدارێکە لە هەڵۆ بچووکترە و ڕاوکەرە. |
| nurati | هەنار<br>pomegranate | hanār/nār هەنار/نار: لە کوردیەکە نزیکە و هاوبەشی هەیە لەگەڵ سۆمەریەکەدا nu-ur . |
| pādušḫi, paduši, wadušši | وشەیەکە بۆ بەخشین (بە زمانی هوری)<br>Hurr. offering term | pādāš پاداش: لە کوردیدا (پاداش/پاداشت) هەر هەمان وشەن. |
| pāḫī | سەر (هی لەش)<br>head | pāīa پایە: مانای (ستونی ڕاگرتنی بینا دەدات). |
| paḫḫeški | کردەوەیەکی دوژمنکارانەیە<br>a hostile action | pāškāndin, pānaške پا شکاندن، پائەشکێ: وەک هەڕەشەی دوژمنکارانە بەکاردەهێنرێت بۆ نموونە دەگووترێت (هەر کەس بەم خاکەی ئێمەدا بێت پای ئەشکێنین). وشەکە پێکهاتووە لە (پا+ئەشکێ)، کە pah سۆمەریە و مانای (پێ/پا) ی کوردی دەدات و tsik هوریە مانای شکاندن دەدات. |
| pahš | پاراستن، پاسەوانیکردن، | pās پاس: دەبێتە ڕەگی (پاسکردن، پاسەوان) |

| | | |
|---|---|---|
| | پاسەوان<br>to protect, to guard, guard | وشەکە خۆی مانای پارێزگاری دەگرێتەوە و لە زمانی میدیدا دەبێتە paθ. |
| pahhur | ئاگر (بەگشتی)، خەڵوزی ئاگرگرتوو، ئاوساوی و سوتانەوە، ئازارێکی سوتانەوە، تا (گەرمی لەش)<br>fire (in general). burning coals, fever, inflammation, burning pain, | pangir, āhir پەنگر ، ئاهر: وشەی ( پەنگر) مانای (پشکۆ) دەدات. (ئاهر) مانای ئاگری هەیە و نزیکە لە وشە هیتیەکەوە. لە کوردیدا بۆ ئاماژەکردن بە ئاگر (ئایر، ئاگر، ئاتەر) بەکاردەهێنرێن، بنەچەکەیان لە سۆمەری و میدی و هوریدا هەن. میدی atr، لە سۆمەریدا gir، دەبێتە خوای ئاگر، هەروەها لە زمانی هوریدا ahari مانای (سوتاندن) ی هەیە و بە شتی سوتاوی وەک بوغورد دەڵێن agri. وشەی ئاگر لە ئینگلیزیدا بووەتە fire و لە هۆڵەندیدا vuur و سوتاندن لە ئیسپانیدا دەبێتە ardor کە هاوبەشی لەگەڵ سۆمەری هوری و کوردیدا هەیە. |
| pai, pa | ڕابوردن، پیا ڕۆیشتن (وشەکە مانای لە شوێنی خۆیدا هەیە)<br>to pass/go past (something), (idiomatic uses) | pīā/pāī پیا/پای: لە کوردیدا دەڵێیت، (لەم سەر بۆ ئەو سەر پیا ڕۆشت ) کە هەمان مانا دەدات. |
| pai, pe, piya | پێی دا، پارەدان، پێدان<br>to give, pay, grant | peīā, pe پێیا، پێ: بەکارهێنانی ئەو وشانە لەم رستانەدا دەبینرێن: (پارەکەی پێیا، زەویکەی دا پێ، بایەخی پێ دا) لە زمانی لوڤیدا وەک هیتی دەبێتە piya لە زمانی کاریدا دەبێتە pi و لە لیدیدا دەبێتە bi. لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە pay و لە فەرەنسیدا payé کرداری payer. ئەو وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا، وەکو کوردی بۆ (پارەدان، بایەخ پێ دان) بەکاردەهێنرێت. بەڵام لە زمانی فەرەنسیدا بۆ(پارە دان یان دانی شتێکی مەعنەوی) بەکار دەهێنرێت. |
| pakkušš | کوتان، پیاکێشان، وردکردن<br>to pound, crush, grind | pīākeš, pākut پیاکێش، پاکوت: وشەی (پیاکێش) دەبێتە ڕەگی (پێدا کێشان) و (پاکوت) ماناکەی دەبێتە (شێلان و کوتان) ( هەژار، هەژار، پ.١٠٠). |
| pakkuššuwar | ئامرازێکە لە تەختە بۆ لەتکردن و وردکردنی دانەوێلە بەکاردەهێنرێت<br>a wooden implement used to crack or crush cereals | pīākešar پیاکێشەر: ئەو شتەیە کە دەدرێت بە شتێکی تردا و هەمان مانای هەیە. |
| palaḫšiya- | داپۆشین | balašīā بەلەشیا: لە زمانی کوردیدا ئەو |

| | | |
|---|---|---|
| | to cover | تایبەتمەندیە هەیە کە وەسفی حاڵەتەکە دەبێتە ناو، بۆ نموونە دەگووترێت (سەر جێگا)، کە ماناکەی (ئەو قوماشەیە کە دەدرێت بەسەر جێگادا). هوریەکانیش بە هەمان شێوە بە (زرێپۆشی لەش) دەڵێن sarijanni کە دەبێتە (سەرگیانی/جانی). ئەمە دڵنیای دەکاتەوە کە (بەلەشیا) مەبەست لە داپۆشینە. |
| palhešš | فراوان بوون یان پان بوون، کشان<br>to become wide or broad, to expand | palhāueš پەلهاوێش: هەمان مانای بەرفراوان بوون و بڵاوبوونەوەی هەیە. |
| palwa | زیپکە، دومەڵ<br>blister, boil | pālu پالو: لە کوردیدا مانای (بالوکە) دەدات (هەژار، پ.١٠١). |
| paltana | شان، دەفەی شان<br>shoulder, shoulder blade | pāldāna پاڵدانە: لە کوردیدا مانای (ئەوەی بۆ پاڵدانەوەیە) دەگرێتەوە. |
| palzašḫa | رووبەکی تەخت بۆ دانانی پەیکەر<br>a flat base for statues | pāl پاڵ: وشەی (پاڵ) لە کوردیدا بۆ هەر شتێک کە شتی لەسەر توند بکرێت. بۆ نموونە (ئەو پیاوە لەسەر سەکۆکە پاڵی داوەتەوە، ئەو ژنە لەسەر جێگەکە پاڵ کەوتووە، ئەو بلۆکە پاڵ بدە بە دیوارەکەوە) هەمیشە (پاڵ) ڕۆڵی ڕاگرتنی شت دەبینێت و لە بەشێکی وشەکەدا (پاڵ) دەبینرێت. هەروەها بە مانای پشت و تەنیشت وشەی pillow لە ئینگلیزی و pulvins لە لاتینیدا مانای (سەرین) دەدات. |
| palzaḫai | پاڵخستن ( بۆ مەڕ، بەرخۆلە، منداڵ لەسەر ڕووبەکی تەخت)<br>to stretch (a sheep, lamb, kid) out (on a flat surface | (بڕوانە palzašḫa ). |
| pangariya | بڵاوبوونەوە، گشتی بوون<br>to become widespread, general | pāngarī پانگەری: هەمان مانا دەدات. وشەکە پێک دێت لە (پان +گەری). ئەم وشەیە لە زمانی لوڤیدا بە شێوەی pūna دەردەکەوێت و هەمان مانای هەیە. لە ئینگلیزیدا pan وەک پێشگر بە مانای (گشتگیری و پانایی) دێت، بۆ نموونە pan-African، وشەکەیان لە لاتینەوە وەرگرتوە. pana بە زمانی سۆمەری مانای (کەوان)ی هەیە، هەروەها لە زمانی ئینگلیزیدا pan مانای تاوە دەدات، ناوەکە لە مانای (بەربڵاوبوونەوە، پان بوونەوە)وە هاتووە. |
| panku | هەموو، گشت، بەتەواوی | pānko پانکۆ: وشەی (پان) لەسەرەوە |

| | | |
|---|---|---|
| | all, entire, complete | ڕوونکراوەتەوە. (کۆ) مانای (گشت، هەموو، کۆکردنەوە) دەگرێتەوە. بەو جۆرە وشەکە هەمان مانای زمانی هیتی ماوە. gu لە سۆمەریدا هەمان مانای (کۆ) لە کوردیدا دەدات. |
| pankur | گرووپێکی ئاژەڵ یان خەڵک group of animal or person | pānkor پانکۆڕ: (پان) لەسەرەوە ڕوونکراوەتەوە. (کۆڕ) کۆبوونەوەی خەڵکە. |
| pa(n)ku | کۆبوونەوە (کۆبوونەوە بۆ پەرستن)، دەستەی هەموو کەسانی دەوری پاشا وەک ئامۆژگارکار و ئاگادارکاران. (worshipping) assembly, the totality of the king's retinue as an advisory and admonitory body, | pānko پانکۆ: مانای (کۆبوونەوەی هەموان) دەدات. |
| pankuešš | زیادبوون to become plentiful | pānkeš پانکێش: واتە (بەرفراوانی ئەکێشرێت). |
| panduḫa | میزەڵان (ئەوەی میزی تێدا کۆ دەبێتەوە) bladder | bandāu, paŋāu پەنگاو، بەنداو: (بەنداو) شوێنی بەندکردنی ئاوە. (پەنگاو) مانای (ئاوی ڕاوەستاو) دەدات (هەژار، پ.١٢٥). |
| pap (a) | کردارێکە ئەنجام دەدرێت لەسەر هەویر و دەبێتە هۆی ئەوەی کە نانەکە ئامادە بێت بۆ برژاندن؛ دەشێت "بۆ دابەشکردن یان شێوە وەرگرتن بێت" an action performed on fermented dough and resulting in loaves ready for baking; perhaps "to subdivide or shape" | papka پەپکە: پەپکە لە کوردیدا مانای (گونکی هەویر، پانکردنەوەی گونکی هەویر) دەدات کە لەگەڵ ڕوونکردنەوەی وشە هیتیەکەدا گونجاوە. |
| paparriy (a) | ئازار لە ئەنجامی بوونی هەوا یان ڕێگری لە ناو سکدا، کۆبوونەوەی هەوا لە ناو سکدا suffer from colic, be flatulent | bāpirī باپری: لە کوردیدا مانای (پڕ بوون لە هەوا) دەدات. وشەی (پڕ) کە پێکهاتەی وشە لێکدراوەکەیە، لە زمانی میدی و ئاڤێستادا، هەمان مانای لە کوردیدا ماوە. جگە لەوە لە سۆمەریدا šagtahar مانای (باکردن) دەدات کە بەکوردی دەبێتە (سگ تڕی). |
| papparš | پرژاندن to sprinkle | pīāparž پیاپەرژ: ( کرداری پیا پرژاندن ) هەمان مانا دەدات. |

| Hittite | Meaning | Kurdish |
|---|---|---|
| pabilili | بابلی<br>In Babylonian | bābilī بابلی: هەمان مانا دەدات. |
| pappenna,<br>papan | شاخ<br>mountain | bābān بابان: ئەمە ناوە بووتە ناوی یەکێک لە بنەماڵە کوردیەکان کە چەند سەدەیەک حوکمی ناوچەیەکی کوردستانیان کردووە و هەتاوەکو ئێستا مانای ناوەکەیان ڕوون نەبووەتەوە. جگە لەوە (بە بانەوە) واتە بە بەرزیەوە، بەو جۆرە دەشێت ئەوە بنەمای ناوەکە بێت. ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا هوریە و هیتیەکان لەوانیان وەرگرتووە. |
| parā | بەرەو (ئەمە یەکێک لە ماناکانی ئەو وشەیەیە)<br>toward | barau بەرەو: هەمان مانای هەیە و لە ئینگلیزیدا بە شێوەی pro وەک پێکهاتەی وشەی لێکدارو دەردەکەوێت کە هەمان مانای هەیە. |
| parai | فوکردنە ئامێری مۆسیقا، هەواپڕکردن<br>to blow (hor) | pirī پڕی: لە کوردیدا مانای (پڕکردن دەدات لە هەوا یان هەر شتێک). |
| parai | دەرکەوتن، پەیدابوون<br>to appear, emerge | darparī دەرپەڕی: بەشێکی وشە هیتیەکە هێشتا لە زمانی کوردی ئەمڕۆدا ماوە. لە فەرەنسیدا paraître مانای (دەرئەکەوێت، دەبینرێت) دەدات. |
| parranda | لەم بەر بۆ ئەو بەر، پەڕینەوە بۆ<br>over to, across to | parīn پەڕین: هەمان مانا دەدات. لە بنەڕەتدا ڕەگی وشەی (پەڕینەوە) دەبێتە (پەڕ). ئەم وشەیە لە کوردیدا دەبێتە بناغەی وشەی (پرد)، کە لە ئاڤێستاشدا دەبێتە peretu و لە ئینگلیزیدا بووەتە bridge.<br>ئەم وشەیە لە زمانی لیدیدا دەبێتە fra. |
| parapri | جۆرێکە لە نان<br>a kind of bread | pārapāraīī/parparī پارەپارەیی/پەڕپەڕی: هەردوو وشەکە لە کوردیدا مانای هەیە و (پارەپارە) مانای (لەت لەت) دەدات و (پەڕپەڕ) مانای (چین چین) دەدات. دەشێت ئەوە ئاماژە بێت بۆ جۆری ناناکە. |
| parašant | گۆڕانکاریە لە سوپادا<br>modifies troops (ئەم وشەیە ماناکەی نەزانراوە، بەڵام دەزانرێت کە پەیوەندە بە گۆڕانکاری لە سوپادا) | parasand پەرەسەند: لە کوردیدا مانای (گەورەکردن، زیادکردن) دەدات. پێ دەچێت مانای وشەکە (گەورەکردن، زیادکردنی سوپا) بێت. |
| parašešš | بڵاوکردنەوە<br>to disperse | parš/parž پەرش/پەرژ: مانای (بڵاوبوونەوە) دەدەن. |
| parā(-)uwant | چاودێر، کەسێک کە چاودێری دەکات<br>supervisor, one exercising oversight | paruar پەروەر: مانای (بەخێوکەر) دەدات (هەژار، پ.١١٩). |
| parḫ-, parḫiya | وەدووکەتن، دەرکردن، | pir,par, parān, fir پڕ،پەر، پەڕان، فڕ: لە |

| | | |
|---|---|---|
| | دوورخستنەوە، هێرشبردن، تاودانی ئەسپ، خێراکردن to chase, to expel, banish, to attack. make (horses) gallop, to hasten | کوردیدا (پەڕانی) واتە (دووری خستەوە). بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو لاوە پەڕیوەتە وڵاتان). (پڕ) بە مانای هێرش بردن دێت (ئەو شێرە پڕی کرد بە ئاسکەکەدا). (فڕ) بە مانای (تاودان) دێت کاتێک کە دەگووترێت (ئەسپەکەی فڕاند). لە فەرەنسیشدا کرداری partir مانای (ڕۆشتن) دەدات. |
| parḫanu | تاودانی ئەسپ to make gallop | firān فڕان: (ئەسپەکەی فڕان) هەمان مانا دەدات. |
| pariyan, parean | پەڕینەوە، دوور کەوتنەوە across, beyond | parīn پەڕین: (ئەو بەردە پەڕیوە) واتە (دوورکەوتۆتەوە) هەروەها دەگووترێت (با لەم پردە بپەڕینەوە). |
| pariyawan | ئاراستە یان شێوە فڕینی باڵندەیە a direction or manner of bird flight | paruāna, frīn پەروانە، فڕین: (پەروانە) مانای (باڵی پانکە، پەپولە) دەدات و (فڕین) ئاماژەیە بە (فڕینی باڵندە یان پەپولە). |
| pariyanalla | شەیتانێکە، ڕۆحێکی شەڕە an evil | frīuān فریوان: (فریودان) مانای (لە خشتەبردن، فێڵ لێکردن) دەدات. کە لەگەڵ سروشتی شەیتان و لەگەڵ مانای وشە هیتیەکەدا یەک دەگرێتەوە. |
| parili-, parli-, paliri | تاوان، سەرپێچیکردن offenc, crime | parla پەرلە: مانای (فێڵ) دەدات. |
| parip(pa)rai | فوکردنە ئامێری وەک زوڕنا، پڕبوون لە هەوا، پڕبوون لە شت to blow (a horn or pipe), to be flatulent, bloated | pirpirī پڕپڕی: مانای (پڕبوون) دەدات. هاوشێوەی ئەو وشانە زۆرن کە لە کوردیدا ماون (چین چین، کەم کەم، زۆر زۆر، ووردە ووردە، دوو دوو، پەڕ پەڕ، لارە لارە، خنە خن، فرتە فرت، .....) ئەم حاڵەتە لە زمانی سۆمەری و هیتیشدا دووبارە بووەتەوە. |
| parkuwa | پاکردنەوە to clear | pākaua پاکەوە: (پاکەوەی کە) مانای (پاکی کەرموە) دەدات. |
| parkue | پاک بوون، ڕوونی، بینراو بەتەواوی to be pure, clear, fully visible | pak پاک: بۆ نموونە دەگووترێت (ئاسمان پاکە) واتە (ئاسمان بە ڕوونی دەبینرێت) و ماناکانی (ڕوونی، پاکژی) هەمووی دەدات. |
| parkui | پاکی، دوور لە پیسی ڕۆحی، داوێن پاکی، پاکی لەش، پاک لە ڕووی ئاینیەوە، pure, free of impurities, , unadulterated, (physically) clean or | pākī پاکی: هەمان ئەو مانایانە دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| | clear, (ritually) pure | |
| parkuyatar | پاکردنەوە<br>purification | pākdārī پاکداری: هەرچەندە ئەو وشەیە بەم شێوەیە لە کوردیدا نیە یان نەماوە بەڵام وشەی (پاک) هەیە و پاشگری (داری) یش هەر هەیە و هەمان مانا دەدات، بۆ نموونە (باخداری، ماڵداری....) |
| parkui ḫaštai | پارچەیەکی لێکراوە لە گۆشت؛ 'ئێسقانی پاکراو'<br>a body part or cut of meat; "pure-bone | pākoī hastī پاکۆی هەستی: لە کوردیدا وشەی (پاک) وەک خۆی ماوە و وشەکانی (هەستی، ئێستک، ئێسک) مانای ئێسقان دەدەن (هەژار، پ.٩٧٥) بە زمانی میدی بە ئێسقان دەگووترێت asta کە هەمووی لەگەڵ زمانی کوردیدا یەکن و بە زمانی فەرەنسی دەبێتە os ، ئیتاڵی وپورتوگالی osso، ئیسپانی hueso. |
| parna | بەڕە (کە وەک فەرش دادەخرێت)<br>kilim | bara بەڕە: هەمان شتە. |
| parš | ڕاکردن، دەربازبوون<br>flee, escape | parš پەرش: مانای (بڵاوبوونەوە) دەدات. نموونە (میلەتی کورد بە ئەوروپادا پەرش بووە) لە ڕووی ماناوە لەیەکتر نزیکن. |
| parš, parši, paršiya | شکاندن (بۆ پارچەی گەورە)، شکاندن (بۆ پارچەی بچووک)، لەیەکتر جیابوونەوە<br>to break (into large fragments), to crumble (into small fragments), disintegrate | parš پەرش: لە کوردیا دەگووترێت (ئەو شوشە شکاوە و پارچەکانی پەرش و بڵاو بووەتەوە) کە ئاماژەیە بۆ لەت لەت بوون و لەیەکتر ترازان و شکاندن. |
| paršiulli | جۆرێکە لە نان<br>a type of bread | parša پەرشە: جۆرێکە لە دانەوێڵە کە لە جۆ دەکات و دەکوڵێنرێت و دەخورێت (هەژار، پ، ١١٨). دەشێت ئەو نانە لە پەرشە دروست کرابێت. |
| partai | گرێکردنەوە، کردنەوە<br>to disentangle, unravel | part پەرت: دەبێتە ڕەگی (پەرتانن) کە مانای (لەبەریەک هەڵپچڕانن) دەدات (هەژار، پ، ١١٨). ماناکەیان نزیک دەردەکەوێت. لە زمانی فەرەنسیدا یەکێک لە ماناکانی parti (هەڵبژاردنی چارەسەر بۆکێشەیەک) دەدات. |
| partawar | باڵ (هی باڵندە)، پەڕ<br>wing, feather | par, pardār پەڕدار، پەڕ: (پەڕ) ئەو شتەیە کە لەشی باڵندەی داپۆشیوە. (پەڕدار) واتە (پەڕی پێوەیە). |
| partūni, pattar | باڵندەیەکە<br>a bird | par پەڕ: وشەی (پەڕ) کە پێکهاتەی لەشی باڵندەیە و لە زمانی کوردیدا بە (جۆرێک لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کۆتری سپی، فریشتە) دەگووترێت (پەری). لە زمانی سۆمەریدا buru مانای باڵندە دەدات. |
| parzaḫi | بەرهەمێکی دانەوێڵەیە<br>a cereal product | parša پەرشە: جۆرێکە لە دانەوێڵە ، شێوەی لە جۆ دەکات و دەکوڵێنرێت و دەخورێت. |
| parzaki | دومەڵ (سەر پێست)، نیشانە (ئەوەی کە دەدرێت لە شتێک)<br>label, bulla | barzak بەرزەک: مانای (بڵندایی نێوان تەختایی) دەدات (هەژار، پ.٧٤) وشەکە لەگەڵ سروشتی دومەڵ و نیشانەدا گونجاوە. ئەم وشەیە لە زمانی میدیدا بووەتە brz و لە ئاوێستادا هەر بە هەمان شێوە بە berez دەنووسرێت و مانای (بەرز) ی کوردیان هەیە. |
| pašaniš | دەستەواژەیەک بۆ خوێندنەوەی داهاتوو یان ژیان (فاڵگرتنەوە)<br>a term used in extispicy | pašān پاشان: واتە دوایی . مانای داهاتووش دەدات و لەگەڵ سروشتی فاڵگرتنەوەدا دەگونجێت. هەروەها لە کوردیدا وشەی (ئانی) بەتەنها مانای (هێنای) دەدات و (پاش) داهاتوو. بەئاوێتەکردنی دوو وشەکە، دەبێتە (پاش+ئانی) کە لەگەڵ سروشتی فاڵگرتنەوەدا دەگونجێت. |
| paš(š)andala | کەسێکە کە لە چێشتخانەدایە، خواردن تامکەر<br>a type of kitchen personnel, 'food-taster | paž/paz پەز/پەژ: (پەز/پەژ) پاشگرێکە بۆ خۆراک دروستکەر بۆ نموونە (ئاشپەز، چاپەز) کە مانای (خواردن دروستکەر، چا دروستکەر) دەدەن. |
| pašiḫai | خیانەتلیکردن، دوو ڕوویی، پشتگوێ خستن<br>to betray, double-cross, disregard | pāšaīī پاشەیی: ئەم وشەیە لە کوردیدا دەبێتە (لە پشتەوە) . بۆ نموونە (پاشەملە) بەکاردەهێنرێت بۆ وەسفکردنی ئەو شتەی کە لە پشتی کەسێکەوە دەکرێت کە لە بنەڕەتدا لە مانای (پشت مل) هاتووە. |
| paškuwai | ڕەتکردنەوە، پشتگوێخستن، لابردن<br>to reject, ignore, to remove | pāškauī پاشکەوی: ئەو شتەیە کە دەکەوێتە پشتەوە. |
| paššu | داڕێژراوێکی بینایَ بەرز [بۆ نموونە، پێپلیکە، سەکۆ یان بارسێک] یان شوێنێکی بەرز<br>an elevated structure [e.g., a step, podium, or pedestal] or elevated locality | pešo پێشۆ: مانای (بردنە پێشەوە) دەدات. |
| pata | پێ، قاچ<br>foot, leg | pāta, pe/pa پاتە: بە کوردی (پاتە) مانای (پێڵاو) دەدات. ئەم وشەیە تەنها لەلادێکانی کوردستاندا بەکاردەهێنرێت. (پێڵاو) لە زمانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | فەرەنسی کۆندا بووەتە botte و لە ئینگلیزیدا بووەتە boot. بەڵام وشەی (پێ/پا) لە کوردیدا و pah لە سۆمەریدا هەمان مانای (قاچ) دەدەن. |
| patta | شتێکە کە لە بەرد دروستکراوە<br>kind of small stone object | bit بت: بەردی داتاشراو کە خەڵک دەیپەرستێ. |
| patalla | شتێکە هاوشێوەی پوزەوانە لە قولەپێوە تا ئەژنۆ، پێچراوی قاچ<br>puttee, leg wrapping | pātālā پاتاڵا: لە ڕاستیدا ئەم وشە هیتیە، لە دوو وشەی (پاتە+ئاڵا) پێک دێت؛ (پاتە) لە زمانی هیتیدا مانای پێ دەدات و (ئاڵا) مانای (بە دەوردا پێچان) دەگرێتەوە لە کوردی و سۆمەریدا. ئەمڕۆ وشەی (پێڵاو) لەسەر هەمان بنەما دروست بووە (پێ+ئاڵا+و)، وشەکانی (پێ، ئاڵا) هەردووکیان سۆمەری و کوردین و پاشگری (و) لە کوردیدا ڕەگی کردار دەکاتە ناو. هەروەها لە کوردیدا وشەکانی (پێتاو، پاڵا petāu, Pālā) هەر یەکەیان جۆرێکن لە پێڵاو بە پوزەوانەوە . (کاڵەو پێتاو) لە کوردیدا بریتییە لە یەک یان دوو پارچە چەرم کە بە پەت دەبەسترێت بە پێوە هەتا ئەژنۆ، بۆ ڕۆشتن بەناو بەفردا. |
| patalḫai | بەستنەوە/کۆتکردن لە قاچەوە<br>to fetter | pātīālāī پاتیائالایی: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| patalli(ya) | پەتی بەستنەوەی ئاژەڵ، بەستنەوەی بەندکراو لەلای قاچییەوە<br>fetter, tether | pat ālāīa, pā tīālāīa پەت ئاڵایە، پا تیائاڵایە: دەشێت مانای (پەت تێئاڵان) بدات یان (پا تیائاڵان). |
| patalliya | بەستنەوەی قاچ، قاچ بەسەرەوە<br>to tie feet, fetter | (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| peda | شوێن، شوێنی بوون یان وەستان<br>place, position | pega پێگە: لە کوردیدا (پێگە) مانای (شوێن، بنکە) دەدات. |
| peiškattalla , piyaškattalla | پێشکەشکەر<br>deliverer | peškaškar/ peškaškār<br>پێشکەشکار/پێشکەشکەر: هەمان مانا دەدات. |
| peiye , peiya | ناردن<br>to send | peīīā پێی یا: بۆ نموونە (نامەکەی پێ یا). |

| | | |
|---|---|---|
| peran | پێشتر، بەردەم، لە حزوردا، لە بەرچاو یان بەرگوێدا، لەرابردوودا، سەرەتا، پێشتر<br>before, in front of, in the presence of, in the sight or hearing of, previously, at first, in advance | bar, pār, pere بەر ، پار، پێرێ: (بەر) مانای (پێشتر، پێشوو، بەردەم) دەدا، هەروەها (پار) مانای (ساڵی رابردوو دەدات) و (پێرێ) مانای (دوو ڕۆژ لەمەوبەر) دەدات. وشەی (بەر) لە کوردیدا وەک پێشگریش سەدان وشەی لێ دروسکراوە بە مانای (پێش)، بۆ نموونە (بەرکوڵ، بەردەم، بەرپێ، بەرچاو، بەرکۆش، ....). ئەم پێشگرە لە کوردیدا بە هەمان مانا و هەمان شێوە بەکاردەهێنرێت . لە لاتینیدا دەبێتە prae و دەبینرێت کە پێشگری pre سەدان وشەی لە ئینگلیزیدا لێ دروست دەکرێت، وەک prieur,pre-book, prearrange, prepare, precast, precouctin و زۆر وشەی هاوشێوەی ئەمانە لە فەرەنسی و زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تریشدا دووبارە دەبنەوە. |
| persnā | پاژنە<br>heel | pāžna پاژنە: هەمان مانا دەدات. |
| peššiya/e, pišša/e, peššiyai, pišya | هەڵدان، فڕێدان، وازلێهێنان، ڕەتکردنەوە، پشتگوێخستن<br>to throw, cast, shove, to abandon, , reject, (to ignore, | pāšīa پاشیە: لە وشەی (پاش) وە هاتووە و دەکرێتە (پاشیە، پاشدان، پاشخستن، پاشقوڵ) کە هەمووی هەمان مانا دەگەیەنن. |
| pešna, pišena, pišeni | نێر، کەسێکی نێر<br>man, male person | pasin/pasana پەسن /پەسەنە: واتە (پەسەندکراوە) و ئەو مانایە لەگەڵ بۆچوونی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمە و تا رادەیەکیش ئەم سەردەمەدا دەگونجێت. |
| pida | بردن (بۆ شوێنێ)، هەڵگرتن، گوێزانەوە<br>to take (somewhere), carry, transport | pedā/peīdā پێدا/پێیدا: ئەم وشەیە لە کوردیدا لە وشەی لێکدراوی (پێدا ناردن) دا دەردەکەوێت کە هەمان مانا دەدات. |
| pippa | خستن، ڕوخاندن، هەڵگەرانەوە<br>to knock down, tear down, overturn | pepīā پێ پیا: واتە (پێی پیایە/پیادە/ پیادادان/ پیاکێشان) کە مانای (تێکشکاند، ڕوخاندن) دەدات. |
| pippit | ئەو شتانەی کە کەسێک هەیەتی<br>possessions | pebet پێبێت: (پێی بێت/پێ بێت) هەمان مانایان هەیە. |
| piyanāi-, peyanai | پاداشت کردن (بە کەسێک)<br>to reward (someone) | peīān پێیان: (پێیان/پێدان) هەمان مانا دەگرێتەوە. |
| puwaliya | جلکێکە بۆ قاچ یان پێ | pelāu پێڵاو: لە کوردیدا مانای (کەوش) دەدات. |

| Hittite | Meaning | Commentary |
| --- | --- | --- |
| | a garment for the leg or foot | |
| pukk, pugga | قیزمون، ناخۆش<br>repulsive, unpleasant | pukāu پوکاو: مانای (چرچ و سیس) دەدات. |
| pukkant | ڕق لێوەبوو، قیزمون، ناخۆش<br>hated, repulsive, unpleasant | pukāu پوکاو: لە کوردیدا ماناکانی دەبێتە (ڕزیو، بۆداری دەڵێن، چرچ) (هەژار. پ.١١٥) کە هامان ماناکانی ماوە. |
| pul | بڕێک<br>lot | pol پۆل: (پۆل) مانای (گرووپێک یان ژمارەیەک) دەدات. بۆ نموونە (پۆلێک ماسی، پۆلێک باڵندە...). |
| puš | شاردنەوە، بەر لە ڕوناکی گرتن لە شتێک<br>to be eclipsed | poš پۆش: (پۆشین) هەمان مانا دەدات. |
| salli | مەزن<br>greate | zāl زاڵ: مانای پاڵەوانی هەیە و هەروەها مانای سەرکەوتوویی هەیە بەسەر لایەنی دوژمندا یان لایەنی بەرامبەردا. ئەم وشەیە چووەتە داستانی ناوچەکەوە و بووەتە بەشێک لە ناوی ڕۆستەم کە بە (ڕۆستەمی زاڵ) ناو دەبرێت. لە سۆمەریدا zal مانای (کەسێکی نایاب) دەدات. |
| sumes | ئێوە<br>you (plural) | šima شمە: بە زاراوەی هەورامی و دملی (زازا) مانای (ئێوە) دەدات و هاوشێوەی هیتیەکان بەکاردێت. لە فارسیدا بە مانای (تۆ، ئێوە) بەکاردێت، بەڵام لە کوردیدا هاوشێوەی زمانی هیتی، تەنها بە مانای (ئێوە) بەکاردێت. |
| šahhan | جۆرێک لە ئەرکی سەرشانە (واجیبە) یان پارەیەک وەک هەقی کرێچێتی زەویەک<br>a kind of obligation, or payment due from a land tenant | šāhāna شاهانە: لە کوردیدا (شاهانە) بریتیە لەو پارەیەی کە دراوە بە خەڵکی خاوەن زەوی. لە هیتیشدا هەر هەمان وشەیە و ماناکەی نزیکە. لە کوردیدا دەگووترێت (سەرانە، بەگانە، سەرفوترانە، کەرانە، ئاشانە) کە هەمووی ئاماژەن بە جۆرێک لە باج دان یان باج وەرگرتن. بۆ نموونە (بەگانە) ئەو باجەیە کە جوتیار ساڵانە دەیدات بە بەگ یان بە ئاغا. هەندێک جار ئەو بەگانەیە پارەنیە بەڵکو کارکردنە بە خۆڕایی بۆ بەگ یان بۆ ئاغا. لە زمانی لوڤیشدا هەمان مانای هەیە. |
| šaheššar | پتەوکردن بە دروستکردنی دیوار یان شتی تر بۆ پاراستنی شوێنێک، شوێنێکی پتەوکراو بەرامبەر بە مەترسی دەرەوە | šāīšār/šāīsar شای شار/شای سەر: لە ناو سۆمەری و گەلەکانی تری ئەو سەردەمە دا (شا) بە مانای گەورە و مەزن بەکارهاتووە. بەو جۆرە ناوەکە بووەتە (گەورەکردنی شار) یان (بەهێزکردنی سەرەوە). |

| | | |
|---|---|---|
| | fortification, Stronghold | |
| šahtarili | جۆرێکە لە مۆسیقا ژەن یان گۆرانی بێژی شوێنی ئاینی رەسمی<br>a type of musician or singer in the official cult | šātirīlī شا تریلی: لە کوردیدا دەگووترێت (شایی و تیریلان) یان (کە پشیلە لەوێ نەبوو مشک تریلیلانیەتی)، هەروەها کاتێک کە دایک گۆرانی بۆ منداڵەکەی دەڵێت (تریلیلان) بەکاردەهێنێت. وشەی (تیریلی) لە کوردیدا لە بابەتی پەیوەست بە مۆسیقا بەکاردێت و وا دەردەکەوێت هەر مانای مۆسیقا بدات. بەو جۆرە ناوەکە بە هەمووی مانای (شای مۆسیقا) دەدات. |
| šikruwai | تینوێتی شکاندن<br>satisfy on's thirst | šikā شکا: ئەم وشەیە بەشێکە لە گەیاندنی مانای تینوێتی شکاندن. بۆ نموونە (بەو جامە ئاوە من تینوێتیم شکا). |
| šaku (wa), šakuwai | جۆرێکە لە سزادان<br>a form of punishment | šaq شەق: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای تێهەڵدان دەدات. وشەی (شەق) لە زمانی سۆمەریدا بووەتە sag کە دیسان زۆر نزیکە. |
| šak (k)u(wa)ni(ya), | قوڕی وەرگیراو لە کانی<br>mud plaster from a spring | zīxīkānī زیخی کانی: وشەی (کانی) لە کوردیدا وەک خۆی ماوەو لە ئاڤێستادا دەبێتە xan. (زیخ) بە وردە لم و لیتەی ناو کانی دەوترێت. گۆرانی شاعیر دەڵێت "کانیەکی ڕونی بەر تریفەی مانگەشەو لە بنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو". |
| šak(k)uni, šakuniya, | سەرچاوەی کانیاو<br>spring water source | šākānī /šākānīāu شاکانی/شاکانیاو: هەردووکیان مانای (کانی گەورە) دەدەن. |
| šala | پشتێنێکی چەرمە<br>a leather strap | šāl شاڵ: لە کوردیدا بە مانای ئەو پشتێنە دێت کە سەیدەکان دەیبەستن. |
| šallai, šalliya, šalliye | شل بوونەوە<br>to melt down | šil شل: ڕەگی وشەی (شلبوونەوە، شلکردنەوە) یە و هەمان مانای هەیە. |
| šalakar | جۆرێکە لە نان کە لە دانەوێڵەی شاپی دروست دەکرێت.<br>a bread made of šappit | šilkī شلکی: هەتا ئێستاش نانی (شلکی) لە کوردەوارێدا هەیە. بە زمانی سۆمەری بە هەویر دەگووترێت šilig کە دیسان وشە کوردیەکەی تێدا بەدی دەکرێت. |
| šallanu | تواندنەوە و تەخت کردن<br>to melt down to flatten | šelān شێلان: (شێلان) مانای تەختکردنی هەویر و نەرمکردنی هەیە و (شلکردنەوە) مانای تواندنەوە دەدات. بە زمانی سۆمەری بە (شێلان) ی کوردی دەگووترێت silañ. |
| šallatar | مەزنی، پاشایەتی<br>greatness, kingship | šāhalder شاهەڵدێر: مانای بەرزبوونەوە و مەزنی دەدات. |
| šallešaša | گەورەبوون، زل بوون، گەورەبوون لە قەبارەدا، زۆر گەورەبوون | šālaš شالەش: مانای (گەورەیی لەش) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| | to become large, grow up, increase in size, to become too big | |
| šalk | شیلان، تێکەڵاوکردن<br>to knead, mix together | šilkī شلکی: لە کوردیدا مانای (نەرمی، نانی ساج) ی هەیە (بڕوانە وشەی šalakar ). |
| ša(m)ma(m)ma | جۆرێکە لە درەخت یان بەرەکەیەتی [هێشتا ئەم تەرجومەیە یەکلانەبووەتەوە]<br>a tree or its fruit | šamāma شەمامە: لە خێزانی کاڵەکە ، بەڵام قەبارەی پچوکترە و خەت خەتە. لە کوردەواریدا بۆ بۆن خۆشی و بۆجوانی خەڵک دەیهێڵێتەوە. |
| šamenu | سواتندن<br>to burn | šamān شەمان: (شەم) لە کوردیدا مانای (مۆم) دەدات و لە ڕووی ڕێزمانیەوە (شەمان/شەماندن) وەک کردار، مانای (مۆماندن) دەگرێتەوە . بە ئینگلیزی بە (دوکەڵکیش) دەگووترێت chimney کە لە فەرەنسیەوە وەرگیراوە و فەرەنسیش لە لاتینی وەرگرتووە. |
| šanh | هەوڵدانی دۆزینەوە، گەڕان بەدوادا، دۆزینەوەی شوێن<br>to seek, look for, to locate | šuen شوێن: بەشێکە لە (بە شوێندا چوون، شوێن کەوتن، شوێن گەڕان) کە هەمان مانا دەدەن. |
| šami | بوغورد، دوکەڵ<br>incense, smoke | šam شەم: لە کوردیدا مانای (مۆم) دەدات. دیارە ئەم وشەیە لە بنەچەدا لە زمانی هیتیەوە هاتوە. |
| šanh | شانە<br>comb | šāna شانە: هەمان مانای هەیە. لە زمانی یۆنانیدا دەبێتە chtena. |
| šanezzi, šanizzi | ئەوپەڕی باشی، چاک، زۆرباش، زۆر نایاب، بەناوبانگ<br>first quality, fine, excellent, outstanding, famous | šānāzī شانازی: مانای (فەخرکردن) دەدات. |
| šapp | لێدان<br>to hit | šap شەپ: مانای لێدان بە دەست دەدات. ئەم وشە کوردیە لە زمانی سانسکریتدا دەبێتە capeTI، لە ئیتاڵیدا دەبێتە schiaffo ، لە فەرەنسیدا دەبێتە tape و لە ئینگلیزیدا دەبێتە slap. |
| šappai, šaippai, šappa | توێکڵ لێکردنەوە، کورتکردنەوەی گیا، قژ یان ڕیش.<br>to peal, trim | sāf ساف، سپی spi: (سافکردن) مانای لێکردنەوەی شتی زیایە و لوسکردن دەدات. وشەی (سپی) دەبێتە رەگی (سپیکردنەوە) کە مانای (توێکڵ لێکردنەوە، پیسی لێکردنەوە) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو ڕێواسە سپی |

| | | |
|---|---|---|
| | | بکە). ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا بریتیە لە sub کە بە مانای (سافکردن) ی کوردی دێت. پێ دەچێت وشە سۆمەریەکە بناغەی وشەی soap ی ئینگلیزی و seife ی ئەڵمانی بێت کە مانای (سابوون) دەدەن. بە یۆنانی بە سرینەوە دەگووترێت sbyno. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت ئەوەیە کە وشە کوردیەکە، هەمان مانای وشە هیتی و سۆمەریەکەی هەیە. |
| šapartara | جۆرێک لە شەیتانی جیهانی ژێر زەوی<br>a class of underworld demon | šāpardār شاپەردار: لەوانەیە بە مەبەستی (گیاندارێکی گەورەی باڵدار) ناویان لێ نابێت. |
| šaphali | چەپ<br>left | capāli چەپ ئاڵی: لە زمانی کوردیدا وشەی (چەپ+ئالی) مانای (لای چەپ) دەدات لەبەر ئەوەی کە وشەی (ئالی) مانای (لا ،تەرەف) دەدات (هەژار. پ.١١). بۆیە بە زمانی هوری وشەی šaphali مانای (لای چەپ) دەدات، کە لەوە دەچێت لە زمانی هوریدا بە دروستر تەرجومە کرابێت. |
| šapiya | سافکردن، کراندن<br>to scrub, rub | sāf ساف: (بڕوانە šappa). |
| šapli | ساڵ<br>year | sāl ساڵ: بە کوردی نزیکە و بە هوری دەبێتە sawaal کە هەموویان لە یەکتری نزیکن. |
| šara | سەرەوە، لەسەر، بەسەر، لەسەر شتێک<br>upward, above, over, on top | sar سەر: هەمان ماناکانی ماوە. لە زمانی سۆمەریدا suhur مانای ( پێستی تەپڵی سەر؛ لوتکەی درەخت، هەر شتێک وەک پۆپنە یان توک لەسەر سەری ئاژەڵ بێت) دەدات و لە زمانی کاریدا دەبێتە šar . لە فەرەنسیدا بووەتە sur کە مانای (لەسەر، بەسەر) دەدات. |
| šarra, šarre, šarriya | دابەشکردن، بەسەردا دابەشکردن، لێک جیاکردنەوە، بەشکردن، بە یەکەلاکردنەوە، لەتکردن، دابەشکردن، شاردنەوەی شتێک لە کەسێک، تێپەڕین لە شتێک، لادان (لە فەرمان، لە سوێن)<br>to divide (up), distribute, apportion, to split up, to split, divide, withhold something from | šir, šārāīa ,sara, sarīā شڕ، شارایە، سەرە، سەریا: (سەرە) مانای (دابەشکردن بە ڕێکوپێکی) دەدات و بە زمانی هوری بووەتە siri کە هەمان مانای (سەرە) ی کوردی دەدات. (شڕ، شڕکردن) مانای (لەتکردن، لەتبوون) دەدات. (شارایە) مانای شاردنەوە دەدات. (سەریا) مانای (بەسەریا) دەدات کە دەشێت مانای (لادان لە شوێن یان فەرمان) بدات. |

| | | |
|---|---|---|
| | someone, transverse, transgress (command. Oathe) | |
| šaramnaz | لە سەرەوە<br>from above | saro/saru سەرو/سەرۆ: مانای (لەسەرەوە) دەدەن. |
| šarawar | کەشو هەوایەکی ناخۆش<br>unfavourable whether condition | šara hor شەرە هۆر: لە کوردیدا (هۆر) ناوێکی ترە بۆ (خۆر). بەو جۆرە ناوەکە دەبێتە (شەری خۆر) کە دەشێت ئەوان کەشو هەوا ناهەموارەکەیان بە شەرکردنی خۆر لە قەڵەم دابێت. دەشێت کە مەبەستی وشەکە (شەرە هەور) پش بێت. |
| šarazziya | باڵادەستی، جیهانی سەرەوە<br>superior, upperworld | šārazāī شارەزایی: لە کوردیدا مانای بە توانایی و لێزانی دەدات. ئەم وشە کوردیە لە دووبەش پێک دێت (شار+ ە+زا) کە مانای (وەچەی شار، لە شارەوە هاتوو) دەدات. |
| šarhiya | ڕنین و درین<br>maul | šir شڕ: لە کوردیدا مانای (لەتوپەتکراو) دەدات. |
| šariyanni | جۆرێکە لە زرێپۆشی لەش<br>a coat of scale armour | sargīānī/sarjānī سەرگیانی/سەرجانی: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. وشەکە لە بنەڕەتدا هوریە و بە (sari jani) دەنوسرێت کە مانای (سەر گیانی) کوردی دەدات و دەبێتە (زرێپۆشی لەش). هاوشێوەی ئەو وشەیە لە کوردیدا وشەی (سەر جێگا) یە کە مانای (سەرچەفی) ی هەیە. |
| šarikuwar | جۆرێکە لە سوپا<br>a kind of troop | šarkar شەرکەر: مانای (جەنگاوەر) دەدات کە بریتیە لە کەسێە کە شەڕ دەکات. |
| šarrena | پاشاکان<br>the kings | sarān سەران: ئەمڕۆ لە کوردیدا ئەم وشەیە مانای (سەرکردە) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (سەرانی کورد دەبێت هەوڵ بۆ میللەتەکەیان بدەن) هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە بە زمانی هوریش هەمان مانای هەیە. ئەوەی کە جێی سەرنجە پاشگری (ena) بەکارهاتووە بۆ ئەوەی کە وشەکە لە تاکەوە بکرێتە کۆ، لەبەر ئەوەی کە sar لە هوریدا مانای (پاشا) دەدات.<br>سۆمەریەکانیش هەمان پاشگری (ان) بەشێوەی ene بەکاردەهێنن بۆ بەکۆکردنی تاک. بە زمانی لیدی serli مانای (سەرکردە) دەدات. |
| šargan(n)iya, šarqanae, šarkaliya | شڕکردن، تێکشکاندن<br>to tear apart, destroy | šir, širaqīān شڕ، شڕەقیان: بەشێکە لە پێکهاتەی وشە هیتیەکە و مانای (لەتوپەتکردن، شڕکردن) دەدات. (شڕەقیان) مانای (درزبردن، قەڵەشبردن) دەدات (هەژار. پ.٤٦٩). |
| šargawtar | دەرکەوتوو، بوون لە بارێکی بەرزدا | sarkaut سەرکەوت: (سەرکەوتوو) مانای (کەسێک کە لە کار، ژیان، جەنگ، |

| | | |
|---|---|---|
| | eminence, high standing | تاقیکردنەوەدا بیباتەوە) هەروەها مانای (کەوتنە باری سەرەوە) ی هەیە کە هەمان مانای وشەکەی ماوە. |
| šarkiske | هەڵکشان<br>to ascend | sarkeš سەرکێش: ئەم وشەیە پێک هاتووە لە (سەر + کێش) کە ماناکەی بریتیە لە (کشان بەرەو سەرەوە) کە هەمان مانای هەیە. |
| šarku | پلە بەرز، نایاب، بەهێز<br>high rank, outstanding, powerful | sarkau, sarko سەرکەو،سەرکۆ: کە مانای (کەسێکی سەرکەتوو، سەرکەوتوویی تیا کۆومبوو) دەدات. |
| šarlai | بەرزکردنەوەی شتێک<br>lift off | sarlāī, sarlā سەرلای، سەرلا: (سەرلا) بەشێکە لە وشەی (سەرلابردن، سەرلایان) کە مانای بەرزکردنەوەی قەپاغ/سەر دەگرێتەوە. |
| šarpa | کورسیەکی قاچ ڕاست وچەپکراو، شتێک کە لەسەر شتێک دادەنرێت<br>a cross legged chair, an object which can sit | carpā ,cuarpā ,sarpā چەرپا ،چوارپا، سەرپا: بە کوردی بە جێگای خەوتن یان قەرەوێلە دەڵێن ( چەرپا ). (سەرپا) و (چوارپا) ش هەمان مانای بە چوار قاچەوە دەدات. |
| šarpašši | سەرپۆشی کورسی<br>chair cover | sarpošī سەرپۆشی: واتە (ئەو شتەی کە دەدرێت بەسەر شتێکدا) کە لە کوردیدا (چەفتەی ژنان، هەر شتێک کە بۆ مەبەستی داپۆشین بەکاربهێنرێت) پێی دەگوترێت (سەرپۆش). وشەکە لێکدراوە و پێکهاتووە لە (سەر+پۆش). |
| šaru | فەرهود، تالآنی، شەڕ<br>booty, plunder, fight | šar, šāro شارۆ،شەڕ: (شەڕ) لە کوردیدا مانای (ناخۆشی، جەنگ، نەهامەتی) دەدات. بە سۆمەری šar مانای (ڕەشەکوژی) دەدات و šara خوای شەڕە. لە زمانی لوڤیدا ašhar مانای (خوێن) دەدات. (شارۆ) مانای (کۆکردنەوەی گەنمی دوراوە لەسەر جێ خەرمان) دەدات (هەژار، پ.٤٦٣). |
| šaru | هێزی خراپە (شەڕ)<br>an evil force | šarāuī / šar شەڕاوی /شەڕ: لە کوردیدا بە کەسێکی شەڕفرۆش دەوترێت ( شەڕاوی ). وشەی (شەڕ) مانای (جەنگ، لەیەکدان، ئاژاوە، ناخۆشی، پێچەوانەی مانای خێرە). بە زمانی سۆمەری šar مانای (ڕەشەکوژی) دەدات و šara مانای بوختانکردن دەدات. |
| šašnu, šaššanu, | پاڵخستنی کەسێک، خستنە ناوجێگا<br>to make someone lie down, to put to bed | saršān سەرشان: لە کوردیدا دەگووترێت (لەسەرشان پاڵکەوتوە، خستنە سەر شان). |
| šašt | خەوتن | xaut خەوت: کە هەمان مانای ماوە و کەمێک |

| | | |
|---|---|---|
| | sleap | لە کوردیدا گۆڕاوە. لە زمانی فەرەنسیدا sieste بەمانای پشو دان و سەرخەوشکاندن دێت. |
| šatar | ئاودانی کشتوکاڵی<br>irrigation | aster/ster ئەستێر/ستێر: لە کوردیدا ئاماژەیە بەو چاڵەی کە ئاوی تێدا هەڵدەگیرێت بۆ ئاودان. |
| šatuhe | ژنێک بێ ڕێز<br>a disrespectable women | šātāu ,šet شێت، شاتاو: (شێت) ئاماژەیە بۆ کەسێک کە ئەقڵی لەدەست دابێت. (شاتاو) پەلاماردانە بە قسە یان بە دەست، زۆربەی جار بۆ دەمەوەری ئافرەت بەکاردەهێنرێت. |
| šazke | پاڵنان، پیاکردن<br>push, shove | suzgī, šužin شوژن، سوزگی: (شوژن) بریتیە لە دەرزیەکی گەورە. سوزگی لە کوردیدا ئاماژەیە بۆ کەلوپەلیکی ناوماڵ، کە کون کونە و سەوزە و خۆراکی تێدا دەشۆرێت و زۆر جار دەگووترێت (ئەو خواردنە لە سوزگی بدە) مانای ئاوی پێدا تێپەڕێنە. |
| ta | تۆ<br>you | ta/to تە/تۆ: لە کوردیدا نەگۆڕاوە و لە زمانی لوڤیدا هەمان مانا دەدات و لە زۆربەی زمانە هیندۆ ئەورووپیەکاندا وەک یەکە. بۆ نموونە بە زمانی فەرەنسی دەبێتە toi,tu، بە ئیسپانی te و بە کرواتی ti. |
| takš | پێکەوەنان، لکاندن بەیەکەوە<br>to put together, wield | tak تەک: مانای (لە پەنا، لە تەنیشت، بە یەکەوە) دەدات. لە سۆمەریدا teĝ مانای نزیک بوون لە شتێک دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە touch ، فەرەنسی touche کە مانای بەرکەوتن دەدات. لە ئیتاڵیدا دەبێتە tocco پورتوگالی toque. |
| takku | ئەگەر<br>if | taqāu, taqu تەقاو، تەقو: لە کوردیدا مانای (ئەی ئەگەر، بەشکو) دەدات. لە سۆمەریدا tukum هەمان مانا دەدات. |
| taninu | ڕێکخستن، دانان بە ڕێکی<br>to put in order, organize | dānān, tanīn دانان، تەنین: (دانان) مانای (کتێب/مۆسیقا/شیعر دارشتن) دەدات. (تەنین) مانای (چنین) دەددات. |
| taru | تەختە؛ درەخت<br>wood; tree | dār دار: بە زمانی کوردی مانای (درەخت، تەختە) دەدات. بە زمانی سۆمەریش بە تەختە دار دەگووترێت dur و لە ئاڤێستادا بە داری دەست دەگووترێت dru و لە زمانی لوڤیدا دەبێتە taru. ئەم وشەیە لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا بە شێوەی جیاواز دەرکەوتووە. ئینگلیزی tree، سلۆڤینی drevo، کرواتی drvo، دانیمارکی træ. |
| tapassa | بەرزبوونەوەی گەرمی لەش<br>fever | tā تا: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە و بە سۆمەری دەبێتە tap. |

| | | |
|---|---|---|
| te | قسەکردن (کردار)<br>to speak | ut وت: دەبێتە ڕەگی (وتن) کە مانای (قسەکردن) دەدات. لە زمانی هوریدا ti مانای (قسەکردن) دەدات و بە زمانی لوڤی دەبێتە hati. |
| teri | سێ (ژمارە سێ)<br>three | hire هیرێ: لە زاراوەی زازاکیدا دەبێتە hire. لە زمانی میدیدا دەبێتە ori. |
| tet<u>h</u>a, tethiski | بروسکەدان، چەخماخەدان<br>to thunder | tīšk, tīž, tez تیشک، تیژ، تیز: لە کوردیدا (تیشک) بە مانای (ئەو ڕۆشناییە دێت کە لە هەر شتێکی پرشنگدارەوە بێت). (تیژ) ئاماژەیە بە هەر شتێک کە باش ببڕێت. (تیز) بریتیە لە کونی لای چەخماخی تفەنگی ڕەشۆکی کە باریکە باروتێکی تێدایە (هەژار، پ. ١٧٤). ئەم وشەیە لە زمانی سراسیدا بە titha دەنووسرێت و مانای (تیشک، پرشنگدار) دەدات. |
| u | و (ئامرازی بەیەکەوە بەستن)<br>and | u و: وەک خۆی ماوە و لە سۆمەریشدا هەر وایە. |
| udne | زەوی، خاک<br>land | āuadānī ئاوەدانی: لە کوردیدا ماناکەی (ناوچەیەکە دەستی مرۆڤی پێ گەیشتبێت)، لە سۆمەریدا eden مانای (تەختایی، دەشتایی) دەدات و a de مانای (ئاودان) دەدات. هەموویان بناغەی وشەی (ئاوەدان) ی کوردیان دروست کردووە. |
| uttar | وتار<br>speech | utār وتار: هەمان مانا دەدات. لە زمانی لوڤیدا utar/utn مانای (وشە، پیتسازی) دەدەن . لە زمانی ئینگلیزیدا utter مانای (گووتنی شتێک دەدات. |
| uwa, ue | هاتن<br>to come | ye یێ: لە کوردیدا مانای (دێ) دەدات. بۆ نموونە (ئەو کابرایە یێ بۆ لام). لە زمانی لوڤیدا دەبێتە awi. |
| walla | هەڵان، بەرزڕاگرتن<br>praise | halā هەڵا: وەک کردار هەمان مانا دەدات. |
| war | سوتاندن<br>to burn | āur ئاور: مانای (ئاگر) دەدات. لە سۆمەریدا ur مانای (سورکردنەوە) دەدات. لە سانسکریتدا vIra مانای ئاگر دەدات و لە لاتیندا uro دەبێتە کرداری (سوتاندن). |
| wašše | جل لەبەر کردن<br>to put on (clothing) | pošī پۆشی: هەمان مانا دەدات. |

# هوریەکان (Hurrian)

**سەرەتایەک سەبارەت هوریەکان**

وا دەردەکەوێت کە هوریەکان لە سەرەتاوە لە مێسۆپۆتامیادا ژیابێتن و نیشتەجێی باکوری مێسۆپۆتامیای بووبێتن، چونکە لە سەرەتای تۆمارکردنی مێژووی مێسۆپۆتامیاوە ئاماژەیان پێ کراوە. هوریەکان وەک سۆمەریەکان لەوە دەچێت خەڵکی ڕەسەنی وڵاتەکە بووبێتن. ئەوانیش هاوشێوەی گروپە ڕەسەنەکانی تری ناوچەکە، زۆر جار بە هەڵە، بە خەڵکی کۆچکردوو بۆ ناوچەکە دانراون.

هوریەکان لە ناوچەی جیاوازی کوردستاندا ژیاون و چەندین شاری مێژوویی گرنگ لە کوردستاندا شوێنی نیشتەجێیان بووە . لەوانە (نوزی Nuzi) کە دەبێتە کەرکوکی ئیمڕۆ، (ئورکیش Urkesh) کە دەکەوێتە کوردستانی ڕۆژئاوا (باکوری سوریای ئەمڕۆ) کە ئێستا (تل موزان) ی پێ دەگووترێت. هەروەها هوریەکان، لە باشور و باکور و لە ڕۆژئاوای کوردستانی ئەمڕۆدا، چەندین شاری تریان دامەزراندووە.

پێش هاتنی ئەکەدیەکان، هوریەکان ناوچەکانیان هەر شانبەشانی سۆمەریەکان بووە و لە ناوچەکانی باکوری مێسۆمۆتامیا و سوریای ئەمڕۆ و کوردستانی باکوردا ژیاون (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٦). پەیوەندی نێوان شارەکانیان پەیوەندیەکی شل بووە و شێوەی دەوڵەتی بەهێزی وەرنەگرتبوو. لە دوای هاتنی ئەکەدیەکانەوە هاوسەنگی ناوچەکە گۆڕا. وەک کاردانەوەیەک بۆ ئەو هێزە دەرەکیانەی کە ڕوویان دەکردە ناوچەکە و بە شێوەیەکی زۆر توند و تیژ پەلاماری ناوچەکەیان دەدا و دەیانوسیت دەستی بە سەردا بگرن، هوریەکان لە سەدەکانی دواییدا زیاتر خۆیان بەهێز کرد، هەتاوەکو وورده وورده لە ژێر یەک دەسەڵاتی ناوچەییدا بە ناوی میتانی هێزی خۆیان کۆکردەوە.

(نەخشەی ژمارە ٦) نەخشەی وڵاتی هوریەکان.

لە دوای کزبوونی دەسەڵاتی سۆمەریەکان لە خوارەوەی مێسۆپۆتامیا، میتانیەکان وەک میراتگری ئەوان سەرکردایەتی نەتەوە ناسامیەکانیان گرتە دەست و لەو پەڕی بەرفراوانبوونیاندا لە باکوریشەوە، لە ناوچەی باکوری ئەناتۆلیا، دەسەڵاتی هیتیە کۆنەکانیان[33] (Hittitian ) کز کردبوو. لە سەدەی پانزەهەمی پێش زاییندا سنوری دەسەڵاتی میتانیەکان دەیدا لە سنووری ناوچەی دەسەڵاتی میسریەکان و ماوەیەک لە جەنگدا بوون. بەڵام دوایی پەیوەندیان لەگەڵ میسریەکاندا باش بووە و لە ١٤٠٠ پ.ز دا کچی پاشای میتانی کە ناوی ئەرتەتاما (Artatama) بوو درا بە پاشای میسر و ڕێکەوتنامەی ئاشتی لە نێوانیاندا مۆرکرا (Ramirez-Faria, 2007, p.321). پایتەختی میتانیە هوریەکان بریتی بوو لە شاری wassukanni/washukanni[34] کە ماناکەی لە زمانی کوردیدا وەک خۆی ماوە.
دوای هاتنی هیتیە نوێکان، وورده وورده دەسەڵاتی میتانیە هوریەکان لە سوریادا کز کرا و ئەو ناوچانە کەوتنە دەست هیتیەکان. ئیتر ئەوان دەسەڵاتیان زیاتر لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵاتدا بۆ مایەوە. هەروەها لەگەڵ هاتن و گەورەبوونی ئاشوریەکاندا، وورده وورده هوری و هیتیەکان دەسەڵاتیان کز بوو. تاوەکو بوونە ناوچەی دەسەڵاتی بچووک و لە ناوچە سەختەکانی دوور لە ئاشوریەکاندا، لە شێوەی دەوڵەتی بچووکدا حوکمیان دەکرد و زۆر لە ناوچە هوریەکان کەوتنە ژێر دەسەڵات و حوکمڕانی ئاشوریەکان.

## ڕەگەزی هوریەکان

گروپەکانی وەک مانی و میتانی و سوباری ڕەگەزەکەیان بە هوری دادەنرێت و لە هەمان کاتدا هەندێک جار مانیەکان بە کاسی و گوتیش دادەنرێن، واتا جۆرە تێکەڵیەک لە نێوانیاندا هەیە. ئەمەش زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەموویان، ئەگەر چی زمانیشیان هەندێک جیاوازی هەبووە، خاوەنی یەک فەرهەنگ بوون و هاوشێوەی کوردی ئەمڕۆ ئەوانیش هەر لە کۆمەڵێک زاراوە پێک هاتبوون و جیاوازیان کەم بووە.
هوریەکان بە خۆیان گوتووە xurrúγi و بە کاتی بەیانیان گوتووە xurri. ئەم دوو وشەیە لە زمانی کوردیدا مانای (خۆر، لە خۆر) دەدەن؛ پێ دەچێت کە ناوەکەیان لەو پرەنسیپەوە هاتبێت. وا دەردەکەوێت کە ناوەکە لە یەکێک لەو دوو بۆچوونەوە سەرچاوەی هەڵگرتبێت؛ یەکەم بەهۆی خۆر پەرستنیان کە ناوەکە مانای خۆر پەرستن دەدات، دووهەم لەبەر ئەوەی جێگای جوگرافییان، دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی سەنتەری دەسەڵاتی ئەو سەردەمە کە بابل بووە، ئەو ناوەیان وەرگرتبێت. ئەم جۆرە ناونانە لە شوێنەکانی تری جیهانیشدا هەبووە. بۆ نموونە ناوی ژاپۆن، کە خۆیان پێی دەڵێن (نیپۆن Nipon)، لە بنەڕەتدا ناوەکە چینیە و بریتیە لە Jih pun. ئەم ناوە مانای (سەرچاوەی ڕۆژ، وڵاتی ڕۆژهەڵات) دەدات، ناوەکە لە بنەڕەتدا پەیوەستە بەوەی کە ژاپۆن کەوتبووە ڕۆژهەڵاتی وڵاتی چینەوە (Hildreth, 1860, p.2).
هەروەها دەبێت ئەوەش بزانرێت کە سیمبوڵی هوریەکان بریتی بوو لە خۆرێک لە نێوان دوو باڵدا. لەبەر ئەوە دەشێت مانای خۆر پەرستیشی دابووبێت. بۆیە دەشێت کە ناوی هوریەکان لە مانای (خۆرپەرست، ڕۆژهەڵاتیەکان) ەوە هاتبێت.

---

[33]. پێش هاتنی هیتیەکان (Hittites) نەتەوەیەک لە سەنتەری ئەنەتۆلیا نیشتەجێ بوون بە ناوی Hiittians کە لەوان جیاواز بوون. دوای هیتیەکان لە ڕاستیدا ناوەکەیان لە ناوچەی هیتیە کۆنەکانەوە وەرگرت کە بە خاکی هاتی ناسرابوو (The land of Hatti).

[34]. لە بنەڕەتدا ئەو شارە لەلایەن میتانیە هوریەکانەوە بە شێوەکانی wassukanni/washukanni ناوهێنراوە کە پایتەختیان بووە، بێرتمان (Bertman) ئەو شارە بە (تل فخردين) دەخەمڵێنێت (Bertman, 2005, p.31) کە دەکەوێتە نزیک ناوچەی (سەری کانی) ئەمڕۆ. هەردوو پێکهاتەی ناوەکە کە بریتیە لە (wassu/washu+kanni)، لە بنەڕەتدا تێکەڵێکی وشەی سۆمەری/لوڤی/هیتی/لیدین. ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا بریتی بووە لە aš̌sa، هیتی assu، لوڤی wasu و لیدی wiśśi کە مانای (باش/خاس) دەدا و بە شێوەکانی باش/وەش/خاس (uaš/bāš/xās) لە کوردی نوێدا ماوە. بەشی دووهەمی وشەکە کە بریتیە لە kanni لە وشە لێکدراوە هیتیەکانی پەیوەست بە مانای (کانی) کوردی دەردەکەوێت. واتە لە کوردی کۆندا بیرت بووە لە (خاسە/وەشە/خۆشە کانی). ئەوەی کە ئەو ڕاستیە دووپات دەکاتەوە ئەوەیە کە سەرچاوەیەکی ناوی گەورە لەو ناوەدا هەیە کە دەڕژێتە ڕووباری خاپورەوە. لەگەڵ کاتدا کورد ناوەکەی کردۆتە (سەری کانی) کە ئەویش پێکهاتووە لە (سەر+کانی) و هەردووکیان وشەی کوردی/هوری/هیتی/میدین. لەبەر ئەوەی کە هەموو ماناکانی وشەی (سەر) لە زمانەکانی میدی و هیتی و کوریدا ماون (بڕوانە فەرهەنگەکانی سۆمەری، هوری، هیتی، لوڤی، میدی، لیدی). عەرەبەکان لە سەردەمی نوێدا وەک بەشێک لە تەعریبکردنی ناوچەو کوردیەکان، ناویان ناوە (راس العين) کە هەر تەرجومەی (سەری کانی) کوردیە.

ناوی (هوری Hurri) لە بنەڕەتدا ئاماژەیە بۆ ناوچەیەکی جوگرافی کە بە بەشی باکوری مێسیۆپۆتامیا گووتراوە. بۆیە لە کاتێکدا ئەو ناوە ئاماژەیە بۆ ناوچە، دڵنیا نیە کە ئاماژەش بێت بۆ زمانێکی تایبەت. بەڵگەی مێژوویی هەیە کە زمانەکەیان بە ناوی تریش ئاماژەی بۆ کراوە بۆ نموونە (میتانی Mittani) (Woodard, 2008, p.82). لەوە ناچێت کە لە ڕووی ڕەگەزەوە هیچ جیاوازی لە نێوان هوری و گوتیدا هەبێت، تەنها هۆکاری ناوچەیی ناوەکەیانی گۆڕیوە. لای مێژوونوسان زۆر جار مانیەکان و میدەکان بە گوتی دانراون، لە هەمان کاتدا مانیەکان بە هوریش دانراون .ئەم ناوانە بەشێوەیەک تێکەڵ کراون، زۆر زەحمەتە بتوانرێت بە ڕوونی هەر یەکەیان دەستنیشان بکرێت. ئەوەی کە ڕوونە، بەپێی بەڵگە زمانەوانیەکان، هوریەکان هەر بەشێوەیەکی زمانی کوردی قسەیان کردووە .

**زمانی هوریەکان**

ئەمڕۆ زمانی هوریەکان نە بە هیندۆئەوروپی نە بە سامی دانانرێت و هاوشێوەی سۆمەری نەخراوەتە خانەی هیچ گروپێکی زمانەوانیەوە, بەڵام هەندێک هەوڵ دراوە بۆ دۆزینەوەی کۆمەڵێک هاوبەشیی وشەسازی لە نێوان زمانی هوری و هیندۆئەوروپیدا. سەرەڕای ئەو هەوڵانە جگە لە چەند وشەیەک نەبێت، کە لەلایەن هەندێک لێکۆڵەری کوردەوە بە شێوەیەکی لاوەکی باسیان لێوە کراوە، هیچ هەوڵێکی جدی نەدراوە بۆ لێکۆڵینەوە لە پەیوەندی نێوان زمانی کوردی و هوری. لە ڕاستیدا پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان هوری و کوردیدا هەیە و بە تایبەتی هەندێک لە وشە هوریەکان لە زمانی کوردیدا وەک خۆیان ماونەتەوە و هەندێکی تریان گۆڕانکاری کەمیان بەسەردا هاتووە.

(وێنەی ٧) نامەی پاشای میتانی، توشراتا بۆ پاشای میسر، ئەمێن هۆرێبی سێ، مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی چواردەی پێش زایین.

بۆ نووسینی زمانی هوری، بە زۆری سیستمی ئەکەدی بۆ نووسین بەکارهاتووە. هەندێک لە تێکستەکانی ناوچەی ئۆگاریت بە ئەلف و بێی ئۆگاریت (Ugaritic alphabetic) تۆمارکراوە. لەبەر ئەم هۆیە زۆر زەحمەتە کە وشە هوریەکان بە شێوەیەک تۆمارکرابێت کە گووترابن (Woodard, 2008, p.84). بۆ نموونە ئەگەر وشەی ئینگلیزی ئەمڕۆ بە پیتی عەرەبی بنووسرێت، ئەوا زەحمەتە وشەکان وەک خۆیان بنووسرێن و هەندێک پیت لەوانەیە لەو پرۆسەیەدا بگۆڕێت یان لاببرێت.

پێ دەچێت زۆر لە مێژەوە هوریەکان نووسینیان هەبووبێت، سەرەڕای ئەوە بەڵگەوە کۆنترین تێکستی هوری کە هەتاوەکو ئەمڕۆ دۆزرابێتەوە، بریتیە لە کۆمەڵێک تێکستی بچووک کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠٠پ.ز.-١٥٠٠پ.ز. ئەم تێکستانە زۆربەیان کورتن و لە ناوچەکانی وەک بابل و ماری دۆزراونەتەوە. گرنگترین تێکست بۆ لێکۆڵینەوە لە زمانی هوری بریتیە لە پێنج سەد دێڕ کە پاشای میتیانی لە نزیکی ١٣٥٥ پ.ز دا بۆ پاشای میسری نووسیوە (Woodard, 2008, p.82) (بڕوانە وێنەی ٧). جگە لەمە بە سەدان تێکست لە نزیک شاری کەرکوک، لە شوێنەواری شارێکی هوری کە بە (نوزی Nuzi) ناسراوە، دۆزراونەتەوە؛ ئەمانە بەشی زۆری ئەو تێکستە هوریانەن کە دۆزراونەتەوە. هەروەها کۆمەڵێک تێکست دۆزراوەنەتەوە کە بریتین لە گۆرانی ئاینی کە بە نۆتەی مۆسیقاوە نووسراون. ئەم تێکستانە لە ناو ئاسەواری شاری (ئوگاریت Ugarit) (لازقیەی ئەمڕۆ) دا دۆزراونەتەوە و مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٤٠٠ پ.ز . لەڕاستیدا چەندین تێکستی تر لە ناوچەی جیاجیادا دۆزراونەتەوە، بەڵام ئەوانەی کە باسکران گرنگترینیان بوون.

لە زمانی هوری و لە ناوچە جیاجیاکانیاندا ژمارەیەک زاراوەی جیاواز هەبووە. ناوچەی نیشتەجێ بوونیان ناوچەیەکی بەرفراوان بووە، کەچی هەموویان بەیەک زمان قسەیان کردووە و ئەمڕۆ هەموویان هەر بە هوری دادەنرێن. دوو زاراوەی سەرەکی هوری دەستنیشان کراوە، یەکەمیان بە میتانی ناو دەبرێت و ئەوی تریان بە هوری کۆن (Woodard, 2008, p.83).

(وێنەی ٨a و ٨b)
وێنەی هەڵکەندراوی خوای گەردەلولی هوریەکان، تێشوب/تاشوب، لەگەڵ وێنەی دەستکردیی هەمان خوای گەردەلول .

لە زمانی هوریدا چەند وشەیەک هەن کە بە بەراورد بە زمانی کوردی، زۆر کەم گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. بۆ نموونە لەبری وشەی (ئازا) ی کوردی ئەوان دەڵێن ada. لەوانەیە ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بە aza خوێنرابێتەوە، لەبەر ئەوەی کە ناوی پاشای مانیەکان کە هەر هوری بوون، بە ئەلفوبێی ئاشوری بە aza نووسراوە. وشەی agul مانای (ئەکۆڵێ) ی کوردی دەدات، هەروەها al لەبری (ئەڵێ) ی کوردیە. یان وشەی alilan ی هوری هەمان (ئەلایلان، لەیلایە) ی کوردیە کە بۆ شینکردن و لاڵانەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ ماوە و نزیکیشە لە سۆمەری.

یەکێک لە خوا گرنگەکانی هوریەکان ناوی Tesub/Teiseba بووە کە خوای با/ڕەشەبا (storm God) بووە. دەشێت بنەچەی ناوەکە هەر لە زمانی کوردیدا مابێت لەبەر ئەوەی کە لە کوردیدا وشەکە مانایەکی نزیکی لە سروشتی ئەو خوایە هەیە و دەبێتە (تاشیەبا (تاشیە+با)). بەرچاوکردنی ئەوەی کە زۆرجار پیتی (س) لە زمانەکانی سۆمەری، میدی، هوری و هیتیدا دەبێتە (ش) لە کوردیدا و بە پێچەوانەشەوە، وشەکە ماناکەی دەبێتە (ئەو بایەی کە دەتاشێ/دەبڕێت). جگە لەوە ئەو ئامێرە تیژەی کە لە کوردەواریدا شەکری پێ دەشکێنرێت پێی دەگوترێت (تەشوێ) کە هەر لە ڕەگی وشەی (تاش) وە هاتووە و ئەو وشەیە لە ئاڤێستاشدا بە هەمان مانا هاتووە. ئەگەر سەرنجی وێنەی (خوای با) بدرێت، دەبینرێت ئامێرێکی شێوە (تەشوێ) ی بە دەستەوەیە (بڕوانە وێنەی ٨a و ٨b).

پاشگری (وان) کە لە کوردیدا بۆ پیشە (پراکتیزەکردن) بەکاردێت بۆ نموونە (شێرەوان، شاخەوان، دارەوان، مەلەوان). ئەم پاشگرە لە زمانی هوریدا، بەهەمان مانا و بەکارهێنان، هەیە. بە هوری دەگووترێت assuwanni کە بە کوردی دەبێتە (ئەسپەوانی). وشەکە پێک دێت لە (assu+wanni). وشەی (زێڕ) لە نێوان کوردی، میدی و هوریدا هاوبەشە. وشەی (ئاگر) ی کوردی لە زمانی هوری و میدیدا بە نزیکی وەک یەکە. پاشگری (گەری) کوردیش لە ناو هوریەکاندا وەک خۆی بە مانای (پراکتیزەکردن) هاتووە. بۆ نموونە tadugari مانای هاوڕێیەتی دەدات کە لەوە دەچێت لە (جووت گەری) وە هاتبێت. هاوشێوەی (زەرەنگەری، ئاسنگەری) وەک پاشگری پراکتیزەکردن بەکارهاتووە. لە وشەیەکی وەک mištanni هوریدا کە مانای (مژدانە) دەدات لە کوردیدا، بە ڕوونی دەردەکەوێت کە وشەکە پێکاهتووە لە (مشتە+انی) و ئەمڕۆ لە کوردی نوێدا دەبێتە (مژدە+انە) کە وشەکەش و پاشگرەکەشی، گۆڕانکاریەکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەبینیوە.

یەکێک لەو تایبەتمەندیانەی زمانی هوری ئەوەیە کە پاشگری i (ی) دەخرێتە دوای وشەکانیانەوە. ئەم پاشگرە لە ناوچەکانی هەولێر، کۆیە، ڕانیە، قەڵادزێ، موکریان و هەندێک ناوچەی کرمانجی سەرودا دەردەکەوێت. بۆ نموونە لەو ناوچانە دەگووترێت (من دەچم نانی دەخۆم). پاشگری (ی) لە زۆر ناوچەی تردا بەکارنایەت و دەگووترێت (من دەچم نان دەخۆم). ئەمڕۆ ئەو ناوچانەی کە ئەو پاشگرەی تێدا بەکاردەهێنرێت، بە درێژایی مێژوو ناوچەی هوریەکان بووە و وا دەردەکەوێت کە هەر هەمان پاشگر بێت کە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت.

بەداخەوە ئەو هەوڵە زۆرەی کە لەگەڵ زمانی سۆمەری و هیتیدا دراوە، لە بەرامبەردا هەوڵێکی کەم لەگەڵ زمانی هوریدا دراوە و سەرچاوەی کەم سەبارەت بە زمانەکایان هەیە. ئەو سەرچاوانەی کە هەشن بەشێکی زۆریان ئەڵمانین، بۆیە نەتوانرا بە پڕی کار لەسەر زمانی هوری بکرێت. سەرەڕای ئەوە، لەو سەرچاوە کەمانەی کە چنگ کەوتوون، دەردەکەوێت کە زمانی هوری پێکهاتەیەکی تری زمانی کوردیە. لە فەرهەنگە هوریەکەدا دەردەکەوێت کە زمانی هوری پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵ زمانی سۆمەری و هیتی و میدیشدا هەیە. هەروەها پەیوەندیشی لەگەڵ زمانە هیندۆئەوروپیەکانی تردا تێدا بەدی دەکرێت.

# فەرهەنگی هوری - کوردی

| وشەی هوری | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| abri | کۆمەڵە داری براوە stock of wood-logs | bir بڕ: لە کوردیدا مانای (کۆمەڵێک داری بڕاوە) دەدات کە ماناکەی نەگۆڕاوە، بۆ نموونە دەگووترێ (ئادەی بڕێک دارم بۆ بێنە). لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا بە مانای (درەخت) دەردەکەوێت، بۆ نموونە بە فەرەنسی arbre و ئیتالّی albero. |
| abuldann | دەرگەوان gatekeeper | āualdān ئاوەڵدان: لە کوردیدا (ئاوەڵا) مانای کراوە دەدات. بەڵام لە سۆمەریدا abula مانای (دەروازە) دەدات. (دان) لە کوردیدا پاشگرێکیشە کە لە وشەکانی وەک (ئاودان، دەرس دان) دا دەبینرێت. بۆ (ئاودان) ئاو دەدات و بۆ (دەرس/وانە) وانە دەدات. بەوجۆرە وشەی (ئاوەڵدان) بۆ کەسێکە کە ئەرکی مامەڵەکردن لەگەڵ دەرگە یان کردنەوەی دەرگە بێت. |
| ábuluski | دەرگەوان doorman | āualāeškī ئاوەڵا ئێشکی: (ئاوەڵا) لە کوردیدا مانای کراوە دەدات و (ئێشک) مانای (ئێشکگرتن و پاسەوانی دەدات). بەو جۆرە وشەکە مانای (ئیشکگری دەرگا) دەدات. |
| ada | بەهێز، بەتوانا strong, powerful | āzā ئازا: ئازا لە کوردیدا مانای (بوێری، بەهێز، بە توانایی) دەدات. یەکێک لە پاشای مانیەکان ناوی aza بووە کە لە سەدەی نزیکی ٨٠٠ پ.ز دا لە ناوچەی ورمێ حوکمی کردووە و زۆر لە مێژوونوسان مانیەکان بە هوری لە قەڵەم دەدەن. (بڕوانە پەیوەندی زمانی مانیەکان و کوردی). ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە esi و haza لە زمانی ئاڤێستادا مانای (هێز) دەدات. |
| adali | بەهێز strong | zālī زاڵی: لە کوردیدا (زاڵ) مانای (سەرکەوتوو بەسەر مەبەست یان دوژمن) دەدات. (زاڵی) دەبێتە (ئاوەڵکردار). لە سۆمەریدا zal مانای کەسێکی نایاب دەدات. |
| adirya | بوون لە ناو کێشەدا (being) in conflict | turaīī, dirī تورەیی، دری: (تورەیی) واتە بوون لە حاڵەتێکی ناڕازی بوون و گرژیدا. (دری) مانای (کەس یان ئاژەڵێکی پەلامارەدەر و هەڵەشە) دەدات، هەروەها (دری) مانای (شەرمەزاری) دەدات (هەژار، پ. ٢٩١) |
| adi | بەوجۆرە، کەواتە thus | adī ئەدی: لە کوردیدا دەگووترێت (ئەگەر حەزت لێرە نیە ئەدی چی دەکەیت لێرە) کە ماناکەی دەبێتە (کەواتە). |
| adzam(m)i | پەیکەری بچووکی مرۆڤ figurine | ādam ئادەم: ناوەکە لەوە دەچێت کە لە (ئادەمی) وە هاتبێت. ئادەم لە لای سۆمەریەکان ناسراو بووە و دوایی چووەتە ئاینەکانی جو، کریستیان و ئیسلامەوە. سۆمەریەکان پێیان وابووە adamu بریتی بووە لە یەکەم مرۆڤ کە خوا فێڵی لێ کردووە و نەمری لێ شاردووەتەوە. چونکە نەیویستووە کە ئەو وەک خواکان نەمر بێت . لەبەر ئەوە پێی گوتووە کە میوەی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەمری ژەهراویە، ئیتر نەیخواردووە. بۆیە ئادەم و وەچەکانی دوای خۆی دەرفەتی ئەمریان لێ وەرگیراوەتەوە (Chopra, 2005, p.7) |
| agri | ئەو شتانەی کە بۆ مەبەستی بۆنکردن دەسووتێنرێن<br>incense | āgir ئاگر: پێ دەچێت هوریەکان وشەی (ئاگر) کە ناوە، کردبێتیانە (ئەگرێ) واتە ئەسوتێ. بە زمانی سۆمەری بە (تەنور، خوای ئاگر) دەڵێن gir و بە کلپە دەڵێن ĝir . ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا وشەکانی (ئاگر،ئاور ، ئاهر، ئایەر، ئاتەر) هەمان مانای ئاگریان هەیە (هەژار، پ.٩) . وشەی ئاگر لە ئینگلیزیدا بووەتە fire و لە هۆڵەندیدا vuur و سوتاندن لە ئیسپانیدا دەبێتە ardor کە هاوبەشی لەگەڵ سۆمەری و هوری و کوردیدا هەیە. |
| agugar | حەواڵەکردن<br>dispatch | āgāīār/āgāugār ئاگایار/ئاگاوگار: مانای (ئاگادارکردنەوە) دەدات. |
| agul | کۆڵین<br>to carve | kol/akol ئەکۆڵ/کۆڵ: (ئەکۆڵێ، کۆڵین) هەمان مانای هەیە. لە سۆمەریدا gul یەکێک لە ماناکانی دەبێتە (کۆڵین). |
| aguurni | کۆڵین و کران<br>carving | kirān, gurīn کران، گورین: (کران) وەک خۆی ماوە و لە ئینگلیزیدا بووەتە carving. گورین بە مانای (سەر برین، پێست لێکردنەوە، کەوڵکردنی ئاژەڵ) دێت. |
| ahari | سوتاندن<br>to burn | āīar/āhīr ئاهیر، ئایەر: هەمووی مانای (ئاگر) دەدەن. لە کوردیدا نەگۆڕاوە. لە ڕاستیدا ئەو وشانەی ئەمڕۆ لە کوردیدا بۆ ئاماژەکردن بە ئاگر (ئایر، ئاگر، ئاتەر) بەکاردەهێنرێن، بنەچەکەیان لە سۆمەری و میدی و هوریدا هەن. میدی atr، لە سۆمەریدا gir/girra خوای ئاگرە ur مانای (سورکردنەوە) دەدات. لە ئاڤێستادا دەبێتە âtar. |
| aheli | ڕزگار کردن<br>to save | ahele ئەهێڵێ: لە کوردیدا دەگووترێت (ڕاوکەرەکە هەموو گیاندارەکانی کوشت، تەنها یەکێکیانی هێشتەوە/هێڵایەوە). لەوێدا (هێشتەوە/هێڵایەوە) مانای to save ی ئینگلیزی دەدات. |
| ái | ئەگەر تەنها<br>if only | āī ئای: لە کوردیدا دەگووترێت (ئای بمتوانیایە گەشتێکی چاکم بە دنیادا بکردایە) کە هەمان مانا دەدات. |
| aja | ژنی شمێگی (شمێگی گەورەی خۆرە)<br>wife of Šimegi (Šimegi is the master of the sun) | āīa/ādā/āīā ئایە/ئایا/ئادا: (ئایە) مانای (پور) دەدات (هەژارP.17) و<br>لە زاراوەی هەورامیدا (ئایە، ئادە)[35] مانای دایک دەدات. |
| aku, ako | ئەوی تر<br>other | auaka/auaīka ئەوەکە/ئەوەی کە: هەر هەمان مانای هەیە. |

[35] دەنگی پیتی ( د) یان (ی ) لە هەورامی و لەو وشەیەدا دەنگێکە کە هەتا ئێستا پیتێکی بۆ نەدۆزراوەتەوە. دەنگەکە دەکەوێتە نێوانی ( د ) و(ی). هەندێک لە هەورامیەکان ( د ) دەنوسن و سێ خاڵی لەسەر دەکەن.

| | | |
|---|---|---|
| al | قسەکردن (کردار)<br>to speak | ale ئەڵێ: هەمان مانای ماوە. |
| aláli | جۆرێکە لە جلوبەرگ<br>a kind of clothes | āluālā ئاڵوالا: مانای (جلوبەرگی ڕەنگاوڕەنگ) دەدات. گۆرانیەکی باخچەی ساوایان دەڵێت (منداڵە و خۆی گۆڕیوە، ئاڵو والای پۆشیەوە). |
| äli | خوشک<br>sister | uāle, uāla والێ، واڵە: هەمان مانا دەدەن (هەژار، پ.٩٠٦). |
| alilan | هاوارکردن، گریان، شیوەن<br>to shout, cry, lament | lāuānaua, laīlāīa,uāuaīlān لاوانەوە، لەیلایە، واوەیلان: لە کوردیدا (لاوانەوە) مانای شینکردن دەدات. (لەیلایە) گۆرانی گوتنە بۆ منداڵان و لەلایەکی ترەوە شینکردن و گریان و کڕوزانەوەیە بۆ مردوو. هەروەها دەگووترێت (شین و واوەیلانیەتی) کە ئاماژەکردنە بۆ (شینکردن و گریان). بەسۆمەریش بە جۆرێک لە شینکردن دەگووترێت ilu و لە زمانی هیتیدا دەبێتە lahlahhima . بە زمانی لاتینی شیوەن دەبێتە eiulo و بە ئینگلیزی دەبێتە wail. |
| alipsi | خشت (هی دیوار دروستکردن)<br>brick | halapase هەڵەپەسێ: دەبێتە ڕەگی (هەڵپەسێران) کە لە کوردیدا مانای شتێک پاڵدا بەشتێکی ترەوە .ئەمەش لەگەڵ سروشت و ڕۆڵی خشت لە دیوار دروستکردندا دەگونجێت و دەشێت ناوەکەی لەو سەردەمەدا ئەوە بووبێت. halbastin (هەڵبەست) وەک کردار بە مانای (دروست کردنی دیوار) بەکار دەهێنرێت. دەگوترێت 'دیوارێکی پتەوی هەڵبەست'. |
| amma | وشەی منداڵانەیە: (بۆ ئاماژە بە دایک، نەنک)<br>nursery word: ‘mother, grandmother’ | āma ئامە: لە کوردیدا وشەیەکی ترە بۆ ئاماژەکردن بە دایک (هەژار، پ.١٢)، بە زمانی سۆمەریش مانای دایک دەدات و زۆرجار لە زمانی سۆمەریدا ئەو ناوانەی کە پەیوەندیان بە ئافرەتەوە هەبێت ئەو وشەیەیان لەبەردەمدا دەبێت. |
| an | خۆشی بینین<br>to rejoice | xan خەن: دەبێتە ڕەگی (خەنین) کە مانای پێکەنین و خۆشی بینین دەدات. |
| andzannuγ | پرسیارکردن<br>to ask | azānī ئەزانی: کە پرسیارکردنە. |
| anni | ئەمە<br>this | āna/aua ئەوە/ئانە: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکە هەیە و ماناکەی نزیکە. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە ane بە مانای (ئەو). |
| arandzah | ڕووباری دیژلە (دیجلە)<br>the Tigris River | aluandze ئەڵوەند زێ: زێی ئەڵوەند زێیەکی گەورەیە کە بە شارۆچکەی خانەقینا تێدەپەڕێ و پێکهاتەیەکی گرنگی ڕووباری دیجلەیە و دەشچێتە سەر دیجلە. هەروەها لە زمانی سۆمەریدا zubi مانای (زێ) ی کوردی دەدات.لە ڕاستیدا بە هەڵە وا دەزانرێت کە ناوی ڕووباری دیژلە عەرەبیە، بەڵام ئەوە دوورە لە ڕاستی، لەبەر ئەوەی کە چەند سەرچاوەیەکی یۆنانی پێش هاتن و بوونی عەرەب لە ناوچەکەدا ئاماژەیان پێ |

| | | |
|---|---|---|
| | | کردووە. پلینی لە کتێبەکەیدا the natural history لە ئاماژەدا بە ڕووباری دیجلە دەڵێت "ڕووبارەکە لە سەرەتای دەستپێکردنی هاتنە خوارەوەیدا، هەرچەندە خاوە، ناوی Diglito[36] ی هەیە، بەڵام دوایی کە ڕەوتی ڕووبارەکە خێرا دەبێت ناوی Tigris وەردەگرێت، کە لەبەر خێراییەکەی ئەو ناوەی پێ دراوە، ئەو وشەیە بە زمانی میدی مانای تیر دەدات" (Pliny, 1890, p.75). ئەمە دڵنیای دەکات کە ناوەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ماناکەی پەیوەندی بە خێراییەوە هەبووە. لەبەر ئەوەی کە پلینی دەڵێت "هەرچەندە خاوە بەڵام ناوی (دیژلیتو) ی هەیە". وەک پلینی ڕوونی دەکاتەوە، وشەی (tigr) بە زمانی میدی مانای (تیر) دەدات، یۆنانیەکان پیتی (س) دەخەنە دوای هەموو ناوێك و ناوەکەیان کردۆتە Tigris. ئەم ناوە لەگەڵ ناوی (دیژلیتو) بەکارهاتوون بۆ ئاماژەکردن بەو ڕووبارە، بەو جۆرە ناوەکە لە دوو ناوچەی کوردستاندا دوو ناوی جیاوازی کوردی هەبووە و هەردوو ماناکەش پەیوەست بووە بە تیژیەوە. Tigris کە ناوە ئەوروپیەکەیەتی بنەچەی کوردی/میدیە و بە داخەوە گران دەبێت کە بتوانرێت ناوی (دیژلیتو) ڕوونبکرێتەوە، سەرەرای ئەوەی کە وشەی (تیژ) لە سەرەتای وشەکەدا دەردەکەوێت و لەوە دەچێت (تیژلا) بێت، هەرچۆنێک بێت ئەمڕۆ هەردوو ناوەکەی ماون و لە ناو ئەوروپیەکاندا پێی دەڵێن Tigris و لە ڕۆژهەڵاتیشدا پێی دەگووترێت (دیجلە). |
| arbi | سەگ<br>dog | uar وەر: دەبێتە ڕەگی (وەڕین)؛ وشەیەکە بۆ ئەو دەنگەی کە سەگ دەیکات. بە زمانی سۆمەری بە سەگ دەگووترێت ur کە پەیوەندی لەگەڵ هوری و کوردیدا هەیە. |
| ardi | شار<br>town | ard, arz ئەرد، ئەرز: کورد ئەم وشەیە بەکاردەهێنێت بۆ ئاماژەکردن بە (زەوی) یان کێڵگە. لە سۆمەریدا بە (ئەرز، عەرد) ی کوردی دەڵێن uraš. ئەم وشەیە لە زۆر لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا هاوشێوەیە و بە ئینگلیزی دەبێتە earth، بە دانیمارکی و سویدی و نەرویجی jord و بە هۆلەندی aarde و بە ئەڵمانی erde. |
| asi | چەوری، ڕۆن<br>grease, fat | hīza هیزە: دەفرێکە لە پێست کە بۆ ڕۆن و پەنیر هەڵگرتن بەکاردەهێنرێت (هەژار،پ.١١١٦). لە زمانی سۆمەریدا išah مانای (چەوری ناو سکی بەراز دەدات). |
| assuwanni | ئەسپ سواری<br>(ئەسپەوانی)<br>horse riding | asuauānī/ aspauānī ئەسوەوانی/ئەسپەوانی: ئەم وشەیە لە کوردیدا پێکهاتووە لە (ئەسپ+وان+ی). (ئەسپەوان) بە تەنها لە کوردیدا ئەو کەسەیە کە سواری ئەسپ دەبێت، بە پاشگری(ی) وە دەبێتە پراکتیزەکردنی ئەسپ سواری. وەک دەردەکەوێت لە هوریشدا هەمان سێ پێکهاتە، وەک ئێستا بووە. |

36. دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکرێت کە یۆنانی و ڕۆمانەکان سەرەرای تۆمارکردنی زۆر ووردەکاری سەبارەت بە ناوچەکە بەڵام ناوەکانیان زۆرجار بە شێوەیەک گۆڕیوە کە ناناسرێنەوە.

| | | |
|---|---|---|
| | | زۆر وشەی تری کوردی هەیە لەسەر ئەم بنەما هوریە دارێژراوە (شێرەوانی، شاخەوانی، دارەوانی، پاڵەوانی، پاسەوانی). |
| aššuššanni | ڕاهێنەری ئەسپ<br>horse-trainer | asuauasen/aspuasen ئەسوە وەسێن/ئەسپ وەسێن: ئەم وشەیە پاشگرەکەشی هەر کوردیە و هاوشێوەی هەیە لە کوردیدا نموونە (مەلابەزێن، باوەشێن) و مانای وشەکە دەبێتە (ئەو کەسەی کە ئەسپ ڕادەگرێت/کۆنترۆڵ دەکات). دەبێت لەبیرمان نەچێت کە ئەم وشەیە، نزیکەی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر نووسراوە و ڕاهێنانی ئەسپ شتێکی نوێ بووە و ئەسپ وەک گیاندارێکی کێوی بینراوە. لەبەر ئەوەی ڕاگرتنی ئەسپ و وەستاندنی جۆرێک بووە لە توانا و کارامەیی و خەڵکی تایبەتمەندی هەبووە. لە میدیدا بە کەسێکی ئەسپ ناس دەگووترێت asp-vaiθana. لە سۆمەریشدا هاوشێوەی ئەو وشەیە دەبێتە gude'usa کە ماناکەی دەبێتە ((گاوێسە) ئەو کەسەی کە ڕەوە ئاژەڵ/گا دەبات). (بڕوانە (وشەی (ئەسپ) sisi لە زمانی سۆمەریدا)، (زمانی هیتی و ڕوونکردنەوەی تێکستەکەی کەیکۆلی). |
| ašti | ئافرەت<br>woman | āštī ئاشتی: ئەوەی کە مایەی سەرنجە ئەم وشەیە ئەمڕۆ لە کوردیدا مانای (پێچەوانەی شەڕ) دەدات. بە زمانی سوپاریەکان (Subarean)[37]، بە ئافرەتیان گووتووە aštu. بەڵام وشەکە بە زمانی لوڤی بە شێوەی aššata دەنووسرێت و وەک زمانی کوردی ئەمڕۆ مانای (پێچەوانەی شەڕ) دەدات. لە ئاڤێستاشدا âxshti هەمان مانای وشە کوردیەکەی هەیە. دیارە لە بنەچەدا وشەکە بۆ ئاماژەکردن بە ئافرەت بەکارهاتووە و دوایی مانای (ئاشتی) ئەمڕۆی وەرگرتووە. |
| aštugari | هاوتایی، بەرامبەر یەک (مرادف، معادل)<br>equivalent | āstugarī ئاستوگەری: واتە (کارکردن لەسەر ئاست) کە هەمان مانا دەدات. |
| ata | باوک<br>father | tāta تاتە: بە زاراوەی هەورامی مانای (باوک) دەدات و بە زمانی لوڤی دەبێتە tāta و لە لاتینیدا دەبێتە atta. |
| awari | کێڵگە، زەوی پاکراوە<br>field, steppe | hauār/uār, ār هەوار/وار،ئار: یەکێک لە ماناکانی (هەوار/وار) لە کوردیدا دەبێتە (زۆزان ، لەوەرگەی سروشتی). (ئار) بەمانای (جێگە، جێ نسێ، هەوار، جێ هەوار، شار، شوێنی گەورە) دێت (هەژار. پ.٣) |
| azuγi | ژەم، کاتی خواردن<br>meal, eating-time | ajue ئەجوێ: (جوین، ئەجوێ) وشەیەکە بۆ وەسفکردنی دانپێدانانی خواردن. لە زمانی لوڤیدا az مانای (کرداری خواردن) دەدات. ئەم وشەیە لە ئینگلیزیدا بووەتە chew و لە ئەڵمانی کۆندا بریتی بووە لە ceowan و ئێستاکە پێی دەڵێن |

[37]. (سوباری) یەکێک لە گروپە ڕەسەنەکانی نیشتەجێی کوردستان بوون و پێ دەچێت ناوچەی (زێبار) لەوانەوە ناوەکەی وەرگرتبێت.

| | | |
|---|---|---|
| | | kauen كە نزیكە لە (جوین jwīn) ی كوردی. |
| baban | شاخ<br>mountain | bābān, bān, babān بابان، بان، بەبان: وشەی (بان ) لە كوردیدا مانای (سەر، بەرز) دەدات. (بابان) ناوی یەكێك لە بنەماڵە ناسراوەكانی كوردستانە، كە سەنتەری دەوڵەت و دەسەڵاتدارێتی لە ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری بووە و بۆ سەدان ساڵ لەو ناوچەیە و دەروبەریدا حوكمڕانیان كردووە. لە ڕابردوودا شاخ پیرۆز بووە و دەشێت ناوەكە هەر لەوەوە هاتبێت. جگە لەوە هەتاوەكو ئەمڕۆ بنەچەی ناوی بابانەكان بۆ كەس ڕوون نەبۆتەوە و چەندین بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەیە. دەشێت ئەمە ماناكەی بێت. بە زمانی هیتیش بە شاخ دەگووترێت papan. وشەی (بەبان) لە كوردیدا مانای (بە بەرزیەوە) دەدات. |
| babanɣi | شاخاوی<br>mountainous | bābānī بابانی: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| baɣ | تێكشكاندن<br>to destroy | pīā پیا: لە كوردیدا دەگووترێت (پیادا، پیاكێشا). |
| bayri | باش، جوان<br>good, buitiful | bahār بەهار: وا دەردەكەوێت كە وشەی (وەرزی بەهار) لەو پرەنسیپەوە هاتبێت. |
| baz | چوونە ژوورەوە، هێنانە ژوورەوە<br>'(intr.) to enter ; (tr.) to bring (in) | uāz/bāz باز/واز: بە زمانی كوردی مانای (كراوە، ڕاكردن، هەڵاتن) دەدات (هەژار، پ.٤٤). بە زمانی سۆمەری bad مانای (كراوە) دەدات وەك زمانی كوردی و بە هیتی has مانای (كردنەوە) دەدات. لە ئینگلیزیدا بەشێوەی pass دەردەكەوێت كە ئاماژەیە بە (دەروازەی نێوان دوو شاخ). |
| bhe | پیاكێشان<br>to strike | pīā پیا: لە كوردیدا دەگووترێت (پیای یا/پیای دا/پیای كێشا) كە هەمان مانا دەگەیەنن. |
| buru | بەهێز<br>strong | buer بوێر: مانای (ئازا) دەدات و لە سۆمەریدا bur ئاماژەیە بۆ كەسێك كە (زاڵ بێت). |
| butki | كوڕ (منداڵی نێر)<br>son | backa بەچكە: مانای (منداڵ، بچووك) دەدات. |
| dumudzi | خوای دەموزید (تەموز) كە خوای داروودرەخت و مەڕوماڵاتە<br>the god Dumuzid (Tammuz); God of vegetation and livestock | tom žī تۆم ژی: ئەم وشەیە بە زمانی سۆمەریش پێی گوتراوە Dumuzi (Dumu-zi) و خوای داروودرەخت و مەڕوماڵات بووە. وشەی (ژی) لە كوردیدا هەر هەمان مانای (ژیان) دەدات، لە سۆمەریدا ئەم وشەیە دەبێتە zi. بەڵام لە وشە لێكدراوە هوریەكەدا وا دەردەكەوێت كە لە هوریدا بە شێوەی (dzi) تۆمار كراوە كە زۆر لە كوردیەكە نزیكترە، لەبەر ئەوەی كە لە بری پیتی (ژ) ی كوردی هوریەكان (dz) یان داناوە. هەروەها وشەی dumu لە سۆمەریدا مانای (منداڵ) دەدات و لە كوردیدا (تۆم) بە مانای (تۆو، تۆخم) بەكاردەهێنێت، بەو جۆرە وشەكە بە مانای ئەمڕۆی كوردی دەبێتە (تۆوی ژیان)، كە لەگەڵ مانای ئەم خوایەدا گونجاوە. میللەتە سامیەكان ئەم ناوەیان گۆڕیوە و كردویانەتە Tammuz. لەبەر ئەوەی كە وشەكە هی خۆیان نەبووە و |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەلای ئەوان zi مانای نەداوە، ناوەکەیان گۆڕیوە، بەڵام لە هوریدا وەک خۆی هێڵراوەتەوە. واتا لای هوریەکان مانای هەبوە. |
| endan | پاشا<br>King | xānadān خانەدان :لە کوردیدا ئەم وشەیە پێکهاتەی(خانە+دان )ە کە مانای (کەسێکی خاوەن ڕەسەنێتی و ڕابردوو) دەدات. |
| eše | خاک، زەوی<br>earth | haš هەش: لە کوردیدا (هەش بەسەر) مانای (قوڕ، خاک بەسەر) دەدات. بەو جۆرە وشەکانی (قوڕ، هەش) یەکن و لە زمانی سۆمەریدا aš sar جۆرێکە لە لەنەفرەتیکردن و وا دەردەکەوێت هەر (هەش بەسەر) بێت . لە هەندێک ناوچەدا هێشتا هەر دەگووترێت (هەش بەسەر). |
| eγeps | گرژبوونی ماسولکە<br>to contract (a muscle) | hez هێز: مانای (قوەت و توانا) دەدات و بە زمانی سۆمەری پێی دەڵێن usu. لە زمانی هیتیدا hazziya مانای پاڵنان دەدات و بە زمانی لوڤی wiši مانای پەستان دەدات. کە هەموویان لەیەک نزیکن و هاوبەشن لەگەڵ کوردیدا. |
| gib | دانان لە حاڵەتێکدا ، وەستان لە حاڵەتێکدا<br>to put, set | kip کپ: کە مانای (دەنگ وەستان، نەبیستنی گوێ، ئارامی) دەدات. |
| heldi | بەرزبووەوە یان بەرز<br>raised or high | halde, halder هەڵدێ، هەڵدێر: لە کوردیدا (هەڵدێ ) بە مانای (هەڵهاتنی خۆر، بەرزبوونەوە) دێت. بۆ نموونە (خۆر زوو هەڵدێ، هەویرەکە پاش کەمێک هەڵدێ). (هەڵدێر) بەمانای جێگایەکی بەرزایی و قیت لە شاخدا دێت. |
| haγli | ڕوومەت<br>cheek | āl ئاڵ: لە کوردیدا ڕەنگی سوری کاڵە و هەمیشە لە پاڵ ڕوومەت/کولم دا دێت. بۆ نموونە (تەماشا کولمی ئاڵی). |
| haigalli | کۆشک<br>Palace | haīkal هەیکەل: مانای بەژن و باڵای بەرز دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (پیاوێکی بە هەیکەل بوو). |
| hildi | نەشونماکردن، زیادکردن<br>to grow | halde هەڵدێ: (بڕوانە ڕوونکردنەوەی halde ). |
| hizi | بەردی ئاش<br>millstone | āšī ئاشی: (ئاش/ئاشی) ناوی ئەو شوێنەیە کە ئاردی لێ دەهارن. |
| han | منداڵ هێنان<br>give birth | hān هان: ئەم وشەیە دەبێتە ڕەگی (هانین) و هەمان مانای وشە هوریەکە دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو ژنە تازە دوو منداڵی هانیوە). لە سۆمەریدا ahan مانای (ڕشانەوە/هێنانەوە) دەدات کە ئەویش بە کوردی (هانینەوە) یە و هەمان مانایە. |
| hani | منداڵ<br>child | hānīu هانیو: هەر چەندە وەک کردار لە کوردیدا (هانی) بە مانای (منداڵ خستنەوە) دێت، بەڵام وەک ناو بەکار نایەت. وشەی (هانیو) لە کوردیدا ئەو شتە دەگرێتەوە کە هێنراوە و لەگەڵ کردارەکەدا دەگونجێت. وشەکە لە کوردیدا ماوە بەڵام ناکرێتە ناو کەچی لای هوریەکان کراوە. |

| | | |
|---|---|---|
| hári | ڕێ<br>road | re ڕێ: لە کوردیدا لە وشە هوریەکە نزیکە و لە سۆمەریدا دەبێتە ara و لە لوڤیدا دەبێتە harrwa و لە زمانی فەرەنسیدا بووەتە rue و لە ئینگلیزیدا بووەتە raod. |
| haš | گوێ لێبوون<br>to hear | has هەس: دەبێتە ڕەگی (هەسکردن) و مانای (دەرک پێکردن) دەدات و لە مانای وشە هوریەکەوە نزیکە. |
| Halbahe<br>(Halba+he) | هی حەلەبە<br>[مەبەست شاری حەلەبە]<br>belonging to Halab | halabī, hi Halab حەلەبی: دەبینرێت کە لە هوری و کوردیدا بە هەمان شێوەی پاشگرەکە بەکاردەهێنرێت.<br>هەروەها وشەکانی (هی حەلەب) هەر هەمان مانا دەدەن کە تەنها پێچەوانەکردنی شوێنی وشەکانە. |
| hers | جوڵەکردنێکی خێرا<br>to move quickly | haras, herš هەرس، هێرش: (هەرس) مانای (هاتنە خوارەوەی کتوپڕی بەفر، دارمانی کتوپڕ) دەگەیەنێت.<br>(هێرش) مانای (پەلاماردان) دەدات. لە زمانی هیتیدا harsiharsi مانای (ڕەشەبا) دەدات. |
| hijari | زێڕ<br>gold | zer, aīār عەیار، زێڕ: (زێڕ) هەمان مانا دەدات و لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە zar/zair و بە زمانی میدی دەبێتە zar و لە سۆمەریدا بە (برۆنز) دەگووترێت zabar. وشەی (عەیار) هەمیشە لەگەڵ زێڕدا باس دەکرێت و زێڕ تەنها کانزایە کە لە ناو هێنانیدا باسی (عەیار) دەکرێت و نرخەکەشی پەیوەستە بە عەیارەکەیەوە. وشەی (زێڕ) ئەمڕۆ لە زمانەکانی تردا دەبینرێتەوە . ئیسپانی و ئیتاڵی oro و پورتوگالی ouro و لاتینی aurum و فەرەنسی or و سانسکریت bharu. |
| hil | قسەکردن<br>to speak | ale ئەڵێ: ڕەگی وشەی (ئەڵێ) یە. لە هوریدا جگە لەم شوێیە al هەر هەمان مانای هەیە. لەوە دەچێت ئەم وشەیە لە ناوچەی جیاوازی هوریدا بە شێوەی جیاواز دانی پێدانرابێت. |
| hínnu | ئێستا/نهۆ<br>now | niho, naua, henuka نهۆ، نەوە، هەنوکە: هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی هیتیدا دەبێتە nu و لە ئاڤێستدا دەبێتە nû و بە ئینگلیزی دەبێتە now، دانیمارکی و سویدی و هۆڵەندی nu. |
| hizmí | بریقەدار، ڕۆشن<br>clear, bright | sīm سیم: هەمان مانا دەدات و ئەم وشەیە بە سۆمەری دەبێتە ašme. |
| hidzúɣ | توڕەکردن، گرژکردن<br>to anger, to vex | dižaīī دژەیی: کە مانای (دژایەتیکردن) دەدات و ماناکەیان زۆر نزیکە. |
| id | شکاندن<br>break | adā ئەدا: دەگووترێت (شوشەکە ئەدا بە زەویدا) کە مانای (شکاندن) دەدات. |
| id | لێدان<br>hit | adā ئەدا: هەمان مانای هەیە (لێ دە، ئەی دا بە زەویدا). ئەم وشەیە بە زمانی سۆمەری دەبێتە du کە هەردووکیان یەکدەگرنەوە لەگەڵ (ئەدا، دا) ی کوردیدا و لە زمانی لوڤیدا hata مانای (تێکشکاندن) دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە hit کە هەمان مانای هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| ija/ iji | کام (کامیان)<br>which | āīā ئایا: دەگوترێت (ئایا ئەمەیە یان ئەوەیە) کە مانای (کام/کامەیان) دەگرێتەوە. |
| inna | لە ساتێکدا<br>at some time | ān ئان: لە کوردیدا مانای (کات، دەم) دەدات. موفتی پێنجوێنی لە شیعرێکدا دەڵێت (هەموو ئان و زەمانێ عەینی قەڵغان و سوپەرتانە) کە کتومت مانا هوریەکەی ماوە. |
| inu, inna | ناوچە، دەڤەر<br>District | īān یان: (یان) لە کوردیدا هاوشێوەی هوری زۆرجار وشەکە پاشگرە. لە ناوەکانی وەک گەرمیان (گەرم +یان)، موکریان (موکر+یان)، دووڕێیان (دووڕێ+یان)..... ئەم پاشگرە لە کوردیدا هەمیشە بە مانای (دەڤەر، ناوچە، شوێن، ماڵ) بەکارهاتووە. هەروەها وشەکە بە تەنها لە کوردیدا بەشێوەی (یانە)، مانای (خانە) دەدات. بۆیە ئارامیەکان لە مێژوودا بە ناوچەی گەرمیان دەڵێن (بیت گەرمای)، بەوجۆرە ئەوان نیوەی ناوە کوردیەکەیان تەرجومە کردووە و نیوەکەی تر وەک خۆی بە کوردی ماوە. کاتێک کە ئاشوریەکان لە سەدەی نۆهەمی پێش زایندا هێرشیان برد بۆ ناوچەی سلێمانی و دەربەندی بازیانیان گرت، بەو دەربەندەیان گووت (باب بیت babite ) (Læssøe, 1963, p.134).<br>هەروەها هوریەکان ئەو پاشگرەیان بۆ زۆربەی وڵاتەکان بەکارهێناوە بۆ نموونە mázriani کە دەبێتە (میسریانی) مەبەستیان فیرعەونیەکان بووە.<br>ئەم وشەیە لە زمانی میدیشدا بە شێوەی yauna دەردەکەوێت کە مانای (شوێن) دەدات و لە کوردی نوێشدا هەر بە شێوەی (یانە) ماوە کە مانای (خانوو، شوێنی حەسانەوە) دەدات. |
| isxarini | خواردن<br>دروستکەر<br>cook | īš xārin ئیش خارن: وا دەردەکەوێت کە وشەکە ی īšxārinī کوردی بێت کە پێک دێت لە (ئیش+خواردن) واتە (ئەو کەسەی کە پیشەی خواردن دروستکردنە). ئەو ئەم بۆچوونە دووپات دەکاتەوە ئەوەیە کە سۆمەریەکانیش وشەی (ئیش) بە هەمان مانای کوردی بەکاردەهێنن. |
| isi | ئەسپ<br>horse | hasā هەسا: (بڕوانە وشەی ئەسپ (sisi) لە زمانی سۆمەریدا). |
| itsuri | ڕاکەر (ئەو کەسەی کە ڕادەکات)<br>runner | zorī زۆری: (زۆر) لە کوردیدا مانای (هێز و توانا) دەدات و لەگەڵ سروشتی ناوەکەدا دەگونجێت. لە کوردیدا (زۆران) ئاماژەیە بە وەرزشێکی کۆنی کوردی کە لە نێوان دوو کەسدا دەکرێت بۆ یەکخستن بە زەویدا. و بەوجۆرە دەبینرێت وشەکە هەمیشە پەیوەندی لەگەڵ هێز و توانا و وەرزشدا هەیە. لە زمانی سۆمەریدا sur مانای (فشار خستنە سەر و گووشین) دەدات و لە ئاڤێستادا sûra مانای (بەهێز و بەجەرگ) دەدات. |
| íw(i)ri | سەرگەورە، پاشا<br>lord, king | uer ,urīā وێر، وریا: (وێر) مانای (ئازا، ئازایەتی) و (وریا) مانای کەسێکی (زرت و زیرەک) دەدات. لە سۆمەریدا uru مانای (ئازا، بەهێز، زیرەک) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| iwuru | میراتگر<br>heir | uer,uār ویر، وار: (ویر) ئەو پارەیە کە کەسێک بۆ کەسێکی تری دەدات وەک پیاوەتی. (وار) ئەو پارەیەیە کە خانەخوێی قومار لە قومارچیەکانی وەردەگرێت. لە زمانی سۆمەریدا urra مانای (قەرزێک کە قازانجی لەسەر بێت، قەرز، چاکە) و لە زمانی هتیدا iwaru مانای (دیاری، میرات، مارەیی) دەدات. |
| íγili | ڕزگارکردن، هێلانەوە<br>to save | ahele ئەهێلێ: لە کوردیدا دەگووترێت (ڕاوکەرەکە هەموو گیاندارەکانی کوشت، تەنها یەکێکیانی هێڵایەوە/هێشتەوە). لەوێدا (هێشتەوە/هێلایەوە) مانای (to save) ی ئینگلیزی هەیە (بڕوانە aheli). |
| izas | ئەز (من)<br>me | az ئەز: ئەم وشەیە لە کوردیدا زۆر نزیکە و لە لوڤیدا دەبێتە a-zu-za. لە ئەڵمانیدا بووەتە ich و لە هۆڵەندیدا بووەتە ik. |
| izaduhlu /ezaduhlu | بەرووبووم کۆکەرەوە<br>harvester | āzāīdaĝil ئازای دەغڵ: واتە (بەهێز/بەتوانای سەر شوێنی چێنراو) کە لەگەڵ سروشتی پیشەکەدا گونجاوە. |
| izikun | هاوارکردنی بەردەوامی زیکن لە تاو ئازار یان غەم یان لە توڕەییدا.<br>to wail | zīqān/zīkān زیکان/زیقان: هەمان مانایان هەیە. لە سۆمەریدا zagga بە مانای (جیکە/زیکە) دێت و نزیکی لە نێوان هەموویدا دەبینرێت. |
| izuγni | زیو<br>silver | zīu, zīuīn زیو، زیوین: (زیو) مادەکە خۆیەتی و (زیوین) لە کوردیدا ئاماژەیە بەشتێک کە لە زیو دروست کرابێت یان ڕەنگی زیوی هەبێت. تێبینی دەکرێت کە پاشگری (ین) لە کوردی و هوری و میدی و ئاڤێستادا بۆ هەمان مەبەست بەکاردێت. |
| katsi | کوپ، کاسە<br>mug, cup | kāsa کاسە: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە و بە سۆمەری پێی دەگووترێت kasu. ئەم وشەیە بە هەڵە وا دەزانرێت عەرەبیە. عەرەب وەری گرتووە و کردوویەتە (كأس). |
| kad | گوتن (کردار)<br>to say | gut گوت: هەمان وشە کوردیەکەیە. لە زمانی سۆمەریدا gu de هەمان مانای (گوتە) ی کوردی هەیە و لە ئاڤێستادا بووەتە gatha. |
| kadiγ, kad | کەوتن (کردار)<br>to fall | kaut/kat کەوت/کەت: هەمان مانا دەدات. |
| kammi | جۆرێکە لە باڵندە<br>a kind of bird | kau کەو: باڵندەیەکی زۆر خۆشەویستە لە کوردەواریدا و ماڵیکردنی بەشێکی گرنگە لە فەرهەنگی کوردی. بە زمانی هیتی بە (کەو) دەڵێن kakkapi و بە سۆمەری بە باڵندەیەک دەگووترێت kabkab بێ ئەوەی ئاماژە بە کەو بکرێت. |
| karí | باڵندە گر<br>bird-catcher | girī گری: دەبێتە ڕەگی (گرتن) و لە سۆمەریدا gurum مانای گرتنی کوردی دەدات. |
| kazijari | شاخێکی بەرزە لە ناوچەی | kažīīārī کەژی یاری: لە کوردیدا (کەژ/کەش) مانای شاخ دەدات و (یار) مانای خوا دەدات لە ئاینی یارسانی کوردیدا و |

| | | |
|---|---|---|
| | میسۆپۆتامیدا<br>high mountains of the Mesopotamia valley | بەشێکیشە لە پێکهاتەی ناوی ئاینەکە (یارسان). هەروەها (یار) مانای (خۆشەویست) یش دەدات. بەو جۆرە ناوەکە بە کوردی دەبێتە (چیای خوا، چیای خۆشەویستی). ئەم شاخە لەلایەن ئاشوربانیپالی دووی ئاشوریەکانەوە لەساڵی ٨٧٩ پ.ز دا لە یەکێک لە هێرشەکانیدا ناو هێنراوە بە Kašyari سەرچاوە ئینگلیزیەکان کە لە زمانی ئارامیەوە ناوەکەیان وەرگرتووە بە Mt.Izla[38] (شاخی عیزلە) ناوی دەبەن (Johnson, 2004, p. 6) ئارامیەکان کە هاتوونەتە ناوچەکە ناوە هوری/کوردیەکەیان گۆڕیوە بۆ (تورو دعیزلو). |
| kebli | ڕاوکەر<br>hunter | kaul کەوڵ: دەبێتە ڕەگی (کەوڵکردن) کە لە زمانی کوردیدا ئاماژەیە بە کرداری جیاکردنەوەی پێستی ئاژەڵ لە لەشی. بێ گومان (کەوڵکردن) بەشێکی کاری ڕاوکەرە، لەبەر ئەوەی یەکێک لە ئامانجەکانی ڕاو بۆ پێستەکەی بووە. لە ئینگلیزیدا quell مانای (کۆتایی هێنانی شتێک لە ڕێگای هێزەوە) و وشەی kill ی لێ دروستکراوە کە مانای (کوشتن) دەدات. |
| kel | بەرزکردنەوە، گرد<br>to lift; hill | kel ,kal کێل،کەل: (کێل) مانای (بڵند، بەرز) دەدات (هەژار، پ.٦٧٨) جگە لەوەش ( کێل) بەو دوو پارچە بەردەی سەر گۆڕ دەوترێت. وشەی (کەل) مانای (چیا، کەژ) دەدات و لە ئینگلیزیدا cliff و هۆڵەندی klif مانای ئەو شاخە براوە دەدات کە دەکەوێتە سەر دەریا. |
| ker/kor | بەرزترین شوێن (هی هەرشتێک)؛ شاخ (شاخی ئاژەڵ)، سەر، تەپڵی سەر، پۆپە<br>uppermost part (of anything): horn, head, crown of head;, top | kur کوڕ: لە کوردیدا مانای (بەرزایی سەر کێو) ی هەیە (هەژار، پ.٦٢٨). لە زمانی سۆمەریشدا وشەی kur مانای شاخ دەگرێتەوە. |
| kil | لەش ساغبوون، بوون لە بارێکی باشدا<br>to be fit, in good shape | kal کەڵ: هەمان مانای هەیە. |
| kinaxina | مۆر؛ سور<br>purple ; red | xuen خوێن: (خوێن) بەشێک لە پێکهاتەی وشە هوریەکەیە و (ڕەنگی خوێنی) ئاماژەیە بۆ ڕەنگی سور. |
| kir | درێژ<br>long | kīr/ker کیر ، کێر: (کێر) مانای (ئەندامی زاوزێی نێرینە، چەقۆی درێژ) دەدات. ناوە هوریەکە لەگەڵ سروشتی وشەکەدا |

[38] . لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (turo) ی ئارامی کە مانای (چیا) دەدات، کراوەتە (mt) کە دەبێتە کورتکراوەی (mount).

| | | |
|---|---|---|
| | | دەگونجێت. |
| kewira-nna | ئەنجومەنی وڵات، پیاوانی بەتەمەن<br>the senate, the Old Men | gaurāna گەورانە: لە کوردیدا مانای (هی گەورەکان) دەدات و بنەچەی وشەکە لە کوردیدا بریتیە لە (گەورە)، کە مانای (مەزن) دەدات و لە سۆمەریدا دەبێتە gur. دەشێت ئەمە بنەچەی وشەی gubernator لاتینی و governor ی ئینگلیزی و gouverneur ی فەرەنسی بێت کە مانای (حوکمران/پارێزگار) دەدات. |
| kol | لاواز<br>Weak | kul ,kol کۆڵ، کول: (کۆڵ) مانای (لاوز) دەدات. لە کوردیدا دەگووترێت (لە حسابا کۆڵم) مانای (لاوازم). کول مانای (شەکەت، ماندو) دەدات ( هەژار، پ.٦٣٧). |
| kol | بریندارکردن<br>to wound | kul کول: مانای (بریندار) دەدات (هەژار، پ.٦٣٧). |
| kubaγi | جۆرێکە لە کڵاو<br>kind of hood | kupaīī کوپەیی: هەر شتێک لە شێوەدا چەماوە بێت و چەمابێتەوە، لە کوردیدا دەبێتە کوپەیی. لە زمانی سۆمەریدا وشەی agupa مانای (کوپە) ی کوردی دەدات. لەوە دەچێت هوریەکان لەوێدا مەبەستیان شێوەی کڵاوەکە بووبێت کە لە کوپە چووبێت. لە زمانی ئینگلیزیدا بە (کڵاو) دەڵێن cap. |
| kud | کەوتن، کوشتن، خستن<br>to fall; to kill, to make fall | kaut کەوت: دەبێتە ڕەگی وشەی (کەوتن). جگە لەوە دەبێتە ڕەگی (کەوتاندن) کە مانای (تۆپاندن) دەدات (هەژار، پ.٦٣٧). |
| kudzuγ | خوای مانگ<br>moon-god | kužaka کوژەکە: مورویەکی پانکراوەی شینە، کە دەکرێتە ملی منداڵ، شێوە بازنەیی و کون کونە، وەک چاوەزار بەکاردەهێنرێت. دەشێت لە ڕابردوودا خوای مانگ بووبێت و بۆ پاراستن کرابێتە ملی منداڵ. |
| kudzuz | هێشتنەوە، مانەوە لا<br>to keep, retain | qostinaua قۆستنەوە: ماناکەیان نزیکە. |
| kul | گووتن<br>to say | qaul قەول: لە هەندێک حاڵەتدا بە مانای (گووتە) بەکار دێت. لە کوردیدا دەگووترێت (بە قەولی کابرای خۆمان) لەوێدا وشەی (قەول) بەمانای گوتە دێت. |
| kul | خستنە لاوە، وەستانی شتێک<br>to leave aside, to stop something | kul کول: لە کوردیدا مانای (لە کەڵک کەوتن، شەکەت، بریندار) دەدات (هەژار، پ.٦٣٨). |
| kundz | چوونە سەر ئەژنۆ، خۆ چەمانەوە<br>to kneel, to bow down | quntis قونتس: ئەم وشەیە لە ناوچەی پێنجوین ماوە و مانای (چیچکان کردن) دەدات. |
| kuru | سەر لە نوێ، کەرەتێکی تر | kara کەرە: ئەم وشەیە بە شێوەی (کەرە/کەرەت) دەگووترێت. لە زمانی ئاڤێستادا بە (یەک کەرەت/یەکەرە) |

| | | |
|---|---|---|
| | anew, once again | دەگووترێت hakeret. |
| man | بوون، مان<br>to be, to exist | mān مان: لە کوردیدا هەمان وشەیە و لە زمانی سۆمەریدا me هەمان مانای هەیە. لە کوردا هەردوو شێوەکەی ماوە بە شێوەی (ما، مان). ئەم وشەیە لە کوردیدا دوو مانای هەیە (مانەوە لەشوێن، مانەوە لە ژیان). لە زمانی لاتینیدا (کرداری مانەوە) دەبێتە maneo و لە زمانی یۆنانیدا meno مانای (مانەوە لە شوێن)دا دەدات. لە زمانی ئینگلیزییدا remain دروستکراوە و لە فەرەنسیدا manoir، هەردووکیان لە لاتینەوە وشەکەیان وەرگرتووە. |
| marijanni | جەنگاوەری سەر دووچەرخەی جەنگی (عەرەبانەی جەنگی)<br>chariot fighter | merjānī مێرجانی: لە زمانی کوردیدا (مێر) مانای (پیاو، ئازا، مەرد) دەدات و (جان) دەبێتە ڕۆح یان لەش. هەمووی دەبێتە (کەسێکی ڕۆح ئازا). جگە لەوانەش لە کوردیدا (مێر) پێکهاتەی ناوی لێکدراوی تری کوردیە، بۆ نموونە (کەڵەمێر) مانای (پیاوی ئازاو هەڵکەوتوو) دەدات و (پشمێر) ئاماژەیە بۆ (پاسەوانی پیاوێک). |
| mázriani | فیرعەونیە میسریەکان<br>Egyptian pharaoh | mīsrī میسری: ئەمڕۆ ئەمە بووەتە ناوی خەڵکی میسر و وڵاتی میسر و هەموو گەلەکانی ناوچەکە ئەم وشەیەیان وەرگرتووە و ئەمڕۆ بەکاری دەهێنن بۆ ئاماژەکردن بە میسر. |
| me | نە، نەکەی<br>do not, not | ma مە: ئامرازە و وەک پێشگر بەکار دێت بۆ داواکردنی نەکردن، بۆ نموونە (مەڕۆ، مەخۆ) کە کتومت مانا هوریەکەی ماوە. |
| midziriiwi | خەڵکی میسر، میسری<br>of Egypt, Egyptian' | mīsrī میسری |
| mištanni | قەرەبووکردنەوەی دارایی<br>financial compensation | mižda, miždāna مژدە، مژدانە: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی ماوە و ئەوەی کە تێبینی دەکرێت کە وشەکە بە پاشگرەکەیەوە هەردووکی کوردی و هوریە، لەبەر ئەوەی کە وشەکە پێکهاتووە لە (مژدە+انە) کە هاوشێوەی وشەی (شاهانە، بەگانە) دروستکراوە و سەرنج دەدرێت وشەی (شاهانە) لە هەردوو زمانی هیتی و لوڤیاندا هەمان مانای کوردیەکەی هەیە. کەواتە پاشگرەکان لە هەر سێ زمانە کۆنەکان و لە کوردیدا یەکن.<br>وشەی (مژدە) لە ئاڤێستادا دەبێتە mizhda و لە سانسکریتدا دەبێتە mīdha. |
| mo | ڕەگی ئامرازی ئیشارەتکردنە<br>demonstrative pronoun stem | ama ئەمە: ئامرازی ئیشارەتە بۆ شتێک کە نزیک بێت. |
| muz | دانان، ڕێکخستن، | mez مێز: لە کوردیدا ئەو کەلوپەلەی ناوماڵە کە شتی لەسەر |

| هوری | مانا | ڕوونکردنەوە |
|---|---|---|
| | کۆکردنەوە<br>to place, tidy up, arrange | دادەنرێت یان نانی لەسەر دەخورێت. ئەم وشەیە زۆر لە عەرەبەکان لە زمانی ڕۆژانەدا بەکاری دەهێنن بەڵام لەبەر ئەوەی کە وشەکە درەنگ وەرگیراوە، بۆیە لە زمانی ستانداردی عەرەبیدا نیە. |
| nahhoubade | نا ئەوادان<br>uninhabited | naāubāda نەئاوبادە: وشەی (ئاوەدان) واتە شوێنێک کە ژیانی تێدا بێت. لە بنەڕەتدا وشەکە پێکهاتووە لەوەی کە شوێنەکە ئاو درابێت، واتە دەستی خەڵکی پێ گەیشتبێت. ئەم وشەیەش هەمان پرەنسیپی هەیە و دەڵێت (نەئاوبادە، ئاوی پیا نەدراوە) کە هەمان مانا دەدات بە پێچەوانەوە. |
| nekri | قوفڵ<br>lock | nakirī نەکری: لە کوردیدا ئەگەر پێشگری (نە) پچێتە سەر وشەی (کر/کردنەوە)، ئەوا مانای پێچەوانەکەی دەدات کە لەگەڵ وشە هوریەکەدا گونجاوە. |
| níri | باش<br>good | nerī نیری: مانای (ئازایەتی، پیاوەتی، پاڵەوانی) دەدات. بە زمانی سۆمەری بە (پیاوەتی) دەڵێن nir. |
| nirubadi | bad<br>خراپ | nerbadī نیربەدی: لە کوردیدا وشەی (نێر) مانای (پیاو) دەدات و وشەی (بەد) مانای (خراپ) دەدات، هەمووی مانای (پیاوێکی خراپ) دەدات، بەو جۆرە دەشێت وشەکە لەو دوو بەشە پێکهاتبێت. |
| niγári | مارەیی<br>dowry | māraīī مارەیی |
| niz | نۆ<br>nine | no/nah نۆ/نەه: لە کوردی و هەموو هیندوئەوروپیەکان نزیکە. |
| nulmi | خزمەتکاری ئافرەت، کۆیلەی ئافرەت<br>housemaid, female slave | nālme ناڵمێ: بە کوردی ماناکەی دەبێتە (مێیەی ناڵکراو، مێیەی بەندکراو). لە سۆمەریدا وشەی mi/mu هەر هەمان مانای (مێ) دەدات لە کوردیدا، بۆیە ناوەکە وا دەردەکەوێت کە بەو شێوەیە دروستکرابێت. |
| pa | دروستکردنی بینا<br>to build | pāïa پایە: لە کوردیدا (پایە) مانای ستونی وەستانی بینا دەدات. |
| paah | ڕوخاندن، شکاندن<br>to destroy | pīāīā پیایا: مانای (پیاکێشا) دەگرێتەوە. بە زمانی هیتی pakkušš مانای (پیاکێشان) دەدات. |
| paige | ئامادە بۆ دروستکردنی بینا (خانو)<br>ready for building (a house) | pega پێگە: مانای (بنکە) دەدات. |
| pala | جۆگە<br>canal | pal پەل: لە کوردیدا وەک خۆیەتی. ئەم وشەیە مانای (شیوەڵ، دۆل، دەرە) دەدا (هەژار، پ.١٢٢). |
| par | دڵبریندار بوون، تورە<br>to be offended, | pir پڕ: لە کوردیدا دەڵێت (لێی پڕە، دڵی پڕە) واتە لێی تورەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| | angry | |
| parili | تاوان<br>crime | parla پەرلە: مانای (فێڵکردن) دەدات و بە زمانی هیتی هەر وەک زمانی هوری دەنووسرێت و مانای (تاوان) دەدات. |
| pašš | ناردن<br>to send | peš پێش: لە کوردیدا ڕەگی (پێش بردن، پێش خستن. پێش دان) کە ماناکەیان نزیکە. |
| piconni | دڵخۆش<br>happy | pekanī پێکەنی: مانای (خەندەکردن) دەدات. |
| pirang | دەربازبوون<br>flee | piringān پرنگانەوە: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (پرنگانەوە) کە مانای (سڵەمینەوە) دەدات کە لە ماندا نزیکن. |
| pudang | ئاگادارکردنەوە (ئاگادارکردنەوەی دەسەڵات)<br>report (to the authority) | badang بەدەنگ: مانای (دەنگدان) دەدات کە یەکێک لە ماناکانی (هاندان و ئاگادارکردنەوەیە) بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو خەڵکە دەنگ بدە/بە بۆ کار). |
| purapši | پیشڕەوێکی ئاینی (پیاوێکی ئاینی)<br>a priest | āporapeš ئاپۆڕە پێش: واتە ئەو کەسەی کە پێش ئاپۆڕە دەکەوێت. هاوشێوەی ئەو ناوە لە کوردیدا هەر ماوە بۆ نموونە ئەو کەسەی کە پێشڕەوی نوێژ دەکات پێی دەگوترێت (پێش نوێژ). لە ناوە هوریەکەدا تەنها ئاڵوگۆڕی شوێنی ناوەکە کراوە. هەروەها لە سۆمەریدا بە کۆمەڵێک خەڵک دەگووترێت puhrum کە ئەوە دیسان دڵنیای دەکات کە وشەکە لەو بنەچەیەوە هاتووە. |
| sagari | چەکەرە، لقی نوێ<br>sprout, bud | cakara چەکەرە: هەمان مانای هەیە. |
| šaphali | لای چەپ<br>left-side | capālī چەپئالی: (چەپ+ئالی) هەمان مانا دەگەیەنێت، لەبەر ئەوەی کە وشەی (ئالی) لە کوردیدا مانای (لا، تەرەف) دەدات (هەژار. پ. ١١). بە زمانی هیتی هەر هەمان شتە و بە سۆمەری بە (چەپ) دەگووترێت gap. |
| sar | پرسیارکردن، خواست<br>to ask, desire | pisīār/pirs پسیار/پرس (هەژار،پ.١٠٦): هەمان مانا دەدەن. |
| sarijanni | زرێپۆشی لەش<br>body armour | sarjānī /sargīānī سەرگیانی/سەرجانی: هەمان مانا دەدات و وشەی هاوشێوەی ئەوە لە کوردیدا بریتیە لە (سەرجێگە) کە مانای (سەرچەف) دەدات. |
| sarri | پاشا<br>king | sar سەر: لە کوردیدا دوو لە ماناکانی (سەر) بریتین لە (سەرکردە، سەری لەش). بە زمانی هیتی بە پاشاکان دەگووترێت šarrena کە هەمان وشەی (سەران) ی کوردی دەگرێتەوە. ئەوەی کە جێی سەرنجە وەک لەو ناوەدا دەردەکەوێت (ان) وەک زمانی کوردی و سۆمەری، پاشگری کۆیە لە زمانی هیتیدا. لە زمانی لیدیدا serli مانای (سەرکردە) دەدات و لە میدیدا sar مانای (سەری لەش) دەدات. لە زمانی ئینگلیزیدا sir وشەیەکی ڕێزە بۆ بانگکردنی نێرینە، sire وشەیەکە بۆ بانگکردنی خەڵکانی پایەبەرز بەتایبەتی پاشاکان. |

| | | |
|---|---|---|
| sawaala | ساڵ<br>year | sāl ساڵ: لە کوردیدا زۆر نزیکە و لە هیتیدا دەبێتە šapli. |
| sawri | چەک<br>weapon | supar, taur سوپەر، تەور: (تەور) چەکێکی دێرنی مرۆڤە. وشەی (سوپەر) مانای (قەڵغان) دەدات. لە ئینگلیزیدا spear مانای (ڕم) دەدات. |
| saɣri | باخ، باخچە<br>garden, orchard | saīr سەیر: (سەیر) مانای (سەرسوڕ هێنەر) دەدات و (سەیران) لە کوردیدا مانای (گەشت بۆ دەشت و دەرو سەوزایی) دەدات. دەشێت هەمان بنەچەیان هەبێت و مەبەست لێی (شوێنی جوان و سەرسوڕ هێنەر) بێت. لە زمانی سۆمەریدا بە هەمان مانا دەبێتە sar. |
| sew | تەڕکردن، شێدارکردن<br>to wet, to moisten | še شێ: مانای (تەڕی) دەدات. |
| sew | ئاوسان<br>to swell | āusāu ئاوساو: هەمان مانا دەدات. |
| si | سەیرکردن (کردار)<br>to look | saī/sah سەی/سەح: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی مانای (سەیرکردن) دەدەن. لە زمانی لیدیدا دەبێتە saw. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە see و بە ئەڵمانی دەبێتە sehe و سویدی se. |
| si<sup></sup>irni | نایاب، خشڵ<br>plendour; jewel | zerīn زێڕین: لە کوردیدا مانای (لە زێڕ) دەدات. بە زمانی میدی-ش دەبێتە zarniya زۆر نیزکە و هەمان مانای (زێڕین) ی کوردی هەیە. |
| sirat | گێڕانەوە<br>to narrate | sīrat سیرەت: ئەم وشەیە وەک خۆی بەکاردەهێنرێت. |
| siri | سەرە<br>to arrange in order | sara سەرە: ئەم وشەیە هەمان مانای هەیە و عەرەبی عێراق لە کوردیان وەرگرتووە و لە زمانی ڕۆژانەدا بەکاری دەهێنن. لەبەر تازەیی وەرگرتنی، لە فەرهەنگی زمانی عەرەبیدا نیە. پێ دەچێت وشەی share ی ئینگلیزی کە مانای (بەش) دەدات، هەمان ڕەگی هەبێت. |
| siɣali | پاک<br>pure | sol سۆڵ: لەگەڵ وشەی (سپی) دا بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە دەگووترێت (پێستی سپی و سۆڵە، پێستی ساف و سۆڵە) و مانای پاکی و بێ گەردی دەدات. |
| šiye, šiu | ئاو، ڕووبار<br>water, river | še, šīu, šuā شێ، شیو، شوا: (شێ) مانای تەڕی دەدات. (شیو) مانای جل شتن دەدات (هەژار، پ.٥٠٢) هەروەها مانای (دۆڵی تەنگی ئاو پێدا ڕۆیشتوو) دەدات .(شۆ) دەبێتە ڕەگی شتن. ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا a tu مانای (ئەشۆ) ی کوردی دەدات. |
| sizi | شەش<br>six | šaš شەش: لە کوردیدا نزیکە و لە سۆمەریدا (شەشەم) دەبێتە šuš و لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا نزیکە. ئینگلیزی و فەرەنسی six، ئەڵمانی sechs ، سویدی و دانیمارکی seks، ڕووسی shest، هتد. |

| | | |
|---|---|---|
| suga | بەیەکەوە<br>together with | takā تەکا: هەمان مانا دەدات. |
| surr | چوون، ڕۆیشتن<br>to go, walk | sur سوڕ: هەمان مانای هەیە. لە کوردیدا دەگووترێت (سامان چوو سوڕێکی دا بەو ناوەدا) واتە (بەوناوەدا ڕۆیشت). |
| šukkalli | وەزیر<br>vizier | šākal شاکەڵ: وشەی (شا) لە ناو سۆمەری، هوری، هیتی و مانیەکاندا وەک پێکهاتەی وشە بەکارهاتووە، زیاتر بە مانای گەورە نەک پاشا. هەتاوەکو ئەمڕۆش ئەم وشەیە وەک خۆی لە کوردیدا بەکاردەهێنرێت. مانای وشەی (شاکەڵ) دەبێتە (گەورەی بەڕێز، گەورەی نایاب، گەورەی ئازا) کە لەگەڵ پلەی وەزیردا گونجاوە کە کەسایەتی گرنگی حوکمڕانیە. |
| tab | توانەوە (بۆ کانزا)<br>to melt (a metal)' | tāu تاو: (تاو) دەبێتە ڕەگی وشەی (تاوانەوە/توانەوە). وشەی tab بە زمانی سۆمەری مانای گەرمی هەیە و ئەمڕۆ لە کوردیدا (تاوە) ئەو ئامرازەیە کە خواردنی تێدا سوردەکرێتەوە. هەروەها مانای (گەرمی زۆر) دەدات بۆ نموونە (تاوی ئاگر، تاوی خۆر). |
| tabiri | کەسێک کە کانزای تواوە لە قاڵب دەدات<br>someone who has cast (metal) | tābar تابەر: وشەی (تاب) لەسەرەوە ڕوونکرایەوە. (ەر er) پاشگرێکە لە کوردیدا فەرمان دەکاتە ناو. بۆ نموونە (دان/دانەر، هار/هارەر) و لە سۆمەریشدا بە هەمان مەبەست بەکاردێت. بەو جۆرە ناوەکە پاشگری وەرگرتووە و بووەتە بکەری کاری توانەوە و بووەتە (تابەر). (بڕوانە وشەی arar ی سۆمەری). |
| tad | خۆشەویستن<br>to love | jūt جووت: (جووتبوون، جووت) ماناکەی نزیکە. |
| tadugar | خۆشەویستی یەکتری<br>love one another | jutgarī جوتگەری: هەرچەندە ئەم وشەیە لە کوردیدا نەماوە بەڵام لە ڕووی ڕێزمانیەوە دەشێت کە ئەو وشەیە لە کوردیدا هەبێت. جگە لەوە پاشگری (گەر/گەری) هەمان مانا و هەمان ڕۆڵی هەیە لە زمانی کوردیدا. |
| tadugari | هاوڕێیایەتی<br>friendship | jutgarī جوتگەری: (بڕوانە tadugar). |
| tagi | جوان<br>beautiful | tākī تاکی: مانای نایاب و تایبەت دەدات، بۆ نموونە دەگوترێت (تاکە لە ناو هەمووواندا). |
| ti | قسەکردن<br>to speak | utī, uťa وتی، وتە: (وتی) کرداری (قسەکردنە) و (وتە) هەمان مانای (قسە کردنێک کە پێشکەش خەڵک دەکرێت) ی هەیە. لە زمانی هتیتیدا te مانای (قسەکردن) دەدات و بە زمانی لوڤی دەبێتە hati. |
| tari | ئاگر<br>fire | tāīr تایر: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. لە زمانی کرواتیدا vatra مانای (ئاگر) دەدات. ئەم وشەیە بە مانایەکی نزیک لە زمانی ئیتاڵیدا بەشێوەی tiro و لە فەرەنسیدا بەشێوەی tir دەردەکەوێت. |
| tan | کردن<br>to do | dān دان: وەک پاشگر بەکار دێت بە مانای کردن (ئاودان، داڵەدان، پێ دان) |

| Hurrian | Kurdish / English | Note |
|---|---|---|
| tasp | لێدان، شینبوونەوە، شکان<br>to hit, bruise, break | tāsā تاسا: مانای (خنکا) دەدات. |
| Teššub | خوای ڕەشەبا<br>Storm God | tāšīabā تاشیەبا: بە کوردی مانای (بای لەتکەر) دەگرێتەوە و لەگەڵ ناوی خوای هوریەکاندا گونجاوە. |
| tia | زۆر<br>many | zīā زیا: هەمان مانای هەیە و لە سۆمەریدا بەشێوەی zi دەردەکەوێت. |
| tiγan | نیشان دان<br>to show | šān شان: هەمان مانا دەدات. |
| tsalmi | پەیکەر<br>statue | zalām زەلام: مانای (پیاو، گەورەیی لەشی مرۆڤ) دەدات. |
| tseerree | کەر<br>donkey | sara /zara سەرە/زەرە: ئەگەر ڕەچاوی ئەوە بکەین کە لە زمانی هوریدا ts بە z یان s دەخوێنرێتەوە، وشەکە کتومت (زەرێ) دەگرێتەوە و ئاماژەیە بەو دەنگە کە کەر دەیکات. |
| tsik | شکانن<br>to break | šik شک: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (شکاندن). هاوشێوەیە لەگەڵ وشەی šika لە زمانی سۆمەریدا کە بریتیە لە پارچەی شکاوی فەخفوری. |
| tsugi | پچووک<br>small | cūk چووک: لە کوردیدا هەمان مانای (بچووک) دەدات. |
| tsurgi | خوێن<br>blood | surka سورکە: ئاماژەیە بە ڕەنگی (سور) ی شتێک، وشەکانی (سورکە، سورکەڵە، سورکێ) هەموویان شێوەی جیاوازی وشەی کوردین کە لە ڕەگی (سور) وە هاتوون. بە زمانی سۆمەری بە ڕەنگی سور دەگووترێت su و بە میدی پێی دەگووترێت suxra (2007, Tavernier, P.20). |
| tun | زاڵبوون بەسەر لایەنێکدا<br>to overpower | tun/tund تون/توند: (تون/توندکردن) مانای (کۆنترۆڵکردنی کەسێک و سنوردارکردنی جوڵەی) دەدات. لە زمانی سۆمەریشدا tun بە هەمان شێوە دەنوسرێ و ماناکەی زۆر نزیکە. |
| tur | دۆڕاندن<br>to go down | dor دۆڕ: دەبێتە ڕەگی (دۆڕانن). |
| túri | داماو، پلە نزم<br>inferior | dorīā/dorā دۆڕیا/دۆڕا: هەمان مانا دەدات. |
| turihhe | نێرانە<br>masculine | turaīī, tiroīī تورەیی، ترۆیی: ئەم دوو وشەیە هەردووکیان مانای (پێچەوانەی ئاشتی و ئارامین ) کە وەک پێشتر باسکرا، هوریەکان بە ئافرەت دەڵێن ašti و لەوە دەچێت نێری بۆ ئەوان مانای پێچەوانەی ئاشتی بووبێت. |
| tuw | پاک<br>clean | šuā شوا: مانای (پاکردنەوە، شتن) دەدات. لە زمانی سۆمەریدا atua مانای پاکردنەوەی ئاینی دەدات. لە ئینگلیزیدا wash مانای (شتن) دەدات. |
| tuwal | لێدان، پیاکێشان<br>to strike, to | dahol, dāul دەهۆڵ، داوڵ: (دەهۆڵ) ئامێرێکی ڕیدمی کوردیە کە قەبارەی گەورەیە و دەکرێتە شان و بە دار لێی |

| | | |
|---|---|---|
| | beat | دەدرێت. بە زۆری لەگەڵ هەڵپەرکێی کوردیدا بەکاردەهێنرێت. (داوڵ) وەک کردار مانای (بەسەریەک خستن) دەدات (هەژار، پ.٢٨٨). لە زمانی لیدیدا dual مانای (پەستان) دەدات. |
| undu | ئەنجا<br>then | anjā ئەنجا: لە کوردیدا کەم گۆڕاوە و بە زمانی سۆمەری دەبێتە anga و بە زمانی هیتی دەبێتە handa و هەموویان هەمان مانا کوردیەکەیان هەیە. لە زمانە هیندۆ ئەورووپیەکاندا بەشێوەی کەمێک جیاواز و مانای نزیک دەردەکەوێت لە زمانی ئینگلیزیدا بە شێوەی and دەردەکەوێت ولە ئەڵمانیدا und و لە ئیتاڵیدا anche. |
| urni | ڕان<br>thigh | rān ڕان: لە کوردیدا وەک خۆیەتی و لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە râna. |
| uruni | بەرەودواوە<br>backward | āuirān ئاوڕان: مانای ئاوڕادانەوە دەگەیەنێت. |
| urγupti | ڕاستی<br>truth | rāstī ڕاستی: هەمان مانا دەدات، وشەی (وەڕاستی) لە کوردیدا مانای (بەڕاستی دەدات). بە زمانی میدی دەبێتە rašta و وشەی سۆمەری abaraša ماناکەی بە کوردی دەبێتە (بەڕاستی). |
| usta-i | پاڵەوان<br>hero | uastā وەستا: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (کەسێکی کارامە و شارەزا) دەدات و لە ناو ناوی پلەدارەکانی دەوڵەتی مانیدا باس لە بەرپرسی زەوی دەکرێت بە (ustaribar وەستا ڕێبەر) و ناوەکە تەرجومە کراوە بۆ زمانی ئینگلیزی بە forman کە مانای (وەستا) ی کوردی دەدات. وشەی (وەستا) چووەتە زمانی قسەکردنی عەرەبەوە و بە هەمان مانای کوردی ئەمڕۆ لە وڵاتەکانی وەک میسر و عێراقدا لە قسەکردنی ڕۆژانەدا بەکاری دەهێنن، بەڵام لە عەرەبیدا وەرگیراوە و وشەی خۆیان نیە. لەبەر ئەوە هەتاوەکو ئێستا نەچووەتە فەرهەنگی زمانیانەوە. |
| wariš | ڕۆیشتن (کردار)<br>to go to | roiš ڕۆیش: دەبێتە ڕەگی (ڕۆیشتن). |
| xalwu | پەرژین کە بە بەرد دروستکرابێت<br>fence made with stones | xalua خەڵوە: لە کوردیدا بۆ شوێنی گۆشەگیری ڕۆحی بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە دەگووترێت (شێخ کەریم چل ڕۆژ چووەتە خەڵوەوە) |
| wuuru, puuru | بەهێز<br>strong | uerāu, buer, ura وێراو، بوێر،ورە: وشەی (ورە) مانای (ئازایی، تین و تاوی دڵ) دەدات (هەژار. پ. ٩١٠). وشەکانی (بوێر، وێراو) مانای (ئازا) دەدەن. بە زمانی سۆمەری وشەی uru ئاماژەیە بۆ کەسێکی (بەهێز، ئازا). |
| xaldzi | ناوچە/دەڤەر<br>district | xalādize خەلادزێ: لەوە دەچێت ئەو ناوە درابێت بە ناوچەی قەلادزێ کە شارۆچکەیەکە نزیکی ڕانیە. لە ئەرشیفی شەمشارەدا کە لە شوێنی ئاوەکەی ئەمڕۆی دوکاندا دۆزراوەتەوە هەر نزیک ڕانیە و قەڵادزێیە و ناوچەیەکی هوری بووە. وا دەردەکەوێت کە ئەو ناوچەیە لە ژێر دەسەڵاتی هوریەکاندا بوبێت و ناوی ئەو شارۆچکەیە (خەڵادزێ) هەر |

| | | |
|---|---|---|
| | | لەوەوە هاتبێت و دوایی کرابێتە (قەلادزێ). |
| xadzidzi | هەواڵگری intelligence | dizīdizī دزی دزی: لە کوردیدا کە دەگووترێت (دزی دزی شتەکانی کرد) لەوێدا وشەکە مانای (بەنهێنی) دەدات. |
| xatúγi | هیتی (هیتیەکان) Hittite | hātuīī هاتویی: ئاماژەیە بە هیتیەکان و هەمان پاشگری (ی/یی) بەکاردەهێنرێت بۆ دەستنیشانکردنی (ڕەچەڵەک، نەتەوە، ناوچە) لە هوری و کوردیدا. |
| xud-, hud- | بەرز هەڵسەنگاند، گەورەکردن (وەک وەسفی خوا بەکاردەهێنرێت) to praise, to magnify (used in theophoric names) | xud خود: ئەم وشەیە لە کوردیدا بووەتە ناوی خودا. جگە لەوەش (خود) وەک وشەیەکی ڕێزگرتن بەکاردێت بۆ ئاماژەکردن بە کەسێک بۆ نموونە دەگووترێت (خودی خۆم لەوێ بووم). لای هوریەکان لە باسی خودای ڕەشەبا (تێشوب/تاشیەبا) دەگووترێت Hut-Teššub یان Huti-b-Teššub کە دەبێتە (خود تێشوب، خوتی ب تێشوب). وا دەردەکەوێت کە ئەوان زیاتر بە مانای (خودا، خودێ، خوا) ی کوردی بەکاریان هێنابێت. لە زمانە ئەوروپیەکاندا وشەکانی God, Gott, Gud بە مانای (خوا، خودا) دێن، کە بنەچەکەیان هوری دەردەکەوێت. |
| xuradi | سەرباز soldier | gurd گورد: مانای (چاپوک و بەکار، پاڵەوان) دەگرێتەوە بەڵام (گورد) مانای (شمشێر) دەدات (هەژار، پ.٧٠٥). ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە gardu. لە ئینگلیزیدا guard و لە فەرەنسیدا garde بەمانای (پاسەوان) دێت. |
| xurri | بەیانی morning | xor خۆر: (خۆر) مانای (ڕۆژ) دەدات. بە درێژایی ئەم فەرهەنگە سەرنج دەدرێت هوریەکان هاوشێوەی ناوچەکانی موکری هەتاوەکو هەولێر، ڕانیە، قەلادزێ، سەردەشت، هتد. هەر هەمان پاشگری ی (i) بەکاردەهێنن بۆ وشەکانیان. بۆ نموونە لەو ناوچانەدا دەگووترێ (عەردی دەکێڵم) کە هاوشێوەی هوریەکان کە بە ardi نووسیویانە، ئەو تایبەتمەندیە ڕوون دەبێتەوە و دەتوانرێت لە زۆربەی وشەکانی ئەم فەرهەنگەدا سەرنجی ئەو دیاردەیە بدرێت. |
| xurrúγi | هوریەکان Hurrian | xoraīī/xorī خۆرەیی، خۆری: هوریەکان ئەو وشەیان بەکارهێناوە بۆ ئاماژەکردن بە خۆیان. ئەمڕۆ ئەم وشەیە لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (کەسێک کە خۆر پەرست بێت، کەسێک کە لە خۆرەوە هاتبێت/زادەی خۆر بێت) ئەمە لەگەڵ سیمبۆلی هوریەکاندا دەگونجێت کە بریتیە لە خۆرێکی گەورە بە دووباڵەوە. لەوە دەچێت هوریەکان ناوی خۆیان لەوە هێنابێت و ناوەکە مانایەکی زیاتر ئاینی هەبێت.<br>وا دەردەکەوێت ئەم ناوە لە ناوی هەندێک لە پەلەکانی کورد دا مابێتەوە. بۆ نموونە (کەڵهور) کە پێکهاتەی ناوەکە بریتیە لە (کەڵ+هور)، لە سەردەمی هوریەکاندا نووسینی بەشێوەی kil xurrúγi مانای (هوریە نایاب/مەزنەکان) بووە. لەوە دەچێت ئەم ناوە پێکهاتەی ناوی (لوڕ) مکانیش بێت، لەبەر ئەوەی کە ناوەکە دەکرێت شیبکرێتەوە بە (لۆ هوری) و لە گەڵ کاتدا کورتکرابێتەوە بۆ (لوڕی). وشەی (لۆ) ی کوردی کە |

| | | |
|---|---|---|
| | | مانای (کابرا، فەلانەکس) دەدات، لە سۆمەریدا بە شێوەی lu نوسراوە و هوریەکانیش بەکاریان هێناوە و ناوەکە هەر مانای (کەسی هوری) دەدات. واتە لە سەردەمی هوریەکاندا ناوەکە دەشێت بە شێوەی lu xurrúγi نوسرابێت کە دەبێتە (لۆ هوری/لوڕی) لە کوردیدا. |
| xúruwwi | شاخی خواردنەوە (شاخی گیاندار کە لە ڕابردوودا هەڵکۆڵراوە و بۆ ئاو یان ئەلکهول خواردنەوە بەکار هاتووە) rhyton | xorauaīī خۆرەوەیی: لە کوردیدا ناوەکە لەگەڵ سروشتی کاسی خواردنەوەدا دەگونجێت. بە زمانی سۆمەری بە بیرە دەگووترێت kurun و بە زمانی هیتی بە (کرداری خواردنەوە) دەگووترێت aku. |
| γawurni | ئاسمان sky | haur هەور: هاوشێوەیی هەیە لە نێوان دوو وشەکەدا. |

# سۆمەریەکان

**سەرەتایەک سەبارەت بە سۆمەریەکان**

پێش هەموو شتێک دەبێت ئەوە بزانرێت کە سۆمەریەکان بە خۆیان نەگووتووە (سۆمەری) بەڵکو ئەکەدیەکان ئەو ناوەیان پێ گوتوون. زۆربەی بۆچوونەکان ئەوە پەسەند دەکەن کە ئەوان بە خۆیان گوتووە (کی ئین گی (ki-en-gi)) و کاتێک ویستبێتیان بڵێن خاکەکەمان، بە (Kalam) ناویان هێناوە کە مانای (خاکی نایاب) دەدات و بە زمانەکەی خۆیان گوتووە (eme-gir) (بڕوانە فەرهەنگی سۆمەری- کوردی). ئەمڕۆ بۆ ئاماژەکردن بەو خەڵکە، ناوی سۆمەریان بۆ دانراوە کە خەڵکانی تر بۆی هەڵبژاردوون و ئەو ناوەی کە خۆیان پەسەندیان کردووە بەکار نایەت. سۆمەریەکان کۆنترین شارستانیەتن لە جیهاندا و لە هەزارەی چوارەمی پێش زایینەوە لە مێسۆپۆتامیادا[39] ژیاون و سەنتەری دەسەڵاتیان لە خواروو و ناوەراستی عیراقی ئەمڕۆدا، لە نێوان دوو ڕووباری دیجلە و فرات بووە و کۆنترین گروپی مێسۆپۆتامیان.

(وێنەی ٩) زەقورەتێکی سۆمەری لە نزیک شاری ناسریە.

ناوچەی دەسەڵاتی سۆمەریەکان لە کۆمەڵە شارێک پێکهاتبوو، کە لێکۆڵەرەکان بە دەوڵەتە شار (City State)[40] ناوی دەهێنن. لەبەر ئەوەی هەر کام لەو شارانە وەک نیمچە دەوڵەتێکی بچووک وابوو. ئەم دەوڵەتە شارانە لە سەردەمی جیاوازدا نازناوی حوکمڕانیان هەبوو. هەندێک لە حوکمڕانە ناوچەییەکان پێیان دەگووترا patesi و پاشا گەورەکانیان پێیان دەگووترا lu gal (بڕوانە فەرهەنگی سۆمەری کوردی).
لە ڕووی دارشتنەوە، بناغەی شارەکانیان بە دەوری پەرستگەدا دروست دەکرد و سەنتەری شارەکانیان ئەو پەرستگانە بوو. زۆربەی یاسا و ڕێساکان و خوێندن لەو سەنتەرانەوە بەڕێوە دەبران. ئەم شارانە هەریەکە حوکمڕانی خۆی هەبوو. هەندێک جار پاشای شارێک لە هەموویان بەهێز تر دەبوو و دەسەڵاتی بەسەر پاشای حوکمڕانی هەموو شارەکانی تردا هەبوو. دەسەڵاتی گشتی سۆمەریەکان لە شاری کش (kish/cush) وە بەڕێوە دەچوو. پەیدابوونی سۆمەریەکان هەر لە خۆیەوە نەبووە، بەڵکو هەزاران ساڵ پێش ئەوان لە ناو کوردستانی ئەمڕۆدا چەندین گوند و شوێنی نیشتەجێبوون و کشتوکاڵ دەستپێکرابوو. لە ڕاستیدا سەرەتای کشتوکاڵ لە ناوجەرگەی کوردستانی ئەمڕۆدا دەستی پێکردووە و دوایی هەر لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە

---

[39]. دەبێت ئەوە بزانرێت کە ناوی مێسۆپۆتامیا ناوێکە کە یۆنانیەکان بۆ ئاماژەکردن بەو ناوچەیە بەکاریان هێناوە و بە هیچ جۆرێک خەڵکی ناوچەکە بەکاریان نەهێناوە. لە بنەڕەتدا ناوەکە یۆنانیە و ماناکەی دەبێتە (وڵاتی نێوان ڕووبارەکان).

[40]. ئەم ناوە لەوەوە هاتووە کە هەر کام لەو شارانە وەک دەوڵەتێکی سەربەخۆ ڕۆڵی دەبینی و سۆمەریەکان کۆنترین دەوڵەتە شاریان لە مێژوودا دروست کردووە.

بەرەو باشور براوە. کەشوهەوای ئەو سەردەمەی خوارووی مێسۆپۆتامیا و  بوونی ڕووبار و دەشتی بەرین، کە هۆکارێکی گرنگن بۆ ئاسانکردنی ژیان، پاڵی بە خەڵکانی باکورەوە ناوە کە بەرەو باشور بڕۆن و لەوێ شارستانیەتەکە بەرفراوانتر بکەن. بەڵگە ئارکیۆلۆژیەکان پشتگیری لەو ڕاستیە دەکەن کە شارستانیەت سەرەتا لە زاگرۆسدا پەیدا بووە و شوێنەوارەکانی کوردستان لەوانەی خواروتر کۆنترن. ئاسەواری  دێی چەرموو[41] کە نزیکەی ٩٠٠٠ ساڵ کۆنە، ئەوبۆچونە پشتڕاست دەکاتەوە، کە هەزاران ساڵ پێش شارستانیەتەکانی خوارووی مێسۆپۆتامیا، لەوێوە سەرەتاکانی نیشتەجێبوون و کشتوکاڵکردن دەستپێکردوە. بێگومان چەرموو تەنها بەڵگە نیە بەڵکو چەندین شوێنەواری تری ناوچەکە ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن.
دەتوانرێت هەموو قۆناغەکانی بەرەو پێشچون، لە مرۆڤی ئەشکەوتەوە بۆ نیشتەجێبوون و کشتوکاڵکردن و دوایی داهێنانی نووسین و داهێنانی شارستانیەتێکی ئاڵۆز، لە شوێنەوارەکانی کوردستاندا، لە شانیدار، چەرمو(نزیک چەمچەماڵ)، زاوێ (ناوچەی ئاکرێ)، زارزی، هەزار مێرد، گرێ ناڤۆکێ[42] (نزیک ئورفە)، هەتاوەکو خوارووی مێسۆپۆتامیا، ببینرێتەوە (Braidwood and Howe, 1960).  بەڵگە ئارکیۆلۆژیەکان وای نیشان دەدەن، کە سۆمەریەکان هەر خەڵکەکەی باکور بوون و لە سەردەمێکدا بۆ پەرەپێدان و گەورەکردنی کشتوکاڵ و شارستانیەتەکەیان هاتوونەتە خوارەوە. بەڵگە زمانەوانیەکانیش بە تەوای پشتگیری لەو بۆچونە  دەکەن، کە ناوچەی مێسۆپۆتامیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست  بە گشتی، لە ڕابردوودا بە کۆمەڵێک لە زاراوەی نزیک لە کوردی نوێ قسەیان کردووە.
سۆمەریەکان، لەبەر ئەوەی کە دامەزرێنەری کۆنترین شارستانیەت بوون لە جیهاندا، زمانەکەیان بە درێژایی هەزاران ساڵ زمانی زانست و ئاین و نووسین بووە. تەنانەت دوای چەندین ساڵ لە حوکمڕانی و بەرفراوانبوونی دەسەڵاتی ئەکەدیەکان، کەچی، نەتەوە سامیەکان هێشتا هەر زمانی سۆمەرییان بۆ ئەدەب و گۆرانیە ئاینیەکانیان بەکار دەهێنا. سۆمەریەکان باوەڕیان وابوو کە پاشاگەری لە خوداوە هاتوەتە خوارەوە. لیستێکیان لە ناوی سەرەتا پاشاکانی خۆیان نووسیوە، کە هەندێکیان هەتاوەکو ئەمڕۆ،  بە تەواوی ڕوون نەبووەتەوە ئایا کەسایەتی ڕاستەقینە بوون یاخود تەنها ئەفسانەیین. هەندێک دەڵێن لەوانەیە ئەوانەش پاشای ڕاستی بووبێتن و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا وورده وورده لای سۆمەریەکان خۆیان کرابێتنە ئەفسانە.
هەتاوەکو سەدەی بیست و سێهەمی پێش زایین و هاتنی ئەکەدیەکان، سۆمەریەکان حوکمڕان و دەسەڵاتداری ناوچەکە بوون، بەڵام دوای سەدەی بیست و سێهەمی پێش زایین ئەکەدیەکان بۆ ماوەیەک بوونە دەسەڵاتدار و حوکمڕانیان لە سۆمەریەکان وەرگرت. هەڵبەت  حوکمی ئەکەدیەکان زۆری نەخایاند، چونکە گوتیەکان هاتن و پەلاماری ناوچەکەیان داو ئەکەدیەکانیان ڕوخاند. لە پاش ڕوخاندنی دەسەڵاتی ئەکەدیەکان سەردەمی نوێی سۆمەری دەستی پێکرد، کە گودیا بەتواناترین و گرنگترین پاشایان بوو. لەو ماوەیەدا کە حوکمی ناوچەکەیان کرد، سۆمەریەکان  زۆر لەو شتانەی کە ئەمڕۆ بوونەتە بەشێکی گرنگی ژیانی مرۆڤ لەلایەن ئەوانەوە داهێنرا، وەک نووسین، دەوڵەتە شار (City Estate)، ئەستێرە ناسی، خشت دروستکردن، مۆری ستونی، کشتوکاڵ، هتد.

### پەیوەندی زمانی کوردی  نوێ و سۆمەری

سۆمەریەکان لە نێوان ٣٣٠٠ – ٣٤٠٠ پ.ز دا بۆ یەکەمجار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نوسینیان داهێنا (Glassner, Bahrani, Mieroop and Hopkins, 2003, P.1). نووسین بە زمانی سۆمەری بۆ

[41]. چەرمو یەکێکە لە کۆنترین دێ لە جیهاندا، ئەم دێیە لەلایەن تیمێکی ئەمریکیەوە لە ساڵانی پەنجاکاندا کۆمەڵێک دۆزینەوەی زۆری تێدا کراوە و لەوێدا چەندین پەیکەر و کەلوپەلی گڵین دۆزراوەتەوە و پاشماوەی دوو جۆر گەنم و جۆرێک جۆی تیا دۆزراوەتەوە. ئەم دۆزینەوەیە بەشێک بوو لە پرۆژەیەکی گەورەی شوێنەوارناسی ئەو ناوچەیە کە زۆر شوێنی هەمەجۆری لە ناوچەکانی کەرکوک، سلێمانی، هەولێر، دهۆک و موسڵی لە خۆ گرتبوو. دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکان لە دوو توێی کتێبێکدا لە ساڵی ١٩٦٠ دا بڵاوکراوەتەوە بە ناونیشانی (Braidwood and  Howe,  Prehistoric Investigations in Iraqi Kurdistan .1960)

[42]. ناوە کوردیە دروستەکەی بریتیە لە گرێ ناڤۆکێ (Girê Navokê) تورکەکان ئەم ناوە کوردیەیان گۆڕیوە بۆ Gobelki Tepe، ئەمڕۆ لە جیهاندا بە ناوە تورکیە نوێکەی ناسراوە.

چەندین سەدە بەردوام بووە و ئەو تێکستە سۆمەریانەی کە دۆزراونەتەوە لە ماوەی ٩٠٠ ساڵدا نووسراون. بۆیە دەبینرێت کە تێکستەکان هەمووی وەک یەک نین لەبەر ئەوەی کە لە ماوەی ٩٠٠ ساڵدا گۆرانکاری بەسەر نووسینی سۆمەریدا هاتووە.

سۆمەریەکان وەک داهێنەری نووسین سەرەتا هەوڵی ئەوەیان نەداوە کە هەرچی دەگووترێت وەک خۆی بینووسنەوە، بەڵکو هەوڵیان داوە سەرە قەڵەم بنووسن و دوایی خەڵکە خوێنەوارەکان، خۆیان لە خوێندنەوەدا، هەموویان گووتووە. بەو جۆرە نوسینەکان زیاتر بە مەبەستی بە بیرهێنانەوە و لەبیرنەچونی شتەکان بووە نەک نووسینی زمانەکە وەکو خۆی (Thomsen, 1984, p.20).

نووسین لە سەرەتا و لە پێش ٣٠٠٠ ی پ.ز دا، بە وێنەکراوە (pictographic) یان وێنەی بیرۆکەکە دەکرا (ideographic)، دوایی ئەم ترادیسیۆنە چوارچێوەیەکی بۆ گەشەسەندنی نووسینی سۆمەری داناوە. لەبەر ئەوەی کە نوسینەکە لەسەر ئەو بناغەیە دارێژرابوو، پرەنسیپەکانی لە نووسینەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە. زمانەوانەکان پێیان وایە کە هەرگیز سۆمەریەکان نووسینیان وەک خۆی نەنووسیوە، بەڵکو تەنها بنەرەتی وشەکانیان نووسیوە. تۆمسن پێی وایە کە هەرچەندە لە نووسینەکانی دواییاندا زیاتر ووردەکاری نووسراوە، بەڵام پرەنسیپی بەکارهێنانی نووسین لای سۆمەریەکان وەک بەبیرهێنانەوە، نەک کتومت گویزانەوەی ووشە گووتراوەکان، هەر وەکو خۆی ماوەتەوە. تەنانەت ڕێکخستنی وشەکان لە هەندێک تێکستدا هەتاوەکو ٢٤٧٠ پ.ز وەک شێوەی خوێندنەوە ڕێک نەخرابوو (Thomsen, 1984, p.20).

سەرەرای ئەو بۆچوونەی تۆمسن، زۆر جار ڕستەی کورت و هەندێک لە ناوی لێکدراوی سۆمەری دەردەخەن کە زمانی سۆمەری لەوە دەچێت زۆربەی جار وەک خۆی تۆمار کرابێت، لەبەر ئەوەی کە لە ڕستە کورت و ناوەکاندا دەردەکەوێت لەگەڵ کوردی نوێدا هێندە نەگۆڕاوە و لە پاش هەزاران ساڵ، تێکستەکان گۆڕانێکی ئەوتۆیان بەخۆیانەوە نەبینیوە.

بۆ بەراوردکردنی سۆمەری و کوردی نوێ، زیاتر پێویستە بە سوود وەرگرتن لە زمانی کوردی لادێکان دەکات نەک زمانی ستاندارد و زمانی شار. لەبەر ئەوەی کە لە لادێ و شارۆچکەکانی کوردستاندا ڕەسەنایەتی زمانی کوردی زیاتر پارێزراوە. بۆ نموونە وشەکانی وەک (دۆس/دۆست، هەش/هەشت، وێسا/وەستا، مەس/مەست، گش/گشت،....) لە زمانی سۆمەریدا هاوشێوەی زمانی لادێکانی کوردستان زۆربەی جار پیتی (ت) ی کۆتایی بەکار ناهێنن؛ سۆمەریەکان وتویانە dusa کە لە زمانی نوسین و ناخاوتنی کوردی شاردا دەبێتە (دۆست) کەچی لە لادێکاندا دەگووترێت (دۆس).

بە گشتی هەندێک لە پیتە سۆمەریەکان لە کوردی نوێدا گۆراوە؛ هەندێک جار پیتی (ک) ی سۆمەری کراوە بە (ج) لە کوردیدا. بۆیە وشەی (کی ki) کە لە سۆمەریدا مانای (جێ) دەدات، لە کوردیدا بووەتە (جی/جێ) بە هەمان مانا.

کۆمەڵێک وشەی زۆری لێکدراویش هەن کە وشەی (جێ) ی تێدایە. بۆ نموونە بە هەڵکراندنی زەوی ( to scratch the earth) گووتراوە ki hur کە دەبێتە (جێ ور/خور) لە کوردیدا. وشەی hur ی سۆمەری مانای (خور/خوران) ی کوردی دەدات. یان ki ĝar مانای (جێ گەران) ی کوردی دەگرێتەوە.

هەندێک جار (ب) ی سۆمەریی دەبێتە (پ) لە کوردیدا و هەندێک جار (ب) ی سۆمەری لە کوردیدا لادەبرێت. بەڵام ئەوەی کە سەرنج دەدرێت، لە فەرهەنگەکاندا زۆربەی جار تەنها ڕەگی وشەکان نووسراون لەبەر ئەوەی کە سۆمەریەکان لە تێکستەکانیاندا بە برگە برگە تێسکتەکانیان نووسیوە. بۆ نموونە gal hur بە مانای گەڵ خوران (scratching groin) تەرجومەکراوە. کە ئەگەر ئەمڕۆ ئەو ڕستەیە بە کوردیەکی سادەی بێ پاشگر بنووسین، دەبێتە گەڵ خور (gal ur/xur) کە ماناکەی دەبێتە (گەڵ خوران). وشەی gal لە سۆمەریدا هەمان مانای (گەڵ/ناوگەڵ) دەدات لە کوردیدا و hur مانای (ور/خور/خوران) دەدات. لە فەرهەنگەکاندا هەندێک جار لەبری تەنها ڕەگی وشەیەک لە نوسینی سۆمەریدا ، وشەکە لە حاڵەتی داهاتوو (موزارع) دا، بێ پاشگرەکانی، نووسراوە. بۆ نموونە ahan لە سۆمەریدا مانای لە کوردیدا (ئەهێن/ ئەهێنێ) دەدات. لەوێدا وا دەردەکەوێت کە ئەوان ڕەگی وشەکەیان خستۆتە حاڵەتی ڕابردووەوە. نموونەی تری چەند وشەیەک لە حاڵەتی ڕابردوودا، agi ی سۆمەری کە (بەکچێنی/کون کردنی نافرەت) تەرجومەکراوە، تەواو مانای (ئەگێ ، گان ئەکا)) ی کوردی دەدات. واتا کتومت وەکو

خۆی ماوەتەوە و نەگۆڕاوە. بە هەمان شێوەش بۆ وشەی aus/us کە مانای (ئەوێسێ/ئەوستێ) دەدات. لە خوارەوە کۆمەڵێک وشەی سۆمەری و بەرامبەرەکەی بە کوردی بە نموونە دانراوە:

| سۆمەری | تەرجومەکەی بە ئینگلیزی و کوردی | وشەی کوردی بەرامبەری | تێبینی |
|---|---|---|---|
| hur, ur | خوران<br>scratch | xur/ur خور، ور | وەک خۆی نەگۆڕاوە. |
| aka | ئەکا<br>to do | akā<br>ئەکا/ئەکات | وەک خۆی نەگۆڕاوە. |
| ana | ئەونە/ئەوەندە<br>as much as | auna<br>ئەونە/ئەوەندە | کەم گۆڕاوە. |
| mir | مار<br>snake | mār مار | |
| are | ئەهاڕێ<br>to grind | ahāre<br>ئەهاڕێ | کەم گۆڕاوە. |
| ezen | جەژن<br>festival | jažin جەژن | گۆڕینێکی کەمی بە خۆیەوە بینیوە. |
| bir | بڕین<br>to shred | bir بڕ/بڕین | وەک دەبینرێت ئەوان بۆ کورتکردنەوە، تەنها ڕەگی وشەکەیان بەکارهێناوە و وشەکە وەک خۆی ماوە. |
| bur | بەردان<br>to release | bar بەر<br>(ڕەگی وشەی بەربوو) | دیسان لێردا دەبینرێت ئەوان تەنها ڕەگی وشەی بەربوونیان تۆمارکردووە. |
| gal | گەورە (گەورەبوون، مەزن؛ ئاژەڵی نێری پێ گەیو)<br>(to be) big, great; (to be) mature (of male animals) | kal کەڵ | هەمان مانای هەیە لە سۆمەری و کوردیدا بەڵام هەندێک جار پیتی (گ) ی سۆمەری لە کوردیدا بە (ک) دەنووسرێت. هەندێک ناوچەی کوردستان ئێستاکەش وشەکە بەشێوەی پیتێک دەڵێن کە لە نێوان هەردوو (ک) و (گ) دایە. |
| duru | تەڕ<br>wet | tar تەڕ | دیسان پیتی (د) ی سۆمەری بووەتە (ت). |
| men | من<br>I | min من | لە هەردوو زماندا ئاماژەیە بە کەسی یەکەمی تاک و نەگۆڕاوە. |
| silan | شێلان (هەویر یان قوڕ)<br>to knead (dough or clay) | šelān شێلان | لێرەدا پیتی (س) ی لە سۆمەریدا بووەتە (ش) لە کوردیدا. |

بە زمانی سۆمەری وشەی are مانای (هاڕ/ئەهاڕی) دەدات بەڵام بە ئاشەوانیان گووتووە arar کە مانای (هاڕەر) ی کوردی دەدات و نموونەی هاوشێوەی لە کوردیدا (دان/دانەر) هەیە. لێرەدا دەبینرێت پاشگری (ەر ar ) کە لە کوردیدا هەیە، لە سۆمەریشدا هەیە. لە ڕاستیدا ئەم پاشگرە لە هەندێک لە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکانی تردا بەدی دەکرێت، بە تایبەتی لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا. بۆ نموونە لە ئینگلیزیدا play/palyer کە مانای (یاری/یاریکەر) دەدا. واتا کردارەکە بە هەمان شێوەی زمانی کوردی و سۆمەری ، بەهۆی پاشگری (ەر ar یان er) وە کراوەتە ناو.

پاشگری (گەر gar) لە سۆمەریدا بۆ ئاماژەکردن بە پیشە یان پراکتیزەکردن بە هاوشێوەی زمانی کوردی بەکارهاتووە. بۆ نموونە asalgar (بیناساز)، emeĝar (جادوگەر) کە ئەمڕۆ وشەی (هێماگەر) دەشێت هەمان مانای جادوگەر بدات. یان وشەی ugul ĝar مانای (دوعاکردن) دەدات.

هەروەها پاشگرو وشەی (گر gir) لە زمانی سۆمەریدا هاوشێوەی کوردیە. بۆ نموونە وشەی a'eĝir کە مانای بەربەستی بچووکی ئاوە و ئەمڕۆ دەبێتە (ئاوئەگر)، هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. وشەی agirgir مانای قامیش دەدات و هەردوو وشەی (گڕ ، گر) لە سۆمەری و کوردیدا هەمان مانایان هەیە. مانای وشەکە لە کوردیدا دەبێتە (ئاگرگر) کە لەگەڵ سروشتی قامیشدا گونجاوە.

تێبینی دەکرێت کە هەندێک وشە هیچ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە. وشەی patesi کە نازناوی حوکمڕان بووە و ئەمڕۆ کورد (پاتشا/پادشا) بەکاردەهێنێت و تەنها گۆڕان ئەوەیە کە پیتی (س) ی سۆمەری دەبێتە (ش) لە کوردیدا. لە زۆربەی وشە سۆمەریەکاندا دەبینرێت پیتی (س) دەکرێتە (ش) لە کوردیدا و بە پێچەوانەشەوە. بۆ نموونە سۆمەریەکان بە ژمارە (هەش/هەشت) دەڵێن (ussu)، کەچی بە (ئێسە/ئێستا) ی کوردی دەڵێن (aše). ئەم حاڵەتی بەکارهێنانی پیتی (س،ش) بۆ هەمان وشە هەندێک جار هەتاوەکو ئەمڕۆش هەر ماوە و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تری کوردستان جیاواز بەکاردێن. بۆ نموونە وشەکانی (سوێر/شۆر، سوتان/شەوتان) لە کوردیدا لە ناوچەی جیاوازدا هەردووکی بەکاردێت. بە گشتی زۆربەی جار پیتی (ش) لە زمانی هیتی، سۆمەری، هوری، میدیدا دەبێتە (س) لە کوردی نوێدا.

پیتی (ب) ی سۆمەری هەندێک جار لە کوردیدا نامێنێت، یان دەبێتە پیتی (و), لەم چەند وشەی داهاتوودا ئەوە دەبینرێت:

| سۆمەری | کوردی نوێ |
|---|---|
| zubi | زێ ze |
| abula | ئاوەڵا āualā |

وشەی gal ی سۆمەری کە هەمان مانای (کەڵ) ی کوردی هەیە، لە زۆر پلەو پایەی سۆمەریەکاندا بەکارهاتووە و وشەیەکی زۆر گرنگ بووە لای سۆمەریەکان و پێکهاتەی زۆر وشەی لێکدراوە. ئەمڕۆ لە کوردیشدا زۆر بەکارهێنانی ماوە. بۆ نموونە (کەڵە پیاو، کەڵە ژن، کەڵە هونەرمەند،....). بە کوپە دروستکەر گووتراوە bahar کە دەبێتە ([43] بامر/بادەر) ی کوردی ئەمڕۆ و لەگەڵ سروشتی کوپە دروستکردندا گونجاوە. بەڵام بە سەرۆکی کوپە دروستکەران گووتراوە bahargal (بامرکەڵ). شایانی ئاماژە پێکردنە کە ئەم وشە لێکدراوە سۆمەریە، لە لای هوریەکان و تەنانەت ئەکەدیەکانیش زۆر بەکارهێنراوە.

بە پێچەوانەشەوە هەندێک جار وشە لێکدراوە کوردیەکان کە ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا هەن، لە بنەڕەتدا لە وشەی سۆمەری دروستکراون. بۆ نموونە، وشەی (پێڵاو) لە کوردیدا لە سێ بەش پێک هاتووە (پێ +ئاڵا+و) لەبەر ئەوەی (پێ ئاڵا) بە تەنها دەبێتە کردار، بەڵام کە پیتی (و) ی خرایە سەر، دەبێتە ناو. هەرچەندە وشەکە لە زمانی سۆمەریدا نیە، بەڵام هەردوو وشەکانی (پێ +ئاڵا) دوو وشەی سۆمەرین و هەمان مانای وشە کوردیەکەیان هەیە. ئەم وشەیە لە ناو هیتیەکاندا بە هەمان مانا بەکارهاتووە و بە شێوەی

[43]. لە لادێکانی کوردستاندا پیتێک هەیە کە زەحمەتە بنووسرێت. پیتەکە لە نێوان بزوێن و پیتی (ها) دایە لە وشەی وەک (بامر) دا دەردەکەوێت، بۆیە بەم شێوە نا ئاساییە وشەکە نووسرا.

puwaliya نووسراوە کە مانای (جلکێکی پێ یان قاچ) ی داوە. هەندێک وشەی کوردی لە تێکەڵی سۆمەری، هوری، هیتی، میدی و لوڤی نووسراون، بۆ نموونە وشەی لێکدراوی کوردی نوێی وەک (سەرسوڕمان) کە پێکهاتووە لە (سەر+سوڕ+مان) و مانای (سەیرمان) دەدات. دەبینریت وشەکە وەک وێنە داڕێژراوە و مابەست لێی (سەر بە سوڕایی ماوەتەوە)؛ وشەی (سوڕ) سۆمەریە، (مان) هوریە و (سەر) لە میدیدا هەمان مانای زمانی کوردی ئەمڕۆ دەدات و لە سۆمەری و هوری و هیتی و لوڤیدا ماناکەی نزیکە.
یان ئەمڕۆ کاتێک کە کوردێک دوعا دەکات و دەڵێت "خودا من لە بەڵا لا دە"، بەشەکانی وشەکە هەموویان هەزاران ساڵ کۆنن و بنەچەکەیان سۆمەری و هورین. وشەی (خودا) هوریە و لە هوریدا بەشێوەی xud نووسراوە و بە مانایەکی نزیک لە مانای خودا بەکارهاتووە، هەروەها ڕاناو، پاشگر و وشەکانی (من، بەڵا، لا، دە) هەموویان سۆمەرین و بە هەمان مانا و مەبەستی ئەمرۆی زمانی کوردی بەکارهاتوون. ئەگەر چی، تاکو ئێستا ڕستەی لەو جۆرە لە زمانی سۆمەریدا بەرچاو نەکەوتووە، بەڵام تاقە وشەکان و ئامرازەکان، لای ئەوانیش بە هەمان مەبەست بەکار هاتووە.
یان کاتێک کە دەگووترێت "ئەی دا و بێ دا"، دیسان (ئەی، دا، و، بێ، دا) هەر هەموویان وشەی سۆمەرین. تەنانەت (و) کەش هەر هەمان مانای هەیە. ئەگەر ئەو ڕستەیە بە سۆمەری و بە هەمان مانا بنووسرێت، ئەوا دەبێتە i di u be di، واتە سەرەڕای پێنج هەزار ساڵ لە نێوان زمانی کوردی و سۆمەریدا، ئەو دێڕە گۆڕانی بە خۆیەوە نەدیوە. دەبینرێت کاتێک کە سۆمەریەکان سکاڵا لە نادادوەری دەکەن، هانا بۆ خوای ڕۆژ دەبەن و دەڵێن i utu کە ئەمڕۆ دەبێتە ئای هەتاو (ai hatau).
لەم کۆمەڵە وشانەی خوارەوەدا پێکهاتەی وشەی سۆمەری و کوردی بە ڕوونی دەبینرێت و دڵنیا دەکرێتەوە کە زمانی کوردی ڕاستەخۆ زمانی سۆمەریە و گۆڕینی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە (بۆ مەبەستی بەراوردکردن، وشە کوردیەکان بە شێوەی بڕگەیی نوسراون):

| وشەی سۆمەری | ماناکەی بە ئینگلیزی و کوردی | گۆڕینی لەسەر وشە کوردییەکە |
|---|---|---|
| nu-zu<br>نەزو | نەزان<br>ignorant | na-zān/zā نەزا/نەزان: لە سۆمەریدا nu مانای (نە) ی کوردی هەیە و zu مانای (زان) ی کوردی هەیە. لە کوردیدا ئەم وشەیە بەشێوەی (زا،زان) نووسراوە. (بڕوانە وشەی zu ی سۆمەری بە مانای زانین) |
| nu-dug-ga<br>نەدوگ گە | نادوێت/قسەناکات<br>not talking | nā-du-e نادوێ: dug لە سۆمەریدا هەمان مانای (دو) ی کوردی هەیە کە قسەکردنە. ئەوەی کە زۆر جار تێبینی دەکرێت، سۆمەریەکان بزوێنی پاشگر بە تەنها دانانێن، بەڵکو بۆ مەبەستی لێ تێک نەچوون ئەو پیتەی پێشی لەگەڵدا دووبارە دەکەنەوە. بۆ نموونە لێرەدا دەبوو بنووسن nu-dug-a بەڵام ئەوان پیتی g کە دوایەمین بەشی وشەکەیە دووبارەیان کردۆتەوە، بۆ ئەوەی کە بزوێنەکە تەنها نەبێت.<br>دەکرێت ئەم وشەیە لە سۆمەریدا بە شێوەی na-du-a ش بنووسرێت و هەر هەمان مانا بدات. |
| nu-a<br>نوە | نەبوون<br>be without | ni-a نیە: هێندە نەگۆڕاوە. |
| nu-me-a<br>نو مێە | کە ئەوە نیە<br>which is not ('not' + 'to be' + nominative). | na-mā-a نەما ە: لە سۆمەریدا me مانای (ما/مان) ی کوردی دەدات و nu مانای (نە) دەدات. ڕستە کورتە سۆمەرییەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (نە+بوون+ جێگری بکە). لە کوردیشدا بە هەمان شێوە شیدەکرێتەوە بە (نە+بوون+جێگری بکەر). |

| | | |
|---|---|---|
| nu-me-en-na-ta<br>نو مێین نەتە | نەماویت<br>you don't exist | na-mā-ui-ta نەماویتە: هەمان مانا دەدات بەڵام وشە سۆمەریاکانی nu-me-en-na-ta لە کوردیدا بۆ کەسی دووهەمی کۆ بەکار دێت. شایانی باسە کە لە کوردیدا دەگووترێت (نەماویتە/ نەماویت) مەبەست لێی ئەوەیە کە کەسی بەرامبەر لاوازبووە و لە ڕووی لەشولارەوە لە بارێکی ناهەمواردایە. |
| nu-zu-a<br>نو زوە | نەزانراو<br>unknown | na-zān-iau/na-zā-u نەزانیاو/نەزاو: لێرەدا وەک لەسەرەوە باسکرا. وشەکە وەک خۆی ماوە. (بڕوانە وشەی zu لە فەرهەنگەکەدا) |

یان ئەگەر سەرنجی ئەم ڕاناو و وشانەی خوارەوە بدەین، دیسان دەبینرێت کە سۆمەری و کوردی هەر هەمان زمانن:

| سۆمەری | تەرجومەکەی بە ئینگلیزی و کوردی | وشە بەرامبەرەکەی بە کوردی | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ane | ئەو (بۆ نێر و مێ)<br>he, she | au/āna<br>ئەو/ئانە | دەبینرێت لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا پیتی (ن) ی سۆمەری بووە بە (و) لە کوردی نوێدا، لە هەندێک ناوچەی تردا وەک خۆی ماوە. هەروەها لە هەندێک حاڵەتدا لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا پیتی (ن) ی سۆمەری بە تەواوی لابراوە و بە نموونە anna ی سۆمەری لە کوردیدا بووەتە (وایە uāia). ئەم حاڵەتە لە زۆر وشەی تریشدا دەردەکەوێت. سۆمەریەکان لە بری (ئەنجا/ئەوجا) ی کوردی دەڵێن anga. کە دیسان دەبینرێت لە هەندێک ناوچەدا پیتی (ن) ی سۆمەری گۆڕاوە بۆ (و) و وشەکە بووە بە (ئەوجا) و لە هەندێکی تردا وەک سۆمەری ماوە بەشێوەی (ئەنجا). |
| anene | ئەوان<br>they | uānān/auān<br>وانان/ئەوان | |
| ana | ئەوەندە<br>as much as | anina/auana/auanda<br>ئەوندە/ئەوەنە/ئەننە | |
| anna | وایە<br>indeed | uāia<br>وایە | |
| anga | ئەنجا<br>moreover | anjā/aujā<br>ئەنجا/ئەوجا | |
| angam | لە ئەنجامدا<br>consequently | anjām<br>ئەنجام | |

ئەگەر سەرنجی ئەو وشانە بدەین کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە ئەندامەکانی لەشی مرۆڤەوە لە زمانی کوردیدا هەیە، ئەوا دەردەکەوێت کە چەند وشەیەک وەکو خۆیان ماون و هەندێکیان کەمێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە و هەندێکی تریان مانای گشتی وشەکە لە زمانی کوردی نوێدا ماوەتەوە، هەر وەک لە خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

| سۆمەری | کوردی | تێبینی |
|---|---|---|
| a | āu ئاو | لە هەردوو زماندا بە مانای (ئاو، شەهوەت) دێت. |
| ahan | ahen ئەهێن | بە مانای (ڕشانەوە/هێنانەوە) لە هەردوو زماندا دێت. |
| bur | bar بەر | لە هەردوو زماندا بریتە لەو بەشەی لەش کە دەکەوێتە سەرو ئەندامی |

| | | |
|---|---|---|
| | | زاوزێی مرۆڤەوە. |
| du | du دو | لە هەردوو زماندا دمبێتە ڕەگی کرداری (دوان/قسەکردن). |
| dur | tir تر | لە هەردوو زماندا بریتیە لەو بایەی کە مرۆڤ لە دواوە دەری دەکات. |
| gal | gal گەڵ | ناوچەی ئەندامی زاوزێ، لە هەردوو زماندا نەگۆڕاوە. |
| ĝeli | galu, garu گەلو، گەرو | لە هەردوو زماندا مانای (قوڕگ) دەدات. |
| guz, ki-iz | gīs, qiž kazi, گیس، قژ، کەزی | بە سۆمەری guz بە مانای قژی پڕ و درێژ دێت و ki-iz بە مانای پاکردنەوە و ڕێکخستنی قژ یان گیا دێت، لە کوردیدا (قژ) مانای توکی سەر دەدات و (کەزی) دەبێتە (زوڵف، گیای حەسیر) و (گیس) مانای (پرچ) دەدات. |
| gubar | gepara گێپەرە | لە کوردی و سۆمەریدا بە مانای (پشتی مل) دێت. |
| kul | qol قۆڵ | وشەکە لە سۆمەریدا مانای (قۆڵی ئامێر) دەدات. لە کوردیدا مانای (قۆڵی مرۆڤ و ئامێر) دەدات. |
| kuš | kāž کاژ | لە هەردوو زماندا بە مانای (پێست) دێت. |
| meli | mil مل | ئەو بەشەی لەش کە دەکەوێتە نێوان سەرو شان. لە هەردوو زمانەکەدا بە نزیکی نەگۆڕاوە. |
| nu | nu نو | لە هەردوو زماندا دمبێتە ڕەگی کرداری (نووستن). |
| gumur | qamūr قەمور | لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا هاوشێوەی زمانی سۆمەری، بە مانای (بڕ بڕەی پشت ) دێت و لە کوردیدا مانای (پشت چەماوە) شی هەیە. |
| pah | pāh پاە/ پا | لە هەردوو زماندا مانای (قاچ) دەدات. |
| saĝ | salk سەلک | لە هەردوو زماندا بە مانای (سەر) دێت. |
| sañ | sān سان | لە سۆمەریدا مانای (سەر) دەدات، بەڵام لە کوردیدا نازناوی پاشایە کە هەردووکیان یەک پرنسیپیان هەیە. |
| tab | ta تا | لە زمانی کوردی و سۆمەریدا هەردووکیان مانای (بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش) دەدات. |
| sir | sir سڕ | ئەم وشەیە لە کوردی و سۆمەریدا ماناکەی ماوە. کە لە کوردیدا بۆ لەرزین لەسەرماو حاڵەتی نەتوانینی جوڵاندنی بەشێکی لەش لە ئەنجامی بەسەرکەوتنیدا بۆ ماوەی درێژ دێت. لە سۆمەریدا بۆ لاوازی و لەرزین دێت. |
| šul | šil/ šila شلە/شل | لە سۆمەریدا نەخۆشیەکی پێستە و لە کوردیدا کونجە بوونی پێست هەمان ناوی هەیە. |
| mi | me مێ | لە هەردوو زماندا مانای (مێ/مێینە) دەدات. |
| giri | girī گری | لە هەردوو زمانەکەدا هەمان مانای (گریان) دەدات. |
| gula | guli گولی | لە سۆمەریدا بریتیە لە نەخۆشیەک و لە تەرجومەکردنیدا دەستنیشان نەکراوە، لە کوردیدا نەخۆشیەکە کە ئەمڕۆ نەماوە، ناوە پزیشکیە جیهانیەکەی بریتیە لە Leopracy. |
| ubur | uar وەر | لە سۆمەریدا مانای مەمکی ئافرەت دەدات و بە زاراوەی گۆران، لاناوە لە شەرمینە و مەمکۆلان (جەلیلیان، پ.٣٨). |
| suhur | sar | لە سۆمەریدا بە مانای (پێستی تەپڵی سەر؛ لوتکەی درەخت، هەر شتێک وەک پۆپنە یان توک لەسەر سەری ئاژەڵ بێت) دێت، لە کوردیدا بە مانای |

(سەری مرۆڤ، لەسەر شتێک، سەرووی شتێ) دێت.

پاشگری (ە) لە کوردیدا بە هەمان مەبەستی سۆمەری بەکار دێت. لە کوردیدا ئەو پاشگرە کردار یان ئاوەڵکردار دەکاتە ناو. بۆ نموونە لە کوردیدا وشەی (سور) کە ڕەنگێکە، کە دەکرێتە (سورە) ماناکەی دەبێتە ئەو کەسەی کە سورە. بەو جۆرە (شێر/شێرە، شڕ/شڕە، برد/بردە، زەرد/زەردە). لە زمانی سۆمەریدا šar کە مانای کوشتار دەدات، بووەتە šara کە ئەمەی دووهەمیان خوای شەڕە. لە کوردیدا هەرچەندە وشەی (شەڕ) هەیە و (شەڕە) نیە، بەڵام لە ڕووی ڕێزمانیەوە وشەی (شەڕە) لە کوردیدا دروستە.
لە هەندێک وشەدا هەموو حاڵەتەکانی گۆڕینی کردار لە سۆمەریدا دەردەکەوێت. وشەی silañ, sila لە سۆمەریدا مانای (شێلا، شێلان) دەدات لە کوردیدا. بەڵام ئەم وشەیە بنەڕەتی وشەکەشی لە کوریدا هەر ماوە کە لە وشەی (شل) پەیدا بووە و مانای (نەرمی، شتێک کە ئاسان بێتە خوارەوە) دەدات. کە بووەتە (شێلا، شێلان)، یەکەمیان کردارە و دووهەمیان ناوە و چاوگیشە. هەروەها لە سۆمەریدا šilig ی لێ دروستکراوە کە مانای (هەویر) دەدات، کە لە هەمان ڕەگی (شل) دروستکراوە کە بێ گومان سۆمەری و کوردیە. لە کوردیدا (شلکی) جۆرێکە لە نان و یەکێک لە ماناکانی (شلکینە) دەبێتە (هەویری تراو).
هەروەها وشەی وەک ešgiri کە مانای (ئیشکەر) دەدا و ešgar کە مانای (ئیشوکار) دەدا و ešbar کە مانای (ئیش برانەوە) دەدات و gu éš-gàr کە مانای (گای ئیشکەر) دەدات. ئەمانە بەڵگەن بۆ ئەوەی کە وشە سۆمەریەکان لە هەموو بارێکدا هەر کوردین. ناوی کوردی لێکدراوی وەک (گا+ئیش+کەر) لە سێ بەش پێکهاتووە و لە سۆمەری هەمان مانای هەبووە. ئەمڕۆ هەر سێ بەشەکەی لە کوردیدا ماوە و بە هەمان مانا بەکاردەهێنرێت و بە هەمان شێوەی وشەی وەک (ئیش+بڕ) یان (ئیش+کەر)، هەمووی ئەو بۆچوونە دوو پات دەکەنەوە.

تۆمسن (Thomsen, 1984, p.59, 60 and 61) بە ووردی باسی حاڵەتی کۆ (جمع) لە زمانی سۆمەریدا دەکات. سۆمەریەکان هەرگیز لەگەڵ ژمارەدا ناو ناکەنە کۆ. زۆر جار کە ناوێک بە تاک باس دەکەن، هەمان مانای کۆشی دەبێت. بۆ نموونە کە دەڵێن gu مەبەستیان لە یەک گا یان کۆمەڵێک گایە. لە کوردیشدا کاتێک کە دەگووترێت (گا)، ئەو وشەیە مانای کۆ و تاکیش دەدات. بۆ نموونە لە کوردیدا دەگووترێت (گای باشم هەیە) لەوێدا دەشێت (گا) کۆ یان تاک بێت. هەروەها لە سۆمەریدا هەرگیز لە دوای ژمارە ناو ناکرێتە کۆ. بە هەمان شێوە لە کوردیدا بۆ نموونە دەگووترێت (١٢ کراسم کڕی)[44].
هەروەها بۆ بەکۆکردن سۆمەرییەکان پاشگری ene/en بەکاردەهێنن، لە کوردیدا پاشگر و ئامرازی (ان) بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە lu gal ene مانای (پاشاکان) دەدات. دەبینرێت جگە لەوەی کە وشەکە هەمان مانای ماوە لە کوردیدا، کە دەبێتە (لۆ کەڵان، کەسە کەڵەکان) (بڕوانە فەرهەنگەکە)، جگە لەوەش پاشگری (ان) لە سۆمەری و کوریدا لە هەمان شوێندا بەکارد دێن و شێوەی بەکارهێنانی ئەو پاشگرەش وەک یەکە. هەروەها لە سۆمەریدا دەگووترێت nin šeš ene. وشەی nin مانای (خوشک) و šeš (برا) و ene (پاشگری کۆیە). مانەکەی دەبێتە (خوشک و براکان). دەبینرێت (ان) لە سۆمەریدا هاوشێوەی کوردی یەکجار بۆ هەردوو ناوەکە بەکاردەهێنرێت و هەردوو ناوەکە دەکاتە کۆ. یان دەگووترێت digir gal gal ene وشەکان پێک دێن لە digir (خوا) و gal (کەڵ، مەزن). ماناکەی دەبێتە (خوا گەورە گەورەکان). دەبینرێت لە سۆمەریدا پاشگری (ان) وەک کوردی دەخرێتە دوای ئاوەڵکردارەوە و ئاوەڵکردارەکەش وەک کوردی دووبارە بووەتەوە. بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە سەرەڕای پەیوەندی ڕێزمانی، ڕستە سۆمەریەکە ئەگەر بنووسینەوە دەبێتە (داگر کەڵ کەڵان). کە لە کوردیدا ماناکەی ئەمڕۆ دەبێتە (دادگر کەڵ کەڵان) و ماناکەشی هەر نزیکە لە زمانی سۆمەریەوە. پاشگری و ئامرازی (ان) ی بەکۆکردن لە زمانی سۆمەری، میدی، لیدی و کوردیدا یەکە.

[44] . مەرج نیە هەموو ناوچەیەک پەیڕەوی ئەم سیستەمە بکات بەڵکو لە کۆمەڵێک شوێن وەک هەولێر، کۆیە، قەڵادزێ، مەهاباد، ڕانیە، هتد. و هەندێک ناوچە لە دەڤەری موکریاندا دەیکاتە کۆ و دەڵێت (دوانزە کراسانم کڕی).

جگە لەو پاشگرە سۆمەریەکان پاشگری (hia هیا) ش بە شێوەیەکی زۆر دەگمەن بەکاردەهێنن بۆ بەکۆکردن. ئەمڕۆ ئەم پاشگرە لە کوردیدا بەشێوەی (ها) ماوە و لە حاڵەتی دەگمەندا بەکاردێت، بۆ نموونە (چەندەها خەڵک، هەزارەها منداڵ). بەڵام لە سۆمەری و لە کوردیشدا، بۆ بەکۆکردن، زیاتر پاشگر و ئامرازی (ان) بەکاردەهێنرێت نەک (ها).
دووبارە کردنەوەی ئاوەڵکردار لە سۆمەریدا بە مەبەستی ئاستی توندی شتەکەیە (Thomsen, 1984, p. 65. بۆ نموونە کە لە کوردیدا دەگووترێت (کابرا کوڕی گەورە گەورەی هەیە) لەوێدا بە دووبارەکردنەوەی ئاوەڵکردارەکە (گەورەیی کوڕەکانی دەکرێتە زۆر گەورە) بەڵام ئەگەر تەنها بگووترێت (کوڕی گەورەی هەیە) لەوێدا کوڕەکانی تەنها گەورەن. جگە لەوەش سۆمەریەکان ئەو دووبارەکردنەوەیە بۆ هەموو ئاوەڵکردارێک بەکارناهێنن، بەڵکو بۆ ئەو وشانە بەکاری دەهێنن کە مانای (ڕەنگ، گەورە، بچووک، ناپاک، زۆر، ....) . ئەم ئاوەڵکردارانە هەمووی لە کوردیدا دووبارە دەکرێنەوە و بە هەمان مانای سۆمەری. بۆیە لە کوردیدا کاتێک کە دەگووترێت (شاییەکە پڕ بوو لە کچی جوان جوان)، لێرەدا ڕستەکە مانای کۆمەڵێک ئافرەتی زۆر جوان دەدات. کەواتە بێ بەکۆکردنی ناوەکە (کچ) مانای کۆی هەیە و دووبارەکردنەوەی ئاوەڵکردارەکە مانای زۆری پلەی جوانیەکە دەدات. بۆیە کە دەگووترێ (چاک چاک ئیشەکەم کرد) هەر دیسان لەوێدا (ئیش) تاکە و دووبارەکردنەوەی ئاوەڵکرداری (چاک) بە هەمان مەبەستی بەکارهێنانە لە لای سۆمەریەکان.
لێکچوونێکی گرنگی تر لە نێوان زمانی سۆمەری و کوردیدا هەیە کە جێندەر نیە (Thomsen, 1984, p.49). ئەمە لە کرمانجی خواروو (سۆرانی) دا بە تەواوی دەردەکەوێت کە نزیکترین زاراوەی کوردیە لە سۆمەری. هەتاوەکو ئەمڕۆ هیچ ئامرازێکی تایبەت بە جێندەر (نێر و مێ) نیە و هاوشێوەی سۆمەری نێر و مێ بە هیچ شتێک جیا ناکرێنەوە. لە ڕستە کورتەکاندا پەیوەندی ڕێزمانی سۆمەری و کوردی زۆر بە ڕوونی بەدی دەکرێت. ئەگەر سەرنجی ئەم ڕستە سۆمەریە بدرێت بە نموونە، ama- dumu-dumu-ne (Thomsen, 1984, p. 62) ماناکەی دەبێتە (دایک هەموو منداڵەکان) و بە کوردی دەبێتە ama-tom-tom-ane (ئامە تۆم تۆمان). (تۆم) لە کوردیدا هەر هەمان وشەی (تۆخم/تۆو) وە و وشەی ama هەتاوەکو ئەمڕۆش لە کوردیدا بە مانای دایک دێت (هەژار p.12) و پاشگری (ان) یش دەیکاتە کۆ. ئەگەر بە کوردی ئیمڕۆ ئەو ڕستەیە بنووسین، ڕستەکە دەبێتە (دایک کوڕ کوڕان[45]).
ڤیتۆ (Vito, 1993, p.104, 105) لێکۆڵینەوەی لەسەر ناوە سۆمەری و ئەکەدیەکان کردووە و چەند ناوێکی سۆمەری لێکدراوی خستۆتە ڕوو. بۆ نموونە:

| [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|
| lu-dingir- ra<br>لو دینگر رە | پیاوی لە خوا<br>man-of-(the)-God | lo dīngir a لۆ دینگرە: لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە ( پیاوی ئاین ڕاگر). سۆمەریەکان بە خوایان گوتووە dingir. وشەی gir ی سۆمەری هەمان مانای (گر) دەدات لە کوردیدا، هاوشێوەی ئەوە لە کوردیدا دەبێتە وشەی (میراتگر، نێشکگر، خۆڕاگر، دەستگر). وشەی lu ی سۆمەری هەمان مانای وشەی (لۆ) دەدات لە کوردیدا کە بریتیە لە (کابرا، کەسێک). |
| dingir zi mu<br>دینگر زی مو | خوا ژیانمە<br>God is my life | dīngir žī ma دینگر ژی مە: دەبینرێت شوێنی کردار و ڕاناو لە کوردی و سۆمەریدا هەر یەکن. |

45. لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا و بە تایبەتی گەرمیان ناڵێن (دایکی کوڕەکە) بەڵکو دەڵێن (دایک کوڕەکە) و ئامرازی پێکەوە بەستن بەکارناهێنرێت. بۆیە لەوێدا (ئامە تۆم تۆمان) بەکارهات.

| | | |
|---|---|---|
| dingir-mu-ama-mu<br>دینگرمو ئامەمو | خوام دایکمە<br>My-God-is-my-mother | dīngir m āma ma دینگرم ئامەمە: سەرنج دەدرێت کە هەموو پێکهاتەی ڕستەکە لە سۆمەری و لە کوردیدا دوای نزیکی پێنج هەزار ساڵ یەکن. ئەم ڕستەیە لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (ڕاگری ئاینم دایکمە). وشەی ama ی سۆمەری کە مانای (دایک) دەدات، لە کوردیدا دەبێتە (ئامە) و ڕاناوی لێکدراوی (م) ی کوردی لە سۆمەریدا دەبێتە mu. بەو جۆرە ڕستەکە گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە. |

لە بەشی داهاتوودا چەند ڕستەیەکی کوردی نوێ بە نموونە دانراوە و تەرجومە سۆمەریەکەشی لەتەنیشتیدا دانراوە. هەر چەندە لەوانەیە هەندێک جار شوێنی وشەکان لە گەڵ یەکدا وەک یەک نەبن بەڵام دەبینرێت لەیەکچوونەکە زۆر جێی سەرسوڕمانە. لە بەراوردکردنندا هەمیشە کوردی لادێکان بەکاردێت و بە مەبەستی بەراوردکردن لە کوردیشدا ڕستەکان وەک نووسینی سۆمەری بە شێوەی بڕگەیی نووسراوە:

| [illegible] | [illegible] | [illegible] |
|---|---|---|
| bāb m na mā a<br>بابم نەماه | pap mu nu me a[46]<br>پاپمو نە مێە | واتە (باوکم نەماوە) |
| bāb m kin ama m uesa a u nā du e<br>بابم کن ئامەم وێساه و نادوێ | pap mu kunu ama mu us a u nu du a<br>پاپمو کونو ئامەمو وس و نو دوە | واتە (باوکم لە کن دایکمەوە وەستاوە و قسە ناکات) |
| min pah m šit<br>من پام شت | men pah mu šita<br>مێن پام شتە | واتە (من قاچم شت) |
| hatāu girā a<br>هەتاو گیراه | utu gira a<br>وتو گیراە | واتە (خۆر گیراوە) |
| āma m giriauhalā akā<br>ئامەم گریە و هەلا ئەکا | ama mu giri'ilu aka<br>ئامەمو گیریلو ئەکا | واتە (دایکم شیوەن ئەکا) دەکات) |
| āma m nā du e īse<br>ئامەم نادوێ ئیسێ | ama mu nu du a aše<br>ئامەمو نو دوە ئەشێ | واتە (دایکم نادوێ/قسە ناکات (ئێستا) |
| māl m tar ni a<br>ماڵم تار نیە | immal mu dar nu a<br>یماڵمو دار نوە | واتە (ماڵەکەم تاریک نیە) |
| bāb m be nan u āu nā nu e<br>بابم بێ نان و ئاو نانوێ | pap mu be ninda u a nu nu a<br>پاپمو بێ نیندە و ئا نو نوە | |
| bāb m na nu e<br>بابم نانوێ | pap mu nu nu a<br>پاپمو نونوە | واتە (باوکم ناخەوێ) |

46. وشەی (پاپ) هەرچەندە لە زمانی سۆمەریدا بە مانای (باوک) هاتووە، بەڵام بەکارهێنانی کەم بووە.

| | | |
|---|---|---|
| bāb m sī asīr ī barā<br>بابم سی ئەسیری بەرا | pap mu ušu asiri bara<br>پاپمو ئوشو ئەسیری بەرا | واتە (باوکم سی ئەسیری بەردا) |
| bāb m dār sāf akā<br>بابم دار ساف ئەکا | pap mu dur sub aka<br>پاپمو دور سوب ئەکا | واتە (باوکم دار ساف ئەکات) |
| bāb m sī Dinar ī lā īa<br>بابم سی دیناری لایە | pap mu ušu [47]Dinar lá-ìa<br>پاپمو ئوشو دینار لایە | واتە (بابم سی دینار قەرزدارە) |
| ama m īš kar ni a<br>ئامەم ئیشکەر نیە | ama mu éš-gàr nu a<br>ئامەمو ئێشگەر نوە | واتە (دایکم ئیشکەر نیە) |
| ama m īšukar aka<br>ئامەم ئیشوکار ئەکا | ama mu ešgar aka<br>ئامەمو ئێشگار ئەکا | واتە (دایکم ئیشوکار دەکا) |
| basī girīa<br>بەسی گریە | ibsi guria<br>ییسی گوریە | واتە (بەسە گریان). |
| āma m jo ahāre<br>ئامەم جۆ ئەهاڕێ | ama mu še are<br>ئامەمو شێ ئارێ | واتە (دایکم جۆ ئەهاڕێ) |
| mil m gaur ia<br>ملم گەورەیە | meli mu gur a<br>مێل مو گورە | |
| bāb m āu paīā akā<br>بابم ئاو پەیا ئەکا | pap mu a pa-è aka<br>پاپمو ئا پەیێ ئەکا | واتە (باوکم ئاو پەیدا ئەکا) |
| bāb m nār u camandar axu ā<br>بابم نار و چەمەنەر ئەخوا | pap mu nuur u sumundar gu a<br>پاپمو نوور و سوموندەر گوە | واتە (بابم هەنار و چەوەنەر ئەخوات) |
| bāb m gue ze nan axu ā<br>بابم گوێ زێ نان ئەخوا | pap mu gu zubi ninda gu a<br>پاپمو گو زوبی نیندە گوە | واتە (بابم لە گوێ چەم نان ئەخوات) |
| āma m ži/žīn ma<br>ئامەم ژی/ژینمە | ama mu zi mu<br>ئامەمو زی مو | بە مانای (دایکم ژیانمە) |

زمانی کوردی بە زمانێکی هیندۆئەورووپی دادەنرێت و دەشبینرێت زمانی سۆمەری و کوردی یەکن، کەچی هەتاوەکو ئەمڕۆ زمانەوانەکان زمانی سۆمەریان نەخستوتە ناو گرووپی زمانەکانەوە و وەک زمانی هوری، ئەویش بە زمانێکی تاقانە دادەنرێت کە پەیوەندی بە هیچ کام لە گرووپەکانەوە نەبێت. سەرەڕای ئەوەی کە ئەو بۆچوونە لە ناو زماناوانەکاندا بە تەواوی جێگیر بووە بەڵام وەک لەم وشانەی خوارەوەدا ڕوون دەبێتەوە، چەندین وشەی سۆمەری هەن کە جگە لەوەی لە کوردیشدا دەردەکەون، لە زمانە هیندۆ ئەورووپیەکانیشدا هەن. بۆ نموونە:

| سۆمەری | کوردی | زمانی هیندۆئەورووپی | تێبینی |
|---|---|---|---|
| abārāša | barāsi<br>بەراسی/بەراستی | verità ئیتالی<br>vérité فەرەنسی | |
| giri | girī<br>(بگریان) | cri فەرەنسی (هاوار)<br>cry ئینگلیزی(هاوار و گریان) | |

[47]. وشەی (دینار) لە زمانی سۆمەریدا نیە، بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوە ئەو وشەیە بەکار هاتووە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | gråta سویدی (گریان)<br>græde دانیمارکی (گریان) | |
| gêli | galu/garu<br>گەلو/گەرو<br>(قورگ) | gola ئیتاڵی<br>gula لاتین<br>gala سانسکریت | |
| nu-zu | na zā/na zān<br>(نەزان) | nescio لاتین<br>nevezhda ڕوسی<br>nezinošs لاتڤی<br>nevezh بولگاری<br>unwise ئینگلیزی | وشەی (نەزان) لە زمانی سۆمەری/کوردی و هەموو زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا لە دوو بەشی سەرەکی پێک دێت (نە+ زا) کە بنەچەکەی سۆمەری/کوردیە و لە هەموو زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دووبارە دەبێتەوە. |
| gu | ko/ge<br>کۆ/گێ<br>(گشت) (هەژار، پ.٧٣٨)) | co زمانە ئەوروپیەکان | ئەم وشە سۆمەریە لە زمانی کوردیدا بە تەنها بەکار دەهێنرێت و زۆر جار دەبێتە پێشگر بۆ کردارو ناوەڵکردار: کۆبونەوە، کۆکردنەوە، هتد. لای میدەکان وشەی kome بە مانای (دەسەلاتی ناوچەیی) بەکار هاتووە، کە لێرەشدا لە سەرچاوە سۆمەریەکە نزیکە و لە کوردیدا هەمان مانای ماوە. هەروەها ئەم وشەیە بە پێشگر بۆ زۆرێک لە وشەکانی زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکان بەکار دەهێنرێت. بۆ نموونە لە ئینگلیزدا coordination, cooperation, co-author, colabiration. |
| bur (لە سۆمەریدا مانای یەکەی قەبارەی هەیە) | bār (لە کوردیدا بۆ قەبارە و کێش بەکار دەهێنرێ، بۆ نموونە دەگووترێت "دوو بار قەیسیم هێنا") کە ئاماژەیە بە قەبارە و بە کێشیش | bar ئینگلیزی و فەرەنسي (یەکەی پاڵەپەستۆ )<br>bear لئینگلیزیدا (هەڵگرتن)<br>baros یۆنانی (کێش)<br>bar ئاڤێستا (هەڵگرتن) | لە کوردیدا وەک کردار (بارکردن) مانای هەڵگرتن دەدات و وشەکە لە زمانی ئاڤێستا و میدیشدا ماوە. |
| gara | kara کەرە (ئەو چەوریەی کە دەکەوێت سەرشیر) | cream ئینگلیزی<br>crème فەرەنسی<br>grädde سویدی | بە بەراورد بە سۆمەری تەنها پیتی (گ) گۆڕاوە بۆ (ک). |
| a | āu ئاو | eau فەرەنسی<br>agua ئیسپانی | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ibsi | /basa/basīatī basīatī<br>بەسە/بەسی<br>/بەسیەتی | basta ئیتاڵی و ئیسپانی | دەبینرێت ئەم وشەیە لە کوردیدا بە شێوە کۆنە سۆمەریەکەشی ماوە، بەڵام تەنها شێوە نوێکەی کە بریتیە لە (بەسیەتی)، چووەتە زمانە هیندۆئەوروپیەکانەوە. |
| nu | نە/نا na/nā | no ئینگلیزی و ئیسپانی و ئیتاڵی<br>nein ئەڵمانی | |
| gu | گا gā | cow ئینگلیزی<br>kuh ئەڵمانی<br>ko سویدی<br>koe هۆڵەندی | لە زمانی کوردی نوێ و سۆمەریدا مانای (نێرەی مانگا) دەدات، بەڵام لە زمانە هیندۆئەوروپیەکانی تردا مانای (مانگا) دەدات. |

ئەم پەیوەندیە هەر تەنها لە وشەدا نیە، بەڵکو لە ڕستە کورتەکانیشدا ئەو پەیوەندیە بە زمانە هیندۆئەوروپیەکانەوە دەردەکەوێت. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت ئەوەیە کە لە کاتێکدا شوێنی بەشەکانی ڕستە لە سۆمەری و کوردیدا وەک یەکن، بەڵام لە زمانە هیندۆئەوروپیەکانی تردا هەندێک گۆڕان بە خۆیانەوە دەبینن.

| | | |
|---|---|---|
| ibsi guria<br>ییسی گوریە | basī girīa<br>بەسی گریە (بەسە گریان) | basta piangere (ئیتاڵی) مانای (بەسە گریان) دەدات.<br>basta gridare (ئیتاڵی) مانای (بەسە هاوارکردن) دەدات.<br>basta de gritar (ئیسپانی) مانای (بەسە هاوارکردن) دەدات. |
| nu-a<br>نوە | nī-a<br>نیە | an-ast پەهلەوی<br>nije کرواتی و سربی<br>non è ئیتاڵی<br>não é پورتوگالی |
| pap mu nu zu a<br>پاپمو نو زوە | bab m na zā a(zān a)<br>بابم نەزانە (نەزاه) | pidara m nā dān ast (فارسی) |
| ama mu nu zu a<br>ئامەم نو زوە | ama m na zā a(zān a)<br>ئامەم نەزانە (نەزاه)<br>(واتە دایکم نەزانە) | moya mama ne znaet (ڕوسی)<br>moja majka je u neznanju (کرواتی) |
| ama mu zi mu<br>ئامەمو زیمو | āma m ži(žīn) ma<br>ئامەم ژی/ژینمە<br>بە مانای (دایکم ژیانمە) | I mana mou íne i zoí mou (یۆنانی)<br>moja majka je moj život (کرواتی)<br>mādara m zinadgie man ast (فارسی)<br>moya mat' - eto moya zhizn' (ڕوسی) |
| ama mu šub ba<br>ئامەمو شوبە | āma m šuan a<br>ئامەم شوانە (دایکم شوانە)<br>(زۆربەی جار کوردی پیتی (ب) ی سۆمەری دەکاتە | my mum is shepherd (ئینگلیزی)<br>meine mutter ist schäfer (ئەڵمانی) |

| | ((و | |
|---|---|---|
| ama mu gardu a<br>ئامەمو گاردوە | āma m gurd a<br>ئامەم گوردە<br>(لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (دایکم پاڵەوانە) بەڵام لە زمانی سۆمەریدا ماناکەی دەبێتە (دایکم سەربازە) و لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا، ماناکەی دەبێتە (دایکم پاسەوانە). | my mum is a guard (ئینگلیزی)<br>ma mère est une garde (فەرەنسی)<br>mi madre es una guardia (ئیسپانی)<br>minha mãe é um guardiã (پۆرتوگالی)<br>mia mamma e' una guardia (ئیتاڵی) |

وەک لە ڕستەی سۆمەری ama mu gardu a دا دەرکەوت، تێبینی دەکرێت داڕشتنی ڕستە لە سۆمەری و کوردیدا وەک یەکە. جیاوازیەکە لەگەڵ زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا ئەوەیە کە شوێنی ڕاناوەکە دەگۆڕێت و دوای ناوەڵناو دەکەوێت؛ لە هەموو زمانەکاندا زیاتر ئەو گۆڕانکاریە ڕوویداوە. بۆیە ئەگەر لە زمانی ئینگلیزیدا گۆڕانکاری بە شوێنی پێکهاتەی ڕستەکە بکرێت. دەبینرێت پێکهاتەی ڕستە سۆمەری و ئینگلیزیەکە بە نزیکی یەکن. ئەوانەی سەرەوە چەند نموونەیەکن بۆ ئەو پەیوەندیە و هەموو وشە هاوبەشەکان لەگەڵ زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا لە فەرهەنگە سۆمەری کوردیەکەدا ڕوونکراوەتەوە .

(نەخشەی ژمارە ٧) ئەو ناوچانەی کوردستان کە ئەمڕۆ زاراوەکەیان زۆر لە سۆمەری نزیکە

زمانی سۆمەری پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ هەموو زاراوە کوردیەکاندا هەیە؛ ئەگەر سەرنجێکی ورد بدرێت، بە ئاسانی دەبینرێت کە هەندێک لە وشەکان، لە لادێکان و لە ناوچە شاخاوی و هەندێک جار لە

ناوچە دەشتیەکاندا پارێزراون. هەندێک کاراکتەری سۆمەری لە ناوچەکانی گەرمیان و هەندێک جار وشەکە تەنها لە کرمانجی سەرودا بەو مانایە ماوە. بەو پێیە لە ڕووی وشە سازیەوە زمانی سۆمەری پەیوەندی لەگەڵ هەموو زاراوە کوردیەکاندا هەیە. لە هەمان کاتدا لە فەرهەنگەکەدا بە ڕوونی پەیوەندی نێوان زمانی سۆمەری و زمانە هیندۆ ئەوروپیەکان ڕوون دەبێتەوە و هیچ گومان لەوەدا نیە کە زۆربەی وشە هیندۆ ئەوروپیەکانی ئەمڕۆ لە زمانی کوردی کۆن (سۆمەری) ەوە هاتوون و بە دڵنیایی زمانی سۆمەری زمانێکی هیندۆئەوروپیە.

لە ڕووی ڕێزمانیەوە لێکچوونی زمانی سۆمەری زیاتر لە زاراوەکانی خوارووی کوردستاندا دەردەکەون. بە تایبەتی بە بەراورد لەگەڵ شێوە ئاخاوتنی لادێکاندا دەردەکەوێت کە زمانی سۆمەری نەک سەرەتای زمانی کوردیە، بەڵکو زمانی کوردی خۆیەتی. لە ڕووی ڕێزمان و وشەکاریەوە، نزیکترین زاراوەی کوردی لە زمانی سۆمەریەوە لە لادێکانی گەرمیان هەتاوەکو لادێکانی شارەزوور بەدی دەکرێت و ئەگەر زیاتر دەستنیشانی ناوچەکان بکرێت ئەوا لادێکانی شارەزوور، دەروبەری سلێمانی، بانە، مەریوان، دەروبەری کەرکوک، هەتاوەکو کەلار کفری خورماتو و خانەقین و بە ئاراستەی سنە؛ لەو ناوچانەدا هەتاوەکو ئەمڕۆ بە زمانێکی زۆر نزیک لە زمانی سۆمەری قسە دەکرێت و هەندێک لە ڕستەکان دوای پێنج هەزار ساڵ گۆڕانی ئەوتۆیان بە خۆیانەوە نەبینیوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٧). هەڵبەتە لە ناوچەکانی دەروبەریشدا هەر هەمان زاراوە قسە دەکرێت، بەڵام بە هەندێک گۆڕانکاری کەمەوە. بۆیە بێ هیچ گومانێک، زاراوەی کرمانجی خواروو بە گشتی زمانی سۆمەریە.

**ئایا هەموو کوردێک دەتوانێت لە تێکستە سۆمەریەکان بگات؟**

وەک باسکرا سۆمەریەکان یەکەم نەتەوە بوون لە مێژوودا کە نووسینیان داهێنا. بۆ ئەم مەبەستە لەسەر قوڕی نەرم دەمیان نووسی و دوایی قوڕەکەیان لە ئاگردا سور دەکردەوە بۆ پاراستنی. ئەم نووسینە لە سەرەتادا زۆر سادە بووە، بەڵام دوای ئەوەی کە نووسین بە کۆمەڵێک قۆناغدا تێپەڕیوە، لە ئەنجامدا گەیشتۆتە ئەوەی کە ئەمڕۆ پێی دەگووترێت نووسینی بزماری. سەرەتا وێنەی شتەکان ڕاستەوخۆ دەکراو لەگەڵ کاتدا بۆ هەر بەشێکی زمان کاراکتەری ئاڵۆز دانرا کە زۆربەی جار وێنەی شتەکە لە قۆناغەکانی دوایی نووسیندا هەر ڕەنگی دەدایەوە. لۆرێنس (Lawrence, 2012) ئەو پرۆسەیەی لە ڕێگای چەند وشەیەکەوە خستۆتە ڕوو هەر وەک لە خشتەکەی داهاتوودا ڕوونکراوەتەوە:

(وێنەی ١٠) تێکستیکی سۆمەری، مۆزەخانەی بەریتانی

| وشە سۆمەریەکە | چۆنێتی نووسینی و قۆناغەکانی گۆڕانی ١٠٠٠ پ.ز | ٢٤٠٠ پ.ز | ٣٠٠٠ پ.ز | ٣٢٠٠ پ.ز | ماناکەی |
|---|---|---|---|---|---|
| sag | | | | | سەر |
| gin | | | | | ڕۆیشتن |
| šu | | | | | دەست |
| še | | | | | جۆ |
| ninda | | | | | نان |
| a | | | | | ئاو |
| ud | | | | | ڕۆژ |
| mušen | | | | | باڵندە |

هەندێک جار سۆمەریەکان یەک وشەیان بەمانای جیاواز بەکارهێناوە ، هەرچەندیشە بە شێوەی جیاوازیش نووسراوە، بەڵام نوسینە لاتینیەکەی موتەرجیم هەمان دەنگ و خوێندنەوەیە. بۆ نموونە وشەی gu لە سۆمەریدا کۆمەڵێک مانا دەدات کە لە کوردی ئەمڕۆدا هەموو ئەو مانایانەی ماون، بەڵام شێوەی وتنیان گۆڕاوە. جا نازانریت ئایا لەو سەردەمەشدا هەر بە هەمان شێوەی کوردی ئەمڕۆ گووتراوە و زمانەوانەکان نەیانتوانیوە بە تەواوی بیخوێننەوە یاخود هەر تەنها یەک خوێندنەوەی هەبووە و مانای جیاوازی داوە؟ ئەگەر سەیری شێوە نوسینە بزماریەکەی خوارەوە بکەین دەبینین کە بۆ پێنج مانای جیاواز چوار شێوە نوسینی جیاواز بەکارهێنراوە، بەتایبەتی جیاوازیەکی زۆر لە نێوان نوسینی ( خواردن) لەگەڵ نوسینی (گا) دا هەیە، ئایا ئاخۆ ئەو جیاوازیەش لە خوێندنەوە و دەنگدا هەبووە؟ ئەمە بابەتێکە دەبێت زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکرێت و گران دەبێت کە ئەو بابەتە یەکلابکرێتەوە. هەر چۆنێک بێت وشەی gu ی سۆمەری لە کوردیدا بە مانای (کۆ، گوێ، خۆ، گا) هاتووە وەک لە خشتەکەی داهاتوودا ڕوونکراوەتەوە:

| نووسینی سۆمەری | چۆنێتی خوێندنەوەی بە سۆمەری | مانای وشە سۆمەریەکە | وشە بەرامبەرەکەی لە کوردی نوێدا و تێبینی |
|---|---|---|---|
| | gu | خواردن | xo خۆ: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی وشەی (خواردن). بۆ نموونە (نانەکە بخۆ، ئەخۆم، ناخۆم). |
| | gu | دەنگ، دەنگە دەنگ | go گۆ: لە کوردیدا بە مانای (قسەکردن و دەنگ) دێت. لە سۆمەریدا بە مانای (دەنگ) دێت. |
| | gu | کۆ، گشت | ko/ge کۆ/گێ: بە هەردوو شێوەکەی بە مانای (گشت) دێت (هەژار، پ.٧٣٨). |
| | gu | قەراخ، گوێ چەم | gue گوێ: مانای (قەراخ، گوێ چەم) دەدات. بۆ نموونە (گوێ چەم، گوێ ئاگردان). دەبینرێت هەمان |

| | | | |
|---|---|---|---|
| کاراکتەری سۆمەری بۆ هەردوو وشەی (کۆ، گوێ) بەکارهاتووە. | | | |
| ga گا: مانای (گا) دەدات کە نێرەی مانگایە. | گا | gu | |

وەک لە خشتەکەدا خراوەتە ڕوو، هەردوو وشەکانی (کۆ، گوێ) ی سۆمەری هەمان کاراکتەری نووسینی بسماری ولاتینیشی بۆ بەکارهاتووە. جا ئەگەر وشەکانیش بکرێنە ئەلف و بێی لاتینی، هەر زەحمەتە کوردێک لە خوێندنەوەکەی تێ بگات. لەبەر ئەوەی وەک لە وشەی gu دا دەردەکەوێت دەبێت بزانرێت بە کام مانا ئەو وشەیە بەکار هاتووە یاخود لە خوێندنەوەدا چ دەنگێکی هەبووە. بێگومان نمونەی تریش هەن لە زمانی سۆمەریدا کە هەمان کێشە دروست دەکەن لەوانە a ، کە دەشێت لە سۆمەریدا مانای (ئاو یان شەهوەت) بدات یاخود ڕۆڵی پاشگری هەبێت. بۆیە تێگەیشتنی تێکستی سۆمەری بە ئەلف و بێی لاتینیش هەر زەحمەت دەبێت بۆ خوێنەرێکی ئاسایی کورد. بەڵام بۆ کوردێک سەخت نابێت، کە لە ناوە لێکدارەکان یان ڕستە سۆمەریە کورتەکانی وەک gal hur کە بە شێوەی ◈ ⊨ دەنووسرێت و لە کوردیدا مانای (گەڵ خور/ور) یان (گەڵ خوران) دەدات، یان وشەی a de کە بەشێوەی ⊨ ‖ دەنووسرێت مانای (ئاو دە/دەدا) دەدات، لەگەڵ ڕوونکردنەوە ئینگلیزیەکەیدا، تێی بگات.
ئەو ڕستە کورتانە بە دڵنیایی ئەوە دەسەلمێنن کە کوردێکی ئەمڕۆ، ئەگەر بیتوانیایە بە لەش بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەری مێسۆپۆتامیا، ئەوا کێشەیەکی ئەوتۆی نەدەبوو لە تێگەیشتنی قسەکردنی سۆمەری.

**ئایا کورد ڕابردووی سۆمەری و دێرینی خۆی زانیوە یان مێژوو ئاماژەی پێکردووە؟**
زۆر مایەی سەرسوڕمان دەبێت کە ئەگەر کورد ئەو هەموو ڕابردووەی هەبووبێت و ئاماژەی پێ نەکرابێت و خۆی بەو ڕاستیە ئاشنا نەبووبێت. ئەگەر زمانی سۆمەری و کوردی هەر هەمان زمان بووبێتن و سۆمەریەکان کورد بووبێتن، ئایا چۆن دەبێت سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژەیان پێ نەکردبێت و کوردیش بەو ڕاستیە نا ئاشانا بووبێت. تێکستی کوردی نوێ لە نزیکی سەدەی هەشتەمی زاینیەوە، جگە لە شیعر، کەمیان ماون، بەڵام سۆمەریەکان گەنجینەیەکی زۆری نوسینیان جێ هێشتووە. ئێستاکە چەندین تێکستی سۆمەری سەبارەت بە بابەتی جیاواز لەبەردەستدان و وەرگێڕاونەتە سەر زمانە جیاوازەکانی جیهان. ئەمڕۆ کتێب زیاتر لەسەر مێژوو و زمانی سۆمەری هەیە وەک لە سەر زمانی کوردی نوێ. زیاتر بەڵگەی سۆمەری لەبەردەستدان وەک لە کوردی. بۆیە لەبەر ڕۆشنایی زۆر لایەن لە ژیانی سۆمەریەکان، ژیانی کوردستان لە ڕابردوودا باشتر بۆ خەڵک ڕوون دەبێتەوە.
سۆمەریەکان سەرەتای مێژووی دروست بوونی مرۆڤیان نووسیوە و چیرۆکەکەیان بەستووە بە دامەزراندنی شارستانیەتەکەی خۆیانەوە. تێسکتی ئەو چیرۆکە دۆزراوەتەوە و بە ووردی باسی سەرەتای دروستبوونی ژیان کراوە. تێکستەکە دەڵێت کە دوای ئەوەی گەردوون لە دەریا دروست بوو و خواکان دروست بوون. خواکان مرۆڤیان لە قوڕ دروست کرد بۆ ئەوەی کە زەوی بکێڵێت، ئاگای لە مەڕوماڵات بێت و بەردەوام بێت لە پەرستنی خواکان. دوایی شارەکان دروستکران و پاشایەتی لەسەر زەوی دانرا. بەڵام لەبەر چەند هۆیەک دوایی خواکان بڕیاریان دا کە مرۆڤ بە هۆی لافاوێکەوە لە ناو بەرن. یەکێک لە خواکان بە ناوی ئێنکی (Enki)، بڕیاریدا کە زیوسودرا (Xisuthros/Ziusudra[48]) لەو پیلانە ئاگادار بکاتەوە کە کەسێکی زانا و مرۆڤێکی باش بوو. ئێنکی فەرمانی بە زیوسودرا دا کە کەشتیەکی گەورە

[48]. ئەم ناوە بە شێوەکانی Zan- suddu/Zi-ud-sura/Ziusudra'/Xisuthros دەنووسرێت. بە هۆی کۆنی ناوەکەوە بە شێوەی جیاواز نووسراوە و یۆنانیەکان بە Xisuthros و Ziusudra ناویان هێناوە. داستانی بەسەرهاتی ئەم کەسە وەکو چیرۆکی ڕوداوەکەی نوح دەردەکەوێت و زۆر سەرچاوە بە نوحی لە قەڵەم دەدات. ناوەکەی بە مانای جیاوازی (ژیانی درێژی دوزیەوە) و بە (ژیانی ڕۆژگاری درێژ) و (درێژی ژیان) تەرجومەکراوە . ئەمڕۆ ئەورووپیەکان کە زیاتر متمانە دەکەنە سەر سەرچاوە یۆنانیەکان بە Ziusudra ناوی دەهێنن.

دروست بکات بۆ ئەوەی کە خۆی و گیانلەبەران ڕزگار بکات. لافاوەکە هەموو دنیای گرتەوە و بۆ حەوت ڕۆژ و حەوت شەو بەردەوام بوو. دوای ئەو ماوە درێژە خۆر هەڵهات و ڕۆشنایی گەیشتە بەهەشت و زەوی. ئەنجا زیوسودرای پاشا لە بەلەمەکەی هاتە دەرەوە و لەبەردەم خوای ڕۆژدا زەوی ماچ کرد و سوژدەی بۆ هەردوو خواکان ئان (An) و (Enlil) برد و وەک پاداشتێک، ئەمری پێ بەخشرا و دوای لافاوەکە، پاشایەتی کە سەرەتا لە ئاسمانەوە هاتە سەر زەوی، یەکەمجار لە Kish دەستی پێکرد. داستانەکە بە شێوەی جیاواز لە لەلایەن سۆمەریەکان و نەتەوەکانی دوای سۆمەریەکانەوە گێردراوەتەوە.

(وێنەی ١١) تێکستێکی مێسۆپۆتامیا سەبارەت بە چیرۆکی لافاوەکە.

مێژوونوسی بابلی، بیرۆسوس، هەمان داستانی لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا گێڕاوەتەوە (بڕوانە میدەکان). ئەویش سەرەتا بەوە دەست پێ دەکات کە دوای ئەوەی خوای بێل (bel) خۆرو مانگ و پێنج ئەستێرەکەی دروست کرد، فەرمانی بە خواکانی تر دا کە مرۆڤ لەسەر زەوی دروست بکەن. سەرەتا مرۆڤەکان کێوی بوون و وەک ئاژەڵ دەژیان، هەتاوەکو زیندەوەرێکی تازە کە ناوی ئۆوانیس (Oannes)[49] بوو هاتە ناوچەکە (بڕوانە وێنەی a,b,c ١٣). ئەم زیندەوەرە زانایە کە بەشێکی لەشی مرۆڤ و بەشەکەی تری ماسی بوو، خەڵکی فێری زانست و زانیاری کرد و ئامۆژگاری کردن کە چۆن زەوی و زار بچێنن و بکێڵن و بەروبووم بدرونەوە. هەروەها فێری دروستکردنی پەرستگە و شار و نووسینی یاسا و ڕێساکانی کردن. بەو جۆرە ناوچەکە لەلایەن حەوت دەسەڵاتدارەوە دەبرا بەڕێوە و لەو ماوەیەدا شەش ئۆوانیسی تر لە دەریاوە هاتن کە ئەوانیش هەر زانینیان فێری خەڵک دەکرد کە هەمووی لە حەوت کتێبدا دانرابوو. دوایی سێ دەسەڵاتداری تر حوکمڕانیان گرتە دەست. خوای بێل کە خۆی یەکێک بوو لە حوکمڕانەکان، زیوسودرای ئاگادار کردەوە لەوەی کە لافاوێک دێت و هەموو زیدەوەرەکان لە ناو دەبرێن. بەو جۆرە زیوسودرا کەشتیەکی گەورەی دروستکرد بۆ خۆ دەربازکردن و دوای حەوت ڕۆژ و حەوت شەو هاتە دەرەوە. لێرەدا چیرۆکەکە زیاتر لە کەشتیەکەی نوح دەچێت کە لە تەورات، ئینجیل و قورئاندا باس دەکرێت. بەڵام دەبێت ئەوە بزانرێت کە ئەم داستانە زۆر لە پێش دەرکەوتنی هەر سێ ئاینەکەدا لەلاین سۆمەرییەکانەوە نوسراوە.

---

[49]. ئەم ناوە دیارە تەرجومە یۆنانی ئەو زیندەوارانە بووە. لەبەر ئەوەی کە بە زمانی سۆمەری پێیان گووتراوە abgal و ئەکەدیەکان کە لەوانیان وەرگرتووە پێیان گووتووە abkallu .

(وێنەی ١٢) گودیا، یەکێک لە پاشا هەرە ناودارەکانی سۆمەریەکان.

زیوسودرا دوای هاتنە دەرەوەی لە کەشتیەکە، حەوت کتێبەکەی، کە لە شاری سیفەر/سیپارا (Sipara/Sephar)[50] شاردبووەوە، دەرهێنا و ژیانی دەستپێکردەوە و شاری بابلی دروست کردەوە. لە دوای ئەو هەشتا و شەش دەسەڵاتدار حوکمی بابلیان کردووە کە هەشتا و چواریان میدی بوون و تەنها دوانیان کلدانی بوون (Neibuhr, 1852, p.241) (Lewis, 1862, p.403). دیسان بێروسوس دەڵێت کە دوای ئەو هەشتا و شەش حوکمڕانە، سەرلەنوێ میدیەکان[51] بابلیان گرتەوە و هەشت پاشای تریان بۆ ماوەی ٢٢٤ ساڵ حوکمرانی بابلیان کرد. بە گشتی ئەو مێژووەی بیرۆسوس هەر چەندە لایەنی ئەفسانەیی بە ڕوونی تێدا بەدی دەکرێت، بەڵام لە هەمان کاتدا بەشێکی ڕاستی مێژوویی ئەم بۆچوونەی بیرۆسۆس لەگەڵ بۆچوونی کورد خۆیدا، لە سەدەی نۆهەمی زاییندا، گونجاوە. لەبەر ئەوەی کە ئیبن وەحشیە لە کتێبەکەیدا کاتێک باسی ئەلف و بێی کوردی و بۆچوونی کورد سەبارەت ڕابردووی خۆی دەکات لە سەدەی نۆهەمی زایندا دەڵێت "کلدانیەکان زاناترین خەڵکی سەردەمی خۆیان بوون و شارەزای هەموو زانست و هونەرێک بوون. یەکەم کەس کوردەکان بوون کە دەیانویست بگەنە هاوشانیان و کێبڕکێ کەریان بن، بەڵام بە دڵنیاییی جیاوازی نێوان ئەم دوو میللەتە زۆر ڕوونە. کارامەیی کوردەکان لە زانستی کشتوکاڵ و تایبەتمەندی ڕووەکدا دەردەکەوێت. کوردەکان دەڵێن گوایە ئەوان لە نەوەی بەنوشاد (بینوشاد) ن و کتێبی زانستی کشتوکاڵیان لە ئادەم، دروودی خوای لێ بێت، بۆ ماوەتەوە. وە کتێبەکانی سەفریس (صفریث) و کتێبی قوسامی (قوثامي) یان لەلایە. بە هەر حاڵ ئەوان دەڵێن گوایە ئاشنای حەوت کتێبەکەی پێش لافاوەکە و پەڕاوی پیر دوانای (مصحف السيد دواناي) ن و دەڵێن ئاشنای جادوگەری[52] و تەلیسمانن. بەڵام وانیە، بەڵکو ئەوان ئەو زانیاری و هونەرانەیان تەنها لە کلدانیەکانەوە بە دەست گەیشتووە و کلدانیەکان لەوانەدا لەوان کۆنترن، لەبەر ئەوە هەمیشە دوژمنایەتی لە نێوانیاندا بەردەوامە". ئیبن وەحشیە بەردەوام دەبێت و لە

[50]. ئەم ناوە بەشێوەی جیاواز و لە سەرچاوەی جیاوازدا باسکراوە. هەندێک سەرچاوە دەڵێن ناوی شارەکە خۆی مانای (شاری کتێبەکان) دەدات.

[51]. لێرەدا بیرۆسوس ئاماژە بە گوتیەکان دەکات کە بابلیان لە ئەکەدیەکان گرتەوە، دەنا چۆن پاشاکانی پێشووتر میدی بوون و هەشت پاشای تر هەر میدی بوون. جگە لەوەش ئەو ٢٢٤ ساڵەی کە باسی دەکات لەگەڵ سەردەمی حوکمی گوتی و بوژانەوەی سۆمەریەکاندا گونجاوە. (بڕوانە بەشی میدەکان).

[52]. لەو سەردەمەدا جادوگەری مانای زانستی ئەستێرە ناسی و کیمیا و زانستە نهێنیەکانی تری داوە.

باسی ئەلفوبێ کوردیەکەدا دەڵێت "کوردەکان دەڵێن بەنوشاد و ماسی سۆراتی (ماسي السوراتي)[53] هەموو زانیاری و هونەرێکیان بەم ئەلف و بێیە نوسیوە" (Bin Wahshih, 1806, p.131,132).

(وێنەی ١٣ a,b,c) ئابگەل (ئۆوانیس) (Oanes) ئەو بونەوەرە ئەفسانەییانەی کە سۆمەریەکان باسیان کردوون و نیوە ماسی و نیوە مرۆڤ بوون. لە ڕاستەوە، وێنەی یەکەم و دووهەم لە پەرستگەکانی بابل و نەینەوا هەڵکەندراون و سێهەمیان لە سەر هەڵکەندراوی سۆمەری دروسکراوەتەوە.

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانرێت کە زانا و کەسایەتیە گرنگەکانی ئەو سەردەمەی نەتەوە سامیەکان کە حوکمڕانی بابلی نوێیان دەکرد لە نەتەوەی کلدانی بوون و لە سەرچاوە یۆنانیەکانیشدا کلدانیەکان (Chaldian) وەک خەڵکی زانا سەیکراون. ئەوەی کە جێگای سەرنجە ئیبن وەحشیە کە خۆی کلدانی بووە[54]، دەڵێت یەکەم نەتەوە کە لە زانستدا کێبڕکێی کلدانیەکانی کردوە کورد بووە. هەرچەندە لەبەر ئەوەی کە خۆی کلدانیە و پشتگیری لە کلدانیەکان کردووە لە پاشتردا دەڵێت کورد زانستی لە کلدانیەکان وەرگرتووە و کلدانیەکان لەوەدا لە کورد کۆنترن، بەڵام ئاماژە بەوەش دەکات کە هەموو زانستەکان لای کورد هەبووە و خاوەنی ئەو زانستانە بوون. هەروەها ئیبن وەحشیە کە دان بەوەدا دەنێت کە کورد لە زانستی کشتوکاڵ و تایبەتمەندی ڕووەکدا لە کلدانیەکان و هەموو کەس بەتواناتر بووە، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە کوردەکان ئەو زانستەیان پشتاوپشت لە سۆمەریەکانەوە پاراستوە. بە قسەی ئیبن وەحشیە کوردەکان لە کشتوکاڵ و تایبەتمەندی ڕووەکدا لە کلدانیەکان بەتواناتر بوون و گوتوشیانە کە کشتوکاڵیان لە ئادەمەوە بۆ ماوەتەوە. ئەمەش دیسان ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە کوردەکان ئاشنای ڕابوردوی دێرینی خۆیان بوون لەزانستی کشتوکاڵدا. بێگومان مامەڵەکردنی زانستیانەی کشتوکاڵ، لە سەدەی نۆهەمی زاییندا، ئەوە دەسەلمێنێت کە کورد نەتەوەیەک بووە لە پێش هەموانەوە نیشتەجێ بووە. چونکە تایبەتمەند بوون لە کشتوکاڵدا و سەیرکردنی ئەو لایەنە وەک زانست، پێویستی بە نیشتەجێبوونی درێژخایەن هەیە. بۆیە ئەوە دیسان ئاماژەیە

[53]. بە داخەوە زۆربەی کتێبە کوردیەکان لەبەر ئەوەی ئەو زانیاریانەی ئیبن وەحشیەیان لە سەرچاوەکە خۆیەوە وەرنەگرتووە، بۆیە زۆر جار سەرچاوە کوردیەکان بە ئەلف و بێکە دەڵێن (ماسی سۆراتی) کە ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە. وەک دەردەکەوێت ئەلف و بێکە هەر ئەلف و بێی کوردی بووە بێ هیچ ناوێکی تایبەتی. (ماسی سۆراتی) کەسێک بووە کە کورد لەو سەردەمەدا ئاماژەی پێ کردووە. وا دەردەکەوێت کە یەکەمجار ئەم هەڵەیە لەلایەن ئایەتوڵای مەردوخیەوە کرابێت و دوایی زۆربەی لێکۆڵەرەوە کوردەکان هەر هەمان هەڵەیان دووبارە کردۆتەوە.

[54]. ئیبن وحشیە خۆی کلدانی بووە و ناوی تەواوی بریتیە لە (احمد بن ابوبكر بن وحشية النبطي الكداني) (Bin Wahshih, 1806, p.136)؛ لە ناوەکەیدا ئەوە دەردەکەوێت. بۆیە بە ڕوونی بۆچوونەکانی پشتگیری لە کلدانیەکان دەکات لەو ڕکەبرایەتیەی لە نێوان کلدانی و کورد دا هەبووە سەبارەت بە بنەچەی زانستی مێسۆپۆتامیا.

بە دێرینی کورد لە ناوچەکەدا و پەیوەستی بەرەچەڵەکی سۆمەریەوە. دەبێت ئەو ڕاستیە بزانرێت کە زانستی کشتوکاڵ سەرەتا لای سۆمەریەکان بووە و مانەوەی لە ناو کوردا بەشێوەیەکی نایاب وەک ئیبن وەحشیە باسی لێوە دەکات، ئەوە دەسەلمێنێت کە کوردەکان هەر سۆمەریەکانن.
ئیبن وەحشیە بەردەوام دەبێت و دەڵێت "من لە بەغدا سی [٣٠] کتێبم بینی کە بەو ئەلفوبێیە نووسرابوون، لە شام دوو کتێبم لەوانە لەلا بوو، کتێبێکیان سەبارەت بە ڕواندنی مێو و دار خورما[55] و کتێبێکەی تریان سەبارەت بە کێشەکانی ئاو و چۆنێتی دەرهێنانی بوو لە ناوچە نەناسراوەکاندا[56]. من ئەو کتێبانەم لە زمانی کوردیەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی بۆ ئەوەی کە مرۆڤایەتی سوودی لێ ببینێت. بەهۆی ئەوەوە نەمتوانی زووتر ئەم کتێبە تەواو بکەم" [57](Bin Wahshih, 1806, p.134,135). دەبینرێت ئیبن وەحشیە هێندە ئەو کتێبە زانستیە کوردیانەی لە لا گرنگ بووە کە نوسینی یەکێک لە گرنگترین کتێبەکانی، بۆ خۆی و بۆ جیهان، دواخستووە بۆ وەرگێڕانی ئەو زانستانە.
لە نوسینەکەی ئیبن وەحشیەدا دەردەکەوێت کە ئەو بۆچوونەی کە کوردەکان سەبارەت خۆیان ووتویانە هەر هەمان بۆچون بووە کە بیرۆسوس-ی مێژوونوس، لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا سەبارەت سەرەتای مێژووی بابل باسی لێوە دەکات. لەبەر ئەوەی سەرەتا کوردەکان گوتوویانە ئەوان لە نەوەی (بینو شاد) ن. دەبینرێت کە ئەم ناوە نیوە تەرجومەی زمانی سامیە بۆ (زان سود zan sudu) ی سۆمەری/کوردی. لەبەر ئەوەی کە (زان) لە کوردیدا مانای (منداڵ/بەرە خستنەوە) دەدات. هەروەها zantu لە میدیدا مانای (خێڵ) دەدات، لە ڕەگی (زێ/زا) وە هاتووە و لە کوردیدا مانای (منداڵ خستنەوە) دەدات و لە سۆمەریدا zi مانای ژیان دەدات. وشەی binu/banu وشەیەکەی سامی کۆنە و بە مانای (منداڵ، خێڵ) دێت. بۆیە وشەی(بینو binu)[58] ی سامی هەر هەمان مانای وشەی (زان) دەدات. بەو جۆرە (زان سودو) لە لایەن ئیبن وەحشیە کە لە ڕوانگەیەکی ئارامیەوە باسی بۆچوونی کوردەکانی کردووە، کراوەتە (بینو شاد). بەرەچاوکردنی ئەوەی کە زۆر جار وەک پێشتر باسکرا پیتی (س) لەلایەن نەتەوە سامیەکانەوە دەکرێتە (ش) بۆ نموونە (سوبارو/شوبارو) و هەروەها لە ڕابردوودا پیتێکی (و u ) هەبووە کە ئەمڕۆ نەماوە و لە زۆربەی وشە سۆمەریەکاندا بەدی دەکرێت. حاڵەتی نیوە تەرجومەکردنی ناوە کوردیەکان، لە ناو نەتەوە سامیەکاندا شتێک بووە کە پەیڕەو کراوە. بۆ نموونە (گەرمیان = بیت گرمای، کوردیان = بیت قارد/کاردو) کە نزیکی زیاتر لە دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا کراوە.
لە پاشتردا ئیبن وحشیە باسی (ماسی سوراتی) دەکات کە وا دەردەکەوێت ئەویش باسی هەمان ئەو زیندەومرانە بکات کە بیرۆسوس ئاماژەی پێکردوون، کە گوایە نیوەی لەشیان ماسی بووە و نیوەکەی تری مرۆڤ بووە. کورد لەو سەردەمەدا پێی وابووە کە هەردووکیان بە زمانی کوردی زانیاری و زانستیان نووسیوە. (ماسی سۆراتی) لە کوردیدا مانای (ماسی ڕەنگ سور) و لە زمانی سۆمەریشدا بە جۆرێک لە ماسی ئەفسانەیی دەگووترێت suhur-maš و وشەی (ماسی) لە هەموو حاڵەتەکاندا بەدی دەکرێت. لەوە دەچێت کورد هەر مەبەستی لە زیندەومرە ئەفسانەییە شێوە ماسیەکان بووبێت.
بە دڵنیایی کوردەکان لەو سەردەمەدا خۆیان بە بەرەی یەکەمین پاشای سۆمەری زانیوە، لەبەر ئەوەی کە دەبینرێت پاش ئەوەی کە ئیبن وەحشیە دان بەوەدا دەنێت کە کوردەکان لە زانستی کشتوکاڵ و تایبەتمەندی

---

[55]. سەرنج دەدرێت کورد کتێبی سەبارەت ڕواندنی دارخورما و مێو هەبووە کە دڵنیای دەکاتەوە ئەو شوێنانەی کوردی تێدا ژیاوە بریتی بووە لە ناوچەکانی خواروی مێسۆپۆتامیا و ناوەڕاست و باکور، لەبەر ئەوەی کە مێو لە ناوەڕاست و باکوری مێسۆپۆتامیا دەڕوێ و خورما بە زۆری لە خواروی مێسۆپۆتامیادا دەڕوێت، کە ئەوە جارێکی تر دڵنیای دەکاتەوە کە کورد دانیشتووی هەموو ئەو ناوچانە بووە بۆیە کتێبی لەسەر ڕووەکی ناوچە جیاوازەکان هەبووە.

[56]. سەرەڕای ئەوەی کە ئیبن وەحشیە خۆی دان دەنێت بەوەی کە زانستی کشتوکاڵ و ئاو لای کوردەکان بووە و ئەوان تیایدا بە توانا بوون و دوو کتێبی کوردی لە سەر ئەو بابەتە تەرجومەکردووە، کەچی ئەمڕۆ چەندین سەرچاوەی ئەوروپی ئاماژە بە ئیبن وەحشیە و کلدانیەکان دەکات وەک سەرچاوەی ئەو زانستە.

[57]. لێرەدا ئیبن وەحشیە مەبەستی لە کتێبەکەی خۆی بووە کە سەبارەت بە ئەلف و بێیەکانی ئەو سەردەمە نوسیویەتی.

[58]. (بینو binu) یان (بنو banu) وشەیەکی سامی کۆنە (Long, 1999, p.4002)؛ ئەمڕۆ عەرەبیش بە هەمان مانا بەکاری دەهێنێت. هەمان مانای (زان) ی کوردی دەدات کە مانای (منداڵ خستنەوە) دەدات. بنەڕەتی وشەی zan سۆمەری/کوردیە و لە زمانی لاتینیدا دەبێتە geno ولە یۆنانانیدا genno و لە میدیدا بە شێوەی zantu دەردەکەوێت.

ڕووەکدا بە تواناتر بوون لە کلدانیەکان، دەڵێت " کوردەکان دەڵێن کە زانستی کشتوکاڵیان لە ئادەمەوە بۆ ماوەتەوە"(1806, p.131). ئەگەر سەرنج بدرێت سۆمەریەکان پێیان وابووە "ئادەم" (adamu) بریتی بووە لە یەکەم مرۆڤ کە خوا فێڵی لێ کردووە و نەمری لێ شاردووەتەوە، لەبەر ئەوەی نەیویستووە کە ئەو وەک خواکان نەمر بێت . لەبەر ئەوە پێی گوتووە کە میوەی نەمری ژەهراویە، بۆیە ئادەم نەیخواردووە. ئیتر ئادەم و وەچەکانی دوای خۆی دەرفەتی نەمریان لێ وەرگیراوەتەوە (Chopra, 2005, p.7). بە ڕوونی دەردەکەوێت کە کوردەکان مەبەستیان ئادەمی ئاینە نوێکانی وەک کریستیان، ئیسلام و جوادایزم نەبووە، لەبەر ئەوەی کوردەکان حەوت کتێبەکەی پێش لافاوەکە کە سۆمەریەکان ئاماژەیان پێ داوە، هەر بە هی خۆیان زانیوە بۆیە ئەوان ئاماژە بۆ ئادەمی لای سۆمەریەکان دەکەن کە زانیاری کشتوکاڵی بۆ بەجێهێشتوون و دیارە کورد ئاگاداری دێرینی ئەو زانستە بووە لای خۆی بۆیە بۆ سەرەتای شارستانیەتی گەڕاندۆتەوە.

ئەو حەوت کتێبەی پێش لافاوەکە کە کوردەکان باسی لێوە دەکەن هەمان ئەو حەوت کتێبە پیرۆزە بووە کە یەکەم پاشای سۆمەری دوای لافاوەکە دەری هێناوە. هەروەها ئەگەر سەرنج بدرێت ئیبن وەحشیە دەڵێت کە کوردەکان دەڵێن کە (کتێبی سەفریس/ صفریث) و (کتێبی قوسامی/ قوثامي) یان لایە. لە ڕاستیدا (سەفریس) هەر هەمان ئەو شارمیە کە بیرۆسوس ئاماژەی پێکردووە و حەوت کتێبە پیرۆزە سۆمەریەکانی تێدا شاردراوەتەوە کە بیرۆسوس بە (Sipara/Sippar/Sephar) ناوی هێناوە و ئیبن وەحشیە بە (صفریث Saphris) باسی دەکات. هەر ئەم شارمیە کە سۆمەریەکان بە Sippar ناویان هێناوە و چوارەم شار بووە کە لە دوای لافاوەکە لە بەهەشتەوە پاشایەتی پێ بەخشراوە (Bryce, 2009, p.655). هەروەها سۆمەریەکان بە Sippar Edina یش ناویان هێناوە. لە تەوراتدا بە یەکەم شوێن دانراوە کە خوا ئادەمی تێدا داناوە و بە "باخچەی عەدەن" (Garden of Eden) ناوهێنراوە (Dr Kutty, 2009, p.69). ئەوەی جێگای سەرنجە کورد باس لەوە دەکات کە کتێبەکانی شاری سەفریس (Saphris) هی کورد بووە. بەپێی سەرچاوەکان ناوی شاری (sip-para) خۆی مانای (شاری کتێبەکان) دەدات .

هەروەها ئەو کوسامی (قوثامي) یەی کە ئیبن وەحشیە باسی لێوە دەکات هەر هەمان ئەو شارە بووە کە لە تێکستە ئەکەدی و ئاشوریەکاندا باسی لێ کراوە بە شێوە جیاوازەکانی (Cuth/Cutha/Cuthah/Cuthium) کە یەکەم جار لە نێوان (٢٢٥٤ پ.ز-٢٢١٨ پ.ز) لە تێکستێکی نارام سینی پاشای ئەکەدییدا ئاماژەی پێ کراوە و شارێکی سۆمەری کۆن بووە و لە تێکستەکانی پێشتردا زیاتر بە Gutium ناوهێنراوە بەو جۆرە (قوثامي Quthami) هەر بریتیە لە (گوتیوم Gutium). ئەم شارە لە تێکستە ئاشوریەکاندا زۆربەی جار شانبەشانی شاری (Sippara/سیپارە/صفریث) ئاماژەی پێ کراوە و سەنتەری دەسەڵاتی گوتیەکان بووە. لە تەوراتیشدا ناوی ئەو دوو شارە بەیەکەوە هاتووە، کاتێک دەڵێت "پاشای ئاشوری خەڵکی هێنا لە بابل، کوسامی (قوثامي)، ئاڤا، حەماث و سێفەرڤایم (صفریث) و لە شارەکانی سەمەریا دایانان لەبری ئیسرائیلیەکان و سەمەرییەیان گرتە دەست و لەو شارانە ژیانیان بردە سەر" (2Kings 17:24). جارێکی تر لە باسی خوای هەر یەک لە خەڵکەکان تەورات دەڵێت "بابلیەکان سێکوث-بێنۆثیان هەڵبژارد، کوثیەکان نێرگەڵ و ئەوانەی حەماث ئەشیمایان دانا" (2Kings 17:30).

دەبینرێت کورد لە سەدەی نۆهەمی زاییندا خۆی بە بەرەی یەکەم پاشای زیوسودرای سۆمەری داناوە و پێیان وابووە ئەو پاشا سۆمەریە بە زمانی کوردی نووسیویەتی و کورد توانای زانستی کشتوکاڵی خۆی گەڕاندۆتەوە بۆ سەردەمی ئادەم؛ ئەو ئادەمەی کە لەلای سۆمەریەکان باسکراوە و لە هەمان کاتدا کورد پێی وابووە کە حەوت کتێبەکەی پێش لافاوەکە هی ئەوان بووە و زانستی شارە دێرینە سۆمەریەکانی سیپارە و (کوثە[59]) هەر هی ئەوان بووە. ئەو شارە ئەمڕۆ بە (کوت) ناسراوە و تا سەرەتای چلەکانی سەدەی ڕابردوو دانیشتوانەکەی زۆرینەی کورد بووە و لە سەردەمی دێرینیشدا سەنتەری دەسەڵاتی گوتیەکان بووە.

---

[59]. شوێنی شاری (کوسە/کوثە) دەکەوێتە شاری (کوت) ی ئێمڕۆوە و هەر ئەو شارمیە کە هەتاوەکو ئێستا سەرەڕای زیاتر لە هەزار و چوار سەد ساڵ لە هاتنی عەرەبەکان، بەشێک لە خەڵکەکەی هەر کوردن. لە ڕاستیدا هەتاوەکو چلەکانی سەدەی ڕابردوو، زۆرینەی ئەو ناوچەیە کورد بوون نەک عەرەب. لە دوای چلەکانەوە و لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی نوێی عێراقدا

ئەو شارەی کە سەرچاوە مێژووییە دێرینەکان باسیان لێوە کردووە، ئیبن حەوقەل لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی "وێنەی زەوی" (صورة الارض)، بە (کوث) ناوی دەهێنێت. ئەم جوگرافی ناسە لە زمانی خەڵکەوە دەڵێت خەڵک دەڵێن حەزرەتی ئیبراهیم هەر لەوێ خراوەتە ئاگرەوە (ابن حوقل، ١٩٩٢، پ. ٢١٩) و ئەو شارە هەر نزیک شاری بابل بووە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٨).

(نەخشەی ژمارە ٨) شاری کوسا (کوثە/کوسامی) و سیپەرە (سفریس) و سنجار و جودی و بابل.

بۆچوونی کورد لە سەرچاوەی تری نوێی تریشدا باسی لێوە کراوە. ئەوەتا ئەولیا چەلەبی (١٦١١ز-١٦٨٢ز) لە زمانی مەقدیسیەوە[60] باس لە ڕەچەڵەکی کورد دەکات و دەڵێت "بە قسەی مەقدیسی، لە دوای تۆفانی نوح یەکەم شوێن شاری جودی ئاوەدان کراوەتەوە، دوای ئەو قەڵای شەنگار و سێیەم مەیفاریقینە. بەڵام خاوەنی شاری جودی کە کوردوم شایە و ئۆمەتی نوح بووە، شەش سەد ساڵ ژیاوە و بە نێو هەموو کوردستاندا گەڕاوە، کە گەیشتۆتە مەیفارقین ئاووهەواکەی زۆر چۆتە دڵیەوە و تییدا نیشتەجێ بووە، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی زۆر بوون، ئەم خەڵکە لە خۆیانەوە زمانێکیان داهێنا کە نە عەرەبی و نە فارسی و

عەرەب لەو ناوچەیە زیادکراوە. شارەکە لەلایەن سۆمەریەکانەوە بە Gudua ناسرابوو، نەتەوە سامیەکان بە Kuth, Kutha, Qutha ناویان هێناوە و ناوەکە لە تەوراتیشدا بەو شێوەیەیە. ئەم شارە ماوەیەک لەلایەن پاشای سۆمەری Gudea وە حوکمڕانی کراوە. لە سەرچاوە ئارامی و ئاشوریەکاندا پاشگری um زۆرجار خراوەتە سەر ناوی شار و ناوچەکان, بەو جۆرە لە سەردەمی ئاشوریەکاندا ئەو ناوچەیە هەندێک جار بە Gutium ناسرابوو و لەسەرچاوە ئارامیەکانی دواتردا کە ئیبن وەحشیە لە سەدەی نۆهەمی زاییندا ئاماژەی پێ دەکات وەک شوێنێک کە کوردەکان بە هی خۆیان زانیوە، لای ئەو کراوەتە (قوثامي Quthami). لەبەر ئەوەی کە پاشگرەکە بەشێک نەبووە لە ناوەکە، مێژوونوسی ئیسلامی وەک ئیبن حوقل، لە سەدەی دەیەمی زاییندا بە (کوث Kuth) ناوی دەهێنێت و ئەمڕۆ کراوەتە (کوت Kut).

[60]. نازانرێت ئەو مەقدیسیەی کە ئەولیا چەلەبی وەک سەرچاوە سەبارەت بە کورد بە کاری هێناوە کام مەقدیسیە، ئایا ئەو مەقدیسیەیە کە حەنبەلی بووە و لە سەدەی دوانزەی زاییندا ژیاوە یان مەقدیسیەکیەکی کورد بووە.

نەعیبری و نە دەریە، ئەمڕۆ بەو زمانە دەڵێن کوردی و لە کوردستاندا بەکار دەهێنرێ. بەڵام زمانی کوردیش دوازدە شێوەیە کە وشەکانیان لە یەکتر ناچێ و بۆ لەیەکتر گەیشتنی تەرجومانیان پێویستە" (چەلەبی، ١٩٧٨،پ.٩٠). ئەوەی کە چەلەبی دەیڵێت سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کورد دەبینرێت کە لە تەورات و لای سۆمەریەکانیش کۆمەڵێک زانیاری زۆر هاوشێوەی ئەوە نووسراوە.

بەپێی تەورات یەکەمین دەسەڵاتدار دوای لافاوەکە نەمرود بووە. هەروەها باس لەوە دەکات کە یەکێک لەو شوێنانەی کە نەمرود ئاوەدانی کردەوە ناوچەی شنار (Shinar) بووە کە تەورات ئەو (شەنگار) ەی کە چەلەبی ئاماژەی پێکردووە، لە تەوراتدا بە (شنار) ناوی هاتووە. هەروەها دەڵێت کە لە سەرەتادا هەموو خەڵک یەک زمانیان هەبووە و پاشتر زمانە جیاوازەکان پەیدا بووە و نەمرودیش شەش سەد ساڵ ژیاوە. دەبینرێت چەلەبی هەمان چیرۆکی تەورات دەگێڕێتەوە و تەنها ناوەکان تۆزێک دەگۆڕێت. (کوردوم شا) ی ئەولیا چەلەبی وەک (نەمرود) ی تەورات، هەر شەش سەد ساڵ ژیاوە، یەکێ لە ناوچە سەرەتاییەکان شەنگار بووە و سەرەتا هەموو یەک زمان قسەیان کردووە دوایی زمانی جیاواز دروست بووە. هەروەها لە تەوراتدا ئەو ناوچەی نەمرود حوکمی تێدا کردووە، ئەو ناوچەیە بووە کە دوایی ئاشوریەکان حوکمیان کردووە (Genesis, Chapter 10, verse 7,8,9) (Bromiley, 1995,P. 73) (Kitto, 2003, p.11) کە دەوروبەری موسڵی ئەمڕۆیە.

بە پێی قورئان و هەندێک لە کتێبە ئاینیە جوییەکان، نەمرود بڕیاری داوە حەزرەتی ئیبراهیم بسوتێنێت، لە هەمان کاتدا دەیان سەرچاوەی ئیسلامی ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو کەسەی فەرمانی سوتانی حەزرەتی ئیبراهیمی دا کورد بووە، ئەم بۆچوونە لەلایەن تەبەری (Wheeler, 2002, p.91) و ئیبن ئەسیر[61] (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ.٣٢)، رازی، قورتوبی، ئیبن ئەلحەیانی ئەندەلوسی، ئەلشوکانی، شەنقیتی- وە باسکراوە[62]. هەروەها ئەمە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی ئیبن حەوقەلدا یەکدەگرێتەوە کە دەڵێت حەزرەتی ئیبراهیم لە شاری (کوث) سوتێنراوە، لەبەر ئەوەی کە سەرچاوە ئیسلامیەکان دەڵێن ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیمی سوتاند کورد بووە و لە هەمان کاتدا بەپێی ئیبن وەحشیەوە، کوردەکان شاری (کوث) یان بە بەشێک لە ڕابردووی خۆیان داناوە.

بەشێک لەم زانیاریانەی کە ئەولیا چەلەبی باسی لێوە دەکات لە لایەن سۆمەریەکانیشەوە نوسراوە. سۆمەریەکان لە داستانی ئێنمێرکار و سەرگەورەی ئەرەتا (Enmerkar and Lord of Aratta) دا دەڵێن پێش ئەوەی کە خوا زمانی جیاواز دروست بکات و زمانەکان تێک بدات، لە سەرەتادا هەموو ناوچەکە بە یەک زمان قسەیان کردووە و ئاشتی و ئارامی وڵات و زمانی سۆمەری گرتبووەوە، هەروەها یەکێک لە ناوچە سەرەتاییەکان بە ناوچەی شنبار (Shunbur) ناو دەبەن (Arnold and Beyer, 2002, p.71). سۆمەریەکان لەو گێڕانەوەیەدا باسی زمان و مێژووی خۆیان دەکەن و چۆنێتی دروستبوونی دیالێکتە جیاوازەکان دەکەن، ئەویش لەگەڵ ئەو بۆچوونەدا یەکە کە ئەولیا چەلەبی سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کورد باسی دەکات و لە تەوراتیشدا دووبارە بووەتەوە و دیسان ناوی (شەنگار) لای سۆمەریان بووەتە (شونبور). ئەم زانیاریانەی سەرەوە لە ماوەی نێوان نزیکەی پێنج هەزار ساڵدا نووسراون. لەبەر ئەوەی سەرچاوە سۆمەریەکان تەمەنیان زیاتر لە پێنج هەزار ساڵە و تەورات زیاتر لە دوو هەزار ساڵە. هەرچەندە مێژووی

61. ئیبن ئەسیر (١١٦٠ ز-١٢٣٣ ز) زانایەکی کورد بووە و ناوی تەواوی بریتیە لە ئەبو حەسەن عەلی کوری موحەممەد کوری موحەممەدی جزریە و وەک لە نازناوەکەیدا دەردەکەوێت خەڵکی شاری جەزیرە بووە لە باکوری کوردستاندا. ئەم زاتە ماوەیەکی ژیانی لە موسڵدا بەسەر بردووە و سەردانی بەغدای زۆر کردووە. ماوەیەک لەگەڵ سەلاحەدینی ئەیوبیدا بووە. ئیبن ئەسیر چەند کتێبێکی لێ بەجێماوە، گرنگترینیان کتێبە مێژووییەکەیەتی بە ناونیشانی "هەموو مێژوو" (الکامل في التاریخ) کە سەرچاوەیەکی زۆر چاکە بۆ ڕابردووی کورد و ژیانی سەلاحەدین و زۆر لە ڕووداوەکانی ناوچەکانی هەولێر، جەزیرە و موسڵ و حەلەب و شارە کوردیەکانی تری ئەو سەردەمەی خستۆتەڕوو. ئیبن ئەسیر دوو برای تری هەبووە کە ئەوانیش کەسایەتی ناسراو بوون بەڵام نەگەیشتوونەتە ڕادەی زانایی ئەم.

62. لە ڕاستیدا هەموو سەرچاوە ئاینیەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئیبراهیم و نەمرود لە هەمان نەتەوە بوون و ئیبراهیم سەرەتا لە ناو نەتەوەکەی خۆیدا بووە. بەڵام دەست نیشانکردنی تەنها ئەو کەسەی کە ئیبراهیمی سوتاندووە بە کورد، لەلایەن سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکانەوە نەک قورئان خۆی، بەشێک بووە لە کەمپەینی نەتەوە نوێکان لە دژی کورد کە لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە بەردەوام بووە هەتاوەکو سەدەکانی دوایی (بڕوانە کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان).

ئەو سەرچاوەیەی کە ئەولیا چەلەبی زانیارییەکانی لێ وەرگرتووە نازانرێت، بەڵام ئەولیا چەلەبی نزیکی چوار سەد ساڵ لەمەوبەر هەر ئەوەی باس کردووە. سەرەرای گۆڕین لە هەندێک زانیاریەکاندا بەڵام هەموویان هاوبەشن لەوەی کە لە سەرەتادا یەک زمان هەبووە و دوایی زمانەکان گۆڕاون. هەروەها کە ڕووداوەکان لە سەرەتادا لە ناوچەکانی شەنگار و دەوروبەریەوە دەستی پێکردووە. دەشبینرێت کە ئەوەی کە لە قورئان و تەوراتدا بە نەمرود باس دەکرێت، ئەولیا چەلەبی بە (کوردم) شا باسی لێوە کردووە. هەڵبەت بەشێکی زۆریش لە سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە حەزرەتی ئیبراهیم لە شاری ئورفەی باکوری کوردستان لەدایک بووبێت. لە ڕاستیدا ئەم بۆچوونە لە تەوراتیشدا پشتڕاست دەکرێتەوە لەبەر ئەوەی حەزرەتی ئیبراهیم کە ژن بۆ ئیسحاقی کوڕی دەهێنێت، بڕیار دەدات خزمەتکارەکەی بنێرێتەوە بۆ خاکی باپیرانی لە حەران (حران) و نایەوێت ژنی کەنعانی بۆ بهێنێت کە خۆی لە ناویاندا دەژیا (Genesis, Chapter 24). شاری حەران ئەمڕۆ دەکەوێتە ناوچەیەکی کوردیەوە لە نزیک شاری ئورفە.
هەروەها وەک باسکرا شاری کوسامی (کوث/قوثامي) کە کوردەکان باسیان لێوە کردووە وەک شارێکی خۆیان، ، ئیبن حەوقەل پێی وایە کە ئیبراهیم لەوێدا سوتێنراوە و دەڵێت "دەڵێن ئیبراهیم درودی خوای لەسەر بێت لەوێدا خراوەتە ئاگرەوە". ڕونیش کرایەوە کە چەندین سەرچاوەی ئیسلامی ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو کەسەی حەزرەتی ئیبراهیمی خستە ئاگرەکەوە کورد بووە. دەبینرێت کە لە مێژوودا دوو ناوچە پەیوەندیان بە ڕەچەڵەکی کوردەوە هەیە. یەکێکیان دەکەوێتە ناوچەی دەوروبەری جەزیرە و ئەوی تریان ناوچەی سەنتەری دەسەڵاتی سۆمەریەکان. سەرنج دەدرێت کە هەردوو ناوچەکە پەیوەست کراوە بە حەزرەتی ئیبراهیمەوە و هەردووکیشی ئاماژەی بە کورد تێدایە. ئاشکرایە کە ناوچەی جەزیرە لە ڕابردوودا زیاتر بە (کاردو/قاردو/کوردە) ناسرابوو (بڕوانە دەوڵەتی کوردیان)، بەشەکەی خوارەوە بە (کوث/گوتیم/قوثامي) ناسرابوو و ئەمڕۆ کراوتە (کوت). وەک ڕوونکرایەوە لە بنەڕەتدا شاری (کوت) ناوی (گودیە) بووە و سامیەکان کرودیانەتە (کوث/کوثە) کە لێرەدا دیسان دوو وشە مێژووییەکەی (کاردو/کوردە، گوت/کوث) دەردەکەوێتەوە. لە ڕاستیدا هەردو ناوەکە ئاماژەن بە هەمان خەڵک، هۆکاری دەرکەوتنی جیاوازی لە ناوەکەدا بەهۆی ئەوەوە ڕوویداوە کە ئاماژەکردنەکە بەو خەڵکە بە دوو زمانی جیاواز دەرکەوتووە. هەردوو وشەی gud (گود) و qarradu (کەرادو) هەر هەمان مانایان هەیە کە بریتەی لە (ئازا، جەنگاوەر، پاڵەوان)؛ یەکەمیان سۆمەریە و دووەمیان ئەکەدی، بۆیە ئەو جیاوازیە دەرکەوتووە (بڕوانە ڕەچەڵەکی کورد). تەنانەت خوای ئەم دوو ناوچەیە لە ڕابردوودا بریتی بووە لە نێرگەڵ (Nergal) و هەر هەمان خوایان پەرستووە و لە سەرچاوەکانیشدا بە خوایەکی هوری ناسراوە. هەتاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەمیش جۆرێک لەو خوایە لە ناو هەندێک لە خێڵە زازاکی و ئێزدیەکاندا هەر مابوو و ڕێزی لێ دەگیرا (بڕوانە دەوڵەتی کوردیان).
دەبینرێت کە سەرەرای ئەوەی کە لە سەدەی حەڤدەی زایینیدا کوردەکان چیتر باسی (زان سودو/ بنو شاد) ی یەکەم پاشای سۆمەری ناکەن و لە یادیان نەماوە، بەڵام هەر باسی هەمان کەس دەکەن و تەنها ئەوەیە ناوی پاشاکە گۆڕاوە بۆ (کوردم شا). دەشبینرێت کە کورد شاری گوتیم/قوثامي/کوثە/کوت (Gutium/Quthami/Kutha/Cuth/Kut) ی گوتی/سۆمەری و شاری سیپەرە-ی سۆمەریشی بە شاری خۆی زانیوە و پێی وابووە کە کتێبەکانی ئەو شارانە بە زمانی کوردی بوون. بەشێک لە زانینی ئەو ڕاستیەش هەتاوەکو سەدەی حەڤدەی زاینیش لە ناو کورد دا بەردەوام بووە و هەموو سەردەمێک کورد هەر هەمان داستانە سۆمەریەکانی سەبارەت بە ڕەچەڵەکی خۆی گێڕاوەتەوە. لە بەشی ڕەچەڵەکی کورد دا ڕوون دەکرێتەوە کە زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکانیش بنەچەی ناوی کورد دەگەڕێننەوە بۆ ئەو شوێنەی کە نوحی لێ گیرساوەتەوە کە دەکەوێتە ناوچەی جەزیرەی کوردستانەوە (بڕوانە ڕەچەڵەکی کورد). پاشتر، کە ئەوروپیەکان هاتنە ناوچەکە و سەر لە نوێ مێژووی ناوچەکەیان نوسیەوە، ڕوداوەکانیان بە تەواوی تێکەڵ کرد. ئیتر وورده وورده لە یادەوەری کوردیشدا بابەتەکە سڕایەوە (بڕوانە کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان).
هەرچەندیشە ئەو سەرچاوانەی سەرەوە کە ئاماژەیان بە سۆمەری بوونی کورد کردووە، لە ماوەی پێنج هەزار ساڵ و لەلایەن خەڵکی جیاوازیشەوە نووسراون کەچی هەموویان یەک ڕاستی دووبارە دەکەنەوە؛ ئەوەی کە کورد خۆی و هەندێک لە نەتەوە دێرینەکانی ناوچەکە، سۆمەریەکانیان بە کورد زانیوە بێ ئەوەی

کە بە سۆمەری ناوی بهێنن. ئەوانەش هەموویان پشتگیری لەوە دەکەن کە ئەو هاوزمانیەی کورد و سۆمەری کە لە فەرهەنگەکەی ئەم کتێبەدا ڕوونکراوەتەوە، لە سەرچاوە مێژووییەکاندا بە شێوەی جیاواز و لە سەردەمی جیاوازدا ئاماژەی پێ کراوە. لە خوارەوە کورتەیەکی داستانە سۆمەری، بابلیەکان و زانیاریەکانی ناو تەورات و چیرۆکی ناو کورد خۆی لە خشتەیەکدا بە مەبەستی بەراوردکردن خراوەتە ڕوو.

| سەرچاوەی سۆمەری | سەرچاوەی بابلی (بیرۆسوس) | تەورات | سەرچاوە نوێ کوردی و بێگانەکان |
|---|---|---|---|
| پێش ئەوەی کە خودا زمانەکان جیاواز بکات، سەرەتا بە یەک زمان قسە دەکرا. پادشایی سەرەتا لە Shunbur (شونبور) دەستی پێکردووە. | | بەپێی تەورات یەکەمین دەسەڵاتدار دوای لافاوەکە نەمرود بووە و شەش سەد ساڵ ژیاوە. یەکێک لەو شوێنانەی کە نەمرود ئاوەدانی کردەوە ناوچەی شنار (Shinar) بووە. لە سەرەتادا هەموو خەڵک یەک زمانیان هەبووە و پاشتر زمانە جیاوازەکان پەیدا بووە. | بەپێی چەلەبی، کورد لە نەوەی (کوردوم شا) یە کە وەک (نەمرود) ی تەوارات، هەر شەش سەد ساڵ ژیاوە. یەکێ لە ناوچە سەرەتاییەکان دوای لافاوەکە شەنگار (سنجار) بووە کە ئاوەدان کراوەتەوە. سەرەتا کورد هەموو یەک زمان قسەیان کردووە و دوایی زاراوە جیاوازەکانی زمانی کوردی دروست بووە. |
| Zansudu /ziusudra یەکەم پاشا بووە. (زان سودو) کەشتیەکی گەورەی دروست کرد بۆ خۆپاراستن لە لافاوەکە و حەوت ڕۆژ و حەوت شەو تێیدا مایەوە. دوای لافاوەکە یەکەمجار لە Kush/Kish وە پاشایەتی دەستپێکردەوە. شاری Sippar چوارەم شاری سۆمەری بووە کە پاشایەتی تێدا دامەزراوە. | زانست لەلایەن حەوت بونەوەری نیوە ماسی و نیوە مرۆڤ دەستپێکرد. پێش لافاوەکە زیوسودرا کەشتیەکی دروست کرد کە حەوت ڕۆژ و حەوت شەو لە لافاوەکەدا مایەوە. کە هاتە دەرەوە حەوت کتێبەکەی لە شاری سیپەرە (Sipara/ Sepharvaim) دەرهێنا و پاشایەتی دەستپێکردەوە. | تەورات ئاماژەی بەو دوو ئەو شارە کردووە بەڵام لە سەردەمی ئاشوری، واتە دوای سەردەمی سۆمەریەکان. | بەپێی ئیبن وەحشیە، کورد پێی وابووە کە لە (بنوشاد) وە هاتوون و ئەو پاشایە بە زمانی کوردی نوسیوەتی. ناوی پاشاکە نیوە تەرجومەی ناوی (زانسودو/زیوسودرا) یە. کورد خۆی گوتوویەتی کە حەوت کتێبی پێش لافاوەکە هی کورد بووە و کتێبەکانی شاری قوسامی/قوثامي (Kush, Quthium/Gutium /Kut) و سەفریش/صفريس (Saphris/Sipara) ی بە کوردی داناوە. |

# فەرهەنگی سۆمەری - کوردی

| وشەی سۆمەری | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| a | ئاو، شەهوەت<br>water, semen | ئاو āu: لە کوردیدا هەردوو مانای (ئاو، شەهوەت) دەدات. |
| a de | ئاودان<br>Irrigate<br>(a[water]+de[pour]) | āu dā ئاو دا : وەک لە ڕوونکردنەوەی وشە سۆمەریەکەدا دەردەکەوێت، وشەکە پێک هاتووە لە (ئاو+دا) و هەمان مانای لە کوردیدا ماوە. |
| a-dé-a | لافاوی سەرەتای بەهار<br>the yearly spring flood<br>('water' + 'to pour' + nominative) | āu da ā ئاو دە ا/یا: وشەکان لە فەرهەنگی سۆمەریدا ناوە لێکداروەکە شیکراوەتەوە بە شێوەی (ئاو+ ڕشتن،دان+ جێگری بکەر) کە لەگەڵ کوردیەکەدا گونجاوە. |
| a-e...gu (-a) | ئاو دایخوراندووە<br>eroded by the water<br>('water' + ergative agent marker + 'to consume' ( + nominative)). | āu ai xu ā ئاو ئەی خوا: لە فەرهەنگی سۆمەریدا ڕستە کورتەکە شیکراوەتەوە بە شێوەی (ئاو+ دروستکەری بکەر+ داخوران (+جێگری بکەر)). لە کوردیدا دەبێتە (ئاو+ئەی (جێگری بکەر)+داخوران (+جێگری بکەر)) بەو جۆرە ڕستەکە دەبێت بە (ئاو+ئەی+خۆ+ا). |
| a gal | زیادبوونی ئاوی لافاو<br>overflow of flood waters<br>('waters' + 'big') | āu qalā/kal/gal ئاو قەڵا/ کەل/گەل: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (ئاو+گەورە)، بۆیە بە کوردی ئەمڕۆ دەبێتە (ئاو گەل/قەڵا/کەڵ) و هەموویان هەمان مانا دەدەن. |
| a gi | بەژنکردنی کچ (کونکردنی ئافرەت)<br>deflower | age ئەگێ: مانای (ئەنجامدانی کاری سێکسی) دەگرێتەوە. |
| a ĝal | هاوکاریکردن<br>to assist | gala گەلە: مانای (کۆمەڵێک پێکەوە) دەدات و لە پرەنسیپی هاوکاری نزیکە. وشەی (گەلەکردن) مانای (کارکردنی بەکۆمەڵ و هاوکاریکردنی یەک) دەگرێتەوە. |
| akan | گوان<br>udder | guān گوان: هەمان مانای هەیە. |
| a-la-la | هاوارکردن بۆ دەربڕینی هەست ونەست، زۆربەی جار بۆ خۆشی، بۆ دڵخۆشی<br>exclamation, often of joy; exuberance | hal hala هەل هەلە: جۆرێکە لە دەنگکردنی خۆشی کە کورد لە هەڵپەڕکێ و زەماوەند و خۆشیدا دەیکات. |

| | | |
|---|---|---|
| a rah | لە ئاودا خنکان<br>to drawn<br>(a[water] + rah[beat]) | āu rāīā ئاو رای یا: لە بنەچەدا وشە سۆمەرییەکە پێک دێت لە (ئاو+ پیاکێشان) لە کوردیدا دەبێتە (ئاو +لابردن) بەو جۆرە دەبێتە (ئاو+ڕایا) کە مانای (ئاو بردی) دەگرێتەوە. |
| a la | ئەی ئاڵێنی بەیەکەوە<br>to bind | āle ئالێ: ئەمە ڕەگە بۆ (ئالاندن بەیەکەوە). |
| a sur | میز دەکات<br>to urinate<br>(a[water] + sur[press]) | āu zor ئاو زۆر: دەبینرێت وشە سۆمەرییەکە پێک هاتووە لە دووبەش (ئاو+زۆر). لە سۆمەریدا sur بە مانای (فشارکردن) دێت و لە کوردیدا هەمان مانای ماوە. بە کوردی ئەمڕۆ دەبێتە (زۆر بۆ هاتنی ئاو/زۆرلێکردنی ئاو). |
| a šu du | خۆ بەستن یان خۆ چەککردن بەباشی<br>'to equip oneself perfectly' | šada, šad شەد/شەدە: (شەد) مانای (بەستن) دەدات و دەبێتە ڕەگی، (شەدانن). (شەدە) بریتیە لەو پارچەیەی کە پیاو و ژن لە سەریانەوە ئەیپێچن کە ناوەکەی لەو پرەنسیپەوە هاتووە. عەرەب ئەم وشەیەی وەرگرتووە و بە هەمان مانا بەکاری دەهێنێت. |
| a tu | شتن (کردار)<br>to wash | āu šo ئاو شۆ: ڕەگی (شتن) لە کوردیدا دەبێتە (شۆ) و وا دەردەکەوێت کە لە سۆمەریدا tu ە. وشەکە بە هەمووی دەبێتە (ئاو شۆ). |
| a us | وەستان بە شتێکەوە<br>to lean | aues ئە وێس: هەمان مانای هەیە. |
| a'aĝa | دەنگ و باس<br>news | āgā ئاگا: ئاگادارکردنەوە هەمان پرەنسیپی دەنگوباسی هەیە. |
| a'ambar | ئاوی زۆنگاوەکان<br>marsh water | āu ambār ئاو عەمبار: لە کوردیدا مانای شوێنی هەڵگرتنی ئاوەوە و پێ دەچێت ناوی شاری (عەمارە) ی عێراق هەر لەوەوە هاتبێت. |
| a'aš | خۆزگە، نەفرەتکردن<br>wish, curse | āīš ئایش: لە کوردیدا دەگوترێت (ئایش بە ئاواتی خۆم بگەیشتمایە) کە هەمان مانای (خۆزگە) بە ئامانجی (خواست، حەسرەتی) دێت. هەروەها دەگوترێت (ئایش لە تۆ، ئایش فەساڵی خواتەوە) کە ئەوش مانای نەفرەت لێکردنە. لە ئینگلیزیدا بەشێوەی wish دەردەکەوێت کە هەمان مانای (خۆزگە) ی کوردی هەیە. |
| aba | کێ<br>who | aua ئەوە: بۆ نموونە دەگووترێت (ئەوە؟). کە لە کوردیدا دەتوانرێت هەمان ووشە بە مەبەستی ئیشارەت پێکردن و پرسیاریش بەکاربهێنرێت. |
| abaĝara | گەرا<br>fetus | garā گەرا: لێرەدا بەشی (گەرا) وەک خۆی ماوە. |
| abara | ئارەقی لەش<br>sweat | abāre ئەباری: ئەم وشەیە وەسفی ئارەقکردنەوەیە و لە کوریدا دەگوترێ (ئارەقی لێ ئەبارێت). |
| abaraša | بەڕاستی<br>truly | barāsī بەڕاسی: ئەم وشەیە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە پۆڵۆنی بووەتە prawdziwie و سلۆڤینی |

| | | |
|---|---|---|
| | | resnično و ئیتاڵی verità و فەرەنسی vrai . ئەم وشە سۆمەریە دیارە ڕەگەکەی وەک کوردی دەبێتە (ڕاس/ڕاست) کە لە زمانی لاتیندا دەبێتە recta، سویدی rekt، ئیسپانی recto و دانیمارکی recht. بە میدی بە (ڕاست) دەگوترێت rašta. |
| abal | جێگر، هاریکار substitute | hāubāl هاوباڵ: هەمان مانا دەدات. |
| abala | ئەو کەسەی کە ئاو دەردەهێنێت یان دەهێڵێ water drawer | āuhela ئاو هێڵە: ئەو کەسەی کە ئاو دەکێشێت. |
| abkiz | جۆگەی پاکەوەکراو cleaned furrow | āukeš ئاو کێش: ئەو جۆگەیەیە کە ئاوی پێدا تێپەڕ دەبێت. |
| abula | دەروازە gate | āualā ئاوەڵا: لە کوردیدا مانای (کراوە) دەدات و ئەم وشەیە هەمان پرەنسیپی هەیە لەگەڵ وشە سۆمەریەکەدا. لە زمانی هوریشدا ئەم وشەیە بەدی دەکرێت. ئەوان بە دەرگەوان دەڵێن ábuluski کە مانای (ئێشکگری دەرگا) دەدات (بڕوانە فەرهەنگی هوری). |
| abzu | ئاوی ژێر زەوی underground water | āuaze ئاوەزێ: زەویەک کە ئاو بدەڵێنێ. |
| adab, dab | ئامێرێکی ڕیدمی drum | daf دەف: لە کوردیدا ئامێری دەف، ئامێرێکی ڕیدمی بازنەییە و لە پێستی ئاژەڵ و چوارچێوەی دار دروست دەکرێت و زنجیری ووردی پێوە دەکرێت. لە ڕابردوودا بە زۆری لە ناو دەرویشەکاندا بەکارهاتووە. ئەم ئامێرە هەتاوەکو ئەوروپا ڕۆیشتووە و بە جۆرێک لە دەفی چوارگۆشە لە پورتوگاڵ دەگووترێت adufe. |
| adda'abba | باپیرە grandfather | āždāuābā ئەژداوئابا: لە لای کورد، ئەم وشەیە بەکاردەهێنرێت، وەک ئاماژە کردنێک بۆ باوباپیران. |
| adea | لافاوی ئاو water flooding | āude ئاودێ: بە مانای (ئاو هاتن) دێت و بۆ (لافاو) بەکاردەهێنرێت. |
| adhal | نهێنی secret | ajal ئەجەل: ئەم وشەیە مانای (وادەی مردن)ەو دەشێت وشەکە لە مانای (نهێنی) ەوە هاتبێت. |
| a'ea | ئاو دەردەپەڕێنێ gushing water | āu aīā ئاو ئەیا: هەمان مانای هەیە. |
| a'eĝir | بەربەستی بچووکی ئاو weir | āuagir ئاوئەگر: ئەم وشەیە ڕەگی (ئاو ئەگرێ) یە. |
| a'eštub | لافاوی زوو early flooding | āuhastāu ئاو هەستاو: هەر هەمان مانای (لافاو)ی هەیە |
| aga | تاجی پادشایی crown | āĝā ئاغا: لە ڕاستیدا بناغەی ناوەکانی (ئاغا) و (بەگ) لە کوردیدا دەگەڕێتەوە بۆ سۆمەری و هوریەکان. وشەی aga ی سۆمەری، مانای تاجی |

| | | |
|---|---|---|
| | | پادشایی هەبووە و هەتاوەکو ئەمڕۆ ئاغا لە ناو کورد دا نازناوێک نیە کە بدرێت، بەڵکو دەبێت بە خوێن ئاغا بێت. پێ دەچێت ئاغاکانی ئەمڕۆی کوردستان لە سەردەمێکی کۆنەوە ئەو نازناوەیان هەبووبێت. وشەکە لە فارسیدا هەر تەنها ناوێکە بۆ بانکردنی ڕەگەزی نێر بەڕێزەوە. |
| agin | بەوجۆرە<br>thus | agīn ئەگین: ئەم وشەیە مانای (دەنا، بەوجۆرە) ی هەیە. |
| agirgir | قامیش<br>read | āgirgir ئاگرگر: واتە (ئەو شتەی ئاسان ئاگر دەگرێت). هەردوو وشەکانی (گڕ) و (گر) لە سۆمەری و کوردیدا هەمان مانایان هەیە و ئەوش مانای ئەم وشەیە دڵنیا دەکاتەوە. |
| agarka | پەرستگە<br>temple | āgārga, āgirga ئاگارگە، ئاگرگە: (ئاگارگە) مانای (شوێنی ئاگادارکردنەوە) دەدات و (ئاگرگە) مانای (شوێنی ئاگر) دەدات. |
| agazi | سەرکردە<br>leader | āĝāzā ئاغازا: لە زمانی کوردیدا مانای (لە وەچەی ئاغا) دەدات. وشەی (zi) مانای (ژیان) ی کوردی دەدات و لە (زا) ی کوردیەوە نزیکە و و (aga) مانای (تاجی پاشایی) دەدات. |
| agupa | کوپە<br>vessel | kupa کوپە: هەمان مانا دەدات و لە زمانی هوریدا kubaγi جۆرێکە لە کڵاو کە دیارە لە پرەنسیپی چەمانەوەوە هاتووە. وشەی (کوپە) ی کوردی لە زمانە ئەوروپیەکاندا دەبینرێتەوە، لە زمانی لاتیندا بووەتە cuppa و ئینگلیزی بووەتە cup، بەڵام لەم زمانانەدا ماناکەی گۆڕاوە؛ بۆ ئاماژەکردن بە (کوپی بچووک) بەکار دێت و ماناکەی لەگەڵ سۆمەری و کوردیدا تۆزێک گۆڕاوە. |
| ahan | ڕشانەوە<br>vomit | ahen ئەهێن: لە کورویدا دەبێتە ڕەگی (هێنانەوە) بە مانای (ڕشانەوە). لە زمانی هوریدا han مانای (منداڵ هێنان) دەدات. |
| aka | ئەکات<br>to do | akā ئەکا: لە کوردیدا هەمان وشەیە و هەمان مانای هەیە. |
| akar | زرێ پۆشی لەش<br>armour | kārā کارا: مانای (بەهێز) دەگرێتەوە. |
| akiti | فیستیڤاڵ<br>festival | yaketī یەکێتی: مانای (یەکگرتن) و پێکەوە بوون دەگرێتەوە ، کە پرەنسیپی فیستیڤاڵی تێدایە. |
| akud | کەسێک کە نەتوانێت ببزوێت یان بجوڵێت بە هۆی کەمئەندامی یان برینداریەوە<br>cripple | got, kautā, kautu گۆت، کەوتا، کەوتو: (کەوتا) ئاماژەیە بە لەجێدا کەوتن لەبەر نەخۆشی (هەژار، ٦٧٢). (کەوتو) ئاماژەیە بە حاڵەتی لەکارکەوتن و ناسەرکەوتوویی لە شتێکدا. (گۆت) مانای لە پێکەوتن دەدات لەبەر ماندوویی. |
| akuš | زەحمەتکێشان و تێکۆشان | akoš ئەکۆش: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (کۆشان) کە |

| Sumerian | مانا / Meaning | لێکدانەوە |
|---|---|---|
| | toil | هەمان مانا دەدات. |
| ala | شەیتان (جنۆکەی خراپە)<br>demon | halā, āla هەلا، ئاڵە: (هەلا) ماناکانی (ڕزیو، پلیخاو، کێشەو شەڕ، دنیای بێ خۆر) هەیە و (ئاڵە/هاڵە) ناوی جنۆکە (شەیتان) یکە کە دوژمنی زەیسان-ە (ژنی تازە منداڵ بوو) ( هەژار، پ.١٠، ١١ و ٩٨٣ ). کورد پێی وایە زەیسان و کۆرپەی ساوا لە ژێر مەترسی ئەودان و هەندێک جار دەیانکوژێت. بە زمانی هیتی ẖulle مانای (شەڕکردن، ئاژاوە) دەدات. لە ئینگلیزیدا بە شێوەی hell و بە ئەڵمانی بە شێوەی hölle دەردەکەون کە مانای دۆزەخ دەدەن. |
| al | پێشگرە<br>Prifix | hal هەڵ: وشەکە لە کوردیدا خۆی بەتەنها مانای (بەرزبوونەوە) دەدات و پێشگرێکیشە کە بە سەدان وشەی کوردی لێ دروست دەکرێت. لە سۆمەریدا ماناکەی ڕوون نەبووەتەوە بەڵام بە هەمان شێوەی کوردی بەکار دەهێنرێت و دەبێتە پێشگرێک لەگەڵ ڕەگی کرداردا. لە کوردیدا زۆر وشەی لێ دروست دەکرێت. بۆ نموونە (هەڵچوو، هەڵگیرسا، هەڵخە، هەڵدا، هەڵهێن، هەڵ بوو، هەڵبڕ، هەڵپچڕ، هەڵبژێر، هەڵبەس، ...). وشەکە لە کوردیدا زۆربەی جار وا لە کردارەکە دەکات کە بزووتنی کردارەکە بەرەو سەرەوە بەرێت. بۆ نموونە (چوو) مانای (ڕۆیشت) دەدات، بە هۆی پێشگری (هەڵ) وە دەبێتە (هەڵچوو) کە ماناکەی دەبێتە (چوون بەرەو سەرەوە). |
| ala | ئامێرێکی ئاودانە<br>Irrigation device | hal هەڵ: ئەم وشەیە ڕەگە بۆ ووشەی (هەڵانین) کە ئاو هەڵێنجان و سەرخستن دەگرێتەوە. |
| al...di/dug/e | خواستن، داواکرن، هەوڵدانی زۆر(زۆربەی جار لەگەڵ ni دێت)<br>pray, demand, insist to desire (often with -ni-) ('hoe' + 'to make the motion of') | haul.... dā/dāg/aiā هەوڵ دا/داگ/ئەیا: ئەگەر تێبینی بکرێت وشەکە وەک کوردی لە دووبەش پێک دێت و دەتوانرێت بە هەمان شێوەی زمانی کوردی، بە سۆمەریش وشەی تری بخرێتە نێوانەوە. بۆ نموونە بە کوردی دەگووترێت (هەوڵ ئەدا بۆ جێبەجێکردنی کارەکان)، دەشتوانرێت بگووترێت (هەوڵ بۆ جێبەجێکردنی کارەکان دەدات). دەبینرێت کە دەتوانرێت ئەو وشە لێکدراوە بەیەکەوە و بە تەنهاش بخرێتە ڕستەوە. |
| al...aka | کارکردن لە هەڵکەندندا (هەڵکەندن+ کردن)<br>to work at hoeing ('hoe' + 'to do'). | hal akā/hal akane هەڵ ئەکا/هەڵ ئەکەنێ: (هەڵ ئەکا) لە کوردیدا مانای (بەرزی ئەکاتەوە) دەدات. بەڵام (هەڵ ئەکەنێ) هەمان مانای وشە سۆمەریەکەی ماوە. |

| | | |
|---|---|---|
| ama | دایک<br>mother | āma ئامە: لە کوردیدا یەکێکە لە ووشەکان بۆ ئاماژەکردن بە دایک (هەژار،پ.١٢) و بنەڕەتی وشەی (مێ) یە. دەبینرێت کە لە زۆر ناوی سۆمەری بۆ ئاماژە کردن بە مێینە ئەو وشەیەی تێدایە، بۆ نموونە amalug (سەرکردەی ئاینی مێینە)، ama'inanak (خوای مێینە)، amagal (ئامەکەڵ /مێیەی کەڵ) کە دەبێتە (سەرکردەی ئاینی مێینە) ،هتد. هاوشێوەی ئەم وشەیە لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا دەردەکەوێت. |
| ama'aya | نەنک<br>grandmother | ama yāīā ئامە یایە: هەردوو وشەکە لە زمانی کوردیدا مانای دایک دەدەن. لەوە دەچێت ناوی نەنک لە زمانی سۆمەریدا لەو دوو ناوەوە دروست کرابێت. ئەمڕۆش هەندێک جار لە کوردیدا دەگووترێت (دایک دایک) بە مەبەستی نەنک. |
| ama'era | ئامادەبووی تازێ<br>mourner | āmaarī ئامە ئەری: لە زمانی سۆمەریدا وشەکە شیکراوەتەوە بە [āma] دایک/مێ +[era] (گریان، تازیەباری). هەردوو وشەکە لە کوریدا وەک خۆی ماوە و وشەیەی (ڕۆ، ئەری) یەکەمیان لە کاتی تازیەباریدا وەک هاوارکردن بەکاردەهێنرێت و دووهەمیان مانای (گریان) دەدات. کورد لە کاتی تازیەباریدا دەڵێت (باوکە ڕۆ/ڕی، دایکە ڕۆ/ڕی). |
| amagal | نەنک یان سەرکردەی ئاینی مێینە<br>grandmother or a female priestess | āmakal ئامەکەڵ: بە کوردی مانای (مێیە کەڵ) ی هەیە. gal لە سۆمەریدا هەمان مانای kel ی هوری و (کەڵ) ی کوردی هەیە. کەواتە مانای ناوەکە دەبێتە (ئامەکەڵ) و وەک (دایەگەورە) یان (کەڵە ژن) ی لێ دێت کە وشەیەکی ترن بۆ نەنک و ئافرەتی بە ئەمەک. |
| amagan | مێینەی گیاندار بۆ زاوزێ<br>breeding female animal | meīgān مێی گان: مانایەکی نزیکی هەیە. |
| amarga | گوێرەکە<br>calf | gueraka گوێرەکە: ئەم وشە کوردیە لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە guamerga کە پێکگاتووە لە (gu+amerga) لە کوردیدا. (گا) لە سۆمەری وکوردیدا هەمان مانای هەیە. لە کوردیدا لە هەندێک ناوچەدا پیتی (م) گۆڕدراوە بۆ (و) بۆ نموونە (نام/ناو، زاما/زاوا، کەمان/کەوان، هەتیم/هەتیو)، بەو جۆرە ناوەکە کراوەتە guaerga و وشەی (گوێرەکە) ی ئەمڕۆی لێ پەیدا بووە. لە ڕاستیدا کورد پێشگری (gu گا) ی بۆ ناوەکە زیاد کردووە و ماناکەی کردۆتە (بەچکەی گا). |
| amargakud | گوێرەکەیەک کە وازی لە شیر هێنابێت<br>weaned calf | āmargākaut/āmargākat ئامەرگا کەوت: وەک لەسەرەوە باسکرا، (amarga) مانای (گوێرەکە) دەدات و (kaut/kat) مانای (واز هێنان) و |

| | | |
|---|---|---|
| | | (بڕانەوە)یە. بە هەمووی ماناکەی دەبێتە (لە گوێرەکەیی کەوت). |
| amarkud | نێرەی خەسێنراوی ئاژەڵ و مرۆڤ<br>Castrated male (animal, man) | ئامەرکەوت āmarkat/āmarkaut: لێرەدا دیسان مانای وشەی (کەوت) هەمان مانای (واز لێهێنان ،نەمان) دەگرێتەوە. وشەکە دەبێتە (لە بەچکە خستنەوە کەوت). |
| an | ئاسمان، بەهەشت<br>Sky, heaven | ئاین āīn: مانای بەهەشت و (ئاسمان) ە کە وردە وردە بووە بە بنەمای وشەی (ئاین) لە کوردیدا . کورد جگە لە وشەی (دین)، وشەی ( ئاین) یش بەکاردەهێنێت. پاشای گوتی و کاسیەکان بە خۆیان گووتووە ianzi (Diakonoff, 1985, p.61) کە وا دەردەکەوێت مانای (وەچە/زادەی ئاسمان/بەهەشت) بدات. |
| ana | ئەوەندە<br>as much as | ئەونە/ئەننە auna/anina: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی هەمان مانا دەدەن. |
| ane | ئەو (بۆ نێر و مێ)<br>he, she | ئەوە/ئانە āna/aua: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی هەیە، بە زاراوەی هەورامی دەبێتە (ئانە). لە زمانی هوریدا anni مانای (ئەمە) دەدات. |
| anene | ئەوان<br>they | وانان/ئەوان auān /uānān: هەردووکیان بەکاردەهێنرێن. وەک لە وشەی (ئانە) دا دەرکەوت کە بە کوردی و سۆمەری مانای (ئەو) دەدات، ئەم وشەیە لە کوردیدا پاشگری کۆی (ان) ی بۆ زیادکراوە و کراوەتە وانان (uānān)، لە سۆمەریشدا هەر بە هەمان شێوە پاشگری ene ی کۆی بۆ زیادکراوە بۆ ئەوەی کە ڕاناوەکە لە تاکەوە بکرێتە کۆ. |
| anga | ئەنجا<br>moreover | ئەنجا anjā: لە کوردیدا هیچ نەگۆڕاوە. ئەم وشەیە بە زمانی هوری دەبێتە undu و بە زمانی هیتی دەبێتە handa و هەموویان هەمان مانای وشە کوردیەکەیان هەیە. بەشێوەی جیاواز و مانای نزیک لە زمانی ئینگلیزیدا بە and و لە ئەڵمانیدا und و لە ئیتاڵیدا anche و لە سانسکریتدا canda مانای (هەروەها) دەدات. |
| angam | لە ئەنجامدا<br>consequently | ئەنجام anjām: هەمان مانای هەیە. |
| anki | گەردوون<br>universe | [ān] ئاسمان + [ki] جێ/جی، لە سۆمەریدا بە (جێ/شوێن) دەڵێن (کی). بەو جۆرە ئەو ناوە بووەتە (جێی ئاسمان). وەک باسکرا وشەی (ئان) ی سۆمەری بووەتە (ئاین) لە کوردیدا. |
| ankišua | گەردوون<br>universe | [ān] ئاسمان+ [kešāu] کێشاو. واتە (ئاسمان کێشراو) یان (درێژایی ئاسمان). |
| anna | وایە<br>indeed | وایە uāīa: هەمان مانا دەدات. ئەگەر سەیری وشە سۆمەریەکانی وەک anene, ana, ane, anna بکەین، دەبینرێت کە پیتی (ن) ی سۆمەری لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | هەندێک ناوچەی کوردستاندا وەک خۆی ماوە و لە هەندێکی تردا کراوەتە (و) و لە هەندێکی تردا لادەبرێت، بەڵام لە هەندێک وشەی وەک anna دا بە تەواوی لە هەموو زاراوە کوردیەکاندا پیتی (ن) ی سۆمەری لابراوە. |
| e nu | ژووری نووستن<br>bedroom | hī nu هی نو: لە کوردیدا (نو) دەبێتە ڕەگی (نوستن)، بەو جۆرە وشەکانی he nu مانای (هی نووستن) دەدەن. |
| anur | horizon ئاسۆ | anor ئەنۆر: ڕەگی وشەی سەیکردنە. (ئاسۆ) و (ڕوانین) لە ڕەنسیپدا یەکن. |
| anzah | شوشە<br>glass | anaza عەنەزە: کەسێک کە دڵ ناسک بێت. |
| are | ئەیهاڕێ<br>to grind | hār هاڕ: ئەم وشەیە لو کوردیدا دەبێتە ڕەگی (هاڕین). لە زمانی هیتیدا دەبێتە harr و بە زمانی لوڤی دەبێتە harra. |
| ara | جار لەگەڵ ژمارەدا<br>times with number | jār, bār جار، بار: لە ڕاستیدا ئەم وشەیە لە زمانی هوری و هیتیشدا بووەتە war (وار) کاتێک کە لە کۆرسی ڕاهێنانی ئەسپدا، میتانیەکان دەڵێن aikawartanna (ئێکا وار دانە) واتە (یەک جار/بار لەو دانە). |
| ara | ڕێ<br>way | re ڕێ: لە کوردیدا زۆر نەگۆڕاوە، لە زمانی هوریدا دەبێتە hári و لە زمانی لوڤیدا harrwa و لە فەرەنسیشدا بوەتە rue و لە ئینگلیزیدا road کە هەمان مانای ڕێی هەیە. |
| a...ra | شەهوەت فڕێدان<br>(ئاو هاتنەوە)<br>to ejaculate<br>('seminal fluid' + overflow') | āu roī ئاو ڕۆی: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (شەهوەت+لەبەر ڕۆیشتن). لە کوردیدا دەگووترێت (ئاوی ڕۆیی) و هەمان شیکردنەوەی وشە سۆمەریەکەی هەیە و کە هەمان ماناش دەدات. |
| arad | کۆیلە، خزمەتکار<br>slave, servant | harāj, ārān هەراج، ئاران: وشەی (هەراج) مانای (هەرزان فرۆشتن) دەدات. بۆ نموونە لە کوردیدا دەگووترێت (هەموو ماڵەکەی بە هەراج فرۆشت). هەروەها (ئاران) مانای (عەزیەت و ئێش) دەدات (هەژار، پ.٣). |
| arakar | هۆکار<br>factor | hokār/hārīkārī هۆکار/هاریکاری: (هۆکار) هەمان مانا دەدات و (هاریکاری) مانای (یارمەتیدان) دەگرێتەوە. |
| arar | ئەو کەسەی کە لە ئاش کار دەکات<br>miller | hārar هارەر: هەتاوەکو ئەمڕۆ هارەر ئەو کەسەیە کە شت دەهاڕێت و هیچ لە ماناکەی نەگۆڕاوە. لە ڕاستیدا پاشگری (ar ئەر/ەر) لە کوردیدا هەر ماوە و ئەم پاشگرە لە زمانی ئینگلیزیشدا بەدی دەکرێت و لە ئینگلیزیدا بووەتە er بۆ نموونە mill/miller, |

| | | |
|---|---|---|
| | | bake/baker, walk/walker و بە هەمان شێوەی (هار) و (هارەر) ی کوردی و سۆمەری. لە فەرەنسیشدا er پاشگری ناوەڵناوە ئەو پاشگرە هەمان ڕۆڵی هەیە. |
| aratta | زۆر نایاب، گرنگ<br>glory, important | harat هەرەت: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (ئەوپەڕ) ی هەیە بەڵام لە حاڵەتی وەسفکردنێکی پۆزەتیڤانەدا. بۆ (هەرەتی جوانی، هەرەتی بەهار، هەرەتی لاوی) بەکار دەهێنرێت. |
| arazu | داواکردن یان پاڕانەوە بۆ شتێک بە حەسرەتەوە<br>supplication | ārazu ئارەزوو: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (ویستی دڵ، دڵخواز، ئاوات) دەدات. |
| arina | ڕەگ<br>root | aruene ئەروێنێ: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای ناشتنی ڕووەک دەدات. وشەکانی (ڕواندن) و (ڕەگ) هەمان پرەنسیپیان هەیە. |
| armura | شوێنی ڕماو<br>ruins | arme ئەرمێ: مانای (ڕوخاندن) دەدات. |
| arre | شتێک کە دەگووترێت بۆ گاڵتەکرن بەشتێک یان بۆ سەرسوڕماوی<br>jest | are ئەرێ: لە کوردیدا کاتێک بە کەسێک دەگووترێ (ئەرێ) لەوێدا هەردوو مەبەستی سەرسوڕمان و گاڵتەجاریش دێت، تەنها مۆسیقای وشەکە لە ووتندا ماناکەی دەگۆڕێت. |
| arzig | هەرزن<br>millet | harzin هەرزن: زۆر نزیکن لەیەک. بە ئەڵمانی و دانیمارکی و نەرویجی دەبێتە hirse و بە سویدی hirs. |
| asalGar | بیناساز<br>architecture | hasār gar حەسار گەر: هەر چەندە وشەکە وەک خۆی لە کوردیدا نەماوە، بەڵام (حەسار) لە کوردیدا ئاماژەیە بە دیواری بەرز. وشەی (حەسارگەر) ئاماژەیە بە کەسێک کە حەسار دروست بکات. هەمان پاشگری (gar) ی سۆمەری، لە زمانی کوردی، هوری و هیتیدا بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بە پیشەی کەسێک. نموونەی لە کوردیدا بریتین لە (زەرنگەر. ئاسنگەر، مسگەر، جادوگەر). بەو جۆرە مانای وشەکە لە کوردیدا دەبێتە ئەو کەسەی کە دیواری بەرز دروست دەکات. |
| asiri | ئەسیری جەنگ<br>prisoner of war | asīr ئەسیر: ئەم وشەیە زۆر جار بە هەڵە وا دەزانرێت عەرەبیە بەڵام سۆمەری و هوری و کوردیە. هوریەکان پێی دەڵێن atsiri و کورد لە هەندێک ناوچەشدا وەک هوریەکان، پێسی دەڵێت (یەخسیر). |
| asura | ئاوێک لە قوڵیدا<br>Water from the dapth | āu zora ئاو زۆرە: وەک پێشتر باسکرا لە زمانی سۆمەریدا (ئا a) مانای (ئاوی) هەیە و sur لە سۆمەریدا هەندێک لە ماناکانی وشەی (زۆر) ی کوردی هەیە. بەو جۆرە وشەکە دەبێتە (ئاو زۆرە). |

| | | |
|---|---|---|
| aš | نەفرەتکردن<br>curse | ăš/āīš ئاش/ئایش: بلە کوردیدا ۆ دەستپێکردنی (نەفرەت لێکردن) بەکاردەهێنرێت و هەندێک جاریش بە تەنیا دەگووترێت (ئایش). بۆ نموونە لە ڕستەدا دەگوترێت (ئایش لە تۆ). |
| ašag | پەپولە<br>butterfly | ašiq ئەشق: دەشێت ئەم وشەیە مانا نوێکەی کە بریتیە لە (خۆشەویستی)، لە بنەچەدا هەر لە پەیوەندی نێوان پەپولە و مۆمەوە هاتبێت، کە بنەمای دەربڕینی خۆشەویستی ڕۆحانیە لای سۆفیەکان. لە زمانی ئەڵمانیدا دەگوترێ<br>Haben schmetterlinge im Bauch<br>بە تەرجومەی حەرفی دەبێتە: ( هەبوونی پەپولە لە سکدا )، بەڵام مانای ڕستەکە دەبێتە (ئاشق بوونی کەسەکە). وەک دەردەکەوێت لە ناو هەندێک فەرهەنگدا پەپولە بە ئەشقەوە دەبەسرێتەوە. |
| aš | ئارد<br>flour | āš ئاش: لەوە دەچێت وشەی (ئاش) ی کوردی کە شوێنی هاڕینی ئاردە، لەوە هاتبێت. |
| aš | شەش<br>six | šaš شەش: لە کوردیدا نزیکە و لە زمانی گۆسی (Goth)[63] دا دەبێتە saihs و لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا six و لە هەموو زمانەکانی جیهاندا نزیکە. |
| aš bala | نەفرەتکردن<br>curse | āīš balā ئایش بەلا: (ئایش بەلایەکت تووش بوایە) هەتاوەکو ئەمرۆ لە کوردیدا بەکاردەهێنرێت. |
| ašlag | کەسێک کە جل پڕ دەکات (هەلاج)، کرێکاری کوتاڵ<br>fuller, felt-worker | halāj هەلاج: ئەو کەسەیە کە بە کوتک و کەوان لۆکە و خوری شی دەکاتەوە. |
| aš sar | نەفرەتکردن<br>curse | haš ba sar هەش بەسەر: لە هەندێک ناوچە، (هەش بەسەر) هێشتا بەکاردەهێنرێت هەژار دەڵێت بریتیە لە (بەدبەخت یان تازیەدار) ( پ.٩٧٧). |
| aše | ئێستا<br>now | īse/esā/estā ئیسێ/ئێسا/ئێستا: بە سێ شێوەکەی لە کوریدا ماوە. لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا دەگووترێت (ئیسێ). لە زمانی سانسکریتدا دەبێتە atha.عەرەبی عیراق لە کوردی وەرگرتووە و تەنها لە زمانی قسەکردندا بەکاری دەهێنێت و کردوویانەتە (هسه) واتە (ئیسێ). لەبەر تازە وەرگرتنی، نەخراوەتەوە فەرهەنگی زمانی عەرەبیەوە. |
| ašiš | باڵندەیەکە<br>a bird | alašīš عەلەشیش: بەشێکی ئەو ناوە لە باڵندەی (عەلەشیش) دا ماوە کە پێشی دەگووترێت (قەلەمون). |
| aškud | دەرگا | aškaut ئەشکەوت: لە کوردیدا بریتیە لەو کونە |

[63]. خەڵکانێک بوون کە بەپێی سەرچاوەکانی خۆیان نیشتەجێی باشوری وڵاتانی ئەسکەندنافی بوون و بە زۆر شوێنی ئەوروپادا بڵاوبوونەتەوە. زمانەکەیان سەر بە لقی جێرمانیک (Germanic) ی هیندۆئەوروپیە و گرنگە بۆ ئەو کەسانەی کە لێکۆڵینەوە لە مێژووی لقە زمانی جێرمانیک دەکەن (Gothic Language, 2012).

| | | |
|---|---|---|
| | door | گەورمیەیەی کە لە شاخدایە. دەشێت وشەی (ئەشکەوت) لەو مانا سۆمەریەوە هاتبێت لەبەر ئەوەی کە لە پرەنسیپدا یەکن. |
| ašme | پرشنگدار<br>radiance | sīm سیم: بە کوردی هەمان مانا دەدات و ئەم وشەیە بە زمانی هوری دەبێتە hizmí. |
| ašša | دەنگێکی بەرز و شێواو بە تایبەتی لە هاوارکردن<br>clamour | hāža/hāša هاشە/هاژە : لە کوردیدا بۆ ئاماژەکردن بە دەنگی (هەژدیها، تاقگە، ڕەشەبا) بەکاردێت. |
| ašša | زۆر باش (زۆر تەواو)<br>perfect | xāsa خاسە: (خاسە) مانای (تەواوە، چاکە) دەگرێتەوە. لە زمانی هیتیدا assu مانای (باش، چاک) دەبێتە و لە زمانی لیدیدا دەبێتە wiśśi لە لوڤیدا دەبێتە wasu. |
| ašte | ویست؛ پێویستی<br>need; necessity | uīst/ uīs ویست/ویس: لە کوردیدا هەردوو شێوەکەی هەیە. بە زمانی میدی دەبێتە vas/vasa. لە زمانی لوڤیدا دەبێتە wazi، لە زمانی ئیسپانیدا دەبێتە istanza و بە مانایەکی نزیک لە ئینگلیزی و لاتینیدا دەبێتە quest و بە فەرەنسی دەبێتە quête. |
| ašte | کورسی، کورسی حوکم، شوێنی گوزەران، یەکەیەکی ناوچەیی.<br>chair, throne; dwelling; a unit of area | stān ، ستان : وشەی (ستان) لە کوردیدا وەک پاشگر بە مانای (شوێن) بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە (بێستان ) پێک دێت لە (باخ +ستان ) واتە (شوێنی سەوزایی و باخ) بەو جۆرە وشەی (کوردستان، دارستان، کافرستان، کوێستان، ...) دروستکراوە. ئەم وشە سۆمەریە لە زمانی لاتیندا بە شێوەی stautuo دەردەکەوێت بە نزیکی هەمان مانای وشە سۆمەریەکەیە و چووەتە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکانەوە. |
| ašudu | سەرچاوەی سامان/شتومەک<br>resources | ašt/šit ئەشت/شت: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکە دەنووسرێت و مانای کەلوپەل یان شتێک دەگرێتەوە. |
| atua | سەرمۆنی پاکردنەوەی ئاینی بە شتن یان قوربانیدان<br>lustration rite | ašuā ئەشوا: لە کوردیدا مانای (پاکردنەوە) دەدات و بە زمانی هوری tuw مانای (پاک) دەدات. لە ئینگلیزیدا کرداری شتن دەبێتە wash و بە ئەڵمانی دەبێتە Wäsche (شتن) وەک ناو. |
| a'u | وشەگەلێکە بۆ دەربڕینی سەرسوڕمان، ئازار و هەست دەربڕینێکی بەهێز.<br>exclamation | āuā, hau ئاوا، هەو: لە کوردیدا وەک نیشانەی سەرسوڕمان کە شتێک باس دەکرێت دەگووترێت (ئاوا) وەک سەرسوڕمانێک لەو شتەی کە لە باسکردنەکەدا ڕوویداوە. وشەی (هەو) بۆ سەیرمان بۆ زیان بەکاردێت (هەو لێم ڕژا) ( هەژار، پ.٢٠٠٨). |
| a'u | ئاوێکی بەرز<br>high water | āu ئاو: لە کوردیدا تەنها مانای (ئاو) دەدات و چووەتە زمانی فەرەنسیەوە و بووەتە eau کە هەر مانای (ئاو)ی کوردی هەیە. |
| a'ua | مۆسیقا ژەن | hauā هەوا: لە کوردیدا بە مانای (مەقامی مۆسیقا) |

| | | |
|---|---|---|
| | musician | بەکار دەهێنرێت. |
| aya | هاوارکردن لە تاو ئازار<br>a cry of woe | āī ئای: لە کوردیدا نەگۆڕاوە. لە فەرەنسیدا بە aïe دەنوسرێت و هەمان مانا دەدات. |
| azalla | ڕوەکێکی پزیشکیە<br>a medicinal plant | žāla ژاڵە: ڕووەکێکی ناسراوە و لە زۆر شوێنی کوردستان و میسۆپۆتامیادا دەڕوێت. ئەم ڕووەکە گوڵێکی جوان دەردەکات و بە ڕەنگی جیاوازیش هەیە. نازانرێت کە ئەگەر بۆ بەکارهێنانی پزیشکی سوودی لێ وەربگیرێت، بەڵام لە کوردەواریدا بە پیرۆز دادەنرێت و ئەفسانەی لەسەر هەیە. کورد دەڵێت (ژاڵە بۆ وا تاڵی، ئەویش وەڵام دەداتەوە و دەڵێت لەبەر برا مردن، ئەی گوڵت بۆ وا ئاڵە، ژاڵە لە وەڵامدا دەڵێت لە بەر دۆست و دوژمن). هەروەها کورد پێی وایە کە قەلەڕەشکە کە بە تەمەن درێژ ناسراوە، بە دەنوک ئاوی ژیانی کردووە بەسەر ژاڵەدا. |
| a-zi-ga | ئاو زیابوون<br>(بەرزبوونەوە)<br>rising water<br>('water' + 'to rise up' + nominative). | au zīa ga ئاو زیا گە: واتە (ئاو زۆرە). وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بە (ئاو+ زیادبوون+ جێگری بکەر). لە کوردیدا بە هەمان شێوەیە و ئەمە زیاتر شێوەی قسەکردنە لە گەرمیان و شارەزوور هەتاوەکو و سنە و هەندێک ناوچەی تر. لە ناوچەکانی تر دەبێتە (ئاو زیا یە). هەندێک جار لە ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تر پیتی (گ) دەگۆڕێت بۆ (ی). بۆ نموونە (کورگەل) کە لە ناوچەی سنە و سلێمانی بەکاردێت، لە ناوچەی کرماشان دەبێتە (کوڕیل). |
| bad | کراوە<br>open | bāz, uāz باز، واز: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی، هەمان مانای(کراوە) ی هەیە و baz لە هوریدا مانای (چوونە ژوورەوە) دەدات و بە هیتی has مانای (کردنەوە) دەدات. لە ئینگلیزیدا pass ماناکەی دەبێتە (دەروازەی نێوان دوو شاخ). لە فەرەنسیدا passe بە مانای تێپەڕ بوون/ ڕەت بوون و گەلێک مانای تری هاو شێوەی دێت. |
| badbad | بەزاندن لە شەڕدا<br>defeat in battle | patpat پەت پەت: دەبێتە ڕەگی (پەتپەتێن)، لە زمانی کوردیدا مانای (سوکایەتی پێکردن و ئازاردان) دەدات (هەژار، ب.١١٦). زۆربەی جار لەگەڵ دوژمندا بەکاردەهێنرێت. |
| bahar | کوپە و قاپ دروستکەر<br>potter | bāhar باهەر: لە کوردیدا (بایەر/باهەر/بادەر) هێشتا دەگووترێت و ئاماژەیە بۆ کەسێک کە شت بسوڕێنێت کە لەگەڵ سروشتی کوپە دروستکرندا دەگونجێت و دەبێت ئەوە بزانرێت کە سۆمەریەکان لە ٣٠٠٠ پ.ز. وە کوپەیان بەهۆی بایان (خولانەوە) وە دروست کردووە. |
| bahargal | سەرۆکی کوپە و قاپ دروستکەرەکان | bāharkal باهەرکەڵ: (گەڵ) وشەیەکە سۆمەریەکان بە هەمان مانای (کەڵ) ی کوردی بەکاری دەهێنن و |

| | | |
|---|---|---|
| | chief potter | هوریەکان پێیان گوتوە (کەڵ)، وەک زمانی کوردی ئەمرۆ. |
| bala | ئاڵاندن، حوکمکردن وەک پاشا، خولاندنەوە، گەڕدان، ماوەی حوکمڕانی، هەڵگەڕانەوە، بە گوریس هەڵکێشان، ئاو هەڵانین؛ هەڵگرتن<br>to rotate, reign, rotation, turn, term of office; to revolt; to hoist, draw (water); to carry | biālā بئالا: ئەم کردارە پێکهاتووە لە (ب +ئالا) کە مانای (بئاڵێنە) ی هەیە ، جگە لەوە (باڵا) مانای بەرزی هەیە. هەروەها وشەی (بەڵا) بە مانای (نەهامەتی و کێشە و ناخۆشی) دێت بۆ نموونە دەگووترێت (خوایە چۆن تووشی ئەم بەڵایە بووم). هێڵان مانای جولانەوەی گوریس دەدات (هەژار، پ.١٠١٩).هەروەها وشەکە مانای (ئاو هێڵان) دەدات. ئەم وشەیە بناغەی ناوی هەولێرە. لەبەر ئەوەی سۆمەریەکان پێیان گوتووە (ئوربێلا urbela) کە مانای شاری باڵا/بەرز یان شاری سەرو دەگرێتەوە و ئەوەش شوێنی شاری هەولێر بووە لە گۆشەی شوێنی گوزەرانی سۆمەریەکاندا کە لە خوار و ناوەراستی عێراقدا ژیاون. لەبەر ئەوەی ئەوان خۆیان نیشتەجێی ناوچەیەکی خوارو تر بوون یان دەشێت لەبەر بەرزی شارەکە و بوونی لەسەر گردێک ئەو ناوەی پێ درابێت. هەرچەندە دوای هاتنی ئاشوریەکان هەوڵ درا، مۆرکی سامی پێ بدرێت و بکرێتە (ئەربائیلو) بەڵام هەر ئەربێلا یان ئوربێلا، کە ناوە سۆمەریەکە بوو وەک خۆی مایەوە. |
| balaĝ | دەهۆڵێکی گەورە یان چەنگ (قیسارە/هارپ)<br>a large drum or harp | raš**balag**, dum**balag** ڕەشبەڵەگ، دومبەڵەگ: هەڵپەرکێی پیاو و ژنان پێکەوە ، پێی دەگووترێت (ڕەشبەڵەک)، (دومبەڵەگ) ئامێری تەپڵە. بەو جۆرە ئەو وشەیە وەک پاشگرێک لە وشەی لێکدراوی پەیوەست بە مۆسیقا، لە کوردیدا بەدی دەکرێت. |
| balaĝdi | ئامێرێکی مۆسیقایە<br>"a musical instrument" | هەر وەک لە سەرەوە ڕوونکرایەوە. وشەی (بەڵەک) لە ناو مۆسیقای کوردیدا هەر زیندووە. |
| balaĝil | مۆسیقا ژەن musician | (بڕوانە balaĝdi) |
| bara | بڵاوکردنەوە، بەرەڵا کرا<br>to spread out, released | bara, bar بەرە، بەر: لە کوردیدا (بەرە) مانای (ڕاخەر) دەدات. (بەر) دەبێتە ڕەگی وشەی (بەر بوون)، دەگووترێت "کابرا چوار کۆتری بەرا". |
| balak | تەشی<br>spindle | baloka بەلۆکە: مانای چیلکە دەدات (هەژار، پ.٨٤). ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە baulk کە مانای تەختە/دارێکە کە چاکرابێت. |
| banda | منداڵ<br>child | banda بەندە: لە کوردیدا ئەم وشەیە بۆ (بەندبوون و هەڵواسراوی بە کەسێکەوە) بەکاردەهێنرێت و مانای بچووکیش دەدات. کە پرنسیپی مانای منداڵی هەیە و لە ئینگلیزیدا بووەتە pendant کە لە بنەچەدا لە لاتینەوە هاتووە، pendent بە مانای (پێوە هەڵواسراوی و ملوانکە) ی هەیە و لە فەرەنسیشدا |

| | | |
|---|---|---|
| | | مانای (پەیوەست، هەڵواسراو) دەدات، بە هەمان شێوەی کوردی (bandana بەندانە).<br>لە ئینگلیزیدا dependant مانای ئەندامانی خێزان دەگرێتەوە کە متمانە دەکەنە سەر سەرکردەی خێزان، بۆ نموونە منداڵ بۆ باوک یان دایک دەبێتە dependant و کە مانای (وابەستەیی) دەدات . |
| banda | بچووک، لاو<br>junior, small | banda بەندە: ئەم وشەیە لە کوریدا وەک خۆی ماوە و کەسێک وەک ڕێز بەرامبەر بە کەسێکی تر لەبری ئاماژەکردن بەخۆ، بۆ خۆ بچووک کردنەوە دەڵێت (بەندەت) واتە بچووکت. هەتا ئێستاش لە ناو کوردەواریدا کە ڕێزدارێک دەپرسێت (ئەوە منداڵی کێ یە؟) باوک یا ن دایکی منداڵەکە دەڵێت (بەندەی جەنابتانە). لەناوچەی بادینان هەتاوەکو ئەمڕۆ کە لەگەڵ کەسێکی پایەبەرزدا قسە دەکرێت دەگووترێت (ئەزبەنی) کە پێکهاتووە لە (ئەز+بەندی) کە مانای (منی بچووک) دەگرێتەوە. |
| banda | دووربینی و ژیری<br>sagacity | panda پەندە: واتە ئامۆژگارکەرانەیە و وانەی لێ فێر ئەبێت. |
| banda | دارێک یان چوارچێوەیەک وەک پاڵپشت بەکاردەهێنرێت<br>stanchion | band بەند: بۆ بەستنەوە و ڕاگرتن بەکاردەهێنرێت بۆ نموونە (بەنداو) کە ئاو ڕادەگرێت. |
| banšur | مێز<br>table | bānžur بانژور: مانای (لەسەر شتێک) دەدات کە ماناو مەبەست و ڕۆڵی مێزە. . |
| bar | دەرەوە، لا (تەرەف)؛ لەبەر (بەهۆی)؛ بڕین<br>outside, side; because of, slit | bar, bir بەر، بڕ: لە کوردیدا (بەر ) بە مانای (لایەک) دێت، بۆ نموونە (ئەم بەر، ئەو بەر) .(بڕ) مانای (بڕین، لەتکردن) ی هەیە. بە مانای (هۆ، بەهۆ) دێت بۆ نموونە (لەبەر ئەوە)، بە نزیکی ئەو مانایەی دوایەمینی لە فەرەنسیدا بووەتە pour و ئینگلزی for و ئیسپانی para و ئیتالی per و فارسی بووەتە (برای). |
| bar...aka | هەڵبژاردن؛ لێ ووردبوونەوە<br>to choose; to examine<br>(to see; to select' + 'to do') | bar akā بەر ئەکا: دەبێتە ڕەگی (لەبەر ئەکا) کە مانای (لەبەرکردنی شتێک کە دەخوێنرێتەوە) دەدات. وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بە (سەیرکردن؛هەڵبژاردن + کردن) و لەگەڵ ڕونکردنەوە کوردیەکەدا دەگونجێت. |
| barda | دارێک کە بە ئاسۆیی دادەنرێت لە نێوان دوو داردا<br>crossbar | parda پەردە: لە کوردیدا ئەو قوماشە هەڵواسراوەیە کە لەبەردەم پەنجەرەدا دادەنرێت کە هەمان پرەنسیپی ئەو مانایەی تێدا بەدی دەکرێت. |
| baza | کەمئەندام و بێ توانا و شەل | bazīu بەزیو: کەسێک کە شکێنرابێت لە شەڕدا یان |

| | | |
|---|---|---|
| | dwarf; cripple, lame | لە قسەکردن و لە پێشبڕکێدا. |
| be | لێ دەرکردن، لابردن، بچووک بوونەوە، کەمکردنەوە؛ دەرهێنان<br>to deduct, remove; to diminish, reduce; to withdraw | be, ba بێ، بە: وشەی (بێ) لە کوردیدا بۆ (لابردن، کەمکردنەوە) بەکاردەهێنرێن. بۆ نموونە (بێ چەک، بێ ژن، بێ دڵ (دڵ ڕەق)، بێ خەو، بێ کەس.....) و (بە) دەبێتە ڕەگی (بردن)، بۆ نموونە (کتێبەکان نەبەم، کتێبەکان ببە) |
| bil | لقی نوێی درەخت<br>sprout, shoot | pil پل: مانای (لقی باریکی دار) دەدات (هەژار، پ. ١١١). |
| bir | بڵاوبوونەوە و پەڕین<br>to scatter, disperse | par پەڕ: ئەم وشەیە دەبێتە ڕەگی (پەڕین) و هەمان مانای سۆمەری دەگەیەنێت. لە زمانی هیتیدا دەبێتە parean کە مانای دوورکەوتنەوەی هەیە. |
| bir | لەتکردن و بڕین<br>to shred | bir بڕ: دەبێتە ڕەگی (بڕین) کە هەمان مانای هەیە. |
| bir | کۆمەڵێک لە ئاژەڵ<br>a team of animals | bir بڕ: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات، بۆ نموونە (بڕێک مەڕم لە لادێ کڕی). |
| birtu | بینایەکی بەهێزکراو<br>fort | bard بەرد: کە دەشێت ناوەکە لە بە بەرد دروستکردنی بیناکەوە هاتبێت. لە ئینگلیزیدا بووەتە fort کە دەشێت بنەچەکەی هەر (بەرد) ی سۆمەری و کوردی بێت. وشەی fort لە فەرەنسیدا جگە لە مانای پتەو، بینای بەهێزی سەربازی و گەلێک مانای تری پەیوەست بە (هێز) دەدات. |
| bu | تەواو (کامل)<br>perfect | bū بوو: لە کوردیدا بە مانای (ئامادەبوون، تەواوبوون، پێگەیشتن) بەکاردێت. بۆ نموونە (میوەکە بووە، چێشتەکە بووە، کارەکە بووە) کە نزیکی هەمان مانای هەیە. |
| bulbal | جۆرێکە لە دروستکردنی وشە کە لە دەنگەکە خۆیەوە وەرگیراوە<br>onomatopoeic | bolabol بۆڵەبۆڵ: وشەیەکە بۆ ئاماژەکردن بەو دەنگانەی کە لە کاتی سکاڵا و توڕەبووندا لەژێر لێوەوە دەگووترێت. |
| bulug | دەرزی، لق و پۆپ<br>needle, shoot, sprout | balok, palik بەلۆک، پەلک: (بەلۆک) مانای چیلکەی هەیە و (پەلک) مانای (لقی دار) دەدات. لە ئینگلیزیدا بە تەختە دار دەگووترێت baulk. |
| buniĝ | سەتڵ، دەفری گەورە، ئەو شوێنە درێژەی کە گیانەوەر ئاخوری تێدا دەخوات یان ئاوی تێدا دەخواتەوە<br>a trough, bowl or bucket | bānīža بانیژە: ئەو شوێنەیە کە لە ئاشدا گەنمی تێدا ڕۆ دەکرێت (هەژار، پ.٤٧) |
| bur | توانای پێشڕەوی و دەسەڵات<br>authoritative | buer بوێر: بۆ وەسفکردنی ئازایی و توانای سەرکردە یان کەسێک بەکاردەهێنرێت. لە زمانی هوریدا buru مانای (بەهێز) دەدات. لە زمانی سانسکریتدا vIra |

| | | |
|---|---|---|
| bur | جلوبەرگ<br>clothing | مانای (سەرکردە، ئازا، بەهێز) دەدات.<br>bar, barg بەر، بەرگ: (بەر) دەبێتە ڕەگی (لەبەرکردن) کە پرەنسیپی سروشتی جلە و (بەرگ) جل خۆیەتی. |
| bur | بەر (ئەو شوێنەی کە لەسەرو ئەندامی سێکسی نێر و مێدایە)<br>crotch | bar بەر: هەر وەک خۆی ماوە. |
| bur | برین<br>cut off | bir بڕ: ئەم وشەیە دەبێتە ڕەگی (بڕین). لە ئینگلیزیدا بووەتە pare کە مانای (بڕینی شتی زیادە دەدات ، بۆ نموونە چیمەن بڕین، یان ڕیش کورتکردنەوە). |
| bur | بەردان (کردار)<br>to release | bar بەر: ئەم وشەیە دەبێتە ڕەگی (بەر بوون) |
| bur | یەکەیەکی قەبارەیە<br>a unit of volume | bār بار: لە کوردیدا ئەم وشەیە بۆ وەسفکردنی قەبارە و کێشە. بۆ نموونە (بارە دار، باری کەرێک، دوو بار جل) ئەمانە هەمووی زیاتر ئاماژەن بە یەکەی قەبارە و کێش. لە کوردیدا بووەتە کرداریش وەک (بارکردنی خشتەکان کاتی زۆر دەوێت). ئەم وشەیە لە زمانی ئاڤێستاشدا هەر وەک کوردیە و بریتیە لە bar و لە زمانی میدیدا bara مانای (سوارە) دەدات. لە ئینگلیزیدا بووەتە bear کە مانای (هەڵگرتن) دەدات. لە یۆنانیدا بووەتە baros کە مانای (کێش) ی هەیە و جارێکی تر لە یۆنانیەوە چووەتەوە زمانی ئینگلیزی وفەرەنسی و بووەتە bar کە یەکەی پاڵەپەستۆیە. |
| bùr | کونکردنی شتێک، چوون بەناو شتێکدا، چوونە شوێنێک بە مەبەستی دزیکردن<br>to bore through, pierce; to break into | bir بڕ: لە کوردیدا ماناکانی (کونکردنی شتێک، چوونە شوێنێک بە مەبەستی دزی، کوناودەرکردن) دەدات، بۆ نموونە (گولەکە تەختەکەی بڕی، دزەکە ماڵەکەی بڕی، ئەو بزمارە دیوارەکەی بڕی). لە ئینگلیزیدا بە شێوەی bore دەردەکەوێت کە ماناکەی دەبێتە (کونکردنی شتێک). |
| burbalaĝ | مۆسیقاژەن<br>musician | (بڕوانە وشەکانی balaĝ و balaĝdi). |
| burgi | شتومەکی بەسوود و بەنرخ<br>commodity | bārga بارگە: لە کوردیدا مانای (باری خواردەمەنی و کەلوپەلی سەفەری پیاوی ماقوڵ) دەدات (هەژار، پ.٤٠)، بەڵام مانایەکی گشتی شتومەکیش دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (بارو بارگەی لەو دێیە داناوە). |
| burgul | بەرد لەتکەر<br>stone-cutter | bardkol بەردکۆڵ: کە لە کۆڵینی بەردەوە هاتووە و وشەی agul لە زمانی هوریشدا بە تەنها هەمان مانای (کۆڵین) ی کوردی هەیە. |
| bursaĝ | خزمەتکارێکە<br>a servant | baršaq بەرشەق: ئاماژەیە بۆ حاڵی خزمەتکار کە لەبەر شەق و لێداندایە. لە کوریدا وشەی هاوشێوەی ئەو وشە سۆمەریە ماوە. بۆ نموونە دەگووترێت "بۆ |

| Sumerian | Meaning | Explanation |
|---|---|---|
| | | کارەکەم ئەو کورەم هەر بۆ **بەردەست** پێویستە" کە لەوێدا مەبەست لێی کاری لاوەکیە. |
| buru | باڵندە<br>bird | bār, bāroka, parī بار، بارۆکە، پەری: (بار) مانای (بێچووە مەلی بەهارە) دەدات و (بارۆکە) بریتیە لە جوجەڵە مریشکی بەهارەی ساڵ تەواونەکردو (هەژار، پ. ٢٩ و ٣١). تێبینی دەکرێت کە وشەی (بارۆکە) ی کوردی پێک دێت لە (بارۆ+کە)، واتە وشەکە لە بنەرەتدا وەک سۆمەری بریتی بووە لە (بارۆ bāro) و بە هۆی پاشگری (کە) بچووک کراوەتەوە و مانای (باڵندەی کەم تەمەن) ی لێ دروستکراوە. واتە لە سەردەمێکدا وشەکە وەک سۆمەری بووە و هەمان مانای داوە. هەروەها وشەی (پەری parī) کوردی ناوێکی ترە بۆ (فریشتە/جۆرێک لە کۆتر).<br>لە زمانی ئینگلیزیدا بە (باڵندە) دەگووترێت bird و ئەوەی کە جێی سەرنجە لە ئینگلیزی کۆندا وشەی brid هەمان مانای (بار bār) ی کوردی داوە، واتە (باڵندەی تەمەن بچووک). لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد دا دەڵێت نازانرێت بنەچەی وشەکە لە کوێوە هاتووە. ئەم وشەیە لە کوردیدا هەندێک جار دەخرێتە پێش ناوی باڵندەوە، بۆ نموونە دەگووترێت (بارەکەو bārakau). تێبینی دەکرێت لە زۆر ناوی باڵندە لە زمانی سۆمەریدا وەکو کوردی وشەی buru ی تێدا بەدی دەکرێت و وەک پێشگرێک بەکاردەهێنرێت، بۆ نموونە buru'ad، buru'az، burudugud، buru'edinak. |
| buru | میوە، بەر<br>fruit, harvest | bar بەر: هەمان مانا دەدات |
| buru | قەڵەم ئاسنی هەڵکۆڵین<br>burin | bira برە: لە کوردیدا مانای (مشار، کەڵبەی نێرە بەراز، شفرە) دەدات (هەژار، پ.٥٣). لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە burin. |
| BU'UDbar | نێرێکی ناپاک<br>Impure male | badfar بەدفەڕ: ئاماژەکردنە بە کەسێکی بێ نرخ و خوێڕی. |
| bu'Vr | بیر<br>well | bīr بیر: هەمان مانا دەدات. |
| da | بەشێکە لە پێکهاتەی کرداری لێکدراو<br>compound verb verbal element | dā دا: زۆر کرداری لە کوردیدا (دا) ی تێدایە، (بای دا، فڕێ دا........) |
| dab | گرتن، دەستگیرکردن<br>to seize, to hold | dāu داو: جگە لەوەی کە ئامێرێکە بۆ گرتنی باڵندە و گیاندار، وەکو سەمبۆلیش بەکار دەهێنرێت بۆ دارشتنی پلانێک بۆ گرتنی مرۆڤ. دەوترێت: (کەوتە ناو داوەکەوە). |

| | | |
|---|---|---|
| daban | قایشی بەستراوە بە لەشەوە (ئاژەڵ یان مرۆڤ)<br>harness | داب dāb: لە کوردیدا مانای (هوندراو لە موی کلکی ئەسپ) دەدات ( هەژار، پ.٢٧٣). |
| dagsirum | چاکردنەوە<br>repair | داگیرس dāgīrs: دەبێتە ڕەگی وشەی (داگیرسان) کە مانای (هەڵکردن، خستەنگەڕ) دەدات و نزیکە لە مانای چاکردنەوەوە. |
| dakkan | ژووری کار<br>chamber | دوکان dukān: هەمان مانای هەیە. |
| dal | فڕین<br>fly | داڵ dāl: لە کوردیدا باڵندەیەکی باڵ گەورەی کەلاک خۆرە. |
| dal | پاراستن<br>protection | داڵە dāla: وشەی (داڵە) لە کوردیدا مانای (پاراستن) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (خێڵە گەورەکە داڵەی کابرای ڕاکردوویان دا). وشەی (داڵە) ی کوردی لە زمانی سراسیدا دەبێتە dele. |
| dála | دەرزی<br>needle | تاڵ tāl: مانای (ژێ، داو) دەدات. |
| dil | یەک: تەنها: بە تەنها: تایبەت و تاک<br>one; single; alone; unique | دڵ dil: پێ دەچێت ئەم وشە دوایی بووبێتە مانای (دڵ) کە بریتیە لەو ئەندامەی لەشدا کە پاڵ بە خوێنەوە دەنێت و لە لەشی زیندەوەردا تاکە و گرنگە. |
| damšah<br>dam-šah | تیمساح، هیپۆ<br>crocodile, hippopotamus | دەمشا damšā: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (دەم گەورە) دەگرێتەوە و لەگەڵ سروشتی هەردوو گیاندارەکەدا دەروات و لە کوردیدا وشەی (شا) لە (شاپەڕ، شاتو، شادەمار، شاجوان) دا هەمووی ئاماژەن بۆ گەورەیی شتەکان. |
| dana | یەکە<br>unit | دانە dāna: لە زمانی کوردیدا وەکو خۆی ماوە. |
| danagar | ئامرازێکی شت تێدا هەڵگرتن<br>a container | دانەگر dānagir: لە کوردیدا مانای (دانەوێڵە گر) دەدات. |
| dar | لەتکردن و جیاکردنەوە لە یەکتری، هەڵدرین<br>To split, spli up; to cut open | دڕ dir: ئەم وشیە دەبێتە ڕەگی ( دڕین) کە هەمان ئەو مانایانەی هەیە. لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە tear و بە فەرەنسی دەبێتە déchirer. |
| dara, dar | تاریکبووە<br>darkened | تار، تارە tār, tāra: وشەی (تار) مانای تاریک دەدا و (تارە) دەبێتە ئاوەڵکردار. لە زمانی لاتینیدا دەبێتە atra و لە ئینگلیزیدا بە وشەی (تاریک) ی کوردی دەڵێن dark . |
| dari | ناکۆتا<br>eternal | دوری durī: لە ڕووی ماناوە هاوبەشی هەیە لە نێوان (ناکۆتا) و (دوری) دا. |

| Sumerian | Kurdish / English | Explanation |
|---|---|---|
| de | ڕژاندن و تێکردنی ئاو، وانە دان<br>to pour, to instruct | dā دا: ئەم وشەیە لە (ئاودا) دا دەردەکەوێت کە مانای ڕژاندن و تێکردنی ئاو دەگرێتەوە و وشەی (a de) ی سۆمەری هەمان مانای (ئاو ئەدای) کوردی دەدات و بووەتە بنەچەی وشەی (ئاوەدان)، ئاماژەیە بۆ زەوییەک کە ئاودرابێت و دەستی مرۆڤی پێ گەیشتبێت. لە کوردیدا بە ناوچەیەک کە گوزەرانی تێدا بکرێت دەگووترێت (ئاوەدانی). هەروەها دەگووترێت (دەرسی دا، مەعیزەی دا) کە (دا) لەوێدا هەمان مانای (وانەدان) دەگرێتەوە. |
| dellu | داری درێژ، تێلا<br>mast | telā تێلا: هەمان مانا دەدات. |
| dešana | کەسوکاری پیاو بەرامبەر ژن و بە پێچەوانەوە<br>in-law | diš دش: لە کوردیدا وشەی (دش) خوشکی مێرد دەگرێتەوە و (دشان) دەبێت کۆی ناوەکە. |
| du | قسەکردن<br>speak | du دو: مانای قسەکردن دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (کابرایەکی کەم دووە) واتە (کەم قسەیە). لە ئاڤێستاشادا دەبێتە du. ئەم وشەیە لە زمانە هیندو ئەورووپییەکاندا ماوە. بە لاتینی dico ، ئیتالی dire، ئیسپانی decir، فەرەنسی dire و ڕەگی گوتن di، ئیتالی و ئیسپانی dice. |
| di...dab | بردنی مەسەلەیەک بۆ دادگا<br>to take up a lawsuit ('lawsuit' + 'to take') | dā dabā دا دەبا: لە کوردیدا (دا/داد) هەردووکی بەکار دێت و لە فەرهەنگە سۆمەرییەکەدا وشەکە شیکراوەتەوە بە شێوەی (بابەتی دادگا+ بردن)، لە کوردیدا هەمان شیکردنەوەی هەیە. |
| di...du | کەسێک بدرێت بە دادگا<br>to sue someone ('lawsuit' + 'to effect') | dāi dā دای دا: ئەمڕۆ کەسێک کە بدرێت بە دادگا دەگووترێت (بە دادگای دا). وشە سۆمەرییەکەش شیکراوەتەوە بە شێوەی (بابەتی دادگە+ دەستپێکردن، هێنان، ڕودان). لە کوردی ئەمڕۆشدا هەر هەمان مانا دەدات. |
| di ĝar | داواکاری یاسایی، دانی کەسێک یان شوێنێک بە دادگا<br>to sue, make a legal claim | dāgar/dādgar داگەر/دادگەر: وشەی (داگەری) مانای عەدالەت دەدات. سۆمەرییەکان بە هەردوو شێوەی di, did نوسیویانە کە ئەمڕۆ لە کوردیدا دەبێتە (دا، داد). بۆ نموونە ئەمڕۆ کورد دەڵێت (هەی دا و بێ دا)، کە سکاڵاکردنە لە ناعەدالەتی. |
| di kud | دادوەر<br>judge | dākaut داکەوت: لە کوردیدا دەگووترێت 'هەق کەوتن' و مانای وشە سۆمەرییەکە دەڵێت 'ئەو کەسەی کە داد دەخات' وەک چۆن هەق دەکەوێت. |
| did, di | کەیسی دادگا، بڕیاری یاسایی، هەڵسەنگاندنی یاسایی، سزادان<br>lawsuit, case; judgment, sentence | dād, dā داد، دا: بە هەردوو شێوەکە لە کوردیدا هەیە و مانای (عەدالەت) دەدات و دەبێتە پێکهاتەی وشەی (دادوەر، دادگە، دادپەروەر). |

| didila | زۆر بچووک<br>very small | tītīla تیتیلە: مانای (بەچکە) دەدات. |
|---|---|---|
| dimdim | بینای بەرزی بەهێزکراو<br>fortified tower | dimdim دم دم: ناوی قەڵایەکی بەهێزی مێژوویی کوردستانە و مانای ناوەکە نازانرێت، شەڕی ئەو قەڵایە بووەتە داستان و چیرۆک لە ناو کوردەواریدا. ئەو قەڵایە لە ناوچە شاخاویەکانی ورمێ بووە؛ لەلایەن سەفەویەکانەوە و لەسەردەمی شا عەباسدا هێرشی کراوەتە سەر و کوردەکان بە سەرکردایەتی خانی لەپ زێڕین کە میری برادۆستیەکان بووە، بەرهەڵستیان کردووە . ئەم بەسەرهاتە لە نێوان ١٦١٠ز بۆ ١٦١١ز دا ڕووی داوە. لە کۆتایی جەنگەکەدا فارسەکان هەموو دانیشتوانی قەلاکەیان ڕەشەکوژ کردووە. هەتاوەکو ئەمڕۆ پاشماوەی قەڵاکە هەر ماوە .(Gunter, 2009, p.19) |
| dimma | ناوێکە بۆ مەڕ<br>a designation of sheep | dima دمە: دوگی مەڕە (هەژار، پ.٢٩٧). |
| dimme | شەیتان (جنۆکەی خراپە)<br>demon | deu دێو: هەمان مانا دەگەیەنێت، بەڵام لە کوردیدا (م) گۆڕاوە بە (و). ئەمەش حاڵەتێکی ناسراوە و لە زۆر وشەدا ڕوی داوە. (زاما/زاوا، کەمان/کەوان، هەتیم/ هەتیو). بەڵام ئەگەر تێبینی بکەین لە زمانی لاتینیدا بووەتە daemon و لە ئینگلیز و فەرەنسیشدا بووەتە .demon |
| dimšah | ورچ، هیپۆ<br>hippopotamus ،bear | damšā دەم شا: لە کوردیدا مانای (دەم گەورە) ی هەیە. هەروەها لە سۆمەریدا ناوی damšāh بۆ تیمساح و هیپۆ دانراوە. کە پێ دەچێت ناوەکان هەموو یەک بن (بڕوانە damšah) |
| diñir | خوا<br>god<br>(di, 'decision', + ñar, 'to deliver') | dāner دانێر: لە سۆمەریدا وشەکە شی کراوەتەوە بە مانای (بڕیار +گەیاندن). لە کوردیدا شی دەکرێتەوە بە (داد+ناردن) و لەبەر ئەوەی کە وشەی (دا/داد) هەمان وشەن لە کوردیدا. بەو جۆرە (دا نێر) ماناکەی بە کوردی دەبێتە (داد نێر) واتە ئەو کەسەی کە دادوەری دەنێرێت/بڵاودەکاتەوە. |
| dirida | فەرمان و ڕێنمایی<br>Instruction, order | dāriža داڕژە: (داڕژان) ماناکەی (لە قاڵبدان) یان (داڕشتنی پلان ) دەگرێتەوە. |
| diš | یەک<br>one | dāš داش: وا دەردەکەوێت ئەم وشەیە تەنها لە یاری دامەی کوردیدا مابێت، کاتێک کە دەگوترێت (داش بە داش) واتە (یەک بە یەک) و هەموو دانەیەک لە پولەکانی یاریکردن پێی دەگوترێت (داش). |
| du | لێدان (ئامێری مۆسیقا)<br>To play (a musical instrument) | dā دا: هەمان مانای هەیە (شماشاڵمان بۆ لێ دە، عودی چاک لێ دە دا). لە زمانی هوری id مانای (لێدان، پێداکێشان) دەدات کە هەردووکیان |

| | | |
|---|---|---|
| | | یەکدەگرنەوە لەگەڵ ( ئەدا، دا) ی کوردیدا. لە زمانی لوڤیدا hata مانای (تێکشکاندن) دەدات. وشەی (لێدان، پێداکێشان) لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە hit کە ماناکەی نزیکە. |
| du | هاتن (کردار)<br>to come | de دێ: هەمان مانا دەدات. |
| dud | جەنگ، دژایەتیکردن، نەگونجان، رێک نەکەوتن<br>combat, strife, discord, quarrel | diž دژ: وشەکە مانای (بەرامبەر وەستان، پێچەوانە بوون) ی هەیە و دەبێتە پێکهاتەی (دژایەتیکردن، دژوەستان، دژمن). |
| dud ĝar | شەڕ دەستپێکردن (شەڕ گێڕان)<br>start a fight | diž ger دژ گێڕ: لە زمانی کوردیدا ووشەی (شەڕ گێڕ) رەگی وشەی (شەڕگێڕان)ە و دەشێت (دژگێڕان) هەر هەمان مانای هەبێت. |
| dul | نزمبوون، قوڵبوون<br>to lower, to be deep | dahel داهێڵ: هەروەها لە کوردیدا (داهێڵ) دەبێتە رەگی داهێڵانن کە مانای (هێنانە خوارەوە) دەدات و هەمان مانای وشە سۆمەریەکەی هەیە. |
| dul | پەنا، شەقکراو<br>sanctuary, cleft | dol دۆڵ: ئەم وشەیە لە کوردیدا پێکهاتووە لە بۆشایی نێوان دوو بەرزایی، لە ئینگلیزیدا بە (دۆڵ) ی کوردی دەگووترێت dale بە فەرەنسیش بە دۆڵی پچوکی نێونی دوو گرد دەوترێت val. |
| dumdam | دەنگە دەنگکردن<br>to make noise | damadam دەمەدەم: هەمان مانا دەدات. |
| dumdam ak | دەنگە دەنگکردن<br>To make noise | damadam akā دەمەدەم ئەکا: وەک خۆی ماوە و بە هەمان مانا. |
| dur | بەیەکەوە بەستراو، گرێ، بەندبوون، بەستن<br>binding, knot, bond, tie | dur دور: لە مانای (دورین، جل دورین)ی کوردی نزیکە. |
| dur | تڕ<br>fart | tir تڕ: لە کوردیدا نزیکە و لە سانسکریتدا دەبێتە durvAta. |
| dur | تەختەی دار<br>wooden board | dār دار: لە کوردیدا مانای تەختە و درەختیش دەگرێتەوە. لە زمانی هیتی و لوڤیدا دەبێتە taru و بە زمانی ئاڤێستا پێی دەگووترێت dru. ئەم وشەیە لە زمانە هیندۆئەوروپیەکانی تردا بە شێوەی جیاواز دەرکەوتووە. ئینگلیزی tree، سلۆڤینی drevo، کرواتی drvo، دانیمارکی træ. |
| dur | پارچە دار<br>baulk/balk | dār دار: ئەوەی کە مایەی سەرنجە، لە کوردیدا هەموو مانا کۆنەکانی ماوە (تەختە، درەخت، پارچە داری دەست) (بۆ روونکردنەوەی زیاتر بڕوانە وشەی رابردوو). |

| | | |
|---|---|---|
| duri | بۆ هەتایی<br>forever | durī دوری: (دور) لە کوردیدا بە مانای (ماوەی زۆر لە نێواندا بۆ کات و درێژی) دێت. دەمێنرێت وشەکانی (هەتایی، دوری) لە رووی ماناوە نزیکن. لە زمانی ئاڤێستادا dûra مانای (دوورە) دەدات لە کوردیدا. |
| durmina | بەردی ڕەنگاو ڕەنگ<br>mottled stone | durmīnā دور مینا: ئەم وشەیە لە کوردیدا پێک هاتووە لە [dur] خشڵ +[مینا] شوشە. |
| duru | تەڕ<br>wet | tar تەڕ: هەمان مانا دەدات. |
| dumu | منداڵ<br>child | تۆم tom: لە زمانی کوردیدا ئەم وشەیە بە مانای (تۆو، توخم) دێت. کە هەمان پرەنسیپی (منداڵ) ی تێدایە. بۆ نموونە کە کەسێک لە کەسێک توڕە دەبێت دەڵێت (تۆم/توخمی سەگ) واتە لە تۆوی سەگ. وشەی توخم لە زمانی میدیا وەک کوردی بە مانای (وەچە، ڕەچەڵەک) بەکارهاتووە و بە taxm/taxma نوسراوە (Tavernier, 2007, P.14) |
| dumu-gal | گەورەترین کوڕ یان کچی خێزان<br>eldest son or daughter ('child' + 'large') | tom-kal تۆم- کەڵ: وشەی (تۆم) لە سەرەوە باسکراوە. gal مانای (کەڵ) دەدات. لە کوردیدا هەندێک لە ماناکانی دەبێتە (گەورە، نایاب). بۆیە (تۆم کەڵ) لە کوردیدا مانای (وەچەی گەورە/چاک) دەدات. |
| dumu-mí | کچ<br>daughter ('child' + 'feminine') | tom-me تۆم مێ: وشەی (تۆم) لە سەرەوە باسکراوە. (مێ) لە کوردیدا ئاماژەیە بۆ توخمی مێینە. بەو جۆرە ماناکەی بە کوردی دەبێتە (تۆم/توخمی مێیینە) و هەر هاوشێوەی شیکردنەوەی وشە سۆمەریەکەیە کە بریتیە لە (منداڵ+ئافرەتانە). |
| dun | ڕاتەکاندن، لەرانەوە<br>to roam around; to rock | dina دنە: هەندێک لە ماناکانی ئەو وشەیە دەبێتە (هەڵخراندن، جوڵاندن) (هەژار، پ.٢٩٨) کە هەمان مانایە. |
| dus | حەمام<br>bathroom | tās تاس: ئەو جورنەیەی کە لە حەمامدا ئاوی تێ دەکرێت پێی دەگوترێت (تاس). لە ئیتالیدا doccia ولە فەرەنسیشدا douche هەیە کە بریتیە لە ئاوڕشتن بە خۆدا بە مەبەستی خۆ شتن. |
| dusa | هاوڕێ، هاوەڵ<br>friend, companion | dost/dos دۆس/دۆست: هەمان مانای ماوە و لە هەندێک ناوچەی کوردستاندا بە (دۆس) دەگوترێت و بە زمانی میدی دەبێتە zušta. |
| e | وشەیەکی دەربڕینی دەنگیە<br>a vocative interjection | e ئێ: لە هەندێک ناوچەی وەک دەوروبەری پێنجوێن دەڵێن (ئێ لاچۆ) وەک ڕەتکردنەوەی شتێک. |
| e | سەیری<br>watch | aī ئەی: لە کوردیدا پێش سەیرکردنی شتێک دەگووترێت (ئەی)، بۆ نموونە بە بینینی فڕۆکەیەک دەڵێن (ئەی لەو فڕۆکەیە) کە ماناکەی (سەیری ئەو فڕۆکەیە) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| e'addak | ماڵ و موڵکێک کە لە باوک و باپیرەوە ماینێتەوە<br>patrimony | hī īadak هی یەدەک: مانای (شتی زیادە بۆ کاتی پێویست) دەدات. |
| [64]e'ara | ئاش<br>mill | hī hārī هی هاڕی: وشەکە دەڵێت (هی هاڕین) کە ئاش دەگرێتەوە. |
| eburgul | شوێنی بەرد بڕین<br>stone-cutters workshop | hī bardkol هی بەردکۆڵ: واتە (بۆ کۆڵینی بەرد). |
| e'EŠ | بەندیخانە<br>prison | hī eš هی ئێش: ماناکەی وەک سروشتی شوێنەکەیەتی و مانای (هی ئێش) دەبەخشێت. لە زمانی فەرەنسیدا بە بەندیخانە دەگووترێت penitencier، واتا (جێگای ئێش کێشان). هەرچەندە وشەکان لە ڕووی پیتسازیەوە پەیوەندیان نیە، بەڵام دەبینرێت لە زمانەکانی تریشدا مانای ئێش لەگەڵ ناوی بەندیخانەدا بەکاردەهێرێت. |
| éd | هاتنە دەرەوە، پەیدابوون؛ دەرکەوتن؛ پەیدابوون وەک شایەت<br>to go out, emerge; to be or become visible; to appear as a witness | īet یێت: هەمان مانا دەدات. |
| eden | تەختایی، شوێنێک کە دارو شتی لێ لابرابێت، ناوچەیەکی کراوە<br>Plain, steppe, open country | āuadān ئاوەدان: لە کوردیدا مانای (ناوچەیەک کە دەستی مرۆڤی پێ گەیشتبێت) دەدات. لە زمانی هیتیدا udne مانای (زەوی، خاک) دەدات. |
| egal | کۆشک، پەرستگا<br>temple, palace | hī kal هی کەڵ: واتە (هی پایەبەرزان) |
| egir | نانەواخانە<br>bakery | hī gir هی گڕ: مانای (هی ئاگر) دەگرێتەوە. gir لە سۆمەریدا خوای ئاگر بووە. |
| egud | شوێنی دانانی مەڕوماڵات<br>Ox-barn | hī gā هی گا: لە سۆمەریدا هەردوو وشەکانی gu/gud هەر هەمان مانای (گا) دەدەن لە کوردیدا. |

[64]. پیتی é کە وشەیە، لە زمانی سۆمەریدا بە مانای (خانوو، پەرستگە، پارچە زەویەک) تەرجومە کراوە بەڵام لە کوردیدا یەکێک لە ماناکانی وشەی(هی hi) دەبێتە (خاوندارێتی)، بۆ نموونە (هی تۆیە، هی ئەوە). لە سۆمەریدا وشەی e'ara ماناکەی دەبێتە ئاش لە کوردیدا (هی هاڕە/هاڕین) دەبێتە (ئەوەی کە هی هارینە) . لەگەڵ وشە سۆمەریەکەدا هەمان مانا دەدەن سەرەڕای ئەوەی کە لە زمانی کوردیدا وشەی é ی سۆمەری مانا سۆمەریەکانی نەماوە. ئەم حاڵەتە لە وشەی é-mí دا دەردەکەوێت کە لە سۆمەریدا ماناکەی دەبێتە (خانووی مێ) لە کوردیدا مانەی (هی مێ) دەبێتە ئەوەی کە هی مێینەیە.

| | | |
|---|---|---|
| Egudgaz | شوێنی سەربڕینی ئاژەڵ<br>Abattoir | hī gāgāz هی گاگاز: واتە (هی گازگرتنی گا). سۆمەریەکان gu/gud بە مانای (گا) ی کوردی بەکاردەهێنن. ئەمڕۆ لە کوردیدا (گاز) تەنها مانای (گازگرتنی ماوە) و ئەو سەردەمە مانای بڕینیشی هەبووە. |
| eĝir | پشت، دواوە، دوای<br>back, rear; after | axīr ئەخیر: (ئەخیر) لە کوردیدا مانای (دواین، پشتەوە) ی هەیە. |
| ekaskalak | شوێنی بچووکی دروستکراوی لا ڕێ<br>waystation | hī kaškalak هی کەشکەڵەک: لە سێ بەش پێهاتووە (هی) و (کەش) کە مانای شاخ و بەرزی دەگرێتەوە لە کوردیدا. (کەڵەك) لە سۆمەریدا هەمان مانای (کەڵەک) ی کوردی دەدات، کە مانای شت خستنە سەر یەک و کەڵەکەکردنی هەیە. بە هەمووی مانای شوێنی کەڵەکەکردنی بەرز دەگرێتەوە. ئەو ناوە لە ئاسکی کەڵەک (āskikalak) دا بەدی دەکرێت کە ناوی شارۆچکەیەکی کوردستانە، دەکەوێتە خۆراوای هەولێر . |
| ekur | ڕێکخراوێکە<br>an institution | hī kor هی کۆڕ: هەمان مانای هەیە لە کوردیدا، واتە (هی کۆبوونەوەی خەڵک). |
| Ekurun | ژووری هەڵگرتنی خواردنەوە (ئەلکهول)<br>Liquor-room | hī xuārinaua هی خوارنەوە: واتە (تایبەت بە خواردنەوە). |
| elel | گۆرانی<br>song | elele ئێلێلێ: ئەمە هەتاوەکو ئەمڕۆ بەشێکە لە سەرەتای گۆرانی کوردی فۆلکلۆر و هەندێک جار هاتۆتە ناو گۆرانی نوێشەوە. |
| elil | گۆرانیەکە<br>a song | ئەمڕۆ زۆر لەم گۆرانیانە لە کوردیدا ماون و بەشێوەی (هەی لۆلۆ، هەی لێ لێ، لێ لێ لێ). |
| elilla | گۆرانی سەر کار<br>a work song | (بڕوانە وشەی ڕابردوو) |
| elilum | گۆرانی<br>song | (بڕوانە وشەی ڕابردوو) |
| Emeĝar | جادو (سیحر)<br>magic | hemāgar هێماگەر: (هێما) لە کوردیدا مانای سیمبوڵ و نیشارەتی هەیە. (گەر) پاشگرێکە بۆ پیشە و مومارەسەکردن. بۆ نموونە (زێڕینگەر) مانای ئەوکەسەیە کە لەگەڵ زێر کار دەکات، بەوجۆرە وشەکە مانای کارکردن لەگەڵ هێما و شتە نادیارەکان دەدات. |
| emeĝir<br>(eme-gir) | زمانی سۆمەری<br>the Sumerian language<br>('tongue' + 'native') | hemāagira هێمائەگرە: ئەم وشەیە لە فەرهەنگی سۆمەریدا بە شێوەی (زمان+خەڵکی ناوچەکە) لێکدراوەتەوە و (ئێمێ eme) کە مانای (زمانی قسەکردن) دەگرێتەوە و ( گر gir) مانای (خەڵکی ناوچەکە) دەدات. پێشتر (هێما) لە کوردیدا باسکراوە و وشەی (ئەگرە) لە کوردیدا مانای (ئێرە) دەدات و |

| سۆمەری | مانا | ڕوونکردنەوە |
|---|---|---|
| | | ئەگەر (هێمانەگرە) بێت، ئەوا لە کوردیدا مانای (هێمای ئێرە) دەدات و گونجاوە لەگەڵ ئەو مانایەدا. |
| é-mí | ماڵی ئافرەتان<br>woman's house | hī me هی مێ: مانای (شوێنی مێینە، شتی مێینە) دەدات. |
| émeš | هاوین<br>summer | hāma هامە: لە کوردیدا (هامە) وشەیەکی ترە بە مانای هاوین. |
| enamarad | بەندیخانە<br>prison | hī nāmrād هی نامراد: وشەی namarad (نامراد) بە تەنها لە سۆمەریدا مانای کۆیلەش دەدات. بەو جۆرە ناوەکە دەبێتە (شوێنی نامرادان). |
| er | گریان، تازیەباری، فرمێسک، لاڵانەوە<br>weeping, mourning; tears; to weep | air ئەر: لە ناوچەکانی کوردستاندا هەندێک جار لەبری (ئەگری) وشەی (ئەری) بەکاردەهێنن. هەروەها لە کاتی کەس لێ ڕۆیشتندا خەڵک وشەی (ڕۆ) هاوار دەکات و بەشێوەی (باوکە ڕۆ، دایکە ڕۆ،...) ئەو وشەیە بەکاردەهێنن. |
| er gul | کۆنترۆڵکردنی گریان<br>to restrain crying | airī kul/girīaī kul ئەری کوڵ/گریەی کوڵ: لە کوردیدا مانای (گریانی بەجۆش) دەدات. |
| ere | بڕۆ<br>go | hara هەرە: هەرە مانای (بڕۆ) دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی ئاوێستاشدا بەشێوەی ar دەردەکەوێت. |
| eribura | ڕیقنەی باڵندە<br>bird droppings | arī bar ئەری بار: [ئەری] پیسی دەکات +[buru] باڵندە (بروانە buru). |
| eridu | ڕێنمایی<br>guidance | aruā du ئەروا دو: واتە (بەدویدا دەڕوات). |
| esi | بەهێز<br>strong | āzā ئازا: مانای (بەهێز) دەدات و ماناکەی نەگۆڕاوە. ئەم وشەیە بە زمانی هوری دەبێتە ada کە مانای (بوێر) دەدات و لە زمانی ئاڤێستادا aêshô هەمان وشە سۆمەریەکەی هەیە. یەکێک لە پاشای مانیەکان ناوی aza بووە (بروانە مانیەکان). |
| eš | سێ<br>three | se سێ: پیتی (ش) لە سۆمەریدا زۆربەی جار لە کوردیدا دەبێتە (س) و بە سۆمەری بە ژمارە سی (٣٠) دەڵێن ušu. |
| eš | سەرمابوون<br>to be cold | eš ئێش: مانای (ئازار) دەگەیەنێت. |
| eš | ئارد<br>flour | āš ئاش: دەشێت ناوی (ئاش) ی کوردی لە (ئارد) ی سۆمەریەوە هاتبێت. |
| eš | گوریس<br>rope | uš وش: ناوێکی تری کوردیە بۆ (گوریس). |
| ešbar | بڕیار<br>decision | īšbir ئیش بڕ: مانای (ئیش بڕانەوە، بڕیاردان لە ئیش) دەدات. وشەی ئیش لە کوردیدا مانای (کار، کێشە و مەسەلە) ی هەیە. |
| ešgar | ئەرکی کار<br>work assignment | īšukār ئیشوکار: هەمان مانای هەیە. |
| ešgiri | ستافی کار | īškar ئیشکەر: هەمان مانای هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| | staff | |
| eškiri | ئەو گوریسەی بۆ بەستنەوەی ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت<br>tether | ušgīrī وشگیری: ماناکەی دەبێتە (ئەو (وش/گوریس) ەی کە شتێکی پێ دەبەسترێتەوە). |
| eššu | گوڵە جۆ (هێشووی جۆ) یان دانەوێڵەی تر<br>ear of barely or other grain | hešū هێشوو: لە کوردیدا مانای (هێشوی ترێ، گوڵی دەغڵ) دەدات (هەژار، پ.١٠١٨) کە هەمان مانایە. |
| e'uzga | بینایەکە<br>a building | hī uezga هی ویزگە: (شوێنی وەستان) دەگرێتەوە و تێبینی دەکرێت پاشگری (گە) کە بۆ ئاماژەکردنە بە (شوێن) لە کوردیدا، لە سۆمەریشدا بەدی دەکرێت. |
| ezen | جەژن<br>festival, feast | jažin جەژن: هەمان مانا دەدات. لە زمانی لاتیندا cecini, cani, cano مانای (ئاهەنگ گێڕان، گۆرانی) دەدەن. بە کرواتی بە (جەژن) دەڵێن .svečan |
| ezen.har | ئاشەوان<br>miller | harzin hār هەرزن هار: ئەو کەسەی کە هەرزن دەهاڕێت. لەبەر ئەوەی کە لە سۆمەریدا بە (هەرزن) دەڵێن arzig. وا دەردەکەوێت بە هەردوو شێوەکە نووسیبێتیان. |
| ezurah | ژوور<br>room | žūr ژوور: هەمان مانا دەدات. |
| gap | چەپ<br>left | cap چەپ: بە زمانی هوری بە (لای چەپ) دەڵێن šaphali کە لە کوریدا (چەپ ئالی) مانای (لای چەپ) دەدات (بڕوانە وشەی šaphali ی هوری). بە هیتیش وەک هوریە. |
| gaba | سنگ<br>chest | qaba قەبە: لە کوردیدا بە کەسێکی لەش گەورە دەگوترێت (قەبە) . |
| gabaĝal | پاسەوانی پێشەوەی عەرەبانەی شەڕ<br>front guard of a chariot | qabakal قەبەکەڵ: لە کوردیدا وشەی (قەبە) بە مانای (گەورەیی و ئەستوری) و (کەڵ) بە مانای (بەتوانا و پێشڕەو) دێت. بە هەردووکی بە زمانی ئەمڕۆ دەبێتە (کەڵە قەبە) بە وێنەی وشەکانی (کەڵە ژن، کەڵە پیاو). |
| gabal | شەڕێکە<br>a fight | qapāl, gopāl قەپاڵ، گۆپاڵ: (قەپاڵ) مانای (گازگرتن) و (گۆپاڵ) مانای (داردەستی سەر چەماوە) دەدات (هەژار، پ.٧٠٢). |
| gabar | شوان<br>herder | gābar, gābār گابار، گابەر: (گابار) کاروانێکە کە چێڵ و گایان بردووە (هەژار، پ.٦٨١). هەروەها کە کە کەسێک دەگوترێت (ئەو گایە بەرە بۆ لەوەڕ)، کەسە ئەگەر ناوی لێ بنرێت، دەبێتە (گابەر). |
| gabartur | شوانێکە<br>a herder | gābardūr گابەردوور: ئەو کەسەی کە گا بۆ شوێنی دوور دەبات. |
| gabgaz | پیاوکوژ | qapgāz قەپ گاز: هەردوو وشەکە بۆ گازگرتنن. |

| | | |
|---|---|---|
| | murderer | (قەپ) بۆ گازی گەورەی پڕ بەدەمە. |
| gabus | شوان<br>shepherd | gāues گاوێس: ئەو کەسەی کە گا دەوەستێنێت و ڕادەگرێت. |
| gada | ڕووەکێکە کە قوماشی لێ دروست دەکرێت؛ خام (کەتان)<br>flax; linen | katān کەتان: گیایەکە پرزەکەی دەکرێتە دەزوو و قوماش (هەژار، پ.٦٤٩). |
| gadala | کوتاڵ (قوماش)<br>fabric | kutāl کوتاڵ: هەمان مانا دەدات. |
| gada | پیاوی ئاینی<br>Priest | gadā گەدا: واتە پیاوێکی گەڕۆک و دەروێش. لە کوردیدا دەرویش ڕۆڵێکی ئاینی هەیە. ئەم وشەیە چووەتە زمانی ئینگلیزیەوە و بە (gad) دەنووسرێت و فەرمانە. ماناکەی گەڕانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک بە دوای خۆشیدا؛ لە ئینگلیزی کۆندا مانای قەلەندەری (vagabond) ی هەبووە. |
| ĝae | من<br>I | xo خۆ: ئاماژەکردنە بە کەسێک خۆی. بۆ نموونە دەگووترێت (خۆبردنە پێش). ئەم وشەیە لە زمانی لاتینیدا دەبێتە ego. |
| gal | گەڵ (ناوگەڵ)<br>groin | gal گەڵ: ناوچەی ئەندامی زاوزێ و نێوان دوو ڕانە و هەمان مانای وشە سۆمەریەکەیە. |
| gal | گەورە (گەورەبوون)، مەزن؛ ئاژەڵی نێری پێ گەیو<br>(to be) big, great; (to be) mature (of male animals) | kal کەڵ: ئەم وشەیە لە زمانی هوریدا بە شێوەی kil دەنووسرێت و هەمان ماناکانی کوردی و سۆمەری هەیە. بۆ نموونە (کەڵە پیاو، کەڵ ژن) مانای (مەزن، نایاب، بەتوانا) دەدات بە کەسەکان. هەروەها وشەکە بۆ نێرەی ئاژەڵ بەکاردەهێنرێت. لە زمانی سۆمەریدا پێکهاتەی وشە لێکدراوەکانە و بۆ ئەو کەسانە بەکاردەهێنرێت کە لە پلەی کاردا مەزنن و هەمان مانای کوردی هەیە. |
| gala | ئەندامی زاوزێی ئافرەت<br>female genitals | gal گەڵ: ناوگەڵی پیاو و ژنە. |
| galam | شارەزا، زیرەک<br>skilful, clever | qalam قەڵەم: لە کوردیدا بە مانای (قەڵەمی نووسین) دێت. لە وشەی پەیوەست بەمانای خوێنەواری و زانایی دێت و دەگووترێ (قەڵەم بەدەست). |
| ĝálda | بوون لەگەڵ کەسێک<br>to be with someone | galdā گەڵدا: هەمان مانای هەیە. |
| gal ur/hur | گەڵ خوران<br>to scratch the groin | gal ur/xur گەڵ ور/خور: وشەکان هەموویان وەک خۆیان ماون. وشەی ur/hur ی سۆمەری مانای (ور/خور) دەدات لە کوردیدا. gal مانای (گەڵ/ناوگەڵ) ی کوردی دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| gal-zu | زانا، زیرەک<br>wise, intelligent<br>('large' + 'to know') | کەڵ زا/زان kal-zā/zān: وشە سۆمەریەکە لە رووی ماناوە شیکراوەتەوە بە (گەورە+ زانین). لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (مەزن+ زانین). واتە دەبێتە (کەڵ زانا). لە کوردیدا دەتوانرێت بە (کەڵزا) ش بنووسرێت (بڕوانە وشەی zu ی سۆمەری). |
| gam | قوڵایی<br>depth | گۆم gom: مانای (شوێنی قوڵایی چەم و ڕووبار) دەدات. |
| gam | داری چەماوە، دەسکی چەقۆ یان شمشێر<br>bent stick; haft | کەمە kama: لە کوردیدا بەکار دەهێنرێت بۆ هەر دارێک کە چەمابێتەوە بۆ دروستکردنی بێژنگ، گۆچان و ماناکەی وەک خۆی ماوە. |
| gan | کێڵگە<br>field | کەن kan: مانای (زەوی کێڵراو، ئاودڕ) ی هەیە (هەژار، پ.٦٩٩). |
| gar | ڕابردوو<br>former | جاران jārān |
| gar | پاڵەوانی<br>(to be) heroic | گوڕ gur: مانای (بە توانایی و بەهێزی) دەدات. |
| ĝar | دان لەبری شتێکی تر، گۆڕینەوە<br>to give in place of something, replace | گۆڕ gor: ڕەگە بۆ وشەی (گۆڕین یان گۆڕینەوە) . ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە gear کە هەندێک لە ماناکانی دەبێتە (هەموارکردن بۆ مەبەستێکی تایبەت، گۆڕین). |
| gara | کەرە (کریم)، شیری خەست<br>thick milk, cream | کەرە kara: لە کوردیدا ئەو چەوریەی کە دەکەوێتە سەر شیر، پێی دەڵێن (کەرە). لە ئینگلیزیدا بووەتە creame، فەرەنسی crème و بە سویدی grädde. |
| garašsaĝ | تەرە پیاز<br>leek | کەرموس qaraus: کەرەوز. [پێ دەچێت کە لە بنەچەدا وشە سۆمەریەکە بە هەڵە تەرجومە کرابێت]. |
| gardu | سەرباز<br>soldier | گورد gurd: مانای (چاپوک و بەکار، پاڵەوان) دەدات بەڵام (گۆرد) مانای (شمشێر) ی هەیە (هەژار، پ.٧٠٥). ئەم وشەیە لە زمانی هوریدا دەبێتە xuradi. لە ئینگلیزیدا guard و لە فەرەنسیدا garde بەمانای (پاسەوان) دێن. |
| gargar | جۆرێکە لە نان یان ئیشی هەویر<br>a bread or pastry | گاڵگاڵی gālgālī: نانێکی خەپلەیی بچووکە لە کوردەواریدا دەکرێت. |
| gaz | کوشتن، سەربڕین<br>to kill, slaughter | گاز gāz: مانای (گازگرتن) دەدات. |
| ge | ڕاخەرێکی قامیش<br>reed mat | گە ga: مانای بەندی قامیش دەدات (هەژار، پ.٧٣٨). کە ماناکەی نەگۆڕاوە و لە زمانی سۆمەریشدا هەمان مانای هەیە. |
| genna | بچووکی<br>to be small | گونە guna: مانای (کورتە باڵای خڕکەڵە) دەدات. |
| ĝešĝiri | ئەو زنجیرانەی کە دەکرێنە قاچی بەندکراوەکان (بە کۆ | گشگیری gišĝīrī: (گرتنی بەکۆمەڵ) دەگرێتەوە. وشەکە پێکهاتووە لە (گیری) کە مانای گرتن و |

| | | |
|---|---|---|
| | باسکراوە<br>fetters | بەندکردنە و (گش) مانای (هەموو، گشت) دەدات. ئەمڕۆ ئەم وشەیە وەک خۆی لە کوردیدا بەکاردەهێنرێت و مانای (گرتنی بەکۆمەڵ) دەدات. |
| ĝeš la | گوێگرتن<br>to listen | guš le/gue le گوێ لێ/گوش لێ: لە کوردیدا دەگووترێت (گوێی لێیە، گوشی لێیە). |
| ĝešla | جەنگ<br>battle | giš lā گش لا: وشە سۆمەریەکە وشەیەکە بە دووبەش نووسراوە بەشێوەی ĝeš-la. لە کوردیدا (گش) ڕەگە بۆ (بەگژدا چوون) و (لا) مانای (لایەنەکان) ی هەیە. بەهەمووی دەبێتە (شەڕکردنی لایەنەکان) کە پرەنسیپی جەنگە. |
| ĝeli | قوڕگ، بۆری هەوا<br>windpipe, throat | galu, galī گەلو، گەلی: (گەلو) لە کوردیدا هەمان مانای (قوڕگ) دەدات. هەروەها لە کوردیدا وشەی (گەلی) مانای (چۆڕاوگەی ئاو، جۆگەی گەورەی ئاودڕ) دەدات. بۆ نموونە (گەلی عەلی بەگ) کە ئاوێکە و لە نزیک هەولێر لە چیایەکی بەرزەوە دێتە خوارێ. ئەم وشەیە لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا دەردەکەوێت. (قوڕگ، گەلی) بە زمانی ئیتاڵی دەبێتە gola، بە لاتین دەبێتە gula و بە زمانی سانسکریتدا دەبێتە gala. لە ئینگلیزیدا بە (گەلی) کوردی دەگووترێت gully. |
| geštu | شەست (٦٠)<br>sixty | šest شێست |
| ĝešnu | ڕۆشنایی<br>light | gašāno گەشانۆ: مانای (ڕووناکبوونەوە، بلێسەدارکردنی ئاگر) دەدات. |
| ĝeštin | شەراب<br>wine | geštin گێشتن: لە کوردیدا ئەم وشەیە بەکاردەهێنرێت بۆ (گەشتن/پێگەیشتنی شەراب). |
| ĝeštug | تێگەیشتو؛ ماریفەت، تێگەیشتن<br>(to be) wise; wisdom, understanding | gaīštu گەیشتو: ئەمە بەشێکە لە وشەی (تێگەیشتوو) کە هەمان مانای هەیە. |
| ĝeštug la | کەڕ<br>deaf | guecka lā/guš lā : (لا) مانای (بێ) ئەوەی هەیە لە کوردیدا. بۆ نموونە دەگووترێت (من لەو شتانە لام) واتە (بەدوورم) (هەژار، پ.٧٤٧). بەهەمووی مانای (بێ گوێ) ی هەیە. |
| ĝeštuglala | گوارەکان<br>earrings | gue lālā/ guš lālā : (لالا) هەتاوەکو ئەمڕۆ لە کوردیدا مانای (لایەکانی) هەیە و ئەم دووبارە کردنەوەیە لە زمانی کوردیدا هاوشێوەی سۆمەری ماوە. بەو جۆرە وشەکە هەمووی دەبێتە (بە لالاکانی گوێوە). |

| Sumerian | Kurdish / English | Notes |
|---|---|---|
| ĝeštug ĝar | گوێ پێدان، گوێ گرتن<br>to pay attention, to listen | گوش گر، گوێ گر guš gir/ gue gir |
| gi | ڕوەکی قامیش<br>reed | ga گە: مانای بەندی قامیش دەدات (هەژار، پ.٧٣٨) کە ماناکەی نەگۆڕاوە و لە زمانی إلوفیشدا هەمان مانای هەیە. |
| gi | کۆمەڵە دەوەن یان درەخت<br>thicket | gīā گیا: مانای هەموو ئەو سەوزە ئاساییانە دەدات کە لە زەوی دەردەچن |
| giguru | قوتدان<br>to swallow | acegaru ئەچێ گەروو: واتە (ئەچێتە گەروو). کە هەمان مانا دەدات. |
| giĝar | پەرژین<br>Fence | cīĝ چیغ: هەر هەمان مانا دەدات. |
| gibulbul (gi-bul-bul) | جۆرێکە لە قامیش<br>a type of reed | ga pal pal،گە پەل پەل: کە ئاماژەیە بە سروشتی ڕوەکی قامیش. لە کوردیدا (گە) مانای بەندی قامیش دەدات (هەژار، پ.٧٣٨) بەشەکەی تری هێندە نەگۆڕاوە. بەو جۆرە وشە لێکدراوە کوردیەکەش مانای (قامیشی پەل پل) دەدات. |
| gir | تورەیی<br>anger | gir گر: لە کوردیدا دەڵێن (گری گرتووە) یان (گری لێ دەباری) کە مانای تورەییان دەدات. |
| gir/girra | خوای ئاگر<br>God of fire | gir, gira گر، گرە: (گر) مانای (ئاگر) دەدات و (گرە) ئاماژەیە بەو هەوا گەرمەی کە لە هاویندا دێت و سوتێنەرە. پێ دەچێت لە ڕابردوودا پێیان وابووبێت کە ئەو هەوایە لەلایەن خوای ئاگرەوە بنێردرێت. لە زمانی سانسکریتدا (ئاگر) دەبێتە agira. |
| ĝir | کڵپە، ڕۆشناییەکی کتوپڕ<br>flash | gir/ girpa گرپە، گڕ: هەمان مانایان هەیە. گرپە ئەو ساتەیە کە لەپڕ ئاگرەکە بەگرمەوە گر دەگرێت. |
| gir | دیاری، مارەیی<br>dowry; gift | gir گر: ڕەگە بۆ (وەرگرتن) |
| gir | کوپەی گەورە<br>a large jar | gir, gārīa گر، گاریە: (گاریە) کوندەی گەورەی ئاوکێشە کە لەسەر بارەبەری دادەنێن (هەژار، پ.٦٨٢). وشەی (گر) لە کوردیدا ڕەگی (گرتنە)، بۆ نموونە دەوترێت (ئەو جامە دوو لیتر ئاو ئەگرێت) و لە کوردیدا (گرە) ئاماژەیە بەو کەلوپەلەی کە شت دەگرێت. بۆیە (قاپ، جام، کوپە) دەتوانرێت هەمووی بە (گرە) دابنرێن لەبەر ئەوەی کە شتیان تێدا دادەنرێت. عەرەب لە کوردی وەرگرتووە و کردوویەتە (جرة) و لەوێوە چووەتە زمانی فەرەنسی (jarre ) و ئینگلیزی (jar). ئەوەی کە جێگای سەرنجە ڕەگی وشەکە لە کوردیدا ماناکەی ماوە. |
| gir | فڕن، تەنور<br>oven | gir گر: مانای ئاگرە و یەکدەگرێتەوە لەگەڵ سروشتی تەنوردا . بە زمانی هوری بە سوتاندن دەگوترێت ahari و بەو شتانەی کە بۆ بۆنەکەیان دەسووتێنرێن |

| Sumerian | واتا / meaning | ڕوونکردنەوە |
|---|---|---|
| | | دەگووترێت agri. بە زمانی هیتی بە ئاگر دەگووترێت pahhur. لە کوردیدا وشەکانی (ئاور، ئاگر، ئاهر، ئایەر، ئاتەر) هەمان مانای ئاگریان هەیە (هەژار، پ.٩). وشەی ئاگر لە ئینگلیزیدا بووەتە fire و لە هۆڵەندیدا vuur و وشەی (سوتاندن) لە ئیسپانیدا دەبێتە ardor کە هاوبەشییان لەگەڵ سۆمەری و هوری و کوردیدا هەیە. |
| ĝir | خەڵکی ناوچەکە<br>native | agira, gīr ئەگرە، گیر: (ئەگرە) لە کوردیدا مانای ئێرەی هەیە. (گیر بووە لە شوێنێک) یان (گیربووی شوێنێک) واتە نیشتەجێی شوێنەکەیە. |
| gira | داپۆشین، شاردنەوە<br>concealment | gīrā گیرا: لە کوردیدا یەکێک لە ماناکانی ئاماژەیە بە (مانگ گیران، ڕۆژ گیران) کە هەمان مانای وشە سۆمەریەکەیە. |
| giranum | هاوارکردن<br>wailing | qīrān قیران: لە کوردیدا کەم گۆڕاوە و لە فەرەنسیدا دەبێتە cri و ئینگلیزی cry بە واتای (هاوار کردن). |
| ĝirgul | ناوێکە بۆ خوری<br>a qualification of wool | girola گرۆلە: تۆپی خوریە . |
| giri | گریان<br>cry | girī / girīa گریە/گری: ئەم وشەیە چووەتە ناو زمانی فەرەنسی بەشێوەی cri، ئینگلیزی cry، دانیمارکی græde و سویدی gråta. هەروەها وشەی grief بە مانای (تازیەباری) دێت لە زمانی ئینگلیزیدا. |
| giri | جۆرێکە لە کورسی<br>a seat | gīra گیرە: کورسی قورئان لەسەر دانانە (هەژار، پ.٧٤٢). |
| ĝiri, ĝir | تاڵانی؛ گیراو<br>booty; captive | gir / gīrāu گر، گیراو: (گر) ڕەگی گرتنە و (گیراو) ئەو شتانە دەگرێتەوە کە گیراون (چنگ کەوتوون). |
| ĝirila | قەساب<br>butcher | giru گرو: دەبێتە ڕەگی (گرون) کە مانای (جیاکردنەوەی پێست لە لەش) دەدات. |
| giri'ilu | شیوەنکردن<br>a lament | girīauhalā گریەو هەڵا: شیوەنکردن دەگرێتەوە. بە زمانی هوری alilan مانای (شیوەنکردن) دەدات کە دیسان هەر کوردیە. وشە سۆمەریەکە لە دووبەش پێک دێت (گریە+هەڵا) لەبەر ئەوەی کە هەردوو وشەکە لە سۆمەریدا بە تەنها مانایان هەیە. ئەگەر ئەو دوو وشەیە لە تەنیشت یەکەوە بە ئینگلیزی بنووسرێت دەبێتە cry wail و بە لاتینی دەبێتە quirito eiulo. دەبینرێت لە هەر چوار زمانەکەدا وەک خۆی ماوە. |
| girmah (gir-mah ) | تەنور<br>kiln | garma گەرمە: وشە سۆمەریەکە پێکهاتووە لە gir-mah کە مانای (گەورە- ئاگر) دەدات و لەگەڵ سروشتی تەنوردا دەگونجێت. لە زمانی سراسیدا وشەی germas بە مانای (گەرم) ی کوردی دێت. |
| ĝiš | درەخت؛ دارستان؛ وەسفێکە بۆ گیانەوەر | giž گژ: وشەیەکی گشتیە بۆ ئاماژە کردن بە ڕووەک (گژ و گیا). هەروەها کۆمەڵێک مانای تری هەیە، |

| | | |
|---|---|---|
| | tree; wood; a description of animals | لەوانە (قەدی دار، تورەبوون، ڕاستبوونەوەی مووی لەش، دنەدانی جوانەگا بۆ سەر چێڵ) (هەژار، پ.٦٩٥). |
| giršesa | جۆرێکە لە تەنور بۆ برژاندنی جۆ<br>an oven for roasting barley | gir گر: دیسان دەردەکەوێت کە وشەی (گر) بناغەی هەموو ئەو وشە سۆمەریانەن کە پەیوەندیان بە ئاگرەوە هەیە. |
| gizulumma | گەزنە<br>nettle | gazina گەزنە: کەم گۆڕاوە. |
| ĝizzal | زانین؛ تێگەیشتن؛ گوێ؛ گوێ لێبوون<br>wisdom; understanding; ear; hearing | guezil, guezāl گوێ زل، گوێ زاڵ: (گوێ زل) مانای (گوێ گەورە) دەدات و (گوێ زاڵ) مانای (گوێ بەهێز) دەدات. |
| gu, kú | خواردن (کردار)<br>to eat | ju, xo خۆ، جو: (خۆ) ڕەگی وشەی (خواردنە) و (جو) دەبێتە ڕەگی (جوین). لە ئینگلیزیدا وشەی (جو) بووەتە chew کە مانای (جوی) ی کوردی دەدا و (جوین) ی کوردی بووەتە chewing لە ئینگلیزیدا. |
| gu | هەموو، کۆی ژمارە<br>entirety, total | ko/ge کۆ/گێ: لە کوردیدا ئەو وشەیە بە هەردوو شێوەکەی هەمان مانای هەیە (هەژار، پ.٧٣٨). وەک فەرمان مانای کۆکردنەوە دەدات، هەروەها کورد وەک پاشگری ناوی لێکدراویش بەکاری دەهێنێت، بۆ نموونە (زانکۆ) کە پێک دێت لە (زان+کۆ) کە مانای شوێنی کۆبوونەوەی زانستە. بەڵام لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا وەک پێشگری co (کە بە کۆ دەخوێنرێتەوە) بەکاردەهێنرێت و مانای بەیەکەوە یان هاوبەش دەدات . لە ئینگلیزیدا چووەتە سەرەتای وشەکانی وەک **cooperate, coalition, coaxial, cohesion** کە لە هەموو ئەو وشانەدا پرەنسیپی بەیەکەوە بوون یان بە کۆمەڵی تێدا بە دی دەکرێت. هەندێک جار ئەو پێشگرە لە وشەکەدا بە جودایی دادەنرێت و هەمان ماناکانی (کۆ) ی کوردی دەدات. بۆ نموونە :-co author ,co-host, .co-morbid دەبینرێت لەو وشانەدا پێشگرەکان بە جودایی دادەنرێن و بەردەوام لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا وشەی نوێش بەهۆی پێشگری co دروست دەکرێت. لە قاموسی ئینگلیزیدا بنەچەی پێشگری کۆ، دەگەڕێنرێتەوە بۆ وشەی com ی لاتینی. بەڵام میدەکان وشەی Kome یان بەکارهێناوە بە مانای دەسەڵاتی ناوچەیی (township) (Diakonoff, 1985, p.89) ئەم وشەیە لە کوردیدا ماوە بە شێوەی (کۆما koma) و مانای (کۆمەڵ، گروپ) دەدات. هەروەها ئەمڕۆ لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کوردیدا بووەتە بەشێك لە وشەکانی (کۆمەڵ، کۆمار) . بەو جۆرە دەردەکەوێت کە پێشگری co ی ئینگلزی بنەڕەتەکەی سۆمەری و کوردیە و com یش بنەچەکەی هەر کوردی/میدیە . گەرچی ئەمڕۆ لە ئەوروپادا دەیگەڕێننەوە بۆ لاتینی، بەڵام دەبینرێت کە ڕیشەی ئەو وشەیە زۆر لە زمانی لاتینی کۆنترە. |
| gu | دەنگی مرۆڤ، دەنگە دەنگ<br>voice, noise | go گۆ: وشەی (گو) بە تەنها مانای (قسەکردن) دەدات. بەشێکە لە وشەی (گفت و گۆ، دەنگۆ، ڕاستگۆ). لە زمانی یۆنانی و لاتیندا دەبێتە echo کە یەکێک لە ماناکانیان دەبێتە (دەنگ). |
| gu | قەراخ، گوێ چەم<br>bank, edge | gue گوێ: بۆ نموونە (گوێ ڕووبار، گوێ ئاگردان) هەمان مانا دەدات. |
| gu, gud | گا<br>ox | gā گا: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە. لە زمانی میدیدا دەبێتە gu و لە ئاڤێستدا gao. لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا ناوەکە بە مانای (مانگ) دێت؛ لە ئینگلیزیcow ، ئەڵمانی kuh، سویدی و دانیمارکی ko و هۆڵەندی koe، سانسکریت go. |
| ĝu | هی من، م (ڕاناوی موڵکداری)<br>my, mine | xo خۆ: بۆ نموونە دەگووترێت (ماڵا خۆ) کە هەمان مانا دەگرێتەوە. لە زمانی لاتیندا ego مانای (من) دەدات. |
| gú-bala | قەراخی هەڵگەڕاوە (لول بوو)<br>the turning edge ('edge' + 'to revolve'). | gue-biāla گوێ بێاڵە: لە کوردیدا (گوێ) مانای (قەراخ) دەدات و (بێاڵە) مانای (داواکردنی لولکردن) دەدات. |
| gu de | گووتن (لە قسەکردن لەگەڵ کەسێکدا)، خوێندنەوەی شتێک؛ بانگکردنی خەڵک<br>to say (addressing someone),; to call; to read out | guta گوتە: هەمان مانای هەیە و دوایی چوەتە زمانی ئاڤێستاوە و بووەتە gatha . |
| gu éš-gàr | گای ئیشکەر<br>working oxen ('bull, ox' + 'assigned task') | gā īškar گا ئیشکەر: وشە لێکدراوە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بە (گا+ئەرکی سەرشان)، ئەمڕۆ لە کوردیدا پێک دێت لە (گا+ئەرکی سەرشان) و مانا و پێکهاتەی وشە لێکدراوەکە نەگۆڕاوە. |
| gu-gal-gal | گای تەواو گەورە لە تەمەندا<br>full-grown ox ('bull, ox' + reduplicated 'great') | gā kal kal گا کەڵ کەڵ: لە کوردیدا مانای (گای زۆر گەورە، گای پێگەیو لە ڕووی سێکسیەوە) دەدات. ئەم دووبارەکردنەوەیە ئەمڕۆ هەر لە کوردی نوێدا تێبینی دەکرێت بۆ نموونە (کوڕی گەورە گەورە، منداڵی بچووک بچووک، ....) |
| gu dub | هاوارکردن<br>to shout | qāu da قاودە: لە کوردیدا (قاو) مانای (دەنگی بەرز) دەدا و یەکێ و لەگەڵ پاشگری (دا) دا بە هەمووی ماناکەی دەبێتە (هاواری لێکرد). |

| | | |
|---|---|---|
| gu e | داپۆشین بە شتێک<br>covered with | qauā کەوا: بەرگێکی کوردیە بۆ پیاو و ژن کە هەموو لەش دادەپۆشێت. |
| gu gar | بەسەریەکداکراو<br>to pile up | kogā کۆگا: مانای (بەسەریەکدا کراو) دەدات. |
| gudaria | ئەو کەسەی کە ئاژەڵ لێ دەخوڕێت<br>drover | gāreīā گارێیا: واتە ( گا بەرێیا دەبات). |
| gude'usa | ئەو کەسەی کە ڕەوە ئاژەڵ ئەبات (شوان)<br>drover | gāuesa گاویسە: مەبەست لە ناوەکە (گا ویسە/وەسێن) ە. وشەی us لە زمانی سۆمەریدا هەمان مانای (وێس) ی کوردی هەیە و gud/gu مانای ( گا ) ی هەیە. وشەیەکی هاوشێوەی ئەم وشەیە لەلایەن میدەکانەوە بەشێوەی asp-vaiθana بەکارهاتووە کە مانای (کەسێکی ئەسپ ناس) تەرجومەکراوە و بە زمانی هیتی/میتانی assuussanni بە (ڕاهێنەری ئەسپ) تەرجومە کراوە کە (ئەسپ وەسێن) ی ئەمڕۆی کوردیە. واتە ئەگەر هەمان وشە بە زمانی میدی بنووسرێت دەبێتە guvaiθana، بەهیتی/میتانی دەبێتە guussanni. لە کوردی نوێدا بە هەردوو شێوەی سۆمەری و هیتی/میتانی، میدی دەتوانێت بگووترێت (گاویسە، گاوەسێن). |
| gur, kur | جیابوونەوە، لێکردنەوە، داکەندن، بڕین<br>to be parted, to trim away, strip; to cut | kur, gur کور، گور: وشەی (گور) لە کوردیدا مانای (لە پێست دەرهێنان) دەدات و (کوڕ) مانای (تاشین لە بندا) دەدات (هەژار، پ.٦٢٨ و ٧٠٣) |
| gu rah | هاوارکردن<br>shouting | qora قۆرە: مانای (هاوارکردن) ی هەیە. gāra/گارە لە هەندێک ناوچە بە مانای (دەنگەدەنگ) کردن دێت. دەڵێن (بەسە ئیدی گارەگار مەکە). لە هەندێک ناوچەی تر (گارەگار) بۆ دەنگەدەنگی مریشکی هێلکەکەر بەکار دەهێنرێت. |
| gu šum | دەنگدانەوە<br>echo | guš/gue, gimī گوش/گوێ، گمی: (گمی) یەکێک لە ماناکانی دەبێتە (دەنگدانەوەی چیا) (هەژار، پ.٧٠٠) و (گوێ/گوش) ئەندامی بیستنە لە کوردیدا. |
| gubar | پشت مل<br>nape | gepara گێ پەڕە: (گێ پەڕەی مل) بە پشت مل دەگووترێت. |
| gud | پاڵەوان، جەنگاوەر، هێرش بردن، سەماکردن<br>to jump (on); to attack; to dance; hero, warrior | gud گود: ئەم ناوە زۆر جار سۆمەریەکان بۆ ئاماژەکردن بە خەڵکی چیاکانی ڕۆژهەڵات یان (کوردستانی ئەمڕۆ) بەکاریان هێناوە و تەرجومەی ئەم ناوە بە زمانی ئەکەدی بریتیە لە qarrādu. هەمیشە ئەم دوو ناوە بۆ ئاماژەکردن بە خەڵکی کوردستان بەکارهێنراوە. ئاشوریەکان ناوی گود gud یان بە kut/qut نووسیوە. |
| gudeĝir | ئەو گایەی کە دوایەمین | gāaxīr گائەخیر: کە دوایەمین گا دەگرێتەوە. |

| | | |
|---|---|---|
| | گایە لە کاتی زەوی کێڵاندا<br>rear ox of a plough team | |
| gudgaz | قەساب<br>butcher | gāgāz گاگاز: ئەمڕۆ لە کوردیدا وشەی (گاز) بە مانای (قەپگرتن) دێت و وەک باسکرا gud مانای (گا) دەدات لە کوردیدا. |
| gudura | ئەو گایەی کە دوایەمین گایە لە کاتی زەوی کێڵاندا<br>rear ox of a plough team | gādura گادورە: ئەو گایەی کە دوورە. |
| gu'en (gu-en) | هەمووی، ژووری<br>دەسەڵات، ژووری<br>کۆڕوکۆمەڵ<br>entirety, assembly room, throne room | koīn/ koīān کۆین/کۆیان: ئامرازی بە کۆکردنی (ان) ی کوردی لە سۆمەریدا دەبێتە en بۆیە وشەکە لەو دوو بەشە پێک دێت (کۆ- ان) و هەمان مانا دەدات، بەڵام ئەمڕۆ لە کوردیدا بۆ ئاسانی گوتنی پیتی (ی) بۆ زیادکراوە. |
| gu'edena | گوێ تەختایی (قەراخ تەختایی)<br>edge of the plain | gue āuadānī گوێ ئاوەدانی: مانایان نزیکە و وشەکان بە جیاش لە سۆمەریدا هەمان مانای کوردی ئەمڕۆ دەدەن. |
| gukiri (gu-kiri) | هاوارکردنی کاتی جەنگ<br>battle cry | koqīra کۆقیرە: واتە (قیرەی بە کۆمەڵ). |
| gul | لەناوبردن، شکاندن، هەڵکۆڵین، بڕین، نەخش هەڵکۆڵین<br>to destroy; to break; to carve, cut; to engrave | kol کۆڵ: لە کوردیدا (کۆڵین) بە مانای (هەڵکەندنی بەرد یان تەختە، زەوی، بەرد، ... ) دێت و هەروەها مانای (کەمئەندامی، بیریندار) ی هەیە (هەژار، پ،٦٣٨). ئەم وشەیە لە هوریشدا بە agul دەنوسرێت و هەمان مانای هەیە. |
| gul | گەورە، زۆر<br>enormous | gal گەل: مانای (زۆر) دەدات و هەروەها ئاماژەیە بۆ میللەت. |
| gula | نەخۆشیەکە<br>a disease | gulī گولی: نەخۆشیەکە لە ناو کوردەواریدا ناوەکەی ماوە. ئەم نەخۆشیە لە کۆنەوە دەستنیشان کراوە و بە گشتی ئێستاکە نەماوە. لە ڕابردودا، لەبەر ئەوەی کە دەرمانی نەبووە، ئەو کەسەی کە تووشی ئەو نەخۆشیە هاتووە لە شار دوور خراوەتەوە بۆ پاراستنی خەڵکانی تر لە تووش بونیان. ئەمڕۆ ناوە پزیشکیەکەی بە زمانی ئینگلیزی بریتیە لە Leopracy. |
| gula | کۆمەڵێک قامیشی بەستراوە بە یەکەوە<br>sheaf of reeds | kole کۆڵێ: ئەم وشەیە لە کوردیدا بەکاردەهێنرێت بە مانای بارێک کە لە توانای هەڵگرتنی شانی مرۆڤێکدا بێت و دەشێت بۆ هەر جۆرە شتێک بەکار بێت کە بە پشت هەڵبگیرێت. بۆ نموونە دەگووترێت (ئەمڕۆ کۆڵێک دارم لەو شاخە هێناوە، کۆڵێک قامیشم کۆکردۆتەوە). |

| | | |
|---|---|---|
| gum | پشتگوێخستن<br>neglect | gum گوم: مانای بزربوونی هەیە و وەک فەرمان هەمان مانا دەدات (گومی کە). |
| gumgam | دەنگێکە (ناوێکە کە لە لاساییکردنەوەی دەنگەکەوە هاتووە)<br>a sound (onomatopoeic) | gimagim گمەگم: دەنگی خوێندنی کۆترە (هەژار، پ.٧٠٠). |
| gumur | بڕبڕەی پشت<br>spine | qamūr قەمور: وشەی (قەمور) لە هەندێک لە ناوچەکانی کوردستاندا هێشتا بەکار دەهێنرێت و بە مانای (پشت/بڕبڕەی پشت) دێت. لە هەندێک ناوچە دەڵێن ( قەموری دەشکێنم ) بەمانای (پشت/ بڕبڕەی دەشکێنم) دێت. هەروەها مانای (کەسێک کە بڕبڕەی پشتی چەمابێتەوە) دەدات. |
| gun | بارێک<br>load | gunī گونی: وشەیەکە بۆ ئاماژەکردن بە کیسەیەک کە لە بەن دروستکراوە و برنج، شەکر، چا یان هەر شتێکی تری تێ دەکرێت. لە زمانی لوڤیدا هەمان مانای وشە سۆمەریەکە دەدات. |
| guNE | شوێنێکە (شوێنێکی پەرستنە)<br>a place; cult centre | xāna خانە: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (شوێن) دەدا و زۆر جار وەک پاشگر بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بە شوێن (چایەخانە، نەخۆشخانە، خومخانە، دەلاکخانە). |
| gunida | دانەوێڵەی پاکراوە لە توێکڵ<br>hulled grain | xuna خونە: چەڵتوکێک کە هێشتا لە کا جیانەکرابێتەوە. |
| gunu | شوێنی گوزەران<br>dwelling | xānū خانو: شوێنی گوزەرانە. |
| gunu | پرشنگداربوون، ڕەنگاوڕەنگ بوون، هاتنە دەرەوە لە گەرا یان هێلکە، ڕۆن لێدان یان چەورکردن، میکیاج لێدان<br>(to be) speckled, multicolored; (to be) hatched (in sign names); to anoint, smear on, apply makeup | juān, gonī جوان، گۆنی: لە کوردیدا وشەی (گۆنی) مانای ڕەنگێنراوی هەیە (هەژار، پ.٧٢٠) و وشەی (جوان) مانای (لاو، قەشەنگ) دەگرێتەوە. وەک فەرمانیش مانای (ڕازاندنەوە) دەدات. |
| gur | ئەستور بوون، گەورەبوون، هەستکردن بە گەورەیی<br>(to be) thick; (to be) big, to feel big | gaura گەورە: هەمان ئەو مانایانەی هەیە. لە زمانی ئینگلیزیدا grow مانای گەورەبوون دەدات (وەک فەرمان). لە سانسکریتدا دەبێتە guru. |

| | | |
|---|---|---|
| gur | خڕ، هەر شتێک بازنەیی بێت<br>loop, circle | gir گر: خڕ، هەر شتێک بازنەیی و خڕ بێت (هەژار، پ.٦٨٧). |
| gur | بڕین و لێکردنەوەی بەروبووم<br>to reap | gera گێرە: مانای (وردکردنی دەغڵ و گیا بەپێ لێنان و شێلانی گیاندار) دەدات. |
| gur | ڕەتکردنەوە (بەڵگەی یاسایی)، ڕەتکردنەوەی خەڵک؛ گۆڕین، گەڕانەوە<br>to reject (legal evidence), to turn away; to turn, return | gar, gor گۆڕ ،گەڕ: لە کوردیدا (گۆڕ) دەبێتە ڕەگی (گۆڕین). (گەڕ) دەبێتە ڕەگی (گەڕانەوە) و (گەڕانەوەی کەسێک) بە مانای ڕەتکردنەوە دێت بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو کەسانە هەموویان بگەڕێنەوە) کە مانای ڕەتکردنەوەی هەیە. |
| gur | ناوی گیاندارێکە<br>a designation of animals | gur, gor, gūr گور،گۆڕ، گوور: (گور) مانای (گورگ) دەدات، (گۆڕ) مانای کەرکێوی و (گوور) مانای بێچووی چێڵ دەدات (هەژار، پ. ٧٠٣ و ٧٠٤)). |
| gure | ئەو لایە<br>That side | gore گۆڕێ: (بەردەم) دەگرێتەوە. |
| guria | گریان<br>cry | girīa گریە: هەمان مانایە |
| guru | هاڕین، لەتکردن و پارچەپارچەکردن<br>to grind, grate; to cut up, chop | gera گێرە: وردکردنی دەغڵ و گیا بەپێ لێنان و شێلانی گیاندار. |
| guru | شتی کەڵەکەبوو بەسەر یەکدا<br>heap | gaura گەورە: مانای (مەزن) دەدات. |
| gurum | چەمانەوە، کەوانەیی، پێچانەوە؛نوشتانەوە، لولدان، ڕێگرتن، گرتن، چاودێری کردن.<br>to bend, curve, wrap around; to bow; to roll up; to curb, restrain; to watch over" | girmola, gir,kūr,gar گرمۆڵە ، گر, کوڕ, گەڕ: (گر) بەمانای (گرد کردنەوە، چەماندنەوە، خڕکردن) دێت. (کوڕ) بە مانای چەماوە دێت. (گەڕ) لە کوردیدا هەردوو مانای (گەڕان، پشکنین) ئەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو کابرایە چووە بۆ گەڕان، ئەفسەرەکە، سەربازەکان هەمووی گەڕا). ( گرمۆڵە) مانای (تۆپەڵکردنی نارێکوپێک، لولدانی شمەک) دەدات. وشەی (گەڕان) بە مانای (التجول) ی عەرەبی لە زمانی ئیتاڵیدا دەبێتە vagare و بە ئیسپانی vagar. هەروەها (گر) دەبێتە ڕەگی (گرتن) کە بە ئینگلیزی دەبێتە grip و بە ئیسپانی دەبێتە agarre. |
| gurum | سوتان<br>burn | gir گر: بڕوانە وشەی (gir, girra). |

| | | |
|---|---|---|
| guruš | بڕین، تاشین، توێکڵ یان پێست لێکردنەوە<br>to cut, trim, peel off | guriž, krož گورژ، کرۆژ: (گورژ) دەبێتە ڕەگی (گورژان) کە مانای کەوڵ کران و پێست داماڵین دەدات (هەژار، پ.٧٠٥). هەروەها وشەی (کرۆژ) لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (کرۆژان) کە مانای (داخوران) دەدات و لە ئینگلیزیدا دەبێتە corrode و بە ئیتاڵی corrodere و فەرەنسی corroder. |
| ĝušur | گاسن<br>harrow | gāsur, gāzor گاسوڕ، گازۆر: (گاسوڕ) مانای (سوڕاندن لەلایەن گا) وە دەدات و پێکهاتەی وشەکە سۆمەری و کوردیە. (گازۆر) مەبەستی دەبێتە (هێز و فشاری گا). وا دەردەکەوێت دوایی کورد وشەکەی گۆڕیوە و کردویەتە (گاسن) کە مانای (گا- ئاسن) دەدات، دەشێت کە ئەم ناوە نوێیە دوای دۆزینەوەی ئاسن پەیدا بووبێت. |
| guz | چەپک کردن، گوشین<br>to be tufted | guš گوش: دەبێتە ڕەگی (گوشین). لە کوردیدا تەنانەت بە گوریسیش دەگوترێت (گوش) کە بناغەکەی لە وشەی (گوشین) موە هاتووە ولەویادا مانای چەپک کردن دەدات. |
| guz, þuz | قژی درێژ، پڕ<br>long, shaggy (hair) | qiž, kazī, gīs قژ، کەزی، گیس: لە کوردیدا (گیس) مانای (پرچ) دەدات (جەلیلیان، پ. ٣٦). (قژ) مانای (توکی سەر) و (کەزی) مانای (قژی هۆنراوە یان هەر شتێک کە هۆنرابێتەوە، زوڵف، گیای حەسیر) دەدات. (قژ) لە زمانی سربی و کرواتی و بولگاریدا دەبێتە kosa (بڕوانە وشەی ki-zi سۆمەری). لە زمانی لوڤیدا kīša مانای (قژ داهێنان) دەدات. لە سانسکریتدا (قژ) دەبێتە keza. ئەم وشەیە لە کوردی/سۆمەریەوە ڕاستەوخۆ چووەتە زمانی لاتینیەوە. وشەی قەیسەر لە لاتینیدا بە شێوەی caesar دەنووسرێت و بە مانای (قژار، سەرێکی گژن) دێت. زۆربەی سەرچاوەکان بناغەی ئەو مانایە بۆ دروستبوونی نازناوی قەیسەری ڕۆم دەگەڕێننەوە (Schwager, 1991, p.22) ، دوایی بووەتە ناوی قەیسەر لە هەموو ئەوروپادا. وشەکە لە کوردیدا دەبێتە (قژار kižār) و پێک دێت لە (قژ+ار) و پاشگری (ار) لە کوردیدا کەسەکە دەکاتە خاوەنی شتەکە بۆ نموونە (شاخار، باڵار، دەنگار،...). هەرچەندە لە لاتینیدا هەمان مانای زمانی کوردی هەیە، بەڵام ئەو شیکردنەوەی زمانی کوردیەی بۆ ناکرێت، لەبەر ئەوەی کە وشەی (قژ) لە لاتینیدا نیە، وشەکە بە پاشگرەکەیەوە چووەتە زمانی لاتینیەوە. بێ گومان وشەکە هەمووی کوردی/سۆمەریە و لەو فەرهەنگەوە هاتووە، چونکە توکنی و قژ پڕی جۆرێک نیشانەی بەتوانایی و بەهێزی بووە لە ناو سۆمەریەکاندا. کاتێک کە لە داستانی گەلگامێشدا وەسفی بە توانایی |

| | | |
|---|---|---|
| | | هاورێکەی گلگامێش، ئەنکیدۆ، دەکرێت، دەڵێت قژی درێژ بوو وەک ئافرەت. لە سەردەمەکانی دواییشدا زۆربەی پاشاکانی کوردستان و دەروبەری بە قژی درێژەوە پەیکەریان بۆ کراوە. |
| guz | دان جیرکردنەوە؛ دان دەرخستن؛ برین<br>to gnash the teeth; to bare the teeth; to cut | gaz گاز: دەبێتە ڕەگی (گازگرتن) کە مانای (قەپاڵگرتن) دەدات. لە زمانی لوڤیدا kwaza مانای (برین، هەڵکۆڵین) دەدات. |
| ha, he | دەربرینێکە بۆ قایلبوون و دەکەوێتە پێش فەرمانەوە<br>precative and affirmative verbal prefix | ā, he هێ، ئا: هەردوو وشەکانی (ئا، هێ) مانای (بەڵێ، قایلبوون) دەدەن ( هەژار پ.١٠١٣). |
| hab | بۆگەن کردوو<br>malodorous | hau هەو: مانای کێم و زوخ (ئیلتیهابکردن) دەدات (هەژار، پ.١٠٠٨). |
| hagunu | ناوێک بۆ مانگا یان بۆ مانگایەک کە گوێرەکەی نەبێت<br>a designation of a cow or a heifer | hī-guān هی گوان: واتە (تەنها بۆ دۆشینە) |
| hal | بەشکردن، دابەش بوون؛ کردنەوە، ڕاژاندن، لە هێڵەکدان، هەڵخلسیکاندن، لەسەر ئەژنۆ ڕۆیشتن، ناوێکە بۆ دانەوێڵە<br>to divide, deal out, distribute; to open;; to pour away; to sieve; to slink, crawl away; a qualification of grain | hal هەڵ: ئەم وشەیە بە گشتی مانای بەرزکردنەوەی هەیە و پێشگرێکە دروستکردنی ژمارەیەکی زۆری وشەی وەک (هەڵچوو، هەڵێنجا، هەڵبوو، هەڵگیرسا، هەڵ هات، هەڵ دا، هەڵ زنا، هەڵ پاچی، هەڵ کوتا، هەڵ بڕی،.......) لێ دروست دەکرێت. |
| halatuša | کەسێک کە لە کەسێکی شارەزاوە پیشەیەک فێر دەبێت (شاگرد)<br>apprentice | halatruša هەڵەتروشە: کەسێک کە بە چیچکانەوە دادەنیشێت. وا دەردەکەوێت کە ئەم ناوە مەبەستی لەوەیە قوتابییەکە بە چیچکانەوە دانیشتووە و گوێ دەگرێت و مامۆستاکەی بەپێوەیە. لە زۆر شوێندا ناوی (وەسا usa) دێت وەک کەسێکی کارامە کە ئەویان بە پێوەیە و ڕۆڵی مامۆستا (مام+وەستا) دەبینێت. |

| | | |
|---|---|---|
| halhala | بەتەواوی لەناوچوو<br>completely destroyed | halāhalā هەلاهەلا: (هەلاهەلا) مانای (بەتەواوی لەتوپەت بوو) دەدات کە هەمان مانای هەیە. |
| hamun | هارمۆنی<br>harmony | hamān هەمان: واتە (وەک یەک) بۆ نموونە دەڵێیت (ئەم وێنەیە هەر هەمان وێنەکەی ترە) کە لەگەڵ پرەنسیپی مانای وشەی (هارمۆنی)[65] دا یەک دەگرێتەوە کە تەرجومەی وشە سۆمەریەکەیە بۆ ئینگلیزی. بە زمانی هیتی himma مانای هەمان کۆپی دەدات و لە زمانی میدیدا بەشێوەی ham دەردەکەوێت و لە ئاڤێستادا دەبێتە hama لە زمانی یۆنانیدا دەبێتە homos ، دەبینرێت کە پرەنسیپی مانای وشەکە لە هەموو ئەو زمانانەدا نزیکن. |
| hara | کەسێکی هاروهاج<br>ruffian | hāra هارە: (هار) وەسفی کەسێکە کە (هاروهاج) بێت و (هارە) کەسەکەیە. تێبینی دەکرێت هەمان (ە) لە کوردی و سۆمەریدا بۆ یەک مەبەست بەکاردەهێنرێت. |
| harran | ڕێگە<br>route | reiān ڕێیان: ماناکەی دەبێتە (ڕێگەکان). |
| harrankalag | شوێنێکی قایمکراو و نامادە<br>stronghold | ārānkalag ئارانکەڵەک: لە کوردیدا وشەی (کەڵەک) بۆ بەهێزکردن و لەسەر یەک دانان و لەیەک گیرکردن بەکاردەهێرێت. بۆ نموونە (کەڵەکەبەرد) و ئەو بەلەمەی کە خەڵکیش پێی دەپەڕێتەوە، پێی دەگووترێت (کەڵەک)، لەبەر ئەوەی کە لە بنەڕەتدا لە داری شەتەکدراو دروستکراوە. وشەی (ئاران) مانای (بنکەی ژیانی زستانەی کۆچەران، گەرمەسێر) دەدات (هەژار. پ.٣). |
| haš | گورزی جەنگ<br>battle-mace | hāuīš/ hāueš هاویش/هاوێش: ڕەگە بۆ (هاویشتن) کە بۆ گورز هاویشتن بەکاردەهێنرێت. |
| hašhurmada | درەختی هەرمێ<br>pear-tree | xāsaharme خاسەهەرمێ: بە هەندێک جۆر لە درەختی هەرمێ دەگووترێت. |
| heĝal | گەلێک (زۆر)<br>plenty | gale گەلێ: هەمان مانا دەدات. |
| henzer | منداڵێک کە ئاستی باری کۆمەڵایەتی نزم بێت؛ منداڵێکی بچووک؛ ساوا؛ لاواز<br>a low social class; small child; baby; weak | hānzir هانزڕ: لە زمانی هوریدا han مانای (منداڵ) دەدات. بە کوردی (هان) دەبێتە ڕەگی (هانین) کە مانای (منداڵ هانین) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (ئەم منداڵە دوو منداڵی بەدوای خۆیدا هێنا). (زڕ) لە کوردیدا بە مانای برا یان خوشکێک کە لە هەمان دایکوباوک نەبن. بەو جۆرە مانای وشەکە (منداڵێکی زڕ) دەبێت. هەروەها (زڕ) بەمانای (وشک، بێ |

[65] وشەی هارمۆنی لە زمانی ئینگلزیزیدا ئاماژەیە بە چەند دەنگێکی مۆسیقا کە لەگەڵ یەکتریدا و لە هەمان کاتدا لێ دەدرێن و دەنگێکی ساز دروست دەکەن. دەنگەکان زۆربەی کات هاوشێوەن، تەنها لە چینە دەنگیەکاندا جیاوازن. هەروەها مانای ڕێکەوتن و سازبوون دەدات لەگەڵ یەکتریدا.

| | | |
|---|---|---|
| | | بەروبوم و لاواز بۆ ڕووەک و چ بۆ گیاندار) دێت. |
| hud | نوکی برۆنزی ڕم<br>bronze arrowhead | xuda خودە: بە کوردی کڵاوی ئاسنینە. ئەم وشەیە چووەتە زمانی ئینگلیزیەوە و بووەتە hood کە بۆ کڵاوێک بەکاردێت کە بە چاکەت یان پاڵتووە بێت و لە ئینگلیزی کۆندا بریتی بووە لە hod. |
| huĝ | بڵاوکردنەوەی ئاشتی، کۆتایی هێنانی جەنگ<br>pacify | hok هۆك: مانای (کردنەوەی گرێ و شتی دژوار و ئاڵۆز) دەدات (هەژار، پ.٩٥٨) |
| huĝ | کرێ، بەکرێ گرتن<br>to hire, rent | haq حەق: ئەو پارەیەیە کە دەدرێت بۆ بەکرێ گرتن، بۆ نموونە (حەقی ماڵ گرتن، حەقی تاکسی گرتن). |
| hulu | لەناوبردن؛ بۆگەنی ناخۆش؛ خراپ بوون، شەیتان؛ بوون بە تاوانبار؛ درۆزنی؛ تاوانباری؛ دوژمن؛ پەلاماردان<br>to destroy; (to be) bad-smelling, maloderous; (to be) bad, evil; (to be) slight, lightweight; (to be) false; (to be) criminal, dishonest; enemy; to raid; | halā, āla/hāla هەڵا، هاڵە/ئاڵە: (هەڵا) چەند مانایەکی هەیە (ڕزیو، پلیخاو، کێشەو شەڕ، دنیای بێ خۆر) و (ئاڵە/هاڵە) ناوی جنوکە (شەیتان) ێکە کە دوژمنی زەیسانە (ژنی تازە منداڵ بوو) ( هەژار، پ. ١٠، ١١ و ٩٨٣ ). کورد پێی وایە زەیسان و کۆرپەی ساوا لە ژێر مەترسی ئەودان و هەندێک جار دەیانکوژێت. بە زمانی هیتی ḫulle مانای (شەڕکردن، ئاژاوە) دەدات. لە ئینگلیزیدا بە شێوەی hell و بە ئەڵمانی بە شێوەی hölle دەردەکەوێت کە مانای (دۆزەخ) دەدەن. |
| hur | هەر<br>ever | har هەر: نەگۆڕاوە. ئەگەر سەرنج بدرێت لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە ever کە زۆر نزیکە. |
| hur, ur | خوران<br>scratch | xur/ur خور/ور: دەبنە ڕەگی وشەی (خوران) کە هەمان مانا دەگەیەنن. |
| i | هاوارکردن لە ئازاردا<br>cry of pain | āī ئای: هەر بە هەمان شێوەیە. بە فەرەنسی بە aïe دەنوسرێت و هەمان مانای هەیە. |
| ibsi | بەسە<br>enough (its enough) | basīatī/basa/basī بەسە/بەسی/بەسیەتی: لە کوردیدا وشە سۆمەریەکە وەک خۆی ماوە و بە سێ شێوەی جیاواز دەردەکەوێت. لە زمانی ئیسپانی و ئیتاڵیدا بووەتە basta. عەرەب ئەم وشە کوردیەیان وەرگرتووە بە شێوە (بس)، بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەردەمی نوێدا وەریان گرتووە، نەخراوەتە قاموسی عەرەبیەوە و وەک وشەیەکی بێگانە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. |
| idu | ژوورێکی ئاینیە<br>a cultic room | dīu دیو : لە کوردیدا مانای (ژوور) دەدات. |
| igen | بەڵام نا<br>but no | agīn ئەگین: مانای (ئەگەر نا) دەدات کە لەوەوە نزیکە . |
| igi | یەکەم، پێشتر، پێشەوە | ek/ īak یەک/ئێک: ئەم وشەیە هەرچەندە لە زمانی |

| | | |
|---|---|---|
| | first, earlier; front | سۆمەریدا مانای (ژمارە یەک) نادات، بەڵام وەک لە تەرجومەی وشە سۆمەرییەکەدا دەردەکەوێت بە ڕوونی تایبەتمەندییەکانی تێدا دەردەکەوێت. هیتی/میتانیەکان بە ژمارە یەکیان گووتوە aika. |
| igi | خەسڵەتی چاکی<br>quality | īakī یەکی: لە کوردیدا مانای (چاک، تاک، نایاب) دەدات، دەگووترێت (پیاوی یەکی) مەبەست لە پیاوی (نایابە). یەکێ لە پاشا گوتیەکان ناوی igigi (Hamblin, 2006, p.102) بووە کە وا دەردەکەوێت دووبارە کردنەوەی وشە سۆمەرییەکەی igi بووە و لەوە دەچێت مانای (یەکی یەکی) کوردی بدات کە لە کوردیدا بە دووبارەکردنەوەی وشەکە، مانای (کەسێکی زۆر نایاب) دەدات. دووبارکردنەوەی وشە لە زمانەکانی سۆمەری، هوری و هتیدا وەک کوردی نوێ بەکارهاتووە. |
| igi | دەستەواژەیەکی ماتماتیکیە<br>a mathematical term | īak/ek یەک/ئێک: ئەمە دڵنیای دەکات کە (یەک) وەک ژمارە لەو سەردەمەدا بەکارهاتووە. لەبەر ئەوەی کە هەموو ماناکانی لە کوردی و سۆمەری هاوبەشن. |
| igira | باڵندەیەکە وەک ماسی گرە<br>heron | agira ئەگرە: کە لەگەڵ سروشتی باڵدارەکەدا دەگونجێت و ئەمڕۆ دەگووترێت (ماسی گرە). |
| igištu | لە هەموویان زیاتر<br>foremost | īakgištīā یەکگشتیا: (یەک لە ناو هەموویاندا، لەگشتیان زیاتر) دەگرێتەوە. لەوە دەچێت لە سۆمەریدا پیتی (گ) ی دووهەمیان نەنوسیبێتەوە. |
| iku | یەکەیەکی قەبارەیە، یەکەیەکی ڕووبەرە<br>A unit of area, a unit of volume | īaka یەکە: هەر هەمان مانایە و بۆ پێوانەیەکی گشتی بەکاردەهێنرێت. دەشێت زەوی، قەبارە.... بگرێتەوە. لە زمانی میتانی/هیتیدا وشەی aika مانای (ژمارە یەک) دەدات لە کوردیدا. |
| il | بەرزکردنەوە، هەڵگرتن<br>to raise, carry | hal هەڵ: وشەی (هەڵ) مانای بەرزکردنەوە دەدات و پێکهاتەی چەندین وشەی لێکدراوی کوردی ترە. بۆ نموونە (هەڵ گرتن، هەڵ واسین، هەڵ برین، هەڵ هاتن، هەڵ چوون، هەڵ خستن، هەڵ دان.....). |
| ila | هەڵبرین یان بەرزکردنەوە<br>elevation | halā هەڵا: هەمان مانا دەدات، بۆ نموونە (هەڵان بۆ سەرەوە، ئاو هەڵانین) |
| ilalum | گۆرانیەکە<br>a song | haīlālo/haīlolo/haīlamin هەی لالو/هەی لولو/هەی لەمن: ئەمانە جۆرێکی تری وشەگەلن کە لە ناو گۆرانی کوردیدا بەکاردەهێرێن بێ ئەوەی کە مانایان بزانرێت. |
| illar | چەک: کەوان، ڕم<br>a weapon: bow, javelin | halar/halirāu هەڵەر/هەڵراو: ئەو دوو وشە کوردیە مانای (شتێکی هەڵدراو) و ( شتێک کە هەڵ بدات) کە مانای کەوان و ڕم، دەدەن. |
| illu | ئاوێکی بەرز<br>high water | hallāu هەڵاو: ئەو هەڵمەی کە لە ناو بەرز دەبێتەوە. لە کوردیدا وشەی (هەڵاو) پێکهاتووە لە (هەڵ + ئاو). |

| | | |
|---|---|---|
| | | (هەڵ) مانای بەرزکردنەوە دەدات و بە سۆمەری دەبێتە ila و (ئاو) ی کوردی بە سۆمەری دەبێتە a. بەو جۆرە هەردوو وشەکە بە سۆمەری بە شێوەی (ila+a ) دراوە لەیەک و هەمان مانا کوردیەکەی هەیە و پیتەکانی هەندێک گۆڕانکاری تێدا کراوە. |
| illu، ilulamma ilulu ،ilum | گۆرانی song | ئەم وشانە لە گۆرانی کوردیدا بەکاردەهێرێن. لە زمانە هیندۆئەوروپیەکانشدا بە شێوەی جیاواز دەردەکەون کە بە مانای ئارامکردنەوە بۆ خەوتن بە دەنگ یان بە جوڵەکردن دێن. لە ئینگلیزیدا دەبێتە lull و سویدی lulla. |
| ilu | گۆرانیەکی شادە، شینکردن joyful song, lament | lāī lāīa لای لایە، haīlo هەی لۆ: گۆرانی هەی لۆ کە بە بەستە دەوترێت بۆ هەڵپەرکێ و شادیە، بە مەقام بۆ غەمگینیە. (لای لایە) دەبێتە (شینکردن و کڕوزانەوە). هوریەکانیش alilan یان بۆ ئاماژەکردن بە (گریان، شیومن، هاوارکردن) بەکار هێناوە. بە زمانی هیتیش دەبێتە lahlahhima و بە زمانی لاتینی شیومن دەبێتە eiulo و بە ئینگلیزی دەبێتە wail. |
| imma | شێوە و دەربڕینی دەموچاو physiognomy | hemā هێما: مانای (نیشانە ،ئیشارەت، (ڕەمز)) ی هەیە. |
| imma | بەشی دەرەوەی ئەندامی زاوزێی مێیە vulva | ī me ئی مێ: واتە (هی مێ، ئەوەی مێ). |
| immal | کەلوپەل، موڵک، زەوی وزار، ئاژەڵ goods, property, possessions, livestock | māl ماڵ: لە کوردیدا (ماڵ و موڵک، سامان) دەگرێتەوە. بە زمانی هیتی بە قەنەفە دەگووترێت na(m)mulli کە وا دەردەکەوێت بە مەبەستی (ناوماڵ) بەکاریان هێنابێت کە لە کوردیدا مانای (کەلوپەلی ناوماڵ) دەدات. |
| išah | چەوری ناو سکی بەراز lard | hīza هیزە: لە کوردیدا پێستەی ئاژەڵە بۆ هەڵگرتنی کەرە. لە زمانی هوریدا asi مانای (چەوری) دەدات. |
| išiu | بێدەنگ silence | uis, ši وس، ش: مانای (داواکاری بێدەنگی) دەدات. کە هەمان مانایە. |
| iškila | بەردی ساف، سەتڵ pebble; a container | šikil, īškel شکڵ، ئیشکێل: شکل بەمانای شێوە، ئیشکێل بە مانای شەیتانۆکە، گیاندارێکی پچکۆلەی سەدەفۆکەیە، بەهاران پاش باران دێتە دەرەوە. |
| i-utu | سکاڵاکردن؛ داواکردنی دادگەری؛ 'ئای، شەماش!' [وەک چۆن ئەوەی کە بگووترێت (ئای دنیا، ئای خوا) ڕستەکە بە هەمان شێوەیە] outcry; cry for justice; 'Oh, | āi hatāu ئای هەتاو: هەتاکو ئێستاش ئەم ڕستە کورتە هەمان مانا دەدات و پەنابردنە بۆ خوەر. لای سۆمەریەکان utu خوای ڕۆژ و خوای دادوەری بووە، بۆیە بەو شێوەیە سکاڵایان کردووە. وەک تێبینی دەکرێت موتەرجیمی زمانی سۆمەری وشەکەی بە (ئای شەماش) یش تەرجومە کردووە، لەبەر ئەوەی کە لە زمانە سامیەکاندا (شەماش) هەر هەمان utu ی سۆمەری بووە کە دەبێتە (هەتاو) ی کوردی. |

| | | |
|---|---|---|
| | Shamash!' | |
| kabkab | باڵندە<br>bird | کەو/کەڤ kau/kav: وشەی کەو دیارە بە ناوەکەوە . ئەوەی کە دڵنیای دەکات کە ئەم باڵندەیە کەوە، بە زمانی هیتی بە (کەو) دەڵێن kakkapi کە زۆر لە وشە سۆمەریەکە نزیکە و هاوبەشیشی لەگەڵ وشە کوردیەکەدا هەیە. هەتاوەکو ئەمڕۆ کورد کە باڵندەی کەو بانگ دەکات هاوار دەکات و دەڵێت (کاکبە کاکبە کاکبە). |
| kag | دەم<br>Mouth | kākīla کاکیلە: مانای (شەویلاگ) دەگرێتەوە. لەوە دەچێت کە لە رابردوودا کورد بە (دەم) ی گووتبێت (کاک)، لەبەر ئەوەی کە وشەی (کاکیلە) وا دەردەکەوێت کە پێکهاتبێت لە (کاکی +لا) کە لەسەر بناغەی ئەو وشە کۆنە مانای (تەنیشت دەم) ی دابێت و ئەوە ڕەگی وشەکە بێت. ئەوەی ئەمە دڵنیا دەکات ئەوەی کە (کاکیلە/تەنیشت دەم) بە زمانی سۆمەری دەبێتە kag la. |
| KA'izi | سوتاندن؛ گۆشتی سورەوەکراو<br>burning; roasted meat | kiza کزە: ئەم وشەیە بەکاردەهێنرێت بۆ ئاماژەکردن بۆ سووربوونەوەی گۆشت. بۆ نموونە دەگووترێت (گۆشتەکە هەڵ کزا/کزەی دێ). هەروەها کاتێک کە کورد دەڵێت (دڵە کزێم هەیە). لەویدا مەبەست لێی (ئازار/سوتانەوە گەدە)ی هەیە. جگە لەوەش وشەکە مانای (سوتاندن) یش دەدات. |
| kal | ڕێزلێگرتن، نرخ پێدان، نایاب بوون، بەنرخ بوون،<br>to esteem, value; to be rare; to make dear | kal کەڵ: ئەم وشەیە مانای (نایاب، تایبەت، بەتوانا، ئازا، نێر) دەدات. |
| kala'a | ماوە (ئەوەی کە دەمێنێتەوە)<br>remainder | kalā, kalāk کەلا، کەلاک: (کەلا) مانای دوورە پەرێز دەگرێتەوە (هەژار، پ.٦٦٢) و کەلاک مانای (لاشەی گیانداری مردارەوەبوو) دەگرێتەوە. |
| kalag | بەهێزبوون، بەتوانا؛ مەزن؛ پاڵپشتکردن؛<br>(to be) strong, powerful, mighty; to reinforce; | kalak کەڵەک: بە مانای (بەرد خستنە سەر یەک، پتەوکردن) دێت، بۆ نموونە (کەڵەکە بەرد) هەروەها (کەڵەک) کە بەلەمێکە لە داری شەتەکدراو دروست دەکرێت. |
| kam | دەستکاریکردنی پێکهاتە یان شێوەی شتێک<br>to alter | kam کەم: ئەم وشەیە دەبێتە ڕەگی (کەمکردنەوە) یان (کەمانەوە) کە مانای (نوشتانەوە) ی هەیە. |
| kasu | پەرداخ؛ قاپ<br>goblet; bowel | kāsa کاسە: لە کوردیدا مانای (قاپ و قاچاخ) دەدات و وەک خۆی ماوە. بە هوری پێی دەگووترێت katsi. |
| ki | شوێن، ناوچە، زەوی<br>place, area, earth | jī/je جێ/جی: بەهەردوو شێوەی هەیە و هەمان مانا دەدەن. ئەم وشەیە لە زمانی یۆنانیدا بەشێوەی gi دەردەکەوێت بە مانای (زەوی، خاک). |

| Sumerian | مانا / Meaning | لێکدانەوە |
|---|---|---|
| ki-áñ | خۆشەویست<br>beloved | jīān/gīān گیان/جیان: مانای (خۆشەویت، ڕۆح) دەدات. |
| ki-bala | وڵاتی یاخی بوو، خاکی یاخی بوو<br>rebellious country, rebel land ('place' + 'to revolt') | je/jī balā جێ/جی بەڵا: ئەگەر سەرنجی شیکردنەوەی وشەکە بدرێت، لە فەرهەنگە سۆمەریەکەدا پێکهاتەکەی بریتیە لە (جێ+یاخی بوون). لە کوردیدا (بەڵا) مانای (ڕوداوی ناخۆش، کێشە، نەهامەتی) دەگرێتەوە. بەو جۆرە لە کوردیدا مانای (جێی کێشە و ناخۆشی). |
| ki...dar | شەقکردنی زەوی<br>to break the ground ('ground' + 'to split') | jī/je dir جێ دڕ: شیکردنەوەی وشە سۆمەریەکە بریتیە لە (جێ/زەوی+شەقکردن). لە کوردیدا بە هەمان شێوە (جێ+ دڕ) هەر هەمان مانای ماوە. |
| ki hur | هەڵکڕاندنی زەوی<br>to scratch the earth | jī ur/xur جێ خور/ور: hur بە سۆمەری مانای (خوراندن) ی هەیە و لە بری (جی/جێ) ی کوردی سۆمەریەکان ki بەکاردەهێنن و هەمان مانای هەیە. |
| ki ĝar | هەوڵدانی دۆزینەوە<br>to found | jī/je gar جی/جێ گەڕ: (جێ گەڕان) هەر هەمان مانای هەیە. |
| ki-iz | کورتکردنەوە، پاکردنەوە (بۆ قژ، گەڵا یان سەوزی)<br>to trim, to clean (of hair, leaves, or vegetation) | kiš, qiž, kazi کش، قژ، کەزی: لە کوردیدا وشەی (کەزی) مانای (قژی هۆنراوە یان هەر جۆرێک لەبەن کە هۆنرابێتەوە، زوڵف، گیای حەسیر) دەدات. وشەی (کش) لە کاتی داهێنانی قژی منداڵدا بەکار دەهێنرێت بۆ ئەوەی کە نەگری. (قژ) مانای (توکی سەر) دەدات. جگە لەوەش لە زمانی سۆمەریدا guz مانای (قژی درێژ، پڕ) دەدات. |
| ki-kal-kal-la | شوێنێکی زۆر نایاب<br>the very precious place ('place' + reduplicated 'to value, esteem' + nominative) | jī kal kal a جی کەڵ کەڵە: وشە سۆمەریەکان شیکراوەتەوە بەشێوەی (جێ+دووبارەکردنەوەی وشەی (بەنرخ، ڕێزدار) + جێگری بکەر). لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (جێ+(نایاب) دووبارە بووەتەوە+ جێگری بکەر) بۆ نموونە ئەمڕۆ لە کوردیدا دەگووترێت (جێ گەورە گەورەیە). بەو جۆرە ڕستەکە هەمان مانای ماوە. |
| ki la | هەڵکەندن<br>to dig | Jī lā جی لا: (جی لابردن) هەمان مانای هەیە. |
| ki sub | زەوی سافکردن<br>to rub the earth | jī saf جی ساف: لە کوردیدا (جێ ساف) مانای (شوێن پاکردنەوە، شوێن سافکردن) دەگرێتەوە. |
| ki sur | دەستنیشانکردنی سنوور<br>to mark a boundary | jī sur جی سوڕ: واتە (سواڕانەوە بە دەوری جێدا) و هەمان مانا دەدات. عەرەب وشەی (سوڕ) ی سۆمەری/کوردی وەرگرتووە و کردوویەتە (سور) بە مانای دیوار و (سوار) بە مانای بازنگ. بەڵام ڕەگی وشەکە سۆمەری و کوردیە لە هەردوو زمانەکەدا مانای (خولانەوە، سوڕان) دەدات. |
| ki us | وەستان لەسەر زەوی<br>to set on the ground | jī ues جی وێس: واتە (وەسان/وەستان لە جێدا). |

| Sumerian | Meaning | Kurdish |
|---|---|---|
| ki'anaĝ | شوێنی خواردنەوە لەسەر ڕۆحی مردوو<br>a place of libations to the dead | jī xanak جی خەنەک: مانای (جێی خەنەک) دەگرێتەوە کە بریتیە لە (شوێنێکی هەڵکەندراو). |
| ki bir | کەلوپەلێکی تیژ<br>a sharp implement | jī bir جی بڕ: واتە ئەو شتەی کە جێ دەبڕێت. ناوی هاوشێوەی ئەوە لە کوردیدا هەر ماوە بۆ نموونە (قوڵبڕ، ملبڕ، گیابڕ) |
| kibšur | بوونی شتی زۆر<br>plentiful | jī bazor جی بەزۆر: شوێنێک کە شتی زۆر تێدا بێت |
| kid | بڕین، کەوت<br>to cut, fell | kat/kaut, kut کەت/کەوت، کوت: (کوت) لە کوردیدا مانای پارچەی هەیە (کوتکردن) مانای (لەتکردن) ی هەیە. (کەت/کەوت) مانای کەوتنی هەیە و بە زەمانی هوری kad ماناکانی (گوت، کەوت) ی کوردی هەیە. ئەم وشەیە لە ئینگلیزیدا بووەتە cut کە مانای بڕینی هەیە. |
| kid | ڕوخاندن<br>demolish | kaut/kat کەت/کەوت: بە مانای ڕوخان دێت. |
| kid | جۆرێک لە ڕاخەری قامیشی یان شتێکی چنراو (قوماش)<br>a type of reed mat or woven object | kat کەت: لە کوردیدا بە مانای (تەختی دارینی لەسەر نووستن) و بەمانای (چارۆکە) دێت (هەژار، پ.٦٤٩) کە بریتیە لە پارچەیەک قوماش کە ئافرەت بەسەر شانیا دەدات. |
| ki duru | زەویەکی تەڕ<br>damp ground | jī tar جی تەڕ: هەمان مانا دەدات. ئەوەی دڵنیای دەکاتەوە ئەوەیە کە وشەی duru لە سۆمەریدا هەمان مانای (تەڕ) دەدات لە کوردیدا. |
| ki'ešbar | جێی بڕیاردانی ئاینی<br>place of (divine) decisions | jī īšbir جی ئیشبڕ: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (جێی ئیش بڕانەوە) یان (جێی بڕیاردان لە ئیش) دەدات. وشەی eš کە لە سۆمەریدا دەردەکەوێت، هەر هەمان مانای وشەی (ئیش) ی کوردیە، لەبەر ئەوەی کە لە وشەی وەک ešgiri کە مانەی (ئیشەکەر) ی کوردی دەدات و وشەی gu éš-gàr کە مانای (گای ئیشکەر) دەدات، دەردەکەوێت. |
| ki-gal | سەکۆ<br>platform | jī kal جی کەڵ: واتە (جێی بەرز). |
| kiĝara (ki-ĝar-ra) | جێگر<br>substitute | jī gir جی گر: هەمان مانا دەدات. |
| ki.kal | گژوگیا<br>grasses | gīā kal گیاکەڵ: گیای نەویستراو |

| Sumerian | Meaning | Kurdish |
|---|---|---|
| kilib | کۆ، بڕێک؛ هەموو؛ بە گشتی؛ کۆمەڵێک<br>total, sum; (the) whole, entirety; assembly | jalab جەلەب: بەکاردێت بۆ ئاماژە کردن بە ڕەوەیەک مەڕ. دەگوترێت (ئەو جەلەبە مەڕە پێش خۆت بدە). |
| kin | هەوڵی بەدەستهێنان/دۆزینەوە<br>to seek | kina کنە: لە کوردیدا مانای (توێژینەوە، کاری زۆر بەردەوام) دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی میدیدا دەبێتە cīna کە هەمان مانای وشە سۆمەریەکەی هەیە. |
| kindar | کون، درز<br>hole, crevice | kandār کەندار: لە کوردیدا وشەی (کەندار) مانای (دادڕاوی زەوی بەهۆی ئاو کەندن) دەدات (هەژار، پ. ٦٧٠). |
| kindu | ڕێگە<br>path | kandu کەندو: واتە (کەنراو) یان (هەڵکەنراو). |
| kinkin | هاڕەر (لە تەختە دروستکراو)<br>(wooden) grinder | jinjin جن جن: (جنین) مانای (لەتکردن) دەدات و وشەی (جن جن) مانای لەتوپەت بوون دەدات. هەندێک جار لە کوردیدا دەگووترێت (لەت لەت، پارچەپارچە، بەش بەش، هەنجن هەنجن) بە هاوشێوەی زمانی سۆمەری. |
| ki-ninda-gu | شوێنی خواردنی نان<br>place to eat bread ('place' + 'bread' + 'to eat') | Jī-nan-xo جی نان خۆ: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە وەک (جێ+نان+نەخوات) و بە کوردی دەبێتە (جی/جێ+نان+خۆ). وشەی سۆمەری gu دەبێتە (خۆ) لە کوردیدا. |
| ki-nu | ژووری نووستن<br>bedroom | jī nu جی نو: لە کوردیدا (نو) دەبێتە ڕەگی (نووستن). ماناکە بە هەمووی دەبێتە (جێی نووستن). |
| ki-ná...aka | گانکردن (کردار)<br>to make love ('bed' + 'to do') | Jī nu akā جی نو ئەکا: لە فەرهەنگی سۆمەریەکدا وشەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (جێی نوستن+ کردن). لە کوردیدا دەبێتە (جی نو+ئەکا). وشەی ki سۆمەری دەبێتە (جی/جێ) لە کوردیدا و aka مانای (ئەکا) ی کوردی دەدا. بەو جۆرە ڕستەکە دەبێتە (لە شوێنی نووستن ئەیکا). |
| kir | مێیەی مەڕ<br>female lamb | kaur کەوڕ: ناوێکی ترە بۆ مەڕ و هەروەها بە مانای (بزنی سپی) دێت( هەژار، پ.٦٧٢). |
| kiri-zal | خۆشی بینین، گەشکەی خۆشی<br>joy, rejoicing | qīraī zil قیرەی زل: واتە (هاوارکردنی گەورە) . |
| ki-sur-ra | سنور، ناوچە<br>border; territory | Jī sura جی سورە: (سوڕان بە دەوری جێدا) |
| kiš, keš | گشت، تەواوی جیهانی سیاسی (ناوی شارێکی بەهێز بووە لە باکوری ناوچەی سۆمەریەکان کە سەرەتا هەموو شارەکانی | giš, gišt گش/گشت: ئەم وشەیە مانای هەموو دەگرێتەوە. پاشای kiš لە ناو سۆمەریەکاندا بە گەورەترین پاشای ناوچەی سۆمەریەکان ناسراوە و ئەو ناوەی پێ دراوە. لەگەڵ ناوی پاشاکەدا وشەی kiš بەکارهاتووە، ئەویش لەبەر ئەوەی کە گەورەترین پاشا |

| | | |
|---|---|---|
| | بەیەکەوە بەست و پارێزگاری شارەکانی تری سۆمەری کرد)<br>totality, entire political world (name of the powerful city in the north of Sumer that first bound together and defended the cities of Sumer) | و پاشای گش/گشت بووە. |
| kiši | نهێنی<br>secret | gizi گزی: مانای (فێڵ) دەدات. |
| ki-šub-ba | زەوی بەفیڕۆدراو<br>waste ground | jī šub جی شوب: (شۆب) لە کوردیدا بە مانای جێ پێ دێت لەسەر زەوی (هەژار، پ.٦٧٥). مانای وشەکە بەو جۆرە دەبێتە (جێی پێ) یان (جێی هاتووچۆ) واتا زەوییەک کە بۆ کشتوکاڵ بەکارنەیەت و لە ڕوانگەیەکی کشتوکاڵیەوە، ئەو زەویە بەفیڕۆ چووە. |
| kišur | قەبر؛ چاڵ<br>grave; hole | jī šor, jī žur جی شۆڕ، جی ژوور: (جێ شۆڕ) مانای (جێی خوارەوە) دەدات و (جێ ژوور) مانای (شوێنی ژور) دەدات. |
| kišuš | نۆتەی مۆسیقا<br>notation | keš کێش: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای ڕیدم (ئیقاع) ی هەیە، بەڵام بە مەبەستی وەسفی ڕەوتی شیعر بەکاردەهێنرێت. |
| kitum (ki-tum) | قەبر، قەبرسان | je toma جێ تۆمە: وشەی (تۆمە) لە کوردیدا بە مانای (ڕەچەڵەک) دێت (هەژار، پ.١٥٦) و وشەکە بە هەمووی بە مانای (جێی ڕەچەڵەک، جێی باوباپیران) دێت. |
| Kituš (ki-tuš) | شوێنی گوزەران<br>dwelling place | je toša جێ تۆشە: وشەی (تۆشە) لە کوردیدا بە مانای (خواردن، زەوا) دێت و بە هەمووی دەبێتە (جێی خۆراک) |
| ki ulutim | شوێنی دروستبوون<br>of creation | je halātin جێ هەڵاتن: جێی هەڵهاتن. (هەڵهاتن) بە مانای (هەڵاتنی هێلکەیەک ،دەرکەوتنی شتێک، بەرزبوونەوەی خۆر) دێت. |
| ki'utu | شوێنێکی ئاینی<br>a cultic location | je hatāu جێ هەتاو: ناوی utu/tau و لەلایەن سۆمەری و هێتیەوە بەکارهاتووە بۆ خوای ڕۆژ، کە خوای عەدالەتیش بووە، کە لەگەڵ وشەی (هەتاو) ی کوردیدا یەکن. مانای وشەکە دەبێتە (جێی هەتاو). |
| kizer | شێوەی دانانی قژ<br>hairstyle | qižar ، qiž , قژ، قژار: وشەی (قژ) کە مانای پرچی هەیە لە وشە سۆمەریەکەدا بەدی دەکرێت و (قژار، قژن) بە کەسێک دەڵێن کە قژی زۆر بێت. |

| | | |
|---|---|---|
| ku | پاڵ کەوتن<br>to lie down | kau کەو: لە کوردیدا دەگووترێت (بۆ خۆی لەویا کەو/کەوتووە) مانای لەویادا پاڵکەتووە و وشەکە وەک خۆی ماوە. |
| kubulum | خۆراک<br>foodstuff | qibulī قبولی: جۆرێکە لە برنجی کولاو. |
| KU | پتەوکردن<br>to strengthen | ko کۆ: مانای (شت پێکەوە دانان، شاخ، کۆبوونەوەی خەڵک، کۆ ) دێت. |
| kud | لێک جیاکردنەوە، لێکردنەوە، برین، لەتکردن.<br>to separate, cut off; to cut | kut کوت: مانای (پارچە) دەدات و وەک فەرمان (کوت کوت کردن) مانای (پارچەپارچە/لەتکردن) دەدات. ئەمە بناغەی وشەی cut ی ئینگلیزیە کە مانای (برین، پارچە) دەدات و هەروەها وشەی quota مانای بەش دەدات لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا. لە ئیسپانیدا بووەتە cuota. |
| kuerin | جۆرێکە لە خواردن<br>type of food | xuārin خوارن: هەمان مانای (خواردن) ی هەیە. |
| kug | کانزا، زیو؛ پرشنگداربوون<br>metal, silver; (to be) bright, | kuk کوک: لە کوردیدا مانای (بەنرخ و بایی دار) ی هەیە (هەژار، پ.٦٣٧). |
| kug diri | ئەو زیادەی کە دەبێت (فائض)<br>surplus | kukdarī کوکدەری: (کوک) لەسەرەوە باسکراوە و (دەر) مانای (دەرەوە، جگە) دەدات. بە هەردوو وشەکە مانای هەبوونی شتی بەنرخی زیادە دەدەن. |
| kug du | پارەی سەرانە<br>ransom money | kukdā کوکدا: واتە (پارە/نرخی دا) (بڕوانە لێکدانەوەی kug). |
| kug dun | قازانج<br>profit | kukdān کوکدان: واتە (نرخ و بەها پێدان) |
| kug ĝal | پیرۆز<br>holy | kuk kal کوک کەڵ: واتە (بەنرخ و پایەدار) (بڕوانە وشەی ڕابردوو) |
| kug la | شایەنێکە بۆ کێشانی زیو<br>silver weigher | kuklā کوکلا: واتە (نرخی هەر لایەک) |
| kug zu | ژیر و زانا<br>wise | kukzā کوکزا: وشەی zu لە سۆمەریدا مانای (زانین) دەدات ولە کوردیدا ڕەگەکەی دەبێتە (زا،زان). ماناکەی دەبێتە (زانینی بەنرخ). (بڕوانە وشەی zu ). |
| kul | قاپ، دەفر<br>bowl | kol کۆڵ: ماناکەی دەبێتە (ئاوە خۆرەی ئاژەڵ لە دار یان لە بەرد و قوڕ، تەشتی دارینی زۆر زلی هەویر لای نانەوا) (هەژار، پ.٦٣٨ ). |
| kul | دەسک (قوڵ)<br>a handle | qol قوڵ: بۆ نموونە (قوڵی ئەو مەکینەیە کورتە) کە مەبەست لە دەسکەکەیەتی. |
| kul | قورس<br>heavy | kol کۆڵ: بۆ نموونە دەگووترێت (یەک کۆڵ شتم بۆ هێناویت) کە لەوێدا مانای (قورسی) و مانای (کۆڵەپشت) دەدات. |
| kul | ژمە خۆراک | kul کوڵ: دەبێتە ڕەگی وشەی (کوڵان) کە مانای |

| Sumerian | واتا / Meaning | تێبینی |
|---|---|---|
| | meal | خۆراک پێگەیشتن دەدات. |
| kul | ڕوەکێکە<br>a plant | kul کوڵ: ناوی گیایەکی دەشتە کە دەخورێت هەروەها مانای (پلوسکی گەنم لە ئاسیاوا) دەدات (هەژار، پ.٦٣٨). |
| kul | پێگەییو لە ڕووی سێکسیەوە<br>sexually mature | kal کەڵ: هەمان مانا دەدات، لە کوردیدا دەگووترێت (ئەو گایە/مانگایە کەڵبووە). |
| kuli | یەکەیەکی پێوانەی شلەمەنیە<br>unit of liquid measuremen | kol کۆڵ: پێوانەی دەخڵە لەدار دروستکراوە و نزیکەی شانزە کیلۆ دەبات (هەژار، پ.٦٣٨). |
| kullum | ئاشپەز (خواردن دروستکەر)<br>cook | kulā کوڵا: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی وشەی (کوڵاندن) و سەرنج دەدرێت کە وەک پێکهاتەی وشە سۆمەریەکە دەردەکەوێت. |
| kun | کون (دەرچەی جۆگە)<br>outlet (of a canal) | kun کون: هەمان مانای ماوە. |
| ku-nu | بوون لەتەک/لەنزیک<br>to be near | kin کن: هەمان مانای (لەتەک) دەدات. لە زمانی هیتیدا دەبێتە kan. |
| kur | سواتاندن و گڕتێبەردان<br>to burn, light up | kura کورە: مانای (کورەی گڵی خشت سورکردنەوە) دەدات و موشەدەمەی ئاسنەگەریش هەمان ناوی هەیە. |
| kur | جیاوازبوون؛ نامۆبوون؛ گۆڕان<br>(to be) different; (to be) strange; to change | gor گۆڕ: دەبێتە ڕەگی وشەی (گۆڕان) کە هەمان مانا دەدات. |
| KUr | ڕەوە (کۆمەڵێک)<br>herd | kor کۆڕ: کۆبوونەوەی خەڵک لە جێگایەکدا. |
| kur | جیهانی ژێرەوە<br>netherworld | gor گۆڕ: مانای (قەبر) دەدات. |
| kur | شاخ<br>mountain | kur کوڕ: مانای (بەرزایی کێو، کێوی بڵند) دەدات(هەژار، پ.٦٣٨). هەروەها لە زمانی هوریشدا پێی دەگووترێت kor. هەتاوەکو ئەمڕۆ هەندێک لە شاخەکانی کوردستان ئەو وشەیە پێکهاتەی ناوەکانیانە بۆ نموونە (کوڕە کاژاو) کە مانای (شاخی بەرزی کاژاو) دەدات. لە ئاڤێستادا دەبێتە giri. |
| kura | ناوێکە بۆ کەلوپەلی چنین<br>a designation of looms | kurka کورکە: بە مانای توک، بەتایبەتی توکی ئاژەڵ دێت (هەژار، پ.٦٣٠). |
| kurĝara | نمایشکەرێکی ئاینی<br>a cultic performer | korgar کۆڕگەر: ئەو کەسەی کە کۆڕ بەڕێوە دەبات. |
| kurku | پیاوێکی ئاینی پاکەرەوە لە گوناح<br>a purification priest | korko کۆڕکۆ: ئەو کەسەی کە خەڵک کۆ دەکاتەوە لە خۆی. |

| | | |
|---|---|---|
| kirkir | باڵندەیەکە<br>a bird | kurkur کورکور: بە کوردی باڵندەی قەتییە و بە باڵندەیەکی ڕاوکەری هاوشێوەی هەڵۆش دەگوترێت (کورکورە) (هەژار، پ.٦٣٠). |
| kur-gal | شاخی مەزن<br>great mountain | kur kal کور کەڵ: هەمان مانا دەدات. لە بەر ئەوەی وشەی kur لە سۆمەریدا مانای (شاخ) دەدات و لە کوردیدا (کور) مانای (بەرزایی کێو، کێوی بڵند) دەدات. وشەی کەڵ لە کوردیدا مانای (مەزن) دەدات و هەمان مانای وشەی (gal) دەدات لە سۆمەریدا و وشەکە لە کوردیدا دەبێتە (کورکەڵ، کێوکەڵ، شاخکەڵ). |
| kurun | بیرە<br>beer | xurān خوران: وشەی (خورانەوە) کە مانای (خواردنەوە) دەدات بە مانای خواردنەوەی ئەلکهولی بەکار دەهێنرێت. هەروەها بە زمانی هوری، ئەو پەرداخەی کە لە شاخی ئاژەڵ دروست دەکرێت بۆ خواردنەوە، پێی دەگووترێت xúruwwi و بە زمانی هیتی بە (کرداری خواردنەوە) دەڵێن aku. |
| kuš | ڕوخاندن، وێرانکردن<br>devastation | kuš کوش: دەبێتە ڕەگی کرداری (کوشتن، کوشتار). |
| kuš | پێست<br>skin | kāž کاژ: هەمان مانای هەیە. بە زمانی هوری پێی دەڵێن asxi. |
| kušer | قازانج<br>profit | kosar کۆسەر: واتە (ئەوەی کۆ دەبێتەوە لەسەری) کە پرنسیپی قازانجە. |
| kušu | قرژاڵ یان کیسەڵێکی قەوچەکەر<br>crab or a snapping turtle | kīso کیسۆ: ناوێکی ترە بۆ (کیسەڵ) (هەژار. پ.٦٧٧). |
| kušu | ماندوو بوون، تووشی کێشە هاتن<br>(to be) tired, troubled | keša, keš کێشە، کێش: (کێشە) مانای (موشکیلە) ی هەیە و (کێش) مانای (توانا و هێز) ی هەیە بۆ نموونە دەگووترێت (کێشم نیە ئەم کارە بکەم) (هەژار، پ.٦٧٧)، هەروەها (کێشان) مانای (هەڵگرتنی ناخۆشی و کێشەی زۆر) دەدات. |
| kušum | هاوارکردن و شینکردن<br>to cry (out), wail | qīža قیژە: هەمان مانای هەیە. |
| la | قەرز، بڕی قەرزاری<br>debt, owed amount | lā لا: ماناکەی وەک خۆی ماوە بۆ نموونە دەگووترێ (شەش هەزارم لایە). |
| la | لاخراو<br>suspend | lā لا: ئەم وشەیە خۆی بەتەنها مانای (لابردن)ی هەیە و پێکهاتەی زۆر وشەی ترە. بۆ نموونە (لاخراو، لاخستن، لادان، لاچوون) ی هەیە. بە زمانی لوفی و هیتی-ش هەر دەبێتە la. |
| la | سامان؛ تەڕوبڕی گەنجی و جوانی<br>wealth ;youthful freshness and beauty | lāu لاو: مانای (گەنج) دەدات. دیارە لەو سەردەمەدا مانای (سامان) یشی هەبووە. ئەوەی جێی سەرنجە ئەمڕۆ وشەی (گەنج) بە هەمان شێوە، ماناکانی (لاوێتی، سامان) دەدات. کە لە بنەڕەتدا میدیە و ئەو |

| | | |
|---|---|---|
| | | سەردەمە مانای (خشل و زێڕ) ی داوە. |
| lah | لێدان<br>to beat | لێیە leīa: ڕەگە بۆ وشەی (لێیان/لێدان). |
| lá-ìa | پاشماوەی قەرز کە ماوە، قەرز<br>remainder of debt left over, arrears | لایە lā īa: هیچ نەگۆڕاوە. ئەمڕۆ دەگووترێت (ئەو پیاوە هەزار دیناری لایە). |
| lál | ئەو بەشە بازنەییەی گوریس کە ڕەشەوڵاخی پێ دەگیرێت، بەشە بازنەییەکەی داو یان پەتی هەڵواسین<br>noose, lasso | لول lul: لە کوردیدا ئاماژەیە بە بازنەیی وایەر، تەل، قژ یان هەر شتێکی هاوشێوەیان. |
| la'u | ئەو شتەی کە زیاد ماوە (فائض)، قەرز<br>arrears; surplus | لا ئەو، لاو[66] lā au, lāā'u: (لای ئەو) دەگرێتەوە و مەبەستی قەرز دەدات. هەروەها (لاو/لادراو) واتە ئەو شتەی کە لادراوە و مەبەستی زیادە دەگرێتەوە. |
| lib | چەوری مەڕ<br>sheep fat | لەبە laba: چەوریەکە دەکەوێتە خواروی پەراسوی گۆشتی مەڕەوە و زیاتر دەکرێتە کەباب. ماناکەی نەگۆڕاوە. |
| libir | کۆن بوون، مانەوە بۆ ماوەی درێژ<br>(to be) old, long-lasting | لەبیر labīr: واتە (لە یادەوریدا). |
| ligiligi | گیایەکە<br>a grass | لقلقی liqliqī: دەبێتە وەسفی گیا، لەبەر ئەوەی وشەکە مانای (پەل پەل) دەگەیەنێت. |
| ligima | لق و پۆپ و درەختی لاو<br>shoot, sapling | لق liq: مانای (پەلی درەخت) دەدات. |
| lil | کەسێکی حەپۆل<br>moron | لاڵ lāl: ئاماژەیە بۆ کەسێک کە نەتوانێت قسە بکات. ئەم وشەیە لە زمانی هیتیدا بەشێوەی lala نووسراوە و مانای (شێوەیەک لە قسەکردن، قسەکردنێکی بەزیان) دەدات. |
| lu | ئەو کەسەی کە، ئەوەی کە، پیاو، کەس<br>(s)he who, that which; man; person | لۆ lo: لە کوردیدا (لۆ) مانای (کابرا، فلانەکەس) دەگرێتەوە (هەژار، پ.٧٦٠) کە وەک خۆیەتی. ئەم وشەیە لە زمانی ئیتاڵیدا دەردەکەوێت بەشێوەی lui، فەرەنسی lui و لە ئیسپانیدا él بە مانای ئاماژەکردنێکی گشتی بۆ نێرینە. |
| lu | لە<br>of | لە la: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. |

66. (لاو) بە کوردی نووسینی زۆر گرانە لەبەر ئەوەی دوو پیتی (ا) پێویست دەکات بۆیە بەو شێوەیە نووسرا.

| | | |
|---|---|---|
| lu | هەڵە<br>false | hala هەڵە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. |
| lu gal | پاشا<br>king<br>(lú, 'grown man', + gal, 'big') | lo kal لۆ کەڵ : وەک لە شیکردنەوەی وشە سۆمەرییەکدا دەردەکەوێت، وشەکە لە دوو بەش پێک دێت، (lú+ gal) و لە سۆمەریدا مانای (پیاو+گەورە) دەدات و لە کوردیدا (لۆ) مانای (کابرا/پیاو، فلانەکەس) دەدات (هەژار، پ.٧٦٠) و (کەڵ) مانای (مەزن) دەدات. وشەکە بە کوردی ئەمڕۆ هەر ماناکەی دەبێتە (پیاوی مەزن، کەسی گەورە). ئەم وشەیە لە زمانی لوڤیشدا هەر هەمان مانای هەیە. |
| lu gal ene | پاشاکان<br>kings | lo kal an لۆ کەڵان: دەبینرێت سۆمەری بەهۆی پاشگری ene وشەکەی کردۆتە کۆ، کە لە کوردیدا (ان) بەکاردێت. |
| lu bala | ئەو پیاوەی کە تەشی دەرێسێت (ئەوەی کە بە دەزوو خولانەوە پەت/بەن دروست دەکات)<br>man of spindle<br>('man' + 'spindle') | lo biālā لۆ بئاڵا: وشەکە (لۆ+ بئاڵا) لە کوردیدا (لۆ) مانای (کابرا/پیاو) دەدات و (بئاڵا) مانای (ئالاندن). بەو جۆرە وشەکە بە کوردی ماناکەی دەبێتە (کەسێک کە شت بە یەکدا دەئاڵێنێت). |
| lubuštum | جلوبەرگ<br>clothing | lo poštu لۆ پۆشتو: (پۆشین) مانای (جل لەبەرکردن) دەدات و (پۆشتە) ماناکەی بە کوردی دەبێتە (جلوبەرگی تازە). وشەکە دەبێتە (لۆ پۆشتە) کە مانای (جلوبەرگی پیاو/مرۆڤ) دەدات. |
| lug | بادان و نوشتانەوە<br>to twist | laq لەق: ڕەگی (لەقینە) کە مانای لادان و جوڵانەوەی هەیە و ماناکەی نزیکە. لە زمانی هیتیدا lagan مانای (لەقان) ی کوردی هەیە و lak واتای (دانکەوتن، لەقینی دان) ی هەیە بە هەمان مانای زمانی کوردی ئەمڕۆ. |
| luhuĝa | کەسێ کاری لاوەکی بکات<br>hireling | lāuakī لاوەکی: مانای (هەر شتێکی لاوەکی) دەدات. |
| lu'IM | تاوانبار؛ ناپاک، ساختەچی<br>criminal; false, fraudulent | laīm لەیم: ئەم وشەیە مانای (پیس، چەپەڵ، کرێشاوی) دەدات و لە ڕووی کاراکتەری مرۆڤیشەوە ئاماژەیە بۆ کەسێکی نادروست و ناپاک (هەژار، پ.٧٧٩). |
| ludubĝara (lu-dub-ĝar-ra) | ڕاوکەر<br>hunter | lodāugara لۆ داوگەرە: وشەی dub هەمان مانای (داو) دەدات و وشەی (گەر) وەک پاشگری پیشە لە ناو سۆمەرییەکاندا بەکاردێت. بەو جۆرە وشەکە هەمووی دەبێتە (لۆ داوگەرە)، کە مانای (پیاو/کابرای داوگەر) دەدات. |
| lukeškešda | ئەو کەسەی کە بە گوریس ئاژەڵ دەبەستێتەوە<br>tetherer | lokešakešdā لۆ کێشەکێشدا: وشەی (لۆ) لە کوردیدا دەبێتە (پیاو/کابرا، کەس) و وشەی (کێش) لە سۆمەری و کوردیدا مانای ڕاکێشان دەدا. وشەکە |

| Sumerian | Meaning | Commentary |
|---|---|---|
| | | دمبێته (لۆ کێشەکێشده)، واته (ئەو پیاوەی که ڕاکێش ڕاکێش دەکات). |
| lukud | کەسێ که نەتوانێت به تەواوی بڕوات یان بجوڵێت بەهۆی کەمئەندامی یان برینداریەوە<br>cripple | lokaut لۆ کەوت: واته (کابرایەک/کەسێکی کەوتوو). |
| lum | هەور<br>cloud | halim هەڵم: مانای بۆخ دەدات. |
| lumagalgal (lu-ma-gal-gal) | پیاوی بەلەم گێڕ<br>boatman | lomakalkal لۆ ما کەڵ کەڵەک: وشەکه پێک دێت له [لۆ +ما+کەڵ+کەڵ] واته (کەڵه پیاوی ئاو). له زمانی سۆمەریدا (ما) به مانای (ئاو) بەکارهاتووە ، بەڵام وشەی (ما) ی سۆمەری به مانای (ئاو)، له کوردیدا نەماوە. |
| lu-sahar-šub-ba | کەسێ که نەخۆشی گولی هەیه<br>leper | lo sahar šuba لۆ سەحەر شوبە: وشەکه پێک هاتووە له (لۆ+سەحەر+ شوبە) (لۆ) مانای (کەس،کابرا) دەدات. (سەحەر) مانای چۆڵایی دەدات و وشەی (شوب) له کوردیدا نەماوە ماناکەی له سۆمەریدا دمبێته (فڕێدراو). وشەکه هەمووی دمبێته (کەسێکی له چۆڵایی دانراو) لەبەرئەوەی له ڕابردوودا کەسانێک که نەخۆشی گولیان هەبووە له شار دوور خراونەتەوە بۆ ئەوەی کەسانی تر نەخۆشیەکه نەگرن. |
| lu-sig-ga | کەسێکی لاواز<br>weak person | lažig لاژگ: (به کەسێکی بێدەسەڵات و گێژ) دەوترێت. |
| lu-sur-ra | ئەو کەسەی که پەت (بەن) ئەخولێنێتەوە<br>spinner | lo sura لۆ سوڕە: (لۆسوڕە) دمبێته (کەس/کابرای سوڕاندن). |
| lu$_2$-še-il$_2$-keš$_2$ | زەوی پێو (مەساح)<br>surveyor | lo šeua hel keš لۆ شێوە هێلکێش: واته (کەسێ له شێوە هێڵ دەکێشێت) |
| ma-eĝir | ئەو دارەی که له پشتی بەلەمدا ئاڕاستەی پێ دەکرێت (سوکان)<br>stern (lit. boat back)" | ma ager ما ئەگێڕ: واته (ئەوەی که به ئاودا ئەیگێڕێت) |
| mah | مەزنی<br>to be greate | māh ماه: ئەم وشەیه ئەمڕۆ له زمانی کوریدیا نەماوە بەڵام له زمانی پەهلەویدا ماوە و دمبێته meh. ئەم ناوە یەکێکه لەو ناوانەی که له سەردەمی هاتنی موسوڵمانەکاندا ناوچەی میدیەکانی پێی ناسراوە، له کاتێکدا ئاشوریەکان پێیان گووتوون مادا، له ژێر کاریگەری زمانی پەهلەوی، له سەردەمی ئیسلامدا به ناوچەی میدەکان گووتراوە (ماه). |
| mah-di | هەڵکەوتوو، پایەبەرز | mādī مادی: ئەمه ناوێکی تر بوو که درابوو به |

| | | |
|---|---|---|
| | exalted, prominent | میللەتی میدەکان و لەلایەن ئاشوریەکانەوە بەکار دەهات. ئاشوریەکان بەزمانی خۆشیان بە میدەکانیان دەگووت (بەهێزەکان) (بڕوانە بەشی میدەکان). هەر ئەم وشەیەشە عەرەبەکان وەریان گرتووە و کردویانەتە (مهدی). |
| ma-a-lu | جۆرێکە لە دەربڕینی کتوپڕ سەبارەت بە ڕاچڵەکاندن، ئازار یان بارێکی دەروونی.<br>an exclamation | mālu/māl, mālita ماڵو/ماڵ، ماڵتە: لە کوردیدا بە دوو جۆربەکار دێت (ماڵو/ماڵت بە قوڕ گیرێت) یان دەگووترێت (ماڵتە). |
| mana | یەکەیەکی کێشە<br>a unit of weight | man مەن: لە کوردیدا یەکەیەکی کێشەیە کە نزیکی سێ کیلۆیە. پەندێکی کوردی دەڵێت (بە حوشتریان گووت کچت بوو، حوشتریش گووتی کە من بارم چل مەن بێت، چ نێر بێت چ مێ). واتە کە من بارم چل مەن قورس بێت، کوڕ یان کچ هیچ جیاوازی نیە. ئەم یەکەیە هەتاوەکو پەنجاو شەستەکانی سەدەی ڕابردووش لە کوردستاندا بەکارهاتووە. |
| mar | کێچ، کرم؛ زیندەوەری مشەخۆر<br>louse; worm; parasite | mār, meru مار: لە کوردیدا وشەی (مێروو) مانای (حەشەرات) دەدات و (مارومێروو) هەموو گیاندارە زیانبەخشەکان دەگرێتەوە جگە لەوەی کە وشەی (مار) ئاماژەیە بە گیاندارە خشۆکەکە. |
| massu | سەرکردە<br>leader | mas, mazin مەس، مەزن: مانای (مەزن) دەدەن (هەژار، پ.٨٢٩) . لە زمانی میدیدا masa مانای (مەزن، گەورە) دەدات و لە زمانی لوڤیدا mashana مانای (مەزنکردن) دەدات و masa مانای (خوادا) دەدات. لە ئاڤێستادا دەبێتە masan کە هەمان مانای وشە میدی و کوردیەکەی هەیە. ئەم وشەیە چووەتە زمانی ئینگلیزیەوە بە شێوەی mass کە مانای ژمارەی زۆری خەڵک یان شت دەدات و لە لاتینیدا دەبێتە missa. |
| maz | ئاوسان، دڵخۆشی<br>to swell, rejoice | mas, mās مەس، ماس: وشەی (ماس) لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (ماسین) کە مانای ئاوسانی هەیە و (مەس/مەست) مانای سەرخۆشی هەیە، بەڵام وشەی (مەس) زیاتر مانایەکی ڕۆحی هەیە وەک لە سەرخۆش و هەندێک باری ڕۆحی خۆش هەر بە وشەی (مەس) دەردەبڕێت. دەگووترێت (ئەو دوو چاوە مەسی/مەستی کردم). |
| me | بوون، مان<br>being | me/mā مێ/ما: دەبێتە ڕەگی وشەی (مان). بۆ نموونە (ئەمێنێ، مام، بمێنە). لە هوریدا دەبێتە man کە دیسان لە کوردی و سۆمەریەوە نزیکە و هەردووکیان لە کوردیدا ماون. لە زمانی لاتینیدا (کرداری مانەوە) |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەبێتە maneo و لە یۆنانایدا (مانەوە لە شوێندا) دەبێتە meno. |
| me'am | دەستەواژەیەکی نیشاندانی خۆشەویستی، گیانە<br>term of endearment, dear | mām مام: بە هەمان مانا بەکاردەهێنرێت و بە شێوەی (مام، مامە) بەکاردەهێنرێت و دەخرێتە پێش ناوەوە. زۆر کەسایەتی کورد، ئەو ناوە خراوەتە پاڵ ناوەکەیان و لە ژیانی ڕۆژانەشدا زۆر بەکاردەهێنرێت. |
| meli | مل<br>nick | mil مل: ئەم وشەیە نەگۆڕاوە، بەڵام ئەوەی کە جێی سەرنجە لە فەرهەنگی هیتی- ئینگلیزیدا، سەبارەت بە وشەی mill دەڵێت (ئەمە لە زمانی هیتیدا ناوی بەشێکی لەشە دەکەوێتە نێوان سەر و شانەوە). دیارە هەتاوەکو ئەمڕۆ ماناکەیان بە تەواوی بۆ ڕوون نەبۆتەوە. ئەمە ئەو ڕاستیە دووپات دەکاتەوە، کە لە داهاتوودا زمانی کوردی دەبێتە بناغەی شیکردنەوەی زمانە کۆنەکان و شارستانیەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەراست. |
| men | من، خۆم<br>I, myself | min من: لە کوردیدا وەک خۆیەتی. ئەم وشەیە بە شێوەی جیاواز لە هەموو زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا دەردەکەوێت. بە کرواتی mene، لیتوانی man، ئینگلیزی me، فەرەنسی moi، هتد. |
| menamenam | بۆ هەتایی<br>ever | min amenim من ئەمێنم: واتە (هەتاوەکو مردنم). |
| mes | پاڵەوان؛ پیاوبوون<br>hero; (to be) manly | mas, mazin مەس، مەزن: (مەس) لە کوردیدا مانای (مەزن) دەدات ( هەژار، پ.٨٢٩) . لە زمانی میدیدا masa مانای (مەزن، گەورە) دەدات، لە لوڤیدا mashana مانای (مەزنکردن) و masa مانای (خوادا). لە ئاڤێستادا دەبێتە mas, masan کە هەمان مانای وشە میدی و کوردیەکەیان هەیە. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بە شێوەی mass دەردەکەوێت بە مانای (ژمارەی زۆری خەڵک، شت) و لە لاتیندا بەشێوەکانی missa ,massa. |
| mes | ڕەشی، خاڵی ڕەش<br>blackness, black spot | meš مێش: ئەم وشەیە لە کوردیدا بووەتە (مێش) کە ئاماژەیە بە مێروویەکی ڕەشی باڵدار. هەروەها وشەکە لە ناو وشەی (خۆڵەمێشی، مشکی، مەشکە، گامێش، مشک ) دا وەک خۆی ماوە. وا دەردەکەوێت کە وشەی (خۆڵە مێش) ی کوردی مانای (خۆڵی ڕەش) بێت. هەروەها ئاژەڵی (گامێش) کە جۆرێکە لە گا، ڕەنگی هەمیشە ڕەشە و لەوە دەچێت ناوەکە بگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دێرین. لەبەر ئەوەی کە ناوەکە پێک دێت لە (گا+ مێش)؛ بەو شێوەیە ناوە کوردیەکە دەبێتە (-ga meš) و لە سۆمەریدا دەبێتە (gu-mes) کە مانای (گای ڕەش) دەدات.<br>پێ دەچێت هەر ئەو ڕەنگە بێت کە بووەتە بناغەی |

| Sumerian | Meaning | Notes |
|---|---|---|
| | | ناوی (مشک، مشکی، مەشکە)، دوایی چووەتە زمانە ئەوروپییەکانەوە و لە ئینگلیزیدا (مشک/موش) بووەتە (مایس mice) و لە فەرەنسیدا (مێش) بووەتە mouche. شایانی باسە لە فەرەنسیدا هەمان وشە بۆ مێرووەکە و بۆ خاڵی ڕەشی دروستکراوی سەر گۆنا بەکاردێت، کە ئەوەش دیسان پشتگیری لەو بۆچوونە دەکات. هەروەها بە زمانی هیتی بە (مشک/موش) دەگووترێت mašḫuil و بە کولە دەگوترێت maša. ئەمانە هەمووی نزیکی ئەم زمانانە نیشان دەدەن. |
| mí, mu | مێ<br>female | me مێ: هەمان مانای هەیە و بە زمانی سانسکریت دەبێتە mahilA. |
| mir | توڕەبوون؛ توڕەیی، توڕەبوونی زۆر<br>(to be) angry; anger, rage | mir, mora مڕ، مۆڕە: لە کوردیدا دەگووترێت (مڕ و مۆچ) واتە (ڕو گرژ). هەروەها (مڕ) مانای بۆڵەی سەگ دەدات لە کاتی گرژبوونیدا (هەژار، پ.٨٠٢). وشەی (مۆڕە ) خۆی مانای (سەیکردنی بە توڕەیی) دەدات. |
| mir | مار<br>snake | mār مار: وەک خۆی ماوە. |
| mu | my, mine<br>هی من | m م: (م) ڕاناوێکە بۆ موڵکایەتیکردنی کەسی یەکەمی تاک. لە کوردیدا دەگووترێت (ماڵم نیە) لە هیتیدا دەبێتە ma. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە my و لە فەرەنسیدا دەبێتە ma. |
| mu | دارێژراو، جوان؛ خڕوپڕ، قەڵەوکراو<br>well-formed, beautiful; plump, fattened | māha ماهە: نوسینی ئەم وشەیە لە کوردیدا کەمێک گرانە. وشەکە لە کوردیدا وەسفێکە بۆ پان و پۆڕی کە لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا هەتاوەکو ئەم دواییەش جۆرێکە لە جوانی لەشولاری ئافرەت. لە بنەڕەتدا (ماهە) ئەو شتەیە کە نانی لەسەر دادەنێن و دەیدەن بە تەنورەوە، کە لە شێوەدا خەپلەیی و پانە و کەسێک تۆزێک پان بێت پێی دەڵێن (ئەڵێی ماهەی). |
| mubeš | لەبەر ئەوە، کەواتە<br>therefore | mabas مەبەس: لە کوردیدا مانای (نیاز لە قسە و کار، لەبەر ئەوە، کەواتە) دەدات. |
| mùl | مێروویەکی زیانبەخشە<br>a destructive insect<br>(mù,'to mill, grind', + ul, 'flower, bud') | mila مڵە: مێروویەکی زیانبەخشە، ڕەگی ڕووەک دەخوات. ناوەکەی لە ئینگلیزیشدا هەر نزیکە و دەبێتە Mole cricket. |
| mur | خۆراکی ڕەشەولاخ، قەڵەوبوون<br>fodder; (to be) fat | mir, murin مڕ ,مورین: (مڕ) لە کوردیدا مانای (زۆر تێر) ی هەیە. (مورین) بەری دەموکانە. (دەموکانە) خۆی پنجەدارێکە وەک کوان لە دار مازو دەردەچێ (هەژار، پ. ٨١٧ و ٢٩٧). |
| murgu | وێنەکێشان، دارشتن (دیزاین)<br>to draw, design | mor مۆر: مۆر بریتیە لە شێوە یان ناوێک کە لەسەر کانزا/تەختە/لاستیک هەڵدەکەنرێ بۆ مەبەستی مۆرکردن. |

| | | |
|---|---|---|
| murgu | خۆراکی ڕەشەوڵاخ و گیانداری تر<br>fodder | merg مێرگ: شوێنی لەوەڕی ئاژەڵ. |
| murmara | دەنگێکی گڕو بەردەوام کە مرۆڤ دەیکات<br>rumble | miramir مرمەر: ئەم وشەیە بۆ (بۆڵەبۆڵکردن) بەکاردەهێنرێت هەروەها بریتیشە لەو دەنگە گڕە قوڵەی کە سەگ و پشیلە دەیکەن. لە ئینگلیزیدا دەبێتە murmur، فەرەنسی murmure، کرواتی mrmor، ئیسپانی murmullo ، پورتوگالی murmúrio، هتد. |
| muš | مێرویەکی گازگر<br>a biting insect | meš مێش: مێرویەکی زیانبەخشی باڵدارە کە هەندێک جار گازیش دەگرێت. هیتیەکان بە مێرویەکی زیانبەخش دەڵێن mišāri کە دەشێت هەردوو وشەکە ئاماژە بێت بۆ (مێش). لە فەرەنسیدا دەبێتە mouche. |
| nab | مۆسیقاژەن<br>musician | nauā, nāī نەوا، نای: (نەوا) مانای (دەنگ و ئاوازی) هەیە و (نای) مانای (شمشاڵ). |
| nadeg | ئامۆژگاری<br>advice | nutiq نوتق: بریتیە لە قسەکردن بە دەنگی بەرز بۆ خەڵک. دەگووترێت (حاکم هات و نوتقی کرد) (هەژار، پ.٨٧١). |
| nam kud | نەفرەت کردن<br>to curse | nām kaut/nāu kaut ناوکەوت/نامکەوت: لە کوردیدا (ناوبڕاو) مانای (لەبیرکراو) دەدات. دەشێت (ناوکەتن) یش بەو مەبەستە بەکار هاتبێت. یاخود مەبەست لە حاڵەتی (ناوک کەوتن) بێت، کە حاڵەتێکە مرۆڤ هەست بە نارەحەتی دەکات و بۆ چارەسەرکردنی دەبێت ناوکی بگیرێتەوە. بۆ نەفرەتکردن یان گاڵتە کردن بە کەسێکی ترسنۆک دەوترێت ( دەی ناوکت کەوێ). |
| nam | چارەنوس، نیشانە؛ نوسینگە؛ ناوچە؛ زۆربەی جار وەک پێشگرێکی ئەبستراکتی یان ناوێکی گشتی بەکار دێت؛ بۆ نموونە nam-lugal کە مانای (پاشایەتی) دەدات یان nam-maḫ کە مانای (گەورەیی) دەدات.<br>destiny, sign; office; province; used mainly as a prefix to form abstract or collective nouns, such as nam-lugal, 'kingship' or nam-maḫ, 'greatness' | nām/nāma نامە/نام: لە کوردیدا (نامە) مانای شتێکی نوسراوی هەیە. هەروەها وەک وشەی هاندان و لەبری(دەی) بەکاردەهێنرێت و دەگووترێت (نامە ڕاکەن بگەنێ) هەروەها بە مانای (دەنگ و باسی نوسراوی کتێب) دێت (هەژار، پ.٨٥٧). بە مانای (ناوی کەسێک) یش بەکاردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| namarad | کۆیلایەتی<br>slavery | nāmirād نامراد: (نامراد) ناکام دەگرێتەوە. بەوجۆرە کۆیلایەتی لەگەڵ سروشتی مانای وشەکەدا دەگونجێت. |
| nam-ensi | نوسینگەی دەسەڵاتدار<br>Office of ruler | nāma-anusī/nāmanusī نامەئەنوسی/نامەنوسی: واتە (شوێنی نامە نوسین) |
| nam tar | فەرماندانی چارەنووسین<br>to decree fate | nāma cāra نامەچارە: واتە (نامەی چارەنووس). |
| name | کەسێک<br>somebody | nāme/nāue نامێ/ناوێ: واتە (کەسێک). وشەی (نام/ناو) ی کوردی لە ئینگلیزیدا کراوەتە name و لە فەرەنسیدا nom. |
| namgal | مەزنی<br>greateness | nāmkal/nāukal نامکەڵ/ناوکەڵ: واتە (ناو پایەبەرز، ناودار) و هەمان مانای هەیە. |
| namgur | ئەستوری<br>thikness | nāmgaura/nāugaura ناوگەورە/نام گەورە: واتە (ناوەکەی گەورەیە، لەشەکەی گەورەیە) کە پرەنسیپی ئەستوریە. |
| nam-en | نووسینگەی پیاوی ئاینی ئین (ئین: ناوی خوای بەهەشت و ئاسمانی سۆمەریە، کورد ئەمڕۆ کردویەتیە ئاین و بە مانای (دین) بەکاری دەهێنێت)<br>the office of en-priest | nāuīn /nāmīn ناوئین/نامئین: واتە (ناوەندی ئین). |
| namguzala | نوسینەگەی جێ کورسی پاشایی<br>office of throne-bearer | nāmcazālī نامچە زاڵی: واتە (ناو جێی دەسەڵات) |
| nam-šilig | توندوتیژی<br>violence<br>(abstract prefix + 'powerful; axe') | nām šiliq نام شلّق: لە فەرهەنگی سۆمەریدا وشەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (پێشگرێکی ئەبستراکی+هێز؛ تەور)، وشەی (نام) کە ئەمڕۆ لە کوردیدا بەشێوە (ناو/نام) ماوە، لە فەرهەنگە سۆمەریەکەدا بە پێشگرێکی ئەپرستراکی دانراوە لەبەر ئەوەی کە مانایەکی مادی نیە. وشەی (شلّق/شلّەقان) مانای (هەڵتەکاندنێکی توند) دەدات. |
| nam-šilig...aka | بەکارهێنانی توندوتیژی<br>to use violence<br>('violence' + 'to do') | nam-šiliq...akā نام/ناو شلق ئەکا: وشەکە لە فەرهەنگی سۆمەریدا شیکراوەتەوە بەشێوەی (ئاژاوە+کردن)، بە کوردی دەبێتە (ناو/نام شلّق+ ئەکا). وا دیارە سۆمەریەکان (ناو/نام شلّەقندن) یان بە مانای ئاژاوە بەکار هێناوە و بەوجۆرە وشەکە دەبێتە (ناو شلّقاندن دەکا). شایانی ئاماژە پێکردنە کە لە کوردیدا وشەی (شڵۆقاو šloqāu ) بەمانای پشێوی و ئاژاوە دێت. هەڵبەت (کرداری شلۆق بوون) و (شلۆق کردن)یش هەیە، بۆ یەکەمیان دەگوترێت: 'حاڵەکە شلۆقا' و بۆ دوو هەمیان دەگوترێت 'حاڵەکەی شلۆقان' یان 'حاڵەکە شلۆق ئەکا'. |
| namtibira | پەیکەر | nāutīābira/nāmtīābira نامتیابڕە/ناوتیابڕە: لە |

| | | |
|---|---|---|
| | sculpture | كوردیدا (ناو/نام) ماناى (سەنتەر، ناوەخن، ناوەرۆک) دەدات؛ بۆ نموونە (ناو ماڵ، ناوجەرگە.....) هەروەها (ناو) ناسنامەى كەسایەتى كەسێكە و لە ماناكانى سەرەوەدا ماناى ئەو وشە لاى سۆمەریەكان دەركەوتووە. بەو جۆرە دەڵێت (كەسایەتى یان كاراكتەرى تێدا ئەبرێت/ ئەتاشرێت) |
| namzu | زانایی (مەعریفەت)<br>wisdom | nāmzān نام زان: وەک پێشتر باسكرا وشەى نام لە كوردیدا زۆر ماناى هەیە یەكێک لەوانە ماناى (سەنتەر، ناوەخن، ناوەرۆک) بۆ نموونە دەگووترێت (ڕۆستەم نامە) (هەژار،پ.٨٥٧). بە گشتى وشەى (نامە) پەیوەستە بە نووسین و زانینەوە و بەو جۆرە وشەكە دەبێتە (نامەزانى) و هەمان مانا دەدات. هەروەها (ناو،زانین) یش هەر لە ماناكەوە نزیكە. (بڕوانە وشەى zu بە ماناى زانین). |
| ñar | گەیاندن (كردار)<br>to deliver | ner نێر: دەبێتە ڕەگى (نێردن) كە ماناى (حەواڵەكردن) دەدات و هەمانا ماناى وشە سۆمەریەكەى هەیە، بۆ نموونە (كابرا شتەكان ئەنێرێ بۆى). |
| niñir | ئەو كەسەى كە پەیامى فەرمى ڕادەگەیەنێت، جاردەرى شار، نوێنەرى قەرزكۆكردنەوە<br>herald, town crier; bailiff | nuenar نوێنەر: ئەو كەسەیە كە لە كارى فەرمیدا نوێنەرایەتى دەكات. |
| ñir-ra | ئەو كەسەى كەشتى پێدا دەنێردرێت<br>courier | nera نێرە: لە كوردیدا دەبێتە (ئەو كەسەى كە شت دەنێرێت)، هەرچەندیشە وشەكە كەم بەكار دێت بەڵام لە ڕووى ڕێزمانیەوە دروستە. لە كوردیدا ناو لە كردار دروست دەكرێت بە زیادكردنى (ە)، بۆ نموونە (برد/بردە، خوارد/خواردە، كرد/كردە،....)، هەروەها (نێر) دەبێتە پاشگرى ناوى خەڵكانى شت بردە، بۆ نموونە (پەیام نێر، وەڵام نێر). |
| ñeš | درەخت<br>tree | než نێژ: دەبێتە ڕەگى (ناژتن/نیشتن) كە دەبێتە كردارى ڕووەک ناشتن. |
| niĝbarag | لێفە<br>quilt | nāubarg ناوبەرگ: وەک لە هەموو ئەو ناوانەى خوارەوەشدا دەردەكەوێت، وشەى (niĝ) ى سۆمەرى بە ماناى nāu (ناو) ى كوردى دێت. بەو جۆرە وشەكە دەبێتە (ئەو شتەى كە لە بەرگ دەگیرێت). كە ئەوش لەگەڵ سروشتى لێفەدا یەک دەگرێت. |
| niĝgida | دار ( داردەستێک لە دار یان لە كانزا)<br>rod | naqīza نەقیزە: پارچە دارێكى نوک تیژە، پارچەیەک ئاسنى بە سەرەوەیە بۆ لێخوڕینى كەر و گا بەكاردەهێنرێت. |
| niĝĝiri | پارمیەک كە لە نێوان دوو | nāugīrī ناوگیرى: لە كوردیدا یەكێک لە ماناكانى |

| | | |
|---|---|---|
| | لایەندا بێت<br>go-between's fee | (ناو) بریتیە لە (ناوەند یان نێوان) بەو جۆرە مانای وشەکە بریتی دەبێت (لەو شتەی کە لە نێواندا گیر بووە). |
| niĝĝir | هەورە بروسکە<br>lightning bolt | nāugir ناوگر: واتە (ناو کڵپەی ئاگر). |
| niĝĝeštug | گوارەی گوێ<br>earrings | nāugue/nāuguš ناوگوێ/ناوگوش: نزیکی ئەو مانایە دەدات. |
| niĝguna | کەلوپەلێکە کە لە ناوماڵدا بەکاردەهێنرێت<br>utensils | nāuxuna/nāuxāna ناوخانە/ناوخونە: لە کوردیدا (ناوماڵی) ئاماژەیە بەو کەلوپەلانەی کە لە ماڵدا بەکاردەهێنرێن. بەو جۆرە (ناوخانە) هەمان مەبەست دەدات. |
| niĝgula | دەستەواژەیەکی حساباتە<br>an accounting term | nāukolā ناوکۆلا: واتە (لە شتەکە کۆلایەوە) بە مانای (لێ ووردبوونەوە). |
| niĝgalla | ئاماژەیە بۆ یان لە شێوەی ئەندامی زاوزێی ئافرەتدایە<br>for or in the form of female genitals | nāugal ناوگەڵ: ناوچەی ئەندامی زاوزێیە. |
| niĝin | دەڤەر، ناوچە<br>district | nāuan/nāuand ناومن/ناوەند: هەمان مانا دەدات. دەبینرێت بە زمانی میدی بە دوو جۆر ناو نراوە nugu, nugi'u. ئەمڕۆ کورد (ناوچە) شی پێ دەڵێت وەکو میدی. |
| niĝkalaga | بەهێز، پتەو<br>strong | nāukalaka ناوکەڵەکە: واتە (ناو بەهێزی). لە کوردیدا هەر کۆمەڵە شتێک بەیەکەوە شەتەک بدرێن بۆ توندوتۆڵکردنیان، پێی دەگوترێت (کەڵەک/کەڵەکە). |
| niĝmurgu | خۆراکی ئاژەڵ<br>fodder | nāumerg ناومێرگ: لە زمانی سۆمەریدا murgu هەمان مانای (مێرگ) ی کوردی هەیە و niĝ مانای (ناو/نێو) ی هەیە. بەو جۆرە وشەکە دەبێتە (ناومێرگ). |
| niĝna | جانتای پارە<br>money bag | nāuāxin ناواخن: واتە (ناوەوەی هەرشتێک/ لە دوتوێی شتێکدا) کە لەگەڵ پرەنسیپی جانتادا دەگونجێت. |
| niĝsub | بریقەپێدان (پۆلیشکردن)<br>polished | nāusāf ناوساف: وشەی (sub) ی سۆمەری بە مانای (ساف) ی کوردی دێت و بەو جۆرە وشەکە دەبێتە (ناوساف). |
| niĝtab | سندوقی ئاگر<br>fire-box | nāutāb/nāutāu ناوتاب/ناوتاو: (تاو/تاب) بە مانای گەرمی دێت و لە سۆمەری و هوریشدا هەمان مانای هەیە. بەو جۆرە وشەکە مانای ( ناو گەرم) دەدات. |
| niĝzu | زانین<br>knowedge | nāuzān ناوزان: واتە ( لە ناو زانیندا، جیهانی زانین). |
| nin | ژن؛ ئافرەتێکی بە دەسەڵات<br>lady; mistress | nana نەنە: مانای (دایکی دایک/ دایکی باوک، ئافرەتی بەتەمەن) دەدات. لە ئینگلیزیدا بەو ئافرەتانەی کە لە کڵێسەدا خزمەت دەکەن، پێیان دەڵێن nun و |

| | | |
|---|---|---|
| | | فەرەنسی nonne و لە لاتیندا دەبێتە nonnus. |
| ninda | نان، خۆراک<br>bread, food | nān نان: لە کوردیدا (نان) وەک سۆمەری مانای (ژەمی خۆراک، نان) ی هەیە و لە زمانی لوڤیشدا هەر مانای (نان) دەدات و چووەتە زمانەکانی هیندی و فارسیشەوە. |
| nindaba | خواردن بەخشینەوە<br>(food) offering<br>(ninda, 'food', + ba, 'to give') | nān ba نان بە: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بە شێوەی (نان+دان). سۆمەریەکان بە نان دەڵێن ninda و ba مانای (بدە، دان، بەخشین) ی کوردی دەگرێتەوە. بەو جۆرە وشەکە دەبێتە (نانبە). |
| ninda-gu | خۆراک<br>food<br>('bread; food' + 'to eat') | nān xo نان خۆ: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بە شێوەی (نان+خواردن). بە کوردیش هەر هەمان شیکردنەوەی هەیە لەبەر ئەوەی (خۆ) دەبێتە ڕەگی خواردن. |
| ninda-ñíri | جۆرێکە لە نان<br>(نان+گەشت، سەفەر)<br>a type of bread<br>('bread' + 'expedition, trip') | nān nere نان نێرێ: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (نان+گەشت،سەفەر) لە کوردیدا دەبێتە (نان+ناردن) کە دەبێتە نانی ناردن، کە لەوانەیە جۆرە نانێکی وشکەوە بووبێت کە کورد ئەمڕۆ ماوەیەتی و کە پێویست بکات ئاوی لێ دەدا و ئەنجا دەیخوات. |
| ninda-SÌLA | جۆرێکە لە نان<br>a type of bread | nāna šila, nān šilkī نانە شلە، نان شلکی: (نان شلکی) یان (شلکێنە) جۆرێکە لە نانی کوردی و (نانە شلە) مانای (نانێکی نەرم) دەدات. |
| nir | ئاغایانە<br>lord(ly) | ner نێر: لە کوردیدا دەگووترێت (نێر) هەرچەندە ئاماژەیە بۆ ڕەگەزی پیاو، بەڵام لەهەمان کاتدا نیشانەی بەهێزی و بە دەسەڵاتیە. بۆ نموونە (نێرە ژن، نێرانە.....). لە زمانی لیدیدا nārs مانای نزیکی وشەی (نێر) ی کوردی دەدات. |
| nirĝal | بەهێز و دەسەڵاتدار<br>authoritative | nerkal نێرکەڵ: هەردوو بەشەکە (نێر، کەڵ) مانای بەهێزی و بە توانایی دەدەن. |
| ñissu | سێبەر<br>shade | nise نسێ: هەمان مانای (سێبەر) دەدات لە کوردیدا. |
| nu | نە، نا<br>not | na/nā نە/نا: لە زمانی هیتیدا هەردوو natta, nu بەکاردێت. ئەم وشەیە لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا هاوشێوەی ئەوەیە. بە ئینگلیزی و ئیسپانی و ئیتالی no، ئەڵمانی nein، فەرەنسی non. |
| nu-a | نەبوون<br>be without | nī-a نیە: هێندە نەگۆڕاوە و لە زمانی پەهلەویدا دەبێتە an-ast لە کرواتی و سربیدا دەبێتە nije و لە ئیتاڵیدا دەبێتە non è و لە پورتوگالیدا دەبێتە não é. |
| nu ba, nu bi | جۆرێکە لە ڕەتکردنەوە<br>(نەفیکردن)<br>negation | na bā, nā be نەبا، نابێ: (نابێ، نەبا) هەردووکیان جۆرێکن لە ڕەتکردنەوە. |
| nu-banda | چاودێر<br>overseer | na banda نە بەندە: وشە سۆمەریەکە لە ڕووی ماناوە شیکراوەتەوە بە شێوەی (نە+لاو (گەنج)). لە |

| | | |
|---|---|---|
| | ('not' + 'young') | کوردیدا دەبێتە (نە+بچووک) و مانەکەی وەک وشە سۆمەرییەکە و بەو جۆرە دەبێتە (لاو نیە، بچووک نیە، وابەستە نیە) و ماناکە لەوەوە دروستکراوە. |
| nu, nud | نووستن<br>to sleap | nu نو: دەبێتە ڕەگی کرداری (نووستن) و بە سۆمەری بە جێی نووستن دەگووترێت ki nu کە مانای (جێی نوستن) دەدات. |
| nu-du-a | نادوێت/قسەناکات<br>not talking<br>('not' + 'to speak' + nominative) | na-du-e نادوێ: ڕستەکە هیچ نە گۆڕاوە و لە ڕووی پێکهاتەشەوە لە سۆمەریدا ڕستەکە شیکراوەتەوە بە شێووەی (نە+ووتن+جێگری بکەر). لە کوردیشدا ڕستەکە لەو سێ پێکهاتەیە پێک هاتووە. بنەڕەتی ئەم ڕستەیە لە دوو وشەی سەرەکی پێک دێت کە بریتین لە (نە+دو (ووتن)). ئەم دوو وشەیە لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا دەردەکەوێتەوە. ئەگەر وشەکانی (نە+وتن) لە هەندێک لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا بە سادەترین شێوە لە تەنیشت یەکەوە ،تەنها وەک وشەی بێ پەیوەندی بنووسرێن، دەبینرێت لە ئیسپانیدا دەبێتە no dire، لاتین ne dico، فەرەنسی ne di پورووتوگالی não dizer. |
| nu-me-a | کە ئەوە نیە<br>which is not<br>('not' + 'to be' + nominative) | na-mā-ua نەماوە : لە سۆمەریدا me مانای (ما/مان) ی کوردی دەدات و nu مانای (نە) دەدات. ئەگەر سەرنجی شیکردنەوەی فەرهەنگە سۆمەرییەکە بۆ وشەکان بدرێت، دەبینرێت کە لە ڕووی ماناوە پێک هاتووە لە (نە+ما+ جێگری بکەر). لە کوردیشدا ئەگەر ڕستەکە شی بکرێتەوە، ئەوا هەر بە هەمان شێوە دەبێت. |
| nu-me-en-na-ta | بونت نیە<br>you don't exist<br>('not' + me-en, 'to be', 2nd pers. sing. + a-ta, temporal clause suffix) | na-mā-una-ta نەماونەتە: هەمان مانا دەدات بەڵام لە کوردیدا بۆ کەسی دووهەمی کۆیە و لە سۆمەریدا بۆ کەسی دووهەمی تاکە. |
| nu-ma-su | بێوەژن (مێردی نەکردۆتەوە)<br>widow ('she has not replaced [her husband]') | na māu šu نە ماو شو: (نەماو شو) یان (شو نەماو)، ماناکەی وەک خۆی ماوە و هەر هەمان پێکهاتەی وشە سۆمەرییەکەی هەیە. |
| numun | تۆو<br>seed | nimun نمون: لە کوردیدا ئاماژەیە بۆ پارچەیەک کە لەشتێک وەرگیرابێت، کە لەگەڵ پرنسیپی مانای تۆودا دەگونجێت. |

| | | |
|---|---|---|
| numun...è/i-i | دەرکردنی تۆو، هێنانە کایەی بەرە<br>to issue seed, bring forth offspring ('seed' + 'to send forth') | numun aīā نمون ئەیا: وشەکە بە سۆمەری شیکراوەتەوە بەشێوەی (تۆو+ ناردن بۆ پێشەوە). لە کوردیدا شیکردنەوەی ماناکەی دەبێتە (نموونە +دەیات). |
| nu siki/sig | هەتیو<br>orphan | nāsik ناسک: مانای (نەرم، وورد وباریک) دەدات (هەژار، پ.٨٥٢) کە لەگەڵ سروشی هەتیودا گەنجاوە. |
| nu-ur, nurma | هەنار<br>pomegranate | hanār, nār هەنار، نار: نزیکە لە کوردیەکە و هاوبەشی هەیە لەگەڵ زمانی هیتیدا nurati. |
| nu-zu | نەزان<br>ignorant ('not' + 'to know') | na-zā, na-zān نەزا، نەزان: لە سۆمەریدا nu مانای (نە) ی کوردی هەیە و zu مانای (زان) ی کوردی هەیە. لە هەندێک ناوچەی کوردستان لە بری (زان) دەڵێن (زا) (بڕوانە وشەی zu). دەبینرێت وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (نە+زانین) و لە کوردیشدا هەمان شیکردنەوەی هەیە.<br>لە زمانی لاتینیدا بە (نەزانین) دەڵێن nescio کە بە ڕوونی هەمان وشە سۆمەریەکە دەردەکەوێت و پەیوەندی ئەم زمانانە دەردەخات، لەبەر ئەوەی کە لە زمانی لاتیندا وشەکە پێک دێت لە (ne+scio) کە ماناکەی دەبێتە (نە+زانین). هەروەها بە ئەڵمانی دەبێتە unwissend و بە ئینگلیزی unwise ، سلۆڤاکی nevzdelaný، لاتڤی nezinošs، بولگاری nevezh و ڕوسی nevezhda. |
| nu-zu-a | نەزانراو<br>unknown ('not' + 'to know' + nominative) | na-zā-īāu ،na-zān-īāu نەزانیاو، نەزایاو: لە کوردیدا دەکرێت بە هەردوو جۆرەکەی بنوسرێت و هەرمان مانا بدات (بڕوانە وشەی zu بەمانای (زانین). دەبینرێت لە ڕووی ماناوە، وشە سۆمەریەکان شیکراونەتەوە بەشێوەی (نە+زانین+ جێگری بکەر) و لە کوردیشدا هەمان شیکردنەوەی هەیە. |
| nu-u-zu-bi | بێ ئەوەی ئەوان بیزانن<br>without their knowing it | na-za-be نەزابێ: بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە وشەی (زان) لە کوردیدا بە (زا) ش دەگووترێت (بڕوانە وشەی zu)، بەو جۆرە لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (بێ ئەوەی بزانرێت) دەدا. |
| þa | پێشگری خواست و قایل بوونی کرداری؛ با؛ وایە.<br>precative and affirmative verbal prefix: may; let; indeed. | bā با: هەمان ڕۆڵی هەیە کە بریتیە لە قایل بوون لەگەڵ شتێک و خواستی کردنی شتێک. بۆ نموونە (با لێرمیە، با بڕۆین، با بچێت، ....) |
| pa | باڵ؛ پەل<br>wing; branch | pal پەل: هەمان مانا دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| pa e | دەرکەوتن (کردار)<br>appear | paīā پەیا: ئەم وشەیە لە کوردیدا هەر مانای (دەرکەوتن) دەدات بۆ نموونە (کابرا لەپڕ پەیا بوو). |
| pa-è...aka | دەرخستن؛ دەری دەخات<br>to show; to make appear | paīā akā پەیا ئەکا: هەمان مانای هەیە و هەردوو وشەکە لە کوردیا وەک خۆی ماوە. |
| pabilga | دەستەواژەیەکی پادشاییانەیە<br>a kinship term | pāplīka/peplīka پاپلیکە/پێپلیکە: مانای (پێ پلیکانە) دەدات کە دەشێت بەشێک بووبێت لە (پێپلیکەی دەسەڵات). |
| pad | شکاندن (بۆ پارچەی بچووک)<br>to break (into bits) | pat پەت: لە کوردیدا دەگوترێت (لەت و پەت بوو) کە مانای (پارچە پارچە بوون) دەدات. |
| pah | قاچ<br>leg | pāh/pā پا/پاه: هەمان مانای هەیە. هیتیەکان بە (پێ) دەڵێن pata، لە کوردیدا (پاتە) مانای پێڵاوی هەیە. هەروەها هیتیەکان بە شتێکی ئاڵاو بە دەوری پێدا دەڵێن patella کە پێکهاتووە لە (pat+ella) کە هەمان مانای (پێڵاو (پێ+ئاڵاو)) ی هەیە. وشەی(پێ/پا) ی کوردی و سۆمەری چووتە زمانی لاتینەوە و بووەتە pede، لە مانیشەوە چووەتە زمانی فەرەنسی pied و ئیتالی piede و سانسکریت pada. لە کوردیدا (پیادە) مانای (بەپێ ڕۆیشتن، کەسێک کە بە پێ بڕوات) دەدات. |
| pana | کەوان ؛ شکڵێکی ئەندازەیی<br>bow; a geometric figure | pāna پانە: لە کوردیدا (پان) مانای (پان بوونەوە، بەرفراوان بوون، پانکردنەوە) ی هەیە. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە ن pan کە مانای تاوە دەدات و هەروەها وەک پێشگر مانای (هەموو) ش دەگرێتەوە. لە زۆربەی زمانەکانی ئەوروپادا هاو مانایە. |
| pap | باوک، یەکەم و باشترین لە هەموو<br>father, first and foremost | bāb باب: لە کوردیدا مانای (باوک) دەدات هەروەها مانای (باشترین لە هەموو) ی هەیە بۆ نموونە دەگووترێت (شمشالی کوردی بابی هەموو ئامێرەکانە)، ڕێک مانا سۆمەریەکەی ماوە. ئەم وشەیە لە زمانی یۆنانیدا بەمانای باوک دەبێتە papas و لە زمانی لاتین و فەرەنسیدا بریتیە لە papa. هەروەها ئەم وشەیە لە ئاینی کوردی یارسان (کاکەیی) دا بە شێوەیەکی بەرچاو بۆ ناوی کەسایەتیە ئاینیەکانیان بەکاردەهێنرێت. بۆ نموونە (بابە یادگار، بابە تایەری هەمەدانی، بابە سەر هەنگی دەودانی، بابە مەحمود،..). |
| papal | سەرەتای لقی ڕووەک<br>bud | pāpil پاپل: مانای (ووردە لقی دار) ی هەیە و نەگۆراوە. |
| paphal (pap-hal) | نهێنی<br>secret | pāpī پاپی: مانای (جاسوس) ی هەیە (هەژار، ب.٩٥). |
| pašeš | لە پێش هەمووانەوە | peš پێش: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. |

| Sumerian | Kurdish / English | Notes |
|---|---|---|
| | foremost | |
| pašu | تەوری داربڕینەوە<br>ax | pāc پاچ: لە کوردیدا (پاچ) دەبێتە پێکهاتەی وشەی (داپاچین) کە بۆ درەخت لەتکردن دێت و لە وشەی (پاچ) یشدا بەدی دەکرێتەوە کە ئامێرێکی هەڵکەندنە. |
| ƥaš | پشت<br>back | pāš پاش: هەمان مانا دەدات. لە زمانی هیتیدا دەبێتە appezzi و لە یۆنانیدا دەبێتە piso و لە ئینگلیزی و لاتیندا دەبێتە post. |
| patesi | حوکمڕان<br>ruler | pātšā/pādšā پادشا/پاتشا: بە هەمان مانا هەتاوەکو ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێت. |
| peš | بەش<br>slice | baš بەش: هەمان مانا دەدات. |
| pešĝal | مەزن<br>mighty | peškal پێشکەڵ: هەمان مانا دەدات. |
| pešturzi | نەوە، وەچە<br>descendants | peštarz پێش تەرز: (تەرز) لە کوردیدا ئاماژەیە بەو لکانەی کە ڕووەکی گەڵامێو، کاڵەک، شوتی دەیهاون بۆ خۆ هەڵواسین بە دار یان شتی تردا. بەو جۆرە مەبەست لێی لق و پۆپی خێزانە. |
| pešturzi | لقی لاکانی درەخت<br>offshoot | peštarz پێش تەرز: وەک لەسەرەوە ڕوونکرایەوە و لە کوردیدا دەگووترێت (سەرتەرز) کە هەمان مانای (پێش تەرز) دەدات. |
| peš | خوری شیتەڵکراو<br>combed wool | pašm پەشم: مانای (خوری) دەدات. هەر لەم وشەیە (پەشمینە) دروست کراوە کە لە کوردیدا مانای (پارچەی لە خوری دروستکراو) دەدات (هەژار، پ.١٢١) و ئێستاکە چووەتە زمانە ئەورووپیەکانەوە. |
| peš | فراوانکردن، بڵاو<br>to expan, wide | paš پەش: مانای (بڵاوکردنەوە) دەدات و نەگۆڕاوە. |
| peš peš | زۆر فراوان<br>very wide | paš paš پەش پەش: لە سۆمەری و کوردیدا دووبارەکردنەوەی کردار و ئاوەڵکردار بۆ ئاماژە بە توندی حاڵەتەکەیە. بۆیە بە هەمان شێوەی (پەش پەش) مانای زۆر بڵاوکردنەوە، زۆر فراونکردن) دەدات و لە وشەکانی وەک (پارچە پارچە، لەت لەت، کوت کوت، کورت کورت، درێژ درێژ، گەورە گەورە) هەمان شێوەی وشە دارشتن دەردەکەوێت. |
| pizirium | کەلوپەلێکە لە زێڕ<br>a gold object | zer زێڕ: وشەی (زێڕ) لە ناو وشە سۆمەریەکەدا بەدی دەکرێت. بە زمانی هوری بە (زێڕ) دەگووترێت heyari کە دیسان لە (زێڕ) ی کوردی نزیکە. |
| puhrum | کۆمەڵەیەک<br>assembly | āpora ئاپۆرە: لە کوردیدا مانای (کۆبوونەوەی خەڵک پێکەوە) دەدات. |
| ra | پاکبوون، ڕوون بوون<br>(to be) pure; (to be) clear | run ڕوون: هەمان مانای هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| rap | کەلەپچە؛ داوی تەڵە<br>clamp; snare | rāu, rāv ڕاو، ڕاڤ: لە ڕووی ماناوە زۆر نزیکن. لە فەرەنسیدا rapt بەمانای ( هەڵگرتن، فراندن) دێت. |
| ri | گریان<br>cry | aīrī ئەیری: لە هەندێک ناوچەی کوردستان īrī دەبێتە ڕەگی (گریان) و بەشێوەی (ئەری، ناری، ئەیری) دەگووترێت. |
| ri | دووری<br>distant | re ڕێ: لە کوردیدا دەگووترێت (ئەو دنیە دوو ڕۆژە ڕێیە) لەوێدا (ڕێ) هەمان مانای (دووری ڕۆیشتن) دەدات. |
| ri | بەردان، بە ڕێدا ڕۆیشتن؛ ڕۆیشتن؛ لێهاتنە دەرەوە؛<br>to release, let go; to walk along; to pour out | rī, re, ro ڕی، ڕێ، ڕۆ: (ڕۆ) دەبێتە ڕەگی (ڕۆیین) کە هەمان مانای (ڕۆیشتن، بەرێدا ڕۆیشتن) دەدات. جگە لەوەش (ڕێ) دەبێتە ڕەگی (ڕێکردن) کە هەمان مانای وشە سۆمەریەکە دەدات. (ڕی) دەبێتە ڕەگی (ڕیان) کە مانای (دەرکردنە دەرەوەی پیسایی) دەدات. لە زمانی پەهلەویدا (ڕۆیشتن) دەبێتە raw، لە ئاڤێستادا ar مانای (بڕۆ، وەرە) دەدا و لە هیتیدا مانای (ڕۆیشتن) دەدات. |
| rig | گەوڕ (تەویلە)<br>sheepfold | rīx ڕیخ: پیسایی (گو) ی مەڕوماڵات دەگرێتەوە. |
| ru | لایەنێکی بیناسازیە<br>architectural feature | ru ڕو: لە کوردیدا ئەو وشەیە بۆ ئاماژەکردن بە (پێشی بینا/ڕووی بینا) بەکاردەهێنرێت. |
| rugu | پتەوی<br>to withstand | raq ڕەق: هەمان مانای هەیە و بە ئینگلیزی بە مانایەکی نزیک دەبێتە rough. |
| sa | وشە یان دەستەواژە<br>lexical entry | uša وشە |
| sa | پارەدان، کڕین<br>pay for, buy | sen سێن: وشەی (سێن) ڕەگی (سێندن) دەکات. هەندێک ناوچەی کوردستان بۆ کڕین ( سێنن) بە کار دێنن. |
| sa | ژێی بەستنەوەی ماسولکە بە ئێسقانەوە؛ ژێ (کەوان، ئامێری مۆسیقا)، ژێی لە ڕیخۆڵە دروستکراو.<br>tendon; string (of a bow, musical instrument); catgut string | že, ža ژێ، ژە: هەمان مانای هەیە. |
| sa | پێوەدان<br>to sting | ciza چزە: دەگووترێت (زەردەواڵەکە چزەی لێ هەستان). |
| sa | برژاندن<br>to roast | ciza چزە: ناوی گۆشتە بە زمانی منداڵان. هەروەها مانای (دەنگی سورکردنەوەی گۆشت) دەدات. |
| sag̑ | سەر؛ کەس؛ سەرمایە<br>head; person; capital | salk/sar سەلک/سەر: مانای (سەر) دەدات کە بەشێکە لە لەش. مانای (کەس) دەدات (ئێمە دە سەر خێزانین). هەروەها وشەکە لە کوردیدا ئەو پارەیە کە |

| | | |
|---|---|---|
| | | لە باقی مامەڵەدا دەدرێت و پێکهاتەی وشەی (سەرمایە) ش پێک دەهێنێت. بە زمانی میدی بە (سەر) دەڵێن sar. |
| saĝ | پاشا<br>king | sar/salk سەر/سەر: (سەر) مانای سەرۆک و پێشەوای هەیە. بۆ نموونە دەگووترێت (سەرانی کورد). بە هوری و هیتی بە پاشاکان دەگووترێت šarrena بەرامبەر (سەران) ی کوردیە و لەوێدا بەهۆی پاشگری (ان) وە ناوەکە کراوەتە کۆ . |
| sag | پێداکێشان، لێدان<br>to strike, beat | šaq شەق: مانای (لێدان بە قاچ دەدات، زلە) دەدات. |
| sag | باش، جوان؛ باشی، شتێکی باش<br>good, beautiful; goodness, good (thing)" | sāĝ ساغ: مانای (باش، چاک، ئەسڵی) دەدات. |
| sag | چۆنایەتی چاک؛ دەگمەنی، بەنرخی<br>high quality; (to be) rare, precious | sāĝ ساغ: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| saĝ bala | ڕاوەشاندنی سەر<br>to shake the head | salk balā سەلک بەلا: (سەلک بەلادا دان) ئەو مانایە دەدات. |
| saĝ dub | سەر شکاندن<br>to smash (heads) | salk dāpīā سەلک داپیا: مانای هەمووی دەبێتە (سەلکی پێدا ئەدا). |
| saĝ il | بەرزکردنەوەی سەر<br>to raise the head | salk hal سەلک هەڵ: (سەلک هەڵئەبڕی) |
| saĝ sag | لەش کەوتنە شەقە شەق بێ توانینی کۆنترۆڵکردنی<br>tremble | šaqa šaq شەقە شەق: وەک خۆی ماوە، بۆ نموونە (لە ترسانا لەشی کەوتبووە شەقەشەق) و لە ئینگلیزیدا بووەتە shake ، سویدی skaka، بە هەمان مانای کوردی و سۆمەریەکە. |
| sa'eš | جۆرێک لە ئامێری مۆسیقایە<br>a type of musical instrument | šāīar ،šāīī شایی، شایەر: (شایی) مانای زەماوەند دەدات و (شایەر) گۆرانی بێژی ناوشاییە. |
| saĝapin | زەوی کێڵ (جوتیار)<br>plowman | sapān سەپان: ڕەنجبەری کشتوکاڵە و پێنج یەکی بەرهەم دەبات (هەژار، پ.٤٣١). |
| saĝ-ba | سوێنخواردن<br>oath | ba salk/sar بە سەلک/سەر: کورد دەڵێت (بە سەری باوکم/دایکم/برام) کە سوێنخواردنێکە بەسەر. لە زمانی هیتیدا šarra بەکاردەهێنرێت بۆ سوێنخواردن. |
| saĝdili | تەنها، سەڵت؛ کەسێکی چاک<br>lone, single; noble | sâĝdil، salt ساغدڵ، سەڵت: (دڵ ساغ/ساغ دڵ) مانای (کەسێکی چاک) دەدات. (سەڵت) مانای کەسێکی تەنها دەدات. |
| saĝDU | کەسێکی شەڕکەر | šaqdā, šaqāua شەقدا، شەقاوە: هەردووکیان |

| | | |
|---|---|---|
| | smitten person | پرەنسیپی وشە سۆمەریەکەیان تێدا ماوە. ئەم وشەیە چووەتە زمانی قسەکردنی عەرەبیەوە و لە ناو عەرەبی عێراقدا بە هەمان مانا بەکاری دەهێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی کە وشەکە عەرەبی نیە، نەخراوەتە فەرهەنگەوە. |
| samag | خاڵ، نیشانە<br>birthmark | šabaq شەبەق: لە کوردیدا (شەبەق) مانای (کون، پەڵە) دەدات بۆ نموونە دەگووترێت (تەماشە ئەو شەبەقە گوڵانەی سەر ئەو قوماشە بکە) یان (ئەو قوماشە دوو شەبەقی تێ بووە). |
| sañ | سەر<br>head | sān سان: ئەم وشەیە لە ناوچەی هەورامان وەک نازناوی دەسەڵاتدار بەکار هاتووە بە مانای (سوڵتان، میر). دیارە مانای (سەری لەش) ی لە کوردیدا نەماوە. نابێت ئەوە لە یاد بکرێت کە (سەر) ی مرۆڤ هەمیشە مانای (سەرکردە) ی هەیە لە کوردی و زۆر لە زمانەکانی تردا بۆ نموونە ئینگلیزی head ، عەرەبی (رأس، رئیس) و کوردی خۆی (سەر) بە هەمان شێوە هەردوو ماناکەی ماوە. بۆیە دەشێت کە لە رابردوودا جگە لە مانای (میر، سوڵتان) دەشێت مانای (سەر) یشی هەبووبێت. یەکێک لە سەرکردە هەرە گەورە ئاینیەکانی کوردستانی سەر بە ئاینی (یارسان) بە (سان سەهاکی بەرزنجی) باس دەکرێت. |
| sar | باخچە<br>garden | saīr سەیر: (سەیر) لە کوردیدا مانای (چوون بۆ دەشت و دەرو سەوزایی، سەرسوڕمێنەر) دەدات (هەژار، پ.٢٥٢). دەشێت هەمان بنەچەیان هەبێت و مەبەست لێی (شوێنی جوان و سەرسوڕمێنەر) بێت. لە زمانی هوریدا بە هەمان مانا دەبێتە sayri. |
| sar | تاشین<br>to shave | sir سر: دەبێتە رەگی وشەی (سرین، سرینەوە) کە لە مانادا نزیکن. |
| saKU | چەک<br>arms | cak چەک: هەمان مانا دەدات |
| sed | سەرمابوون، ساردکردنەوە؛ زسان<br>(to be) cold; to cool; winter | sār/sārd سار/سارد. |
| sahar | زوقم<br>frost | sār سار: مانای (سارد) دەدات. |
| si | هەستانە سەرپێ<br>to stand upright | hās هەس: دەبێتە رەگی (هەسان/هەستان). ئەم وشەیە لە هەردوو زمانی فەرەنسی و سویدیدا بە شێوەی hausse و بە مانای (بەرزبوونەوە، زیادکردن) دەردەکەوێت. |
| sisi | ئەسپ<br>horse | has هەس: دەبێتە رەگی وشەی (هەسان/هەستان) ولە سۆمەریدا وشەی si مانای (هەسا/هەستا) دەدات و |

وشەکە دووبارەکردنەوەیە بۆ دەربڕینی بەهێزی گیان لەبەرەکە یان بەرزکردنەوەی مرۆڤ لە زەوی لە کاتی سواربونیدا. بەو جۆرە ناوی گیانلەبەرەکە بووەتە (هەس هەس si si). لە هوریدا بە ئەسپ دەڵێن isi ئەوان هەر یەکجار پێیان گوتووە (هەساو). میتانیەکان پێیان گووتووە aššu. دەبینرێت کە لە (هەس+و) پێکهاتووە، یەکەمیان دەبێتە ڕەگی کرداری (هەستان) و (و) ئامرازێکە بۆ کردنی کردار بە ناو.
لە سەردەمێکدا ئەو ناوە لە زمانی میدیدا کراوە بە (aspa ئەسپا) (بڕوانە فەرهەنگی میدی). هەروەها لە کوردیدا کە داوا لە کەسێک دەکرێت کە هەستێتە سەر پێ، دەگووترێت (هەسەپا hasapa). بەو جۆرە (ئەسپ/هەسپ) لە بنەڕەتدا مانای (هەساو/هەستاو) ی داوە و دوایی مانای (پێ هەستاو) ی داوە کە گونجاوە لەگەڵ سروشتی گیانداری ئەسپدا. ناوەکە پێک دێت لە (هەس+پا)؛ بەو جۆرە ناوی aspa دروست بووە.
ئەمڕۆ پاشماوەی ئەم ناوە لە بەشێکی ناوی (هێستر) دا دەبینرێت و لە زمانی ئینگلیزیدا هەتاوەکو ئەمڕۆ بە (کەر) دەگووترێت ass. کە لە بنەڕەتدا و لە ئینگلیزی کۆندا بریتی بووە لە assa. هەروەها دەبینرێت لە زمانی سویدی و فەرەنسیشدا وشەی (هەسا) ی کوردی دەبێتە hausse. ئەمانە هەموویان ئەو پەیوەندیە مێژوویەی ئەم زمانانە دەسەلمێنن.

| Sumerian | کوردی / English | تێبینی |
|---|---|---|
| si ak | کۆککردنی ژێی سەر عود، کۆککردن<br>to adjust the strings on a lute, to tune | zīā ak زیا ئەک: لە زمانی سۆمەریدا (ئەک) هەمان مانای (ئەکا) ی کوردی هەیە و (زی) مانای زیادکردنی هەیە. |
| sibta | بەشی زیاتر<br>additional share | zīāda زیادە: هەمان مانا دەدات. |
| si'EZEN | هەمیشە غەمبار؛ ئامێرێکی مۆسیقایە<br>fret; a musical instrument | sāz ,soz ساز، سۆز: (ساز) ئامێرێکی مۆسیقای ژێدارە. یەکێ لە ماناکانی (سۆز) بریتیە لە (گۆرانی غەمبار) (هەژار، پ.٤٢٧). |
| sig | لاوازبوون؛ بێ قەدر؛ باریک بوون؛ تەسک بوون<br>(to be) weak; (to be) low; (to be) thin; (to be) narrow | suk سوک: مانای (کێش کەمی) هەیە و هەروەها مانای (بێ قەدر) دەدات بۆ کەسێک. |
| sig | سوک؛ بێ دەنگ بوون (داواکردن لە کەسێک کە بێ دەنگ بێت)<br>hush; (to be) silent | suk سوک: هەماناکانی هەیە. |

| | | |
|---|---|---|
| sigda | سەبەتە<br>basket | sabata سەبەتە |
| silañ, sila | شێلان (هەویر یان قوڕ)<br>to knead<br>(dough or clay) | šelā, šelān شێلا، شێلان: (شێلا) و (شێلان) هەمان مانایان هەیە. لە زمانی هیتیشدا وشەی šalk بەمانای (شێلان، تێکەڵکردن) دێت. لە کوردیدا وشەی (شلکی šilki) بە مانای (نەرمی، نانی ساج) دێت. بەڵام وشەی (شلکێنە šilkene) ی کوردی بە مانای (هەویری تراو، جۆرێک نانی ڕۆناوی) دێت (هەژار، پ.٤٢٧) .وشەی šalakar بە زمانی هیتی جۆرێکە لە نان؛ بەو جۆرە هاوبەشیەکی ڕوون لە نێوان ئەم زمانانەدا هەیە. |
| silim | تەندروست بوون؛ بوون لە حاڵەتی تەواودا؛ لەش ساغی<br>(to be) healthy; completeness; well-being | salīm سەلیم: ئەم وشەیە هەمان مانای هەیە لە کوردیدا و بە زمانی ئەکەدی پێی دەگووترێت šulmu. ئەمڕۆ کورد بۆ وەسفی حاڵەتی باشی کەسێک دەڵێت (ساغ و سەلیم) کە بە سۆمەری بە هەمان مانا دەبێتە (sag u silim) لە بەر ئەوەی هەر دوو وشەکانی (ساغ، سەلیم) و ئامرازی (و) لە سۆمەری و کوردیدا یەکن. |
| silim ...du | سڵاو لێکردن، گوتنی سڵاو<br>to greet, say "Hello"<br>('health' + 'to speak') | silām du سڵام دو: لە فەرهەنگەکەدا وشەکە شیکراوەتەوە بەشێوە (تەندروستی+قسە) و بە کوردی دەبێتە (تەندروستی+قسە) کە ماناکەی وەک خۆی ماوە. |
| sir | پشکنین<br>check | saīr سەیر: مانای (سەیرکردن و لێ وردبوونەوە) دەدات و هەمان مانای ماوە. |
| sir | لاواز، لەرزین<br>weak, feverish | sir سڕ: لە کوردیدا بە مانای (سڕبوونی گیاندار، لەکارکەوتنی بەشێکی لەش لە ئەنجامی کەوتن لەسەر ئەولایە، بەنجبوونی شوێنێک لە ئەنجامی دەرزی بەنج لێدان) دێت، هەروەها ئاماژەشە بۆ حاڵەتی لەرزین لە سەرمادا، کە هەردوو ماناکەی ماوە. |
| sir | چڕ<br>dense | cir چڕ: هەمان مانای هەیە. |
| sissi | سەوزبوون<br>to be green | sauzī سەوزی: وەک خۆی ماوە و بە زمانی سانسکریت بە (گیا) دەڵێن sasa. |
| siškur | دوعاکردن؛ نوێژکدن؛ خێرکردن، سەرەمۆنی ئاینی؛ خواردنەوەی ئاینی | zīkir زیکر: ئەم وشەیە لە کوردیدا بە مانای (کۆڕی دەرویشان، دوعاکردن) بەکاردێت. |
| šita | پاکراوە، شۆراو لە حەمامدا<br>cleaned, bathed | šitu شتو: لە کوردیدا مانای (حەمامکردن، پاکردنەوە بە ئاو) دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (لە حەمام خۆم شتوە، لە حەمام جلەکانم شتوە). |
| su | سور<br>red | sur سور: ئەم وشەیە بە زمانی میدی دەبێتە suxra و بە زمانی هوری بە خوێن دەگووترێت tsurgi کە لێرەدا زیاتر ئاماژەیە بە ڕەنگەکەی و هەموویان لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کوردیەوە نزیکن. |
| sub | سافکردن<br>to rub | sāf ساف: ڕەگی وشەی (سافکردنە). ئەم وشەیە بە زمانی هیتی پێی دەگووترێت šapiya و پێ دەچێت وشە سۆمەریەکە بناغەی وشەی soap ی ئینگلیزی و seife ی ئەڵمانی بێت کە مانای (سابوون) دەدەن. عەرەبیش ئەم وشەیەی وەرگرتووە و کردوویەتە (صفا) بە مانای (پاکی، پاڵێوراو) بەکاری دەهێنن. ئەوەی کە سەرنج دەدرێت لە کوردیدا هەمان مانای وشە سۆمەریەکەی وەک خۆی ماوە. |
| suh | شێوان؛ سەرلێشێوان<br>to confuse; confusion | šeu شێو: دەبێتە ڕەگی وشەکانی (شێواو، شێواندن). |
| suhur | پێستی تەپڵی سەر؛ لوتکەی درەخت، هەر شتێک وەک پۆپنە یان توک لەسەر سەری ئاژەڵ بێت<br>scalp; tree top, crest | sar سەر: وشەی (سەر) لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (پێچەوانەی ژێر، لەسەر شتێک، سەری مرۆڤ یان ئاژەڵ، بەشی سەرەوەی هەر شتێک). ئەم وشەیە لە زمانی هیتیدا šara مانای (سەرەوە، لەسەر، بەسەر، لەسەر شتێک) دەدات و لە لوڤیدا دەبێتە šari. لە زمانی میدیدا sar مانای (سەری لەشی مرۆڤ دەدات) و لە هوریدا šar مانای (پاشا،سەرکردە) دەدات، کە هەموو ماناکانی لە کوردیدا ماوە. لە فەرەنسیدا دەبێتە sur کە مانای (لەسەر، بەسەر) دەدات. |
| suhurmaš | ماسیەکی ئەفسانەیی<br>a mythical fish | suramāsī سورەماسی: (ماسیە سورە/سورەماسی) لە سەرەمۆنی نەورۆزدا بەکاردەهێنرێت و دەشێت ڕابردوویەکی مێژوویی کۆنی هەبێت. وشەی (ماسی) لە زمانی سانسکریتدا دەبێتە matsya. |
| suhursumla | جۆرێکە لە ماسی<br>a fish | surasimela سورە سمێڵە: ماسیەکە کە دوو پارچە گۆشت بەلای دەمیەوەیە کە لە شێوەی سمێڵدایە و ڕەنگی ئاڵە، بۆیە پێی دەگووترێت (سورە سمێڵە). |
| suku | شەوقدانەوە، تیشکدانەوە<br>shine brightly, to flash | šauq شەوق: هەمان مانا دەدات. |
| sul | گۆشتی سوێرکراو یان ترشکراو<br>salted or pickled meat | sol سۆل: مانای (پرخوێ، سوێر) دەدات (هەژار، پ.٤٢٨). |
| sumug | تاریکایی، ترس<br>darkness, fear | sām سام: مانای (ترس) دەدات. |
| sumundar | چەوەندەر/ چەمەنەر<br>beetroot | cauandar/camandar چەمەندەر/چەوەندەر: هەمان مانای هەیە. |
| sur | تورەبوون، گرژبوون<br>(to be) furious, angry | sur سور: ڕەگی وشەی (سوربووەوە) کە دەربڕینێکە بۆ گوزارشکردن لە تورەیی و گرژبوون. |
| sur | ئامێرێکی مۆسیقایە | surnā/zurnā سورنا/زورنا: دەشێت ئەمە بناغەی |

| Sumerian | Meaning | Commentary |
|---|---|---|
| | a musical instrument | ناوی ئەو ئامێرە مۆسیقا کوردیە بێت کە ناوەکە پێک دێت لە (سوڕ+نای). وشەی (سوڕ) لە کوردیدا مانای (خولانەوە، سەماکردن) دێت و لە زمانی سۆمەریشدا سوڕ بە مانای (خولانەوە) دێت. |
| sur | فشارخستنەسەر، گوشین<br>to press, squeeze | zor زۆر: مانای (هێز و توانا) دەدات و دەبێتە بناغەی وشەی (زۆران، زۆرلێکردن، بەزۆر). لە ئاڤێستادا sûra مانای (بەهێز و بەجەرگ) دەدات و لە زمانی هوریدا itsuri مانای (ڕاکەر) دەدات و لە سانسکریتدا zUra مانای (ئازا، بوێر، شەڕانی) دەدات. |
| sur | خولانەوە، سوڕانەوە<br>to spin; to twist | sur سوڕ: مانای (خولانەوە، گڕدان) دەدات و دەبێتە ڕەگی وشەکانی (سوڕانەوە، سوڕدان). ئەم وشەیە بووەتە بناغەی وشەی سوڕنا/زوڕنا (سوڕ+نای) و ئەمڕۆ ئەم ناوە لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە لایەن کورد و فارس و ئەرمەنەوە بەکاردەهێنرێت، بەڵام ڕەگی وشەکە سۆمەری/کوردیە. |
| suzi | پرشنگێکی نایاب<br>awesome radiance | sozī سۆزی: دەبێتە ڕەگی وشەی (سوزیان) کە مانای سوتانی هەیە. |
| šaduga | دوێنێ<br>yesterday | dueka دوێکە: لە هەندێک ناوچەی کوردستان، لەبری دوێنێ دەڵێن (دوێکە). لە ناو وشە سۆمەریەکەدا بەشێکی وشە کوردیەکە دەبینرێت. |
| šagba | سک پڕ<br>pregnant | sigbā/sikbā سکبا/سگبا: دەبێتە ڕەگی (سک بدات) کە مانای سک چوونە پێشی هەیە. ئەمڕۆش کورد دەڵێت (سکپڕ) کە مانای پڕبوونی سک دەدات و لە ماناوە نزیکن. |
| šagia | ساقی<br>cup-bearer | sāqīā ساقیا: ئەم وشەیە لە کوردیدا بە (ساقیا) بەکاردەهێنرێت. هێمنی شاعیر لە یەکێک لە شیعرەکانیدا دەڵێت "ساقیا وابادەوە وابادەوە ڕوو لەلای من کە بەجامێ بادەوە". هەروەها بابە ڕەجەبی لوڕستانی لە سەدەی هەشتەم و نۆهەمی زاینیدا دەڵێت "ساقیا دەستم، ساقیا دەستم، جامێ تر باوەر بگێرە دەستم، ئەز جە مەیخانەی ڕۆی ئەلەست مەستم، وە مەستی پەیمان ئایینم بەستم "واتە (ئەی ساقی، جامێکی تر مەی بێنە، چونکە من مەستی مەیخانەکەی بادەی ئەلەستم و بە مەستیەوە پەیمانی ئاینی خۆم بەستووە" (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٥٧). ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا لە زمانی ئەکەدیەوە چووەتە زمانی سۆمەریەوە، ئەمڕۆ زۆربەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات بەکاری دەهێنن، بەڵام سەرنج دەدرێت کە کورد وەک سۆمەری بە (ساقیا) دەیڵێت. بەڵام لە عەرەبی و فارسیدا بە شێوەی (ساقي) دەگووترێت. |
| šagiagal | سەرکردە ساقی<br>head cup-bearer | sāqīākal ساقیا کەڵ: (ساقیا کەڵ) هەمان مانا دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| šagida | جلوبەرگێکە<br>a garment | cākat چاکەت: پارچە جلێکە کە ئەمڕۆ لە زۆربەی وڵاتەکانی جیهاندا هەمان وشەی بۆ بەکاردێت. |
| šagpeš | سکپڕ<br>pregnant | sigpeš/sikpeš سکپێش/سگپێش: مانای (هاتنەپیشەوەی سک) دەدات. ئەمڕۆش بۆ ئاماژەکردن بەو حاڵەتە لەبری ئەو وشەیە کورد (سک/سگپڕ) بەکاردەهێنێت کە لە ڕووی پێکهاتەییەوە لە وشە سۆمەریەکە نزیکە. لە سانسکریتدا دەبێتە sagarbha. |
| šagsuga | بەتاڵی؛ برسێتی<br>emptiness; hunger | sigsuka/siksuka سکسوکە/سگسوکە: واتە (سکی بەتاڵە، سکی کەمی تێدایە) |
| šagtahar | ئازاری سک لە ئەنجامی بوونی هەوای ناوسکەوە<br>colic | sigtir/siktir سکتڕ/سگتڕ: مانای (بوونی تڕ لە سکدا) دەگەیەنێت. بە زمانی لوڤی بە (تڕ لێدان) دەڵێن huntariya. هەمان حاڵەت بە زمانی هیتی پێی دەڵێن paparriy کە بە کوردی دەبێتە (باپڕی bāpiri) واتە پڕبوون لە هەوا. |
| šagtur | ڕەحم (لە لەشی ئافرەتدا)<br>womb | sigtor سکتۆڕ: واتە (تۆڕ لە ناو سکدا) کە لەگەڵ سروشتی ڕەحمدا گونجاوە. |
| šagzu | مامان (ئەو ئافرەتەی هاوکاری منداڵ بوون دەکات)<br>midwife | siguzā سکوزا: ئەم وشەیە مانای (منداڵ بوون) دەدات. |
| šakkanak | دەسەڵاتدارێکی پایەبەرز<br>governor-general | šāxānak شاخانەک: مانای (پاشا/گەورەی شوێن) دەگرێتەوە. هەندێک کەس بە هەڵە وا دەزانن وشەی (شا) فارسیە. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە. لەبەر ئەوەی کە سۆمەری، هوری، هیتی و مانی، زۆربەی جار وەک پێکهاتەی وشە و بە مانای گەورە، بەکاریان هێناوە. نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵ پێش دەرکەوتنی فارس وەک نەتەوە ، ئەو ناوە هەبووە. جگە لەوە مانیەکان کە بە زمانی کوردی دواون، نزیکی ٩٠٠ پ.ز بە دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانیانی خۆیانیان گوتووە (شاکان šaknu) (بروانە مانیەکان). |
| šar | گشتی، هەموو؛ جیهان<br>totality, all; world | šar شار: ئەم وشەیە مانای (شار) ی کوردی دروست کردووە. کە لە پەهلەویدا کراوەتە (شهر) بە مانای (شار، خاک، وڵات) و دوایی چوەتە فارسیەوە و لە هەردوو ئەم زمانانەدا پیتی (ها) ی بۆ زیادکراوە بەڵام لە کوردیدا وەک خۆی ماوە. |
| šar | ڕەشەکوژیکردن (کردار)<br>to slaughter | šar, šir شەڕ،شڕ: (شەڕ) مانای (جەنگ ،کوشتار، نەهامەتی) دەدات و (شڕکردن) مانای (لەتوپەتکردن) دەدات. بە زمانی لوڤی ašhar مانای (خوێن) دەدات. بە زمانی هیتی šaru هەمان مانای (شەڕ) ی کوردی هەیە. لە زمانی سانسکریتدا بە (شەڕ) دەگووترێت asuri. |
| šara | بوختانکردن | šar شەڕ: (خراپەکاری و خراپە) مانای تری ئەم |

| | | |
|---|---|---|
| | slander | وشەیەن لە کوردیدا. |
| šara | خوای جەنگاوەری سۆمەری<br>Sumerian worrier God | šara شەرە: یەکێک لە ماناکانی وشەی (شەڕ) دەبێتە (جەنگ) و لەوە دەچێت سۆمەریەکان بەهۆی پاشگری (ە) وە هاوشێوەی کوردی (شەڕ) یان کردۆتە (شەڕە) کە وشەکەی کردۆتە بکەری (شەڕ) کە لەگەڵ سروشتی خواکەدا گونجاوە. |
| še | شێوە<br>shape | šeua شێوە: هەمان مانای هەیە و پێ دەچێت ئەو وشەیە بناغەی وشەی shape ی ئینگلیزی بێت کە هەمان مانای هەیە. |
| še | جۆ<br>barley | jo جۆ: هەمان مانا دەدات. |
| šeg | ئاسک یان بزنە کێوی<br>a deer or mountain goat | šak شەک: بەرخی دوو بەهار دیتوە (هەژار، پ.٤٨٧). |
| šegbar | جۆرێک لە ئاسک یان بزنە کێوی<br>a deer or mountain goat | šakbarān شەکبەران: نێرەی مەڕی سێ بەهار دیتوە (هەژار، پ.٤٦٧). |
| šen | مادەیەکی سەوزباوە لەسەر مس و هاوجۆری مس دروست دەبێت<br>verdigris | žaŋ ژەنگ: لە کوردیدا ئاماژەیە بەو مادەیەی کە دەکەوێتە سەر کانزا لە ئەنجامی کۆن بوونی کە هەر هەمان مانا دەدات. |
| šena | ڕووەکێکە<br>a plant | šīnāīī شینایی: ئاماژەیە بۆ زەویەک کە هەمووی سەوزبووبێت. |
| še-ñar | ناردنی جۆ<br>barley delivery<br>('barley' + 'to deliver) | jo ner جۆ نێر: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بەشێوەی (جۆ+ناردن). لە کوردیدا (نێر) دەبێتە ڕەگی (ناردن) و بەو شێوەیە لە کوردیدا شیکردنەوەکەی دەبێتە (جۆ+ناردن). |
| šenšenbal | باڵندەیەکە، قەتێ<br>a bird, quail | šīnšīnbāl شین شین باڵ: لە کوردیدا بە ڕەنگی کەو و قەتێ دەگووترێت (شین). بەو جۆرە ناوەکە باس لە باڵ شینی باڵندەکە دەکات. جگە لەوە دووبارەکردنەوەی وەسف لە کوردیدا هەر ماوە بۆ نموونە دەگووترێت (سێوەکان سور سور بوو بوون). حەسەن زیرەک لە گۆرانیەکیدا دەڵێت ( وەک قومری سەرباڵم شینە) کە دیسان لەوێدا باڵی قومری کە هەمان ڕەنگی قەتێی هەیە، بە شین وەسف کراوە. |
| šenu | جۆرێک درەختە<br>type of tree | šīnik شینک: درەختێکی لێرەوارە بەرێکی هەیە دەخورێ (هەژار، پ.٥٠١). |
| šer | لاوازکردن<br>to weaken | šir شر: لە کوردیدا مانای (پەرێشان، لاوازبوون) دەدات. |
| šerda | تاوان<br>crime | jarda جەردە: مانای (تاوانبار) دەگەیەنێت.<br>(جەردەیی) کاری تاوانباری دەگەیەنێت . |

| | | |
|---|---|---|
| šeria | قاپوقاچاخ<br>dish | šira شره: مانای (کەلوپەل) دەگرێتەوە (هەژار، پ.٤٦٩). |
| šika | پارچەی شکاوی فەخفوری<br>potsherd | šika شکە: (شک) ڕەگی وشەی (شکان) ە لە کوردیدا و پاشگری بزوێن و پیتی ( و) فەرمان دەکاتە ناو یان ئاوەڵناو. بۆ نموونە (ژەم بورد- ژەم بوردە، خەم خوارد- خەم خواردە، کرد-کردە) بەو جۆرە (شک- شکە) و بوومتە ناوی پارچە شکاوەکە. لە زمانی هوریدا tsik مانای (شکاندن) دەدات وەک کردار. |
| šilig | هەویر<br>dough | šilkī شلکی: لە کوردیدا وشەی (شلکی šilkī) بە مانای (نەرمی، نانی ساج) دێت. بەڵام وشەی (شلکێنە šilkena) بە مانای (هەویری تراو، جۆرێک نانی ڕۆناوی) دێت. لە زمانی هیتیشدا وشەی šalk بەمانای (شێلان، تێکەڵکردن) دێت. بەو جۆرە هاوبەشیەکی ڕوون لە نێوان ئەم زمانانەدا هەیە. |
| šìr | گۆرانی گووتن، گۆرانی<br>to sing, song | cir, šīr,šāīar چڕ، شیر، شایەر: (چڕ) دەبێتە ڕەگی (چڕین) کە مانای گۆرانی گوتنە. (شیر) بە (هۆنراوە، شیعر) دەگووترێت و بە گۆرانی بێژ دەگووترێت (شایەر). |
| šir-dili | سیر<br>garlic | sīr سیر: لە بەشێک لە ناوە سۆمەریەکەدا وسەی (سیر) دەردەکەوێت. |
| šita | پاک، شۆراو<br>clean; bathed | šitu شتو: مانای (شۆراو) دەدات. |
| šu du | بەستنی دەست<br>to bind the hands | šada شەدە: (شەد) مانای بەستنی هەیە و (شەدە) بە مانای (مشکی و ئاوریشمی سەروپێچی پیاو و ژنان) دێت. |
| šuba | شەوقدار؛ جوان (ئاوەڵکردار)<br>pretty; shining (adj.) | sāfa سافە: وەک ئاوەڵناو ماناکەی دەبێتە (پاکە، لوسە). |
| šùd | نوێکژکردن (سوژدەبردن)<br>to pray | suždа سوژدە: هەمان مانا دەدات. زۆر جار پیتی (د d) ی زمانی سۆمەری لە کوردیدا دەبێتە (ژد žd). بۆ نموونە adda'abba ی سۆمەری لە کوردیدا دەبێتە (ئەژدا و ئابا). وا دەردەکەوێت کە ئەم وشەیەش بە هەمان گۆڕیندا ڕۆیشتبێت. |
| šudu | کەلەپچە<br>handcuffs | šad شەد: مانای بەستن دەدات. |
| šudu'a | دەستگیرکراو<br>captive | šadāu شەداو: واتە (کەسێک کە بەسترابێت). تێبینی دەکرێت کە لە سۆمەری و کوردیدا هەمان پاشگر بەکاردەهێنرێت بۆ گۆڕانی کردار یان ئاوەڵکردار بۆ ناو. وەک لەم حاڵەتەدا رووی دا. |

| | | |
|---|---|---|
| šul | نەخۆشیەکی خراپی پێستە کە تێیدا پێست تووشی کێشە دێت<br>a bad disease involving skin eruptions | šil/ šila شلە/شل[67]: حاڵەتێکی پێستە کە تێیدا بەشێک لە پێست پەڵە پەڵەی قاوەیی لێ دەردەکەوێت. ئەم پەڵانە بە بەرکەوتنی تیشکی خۆر زۆر زیاد دەکەن. هەروەها بە (ڕەنگی گۆشتی پنۆک پنۆک، بەڵەکی سور و سپی) دەگووترێت. بۆیە بە گای سوری بەڵەک بەڵەک دەگووترێت (گای شل). |
| šu-mah | مەزن<br>mighty | šāmā شاما: لە کوردیدا وشەی (ما) بە مانای گەورەیی نەماوە. بەڵام (شا) بە شێوەی جیاواز لەلایەن هوری، سۆمەری، هیتی و مانیەکانەوە بەکار هاتووە. |
| šun | پرشنگدار<br>shine | šaŋ شەنگ: لە کوردیدا مانای (جوان ولەبار) دەدات. ئەم وشەیە لە ئینگلیزیدا دەبێتە shine. |
| šuba | شوان<br>shepheard | šuān/ šivān شوان/شڤان: ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە shepheard و لە ئەڵمانیدا دەبێتە schäfer. |
| šur | باران بارین؛ شلەمەنی بەرهەمهێنان؛ چۆڕانەوە؛ دەرهێنانی ڕۆنی تۆو<br>to rain; to produce a liquid; drip; to extract seed oil | cor چۆڕ: ئەم وشەیە دەبێتە ڕەگی (چۆڕین، چۆڕانەوە) کە هەمان ئەو مانایە دەدات. لە ئینگلیزیدا وشەی shower دروستکراوە کە وەک کردار مانای (بارین، خۆشتن) دەدات. |
| šurin | سیسرە (مێروویەکە هەمیشە لە ناو باخدا زیکەی دێت)<br>cricket | sīsra سیسرە: ئاماژەیە بە هەمان مێروو. |
| šurin | فڕن، تەنور<br>oven | sur, firin سور، فڕن: (سور) ڕەگی وشەی (سووربوونەوەیە) کە مانای (سورکردنەوە) دەدات لە کوردیدا و (فڕن) هەر هەمان مانای وشە سۆمەریەکەی هەیە. |
| šu ur | سڕینەوە<br>erase | sir سڕ: ڕەگی وشەی (سڕینەوەیە). |
| šuš | شەشەم<br>sixth | šašam شەشەم: لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا نزیکە و لە زمانی گۆسی (Goth) دا دەبێتە saihsta و بە ئینگلیزی sixth. |
| tab | سوتاندن، ئاگر<br>to burn, fire | tāu/tāb تاو/تاب: مانای (گەرمی) دەدات بۆ نموونە (تاوی ئاگر). (تاو) دەبێتە ڕەگی وشەی (تاوانەوە/توانەوە) و هەروەها (تاو) بە کرمانجی سەروو مانای (خۆر) دەدات. وشەی (تاوە) کە کەلوپەلێکی چێشتە و بۆ خواردن سورکردنەوە بەکاردەهێنرێت. وشەی tab بە زمانی هوری مانای (توانەوەی کانزا) دەگرێتەوە. بە زمانی سانسکریت بە |

[67]. ناوی زانستی ئەم حاڵەتەی پێست بە ئینگلیزی پێی دەگووترێت Freckle.

| Sumerian | Kurdish / English | Explanation |
|---|---|---|
| | | (گەرمی) دەگوترێت tapa. |
| tab | نەخۆشی؛ تا<br>fever ،Illnes | tā تا: بە مانای بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای لەش دێت لە نەخۆشیدا کە هەمان مانا دەدات. لە هیتیدا بە (تا) ی کوردی دەگووترێت tapassa. |
| taka, taga, tak | پیاکێشان، لێدان، دەستپێکردنی ئاگر<br>to strike, hit, to start a fire | tak, taq تەق، تەک: (تەق) دەبێتە ڕەگی (تەقاندنەوە، تەقەکردن) و (تەک) دەبێتە ڕەگی (تەکان) کە مانای (پێداکێشان، بزوتنی بەگوژم، پاڵنان) دەدات. |
| tak | جێهێشتن، پشتگوێ خستن<br>to abandon; to neglect | tak تاک: ئەم وشەیە مانای (تەنها) دەدات. |
| tug ur | واز هێنان<br>abandon | taxir تەخر: بە مانای (واز هێنان) دێت. دەگووترێت (من جگەرەم تەخر داوە). |
| te | کونکردن<br>to pierce | te تێ: دەبێتە پێکهاتەی وشەکانی (تێ خە، تێ بە، تێ نێ، تێ برە، تێ ڕا) کە هەمیشە بەشێکە لە وشەکان کە پەیوەستن بە (تێخستن). |
| teĝ | نزیکبوون لە شتێک<br>(to be) near to | tak تەک: هەمان مانای هەیە. لە هیتیدا takš مانای (پێکەوەنان) دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە touch ، فەرەنسی touche کە مانای بەرکەوتن دەدات. لە ئیتاڵیدا دەبێتە tocco پورتوگالی toque. |
| ti | تیر<br>arrow | tīr تیر: هەمان مانای هەیە. |
| ti bala | خولانەوە یان جوڵان بە دەوری خاڵێکدا<br>turn sidway | te biālā تێ بئالا: واتە (خولانەوەی شتێک بە دەوری شتێکدا) بۆ نموونە (ئەو پەتەی تێ بئالە/بئاڵێنە) |
| ti rah | تەقاندن یان هەڵدانی شتێک<br>shoot | te rā تێ ڕا: بۆ نموونە دەگووترێت (ئاوی تێ ڕاه/ڕادە) کە مانای (تێ ڕادان، هەڵدان) ی ئاوەکە دەگرێتەوە. پێ دەچێت ئەمە بناغەی وشەی (تیر) بێت. |
| tibira | پەیکەر<br>sculpture | tīābira تیابرە: بۆ نموونە لە کوردیدا دەگووترێت (ئەو قوماشەی تیا برە). بەو جۆرە دەتوانرێت (ئەو پەیکەرەی تیابرە/ببرە) |
| tigul | قاپ و قاچاخێکی ماڵە<br>a pot | tīākul تیاکوڵ: واتە (ئەو شتەی کە شتی تێدا دەکوڵێنرێت) . |
| ti'uz, da-uz , ti-uš, ti-uz | باڵندەیەکە<br>a bird | tāus تاوس: پێ دەچێت ئەوە ناوی (تاوس) بێت، لەبەر ئەوەی کە uz لە سۆمەریدا پاشگرێکە زۆرجار لەگەڵ باڵندەدا بەکاردەهێنرێت. |
| tu | پێداکێشان؛ چنین<br>to weave | taun تەون: مانای (تەنینی ڕایەخ) دەدات. |
| tuduga | ئەو قسانەی کە دەگووترێت وەک بەشێک لە جادوگەری<br>incantation | jādugarī جادوگەری: پراکتیزەکردنی جادووە. |

| | | |
|---|---|---|
| tudur | خشڵ<br>Jewlery | dur دوڕ: (خشڵ و زێڕ) دەگرێتەوە. |
| túg | جلوبەرگ<br>cloth | tuk توک: مانای (مووی ئاژەڵ و مرۆڤ) دەدات. |
| túg-bir-ra | جل دڕاو<br>torn clothes ('cloth' + 'to rip to pieces' + nominative) | tuk bir āu توک بڕا و: لە سۆمەریدا وشەکان شیکراوەتەوە بە شێوەی (جلوبەرگ+دڕاندن+ جێگری بکەر). لە کوردیدا وشەکان پێک دێن لە (موو، وردەپەڕی مەڵ+دڕاندن+پاشگری بەناوکردنە). بەو جۆرە لە کوردیدا ماناکەی دەبێتە (موبڕاو) کە هێشتا جیاوازیان کەمە. |
| tukum | بەڵکو؛ ئەگەر<br>perhaps; if | taqāu, taqu تەقاو، تەقو: لە کوردیدا مانای (ئەی ئەگەر، بەشکو) دەدات. لە زمانی هیتیدا وشەکە دەبێتە takku. |
| ubur | مەمکی ئافرەت<br>female breast | uar وەر: بە زاراوەی گۆران، لاناوە لە شەرمینە و مەمکۆلان (جەلیلیان، پ.٣٨). |
| ud | لەو کاتەوەی<br>since | uatā وەتا: هەمان مانای دەدات (هەژار. پ. ٩١٦). |
| udra | بڕێکی زۆر، قازانج<br>excess, profit | dirāu دڕاو: لە کوردیدا دەگووترێت (ئەو پیاوە لە قەڵەویدا دڕاوە) یان بۆ ئاماژەکردن بە دەوڵەمەندی دەگووترێن (هێندە دەوڵەمەندە دڕاوە). لە زمانی سانسکریتدا دەبێتە udreka. |
| udun | فڕن (بۆ فەخفوری یان خشت)، تون/ئاتون<br>Kiln (for porrey or bricks), oven | ātun ئاتون: مانای (ئاگردانی حەمام، تونخانە) دەدات کـ ماناکەی نەگۆڕاوە. |
| udurduruna | کا<br>hay | drunadruna درونەدرونە: لە کوردیدا زۆر جار وشە دووبارە دەکرێتەوە بۆ نموونە (بە خزمەخزمە، جارجار، کەم کەم، هێواش هێواش، نازا نازا، یەکی یەکی) پێ دەچێت ئەمەش هەر هەمان وشەی (درونەوە) بێت و دووبارە کرابێتەوە، لەبەر ئەوەی زۆر وشەی پەیوەندیدار بە کشتوکاڵ وشەی duru ی لەگەڵدایە. |
| ug | گرژبوون، توڕەبوون<br>(to be) furious; anger | āx ئاخ: دەربڕینی توڕەبوونە. |
| ug | بچووک، زۆر بچووک<br>tiny, very small | cuk چوک: هەمان مانای هەیە. |
| ugula | ڕێنمایی کار؛ چاودێریکار، وەستا<br>instructor; overseer, foreman | qolā قوڵا: مانای کەسێکی (ڕێک، شیاو) ی هەیە و پێچەوانەی وشەی (ناقوڵا) یە (هەژار، پ.٥٦٧). |
| u'il | هەڵگر<br>carrier | hel ,hal هێل، هەڵ: (ناوهێل) ڕەگە بۆ (ناو هێلانین) کە دەرهێنانی ناوە و (هەڵ) پێشگرێکە مانای |

| | | |
|---|---|---|
| | | (بەرزکردنەوە) دەدات. |
| ukuku | باڵندەیەکە<br>a bird | kukuxtī کوکوختی: لە کوردیدا (قومری) شی پێ دەگوترێت. |
| ukul | جۆرێکە لە گیاکەڵ<br>type of weed | gīākal گیاکەڵ: گیای زیانبەخشی نەویستراو پێی دەگووترێت (گیا کەڵ)، بەشێ لە وشەکە وەک خۆی ماوە. |
| ukur | قەساب<br>butcher | agur/gur ئەگور/گور: جیاکردنەوەی پێستی ئاژەڵە لە لەشی. |
| ukurum | جۆرێکە لە خشت<br>a type of brick | uaqur/qur وەقوڕ/قوڕ: (وەقوڕ) مانای (لەقوڕ) و (قوڕ) گڵی تەڕە کە مادەی دروستکردنی خشتە. |
| ù-a | خەوتن<br>sleep | xau/hau خەو/هەو: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەی (خەو/هەو) دەگووترێت (هەژار، پ.١٠٠٨). |
| ù...ku | خەوتن<br>sleap<br>('sleep' + 'to lie down; to enter'). | xau/hau kau خەو/هەو کەو: وشە سۆمەریەکە شیکراوەتەوە بە شێوەی (خەو+ پاڵکەوتن؛ هاتنە ژوورەوە) و بە کوردی دەبێتە (خەو+کەو). لە کوردیدا وشەی (خەو) مانای خەوتن و (کەو) مانای پاڵکەوتن دەدات. بۆ نموونە دەگووترێت (ئەو کوڕە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا کەوتووە). ئەگەر بە کوردی ئەمڕۆ بگووترێت دەتوانرێت بگووترێت (بە خەوا کەو/کەوتووە). |
| ula | جەنگ<br>battle | halā هەڵا: مانای (شەڕ و ناخۆشی) دەدات و بە زمانی هیتی وشەی ḫulle مانای (شڕکردن، ئاژاوە) دەدات. |
| ula | لاوازی لەش<br>(to be) feeble | hīlāk هیلاک: هەمان مانای هەیە. |
| ulilla | شیوەنکردنێکە<br>a lament | lāilāīā لایلایە: جۆرێکە لە شینکردن. بە هوری alilan بەکاردەهێنن، کە لەگەڵ کوردیەکەدا یەکدەگرێتەوە و بە زمانی لاتینی دەبێتە ululates و بە ئینگلیزی دەبێتە wail. |
| ul | گوڵ، خونچە<br>flower, bud | ul وڵ: مانای (گوڵ، خونچە) دەدات (هەژار، پ.٩١٤). |
| ul | وێڵ<br>remote | ul, uel وڵ، وێڵ: بە هەردوو شێوەکەی هەمان مانا دەدات. |
| ULMA | ناوێکە بۆ هەر مادەیەکی کەڵەکە بوو<br>designation of mound | ulma وڵمە: بریتیە لە پارچە گۆشتی گەورەی بێ ئێسقان. |

| | | |
|---|---|---|
| ulu | بای باشور، شەیتان (جنۆکەی خراپە) south wind; a demon | هەڵا، ئاڵە: (هەڵا) چەند مانایەکی هەیە (ڕزیو، پلیخاو، کێشەو شەڕ، دنیای بێ خۆر) و (ئاڵە/هاڵە) ناوی جنۆکە (شەیتان) یکە کە دوژمنی زەیسانە (ژنی تازە منداڵ بوو) ( هەژار، پ. ١٠، ١١ و ٩٨٣ ). کورد پێی وایە زەیسان و کۆرپەی ساوا لە ژێر مەترسی ئەودان و هەندێک جار دەیانکوژێت. بە زمانی هیتی ẖulle مانای (شەڕکردن، ئاژاوە) دەدات. لە ئینگلیزیدا بە شێوەی hell و بە ئەڵمانی بە شێوەی hölle دەردەکەوێت کە مانای (دۆزەخ) دەدەن. (هەڵ) دەبێتە ڕەگی وشەی (هەڵکردن) کە دەستپێکردنی بایە. لە ئینگلیزیدا hell مانای (دۆزەخ) دەدات و لە ئەڵمانیدا دەبێتە hölle و هۆڵەندی hel. halā, āla |
| unu | ڕازاندنەوە، خشڵ adornment, jewelry | هۆنی: ڕەگی وشەی (هۆنینەوەیە) کە بۆ ملوانکە دروسکردن دەبێت و بۆ داڕشتنی شیعریش دەبێت. بەو جۆرە هاوشێوەیە لەگەڵ وشەی ڕازاندنەوەدا. honī |
| unu | هۆڵی خواردن؛ پیرۆزترین شوێنی پەرستگە؛ جێگە، شوێنی ژیان dining hall; the most sacred part of a temple; domicile | ناو: مانای (سەنتەر، ناوەند، ناوەڕۆک) دەگرێتەوە. nāu |
| unu | ژەم، خۆراک؛ کاتی خۆراک؛ مێز meal, food; meal(-time); table | خوان: مانای سفرەی خواردن دەگرێتەوە. xuān |
| ur | سەگ dog | وەڕ: دەبێتە ڕەگی (وەڕین). بە زمانی هوری بە سەگ دەڵێن arbi کە دیسان لە ناوە سۆمەریەکە نزیکە. uar |
| ur | لێکردنەوە to pluck | وەڕ: دەبێتە ڕەگی (وەڕاندن) کە بۆ لێکردنەوەی بەرووبوم، بەکاردەهێنرێت و هەمان مانای هەیە. uar |
| ur | سورکردنەوە (بۆ خۆراک) fry | ئاور: مانای (ئاگر) دەدات. لە هیتیدا war مانای (سوتاندن) دەدات. لە سانسکریتدا vIra مانای ئاگر دەدات و لە لاتینیدا uro دەبێتە کرداری (سوتادندن). āur |
| urar | وشەیەک کە لە شێوەی دەنگەکەوە سەرچاوەی گرتووە a sound (onomatopoeic) | ورەور: ئاماژە کردنە بە قسەکردنێکی ناڕوون. uraur |
| uraš | زەوی | ئەرز، عەرد: هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە arz, ard |

| سۆمەری | مانا | ڕوونکردنەوە |
|---|---|---|
| | earth | بە زمانی هوری دەبێتە ardi و کە هاوشێوەی کوردیە و بە سانسکریت دەبێتە urvI، ئینگلیزی دەبێتە earth، بە دانیمارکی و سویدی و نەرویجی jord و بە هۆڵەندی aarde و بە ئەڵمانی erde. |
| urbad | سەربان<br>rooftop | haurabān هەورەبان: (هەورەبان) مانای سەربان دەگرێتەوە. بە زمانی هوری بە ئاسمان دەگوترێت xawurni کە بە ڕوونی (هەور) ی تێدا بەدی دەکرێت. |
| urdib | بەچکە (هی گیاندارە شیردەرەکان)<br>cub | ورد urd: ئاماژەیە بە (بچوکی) بۆ نموونە (منداڵەکانت وردن) و (ووردیلە) مانای (منداڵ) دەدات. |
| urgir (ur-)<br>(gir) | سەگی ماڵی<br>(domestic) dog | uaragīr وەرەگیر: ur مانای سەگی هەیە و بە سۆمەری، بەڵام بە کوردی ئەو دەنگەیە کە سەگ دەیکات. (گیر) دەبێتە ڕەگی وشەی (گیربوون، نیشتەجێ). بۆ نموونە (ئەو منداڵە زەحمەتە لێرە گیر بێت). بەو جۆرە ماناکە دەبێتە (سەگی گیربوو، سەگی نیشتەجێ). |
| úrgu | توڕەبوونی زۆر<br>rage | riq, urg ڕق، وڕگ: (ڕق) مانای (توڕەیی، کینە) دەدات (هەژا، پ. ٣٤٧) (وڕگ/وڕک) مانای (گڕو، پەڵپ) دەدات. دەبینرێت لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا دەبێتە rage و لە سانسکریتدا دەبێتە ruS. |
| urra | قەرزێک کە قازانجی لەسەر بێت؛ قەرز؛ چاکە<br>interest-bearing loan; debt; favour | uār, uer وار، وێر: لە کوردیدا (وار) ئەو پارەیە کە خانەخوێی قومارکردن بۆ هەر سەرێکی یاریکردن وەریدەگرێت. (وێر) پارەدانە بە پیاوەتی و چاکە بۆ کەسێکی تر کە ماناکانی هەمووی ماون. |
| uru | شار، شارۆچکە، گوند، ناوچە<br>city, town, village, district | uār, ār وار، ئار: لە کوردیدا (وار) مانای (گوند، دەڤەر، ناوچە، شوێن) و (ئار) مانای (جێی گەورە، شار، هەوار، نسار، جێ نسێ، جێگە) دەدات (هەژار. پ.٣). وشە سۆمەریەکە بووەتە پێکهاتەی ناوی زۆر لە شارە کوردیەکانی وەک ورمێ (ئورمێ)، (ئوربێلا/وربێلا/هەولێر) ، ئورفە، هەروەها (uruk ئوروک) کە هەندێک سەرچاوە بە بنەچەی ناوی عێراقی ئەمڕۆی دادەنێن و شارەکانی وەک (ورمێ)، بنەچەی ناوەکانیان هەمووی سۆمەرین. چەند دێیەک هەیە لە کوردستاندا بە ناوی (وارە ڕەش، وارە مانە، بەرواری باڵا). لە یۆنانیدا بەشێوەی xira دەردەکەوێت و لە لاتینیدا urb مانای (شار) دەدات و ئەم وشەیە بە شێوەی urban لە لاتینیەوە چووتە ئینگلیزی وەک ناوەڵناو بە مانای ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە (شار) ەوە و لە زمانی فەرەنسی و ئیسپانی و ئیتاڵیشدا دەردەکەوێت. |

| | | |
|---|---|---|
| uru-bar-ra | دەرەوەی شار، قەراخ شار، قەراخ لادێ<br>outside the city, outskirts of the city, the countryside ('city' + 'outside' + nominative). | bar uār, uār bar بەر وار، وار بەر: لە کوردیدا دەتوانرێت بە هەردوو شێوەکەی بنووسرێت. |
| uru | ئازا؛ بەهێز، زیرەک<br>valiant; strong; clever | uer/urīā وێر/وریا: (وێر) مانای (ئازا، ئازایەتی) و (وریا) مانای کەسێکی (زرت و زیرەک) دەدات. لە هوریدا íw(i)ri مانای (سەرگەورە، پاشا) دەدات. لە سانسکریتدا (ئازا) دەبێتە uruvikrama. |
| uruh | پیاوێکی ئاینیە کە سەرەمۆنی پرسە نمایش دەکات<br>a priest who performs funerary rites" | hora هۆرە: جۆرە گۆرانیەکی فۆلکلۆری کوردیە، کە لە ناوچەکانی کرماشانەوە هەتاوەکو شارەزوور دەگوترێت. لە ڕووی دارێژراوی مۆسیقاوە، هۆرە زۆر سادەیە بەڵام شێوەی گوتنی زۆر گرانە و تایبەتمەندە. بە هیچ جۆرێک هاوشێوەی ئەو جۆرە گۆرانی گووتنە لە ناو ڕۆژهەلاتی ناوەراستدا نیە. ئەم گۆرانیە بۆ دەربڕینی بابەتی غەمگین و دڵخۆشکەرانە دەگوترێت. هەر ناوچە یان عەشیرەتێک هۆرەی تایبەتی خۆی هەیە. بۆ نموونە (هۆرەی جاف، هۆرەی قەڵغانی......). دەشێت لە ڕابردوودا ئەم شێوە گۆرانیە بەشێک بووبێت لە سەرەمۆنی پەرستنی خۆر/هۆر یان گۆرانی هوریەکان خۆیان بووبێت. |
| uru nu | شار نیە<br>Its not city | uār nau/nīa وار نەو/نیە: هەمان مانا دەدات.(بڕوانە وشەی uru بکە بە مانای ناوچە). |
| ús | وەستان بە شتێکەوە (خۆراگرتن بەشتێکەوە)، وەستان لەسەر شتێک، ڕاگرتنی شتێک.<br>lean, to stand upon, to support | ues وێس: دەبێتە ڕەگی (وێسان) کە ماناکانی دەبێتە (وەستان لەسەر شتێک، ڕاگرتنی شتێک، خۆڕاگرتن بە شتێکەوە). |
| usar | هاوسێ (مێ)؛ ژنی دووهەمین<br>(female) neighbor; secondary wife | hāusar, hāuse هاوسێ، هاوسەر: (هاوسێ) مانای (دراوسێی هەیە) و ژن و مێرد بۆ یەکتری دەبنە (هاوسەر). |
| ussu | هەشت<br>eight | haš/hašt هەش/هەشت: بە هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا ماوە. لە زمانی ئیتاڵیدا دەبێتە otto، ئیسپانی ocho و لاتین octo. |
| usu | هێز<br>force | hes/hez هێس/هێز: هەمان مانای هەیە و لە هوریدا eγeps مانای ماسولکە گرژبوون دەدات. لە زمانی هیتیدا hazziya مانای پاڵنان دەدات و بە زمانی لوڤی wiši مانای پەستان دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| usu | پیشە، توانا<br>skill | uasā وەسا: کەسێکە کە شارەزا و کارامە بێت و نازناوێکە دەدرێت بە خاوەن پیشە. |
| ušu | سی (٣٠)<br>thirty | sī سی: لە کوردیدا نزیکە، هەروەها لە سۆمەریدا بە ژمارە (سێ) ش دەگووترێت eš. |
| utah | بەهەشت<br>heaven | tāu/hatāu تاو/هەتاو: مانای تیشکی خۆری هەیە. |
| utu | خوای ڕۆژ<br>sun-god | tāu/hatāu تاو/هەتاو: هیتیەکان و سۆمەریەکان بە خوای ڕۆژ (sun-god) دەڵێن utu، کە هەمان (هەتاو hatāu) ی کوردیە. |
| utu'e | خۆر هەڵاتن<br>sunrise | hātaua هەتاوە: هەمان مانا دەدات. لە سانسکریتدا دەبێتە udaya. |
| uzgab | ژوورەوەی پەرستگە، نزرگە؛<br>cella, shrine | uesga وێسگە: مانای (شوێنی وەستان) دەدات. |
| za | تۆ<br>you (singular) | tu/to/ta تۆ/تە/تو: بە هەردوو شێوەکەی دەگووترێت. لە زۆربەی زمانە هیندۆ ئەوروپیەکانی تردا نزیکە. ئەڵمانی sie فەرەنسی toi بە ئیسپانی te و کرواتی ti. |
| zabar | bronze<br>برۆنز | zer زێر: لە زمانی کوردی مانای (کانزا بەنرخەکەی خشڵ) دەدات و (زێڕ) بە زمانی میدی دەبێتە zar و بە هوری دەبێتە hijari. ئەم وشەیە لە زمانەکانی تردا دەبینرێتەوە؛ بۆ نموونە ئیسپانی و ئیتالّی oro، پورتوگالی ouro، لاتینی aurum و فەرەنسی or. لە سانسکریتدا وشەی zubhra مانای (پرشنگدار، جوان، زیو) دەدات. |
| zagga | جیکەجیکە کردنی باڵندە، بریسکە/زەق<br>to twitter, to sparkle | jīka, zīka, zāqa, zaq جیکە، زیکە، زاقە، زەق: (جیکە) ئەو دەنگەیە کە باڵندە دەیکات بە تایبەتی چۆلەکە، (زیکە) مانای دەنگی جوکن و مانای زریکەش دەدات. (زاقە) بریتیە لە دەنگی تیژی منداڵ. (زەق) بریتیە لە ڕەنگێک کە زۆر دەربکەوێت, دەگووترێت (ڕەنگی کراسەکەت زۆر زەقە) کە جگە لەڕەنگ بۆ هەموو شتێک کە زۆر بکەوێتە بەرچاو (زەق) ی بۆ بەکار دەهێنرێت. |
| zagin | زەقبوون<br>shining | zāqīn زەقین: یان زەقبوون واتە دەرکەوتن لە ناو کۆمەڵێک شتدا. |
| zaginduru | درونەوەی زووی دانەوێڵە<br>early harvested grain | zaqīnduru زەقین دورو: مانای درونەوەی ئەوەی کە زەقە و گەشاوەتەوە. |
| zaginduru | بەردی خشڵی شینی تۆخی پیرۆزەیی<br>lapis | zaqīndur زاخین دوڕ: لە کوردیدا بە مانای (دوڕی بەردین) دێت کە هەمان مانایە. |
| zah | چوونە ئەو لاوە، پاشەکشێ؛ خۆ بەدوور خستن | jīā جیا: ئەم وشەیە بە مانای (جیابوونەوە لە کەسێک) دەدات. هەروەها ئاماژەیە بۆ بزربوون کاتێک کە |

| | | |
|---|---|---|
| | بزربوون<br>to move away, withdraw; to stay away; (to be) lost | دەگووترێت (سەربازەکە لە هێزەکەی جیابووەوە) هەروەها (خۆ جیاکردنەوە) مانای (خۆ بەدوورخستن دەدات). |
| zal | کەسێکی نایاب<br>noble | zāl زاڵ: مانای پاڵەوانی هەیە و هەروەها مانای سەرکەوتوویی هەیە بەسەر لایەنی دوژمندا یان لایەنی بەرامبەردا. لە زمانی هیتیدا salli مانای (مەزن) دەدات. ئەم وشەیە چووەتە داستانی ناوچەکەوە و بووەتە بەشێک لە ناوی ڕۆستەم کە بە (ڕۆستەمی زاڵ) ناو دەبرێت. لە زمانی فارسیدا وشەی (زاڵ) تەنها ناوی باوکی ڕۆستەمە، بەڵام لە زمانی کوردیدا جگە لەوەی کە ناوە، چەند مانایەکی تریشی هەیە. بۆیە (ڕۆستەمی زاڵ) مانای (ڕۆستەمی سەرکەتوو بەسەر بەرامبەردا) دەگرێتەوە. لە هوریدا adali٢ مانای (بەهێز) دەدات. |
| zala | کوتراو، پیاکیشراو<br>smashed | zala زلە: مانای (زلە) دەدات. کە ئەویش پێداکێشانە بە دەست. |
| zalag | پاکی؛ ڕوناکی (ئاگر) ؛ ڕۆشنی، پرشنگداری<br>(to be) pure; (fire) light; (to be) bright, to shine | dalāq, zulāl دەلاق، زولاڵ: (دەلاق)بریتیە لە کون لە دیواردا کە ڕۆشنایی لێ دێت. (زولاڵ) بۆ دەنگی پاک و ئاوی ڕون بەکار دەهێنرێت، دەگوترێت 'دەنگی زولاڵە یان ئاوێکی ڕون و زولاڵە'. |
| zana | کرمێک کە دەبێتە پەپولە یان مێروو<br>larva, caterpillar | zāīn زاین: مانای (زاوزێ) دەدات. |
| zara | نیگەرانی زۆر<br>(excessive) concern | zār زار: ماناکانی (کز و لاواز، پەرێشان و لێ قەوماو، دەنگی گریان) دەدات (هەژار، پ. ٣٧٢). |
| zarah | هاوارکردنی بەرز لە تورەیی، ئازار یان غەمگینیدا<br>wailing | zara زەرە: دەنگی کەرە و بە دەنگی ناخۆشیش دەگووترێت (زەرە ) یان( زەرین) هەروەها ماناکانی وشەی (زار) لە سەرەوە ڕوونکراوەتەوە. |
| ze | زراو، زەردی زراو<br>gall bladder; bile | zar, zirāu زەر، زراو: (زەر) ئاماژەیە بە ڕەنگەکە و (زراو) ئەو ئەندامەی لەشە کە شلەیەکی زەردی تێدایە (زەردی زراو) ئاماژەیە بە شلە زەردەکەی زراو. لە هەردوو ناوەکەدا ڕەگە سۆمەریەکە بەدی دەکرێت. بە سانسکریت بە (زەرد) دەگووترێت zAra. |
| zi | بەرزبوونەوە<br>to rise | ziā زیا: هەمان مانا دەدات. لە زمانی لوڤیدا دەبێتە izi کە مانای (زیادکردن) دەدات. |
| zi | ژیان<br>life | žī, jīu ژی، جیو :(جیو، ژی) هەمان مانا دەدەن (هەژار، پ.١٩٣) . وشەی (ژیان) لە زمانی یۆنانید دەبێتە zoi و بە کرواتی ziv و بە ڕوسی zhit’ و بە |

| | | |
|---|---|---|
| | | سربی živeti و بە چیکی život' بە پۆلۆنی żyć. |
| ziana | heavenly life<br>ژیانێکی خۆش (ژیانێکی بەهەشتی) | žīān ژیان: مانای (ژیان) دەدات (بڕوانە وشەی ڕابردوو). لە زمانی سانسکریتدا دەبێتە Jivana. |
| zid | ئارد<br>flour | zād زاد: مانای (دەخڵ و نان، توێشو) دەدات (هەژار، پ.٣٧٢). |
| zig | ئاوسان؛ پانبوون؛ بەرزبوونەوە<br>to swell; to expend; to rise | zig/sik : ڕەگن بۆ (زگدان/سکدان) کە مانای (هەڵئاوسان و بەرزبوونەوە) ی هەیە. بۆ نموونە دەڵێن (ئەو دیوارە سک/زگی داوە) و دیارە دەبێتە بنەچەی وشەی (سگ/سک) لە کوردیدا. |
| zigan | تەختەی ئاراستەکردنی بەلەم (سوکان) | sukān سوکان: ئەم وشەیە بە کوردی وەک خۆی ماوە و بە ئەکەدی پێی دەگوترێت sikkānu. ئەمە کۆنی وشە کوردیەکە دووپات دەکاتەوە. |
| zigal | هێنانی ژیان، زیندوو<br>living, life-brining | zīkil زیکڵ: مانای (هوشیار، زرنگ) دەدات. |
| zi ir | هەستکردن بە ناڕەحەتی<br>feel troubled | zīra زیرە: لە کوردیدا ئەم وشەیە مانای هەستکردن بە تۆقین و ترساندن دەگەیەنێت، بۆ نموونە (لە ترسا خەریکە زیرە ئەکەم). کە هەمان مانای ماوە. |
| zu | زانین، فێربوون<br>to know; to learn | zān, zā زان، زا: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات و بووەتە بناغەی وشەی (زانا) و لە وشەی (زیرەک) یشدا بەدی دەکرێت. ئەوەی کە تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە لە زمانی سۆمەریدا هەندێک جار پیتی (ن) ی کوردی نانوسرێت. نازانرێت ئایا ئەوان ئەو وشەیان لە نووسیندا نەخوێندۆتەوە یان ئەو کەسانەی کە فەرهەنگی سۆمەریان داناوە پێیان وابووە پیتی (ن) زیادەیە. بۆ نموونە لە سۆمەریدا بە وشەی (نەزان) ی کوردی دەڵێن nu-zu، لە بری (ستان) کە پاشگرێکە لە کوردیدا بۆ ناوچە بەکاردەهێنرێت، سۆمەریەکان ašte بەکاردەهێنن کە دیسان پاشگری (ن) دەرناکەوێت. لە هەندێک وشەی تریشدا هەمان حاڵەت ڕوو دەداتەوە.<br>سەرەڕای ئەوە وشەی (زان) لە کوردیدا بە (زا) ش دەگووترێت. لە ناوچەی هەورامانی تەخت ئەو وشەیە وەک خۆی بە (زا) ش دەگووترێت. لە شیعری مەستورە خانم (١٨٠٥ز ١٨٤٨ز) دا ئەو وشەیە بە شێوەی (زا) دەردەکەوێت، کاتێک کە دەڵێت:<br>__بزا__ چۆن لە شار خۆم وا دەرکرام<br>کە دوور کەوتمەوە لە خوشک و برام<br>__بزا__ چۆن ئاوا هاڵمە ناو مەینەت<br>ئاخ سەد ئاخ لە دەس ئەم کەین و بەینەت<br>هەروەها لە شیعری سان زەهاکی ڕێبەری یارسانەکاندا و لە سەدەی سیانزەهەمی زایندا ئەو |

| | | |
|---|---|---|
| | | وشەیە بە (زا) گووتراوە:<br>عیسی باوەما، عیسی باوەما داود تۆ بزا عیسی باوەما<br>شێخ و بەرزنجە حاجی و کاوەما چێگا ئاخر مۆر<br>فەرزەن لاوەما رجاجی بنیام چێوەر هاوەما<br>(بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.١٦٢).<br>ئەم وشەیە لە زمانە هێندۆ ئەوروپیەکاندا بە شێوەی<br>جیاواز ماوە؛ scio لاتینی، znati کرواتی، wissen<br>ئەڵمانی، wise ئینگلیزی، znaya بولگاری، znat′<br>ڕوسی، znać پۆلۆنی. بەپێی هەندێک سەرچاوە<br>بنەچەی وشەی zand ی ئاڤێستاش لە وشەی<br>(زانzan) دروستکراوە<br>.(Yule and Burnell, 1996, p.982) |
| zubi | چەم، جۆگە؛ جۆرێک لە ئاودان<br>watercourse, canal | ze زێ: بە مانای (ڕوبار، چەمی گەورە) دێت. هەر ئەم ناوانەیە کە بە درێژایی مێژوو دراوە بە ڕووبارەکانی زاب/زێی گەورە و زاب/زێی بچووک. |
| zur | شڵەقاندنی شلە<br>roil | xur خوڕ: (خوڕ) مانای (جوڵەی خێرای ئاو) دەدات. |
| zurzar | دەنگێکە<br>a sound | zurazur زورە زوڕ: ماناکەی دەبێتە (دەنگی گریانی گڕ لەسەر یەک) (هەژار، پ.٣٨٤). |

# بەشی ٢
# سەرەتایەک سەبارەت بە دەوڵەتەکانی هەزەبان و کوردیان

لە دەوروبەری سەدەکانی دووهەم و یەکەمی پێش زایینەوە کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی سێ پاشای سەرەکی کورد دا بوو؛ میدیەکان، هەزەبانیەکان و کوردیان. هەرچەندە پاشای بچوکتر هەبوون، بەڵام ئەو سیانە دیارترینی پاشای کوردی ناوچەکە بوون. وردە وردە دەسەڵاتی میدەکان ڕووی لە کزی دەکرد و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان بەرتەسکتر دەبووەوە و زیاتر حوکمڕانیان لە ئازەربایجاندا دەکرد. سەرەڕای ئەوەی کە میدەکان هێزو دەسەڵاتەکەی جارانیان نەمابوو بەڵام هێشتا دەوڵەتەکەیان ئەکتەرێکی گرنگی ڕووداوە سیاسی و سەربازیەکانی ناوچەکە بوو. شانبەشانی لاواز بوونی میدەکان؛ دوو دەوڵەتی تری کوردی بوژانەوەیان بە خۆیانەوە دەبینی کە بریتیبوون لە کوردیان و هەزەبان. ڕیشەی دەسەڵاتی ئەم دوو دەوڵەتە دەگەڕایەوە بۆ هەزاران ساڵ، بەڵام لە دوا سەدەکانی پێش زایینەوە، دەسەڵاتیان بەشێوەکی بەرچاو ڕووی لە گەشانەوە دەکرد. دەوڵەتی کوردیان ( Cordyene) بە ڕێژەیەکی کەمتر لە هەزەبان و میدەکان ڕۆڵی دەبینی. هۆکاری بەرفراوان نەبوونی دەسەڵاتی کوردیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سنوری دەوڵەتەکەیان بە سنوری ڕۆمانەکانەوە بوو کە ئەو کاتە بەهێزترین دەوڵەتی جیهان بوو، بەڵام ناوچەی دەسەڵاتی مید و هەزەبانەکان دورتر بوون. واتە بۆ ئەوەی کە ڕۆمانەکان دەستیان بە دوڵەتی میدەکان و هەزەبانەکان بگات دەبوو بەسەر ناوچەی دەسەڵاتی کوردیاندا تێبپەڕن ( بڕوانە نەخشەی ژمارە ٩). لە دوای کۆتایی سەدەی سێهەمی زایینەوە کۆتایی بە ڕۆڵی پاشاکانی هەزەبان و میدەکان وەک پاشا هێنرا. بەڵام وەکو دەسەڵاتی ناوچەیی (مەرزبان) ی ساسانیەکان ڕۆڵیان هەر مابوو، بەتایبەتی دەوڵەتی هەزەبانەکان کە لەپاش هاتنی عەرەبە موسوڵمانەکانیش سەرلەنوێ بە هەمان ناوەوە دروست بووە و هەتاوەکو نزیکی سەدەی سیانزەهەمی زایینی دەسەڵاتی گرنگی کوردستان بوو.

# دەوڵەتی هەزەبان (Adiabene)

### ناوی هەزەبان

یەکەم جار ناوی ناوچەی هەزەبان لە مێژوودا لە دەوروبەری سەدەی هەژدەی پێش زایین بە شێوەی ئەهازوم (Ahazum) هاتووە وەک ناوچەیەکی دەسەڵاتی هوری. شوێنی دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە لە نزیک شاری هەولێر بووە و لە هەردوو ئەرشیفی شەمشارە (Shemshara)[68] و ماری (Mari) دا ناوی هاتووە. هەڵبەت دەبێت ئەوە لەبیر نەکرێت کە ناوی Ahazum لە ئەرشیفی ئاشوریەکانەوە وەرگیراوە و ئاشوریەکان زۆرجار پاشگری um- یان لەسەر ناوی دەوڵەتە بچوکەکانی ئەو سەردەمە داناوە، واتە پاشگرەکە بەشێک نیە لە ناوەکە خۆی. بۆ نموونە لە ناوی ناوچەکانی وەک Haburatum, Gutium, Ekallatum, Simurrum ،هتد. دا هەمان ئەو پاشگرە دەبینرێت. ئەوەی کە ئەو بۆچونە بەهێز دەکات کە ناوی ئەو شوێنە لەلایەن هوریەکانەوە دانراوە ئەوەیە کە پێش هاتنی ئاشوریەکان ئەو ناوچەیە سەنتەری

---

[68]. ئەرشیفێکی گرنگ بوو کە لە نزیکی ساڵی ١٩٥٦ دا و پێش دروستکردنی بەنداوی دوکان و پڕکردنەوەی ناوچەکە بە ناو، لەگەڵ چەندین ناسەواری تردا دۆزراوەتەوە و لەلایەن شوێنەوارناسێکی دانیمارکیەوە دۆزینەوەکان کراوە و لە ژێر ناونیشانی ئەرشیفی شەمشارە (Shemshara Archive) ووردەکاری و زانیاریەکان بلاوکراوەتەوە و زانیاری ووردی سەبارەت بەو سەردەمەی کوردستان تێدایە.

دەسەڵاتی هوریەکان بووە و Hazzi ناوی خوای چیای هوریەکان بووە؛ پێ دەچێت شارەکە بە ناوی خوای چیای هوریەکانەوە ناونرابێت. بۆیە دەبێت کە ناوی ئەو دەوڵەتە لە بنەچەدا بریتی بووبێت لە هەزی (Hazzi). تەنانەت لە هەندێک سەرچاوەدا کە باس لە ڕووداوەکانی سەدەی یەکەمی زایین دەکات، ئەو ناوچەیە بە Ahazia[69] ناوبراوە (Harrak, 2005, P.17). لە دوای سەدەی یەکەمی زایینەوە لەهەموو سەرچاوە مێژووییەکاندا ناوەکە بووەتە هەزە (Hazza) و دوایی لە سەردەمی نوێتردا لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا بە (حزة) ناسراوە. ئەو ناوچەیە بە بەشێک لە ناوچەی هەزمبان (Adiabene) دانراوە. سەبارەت بە جێگای جوگرافی Ahazum، هەردوو مێژوونوسان ئەیدەم و لایسۆ پێیان وایە ئەهازوم (Ahazum) ناوچەی دەشتایی نێوان ڕانیە و هەولێرە و کەوتوتە دەوروبەری کۆیەی ئەمڕۆ هەتا تەق تەق (Eidem and Læssøe, 2001, p.22). سەرچاوە مێژووییە یۆنانی و ڕۆمانەکان لەو سەردەمەدا ئاماژەیان بەو ناوچەیە کردووە بە شێوەی Adiabene. مێژوونوسی ڕۆمانی، مارسێلینۆس، لە سەدەی چوارەمی زاییندا پێی وایە کە بنەچەی ناوی ناوچەکە لە ناوی (زاب) ەوە هاتووە، بەڵام دوایی کە بۆچوونی خۆی سەبارەت بە ناوەکە شی دەکاتەوە، دەڵێت " دیاباس (Diabas) و ئەدیابەس (Adiabas)؛ هەردووکیان دوو ڕووبارن کە پردی بەلەمییان لەسەرە و هەزمبان (Adiabene) ناوەکەی لەمەی دواییانەوە وەرگرتووە" (Marcellinus, 1894, p.334). مارسێلینۆس مەبەستی لە زێی گەورە و زێی بچووکە. دەبینرێت کە ئەو نوسەرە بەشێکی ڕاستیەکەی گوتووە بەڵام ناڵێت ئایا چۆن Adiabas بووە بە Adiabene.

دەبێت ئەوە بزانرێت کە وشەی (زاب) لە بنەچەدا سۆمەری/کوردیە، چونکە سۆمەریەکان بە ڕووبار دەڵێن Zubi و لە کوردی نوێدا پیتی (ب) لە وشەکە لابراوە و کراوەتە (زێ)[70] کە هەر بە مانای (ڕووبار) دێت و پاشگری ene لە لە سۆمەریدا ئامرازی بە کۆ (جمع) کردنە کە لە کوردیدا دەبێتە (ان/یان). واتە بە سۆمەری ئەگەر بگووترێت زێیان (زێ+یان) (ڕووبارەکان) ئەوا دەگوترێت Zubiene (zubie+ene)[71]. لە ڕاستیدا ناوەکە ناوی شارێک بووە بە ناوی (هەزە) و لە نێوان هەردوو زابدا بووە، بۆیە پێیان گوتووە (هەزەی زابان/هەزەزابان). وا دەردەکەوێت کە لەگەڵ تێپەڕ بوونی کاتدا ناوەکە بووەتە (هەزمبان) و لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا بە شێوەیەکی نزیک لە ناوە کوردیەکە پێی دەڵێن "ئەدیابینێ"[72] (Adiabene) ، بەڵام ئارامیەکان کردوویانەتە (حدیاب). واتە ناوەکە لە سەردەمی سۆمەریەکان هەتاوەکو ئەمڕۆ هەر هەمان مانا دەدات. جگە لەوە مارسێلینۆس ئاماژە بە ڕاستیەکی تریش دەکات کە دەڵێت کە جاران پێیان دەگووت ئاشوریا (Assyria). لێرەدا ئەو ڕاستیە مێژووییە دووپات دەکاتەوە کە ماوەیەک بەهۆی هاتنی ئاشوریەکانەوە ناوی ئاشوری بە ناوچەکە دراوە، بەڵام پاشتر ناوە مێژووییە دێرینەکەی خۆی وەرگرتۆتەوە کە لە پێش هاتنی ئاشوریەکاندا هەیبووە.

---

[69]. لە کتێبی The Acts of Mar Mari the Apostle دا باس لەوە دەکات کە پاشای هەولێر نەخۆشیەکی هەبووە بە ناوی "نەخۆشی شێری ئەهەزیە" (disease of the lion of Ahazia) کە ئاماژە بووە بە نەخۆشیەک کە لەو ناوچەیەدا بەو ناوە ناسرابوو. بە پێی سەرچاوە ڕۆمانەکانی وەک مارسێلینۆس (Marcellinus, 1894, P.177)، ناوچەی هەولێر لە سەدەکانی یەکەمدا ژمارەیەکی بێ شومار شێری تێدا بووە. ئەمەش دیسان ئەوە دەسەلمێنێت کە ناوەکە ئاماژەیە بە هەمان شار و Ahazia هەر ناوە دروستەکەی Ahazum بووە و دوایش لە سەرچاوەکاندا بووەتە Hazza/Haza.

[70]. زۆر وشەی تری کوردی پیتی (ب) ی تێدا لا دەبرێت بۆ نموونە لە هەندێک ناوچە بە (کەباب) دەڵێن (کەواو) و وشەی وەک (دەرباز) بە (دەرواز) یش دەگووترێت یان (بەفر/وەفر، نەبی/نەوی، بە/وە، ...).

[71]. لە زمانی سۆمەریدا شتی بێ گیان و ئاژەڵ ناکرێتە کۆ، بەڵام لە زمانی میدیدا کراوە و وشەی نەسپ بە هۆی ئامرازی (ان) کراوەتە کۆ. هەر چەندە ئەو ئامرازە لە زمانی سۆمەریدا هاوشێوەی زمانی کوردی و میدی و لیدیە، بەڵام لە ڕووی بەکارهێنانیەوە لەو خاڵەدا لەگەڵ زمانی میدیدا جیاوازە. وا دەردەکەوێت کە لە زاراوە کوردیەکانی باکور و ڕۆژهەڵاتدا ئەوە کرابێت. ئەمڕۆش لە زاراوەی کرمانجی خواروودا لە ناوچەکانی هەولێر هەتاوەکو موکریان هەر ئەوە دەکەن و لە هەندێک ناوچەی تری کرمانجی خواروودا ئەوە ناکرێت.

[72]. ناوە کوردیەکان لە سەرچاوە یۆنانی و ئارامیەکاندا دەگۆڕێن؛ پیتی (ز) دەکرێتە (د)، پاشگری (س) ی بۆ زیاد دەکرێت و پیتی (ها) یان کردۆتە (ئە)، بۆیە هیرۆدۆت و جۆزیفۆس ناو (بەرزان) یان کردۆتە Bardanes. هەروەها (پاکیزە) کراوەتە Paqida و بەوجۆرەش (هەزمبان) کراوتە Adiabene.

(نەخشەی ژمارە ٩) نەخشەی ناوچەکانی هەزبان لەوپەڕی بەهێزی و میدیای ئازەربایجان و کوردیان لە سەرەتای سەدەکانی زاییندا.

وۆڵکەر دەڵێت "شاری هەزە، دەکەوێتە ١٢ کیلۆمەتر خوارووی هەولێر، کە کۆمەڵگەیەکی کریستیانی لێ بوو بە لایەنی کەمەوە لە سەدەی چوارەمی زاینییەوە و لە پێش هەولێرەوە سەنتەری هەزمیان (Adiabene) بووە" (Walker, 2006, p.26). ئەم بۆچوونە لای ڕۆبنسن-یش دووبارە بووەتەوە کاتێک کە سەبارەت بە هاتنی ئیسلامەکان لە زمانی بەلازەری (البلاذري) موە هاتنی موسوڵمانەکان دەگێڕێتەوە و دەڵێت "ئەمجا لایدا بەرەو خوارەوە، لە ڕووبارەکە پەڕیەوە و چووە ناوچەی هەزمیان، کە لەوێ هەزە-ی گرت" (Robinson,2004, p.91 &92). ئەمڕۆ زۆربەی لێکۆلەرەکان بە گشتی کۆکن لەسەر ئەوەی کە شارێک هەبووە بە ناوی هەزە (Hazza) و ئەو شارە لە ناوچەیەکدا بووە کە پێی گوتراوە هەزمیان (Adiabene). ناوەکە جگە لە ناوی ناوچە، ناوی بنەماڵەیەکی گرنگ و دەوڵەتێکی دێرینی کوردی بووە و بۆ ئاماژەکردن بە ناوچەی دەسەلاتی ئەو دەوڵەتەش بەکارهێنراوە. ئەم دەوڵەتە سەنتەرەکەی لە هەزەدا بووە و دەسەلاتی لە ئازەربایجانەوە هەتاوەکو ناو سوریا ڕۆیشتووە و تیرەی ڕەوەندی سەلاحەدین سەر بە خێڵی گەورەی هەزمیانی بووە.

## مێژووی دەوڵەتی هەزمیان (Adiabene)

لە سەدەکانی هەژدەی پ.ز دا، ئاشوریەکان لە ڕۆژئاواوە ڕوویان کردە ناوچەکە و دەسەلاتی خۆیان بەرەو ناوچەکانی کوردستانی ئەمڕۆ بەرفراوان دەکرد و دەیانویست وردە وردە دەوڵەتە بچووکەکانی ناوچەکانی نەینەوا و هەولێر و سلێمانی و کەرکوکی ئیمڕۆ بخەنە ژێر دەستیان. لەو سەردەمانەدا چەندین دەوڵەتی بچووک لە ناوچەکەدا هەبوون. هاتنی ئاشوریەکان و بەرفراوان بوونی قەلەمڕەوی دەسەلاتیان، بوو بووە هۆی ئەوەی کە هاوپەیمانیەکان هەمیشە لە گۆڕاندا بن. یەکێک لەو دەوڵەتانەی کە لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زاییندا ناوی هاتووە، دەوڵەتی هەزمیانیەکان بووە، کە بە ئەهازوم (Ahazum) دەناسرا. یاشوب ئادو (Yashub-Addu) ی پاشای هەزمیانیەکان کەوتبووە ژێر فشارێکی زۆرەوە و دەیویست لەو هەل و مەرجە نوێیەدا مانەوەی دەسەلاتی هەزمیانیەکان بپارێزێت. بە پێچەوانەی ناوچەی توروکیەکان (Turukkeans)[73] کە زیاتر لە قولایی چیاکاندا بوون و کەمتر دەستی ئاشوریەکان بەو ناوچانە دەگەیشت، ناوچەی دەسەلاتی هەزمیانەکان کەوتبووە جێگایەکی جوگرافی واوە کە بەربەستێکی سروشتی نەبوو کە هاوکاری بکات بۆ ڕێ گرتن لەو هێزە نوێیە. بۆیە هاتن و فراوانبوونی دەسەلاتی ئاشوریەکان، بەجۆرێک دەوڵەتە بچووکە کوردیەکانی شپرزە کردبوو کە نەیاندەزانی چۆن لەو هاوکێشە نوێیەدا بمێننەوە.
دەبینرێت کە یاشوب عادوی پاشای هەزمیان، ماوەیەک هاوپەیمانی شەمشی عەدادی پاشای ئاشوری بوو. کەچی دوای چەند مانگێک هاوپەیمانیەکەی هەلوەشاندەوە و زنجیرەیەک هاوپەیمانی نوێی لەگەل توروکیەکان و سیموروم و پاشتر لەگەل کاکمومدا بەست. دوای ئەمە شەمشی عەدادی پاشای ئاشوری، وەک قۆناغێک لە کۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی کوردستان، سوپایەکی بەهێزی ناردە سەر هەزمیانیەکان و چوار دەوری شیکشابوم (Shikshabbum) ی پایتەختەکەیانی دا. سەرەڕای ئەو پشتگیریەی کە هەزمیان لە گوتیەکان و توروکیەکانەوە شانبەشانی هەزمیانیەکان وەری گرت و لە دژی ئاشوریەکان دەجەنگین، بەلام لە ئاکامدا ئاشوریەکان بەهێزتر بوون و شارەکەیان گرت. بەو جۆرە کۆتایی بە دەسەلاتی یاشوب عادوی هەزمیانی هێنرا و پاشایەکی ملکەچی نوێ دانرا بە ناوی هەلون- پی- ئومو (Halun-pi-umu) (Eidem and Læssøe, 2001).
لە دوای هاتنی ئاشوریەکان و گرتنی ناوچەکانی هەولێر و نەینەوا، ئیتر سەرچاوەکان هیچیان سەبارەت ئەم دەوڵەتە باس نەکردووە. وا دەردەکەوێت کە لەگەل بەهێزبونی ئاشوریەکاندا، ئەوان زیاتر وەک خێڵێکی حوکمڕانی ژێر دەستی ئاشوریەکان مابێتن. ئاشکرایە کە ئاشوریەکان بۆ چەند سەدەیەک حوکمڕانی ناوچەکەیان کردووە و هیرۆدۆتی مێژوونوس ئەو ماوەی حوکمڕانیە بە ٥٢٠ ساڵ لە قەلەم دەدات

[73]. هۆکاری نەناسینەوەی ناوەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئاشوریەکان پاشگری پێوە دەکەن. زۆر جار کە ناوی شارەکە مانای هەبێت ئەوان تەرجومەی دەکەن و جگە لەوەش دەبێت بزانرێت کە ئایا ناوەکان لە چەند برگە پێک هاتوون. ئەوەش پێویستی بە کاری تایبەتمەند و ورد هەیە و هەندێک جار لە دەرەوەی بواری ئەم کتێبەدایە.

(Herodotus, 1860)، بەڵام دوای ڕوخانی ئاشوریەکان لە ساڵی ٦١٢ پ.ز دا، ناوچەی هەزبان دیسان وورده وورده زیندوو بووەوە. هەزبانیەکان لە سەرەتادا بەشێك بوون لە حوکمڕانە ناوچەییەکانی ژێر دەسەڵاتی میدەکان کە پاشای گەورەی کورد و ناوچەکە بوون. لە سەدەکانی پاشتردا، بە تایبەتی شانبەشانی کزبوونی میدەکان، هەزبانیەکان ئەو بۆشاییەیان پڕ دەکردەوە کە لە ئەنجامی کزبوونی میدەکانەوە هاتبووە کایەوە.

هەزبانیەکان، لە دوای ڕوخانی فارسەکان لە کۆتایی سەدەی چوارەمی پێش زاییندا و پاشتریش سەرهەڵدانەوەی ئەشکانیەکان، وورده ووورده خۆیان بەهێز کرد و پاشاکەیان ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەو ناوچەیەدا کە کەوتبووە نێوان دەسەڵاتی ئەشکانیەکان لە ڕۆژهەڵاتدا و دەسەڵاتی ڕۆمەکان کە لە باکور و ڕۆژئاوادا بوون. لەگەڵ فراوانبوونی ناوچەکەیاندا، هەمان ناوچەی دەسەڵاتی میتانیەکانیان وەرگرتەوە و لە ئازەربایجانەوە هەتاوەکو سوریا کاریگەریان لەسەر ڕووداوەکان دروست دەکرد (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٠).

هەزبانیەکان دەبوو دیسان لەو سەردەمەشدا سیاسەتێکی میانڕەو بگرنە بەر بۆ ئەوەی کە لە نێوان ئەو دوو هێزەدا بتوانن بمێننەوە. لەو سەردەمەدا هەندێک جار بە تەواوی دەسەڵاتی خۆیان فراوان و سەربەخۆ کردووە و هەندێک جاریش وڵاتەکەیان لەلایەن ئەشکانی و ڕۆمانەکان و جارێکیش لەلایەن تیگرانی پاشای ئەرمینیاوە گیراوە. لە هەندێک لە جەنگەکانی سەدەی یەکەمی پێش زاییندا و لە نێوان ٧٣ پ.ز- ٦٣ پ.ز دا ناوی پاشا کوردەکانی هەزبان و پاشای مید و پاشای کوردیان بەیەکەوە چەند جارێک هاتووە کە هاوکاری تیگران، پاشای ئەرمەنی و میسراداتی پاشای پۆنتوسیان کردووە لەو جەنگەیاندا کە بەرامبەر لۆکۆلۆس (Lucullus) ی سەرکردەی ڕۆمانەکان شەڕیان کردووە (Plutarch, 1959, p.555).

بەرەو کۆتایی سەدەی یەکەمی پێش زایین و سەرەتای سەدەی یەکەمی زایینەوە، هێزی هەزبانیەکان پتەو تر و فراوانتر دەبوو. بە تایبەتی لە سەردەمی مانوبازی[74] پاشا و هێلێنا[75] (Helena) ی شاژندا، کاریگەری دەسەڵاتی هەزبانیەکان زۆربەی کوردستانی ئەمڕۆ هەتاوەکو ئیسرائیلی ئەمڕۆ دەڕۆیشت کە ئەو سەردەمە لە ژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکاندا بوو. هەزبانیەکان لە نێوان ئەو هێزە گەورانەی ئەو سەردەمەدا، بۆ چەند سەدەیەک سەربەخۆیی خۆیان پاراست (Graetz and Lowy, 2009, p.311).

لەبەر ئەوەی کە هێلێنا و دوایی ئێزد[76] (Izates) ی کوڕیان چوونە سەر ئاینی جوو، سەردەمی حوکمڕانی هێلێنا و مانوباز و دوایی ئێزدی کوڕیان، لە سەرچاوە جوومکاندا نەک هەر بە ووردی باسکراوە، بەڵکو تەنانەت ووردەکاری قسەکانی هێلێنای هەزبانی-ش تۆمارکراوە. جۆزیفۆس[77] (Josephus) ی

74. مانوباز ناوێکی تریشی هەبووە کە بریتی بووە لە Bazeus (Josephus, 2003, p.122). بە ڕەچاوکردنی ئەوەی یۆنانیەکان پاشگری us بۆ هەموو ناوێک زیاد دەکەن، ناوەکە بریتی بووە لە Baze یاخود (باز Baz), کە ناوی باڵندەیەکی ڕاوکەرە لە کوردیدا. سەبارەت ناوی مانوباز، وا دەردەکەوێت کە پێکهاتبێت لە (مانو+باز)، وشەی یەکەم لە زمانی میدیدا مانای (هزر) دەدات و لە کوردیدا ماناکەی نزیکە (بڕوانە فەرهەنگی میدی)، (باز) مانای باڵداری (هەڵۆ) دەدات. ناوەکە بە هەمووی مانای (بازی خاوەن هزر) دەدات. وا دەردەکەوێت ئەم پاشا کوردە هەردوو ناوەکانی (مانوباز، باز) ی بەکارهێنابێت. ئەم ناوە لە ناو کورد دا بە درێژایی مێژوو هەر هەبووە و تەنانەت لە دوای هاتنی ئیسلام و لە سەدەی دەیەمی زاییندا یەکێک لە ئەمیرە کوردە نازاکان ناوی (ئیبن عەبدوڵای کوڕی حسێن کوڕی دۆستەک) بووە و لە مێژوودا بە بازی کورد (الباد الكردي) ناو هێنراوە. بازی کورد، لە سەدەی دەیەمی زاینیدا زۆربەی ناوچەکانی دیاربەکر و مەیفاریقین و موسڵی خستەوە ژێر دەستی خۆی، دوایی خەلیفەی بەغدا بە سوپایەکی گەورەوە هێرشی کردە سەری و "بازی کورد" یان کوشت (ابی الهیجاء، ١٩٩٣، ص. ٦٩).

75. بۆ ناوی ئەم شاژنە دوو ئەگەر خۆی دەنوێنێت. وشەی هێلین لە کوردیدا بە مانای (هێلانە، هێڵان، جێهێشتن، گوم کردن، شەرمی ژنان) دێت( هەژار، پ. ١٠٢١). جگە لەوەش لە باکوری کوردستان بۆ ناوی کچان بەکار دەهێنرێت. بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بکرێت کە لە سەدەی یەکەمی زاییندا کوردستان لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی یۆنانیدا بووە و ناوی شاژن (هێلین) دەشێت کە لە یۆنانیەوە وەرگیرابێت و ناوەکە لە کاتێکدا کە کوردیە لە هەمان کاتدا یۆنانیشە.

76. ناوەکە بەهۆی ئەوەی کە لە سەرچاوەی یۆنانیەوە وەرگیراوە بۆیە پاشگری es ی پێوە لکێنراوە، مانای ناوەکە لە کوردیدا لە ناوی ئاینی (ئێزد) یدا دەردەکەوێت و لە زمانی پەهلەویدا yazd مانای (خودا، خودایی) دەدات.

77. ئەم مێژوونوسە ناوی تەواوی بریتی بووە لە Titus Flavius Josephus و لە سەدەی یەکەمی زاینیدا ژیاوە و زۆرێک تێکستی سەبارەت بە مێژووی جومکان نوسیوە.

مێژوونوسی جو، بە ووردی باسی ئەم بنەماڵە هەزمبانیەی کردووە و سەردەمێکی حوکمرانیەکەیانی خستوتە ڕوو (Josephus, 2003).

لە نزیکی سەدەی یەکەمی زایینداا مانوباز و هێلێنا بڕیاریان دابوو کە ئیزدی کوڕە بچووکیان ببێتە پاشای داهاتوو. وەکو پەیڕەوکردنی نەریتی پادشایی ئەو سەردەمە و بە مەبەستی پاراستنی ژیانی، ئیزد نێردرا بۆلای پاشای ناوچەی Charax-Spasini. وا دەردەکەوێت کە ئەو ناوچەیە نزیکی شاری عەمارەی ئەمڕۆ بێت و وابەستەی هەزمبانیەکان بووبێت. پاشای ناوچەکە کچێکی خۆی دا بە ئیزد و لەوێ لە ژێر کاریگەری جوێکدا خۆی و ژنەکەی چوونە سەر ئاینی جو.

پاش چەندین ساڵ، مەنوبازی باوکی ئیزد کە تەمەنی بەرەو پیری چوو ناردی بە شوێن کوڕەکەیدا و ناوچەی کوردیان (جەزیرە ی ئەمڕۆ) ی پێدا. ماوەیەک بەو جۆرە مایەوە هەتاوەکو باوکی مرد. پێش ئەوەی کە ئیزد بگەڕێتەوە، هێلێنای شاژن دەستبەجێ براکانی تری دەستبەسەر کرد بۆ ئەوەی کە حوکمرانی نەگرنە دەست. هێلێنا، بە شێوەیەکی کاتی دەسەڵاتی دایە دەست مەنوبازی برا گەورەی ئیزد کە بڕوا پێکراوی بوو، هەتاوەکو ئیزد گەیشتەوە و کرایە پاشای هەزمبانیەکان و خشڵی نیشانەی پاشایی کە بە سامپسەر (Sampser) ناسرابوو، درایە دەست ئیزد.

هەر کە کرا بە پاشا، ئیزد بە کارێکی باشی نەزانی براکانی بە دەست بەسەری بژین، بۆیە وەک دابونەریتی ئەو سەردەمە و خۆ پاراستن لە پیلانی براکانی ، هەندێک لە براو ماڵ و منداڵەکانی نارد بۆ لای پاشای ڕۆم و هەندێکیان بۆ لای پاشای ئەشکانی. ئیزد تەنها مانوبازی برا گەورەی هێشتەوە، کە متمانەی پێ بوو لە حوکمرانیدا هاوکاری بکات.

لە هەمان کاتدا هێلێنای شاژنی دایکی دەچێتە سەر ئاینی جوو. ئیزد خۆی بەشێوەیەک پەیڕەوی ئاینە نوێکەی کردووە کە بڕیار دەدات خۆی خەتەنە بکات. هەرچەندە دایکی و ژنەکەی و خوشی لەم مەسەلەیە دوو دڵ بوون، بەڵام لە کۆتاییدا بڕیار دەدا و خەتەنە دەکات و دەبێتە پەیڕەوکەرێکی تەواوی دابوو نەریتی جو.

بە پێی جۆزیفۆسی مێژوونوس، ئیزد ماوەیەک لە ناو هەزمبانیەکاندا بەهۆی گۆڕینی ئاینەکەیەوە تووشی کێشە دێت و هەندێک لە دەسەڵاتدارە هەزمبانیەکان پیلانێک لەگەڵ پاشا دراوسێکاندا دەکێشن کە ئیزد لە ناوبەرن، بەڵام ئیزد زۆر وریایانە لەو پیلانە ڕزگاری بوو و دوژمنەکانی لەناوبرد. ئەمجا سەرلەنوێ دەسەڵاتدارە هەزمبانیەکان وەک نیگەرانی بوونیان بەرامبەر ئاین گۆڕینەکەی ئیزد، گازندەیان بردە لای پاشای ئەشکانی بۆ ئەوەی کە ئیزد لابەرێت و بێتە فریایان، بەڵام داواکەیان بێ سوود بوو.

لە سەدەی یەکەمی زایینیدا دەسەڵاتدارانی ناوچەی ئەشکانیەکان پیلانێک لە دژی پاشای ئەشکانی، ئەرتابان (Artabanus) دەگێڕن و ئەرتەبان لەسەر تەختی پاشایی لادەبرێت. لەبەر ئەوەی کە هەزمبانیەکان پاشای بە دەسەڵاتی ناوچەکە بوون، بۆیە ئەرتەبان پەنا بۆ ئیزدی پاشای هەزمبانی دەبات بۆ ئەوەی هاوکاری بکات. ئیزدی هەزمبانی ماوەیەک ئەرتەبان لەلای خۆی دەهێڵێتەوە و ڕێزێکی زۆری لێ دەگرێت و ئینجا هاوکاری دەکات هەتاوەکو دەسەلاتی خۆی وەردەگرێتەوە. بەپێی جۆزیفۆس، ئیزدی هەزمبانی هەوڵێکی زۆر دەدات و دەکەوێتە نێوان لایەنە ناکۆکە ئەشکانیەکانەوە هەتاوەکو ئەرتەبان وەک پاشای ئەشکانی قبوڵ دەکرێتەوە و دەسەڵاتەکەی خۆی وەردەگرێتەوە. ئەرتابان وەک پاداشتێک بەرامبەر ئەو چاکەیەی کە ئیزد لەگەڵیدا دەکات، ناوچەی نوسەیبین لە پاشای ئەرمەنی وەردەگرێت و دەیداتە ئیزد، بەو جۆرە ئیزد هێندەی تر دەوڵەتەکەی بەهێز دەبێت و قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی بەرفراوانتر دەکات و زیاتر هەست بە توانا و بەهێزی خۆی دەکات.

دوای مردنی ئەرتابانی ئەشکانی، بەرزان (Bardanes)[78] ی کوڕی بووە پاشای ئەشکانیەکان و وەک پاشایەکی گەورەتر لە ئیزدی هەزمبانی، داوای لێکرد کە هاوکاری بکات بۆ ئەوەی کە جەنگ دژی

[78]. هۆکاری دانانی بەرزان لەبری (Bardanes) بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو وشەیە بە هەمان مانا لە ناو میدەکاندا هەبووە (بڕوانە فەرهەنگی میدی) و دوایی چووەتە زمانی پەهلەویەوە کە زمانی ئەشکانیەکان بووە، بەڵام تەنها ئەوەیە هەندێک جار لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا پیتی (ز) کراوەتە (د). بۆیە پاشگرە یۆنانیەکەی لێکرایەوە و ناوەکە بە شێوە دروستەکەی خۆی نوسرا.

ڕۆمانەکان بکات. ئێزد لەبەر ئەوەی کە سنوری لەگەڵ ڕۆمەکاندا بوو، هەستی دەکرد کە لە ڕووداوی لەو جۆرەدا هەمیشە بەرژەوەندی هەزمبانیەکان زیاتر دەکەوێتە ژێر مەترسیەوە، بۆیە ڕەتیکردەوە کە هاوکاری بکات. بەهۆی کێشەی ناوخۆیی ناو ئەشکانیەکانەوە، بەرزان نەیتوانی سوپا بکاتە سەر ئێزد و بەو جۆرە ڕووداوەکانی سەردەمەکە لە بەرژەوەندی ئێزد بوون و دەسەلاتی گەورەتر دەبوو. ووردە ووردە مانوبازی برایشی، کە بە مەنوبازی دووهەم ناسراوە، چووە سەر ئاینی جودایزم.
هێلێنای شاژن کە دایکی ئێزد بوو، هێندە ئاینەکەی بە توندی گرتبوو، بە مەبەستی زیاتر نزیک بوونەوە لە ئاینە نوێیەکەی، بە سەردان چوو بۆ شاری ئورشەلیم (قودس). کە گەیشتە ناو شارەکە، هێلێنا بینی کە جوەکان لە برسێتیدا دەژیان، هەندێک لە خزمەتکارەکانی نارد بۆ ئەلێکسەندەریە بۆ کڕینی گەنمە شامی و هەندێکی تری نارد بۆ قوبرس بۆ کڕینی هەنجیری وشک و هەمووی بەسەر خەڵکدا دابەشکرد. هەروەها شاژن لەوێ بینایەکی تایبەتی دروست کرد بۆ ئەوەی کە دوای مردنی، خۆی و کوڕە بە ئاین جوەکانی لەوێ بنێژرێن. لە هەمان کاتدا ئێزدی کوڕیشی پارەی زۆری نارد بۆ هاوکاریکردنی جوەکان.
ئێزدی پاشای هەزمبان، لە تەمەنی پەنجاو پێنج ساڵیدا کۆچی دوایی کرد و هەر دوا بەدوای ئەویش، هیلێناش کۆچی دوایی کرد. مەنوبازی برای ئێزد، ئێسک و پروسکی هەردووکیانی نارد بۆ ئورشەلیم و لەوێ لەو بینا تایبەتەدا نێژران کە هێلێنا بۆی دروست کردبوون. دوای تێپەڕبوونی نزیکی هەزار و هەشت سەد ساڵ، لە سەدەی نۆزدەهەمدا گۆڕی هێلێنا[79] لە ئورشەلیم دۆزرایەوە (بڕوانە وێنەی ١٥).

(وێنەی ١٤) وێنەی گورستانی شاژن هێلێنا و کوڕەکانی لە ئورشەلیم (قودس) لە ساڵی ١٩٠٣ دا گیراوە.

نازانرێت بڕیاری ئێزد و هێلێنا کە بچنە سەر ئاینی جوو، بڕیارێکی شەخسی بووە یان سیاسی لەبەر ئەوەی کە لە ڕووداوەکاندا هەردوو لایەنەکانی تێدا بەدی دەکرێت. بە دوور نازانرێت کە هەنگاوێک بووبێت بۆ خۆ جیاکردنەوە لە کاریگەری ئەشکانیەکان و لە هەمان کاتدا بەشێک بووبێت لە هەوڵی هەزمبانیەکان کە ویستبێتیان دەسەلاتیان بەرەو ئیسرائیل بڕوات کە ئەوە ڕێگایەکی گرنگی بازرگانی بوو کە لە سەردەمی مانیەکانەوە بە هەمان شێوە بەکار دەهات (بڕوانە مانیەکان). تێبینی دەکرێت کە لە ساڵی ٧٠ ز-٧٣ ز و لە شەری نێوان جوەکان و ڕۆمەکاندا، سەرچاوە جوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە شازادە هەزمبانیەکان لەو جەنگەدا بەشداریان کردووە و ڕۆمەکان هەموو ئەسیرەکانی ئەو جەنگەیان کوشتووە، جگە لە شازادە

[79]. لە ساڵی ١٨٦٣ دا گۆڕێک لە شاری ئورشەلیم لەلایەن شوێنەوارناسێکی فەرەنسیەوە دۆزرایەوە بە ناوی دی سۆلسی (De Saulcy) و سەرەتا وای زانی ئەوە گۆڕی پاشای جو بووە و ناوی لێنا گۆڕی پاشاکان (Tomb of the Kings). دوایی دەرکەوت کە ئەو گۆرە هەر هەمان بینا و گۆڕی تایبەت بوو کە شاژن هێلێنا پێش مردنی بۆ هەموو خێزانە پادشاییەکەی دروستی کردبوو. شایانی باسە کە ئێستا ئەو تابوتە بەردینەی کە هێلێنای تێدا نێژرابوو لە مۆزەخانەی لۆڤەرە لە فەرەنسا (Hachlili, 2005, p.36).

هەزمبانیەکان کە ژیانیان لەلایەن ڕۆمەکانەوە پاریزرابوو. شازادە هەزمبانیەکان هەموویان وەک بارمتە نێردرابوونەوە بۆ ڕۆمای پایتەختی ڕۆمانەکان، بە مەبەستی بەکارهێنانیان وەک کارتێکی فشار لەسەر پاشای هەزمبانی (Graetz and Lowy, 2009, p.311).

(وێنەی ١٥) تابوتی بەردینی شاژن هێلینای هەزمبانی کە ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی لۆڤەر هەڵگیراوە.

بەشداریکردنی شازادە هەزمبانیەکانی تر جگە لە هێلینا و کوڕەکانی لەو جەنگەدا، ئەوە دوویات دەکاتەوە کە هەزمبانیەکان بەرژەوەندیەکی هاوبەشیان لەگەڵ جوەکاندا هەبووە و سنوری ناوچەی نیشتەجێبوونی ئەو دوو نەتەوەیە لەو سەردەمەدا بەتەنیشت یەکەوە بووە. ڕاستە ئێزد بڕیارێکی شەخسی داوە کە ئاینەکەی بگۆڕێت بۆ ئاینی جو، بەڵام بە دڵنیایی پاشا هەزمبانیەکان ویستویانە کە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتیان هەتاوەکو ئیسرائیل بڕوات و ئەو ڕێگا بازرگانیە مێژوییە لە ژێر دەسەڵاتی خۆیاندا بهێڵنەوە. لەو سەردەمەدا هەزمبانیەکان و جوەکان دوژمنێکی هاوبەشیان هەبووە، لەبەر ئەوەی کە هەزمبانیەکان دەیانویست دەسەڵاتی ڕۆمەکان لەو ناوچەیەدا بێ هێز بێت و جوەکانیش دەیانویست لە حوکمی ڕۆمانەکان ڕزگاریان بێت، بێگومان دروستکردنی ئەو هاوپەیمانیە لە بەرژەوەندی هەردووکیان بووە.

(وێنەی ١٦) پاشایەکی هەزمبانی کە لای هەریر/هەولێر لەسەر شاخەکە وێنەکەی هەڵکەندراوە، پێ دەچێت کە ئەوە وێنەی پاشا، ئێزد یان مەنوبازی هەزمبانی بێت.

ڕۆڵی هەزمبانیەکان لە سەدەی یەکەمی زاییندا هێندە گرنگ بوو، کاتێک کە تیریداد (Tiridates) ی پاشای ئەشکانی بانگهێشت کرا بۆ لای نیرۆی قەیسەری ڕۆم، کوڕەکانی هەردوو پاشای هەزمبانی و پاشای میدی لەگەڵ خۆیدا برد (Lindsay, 1856, p.96).

ئەو زانیاریانەی کە لە دوای سەدەی یەکەمەوە سەبارەت بە هەزمبان هەیە، پچڕ پچڕن و ناتوانرێت زنجیرەی دەسەڵاتدارەکانیان بزانرێت. بەڵام دەزانرێت کە لە سەرەتای سەدەی دووهەمی زاینیدا، پاشای هەولێر لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا بە مێبارساپس (Mebarsapes) ناوی هاتووە. ئەم پاشایە لە جەنگی ڕۆمەکاندا بەرامبەر ناوچەی هەزمبانیەکان ناوی هاتووە و لەو جەنگەدا تراجانی قەیسەری ڕۆم بۆ ماوەیەکی کورت هەولێری داگیر کردووە، بەڵام لەوە دەچێت کە لە کاتی هاتنە سەر حوکمی قەیسەری نوێ هادریان (Hadrian)، دیسان هەزمبانیەکان ناوچەکەیان وەرگرتبێتەوە (Frye, 1984, p.279).
بوونی زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لە سەر سنوری ڕۆمەکان کە گەورەترین دەوڵەتی جیهانی ئەو سەردەمە بووە، هەمیشە بووەتە هۆی ئەوەی کە پاشا کوردەکان نەتوانن دەسەڵاتی خۆیان تا ڕادەیەکی باش بەهێز بکەن و لە ئاستێکی دیاریکراودا بمێننەوە. دەبینرێت هەمیشە پاشا کوردەکان کەوتبوونە نێوان، هێزی ڕۆمەکان و ئەشکانیەکان، بۆیە لە کۆتایی سەدەی دووهەمی زاییندا پاشای هەولێر کە ناوی ناسرای (Nasrai)[80] بووە، ڕەتیکردۆتەوە کە هاوکاری پاشای ئەشکانی لە جەنگێکیدا لە دژی ڕۆمەکان بکات. لە ئەنجامدا هەر دوای سەرکەوتنی ئەشکانیەکان، پاشای ئەشکانی هێرشی کردە سەری و ناوچەکەی تاڵان کرد و ناسرای پاشای هەزمبانیشی کوشت. هەروەها لە نزیکی ناوەڕاستی سەدەی سێهەمی زاینیدا پاشای هەولێر بە ناوی شاهرات (Shahrat) و پاشای کەرکوک کە ناوی دۆمژدانە (Domjtana[81]) بووە لەگەڵ پاشای مید[82] و ساسانیدا پێکەوە هێزیان یەکخست و کۆتاییان بە حوکمی ئەشکانیەکان هێنا کە چەند سەدەیەک بوو حوکمڕانی گەورەی ناوچەکە بوون (Karwerau and Kroll, 1985, p.16 and 17).
بەهۆی ڕۆڵی هەولێر و ناوچەی هەزمبانیەکان لە ئاینی کریستیاندا، سەرچاوەی ئاینی باش سەبارەت بە هەزمبان لەئارادایە. لەو سەرچاوانەدا وا دەردەکەوێت کە هەزمبان بووەتە سەنتەرێکی گرنگی ئاینی کریستیان. سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە لە ناوچەکانی کوردستان و بە تایبەتی هەزمباندا تا ڕادەیەک ئازاد بوون و کریستیانێتی لە ناوچەی ژێر دەسەڵاتیاندا بەرەو بەهێزی ڕۆیشتووە. شایانی باسە کە هەتاوەکو سەدەکانی دەیەمی زاینی هەزمبان وەک ناوچەیەکی گرنگی کرسیتیان مایەوە و یەکێک لە دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی هەزمبانیەکان کە ناوی مار قەرداخ-ە، لە کەنیسەی ڕۆژهەڵاتدا بە شەهید لە قەڵەم دراوە و ژیانەکەی و چۆنێتی شەهیدبوونی تۆمارکراوە و ئەمڕۆ لە شاری هەولێر کەنیسەیەک بە ناوی ئەو کەسایەتیە سەربازی و ئاینیەوە ناونراوە.
لە هەمان کاتدا دوای بەهێز بوونی ساسانیەکان کە بنەماڵەیەکی کورد بوون، هەردوو دەسەڵاتی هەزمبانی و میدی و کوردیان بەرەو لاوازی چووە و ساسانیەکان دەسەڵاتیان لە سەنتەردا قۆرخ کردبوو، بۆیە لە سەدەی چوارەمی زاینیەوە نازناوی "پاشا" لە زۆربەی پاشا ناوچەییەکان سێنرایەوە و نازناوی پاشای هەزمبان لابرا و زیاتر بە "مەرزبان" ناو دەهێنران، کە زیاتر وەک حوکمڕان بوون نەک پاشا. بە گشتی لە نێوان سەدەی چوارەم و هەتاوەکو سەدەی نۆهەمی زایینی، شتێکی ئەوتۆ سەبارەت ناوچەکە نازانرێت. لەبەر ئەوەی کە زانیاریەکان زۆر دەگمەنن، لە ڕوانگەی مێژووەوە، ئەو سەردەمە بە سەردەمێکی تاریک دادەنرێت.
بەپێی وەسفی مارسێلینۆس لە سەدەی چوارەمی زاییندا بۆ وڵاتی هەزمبانیەکان، دەبینرێت بە نزیکی هەموو کوردستان دەگرێتەوە. دەبینرێت مارسێلینۆس پێی وایە کە ناوچەی نەینەوا[83] و هەمەدان و هەولێر هەمووی سەر بە ناوچەی هەزمبانیەکان بووە (Marcellinus, 1894, p.334). وا دەردەکەوێت کە سەنتەری دەسەڵاتی کوردستان لە سەدەی چوارەمدا لە هەولێر و کۆیەدا بووە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە میدەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە لە ژێر فشاری ئەشکانیەکاندا بوون و لە باکور و ڕۆژئاواوە ڕۆمەکان لەو ناوچەیەدا بوون، ئەوەش پێگەی هەزمبانیەکانی بەهێزترکرد لە ناو کورداندا. ئەم بۆچوونەی مارسێلینۆس

---

80. لەوە دەچێت ناوەکە لە بنەچەدا (ناسراو) بووبێت و ئارامیەکان کە سەرچاوەی ناوەکەن، پیتی (ی) یان بۆ زیاد کردبێت.
81. ئارامیەکان ناوەکە بە شێوەیەک دەگۆڕن کە زەحمەتە بزانرێت ناوەکە لە بنەڕەتدا چۆن بووە.
82. وەک لێرەدا دەرکەوت پاشای مید و پاشای ساسانی سەرەتا یەک بوون، بەپێی کارنامەی ئەردەشیری پاپەگان دوایی ئەردەشیر ویستوویەتی ببێتە پاشای بەهێزی ناوچەکە و هێرشی کردە سەر پاشای میدی و کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەویش هێنا.
83. دەبێت ئەوە بزانرێت کە ناوچەی نەینەوا (موسڵ) لە ڕابردوودا ناوچەکانی جەزیرە و بۆتان و هەکاریشی گرتۆتەوە.

یەکدەگرێتەوە لەگەڵ بۆچوونی زۆربەی مێژوونوسە موسوڵمانەکانی وەک ئەلعومەری و ئەلقەلقەشەندی، بۆ ناوچەی گشتی جێنشینی کوردەکان.

چەند سەدەیەک لە دوای هاتنی ئیسلامەوە وورده وورده هەواڵی هەزەبانیەکان لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا دەرکەوتەوە، لەبەر ئەوەی کە هەزەبانیەکان بۆ ماوەیەک کەوتنە ژێر دەسەلات و باجی عەرەبە موسوڵمانەکانەوە. وردەکاری مانەوەی دەسەلاتی هەزەبانیەکان لە سەرەتای هاتنی ئیسلامدا نازانرێت، بەڵام لە سەدەی نۆهەمی زاینیەوە، لە هەمان ناوچەی مێژوویی خۆیاندا، وەک بنەماڵەیەکی گەورەی حوکمڕانی کوردی ئاماژەی پێ کراوە.

دوای هاتنی موسوڵمانەکان، لە سەرەتادا بۆ ماوەیەک هەزەبان خراوتە سەر ناوچەی موسڵ کەحەمدانیەکان بە پشتیوانی خەلیفەی بەغدا حوکمڕانیان دەکرد. لە سەدەی نۆهەمی زاینیەوە زۆر لە دەسەلاتە کوردیەکان بوژانەوەیان بە خۆیانەوە بینی و دیسان دەسەلاتیان دەگرتەوە دەست. هەزەبانیەکان هێرشی بەردەوامیان دەکردە سەر حەمدانەنیەکان و هەراسانیان کردبوون و دەیان ویست کە ناوچەی دەسەلاتەکەی جارانیان وەربگرنەوە کە هەتاوەکو ئیسرائیل بوو.

لە دوای سەدەکانی نۆهەمەوە هەزەبانیەکان وەک دەوڵەتێکی بەهێز حوکمڕانی ناوچەکەی خۆیان کردووە و هەولێر لە ژێر سایەیاندا گەشانەوەیەکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی. سەرەڕای چەندین ڕووداوی جیاواز، هەزەبانیەکان هەتاوەکو سەدەی سیانزەهەمی زاینی هێزی سەرەکی ناوچەکە بوون و لە ئازەربایجانەوە هەتاوەکو میسر کاریگەریان لەسەر ئاراستەی ڕووداوەکان هەبوو. لە ڕاستیدا سەلاحەدینی ئەیوبی کە بە بنەچە هەزەبانی بوو، هەر هەمان ئەو ناوچە گرنگانەی گرتەوە دەست کە پێشتر بنەماڵەکەیان، لە سەردەمی ئێزد و لە پێشتریشدا، هوریەکان حوکمڕانیان دەکرد. سەلاحەدین هەر لە خۆیەوە ئەو دەسەلاتە بەهێزەی دروست نەکرد، بەڵکو ئەو ناوچانەی کە سەلاحەدین هەتاوەکو میسر حوکمڕانی دەکرد، لە سەردەمی هوری و هیتیەکان و دوایی هەزەبانیەکانەوە هەر لە ژێر کاریگەری کورد دا بووە و ئەم کاریگەریەش هەر تەنها سەربازی نەبووە، بەڵکو کەسایەتیە کوردیە ئاینیەکان، لە شام و میسردا قازی گەورەبوون و لەو ناوچانەدا زۆربەی بڕیاردانی حەڵاڵ و حەرام لەلایەن زانا ئاینیە کوردەکانەوە دراوە (بڕوانە بوونی کۆچەر و زاراوەی جیاواز لە ناو کورد دا).

هەر لە ژێر سایەی هەزەبانیەکاندا بوو کە چەندین مێژوونوس و شاعیر و فەیلەسوفی کورد، وەک ئەبو هیجای هەزەبانی[84]، ئیبن خلکان[85]، عومەری سورەوەردی (عومەر السهروردي)، کمال الدين سالار کوڕی حەسەن عومەر کوڕی سەعید هەولێری شافعی، عیزی زەریر (عز الضرير)[86]، و بە سەدان کەسایەتی تری مێژوویی دەرکەوتبوون. هەولێر بوو بووە شارێک کە چەندین قوتابخانەی تێدا بوو، هەروەها شوێنی نیشتەجێی چەندین کەسایەتی ئاینی و زانستی ئەو سەردەمە بوو. ئیبن ئەلمستەوفی لە کتێبی مێژووی هەولێر

---

[84]. ناوی تەواوی بریتیە لە میر عیزەدین محەمەد کوڕی ئەبی هیجای کوڕی محەمەدی هەزەبانی هەولێری (الامير عز الدين محمد الهذباني الاربلي) و لە نێوان (١٢٢٣ ز- ١٣٠١ ز) دا ژیاوە. ئەم زاتە ئەمیرێکی هەزەبانیەکان بووە و وەک ئەدیب و شاعیر و مێژوونوس ناسراوە و یەکێک لە کتێبە گرنگەکانی بریتیە لە "مێژووی کوڕی ئەبی هیجا" (تاريخ ابن ابي الهيجاء) (ابي الهيجاء، ١٩٩٣).

[85]. زانایەکی گەورەی کورد بووە و لەدایکبووی گوندی خەلەکانە لە ناوچەی دوکانی نزیک شاری سلێمانی و وەک زۆر لە کوردە موسوڵمانەکانی ئەو سەردەمە، پەیڕەوی مەزهەبی شافیعی کردووە. ئیبن خەلەکان بە شاکارێکی مێژوویی ناوبانگی دەرکردووە، کە ناوی هەموو کەسایەتیە مێژووییەکانی ئەو سەدەمەی تێدا بڵاوکردۆتەوە و ئەمڕۆ بە سەرچاوەیەکی جیهانی دەژمێردرێت بۆ مێژوو و ژیانی کەسایەتیە گرنگەکانی ئیسلام. ئەم کارەی ناو ناوە "کۆچکردنی پیاوماقوڵان و دەنگوباسی کەسایەتیەکانی سەردەم" (وفيات الاعيان و انباء ابناء الزمان)، کتێبەکەی بۆ چەندین زمان تەرجومەکراوە. ئەم زانایە لە نەوەی جەعفەری بەرمەکی بووە و سەرەتای ژیانی لە هەولێردا ژیاوە و دوایی ڕووی کردۆتە موسڵ و شام و میسر.

[86]. عیزی زەریر (العز الضرير) (١١٩٠ ز- ١٢٦٤ز): ناوی تەواوی حەسەنی کوڕی ئەحمەد کوڕی ئەجای هەولێریە و بە عیزی زەریر ناسراوە. ئەم زاتە، فەیلەسوفێکی ناسراو بووە و لە ئەدەبی عەرەبیدا شارەزاییەکی زۆری هەبووە. هاوڕێی نزیکی ئەبی هیجای هەزەبانی بووە کە ئەویش خەڵکی هەولێر بووە و ئەبو هیجا چەندین شیعری بۆ گوتووە. بەشێکی ژیانی لە دیمەشق بردۆتە سەر و لەوێ لەگەڵ خەڵکانی منەوەر و فەیلەسوفەکاندا مشتومڕی کردووە (ابي الهيجاء، ١٩٩٣، پ.٨). بە داخەوە جگە لەو زانیاریانە شتێک سەبارەت بەرهەمەکانی ئەم فەیلەسوفە نازانرێت.

(تاريخ اربل) دا زۆر بە ووردی ژیانی سیاسی و ئەدەبی دەوڵەمەندی هەولێری ئەو سەردەمەی ڕوونکردۆتەوە. میر و کەسایەتیە بەناوبانگەکانی هەزەبانیەکان، لە ئازەربایجانەوە هەتاوەکو میسر، ڕۆڵی گرنگیان لە ناوچەکەدا دەبینی.

**ئایا دەوڵەتی هەزەبان (Adiabene) لە بنەچەوە دەوڵەتێکی کوردیە؟**

ئەگەر سەیری سەرچاوە مێژووییەکانی ئەمڕۆ بکرێت، ئەوا وەک زۆر ڕووی مێژووی کورد و کوردستان و ناوچەکە و بە سیاسی کردنی دیاردەکان، هەزەبانیەکان بە کورد دانانرێن و دەوڵەتەکەشیان بە دەوڵەتێکی کوردی سەیر ناکرێت. نەک هەر ئەوە بەڵکو تەنانەت هەندێک جار بە ئاشوری و جاری واش هەیە بە دەوڵەتێکی جو یان بە نەتەوەیەکی تر لە قەڵەم دەدرێت. کەچی بەڵگە مێژووییەکان هیچ گومانێک لەسەر کورد بوونی ئەو دەوڵەتە ناهێڵن. بۆ یەکلاییکردنەوەی ئەو بابەتە، لە خوارەوە چەند بەڵگەیەکی مێژوویی خراوەتە ڕوو:

١. پێش هاتنی ئاشوریەکان، ئەم دەوڵەتە سەرەتا دەوڵەتێکی سەربەخۆی بچووک بوو لە ژێر ناوی Hazza دا کە وەک ئاماژەی پێکرا ناوەکە هوریە و Hazzi خوای چیای هوری بووە و ئاشوریەکان پاشگری um ی شوێنیان بۆ زیاد کردوە و ناوەکەیان کردۆتە Ahazum. پرۆسەی داگیرکردنی دەوڵەتی هەزەبانیەکان لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زاییندا لە ئەرشیفی شەمشەرەدا باسکراوە. ئەو ناوچانە لە بنەڕەتدا خەڵکەکەی هەمووی هوری بوون و لە دوای سەدەکانی هەژدەی پ.ز، ئاشوریەکان وورده وورده ناوچەکانی وەک عەرەفە و هەزە و چەندین شوێنیان گرتوتە دەست. ئاشوریەکان وەک هێزێکی نوێی ناوچەکە، سەرەڕای ئەوەی کە بۆ سەدان ساڵ حوکمڕان و دەسەڵاتداری ناوچەکە بوون، بەڵام نەیانتوانیوە فەرهەنگ و زمان و پەیوەندیە خێڵەکیەکان بگۆڕن، چونکە خەڵکەکە هەر هەمان خەڵکی دانیشتوانی کۆن بوون. بە دڵنیایی لەگەڵ هاتنی ئاشوریەکاندا ژمارەیەکی زۆر لە خێڵە ئارامیەکان هاتن بۆ ناوچەکە، بەڵام هەر دوا بە دوای ڕوخاندنی ئاشوریەکان، دەسەڵات چووەتەوە دەست میدەکان و زۆربەی خێڵە کوردیە کۆنەکان خۆیان دروستکردۆتەوە و هەزەبانیەکانیش، وەک خێڵێکی گەورەی ناوچەکە، لە نزیکی سەدەکانی سێ سەدی پ.ز وە گەشاونەتەوە. مانەوەی خێڵێک بە هەمان ناو و لە هەمان ناوچەدا، شتێکی نامۆ نیە لە ناوچەکانی کوردستاندا. ئەوەتا بەگزادەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش زاینەوە بە bagdatti (بڕوانە مانیەکان) ناویان لە ناوچەی ورمێ هاتووە و هەتاوەکو ئەمڕۆش لەو ناوچەیەدا وەک خێڵێکی دەسەڵاتدار ماون. هەروەها وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا مارسیلینوس لەسەدەی چوارەمی زاییندا ئاماژەی بەوە کردووە کە ناوی شوێنەکە جاران ئاشوریا بووە و کراوەتە هەزەبان، کە دیسان ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە ماوەیەک بەهۆی هاتنی ئاشوریەکانەوە ناوەکە گۆڕاوە و لەبەر ئەوەی کە ناوە کۆنەکە مێژوویەکی پتەوتری لەلای خەڵکەکە هەبووە، هەر بە کۆتایی دەسەڵاتی ئاشوریەکان ناوە دێرینە مێژووییەکە گەڕاوەتەوە.

٢. ناوچەی (گەرمیان) کە ناوچەیەکی تەریبە بە سەنتەری ناوچەی هەزەبانیەکان و ئاماژەی پێ کرا، لە بنەڕەتدا ناوەکەی ناوێکی کوردی/سۆمەری/هوریە. دوای هاتنی ئارامیەکان نیوەی ناوەکەی تەرجومەکراوە بۆ ئارامی و کرایە (بيت گرماي). دانانی ئەو ناوە خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە دەستنیشانکردنی وڵاتی هەزەبانیەکان لەلایەن خۆیانەوە. هۆکاری ناونانی ئەو ناوچەیە بە (ناوچەی گەرم) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە خەڵکانێک ئەو ناوەیان هەڵبژاردوە کە سەنتەری دەسەڵاتیان ناوچەیەکی سارد بووە ، بۆیە بە (گەرمیان) ناویان ناوە. چونکە ئەگەر ناوی ئەو ناوچەیە لەلایەن نەتەوەکانی ڕۆژئاوا یان باشورەوە ناو بنرایە، بە ناوچەی گەرم ناو نەدەنرا، لەبەر ئەوەی کە ناوچەکانی خۆیان گەرمترە. جا ئەگەر سەیری گەرمیان بکرێت دەبینرێت کە ناوچەیەکی پشتێنەییە کە دەکەوێتە خوار (هەزەبان)ەوە (بڕوانە نەخشەی ١٠). پاشتر لە سەرچاوە ئیسلامیەکانیشدا ناوی ئەم ناوچەیە لە (بيت گرماي) ی نیوە ئارامیەوە گۆڕاوە بۆ (بجرمي/باجرمي)، بەڵام کورد هەر ناوە ڕەسەنە هوری/کوردیەکەی پێ دەڵێت. شایانی باسە کە کورد بە درێژایی مێژوو وڵاتی خۆی بە گەرمیان و کوێستان لە قەڵەم داوە و لە زۆربەی سەردەمەکاندا وڵاتەکەی دابەش کردووە بۆ ئەو دوو ناوچەیە و لە وەرزی جیاوازدا سوودی لە هەریەکەیان بینیوە. هەموو شارێک یان گوندێک کە دەکەوێتە ناوچەی ساردەوە پێی دەڵێت (کوێستان) و بۆ دەڤەری گەرمیش بە پێچەوانەوە.

کەواتە هەر لە ڕوانگەیەکی کوردی دەستنیشانکردنی ناوچەی گەرمیان و کوێستانەوە ناوەکە ناونراوە و هەموو میللەتەکانیش ئەو ناوەیان قبوڵ بووە.

(نەخشەی ژمارە ١٠) سەنتەری دەسەڵاتی وڵاتی هەزمبان و ناوچەی گەرمیان.

٣. لە سەدەی یەکەمی پێش زاییندا، کاتێک کە یەکێک لە دەست و پێوەندەکانی عیسای پێغەمبەر بە ناوی مار ماری (Mar Mari) ڕووی کردۆتە ناوچەکانی وەک هەولێر و کەرکوک و زۆزان، دەبینرێت زۆربەی ناوی شوێنەکان و خەڵکەکەش هەر کوردیە. بۆ نموونە لە کۆڕی پاشای هەولێردا مار ماری باسی یەکێک لە سەرکردەکانی سوپای هەولێر دەکات کە ناوی زەردەش/زەردەشت (Zaradosh) بووە و کوڕەکەی ناوی کوردەوا (Qardway) بووە و لە ناوچەی گەرمیان باسی کەسێک دەکات بە ناوی (دۆستی Dousti)[87] (Harrak, 2005, P.17). هەروەها ناوی شوێنەکان بریتین لە (بیت گرمای، گەلاڵە، داسن (ناوچەی ئێزدیەکان)، زۆزان، هتد. جگە لەوانەش، یەکەم قەشەی باڵا (bishop) ی هەولێر لە سەدەی یەکەمی زایندا ناوی paqida (پاکیدە/پاکیزە)[88] بووە (Lieu, 1992, p.35) . پاکیزە خۆی سەرەتا کۆیلەی موغێک بووە، دوایی بوەتە کریستیان و کوڕی کابرایەک بووە بە ناوی بێری (Beri)[89] (Foster, 1977, p.93).دەبینرێت کە پاکیزە ناوی خۆی و باوکی هەر کوردی بووە. تەنانەت کۆنترین ئاماژەکردن بە

[87]. ناوی (دۆست)، ناوێکی کوردیە و مانای (هاوڕێ، خۆشەویست، دڵسۆز) دەدات. لە زمانی سۆمەریدا بەشێوە dusa نووسراوە و میدەکان بە zušta نوسیویانە و لە کوردیا بە هەردوو شێوەی (دۆس/دۆست) دەنووسرێت. ئەمڕۆ لە زۆربەی زمانە زاگرۆسی (ئێرانی) مکاندا دووبارە دەبێتەوە بەشێوەی (دۆست).

[88]. ئەم ناوە لە کوردیدا پێکهاتووە لە (پاکی+زا) کە مانای (وەچەی پاکی، لە پاکی پەیدابوو) دەدات. هەر هەمان وشەی کوردی لە تێکستێکی ئاینی کریستیانیدا بەشێوەی pākiž لە ژێر ناوی زمانی میدیدا لە کەنیسەیەکی ئەرمەنیدا دۆزراوەتەوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزەهەمی پێش زاینی و لە کۆپیەکی زۆر کۆنترەوە وەرگیراوە (بڕوانە زمانی میدەکان).

[89]. ئەم ناوە لە کوردیدا مانای (مەردۆش) دەدات.

جۆرێک لە یاری پۆڵۆ لە سەدەی پێنجەمی زاییندا کە لە ناو هەولێردا کراوە و لە شێوەی یاری پۆڵۆی ئەمڕۆدا بووە و لەسەر پشتی ئەسپ کراوە، بە ئەسپ ڕیسا (asprisā) ناوهێراوە (Walker, 2006, p.21)، کە ناوێکی کوردیە . شایانی باسە کە نزیکی حەوت سەد ساڵ دوای ئەوە هەر هەمان ئەم یاریەی کە هەزەبانیەکان لە سەدەی چوارەمی زاییندا کردوویانە لە سەرچاوەکاندا باسی لێوە دەکرێت بەوەی کە یەکێک بووە لەو یاریانەی کە سەلاحەدینی ئەیوبی زۆر ئارەزووی لێی بووە (Bois, 1966, p.69).

٤. وەک لە سەرەتادا ئاماژەی پێ کرا، خێڵی گەورە و دەوڵەتی هەزەبان لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زایینەوە لە ژێر ناوی Ahazum دا حوکمڕانیان کردووە. سەرچاوە یۆنانیەکان لە دوای سەدەی یەکەمی زاینەوە هەزەبانیەکانیان وەک نەتەوە سەیر کردووە، کەچی لە دوای هاتنی ئیسلامەوە دیسان لە هەمان ناوچە ناوی هەزەبانیەکان هاتوتەوە و حوکمڕانی هەولێر و دەوروبەریان کردووە. دەوڵەتی هەزەبانی لە سەردەمی ئیسلامیدا یەکێک بووە لە دەوڵەتە هەرە بەهێزەکانی ناوچەکە و ژمارەیەکی زۆر لە شاعیر و مێژوونوس و مۆسیقا ژەن و زمانەوان و کەسایەتی ئاینی ناسراوی خۆی هەبووە. هەروەها تیرەی ڕەوەندی[90] سەلاحەدینی ئەیوبی، تیرەیەک بووە لە خێڵی گەورەی هەزەبانیەکان و ناوچەی دەسەڵاتی هەزەبانیەکان[91] هەر هەمان ناوچەی ژێر دەسەڵاتی میتانیەکان بووە. لە ڕاستیدا دەسەڵاتی هەزەبانیەکان و دوایی ئەیوبیەکان، هەر میراتگری دەسەڵاتی هوریەکان بووە کە بنەماڵەی میتانیەکان سەرکردایەتیان دەکرد و درێژکراوەی ئەو دەسەڵاتە بوون، بەڵام لە سەردەمی سەلاحەدیندا دەسەڵاتەکە بەرفراوانتر بووە و وڵاتی میسر و زۆر شوێنی تری گرتەوە[92].

ئیبن خەلەکان لە باسی سەلاحەدینی ئەیوبیدا دەڵێت "مێژوو نوسان ڕێکەوتوون لەسەر ئەوەی کە باوک و کەسوکاری خەڵکی (دوین) ن، کە شارۆچکەیەکە لە کۆتایی ئازەربایجاندا لە لای ئاران و وڵاتی کەرمجە و ئەوان کوردی ڕەوادین. ڕەوادیەکان تیرەیەکن لە هەزەبانیەکان کە خێڵێکی گەورەی کوردن. پیاوێکی زانای خەڵکی دوین پێی گوتم لە نزیک دوین گوندێک هەیە پێی دەڵێن ئەجدانقان و هەموو خەڵکەکەی کوردی ڕەوادین" (ابن خلکان، ٢٠١٠). بەو جۆرە لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا و لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا زۆربەی کەسایەتی و پاشا هەزەبانیەکان، جگە لە ناوی خێڵەکەیان، ناوی کورد لەگەڵ ناوە هەزەبانیەکەیان دانراوە.

لە سەردەمی سەرەتای هاتنی ئیسلامدا بەهۆی هاتنی عەرەبەکانەوە و بەهێزبوونیان لە هەندێک ناوچەدا، قەڵەمڕەوی هەزەبانیەکان کەم بووەوە، بەڵام پاش ماوەیەک هەزەبانیەکان وەک خێڵ و وەک دەسەلاتیش، بە نزیکی هاوشێوەی ئەو دەسەڵاتەی کە لە سەردەمی مانوباز و هێلینای شاژندا هەیان بوو، لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتاوەکو ناو ئازەربایجان و لە باکورەوە بۆ ناو کوردستانی باکور و هەتاوەکو سوریاش ئەو دەسەڵاتەیان مابوو.

٥. لە سەدەی یەکەمی زاییندا یەکێک لە شاژنە دەسەڵاتدارەکانی هەزەبانیەکان، هێلینای ژنی مانوباس بووە. ئەم ئافرەتە دەسەڵاتێکی فراوانی هەبووە و ڕۆڵێکی گەورەی لە بەڕێوەبردنی وڵاتەکەدا بینیوە. دوای مردنی مانوبازی مێردیشی، شانبەشانی ئیزدی کوڕی وڵاتی بەڕێوە بردووە و دەسەلاتی هەبووە . قبوڵکردنی

[90]. ناوی ئەم تیرەیە هەندێک سەرچاوە بە (ڕەوەندی) دەنووسن و هەندێک بە (ڕواد). وا دەردەکەوێت کە (ڕەوەندی) دروست تر بێت لەبەر ئەوەی کە لە کوردیدا مانای هەیە و مانای (کۆچەر) دەدات.

[91]. کوردبوونی خێزانی سەلاحەدین و پابەندبوونیان بە ڕەچەڵەکی خۆیان و ناوچەی هەولێر و هەزەبانەوە زۆر بە ڕوونی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا دەردەکەوێت. یافیعي (عبد الله بن أسعد اليافعي) کە خۆی یەمەنی بووە، لە سەدەی چواردەیەمی زاییندا دەڵێت کاتێک کە یەکێک لە پاشا ئەیوبیەکان کە نازناوی مەلیک مەسعودی هەبووە و باپیری پاشای یەمەن بووە و لە مەکە وادەی مردنی دێت، پێش مردنی وەسیەت لای پیر (شێخ) یکی خواناسی هەولێری مەکە دەکات سەبارەت چۆنێتی بە خاکسپاردنی. داواکاریەکەشی ئەوەبوو کە هەر لە ناو خەڵکی ئاساییدا بنێژرێت و هیچ لەسەر گۆڕەکەی نەکرێت. پیرە خواناسە هەولێریەکە ئەوەی کردووە و لەسەر گۆڕەکەی نووسیوە "ئەمە گۆڕی یوسفی کوڕی محەمەدی کوڕی ئەبوبەکری ئەیوبی هەژارە" (اليافعي، ٢٠١٠، پ.٢/١٦٢). ئەم نەریتە لە ناو هەندێک لە تەریقە سوفیگەریەکانی کوردستاندا هەتاوەکو ئەمڕۆش دەکرێت و هیچ لەسەر گۆڕەکانیان ناکەن جگە لە دوو کێل نەبێت.

[92]. ئەگەر سەرنجی نەخشەی ناوچەی دەسەڵاتی میتانیەکان و هەزەبانیەکان و دوایی ئەیوبیەکان بدرێت، ئەو پەیوەندیە مێژووییە بە ڕوونی دەردەکەوێت.

دەسەلاتداریێتی ئافرەت لە ناو کورد دا هەر لە خۆیەوە نەهاتووە و ڕابردووی مێژوویی کۆنی هەیە و چەندین جار لە مێژوودا دووبارە بووەتەوە (بڕوانە ڕۆڵی ئافرەت لە ناو کورد دا)، ئەم دیاردە کولتوریەش دیسان کوردبوونی ئەو دەوڵەتە نیشان دەدات.

(وێنەی ١٧) وێنەی دەستکردیی قەشەی باڵای سالزبری لەبەردەم سەلاحەدیینی ئەیوبیدا.

# دەوڵەتی کوردیان (Kurdian, Cordeyen) (جەزیرەی ئەمڕۆ)

### ناوی دەوڵەتی کوردیان

لە سەرەتاکانی مێژووی شارستانی و سەرەتای تۆمارکردنەوە، ئاماژە بە ناوچەی کوردیان بە شێوەی جیاواز کراوە (بڕوانە کورد و ڕەچەڵەکی کورد). بەهۆی پەیوەندی ئەو ناوچەیە بە بەسەرهاتی کەشتیەکەی نوحەوە، هەر لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە زۆر لە نەتەوە و ئاینە جیاوازەکان لە ڕابردوو و لە مێژووی نوێشدا ئاماژەیان پێکردووە. لە سەردەمی سۆمەریەکاندا ناوەکە Karda بووە، بەڵام دواتر لە ئەرشیفی ماریدا بە Kurda ناوهێنراوە، وەک ناوچەیەکی دەسەڵاتی میتانی باسکراوە و چەندین جار لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا ناوی هاتووە. لە تێکستە ئاشوریەکاندا بە ناوچەی (کورتێ) Kurte ناوهێنراوە، کە هەمیشە لەجەنگدا بووە لەگەڵ ئاشوریەکاندا و ئاشوریەکان زۆر جار هێرشیان کردۆتە سەری. هەروەها ئاشوریەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم دەوڵەتە زۆرجار لەگەڵ دەسەڵاتەکانی دراوسێیدا هێزیان کردۆتە یەک بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئاشوریەکان. یۆنانیەکان ناوەکەیان بە شێوەیەکی نزیک لە ناوە کوردی/هوریەکە و بە شێوەی جیاوازی (Gorduene, Cordyene, Cardyene, Carduene, Gordyene, Gordyaea, Korduene, Gordian) تۆمارکردووە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٩). ئارامیەکان ناوەکەیان تەرجومە کردووە و ناوی کوردیان (کورد+یان) کراوەتە بیت کاردو/قاردو(بیت+کاردو/قاردو) و عەرەبەکان کە لەسەرچاوە ئارامیەکانەوە ناوەکەیان وەرگرتووە و لە سەردەمی هاتنی موسوڵمانەکاندا کردویانەتە (بقردي/باقردي) و دوایی کراوەتە جەزیرە.

### مێژووی دەوڵەتی کوردیان

نووسینەوەی کرۆنۆلۆژی مێژووی ناوچەی کوردیان کارێکی ئاسان نیە، لەبەر ئەوەی کە ئەو سەرچاوانەی کە هەتا ئێستا لەبەردەستدان پچڕ پچڕ و ناتەواون. وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە تۆمار کراوە. دوایی لە تێکستە ئاشوریەکاندا ناوی هێنراوە و زۆر جار ئەو ناوچەیە وەک دەسەڵاتێکی نەیاری ئاشوریەکان ناوی هێنراوە. پێشتر پێش بەهێز بوونی ئاشوریەکان کوردیان ناوچەیەکی گرنگی دەسەڵاتی میتانی بووە و پەیوەندی لەگەڵ هەردوو شارەکانی ماری و بابل دا هەبووە و چەندین جار پەیمانی دیپلۆماسی لەگەڵ ئەو ناوچانەدا مۆر کردووە. یەکێک لە پاشاکانی دەوڵەتی کوردیان ناوی حامورابی (Hammurapi)[93] بووە و هەر بە (šar Kurda) ئاماژەی پێ کراوە (Pitard, 1987, p, 42). لە زمانی هوریدا هاوشێوەی زمانی کوردی، ماناکەی دەبێتە (سەر کوردە/سەرکردەی کوردە). حامورابی پاشایەکی بەهێز بووە و لە ڕووداوەکانی نزیکی هەزار و هەشت سەدی پێش زاییندا زۆر جار ناوی هێنراوە. ناوچەکە لە ڕێکەوتنە دیپلۆماسیەکاندا ئاماژەی پێ کراوە وەک یەکێک لە حەوت شارە میتانیەکان کە خواکەی وەک شایەت لە ڕێکەوتنامەکەدا باسکراوە و لە شێوەی (کێرد) بووە (Young, 1992, p.14). شایانی باسە ئەمڕۆ هەمان خوای خەنجەر لە ناوچەی یەزلیکایە (Yazilikaya) ی تورکیا، وەک پاشماوەی هیتیەکان لەسەر بەردێک هەڵکەندراوە و بە خوای جیهانی ژێرەوە باسدەکرێت و لە لای هیتیەکان بە نێرگەڵ (Nergal) ناسراوە کە لە شێوەی خەنجەرێکدا کراوە و دوو شێری لەسەرە و لە زەوی چەقێندراوە (بڕوانە وێنەی ١٨) (Nossov, 2012, p.47). ئەم خوایە لە بنەچەدا هیتی نیە و هیتیەکان لە ڕووی فەرهەنگ و ئاینەوە کەوتوبوونە ژێر کاریگەری هوریەکان و زۆربەی خواکانی ئەوانیان دەپەرست. دیاکۆنۆف دەڵێت نێرگەڵ (Nergal) لە بنەچەدا خوای میتانیە هوریەکان بووە (Diakonoff, 1981,

---

[93]. ئەم حامورابیە هیچ پەیوەندیەکی بە حامورابی بابلەوە نیە و هەر تەنها ناوەکەیان هاوبەشە.

(p.86. هەروەها دەبێت ئەوە بزانرێت کە هەتاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم لە ناو هەندێک لە ئێزدی و دملی (زازا) کوردەکاندا جۆرێک شمشێر لە زەوی چەقێندراوە و بە شێوەیەکی پیرۆز مامەڵەی لەگەڵدا کراوە[94] (Izady, 1992, p.151).

(وێنەی ١٨) خوای نێرگەڵ (Nergal) کە لە شێوەی خەنجەرێکی چەقیو لە خاکدا بووە.

بۆ یەکەمجار لە ناو یۆنانەکاندا زەینەفۆن (٤٣٠ پ.ز-٣٥٤ پ.ز) ی سەرکردەی سوپا و فەیلەسوف، لە سەدەی چوارەمی پێش زایندا ئاماژەی بەو ناوچەیە کردووە. زەینەفۆن وەک سەرکردەی سوپای یۆنانی ناسراو بە سوپای (دە هەزارە) کە لە پاشەکشەیدا لە بابلەوە بۆ یۆنان بە بەشێکی کوردستاندا تێپەڕیوە، ئاماژەی بەو ناچەیە کردووە و بە کاردۆخی (Carduchi) ناوی هێناوە.

زەینەفۆن جگە لە هەندێک زانیاری سەبارەت بە جۆری چەک و چۆنێتی شەرکردنی خەڵکی ئەو ناوچەیە، زانیاری تری ئەوتۆ دەربارەیان ناخاتە ڕوو. زانیاریەکان زیاتر بریتین لە ووردەکاری ڕۆژانە نەک زانیاری مێژوویی سەبارەت ناوچەکە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە سەدەی چوارەمی زاییندا یۆنانیەکان زۆر ئاشنای ئەو ناوچانە نەبوون. سەبارەت بە کاردۆخیەکان و ئەو تیر وکەوانانەی کە بەکاریان هێناوە، زەینەفۆن دەڵێت "تیروکەوان بازێکی شارەزا بوون؛ کەوانەکەیان نزیکی مەترو نیوێک درێژ و تیرەکانیان زیاتر لە مەترێک درێژ بوو. کاتێک کە تیریان دەهاویشت، پەتەکەیان ڕادەکێشا و بەشی خواری کەوانەکەیان بە قاچی چەپیان دەگرت، ئەو تیرانە زرێپۆشی سەر لەشی پیاوەکانی ئێمەیان دەبڕی" (Xenephone, 1845, p.239). هەروەها زەینەفۆن دەڵێت کاردۆخیەکان هەوڵیان دەدا کە شەڕی دەستەو یەخە کەمتر بکەن و زیاتر لە دوورەوە شەڕیان لەگەڵ کردوون. لە کۆتاییدا باس لەوە دەکات کە سەخت ترین بەشی گەشتەکەیان تێپەڕبوونیان بووە بە ناوچەی کاردۆخیدا.

[94]. میهرداد ئیزادی دەڵێت مارک سایکس لە ساڵی ١٩٠٨ دا دەڵێت کە ئەم جۆرە سەرەمۆنیە لە ناو خێڵە دملی (زازا) کانی وەک بۆسکان و کوریان-دا بەرێوە چووە. میهرداد ئیزادی بەردەوام دەبێت و دەڵێت ئەگەرێکی زۆر هەیە کە چەقانی شمشێر لە سەر بەرد لە داستانی ئارسەری پاشا (The legend of King Arthur) دا، هەر لەو بنەچەیەوە چووبێتە ناو بەریتانیەکانەوە. لەبەر ئەوەی کە ئەو هێزە سەربازیانەی کە بە فەرمانی ئیمبراتۆری ڕۆمانەکان، مارکوس ئورێلیۆس، لە ناوچەی هەنگاریای ئەمڕۆوە نێردراوە بۆ بەریتانیا، دابونەریتە کوردیەکەی چەقاندنی شمشێر لەسەر زەویان گوێزاوەتەوە بۆ بەریتانیا (Izady, 1992, p.151).

دەبینرێت کە نزیکی چوار سەد ساڵ دوای زەینەفۆن، سترابۆ (٦٤ پ.ز- ٢٤ ز) ی جوگرافیناس و مێژوونوسی ڕۆمانی ئاماژەی بەو ناوە کردۆتەوە و ڕاستی کردۆتەوە و دەڵێت " نزیک ڕوباری دیجلە ئەو شوێنانەن کە سەربە گۆردیایی (Gordyæi) ن، کە پێشینان پێیان دەگوت کاردوخی (Carduchi)" (Bailey, 1989, P.65). لێرەدا سترابۆ بە ڕوونی ناوە هەڵەکەی زەینەفۆن و هەندێک لەوانەی تری ڕاست کردۆتەوە و نزیکی کردۆتەوە لەو ناوەی کە لە سەردەمی سۆمەریەکان و دوایی ئاشوریەکاندا بۆ ئاماژەکردن بۆ ئەو ناوچەیە بەکار هێنراوە.
سترابۆ بەردەوام دەبێت و لە باسی گۆردایی (Gordyæi) دا ناوی چەند شارێکی ناوچەکەشی نوسیوە، لەوانە سارێسا (Sareisa)، ساتالکا (Satalca) و پێنکا (Pinaca) (Strabo, 1856, p.157). شایانی باسە نزیکی هەشت سەد ساڵ پێش سترابۆ، ئاشوریەکان لە تۆماری جەنگەکانیاندا لە ئاماژە کردندا بە ناوچەی Kurte، هەمان ئەو شارەی کە سترابۆ بە Sareisa ی ناو دەهێنێت، ئەوان بە شێوەی Shereisha[95] ئاماژەیان پێ کردوە (Campbell, 1891, p.230). هەروەها سترابۆ لە باسی گۆردیان (کوردیان) و ناوچەکەدا، ئاماژە بە پتەوی دیواری قەلاکانی دەکات و دەڵێت "ناوبانگیان دەرکردبوو بەوەی کە لە هونەری بیناسازیدا زۆر نایاب بوون و زۆر شارەزاش بوون لە دروستکردنی دەزگای تایبەت بە گرتنی قەڵادا" (Strabo, 1857, p.157). لە سەدەی دەیەمی زایندا، لە کتێبی (الفهرست) ی (ابن ندیم) دا، ناوی کتێبێک هاتووە بە ناونیشانی " کتێبی قەڵا و کوردەکان" (کتاب القلاع والاکراد) (ابن الندیم، ٢٠١٠، پ.١١٦). بە داخەوە کتێبەکە هەتاوەکو ئەمڕۆ نەدۆزراتەوە، بەڵکو تەنها لە نوسینی تردا ئاماژەی پێکراوە. بەڵام لە ناونیشانی کتێبەکەدا دەردەکەوێت کە نوسەر ئاماژەی بە کارامەیی کوردەکانی ئەو ناوچەیە، لە دروستکردنی قەڵا و دەزگاکانی قەڵا گرتندا کردبێت. وا دەردەکەوێت کە تایبەتمەندی ئەو ناوچەیەی کوردستان کە لە سەدەی یەکەمەدا سترابۆ ئاماژەی پێکردووە لە دروست کردن و گرتنی قەڵادا، لە بنەچەدا هەر کارامەیی و شارەزایی باپیرە هیتیەکانی ئەو ناوچەیە بێت کە هەتاوەکو سەدەی دەیەمی زایین هەر لە ناو کورد دا بەردەوام بووبێت و هەتاوەکو ئەمڕۆ قەڵای هیتیەکان لە باکوری کوردستاندا هەر بە پتەوی ماون.
جارێکی تر لە سەدەی یەکەمی پێش زاییندا و لە نێوان ٧٣ پ.ز- ٦٣ پ.ز، پلوتارکی مێژوونوسی یۆنانی لە ئاماژە کردندا بە ڕووداوەکانی جەنگی نێوان ڕۆمەکان بەرامبەر بە تیگران، پاشای ئەرمەنی و میسرادات و پاشای پۆنتۆس دا، چەند جارێک ناوی پاشای کوردیان و هەزبان و پاشای مید بەیەکەوە دەبات کە هاوکاری تیگران و پاشای پۆنتۆسیان کردووە بەرامبەر لۆکولۆس (Lucullus) ی سەرکردەی ڕۆمانەکان. پاشتریش جارێکی تر پلوتارک ئاماژە بە ڕێکەوتنێک لەنێوان زەربینۆس (Zarbienus)[96] کە پاشای کوردیان بووە، لەگەڵ لۆکۆلۆسی سەرکردەی ڕۆماندا دەکات، کە چۆن کاتێک کە تیگرانی پاشای ئەرمەنی بەم پەیمانە دەزانێت، هێرش دەکاتە سەر زەربینۆس و دەیکوژێت. هەر سەبارەت بەو ڕووداوە پلوتارک دەیگێڕێتەوە کە کاتێک لۆکۆلۆسی گەورە سەرکردەی ڕۆمەکان دەگاتە ناوچەی کوردیان، وەک ڕێزێک بۆ زەربینۆسی پاشای کوردیان، بڕیار دەدرێت کە پرسەیەکی گەورەی بۆ دابنرێت و بە دەستی خۆی گڕ لە تەرمەکەی بەر دەدات. بێگومان بەپێی پەیڕەوی نەریتی ئەو کاتە ئەمە نیشانەی پلەی بەرزی ڕێزلێنان بووە. جگە لەوەش لۆکۆلۆس بڕیار دەدات کە بۆ یادەوەری ئەو پاشایە و ڕێزلێنانی، مۆنومێنتێکی مەزنی بۆ دروست بکرێت (Plutarch, 1959, p.555).

95. زۆربەی جار ئاشوریەکان پیتی (س) دەکەنە (ش)، هەر وەک لە ناوەکەدا دەردەکەوێت تەنها گۆڕین ئەوەیە کە لە ناوی شارەکەدا ڕوویداوە.

96. نازانرێت پێکهاتەی ناوی Zarbienus لە بنەڕەتدا چی بووبێت لەبەر ئەوەی کە ڕۆمانەکان پاشگری us دەخەنە سەر ناوەکە و هەندێک جار ناوەکە زۆر دەگۆڕدرێت.

لە سەدەی دووهەمی زاینیدا باس لە پاشایەکی تری کوردیان دەکرێت بە ناوی مانی سەر (Manisarus)[97]. ئەم پاشایە زۆر بەهێز بووە و بەشێک لە وڵاتی ئەرمەنیەکانی خستۆتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی و دەسەڵاتەکەی ناوچەکانی جەزیرە و سنجار و دەروبەری گرتۆتەوە. مانی سەر، هێندە دەسەڵاتی بەهێز بووە، تەنانەت ماوەیەک هەوڵی داوە بە شەڕ کورسی و دەسەڵاتی ئەشکانیەکان بگرێتە دەست. مانیسەر بەشێوەیەک لەگەڵ ئەشکانیەکاندا کەوتبووە جەنگ کە گەورە نوێنەری خۆی ناردووە بۆ لای تراجانی (Trajan) ی قەیسەری ڕۆم و داوای لێکردووە کە هێزیان بکەنە یەک لە دژی دوژمنی هاوبەشیان کە ئەشکانی و هاوپەیمانەکانیان بووە. مانیسەر بۆ ئەم داواکاریە پەیمان بە تراجان دەدات کە هەندێک لە ناوچەکان کە لە هاوپەیمانەکانی پاشای ئەشکانی بە جەنگ گرتبوو، بداتە قەیسەری ڕۆم. بەڵام قەیسەری ڕۆم مەرجی دانا کە ئەگەر مانیسەر خۆی بە شەخسی نەچێتە لای قەیسەر و ئەو ڕێکەوتنە مۆر نەکات داواکاریەکەی ڕەت دەکاتەوە (Bennett, 1997, p.199).

پاشایەکی تری کوردیان لە سەدەی چوارەمی زاینیدا لە لایەن مێژوو نوسی یۆنانی مارسێلینۆسەوە ئاماژەی پێکراوە. ئەم پاشایە ناوی جۆڤانیان (Jovinianus)[98] بووە. بەپێی مارسێلینۆسی مێژونوس، کە خۆی لە سوپای ڕۆمدا بووە، جۆڤانیان لە ناو ڕۆمەکاندا پەروەردە بوو بوو و هەستی بە نزیکی دەکرد لەگەڵ ڕۆمەکان. مارسێلینۆس خۆی وەکو شاندێک نێردراوە بۆ لای جۆڤانیان هەتاوەکو داوای پشتگیری ڕۆمەکانی لێ بکات. مارسێلینوس وەسفی پاشاکە دەکات کە چۆن بە یاوەری پاشای ئەلبانیا و پاشای خیۆنیتای (Chionitae) بووە (Marcellinus, 1894, p.175).

شتێکی تری ئەوتۆ سەبارەت ئەم دەوڵەتە کوردیە نازانرێت هەتاوەکو هاتنی ئیسلام . لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا لە ئاماژە بە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا، ئەو ناوچەیە زۆربەی جار وەک ناوچەیەکی ژێر دەسەڵاتی کوردان ئاماژەی پێکراوەوە و زۆر جار ئیمارەتە کوردیەکانی وەک مەروانی، حەمیدی، هەزبانی، بۆتانی، جەزیری، بەدرخانی، هتد. لە هەمان ناوچەدا حوکمڕانیان دەکرد و ناوچەکە هەمیشە سەنتەرێکی گرنگی دەسەلاتی کوردی بووە.

مێژوونوسی ئیسلامی قەلقەشەندی لە سەدەی چواردەیەمی زاینیدا ئاماژە بە قەڵای فنیک دەکات، وەکو قەڵایەکی ژێر دەسەڵاتی کوردەکان (القلقشندي، ٢٠١٠) .هەروەها لە سەدەی شازدەی زاینیدا شەرەفخانی بدلیسی (بدلیسی، ٢٠٠٦، پ.٢٠٩) باسی ناوچەی فنیک دەکات کە هەمان ناوچەیە کە ستراباۆ لە سەدەی یەکەمی پێش زاییندا بە Pinaca باسی دەکات و مارسێلینۆس لە سەدەی چوارهەمی زاییندا خەڵکەکەی بە Phoenice ناو دەبات (Marcellinus, 1894, p.225). شایانی باسە شەرەفخان (فنیک) وەک ناوچە باسی دەکات و ئاماژە بە چوار هۆزی کورد لەو ناوچەیەدا دەکات کە حوکمڕانییان کردوە.

ئەم بەڵگەو زانیاریانەی سەرەوە دەیسەلمێنن کە ناوچەی جەزیرە و بۆتانی ئەمڕۆی باکوری کوردستان، لە ڕابردوودا یەکێک بووە لە مەڵبەندە کوردیە گرنگەکان و هەمیشە ناوەکەی بە نەتەوەی کوردەوە بەستراوە و وەک دەوڵەت یەکێک لە سەنتەرەکانی دەسەڵاتی کوردی بووە. لە سەرەتای شارستانیەتی ناوچەکەوە ڕۆڵی هەبووە لە ڕووداوە جیاوازەکانی ناوچەکەدا. هەروەها ڕاستیەکی تر ڕوون دەبێتە کە ناوی (کوردیان) هەمان مانای (کوردستان) دەدات (بڕوانە کورد و ڕەچەڵەکی کورد) بۆیە لای ئارامیەکان ئەم ناوچەیە بە (بیت کاردو/قاردو) ناوی هاتووە و ئینجا عەرەبە ئیسلامەکان ناوە ئارامیەکەیان گۆڕیوە بۆ (باقردي/بقردي). شایانی باسە کە درەنگتر لە ژێر کاریگەری عەرەبە موسوڵمانەکاندا ناوەکە گۆردرا بە جەزیرە و هەتاوەکو ئەمڕۆ هەر بەو ناوەوە ناسراوە.

---

[97]. ئەم ناوە لە بنەڕتدا ئەگەر پاشگرە یۆنانیەکەی لێ بکرێتەوە، دەبێتە مانی سەر (Manisar) کە ئەگەر تێبینی بکرێت ئەو ناوە لەگەڵ ناوی پاشای هەزمبانی هەولێردا گونجاوە کە ناوی مانوباز بووە. ناوی مانی سەر لە کوردیدا مانای (سەرکردەی زانا) دەدات. دەبێت ئەوەش بزانرێت کە وشەی sar لە سەردەمی هیتی و هوریەکانیشدا هەر مانای (پادشا) ی داوە.

[98]. ناوەکە دوای ئەوەی کە پاشگرە یۆنانیەکەی لێکرایەوە، دەبێتە جەڤانیان.

# چەند زمان و گروپی دێرینی ئەناتۆڵیا و بەڵکان

**کورتەیەک سەبارەتیان**

ئەناتۆڵیا هەتاوەکو بەڵکان کۆمەڵێک گروپ و زمانی جیاوازی تێدا بووە وەک هیتی (Hittite)، لوڤی (Luvian)، پالایک (Palaic)، لیسی (Lycian)، لیدی (Lydian)، کاری (Carian)، فیریگی (Phrygian)، هوری (Hurrian) و ئورارتی (Urartian). هەندێک لەم زمانانە تا ڕادەیەک لێکۆڵینەوەی زیاتری لەسەر کراوە و زۆر لایەنی مێژوویی ئاشکرا کراوە؛ وەک زمانی هیتی، هوری و لوڤی. هەندێکی تریان تەنها چەند وشەیەکی زانراوە و بە ڕێژەی جیاواز کاریان لەسەر کراوە. هەندێک لەو زمانانە تەنها سەد وشەیەکیان دۆزراوەتەوە. هەر یەک لەم زمانانە پەیوەنیان بە زمانی کوردی نوێوە هەیە و ئەو پەیوەندیەش بە ڕێژەی جیاواز بەرچاو دەکەوێت. لە فەرهەنگی زمانی هوری، لوڤی و هیتیدا پەیوەندی لەگەڵ زمانی کوردیدا خرایە ڕوو، لێردا تەنها سێ زمان لە ناو ئەو زمانانە وەک نموونە هەڵژێردران کە هەتاوەکو ئەمڕۆ زانیاریەکی کەم سەبارەتیان هەیە، ئەوانیش بریتین لە زمانی کاری، سراسی و لیدی.
بڕیاری هەڵبژاردنی ئەو زمانەنە بەو مەبەستەیە کە پەیوەندی زمانی کوردی بە زمانە دێرینەکان لە ڕۆژهەڵاتەوە هەتاوەکو یۆنان و بەڵکان، بخرێتە ڕوو. لە هەمان کاتدا پرۆسەی گوێزانەوەی زمانی هیندۆئەورووپی لە زاگرۆس و مێسۆپۆتامیا نیشان بدرێت. لەبەر ئەوەی هەر کام لەو گروپانە بەشێک لە پرۆسەی مێژووی گوێزانەوەی وشە کوردیە کۆنەکان دەگرێتە خۆ. بە دڵنیایی سەرەتای ئەو پرۆسیە زۆر لە پێش سەردەمی سۆمەریەکانەوە دەستی پێکردووە و لە دواتردا بەردەوام بە ئاراستەی ئەورووپا ڕۆیشتووە.
ئەمڕۆ کرواتیەکان باس لەوە دەکەن کە ئەوان هەرچەندە زمانەکەیان سلافیە و کە پەلێکی هیندۆئەورووپیە، بەڵام ڕەچەڵەک و ڕەگەزی خۆیان دەگەڕێننەوە بۆ ناوچەکانی کوردستان و پێیان وایە کە لەوێوە هاتوون. بە دڵنیایی بۆچوونی کرواتیەکان بێ بناغە نیە و لەوانەیە ئەو کۆچکردنەی ئەوان بۆ کرواتیا، بە بەراورد بە مێژووی کورد، لە سەردەمێکی تا ڕادەیەک نوێدا ڕووی دابێت. بۆ نموونە دەبینرێت ناوی یەکێک لە خێڵی سراسیەکان، پێش ٢٠٠٠ ساڵ هەمان مانای ماوە لە زمانی کوردیدا (بڕوانە سراسیەکان).
وردبوونەوە لە زمانە کۆنەکانی ناوچەکە ئەو ڕاستیە دەخاتە ڕوو و جارێکی تر دووپاتی دەکاتەوە کە زمانی کوردی زمانی دایکە بۆ زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکان و کوردستان شوێنی لەدایکبوونی یەکەم زمانی هیندۆئەورووپیە.

## کاریەکان (Carian)

لە هەزارەی یەکەمی پێش زایندا، خاکی کاریەکان (Land of Caria) دەکەوتە باشوری ڕۆژئاوای ئەناتۆڵ لە نێوان ناوچەکانی لیدی و لیسیدا (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١١). شتێکی ئەوتۆ سەبارەت کاریەکان نازانرێت و بەشێک لە تێکستی کاریەکان لە ناو یۆنان و وزۆرینەیان لە میسر دۆزرانەتەوە، کە بریتین لەو تێکستانەی کە لەسەر گۆڕی ئەو جەنگاوەرانەدا نووسراون کە لە میسر مردوون (Woodard, 2008, p.64). زمانی کاریەکان بە زمانێکی هیندۆئەورووپی دادەنرێت و سەر بە لقی زمانی ئەناتۆڵیایە و هاوبەشی لەگەڵ زمانی لوڤی، هیتی، لیدی، هتد. دا هەیە. سەرەڕای دانانی زمانی کاری وەک بەشێک لەو گروپە زمانەوانیە، بەڵام زانیاری ورد سەبارەت ئەو زمانە زۆر کەمە و لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە وردە وردە هەندێک ڕووی وشەکاری ئاشکرا کراوە. ئەم زمانە ڕوونکردنەوەیەکی ترە بۆ ئەو پەیوەندیەی کە زمانە کۆنەکان لەگەڵ یەکدا هەیانبووە. هەتاوەکو لە ڕووی جوگرافیەوە لە کوردستانی ئەمڕۆ و مێسۆپۆتامیا دوور بکەوێتەوە، دەبینرێت پەیوەندیەکە کەمتر دەبێتەوە. لە بەشی داهاتوودا چەند وشەیەکی هاوبەشی نێوان کوردی و کاری لەگەڵ زمانەکانی تردا ڕوون دەکرێتەوە.

| زمانی کاری (Carian Language) | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| para | پەڕین forth | para/pari پەڕا/پەڕی: هەمان مانا دەدات. لە زمانی لوڤیدا دەبێتە parī و لە هیتیدا parḫ و لە لیدیدا fra. |
| ted | باوک father | tāta تاتە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات و لە لوڤیدا دەبێتە tāta و لە لیدیدا دەبێتە taada و ئەمڕۆ لە زمانی ڕۆمانیدا ماوە بە شێوەی tată. |
| gela | پاشا king | kal کەل: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (نایاب، پایەبەرز، مەزن) دەدات. لە زمانی سۆمەریدا هەمان مانای زمانی کوردی هەیە و بەشێوەی gal دەنوسرێت و بە هوری kil بە مانایەکی نزیک دێت. |
| mso | خودا god | mas مەس: لە کوردیدا مانای (مەزن) دەدات. لە سۆمەریدا massu مانای (سەرکردە) و mes مانای (پاڵەوان) دەدات. لە زمانی میدیدا masa مانای (مەزن)، لە لوڤیدا mashana مانای (مەزنکردن) و masana مانای (خوادا) دەدەن. ئەم وشەیە چووەتە زمانی ئینگلیزیەوە بە شێوەی mass کە مانای ژمارەی زۆری خەڵک یان شت دەدات و لە لاتیندا دەبێتە missa. |
| nu | ئێستا now | niho, naua نهۆ، نەوە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدەن. ئەم وشەیە لە زمانی هوریدا دەبێتە hinnu و لە هیتیدا دەبێتە nu و لە ئاڤێستادا دەبێتە nû و بە ئینگلیزی دەبێتە now، دانیمارکی و سویدی و هۆڵەندی nu نەرویجی nå. |
| šar- | سەرەوە، بەرزی، لەسەر up, aloft, on top of | sar سەر: لە کوردیدا هەمان ماناکانی ماوە و لە زمانی سۆمەریدا suhur مانای ( پێستی تەپڵی سەر؛ لوتکەی درەخت، هەر شتێک وەک پۆپنە یان توک لەسەر سەری ئاژەڵ بێت) دەدات و لە زمانی هیتیدا دەبێتە šara و لە فەرەنسیدا بووەتە sur کە مانای (لەسەر، بەسەر) دەدات. |
| pi- | پێدان to give | peīā/pe پێیا/پێ: بەکارهێنانی ئەو وشانە لەم رستانەدا دەبینرێت: (پارەکەی پێیا، زەویکەی دا پێ، بایەخی پێ دا) لە زمانی لوڤیدا وەک هیتی دەبێتە piya و لە لیدیدا دەبێتە bi. لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە pay و لە فەرەنسیدا payer . ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا وەکو کوردی بۆ (پارەدان، بایەخ پێ دان) بەکاردەهێنرێت. لە زمانی فەرەنسیدا بۆ(پارە دان یان دانی شتێکی مەعنەوی) بەکار دەهێنرێت. |

# سراسیەکان (Thracian)

سراسیەکان نەتەوەیەک بوون کە لە ناوچەی بەڵکان (بەڵقان) و باکوری ڕۆژهەڵاتی یۆنانی ئەمڕۆدا ژیاون (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١١). لە سەدەکانی حەوسەدی پێش زاینەوە یۆنانیەکان ئاماژەیان پێ کردوون و کاریگەری و تێکەڵیان زۆر هەبووە لەگەڵ یۆنانەکاندا. سراسیەکان نەتەوەیەکی گەورەبوون و ناوچەیەکی زۆریان بە دەستەوە بووە. ووردەکاری مێژووی سراسیەکان زۆر ڕوون نیە و زانیاریەکان زۆربەیان پچڕ پچڕن. نەبوونی تێکستی زۆر بە زمانی سراسی، بۆچوونی جیاوازی سەبارەت بە زمانەکەیان دروست

کردوە. هەندێک بە زمانێکی تری گروپی زمانە هیندۆئەوروپیەکانی دادەنێت و هەندێکی تر گومانی لەو بۆچوونە هەیە.
سەرەڕای دووری ناوچەی جوگرافی سراسیەکان لە کوردستانی ئەمڕۆ، کەچی ناوی هەندێک لە خێڵەکانیان بە تەواوی لە زمانی کوردیدا مانا دەدات. یەکێک لە خێڵە جەنگاوەرەکانی سراسیەکان کە سترابۆ لە نزیکی پێش کۆتایی سەدەی یەکەمی زایین ئاماژەی پێکردووە بە سەرەپەڕەی (Saraparae) و دەڵێت مانای ناوەکەیان بریتیە لە (سەرپەڕمیی/سەرلێکەرەوە) (Strabo, 1856, p.272). دەبینرێت کە پێکهاتەی وشە لێکدراوەکە بریتیە لە دووبەش، (سەر، پەڕی) ە هەردووکیان کوردین و وشەی (پەڕی، پەڕین) لە زمانی کاری، لوڤی و هیتیشدا بە هەمان مانا دێت و وشەی (سەر) لە زمانەکانی میدی و هوریدا هەمان مانای هەبووە و لە زمانەکانی سۆمەری، هیتی، لوڤیدا نزیکە لە سروشتی مانای وشە کوردیەکە. ئەمانە هەمووی ئەوە دەسەلمێنن کە ئەو وشانەی کە کوردین لە هەمان کاتدا بە هیتی و لوڤی و زۆر لە زمانەکانی تر مانا دەدەن و بە پێچەوانەشەوە. تەنانەت یەکێک لە خوای یۆنانیەکان کە زۆربەی سەرچاوەکان بە بنەچەی سراسی دەزانن پێیان وایە لەوانەوە وەرگیراوە، ناوی ئارێس (Ares) بووە و خوای شەڕ بووە، ئەم خوایە مانای وشەکەی دەبێتە (هەرا، هوریا) ی کوردی و لەبەر ئەوەی کە سەرچاوەکان مانای وشەکە بە (Throng of a battle) (Day, 1985, p.170) لە یەک دەدەنەوە کە مانای (قەرەباڵغی جەنگ) دەدات و لە کوردیدا (هەرا، هوریا) ی پێ دەگووترێت. ئەو گۆڕانەی کە ڕووی داوە ئەوەیە کە سراسیەکان زۆر جار پیتی (س) بۆ وشەکان زیاد دەکەن، هەر وەک لە فەرهەنگۆکەکەدا ڕوون دەکرێتەوە. ئەم لێکچوونە زمانەوانیەش شتێکی چاوەڕوانکراوە لەبەر ئەوەی سەرەڕای کەمی ژمارەی وشە سراسیەکان کە دۆزراونەتەوە، کەچی لە ناو ئەو ژمارە وشە کەمەشدا زۆربەی وشە سراسیەکان لە زمانی کوردیدا وەک خۆی ماوە و هەندێکی لەگەڵ سۆمەریشدا هاوبەشە. بۆ نموونە لە زمانی سراسیدا وشەی suras بە مانای (سوێر) دێت لە کوردیدا و وشەی germas مانای (گەرم) دەدا و bend مانای (بەند) دەدات. وشەی dele مانای (داڵە) واتە (پاراستن) دەدات لە کوردیدا کە هاوبەشیشە لەگەڵ dal ی سۆمەریدا کە هەمان مانا دەدات و وشەی kiri مانای چیا دەدات کە لە زمانی سۆمەری و کوردیدا یەکە و بریتە لە kur. وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، ئەوەی کە تێبینی دەکرێت زۆر جار وشەی سراسی لەگەڵ کوردیدا یەکە بەڵام لە زمانی سراسیدا پاشگری s ی بۆ زیاد کراوە. ئەم پاشگرە لە یۆنانی و لاتینیشدا بەدی دەکرێتەوە. بۆ نموونە لە زمانی سرایدا وشەی zenis دەبێتە zān ی کوردی، suras دەبێتە suer، ramus دەبێتە ārām، buzas دەبێتە paz، beras دەبێتە bor، esvas دەبێتە asip و germas دەبێتە garmā.
لە فەرهەنگۆکەکەدا هەندێک لەو شانەی زمانی سراسی کە لە کوردیدا ماون ڕوونکراونەتەوە:

| وشەی سراسی (Thracian) | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| asas | بەرد<br>stone | hasān هەسان: جۆرە بەردێکە کە بۆ تیژکردنی چەقۆ بەکاردەهێنرێت. هەروەها تاشە بەردی لوسی شاخ پێی دەگووترێت (سان). بە زمانی میدی دەبێتە asa(n) و لوڤی asu. |
| bend | بەستن بەیەکەوە<br>to bind | band بەند: لە کوردیدا (بەند) مانای (کەلەپچەکردن، زیندانی کردن، بەربەستی ئاو) دەدات. |
| beras | قاوەیی<br>brown | bor بۆر: ئەم ڕەنگە لە کوردیدا لە ئاماژە بە ڕەنگی پێستی تۆخ و قاوەییدا دەردەکەوێت کە دەگووترێت (کابرا زۆر ڕەش و بۆرە) یان کاتێک کە لە کوردیدا بە نان یان ناردی مەیلە و قاوەیی دەگووترێت (ناردی بۆر، نانی بۆر)، لە ئینگلیزیدا دەبێتە brown. |
| burt | بینایەکی بەهێزکراو | bard بەرد: دەشێت ناوەکە لە بە بەرد دروستکردنی |

| | | |
|---|---|---|
| بیناکەوە هاتبێت. لە زمانی سۆمەریدا بە هەمان مانا دەبێتە birtu و لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا بووەتە fort. | a fort | |
| paz, biza بزە، پەز: (بزە) بەمانای (بزن) دێت. (پەز) لە کوردیدا مانای (مەڕ، ڕەوە مەڕ) دەدات. (مەڕ) لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە pasu ولە لاتینیدا دەبێتە pacu. | بزن a goat | buzas |
| dāla داڵە: وشەی (داڵە) لە کوردیدا مانای (پاراستن) دەدات. لە سۆمەریدا دەبێتە dal. | پاراستن protect | dele |
| zānd زاند: لە کوردیدا (زاند) مانای (منداڵ هێنان، منداڵ پەیدابوون) دەدات (هەژار، پ.٣٧٤). لە زمانی میدیدا zantu مانای (خێڵ) دەدات. بنەچەی وشەکە لە (زێ، زا) وە هاتووە کە لە کوردیدا مانای (بەرە، زایین) دەدات و zi بە زمانی سۆمەری مانای (ژیان) دەدات کە لەگەڵ (ژی) کوردیدا یەک وشەن. لە زمانی یۆنانیدا وشەی منداڵ خستنەوە دەبێتە genno و بە وشەی (زیندو) ی کوردی دەڵێن zontanos. | خێڵ clan | dentu |
| asip ئەسپ: (بڕوانە ڕوونکردنەوەی وشەی (ئەسپ) sisi لە زمانی سۆمەریدا). | ئەسپ horse | esvas |
| garmā گەرما: لە کوردیدا هەمان مانا دەدا. لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە warm. | گەرم warm | germas |
| žin ژن: لە کوردیدا هەمان مانا دەدا و لە ئاڤێستادا دەبێتە ghen و لە زۆر زمانی هیندۆ ئەورووپی تردا دەردەکەوێت بە کرواتی و چیکی žena و بە سلۆڤینی ženska و بە یۆنانی gynaíka. | ئافرەت، ژن woman, wife | goni |
| kur کوڕ: مانای (بەرزایی کێو، کێوی بڵند) دەدات (هەژار، پ.٦٣٨). لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە kur و لە هوریشدا پێی دەگووترێت kor. هەتاوەکو ئەمڕۆ هەندێک لە شاخەکانی کوردستان ئەو وشەیە پێکهاتەی ناوەکەیانە بۆ نموونە (کورە کاژاو) کە مانای (شاخی بەرزی کاژاو) دەدات. لە ئاڤێستادا دەبێتە giri. | چیا mountain | kiri |
| m م: ڕاناوە بە مانای (هی من) بۆ نموونە (خانووکەم خۆشە). لە سۆمەریدا mu مانای (هی من) و men مانای (من) دەدات. لە هەموو زمانە هیندۆ ئەورووپیەکاندا بە شێوەی جیاواز دەردەکەوێتەوە. | هی من my | ma |
| bara بەرە: مانای (وەچە) دەدات و (بەر) مانای (بەروبوم) دەدات. بە زمانی سۆمەری buru مانای (بەروبوم) دەدات. لە کوردیدا هەردوو مانای وشە سۆمەری و سراسیەکەی ماوە. | کوڕ، منداڵی کوڕ boy, son | per |
| bard بەرد: هەمان مانا دەدات. | بەرد rock | per(u)- |
| pis پس: هەمان مانای (کوڕ، منداڵی نێر) دەدات. لە یۆنانیدا دەبێتە pais بە مانای منداڵ. | کوڕ، منداڵ boy, child | pes |

| | | |
|---|---|---|
| ramus | ئارام، لەسەر خۆ<br>quiet, calm | aram ئارام: هەمان مانا دەدات. لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە airime . |
| sekas | گیا، سەوزی<br>grass, greenery | sauzi سەوزی: مانای (گیا) دەدات و بە سۆمەری sissi مانای (سەوزبوون) دەدات. |
| suras | سوێر<br>salty | suer سوێر: هەمان مانا دەدات. |
| svit | پرشنگدانەوە، بریسکەدانەوە<br>to shine, to twinkle | sut سوت: دەبێتە ڕەنگی (سوتان). لە سۆمەریدا suzi مانای (پرشنگێکی نایاب) دەدات. |
| titha | تیشک، پرشنگدار<br>light, radiance | tišk تیشک: هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی هیتیدا دەبێتە tet̰ha کە مانای (بروسکە) دەدات. |
| zenis | لە دایکبوون<br>born | zān زان: مانای (منداڵ بوون) دەدات. |

# لیدیەکان (Lydian)

لیدیەکان نیشتەجێی باکوری ڕۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆ بوون. دراوسێی لوڤیەکان و و کاریەکان بوون (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١١). وڵاتەکەیان پێی گوتراوە لیدیا (Lydia) و لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە سەرچاوە یۆنانیەکان ئاماژەیان پێ کردوون و مێژووی تێکستەکانیان دەگەڕێتەوە بۆ حەوسەدی پێش زاین. لیدیا سەرەتا ناوچەیەکی سەر بە دەسەڵاتی هیتیەکان بوو. بەڵام لە دوای نەمانی هیتیەکان وڵاتی لیدیا لە ناوچەیەکی بچووکەوە بووە دەوڵەتێکی بەهێز و لە سەدەی حەوتەمی زاییندا لیدەکان دەوڵەتێکی بەهێزیان دروستکرد و لە سەدەی شەشەمی زاییندا بوونە ئیمبراتۆریەتێک لە ڕۆژئاوای تورکیای ئەمڕۆدا و هاوسنووری میدیا بوون. بەرەو کۆتایی سەدەکانی پێش زایین دەسەڵاتی لیدەکان ڕووی لە بێ هێزی کرد و ناوچەکەیان هەتاوەکو سەدەکانی زایین بە هەمان ناو مابووەوە.
زمانی لیدی، زمانێکی تری لقی زمانی ئەناتۆلە و دەچێتە ناو گرووپی زمانە هیندۆ ئەوروپیەکان. لە نووسیندا ئەلف و بێیەکیان بەکارهێناوە کە لە ئەلف و بێی یۆنانی نزیکە. تێکستی درێژی لیدی دەگمەنە و زۆربەی ئەو تێکستانەی کە لە ئارادان پارچە پارچە و کورتن و هەندێکیان لەسەر پارە و هەندێکیان لەسەر بەرد هەڵکەندراون (Woodard, 2008, p.56). بەهۆی نەبوونی تێکستەوە، نەتوانراوە فەرهەنگێکی تەواوی ئەم زمانە بنووسرێت، بەڵام ژمارەیەکی کەم،وشەی لیدی ماون کە لەنێوانیاندا نزیکەی بیست و پێنج وشەیان زۆر لە زمانی کوردی نزیکن. هەر وەک لە فەرهەنگۆگەکەدا ڕوونکراوەتەوە:

| وشەی لیدی (Lydian) | ماناکەی بە کوردی و بە ئینگلیزی | [illegible] |
|---|---|---|
| aara | زەویەکی تایبەت، حەوشە<br>Estate, yard | ārā ,uār, hauār ئارا: (ئارا) مانای (جێگای ژیانی هەمیشەیی) دەدات (هەژار، پ.٣). (وار) بە مانای (شوێن، لادێ، شارۆچکە) دێت و (هەوار) بە مانای (سەوزایی، زۆزان) دێت. لە سۆمەریدا uru مانای (شار، لادێ، ناوچە) دێت و لە هوریدا awari بە مانای (کێڵگە، زەوی پاکراو) دێت. |
| an | ئامرازی کۆتایی کۆ<br>gen.pl.ending | ān ان: لە کوردیدا وەک خۆیەتی و لە سۆمەریدا دەبێتە ene و لە هوریشدا هاوشێوەی زمانی سۆمەری دەبێتە |

| | | |
|---|---|---|
| | | ena و لە زمانی میدیشدا هەر هەمان ئامرازە و دەبێتە an. |
| aśaa | دڵ چاکی<br>kindness | haz/haž حەز/حەژ: دەبنە ڕەگی (حەزلێکرد) کە ماناکەی نزیکە. بە هیتی دەبێتە assiya و لە زمانی لوڤیدا aza مانای (خۆشویستن) دەدات. |
| afara | وەچە<br>descendant | bara بەرە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدا و لە زمانی سۆمەریدا buru مانای (بەربوم، میوە) دەدات و لە زمانی سراسیدا دەبێتە per. |
| afaris | ڕێکەوتنامەی فرۆشتن<br>sale deed | froš فرۆش: وشەی (فرۆش) ئاماژەیە بەو شتەی کە دەفرۆشرێت. |
| akullon | بەشی ناوەوەی ئەندامی زاوزێی ئافرەت<br>vigina | kulān, qul کولان، قوڵ: (کولان) مانای (شوێنی ژیانی کۆتر و مریشک) دەدات (کۆڵان) مانای (جادەی پێچاو پێچ) دەدات. (قوڵ) ماناکەی دەبێتە (چاڵایی). هەروەها بە بەشی خوارەوەی ڕیخۆڵە دەگووترێت (قوڵۆن). |
| ãnas | ئەوان<br>those | auān/uān ئەوان/وان: لە کوردیدا نزیکە و بە سۆمەری دەبێتە anene. |
| av | ئامرازێکە بۆ ئیشارەتکردنی ڕاستەوخۆ بە شتێک<br>the pronoun pointing at a direct object | ava، aua ئەڤە، ئەوە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدەن. لە زمانی لوڤیدا دەبێتە awa. |
| bi | پێدان<br>to give | peīīā پێی یا: لە کوردیدا هەمان مانا دەدا و لە زمانی هیتیدا دەبێتە piya. لە زمانی لوڤیدا وەک هیتی دەبێتە piya و لە زمانی کاریدا دەبێتە pi. |
| brafr | ئەندام لە گروپێکی هاوبەشدا (هاوکار،<br>member of a commune | brādar برادەر: لە کوردیدا مانای (هاوڕێ) دەدات. لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا بە شێوەی نزیک دەردەکەوێت و زیاتر مانای (برا) دەدات. |
| da | پێدان (کردار)<br>give | dā دا: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (دان) کە هەمان مانای هەیە. لە هیتیدا دەبێتە da و لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە dâ لە لاتینیدا بە da دەردەکەوێت. |
| daul | پەستاندن<br>to press | dāul داوڵ: ئەم وشەیە وەک کردار مانای (بەسەر یەک ئاخنین) دەدات (هەژار، پ.٢٨٨) لە هوریدا tuwal مانای (لێدان، پێداکێشان) دێت. |
| do | هەتا<br>untill | ta تا: هەمان مانا دەدات. |
| el | ئەوە (بۆ کوڕ)<br>he is | lo لۆ: لەکوردیدا هەمان مانا دەدات و لە سۆمەریدا دەبێتە lu و ئەم وشەیە لە زمانی ئیتاڵیدا دەردەکەوێت بەشێوەی lui، فەرەنسی lui و لە ئیسپانیدا él بە مانای |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئاماژەکردنێکی گشتی بۆ نێرینە. |
| ẽmi- | هی من<br>mine | m م: ڕاناوە بە مانای (من) بۆ نموونە (کراسەکەم جوانە). لە سۆمەریدا mu هەمان مانا دەدەت. لە هەموو زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا بە شێوەی جیاواز دەردەکەوێتەوە. |
| fra | پەڕینەوە، بەناو<br>across, through | par, fre پەڕ، فرێ: وشەی (فرێ) ماناکەی دەبێتە (ڕەوانەکردن) (هەژار، پ.٥١٩). (پەڕ) دەبێتە ڕەگی (پەڕین) کە هەمان مانا دەدات. لە زمانی هیتیدا دەبێتە parranda. |
| ni | نا<br>not | na, nā نا، نە: لە کوردیدا هەمان مانای هەیە و بە سۆمەری دەبێتە nu و بە هیتی دەبێتە natta. |
| kana | ژن (بەمانای هاوسەی پیاو)<br>wife | kani کەنی: لە کوریدا بە مانای (کچ) دێت و لە ئاڤێستادا دەبێتە kanyâ. لە زمانی سویدیدا بە (مێ) دەگووترێت kvinna و بە نەرویجی kvinne. |
| karTT | هەڵوەشاندنەوە، لابردن<br>to abolish | kart کەرت: مانای (لەتکردن) دەدات. |
| kat- | خوارەوە، بەرەو خوارەوە<br>down | kat کەت: مانای (کەوتن، فەشەل هێنان) دەگرێتەوە. لە زمانی هوریدا kadiγ, kad هەمان مانا کوردیەکە دەدەن. |
| lalou | کێری منداڵ<br>juvenile penis | lala لەلە: لە کوردیدا لە ژێر سەری کێر هەتا گون ئەو ناوەی پێ دەگووترێت (هەژار، پ.٧٧٥) و بە زمانی هیتی lalu مانای (کێر) دەدات. |
| nãrs | ئازایەتی، پیاوەتی<br>virtue, valour | ner نێر: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات و لە سۆمەریدا nir مانای (ئاغایانە، سەرگەورانە) دێت. |
| qe | کێ<br>who | ke کێ: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زمانی لوڤیدا دەبێتە kwi و لە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا بە ئیتاڵی chi، ئیسپانی و پورتوگالی que و فەرەنسی qui. |
| qisk | کەسێک<br>someone | kasek کەسێک: هەمان مانا دەدەن. لە زمانی هیتیدا دەبێتە kuiski. |
| endo | بەرەو ناو<br>into | handru هەندرو: لە کوردیدا مانای (لەناو) دەدات و لە هیتیدا دەبێتە andurza و هەمان مانا کوردیەکەی هەیە و لە لوڤیدا دەبێتە anta. وشەی endo لە زۆربەی زمانە ئەوروپاییەکاندا وەک پێشگرێک بەکار دەهێنرێت بەمانای ناوەوە یان ناوخۆ. |
| ciw | خوا<br>God | xuā خوا: هەمان مانا دەدات. |
| saw | سەیرکردن<br>see | saī/sah سەی/سەح: لە کوردیدا هەمان مانا دەدەن. لە زمانی هوریدا دەبێتە si و ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە see، بە ئەڵمانی دەبێتە sehe و سویدی se. |
| sawtaar | پاسەوان، ئێشکگر<br>Watchman, guard | caudār, sahdār چاودار، سەحدار: هەرچەندە وشەکان لە کوردیدا نین، بەڵام دەکرێت ئەو وشەیە لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | کوردیدا دروست بکرێت و هەمان مانا بدات. پاشگری taar لە زمانی هیتیشدا دەردەکەوێت و لە کوردیدا دەبێتە (دار). |
| sawtari | پاسەوانیکردن to guard | caudāri, sahdāri چاوداری، سەحداری: (بڕوانە وشەی sawtaar). دەبینرێت پاشگری tari لیدی لە کوریدا دەبێتە (داری). |
| serli | سەرکردەیەکە a leader | sar سەر: هەمان مانا دەدات و بە زمانی هوری بە شێوەی sarri دەردەکەوێت بە مانای (پاشا) و لە زمانی میدیدا sar مانای (سەری لەش) دەدات. |
| taada | باوک father | tāta تاتە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات و لە لوڤیدا دەبێتە tāta و لە کاریدا دەبێتە ted و لە زمانی ڕۆمانیدا دەردەکەوێت بە شێوەی tată. |
| wiśśi | باش good | uaš/bāš/xas، باش/وەش/خاس: هەرسێکی بەکاردەهێنرێت. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە ašša و لە هیتیدا دەبێتە assu و لە لوڤیدا دەبێتە wasu. |

# ئاڤێستا و مێژووەکەی و چەند سەرنجێک

ئاڤێستا ئەو زمانەیە کە تێکستە پیرۆزەکانی ئاینی مەزدایەسنی (زەردەشتی)[99] پێ نووسراوە. ئەم زمانە دەکرێت بە دوو بەشەوە و دوو ناویان بۆ دانراوە. ئاڤێستای کۆن (Old Avestan) و ئەوی تریان ئاڤێستای نوێتر (Younger Avestan). لە ڕاستیدا نازانرێت ئایا ئاڤێستای نوێتر هەر تەواوکەری هەمان زمانە کۆنەکەیە و فۆرمێکی نوییەتی یان زاراوەیەکی تری جیاوازی ئەو زمانەیە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تێکستی کەمی ئاڤێستای کۆن ماوە. هەموو تێکستەکانی ئاڤێستای کۆن لە چەند بەشێک پێکهاتوون; ئەو بەشانە بریتین لە حەڤدە شیعری گاتایی کە هەتاوەکو ئەمڕۆ کێشەی تەرجومەکردنیان هەیە، لەگەڵ دوو نوێژی پیرۆز و دابونەریتی گشتی کە لە حەوت بەش پێکهاتوون. بەشە زۆرەکەی ئاڤێستا ئەو بەشەیە کە بە زمانی ئاڤێستای نوێتر نوسراوە کە پێکهاتووە لە ٧٢ بەش کە پێی دەگوترێت یەسنا(Yasna) و ئەوی تریان (یەشت Yašt) کە دوور و درێژە و بۆ پیرۆزی میسرا و ئەناهیتا نووسراون. دوایەمینیان ڤیدێڤدات (Videvdat) کە بریتیە لەو ڕێسایانەی خوای درۆ ڕەت دەکەنەوە (Brown and Oglivie, 2009, p.107).

لێکۆڵەرەکان لەسەر دانانی مێژوویەک بۆ زمانی ئاڤێستا کۆک نین و بۆچوونی جیاوازیان هەیە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هیچ بەڵگەیەکی مادی نیە کە ڕادەی کۆنی یان تەمەنی ئاڤێستا بسەلمێنێت. زۆربەی لێکۆڵینەوەکان متمانە دەکەنە سەر شیکردنەوەی زمانەوانی و تیۆری تر بۆ دەستنیشانکردنی مێژووەکەی. بە پێچەوانەی هەر یەک لە زمانەکانی هوری و هیتی و سۆمەری، هتد. کە بەڵگەی مێژوویی کۆنی مادی لەبەردەستدا هەیە بۆ دەستنیشانکردنی تەمەنیان بە پشتبەستن بەو تێسکتانەی کە سەبارەتیان نووسراوە یان ئەوان سەبارەت خۆیان نووسیویانە. هەروەها بە یارمەتی ئەو ئاسەوارانەی کە لەو نەتەوانە خۆیانەوە جێماوە دەتوانرێت بە دڵنیایی تەمەنی مادەی نووسینەکە وسەردەمەکەشیان دەستنیشان بکرێت.

تێکستە ئاڤێستاییەکان هیچ بەڵگەیەکی وا بەدەستەوە نادەن کە کارەکە ئاسان بکەن. هەتاوەکو ئێستا کۆنترین دوو تێکست بریتین لە تێکستێک کە وەک کۆمەڵێک لێکدانەوە سەبارەت بە ئاڤێستا نووسراوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆهەمی زایینی بە ناوی زەند (Zend) و تێکستێکی نووسراوی ئاڤێستا خۆی کە مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٣٢٣ ی زاینی کە کەمتر لە حەوت سەد ساڵ دەکات (Bromiley, 1995 p.124). کەواتە بەهۆی بەڵگەی مادیەوە دڵنیاکراوە کە کۆنترین تێکست سەبارەت ئاڤێستا، تەمەنی بۆ سەدەی نۆهەمی زایینی دەگەڕێتەوە. پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا تێکستی کۆنتر هەبووە؟ بە دڵنیایی مێژووی ئەو ئاینە کۆنتر بووە بەڵام ناتوانرێت مێژوویەکی ڕوونی بۆ دابنرێت.

سەبارەت شوێنی نووسینی تێکستە ئاڤێستاییەکانیش هەر کێشە هەیە. لە ڕاستیدا لە کاتێکدا هەندێک سەرچاوە هەیە سەبارەت بەوەی کە زەردەشت لە ناوچەیەکی ئازەربایجان هاتبێت، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ڕوون نیە دڵنیای بکاتەوە کە ئاڤێستا زمانی کام ناوچە بووە. هەندێک سەرچاوە پێیان وایە کە زمانی ئاڤێستا، زمانی ناوچەکانی ڕۆژهەڵات بووە لە نزیک ئەفغانستانی ئەمڕۆ، لەبەر ئەوەی کە ڕووداوەکانی ئاڤێستا زیاتر باسی ئەو ناوچەیە دەکەن. بەڵام ئەو بۆچوونەش لەسەر هەندێک بنەمای زمانەوانی ڕەت دەکرێتەوە (Brown and Oglivie, ,p.107). دیاکۆنۆف پێی وایە کە ئاڤێستا لە بنەڕەتدا لە ناوچەی خوارزمدا سەری هەڵداوە و هەر بە زمانی ئەو ناوچەیەش نووسراوە. ئەوەی مایەی سەرنج ڕاکێشانە، ئاڤێستا ئاماژە بە فارس و مید ناکات و هیچ زانیاریەکیان سەبارەت نادات (Diakonff, 1985, p.132)، کەچی لە سەرچاوە کریستیانەکاندا سەبارەت ڕابردووی قەشەکانی هەولێر، هەتاوەکو سەدەی سێهەمی زاینی ئاماژە بە

---

[99]. هۆکاری بەکارهێنانی (ئاینی مەزدا یەسنی) دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە لە مێژوودا ئاینێک نەبووە بە ناوی ئاینی زەردەشتی، بەڵکو ئەم ناوە لە ئەوروپا و لە سەدەی حەڤدەی زاینەوە لەلایەن ئەکادیمیە ئەوروپیەکانەوە دانراوە. دەنا پەیڕەوکەرانی ئەو ئاینە بە خۆیان دەڵێن (مەزدا یەسنی) کە مانای (مەزدا پەرست) دەدات و هەندێکیان بە تەواوی ناوی (ئاینی زەردەشتی) ڕەت دەکەنەوە لەبەر ئەوەی کە ئەم ناوە لەلایەن خەڵکەوە بۆیان دانراوە و هەرگیز ئەوان خۆیان بەو ناوە نەناساندووە.

میدەکان دەکرێت (Karwerau and Kroll, 1985, p.16 and 17). ئەمە ئاشکرای دەکات کە تێکستەکان نە لە ناوچەی میدەکان و نە لەسەردەمی میدەکاندا نووسراون و بەپێی ئەوەی کە میدەکان هەتاوەکو سەدەی سێهەمی زایینی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا باس کراون و مابوون، بۆیە پێ دەچێت کە تەمەنەکەی دوای سەدەی سێهەمی زایینی بێت.

مێژوونوسە یۆنان و ڕۆمانە کۆنەکان مێژوویەکی دێرینی زیاتر لە شەش هەزار ساڵیان بۆ زەردەشت داناوە و زۆر لەو مێژووە جیاوزە کە ئەمڕۆ مێژوو نوسانی نوێ باسی لێوە دەکەن و دەیگەڕێننەوە بۆ ساڵی ٦٠٠ پ.ز. دەبینرێت کە دایۆگینیس (Diogenes) دەیگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی ٦٤٨٠ پ.ز، هێرمۆدۆروس (Hermodorus) دەیگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی ٦٢٠٠ پ.ز و پلوتارچ (Plutarch) دەیگەڕێنێتەوە بۆ ساڵی ٦٢٠٠ پ.ز (Clark, 1998, p.20).

شەمسەدینی شارەزووری لە کتێبەکەیدا کەمێک باسی زەردەشت دەکات و دەڵێت کە خەڵکی ئازەربایجان بووە و لەگەڵ باوکی هاتووچۆی شاری (حاران)[100] ی کردووە. لەوێ لای فوریسی حەکیم کە کابرایەکی زانا بووە و وەک گەدا ژیاوە، فێری حیکمەت و زانستی ئەستێرەناسی بووە. کە گەڕاوەتەوە زانستی ئەستێرە ناسی بردۆتە ناو خەڵکی ئازەربایجان، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دژایەتی کراوە، ڕووی کردۆتە ڕۆژهەڵات و چووەتە لای ڕۆستەمی داواران. شەمسەدین جگە لە ناوچەی "داواران"، ناوی ناوچەیەک بە ڕوونی ناهێنێت کە زەردەشتی بۆ چووە (الشهرزوري، ١٩٧٦، پ.٣١٠- ٣١٢). بەپێی ڕوونکردنەوەی شارەزووری، زەردەشت ڕووی کردۆتە ڕۆژهەڵات. دیارە ئازەربایجانی بەجێهێشتووە و پێ دەچێت ڕووی کردبێتە دەوروبەری خوراسان و ئەفغانستانی ئەمڕۆ.

سەرەرای ئەوە وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، لەبەر ئەوەی کە لە ئاڤێستادا ئاماژە بە مید و ئەخامەنیە فارسەکان ناکرێت. ئەگەر میدەکان هەتاوەکو سەدەی سێهەمی زاینی لە ناوچەکەدا مابێتن و ئاڤێستا ئاماژەی پێ نەکردبێتن، ئەوە دڵنیای دەکاتەوە کە ئاڤێستا لەو سەردەمە نوێترە. لە (یەشت) دا ئاماژە بە "کورد" کراوە و باسیان دەکات و لە شوێنێکدا دەڵێت "کە پێم گووتیت ئەوان ناویان کورد و کرمان (کارمان) (Karman) بوو" (West, 2004, p.15).

هیچ بەڵگەیەکی ڕوون لە ئارادا نیە کە بیسەلمێنێت ئاینی مەزدا یەسنی (زەردەشتی) ئاینێکی زۆر دێرینە و لە ڕاستیدا ناونەهێنانی مید و ئەخامەنیە فارسەکان و لەبری ئەوە ناو هێنانی ناوی "کورد" بە شێوە نوێیەکەی کە ئەویش ناوێکە بەو شێوەیەی بۆ سەدەکانی زایین دەگەڕێتەوە، ئەوە دڵنیا دەکاتەوە کە ئەم ئایینە لە سەدەکانی زاییندا دەستی پێکردووە، بۆیە زیاتر وا دەردەکەوێت کە تێکستەکان لە دەوروبەری ناوەڕاستی هەزارەی یەکەمی زاییندا نووسرابێت، واتە تەمەنی لە نێوان ١٥٠٠- ١٧٠٠ ساڵ بێت و هێندە دێرین نەبێت کە ئەمڕۆ باسی لێوە دەکرێت.

جگە لەوەش لە سەرچاوە ڕۆمانەکاندا خوای مید و ئەخامەنیە فارسەکان بە کۆ (جەمع) ناو دەهێنن (Strabo, 1856, 266)، واتە زیاتر لە یەک خوایان هەبووە و پەیرەوی ئاینی مەزدایەسنی (زەردەشتی) یان نەکردووە. هێرۆدۆت ئاینی ئەخامەنیە فارسەکانی بە فراوانی ڕوونکردۆتەوە و دەڵێت "هیچ وێنەیەکی خواکانیان نیە، هیچ پەرستگە و شوێنێکی پەرستنیان نیە و پێیان وایە بوونی ئەوانە نیشانەی ناژیریە. پێم وایە ئەوە لەو بۆچوونەوە هاتووە کە ئەوان بڕوایان بەوە نیە کە خوا و مرۆڤ لە هەمان سروشت بن کە ئەوە یۆنانەکان بڕوایان پێیەتی. بەڵام ئەوان دەچنە سەر بەرزترین شاخ و لەوێ قوربانی بۆ خوای ئاسمان (Jupiter) دەکەن، ئەوەش ئەو ناوەیە کە دەیدەن بە هەموو ئاسمان. بە هەمان شێوە قوربانی بۆ ڕۆژ و مانگ دەکەن، بۆ زەوی، بۆ ئاگر، بۆ ئاو و بۆ با. ئەوانە ئەو خوایانەن کە پەرستنیان لە سەردەمی کۆنەوە بۆ

---

[100]. ئەگەر شەمسەدین مەبەستی لە شاری حەران (الحران Harran) بووبێت، ئەوا ئەو شارە شارێکی مێژووییە کە لە ڕابردوودا سەنتەرێکی گەورەی شارستانیەت بووە و شوێنی خوێندن و زانین بووە. بەپێی تەورات حەزرەتی ئیبراهیمیش لەوێ ژیاوە و سەرەرای ئەوەی کە دوایی چووە لە ناو کەنعانیەکاندا نیشتەێ بووە، کەچی کە وەختی ژنهێنانی ئیسحاقی کوڕی هاتووە، خزمەتکارەکەی ناردۆتەوە بۆ ناو خاکی باوباپیرانی لە حەران، لەوێ ژنی بۆ هێناوە. ئەم شارە ئەمڕۆ دەکەوێتە باشوری شاری ئورفەی ئەمڕۆ لە باکوری کوردستان، لە نزیک سنووری سوریا، کە بە درێژایی مێژوو ناوچەیەکی کوردی بووە.

ماوەتەوە. دوایی تر دەستیان کرد بە پەرستنی Urania کە لە عەرەب و ئاشوریەکانەوە وەریان گرتووە. ئاشوریەکان ئەو خوا مێیە بە Mylitta ناو دەبەن و عەرەبەکان بە ئەللات (اللات)[101] " ئەمجا هیرۆدۆت بەردەوام دەبێت و دەڵێت "بۆ ئەو خوایانە فارسەکان بەم شێوەی خوارەوە قوربانی پێشکەش دەکەن: هیچ مێزێک دانانێن، ئاگر ناکەنەوە، هیچ خواردنەوەیەک تێناکەن؛ شمشاڵ لێ نادەن،....." (Herodotus, 2009, p.41 and 42).

دەبینرێت کە هیرۆدۆت لە نزیکی سەدەی پێنجەمی پێش زایندا بە ڕوونی بیروباوەڕی ئەخامەنیە فارسەکان دەخاتە ڕوو، بەڵام بە هیچ جۆرێک، نە بە ناو و نە بە دابونەریت، باسی ئاینی زەردەشتی نەکردووە. هەروەها دەبینرێت کە ئەخامەنیە فارسەکان چەندین خوایان پەرستووە و هەندێک خوای عەرەب و ئاشوریەکانیشیان وەرگرتووە و پەرستووە. شایانی ئاماژە پێکردنە کە ئاگر کە لە ئاینی مەزدا یەسنی (زەردەشتی) دا بە پیرۆز دادەنرێت، بەڵام هەرگیز لە ناو ئەخامەنیە فارسەکاندا بۆ مەبەستی ئاینی بەکارنەهاتووە. تاقە نەریت کە پەیوەندی بە ئاینی مەزدا یەسنی (زەردەشتی) یەوە هەبووبێت لەو سەردەمەدا، بریتی بووە لە نەناشتنی مردوو لە خاکدا و وازلێهێنانی کە داڵ و گیانلەبەران بیخۆن. هەڵبەت ناتوانرێت تەنها لە سەر بنەمای یەک دابونەریت بگووترێت کە ئەخامەنیە فارسەکان مەزدا یەسنی (زەردەشتی) بوون. بۆ نموونە بەپێی سترابۆ لە مێسۆپۆتامیدا لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زاینی لە دوای ئەنجامدانی کاری سێکسی پێش ئەوەی کە دەست لە هیچ شتێک بدەن، وسڵیان دەرکردووە (Strabo, 1857, p.155)، کە ئەوە دابونەریتێکە ئەمڕۆ ئیسلام پەیڕەوی دەکات، بە دڵنیایش دەزانرێت کە ئیسلام لە سەدەی یەکەمی زاینیدا نەبووە، واتە لەبەر ئەوەی کە هەندێک لە خەڵکی مێسۆپۆتامیا وسڵیان دەرکردووە، ناکرێت بگوترێت کە خەڵکەکە موسوڵمان بوون. ڕاستە هیرۆدۆت و زۆر لە مێژوونوسە یۆنانەکان باسی "موغ" (Magi) دەکەن، بەڵام دەبێت ئەوە بزانرێت کە موغەکان سەرکردەی ئاینی میدەکان بوون و مانەوەی ناوەکە لە ناو ئاینی مەزدایەسنی (زەردەشتی) دا هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، ئەو وشەیە ناوێکە کە بۆ سەرکردەی ئاینی بەکارهاتووە. مۆڵتن (Moulton, 1926) لە کۆمەڵێک وانەدا سەبارەت بە ڕەگی ئاینەکە بە ووردی لە بابەتەکە کۆڵیوەتەوە و گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە موغەکان خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە بوون، بەڵام نەیتوانیوە بە ڕوونی پەیوەندی موغ و ئاینی مەزدایەسنی (زەردەشتی) ڕوون بکاتەوە. لە ڕاستیدا موغەکان لە سەردەمی میدەکان و پێش دەرکەوتنی ئاینی مەزدا یەسنی هەر پیاوی ئاینی بوون و بەکارهێنانی ئەو ناوە لەلایەن مەزدا یەسنی (زەردەشتی) ەکانەوە هیچ بەڵگەیەک نیە کە موغەکانی سەردەمی میدەکان، مەزدا یەسنی (زەردەشتی) بووبن.

وەک ئاماژەی پێکرا دەبێت ئەو ڕاستیە بزانرێت کە ئاینێک نەبووە لە مێژوودا بە ناوی ئاینی زەردەشتیەوە، بەڵکو ئەو ناوە لەلایەن ئەوروپیەکانەوە هێنراوەتە کایەوە. ئەوانەی کە هەڵگری ئەو بیروباوەڕەن بە خۆیان دەڵێن (مەزدا یەسنی) واتە (مەزدا پەرست) (Rose, 2010, p.xix). واتە ئاینەکە لە کاتێکدا باسی پێغەمبەرێک دەکات بە ناوی زەردەشتەوە، بەڵام مەرج نیە لەبەر ئەوەی کە ئەو ئاینە باسی زەردەشت دەکات مێژووەکەی بگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی دێرین. بۆ نموونە لە قورئاندا باسی پێغەمبەران ئیبراهیم، موسا، عیسا و چەندین پێغەمبەری دێرینی تر دەکرێت، بەڵام مێژووی ئاینی ئیسلام خۆی نزیکی هەزار و چوار سەد ساڵە و ناوهێنانی ئەو پێغەمبەرانە ئەوە ناگەیەنێت کە مێژووی ئیسلام بگەڕێنرێتەوە بۆ سەردەمی ئەو پێغەمبەرانەی کە باسکراون.

هۆکارەکانی تێکدانی مێژووی ئەو ئاینە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەشێکی زۆری تیۆریەکان سەبارەت بە زەردەشت و ئاینی مەزدا یەسنی (زەردەشتی) لەگەڵ داڕشتنی ئەفسانەی ئاریەکاندا دانراوە (بڕوانە کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان). بە ئاشکرا زۆر ڕووی مێژوویی ئەو ئاینە مۆرکی ڕوانگەی سیاسی سەدەکانی حەڤدە و هەژدەی ئەوروپای پێوە دیارە و زەردەشت لە ئەوروپادا هێندە گەورە کراوە،

---

[101]. ئەللات (اللات) خوایەکی گرنگ و مێینەی عەرەبەکان بووە لە سەردەمی جاهیلیدا، ئەو خوایە هەتاوەکو سەرەتای هاتنی ئیسلام لە ناو عەرەبەکاندا دەپەرسترا و لە قورئاندا لە سورەتی نەجم (٥٣:١٩) باسکراوە. هەڵبەت نوسینی ناوی ئەو خوایە لە تێکستەکەدا، دەیسەلمێنێت کە زانیاریەکانی هیرۆدۆت دروست بوون.

دەبینرێت کە لەو سەردەمەدا و لە ژێر ئەو کاریگەریە سیاسیەدا، زۆر لە فەیلەسوف و هونەرمەندە ئەوروپیەکان، بە تایبەتی ئەڵمانەکان، زەردەشتیان دەخستە شاکارەکانیانەوە و بابەتەکەیان لە بابەتێکی مێژوویی وئەکادیمیەوە کردبووە بابەتێکی ڕۆژانەی سیاسی. هەر لە ژێر ئەو کاریگەریەدا نیتشە (Friedrich Wilhelm Nietzsche) ی فەیلەسوفی ئەڵمانی کتێبە بەناوبانگەکەی نوسی بە ناونیشانی "زەردەشت بەو شێوەیە قسەی کرد" (Also sprach Zarathustra ) و هەر لە ژێر هەمان ناونیشاندا ڕیشارد شتراوس (Richard Strauss) ی مۆسیقا دانەر سەمفۆنیایەکی مۆسیقای دانا. بەو جۆرە ئەو ئاینە زۆر ڕووی مێژوویی لە دەست داوە و چەند سەد ساڵێکە لە ئەوروپا کراوەتە جۆرێک لە ئەفسانە. جا لەبەر ئەوهۆکارانە ئەمڕۆ ئەم ئاینە مێژووەکەی زۆر ڕوون نیە، چونکە مێژووەکەی زیاتر لەسەر بناغەی تیوریەکی ئەفسانەیی و ڕوانگەی سیاسی سەدەکانی حەڤدە و هەژدە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە.
دیارە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر مێژووی ئەم ئاینە، پێویست بە لێکۆڵینەوەی نوێ دەکات هەتاوەکو بتوانرێت لە تەپ و تۆزی بیروباوەڕی سەدەکانی ڕابردووی ئەوروپا ڕزگار بکرێت و خوێندنەوەیەکی هاوچەرخی دروست و دوور لە ویست و پێویستی سیاسی سەردەمی بۆ بکرێت. بە دڵنیایی ئەو ئاینەی کە ئەمڕۆ پێی دەگووترێت ئاینی زەردەشتی ڕابردوویەکی مێژوویی هەیە، بەڵام ئەو ئاینە هێندە دێرین و بەرفراوان و گەورە نەبووە کە مێژوونوسان باسی لێوە دەکەن. هیچ بەڵگەیەکیش لەبەردەستدا نیە کە بیسەلمێنێت کە ئەخامەنیە فارسەکان و میدەکان مەزدا یەسنی (زەردەشتی) بوون و بەڵگەیەکی ڕوونیش نیە کە نیشانی بدات لە ڕابردوودا کورد پەیڕەوی ئەو ئاینە تایبەتەی کردبێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە ئاینی کورد هەر تەواوکەری ئاینی هوری، هیتی، میدی، ئیلامی، مانی، لوڤی، کاسی و سۆمەریەکان بووە. بەڵام بە دڵنیایی وەک شەمسەدین و مەسعودی و زۆربەی مێژوونوسەکان دووبارەی دەکەنەوە، زەردەشت خەڵکی ئازەربایجان بووە و فەیلەسوف و زانا بووە. لەبەر ئەوەی وەک لە زمانی مید و مانیەکاندا دەردەکەوێت کە ئازەربایجان لە ڕابردوودا بە زاراوەیەکی کوردی قسەیان کردووە و زردەشتیش بەو زاراوەیە قسەی کردووە، بۆیە دەتوانرێت بگووترێت کە زەردەشت بە زاراوەیەکی کوردی قسەی کردووە.

**پەیوەندی زمانی ئاڤێستا و زمانی کوردی**

وەک لە فەرهەنگی وشە ئاڤێستاییەکانی ئەم کتێبەدا دەردەکەوێت، پەیوەندیەکی پتەوی وشەکاری و ڕێزمانی لە نێوان زمانی ئاڤێستا و زمانی کوردیدا هەیە. هەندێک لە وشەکان تەنها لە زمانی کوردی، ئاڤێستا و میدیدا هەن و هەندێکی تریان تەنها لە سۆمەری و کوردی و ئاڤێستادا هەن و هەندێکیان لە ناو زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دووبارە دەبنەوە. بۆ نموونە وشەی dru لە زمانی ئاڤێستادا مانای (داری دەستی) دەدات و لە کوردیدا دەبێتە (دار dar) و لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە dur. وشەی atar ی ئاڤێستا کە مانای (ئاگر) دەدات، لە زمانی کوردیدا بەشێوەی ئاتەر/ئاگر/ئایر/گڕ/ئادر دەبینرێت، لە زمانی هوریدا دەبێتە tari و بە میدی دەبێتە atr و لە سۆمەریدا دەبێتە gir، کە هەموویان لە زاراوە کوردیەکاندا ماون و هاوشێوەیان لە هەموو زمانە کۆنە ئاسامیەکانی[102] مێسۆپۆتامیادا هەبووە.
هەندێک جار وشە ئاڤێستاییەکان لە ناو زمانە زاگرۆس (ئێران) یە زیندوەکاندا بە تەنها لە زمانی کوردیدا ماون. بۆ نموونە وشەی (پەراسو) ی کوردی. لە زمانی ئاڤێستادا دەبێتە peresu و بە زمانی میدی دەبێتە prsu. یان وشەی (سەگ) کە لە ئاڤێستادا بە شێوەکانی span, spâ دەنووسرێت. لە کوردیدا بە شێوەی (سپڵۆت، سپەر) هەیە و بە زمانی میدی دەبێتە spa. هەندێک جار وشە ئاڤێستاییەکان زۆر کەم لە کوردیدا گۆڕاون. وشەی perenô-mångha ی ئاڤێستا مانای (پڕ مانگ) ی کوردیدا دەدات، واتە (مانگ پڕە) . یاخود وشەی pouru-mahrka کە مانای (پڕ مەرگە) ی کوردی دەدات، بە نزیکی وەک خۆی ماوە. جاری وا هەیە پاشگرە کوردیەکان لەگەڵ ئاڤێستادا وەک یەکن، بۆ نموونە چیای Hara Berezaiti ی کە لە ئاڤێستادا باسکراوە، لە کوردیدا (هەرە بەرزایەتی) مانای (ئەوپەڕی بەرزی) دەدات و وشەکان هەمان مانایان ماوە و پاشگری (ایەتی) لە کوردی و ئاڤێستدا وەک خۆیەتی. وشەی وەک taxma لە زمانی

[102]. مەبەست لەو زمانانەیە کە سامی نین، وەک سۆمەری، هوری، میدی و هیتی.

ئاڤێستا و میدیدا مانای (ئازا) دەدات و لە کوردیدا (تۆکمە) مانای (بەهێز) دەدات. وشەکان هەندێک جار لە هەموو زمانە کۆنەکاندا هاوبەشن. بۆ نموونە وشەی tap کە مانای گەرمی دەدات، ئەم وشەیە لە کوردیدا بە شێوەی (تاو، تاڤ) دەردەکەوێت و لە زمانی هوری و سۆمەریشدا دیسان هەر بەشێوەی tab دەردەکەوێت.

بە گشتی زمانی ئاڤێستا وەک زاراوەیەکی کوردی خۆی نیشان دەدا و زۆر نزیکی لەگەڵ زمانی میدی تێدا دەردەکەوێت و هەندێک لە وشەکانیان بە تەواوی یەکن. بە دڵنیایی ئاڤێستا پەلێکە لە زمانی کوردی و لەو زمانەدا وا دەردەکەوێت کە ناوچەکەی کەوتبێتە ڕۆژهەڵاتی دووری کوردستان و ناوچەیەکی میدی بووبێت. زمانی ئاڤێستا لە ڕابردووی دێریندا زنجیرەیەکی نەبچڕاوی زاراوە کوردیە کۆنەکان بووە کە لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە کوردستان هەندێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە و دوایی لە ناوچووە.

# فەرهەنگی ئاڤێستا - کوردی

| وشەی ئاڤێستایی | ماناکەی بە کوردی و ئینگلیزی | وشەی کوردی بەرامبەری و کۆمەڵێک تێبینی |
|---|---|---|
| adā | ئەوجا/ ئەنجا<br>then, thereupon | aujā/anjā ئەوجا/ئەنجا: ئەم وشەیە بە هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا ماوە و لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە anga، بە هوری undu، بە هیتی handa و لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا بە مانای نزیک و شێوەی جیاواز دەردەکەوێت, لە ئینگلیزیدا بە شێوەی and، لە ئەڵمانیدا und و لە ئیتاڵیدا ánche. |
| adhairi | ژێر<br>under | žerī ژێری: هەمان مانا دەدات. |
| aêiti | هاتن<br>to come | hātīa هاتیە: هەمان مانا دەدات. |
| aem | ئەمە<br>this | ama ئەمە: هەمان مانا دەدات. |
| aêsha | ئەمە<br>this | auasa ئەوسە: مانای (ئەوە) دەدات. |
| aêshô | بەهێز<br>powerful | āzā, hez ئازا ,هێز:(ئازا) لە کوردیدا مانای (بەهێز، بوێر) دەدات و (هێز) مانای (قوەت) دەدات وشەی (ئازا) لە زمانی هوریدا دەبێتە ada. لە سۆمەریدا usu مانای (هێز) دەدات. |
| aêta | ئەوە<br>that | auata ئەوەتە: هەمان مانا دەدات. |
| ahmâi | ئێمە<br>we | ema ئێمە: هەمان مانا دەدات. |
| ahura | گەورە، خوا<br>Lord, God | xor/hor خۆر/هۆر: لە کوردیدا مانای (ڕۆژ) دەدات و پێ دەچێت وشەی (خۆر) لە هەمان کاتدا ئاماژە بوو بێت بە خوا. |
| airime | لەسەرخۆ، ئارام<br>quiet , quietly | ārāmī ئارامی: هەمان مانا دەدات. لە زمانی سراسریدا دەبێتە ramus. |
| aiwyô | ئاو<br>water | āu ئاو: ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریشدا بە دوو شێوەی au, a دەردەکەوێت و لە زمانی فەرەنسیدا دەبێتە eau. |
| akha, aka | خراپ، شەیتان<br>bad, evil | āīx ئایخ: لە کوردیدا مانای (خراپ) دەدات. لە هەندێک ناوچەی کوردستان بە شتێکی خراپ و بێ کەڵک دەوترێت (ئایخ). |
| aoj | دەڵێت<br>say | aueže ئەوێژێ: هەمان مانا دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| ar | برۆ، بجوڵێ، وەرە<br>go, move, come | hara هەرە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا بە شێوەی ere دەردەکەوێت و مانای (برۆ) دەدات و ri مانای (ڕۆیشتن، چوون) دەدات. لە هیتیدا ar ماناکەی نزیکە و لە لوڤیدا ar مانای (هاتن) دەدات. |
| arša | ورچ<br>Bear | hirc/urc هرچ/ورچ: لە کوردیدا هەردووکی بەکار دەهێنرێت. لە هیتیدا دەبێتە hartakka و بە لاتینی ursu و بەفەرەنسی ours و بە ئیتاڵی orso. |
| asman | ئاسمان<br>the sky | āsmān ئاسمان: هەمان مانا دەدات. |
| aspa | ئەسپ<br>horse | asp ئەسپ: (بڕوانە وشەی ئەسپ لە سۆمەریدا) |
| asta | ئێسک<br>bone | hastī هەستی: لە کوردیدا وەک یەکە و بە زمانی هیتی دەبێتە hastāi و بە میدی asta و بە زمانی فەرەنسی دەبێتە os، ئیتاڵی وپورتوگالی osso، ئیسپانی hueso. |
| aθā | بەوجۆرە<br>thus | usā وسا: هەمان مانا دەدات. |
| ava | ئەوە<br>that | ava/aua ئەوە/ئەڤە: هەمان مانا دەدات. |
| ava-bar | بهێنرێت بۆ<br>to bring to | ava-bera/bāra ئەڤە بێرە/بارە: هەمان مانا دەدات. |
| avadha | لەوێ<br>there | auatā ئەوەتا: هەمان مانا دەدات. |
| avatha | بەوجۆرە<br>thus | āuā, āuhā،uasā وەسا، ئاوا, ئاوها: هەر سێکیان هەمان مانا دەدەن. |
| azhish [azhi] | مار، هەژدیها<br>a snake, a dragon | haždīhā, hazīā ئەژدیها, حەزیا: هەمان مانا دەدەن. |
| âstâya | هەستان<br>to stand | hastāīa هەستایە: وەک خۆی ماوە. ڕەگی وشەکە لە سۆمەریدا دەردەکەوێت بە شێوەی si کە لە کوردیدا دەبێتە (هەس). |
| âste | حەوانەوە<br>to rest | est ئیست: هەمان مانای هەیە. |
| âtar | ئاگر<br>fire | ātar ئاتەر: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە زمانی هوری دەبێتە tari و بە میدی دەبێتە atr. |
| âxshti | ئاشتی<br>peace | āštī ئاشتی: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە زمانی لوڤی دەبێتە aššata. شایانی سەرنجە کە بە زمانی هوری ašti مانای (ئافرەت) دەدات. |
| âyese | خۆزگە خواستن، داواکردن، ویستن<br>to wish, to desire, to demand | uīst/uīs/āīš ئایش/ویس/ویست: خۆزگە خواستن و نەفرەتکردن لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە a'aš. لە کوردیدا دەڵێن (ئایش ئەوەم بۆ دەکرا) واتا (خۆزگە ئەوەم بۆدەکرا). لە ئینگلیزیدا بەشێوەی wish دەردەکەوێت. وشەی (ویس/ویست) لە کوردیدا مانای (خواس) دەدات و بە |

| | | |
|---|---|---|
| | | سۆمەری دەبێتە ašte. |
| bakha | بەشی، پارچەیەک<br>a portion, a piece | baš بەش: کوردی لە ئاڤێستا نزیکە بەڵام لە سۆمەری نزیکترە کە بریتیە لە peš. |
| bar | هەڵگرتن<br>to bear | bār بار: لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (بارکردن). لە زمانی سۆمەریدا bur یەکەیەکی قەبارەیە و لە زمانی میدیدا bara هەمان مانای وشە ئاڤێستاییەکەی هەیە. لە زمانی ئینگلیزیدا وەک کردار دەبێتە bear. |
| barezahi | بەرزی؛ شاخ<br>height; a mountain | barzāyī بەرزایی: لە کوریدا هەمان مانا دەدا و بە زمانی میدی دەبێتە barzi دەبینرێت. بە هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا ماون و پاشگری (یی) لە ئاڤێستا و کوردیدا یەکن. |
| basta | پەیوەست، بەستراو<br>bound, tied | basta بەستە: هەمان مانا دەدات. |
| bû | بوون، بوو<br>to be, to become | bū بوو: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە سۆمەریدا bu مانای تەواو (پێرفێکت) دەدات، لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە be. |
| bavãn | لەوانەیە بووبێتن<br>they might be | biban بن: هەمان مانا دەدات. |
| bâ | بە دڵنیایی، وایە<br>definitely, indeed | bā با: لە کوریدا (با) بە مانای قایل بوون دێت و دەگووترێت (با وایە، با ڕاست ئەکات) کە هەمان مانا دەدات. |
| bâzû | بازو<br>arm | bāzu بازو: ئەم وشەیە لە کوردی و میدیدا هەر بە هەمان شێوە دەنوسرێت. |
| buyama | ئێمە ئەبین<br>may we be | buīma/buma بویمە/بومە: بە هەردوو شێوەکە دەگووترێت. |
| buyata | بوویت<br>may ye be | buīta بویتە: لە کوردیدا نەگۆڕاوە. دەبینرێت لەم نموونە و نموونەکانی سەرەوەدا هەموو ڕاناوەکان و پێکهاتەی وشەکە لە ئاڤێستا و کوردیدا یەکن. |
| cathru-gaosha | چوار گۆشە<br>four-cornered | cuār goša چوار گۆشە: هەر هەمان مانای ماوە. بە فەرەنسی بە ژمارە چوار دەگوترێت quatre . |
| ci | چی<br>what? | cī چی: هەر هەمان مانا دەدات، بە زمانی هیتی دەبێتە kui. لە زۆر زمانی تری هیندۆئەورووپیدا دەردەکەوێت؛ بە ئیسپانی qué، ئیتاڵی che و فەرەنسی que. |
| citha | سزا؛ جەزا<br>penalty; punishment | sizā/jazā سزا/جەزا: هەر هەمان مانایان هەیە. |
| cithra | ڕەگەز، ڕەسەن، خێزان<br>origin, race, family | sajara سەجەرە: ئەم وشەیە لە کوردی و میدیدا مانای (نەخشەی بنەماڵە) دەدات و بە میدی بە čiθra دەنووسرێت. |
| cvañt | چەند<br>how much | cand چەند: ئەم وشەیە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زۆر لە زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا هەیە. بۆ نموونە بە زمانی |

| Avestan | Meaning | Explanation |
|---|---|---|
| | | ئیتالی quanto ،ئیسپانی cuánto ، پورتوگالی quanto و بەفەرەنسی combien. |
| daenyå | ئاین/دین<br>religion | dīn دین: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زمانی سۆمەریدا لە ناوی خوا دا دەردەکەوێت کە بە dingir دەنوسرێت، لەوە دەچێت، کە لەلای سۆمەریەکان، ماناکەی (ڕاگری ئاین) بووبێت ، لەبەر ئەوەی پاشگری gir لە سۆمەری و کوردیدا هەمان مانای هەیە. |
| daêva | دێو<br>devil | deu دێو: هەر هەمان مانا دەدات. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە dimme. |
| dar | درین<br>to tear | dir دڕ: هەر هەمان مانا دەدات و لە سۆمەریدا دەبێتە dar. لە زمانی ئینگلیزیدا دەبێتە tear. |
| darekha | درێژ<br>long | direž درێژ: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات. |
| darshi-dru | بە داری درێژەوە<br>with mighty club | direža-dār درێژە- دار: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە. لە زمانی سۆمەریدا بە (دار) ی کوردی دەگوترێت dur و بە زمانی هیتی و لوڤی پێی دەگووترێت taru. لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا بە شێوەی جیاواز دەرکەوتووە. ئینگلیزی tree، سلۆڤینی drevo، کرواتی drvo، دانیمارکی træ. |
| du | قسەکردن<br>to speak | du دو: لە کوردیدا مانای قسەکردن دەدات. بە سۆمەریش هەر دەبێتە du. ئەم وشەیە لە زمانە هیندۆ ئەورووپیەکاندا ماوە. بۆ نموونە بە فەرەنسی ڕەگی گوتن di، زمانی گالیشی di (Galician)، ئیتالی و ئیسپانی dice. |
| dâ | پێدان، دانان<br>to give, to put | dā دا: لە کوردیدا هەمان مانای ماوە و پێکهاتەی زۆر وشەی سۆمەریە. بۆ نمونە a de لە سۆمەریدا، مانای (ئاو دا) دەدات لە کوردیدا، بەو جۆرە وشەکە لە سۆمەریدا بە شێوەی de دەنوسرێت. لە زمانی هتیدا دەبێتە da و لە لاتینیدا بە da دەردەکەوێت. |
| dâiti | پێدان، بەخشین<br>giving, bestowing | dāhāt/dauiate داهات/داویەتێ: (داهات) ئەو بڕە پارە یان ئەو سودەیە کە کەسێک لە کار، پیشە یان هەر شتێکەوە بەدەستی دەهێنێت. (داویەتێ) ماناکەی دەبێتە (پێی داوە). |
| dãn | پشتگیری کردن<br>to support | dān دان: مانای (پێ دان، پێ بەخشین، یارمەتی دان) دەدات. |
| dî | بینین<br>to see | dī دی: هەمان مانا دەدات. |
| dûraêpârayå | دورە بۆ پەڕینەوە یان بەسەردا ڕۆیشتن<br>far for crossing or passing over | dura parīaua دورە پەڕیەوە: هەر هەمان مانا دەدات و بە زمانی هیتی parranda نزیکی هەمان مانای وشەی (پەڕینەوە) ی وکوردی هەیە. |
| dûraosha | ئازار لابردن، | duraeša دورە ئێشە: هەردوو بەشی وشەکە لە کوردیدا |

| | | |
|---|---|---|
| | ئازار کوشتن<br>removing pain, killer of pain | وەک خۆی ماوە. وشەی (دور) وەک کردار مانای (لابردن) دەدات. بۆیە وشەکە مانای (ئازار لابردن/دورخستنەوەی ئازار) دەدات. |
| dûra | دوورە<br>far away | dura دورە: هەمان مانا دەدات. |
| eresh | ڕاست، حەق، ڕاستی<br>true, just, righteous | rāz,rās/rāst ڕاز، ڕاس/ڕاست: لە کوردیدا بە هەر سێ شێوەکەی هەیە. بە زمانی میدی ئەم وشەیە دەبێتە raz و لە زمانی سۆمەریدا لە وشەی abaraša دا دەردەکەوێت، کە ماناکەی لە کوردیدا دەبێتە (بەراسی). |
| erezu | ڕاس/ڕاست<br>straight | rāz,rās ڕاز، ڕاس: (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| ferâ | بەرەو ، بەرەو پێشەوە، زیاد لە ڕادەی خۆی<br>pro; forward, excessive | barau,baro,brau, fira, fire بەرەو، بەرۆ، برەو، فرە، فرێ: (بەرەو) مانای (بە ئاراستەی) دەدات و (بەرۆ) مانای (بەرەو پێشەوە) دەدات و (برەو) مانای (گەشەسەندن) دەدات و (فرە) بەمانای زیا/زیاد لە ڕادە دێت و (فرێ) بە مانای (ڕەوانەکردن) دێت. لە زمانی هتیدا parā بە مانای (بەرەو) ی کوردی دێت. لە ئینگلیزیدا دەبێتە pro. |
| frô | زۆر<br>much | fira فرە: هەمان مانا دەدات. |
| gao | گا، ڕەشە وڵاخ<br>ox, cattle | gā/gāu گاو/گا: ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە gu. لە زمانی تریشدا دەردەکەوێت بەڵام لە زمانی کوردی و ئاڤێستا و سۆمەریدا هەمان مانا دەدەن. |
| gaosha | گوش/گوێ<br>ear | guš/goš گوش/گۆش: هەمان مانا دەدات. |
| gâthâ | گروپێک لە گۆرانی ئاینی<br>group of hymns | guta گوتە: مانای (قسەکردنێکی ئامادەکراو، قسەکردن) دەدات و لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە gu de. |
| ghenâ | هی ژن<br>of women | žina ژنە: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زمانی سراسیدا دەبێتە goni. ئەم وشەیە لە زۆر زمانی هیندۆ ئەورووپی تردا دەردەکەوێت بە کرواتی و چیکی žena و بە سلۆڤینی ženska و بە یۆنانی gynaíka . |
| hakat | دەستبەجێ، یەکسەر<br>immediately, at once | hāukāt هاوکات: ماناکەی دەبێتە (لە هەمان کاتدا). |
| hakeret | یەک کەرەت<br>once | īakarat یەکەرەت: هەمان مانا دەدات. |
| hama | هاوین، هەموو، هەمان<br>summer , all, same | hām/hāu,hamu,hāuīn/hāmin هامن/هاوین، هەموو، هاو/هام: دەبینرێت لە کوردیدا وشەی (هاوین) پێک دێت لە (هاو/هام+یان) کە ماناکەی دەبێتە سەردەم/جیهانی گەرمی. لە بەر ئەوەی کە وشەی (یان) مانای (ناوچە، شوێن، جیهان، |

| | | |
|---|---|---|
| | | وەرز) دەدات، ئەگەر تێبینی بکرێت بۆ وشەی (زستان) ی کوردی کە پێک هاتووە لە (زا+ستان) لە ئاڤێستادا دەبێتە zaya کە دیسان ئەوان پاشگری (ستان) بەکارناهێنن وەک کوردی. وشەی (هەموو) لە کوردیدا نەگۆڕاوە و (هام/هاو) بۆ هاوشێوەیی بەکاردەهێنرێت. لە زمانی سۆمەریدا دەبێتە hamun، هیتی himma، میدی ham و لە یۆنانیدا دەبێتە homos، دەبینرێت کە پرەنسیپی مانای وشەکە لە هەموو زمانەکاندا نزیکە. |
| hañdâtâ | ڕێکخستن، ستاندارد<br>arranged, canonical | andāza/handasa ئەندازە/هەندەسە: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی مانای (پێوانە، هێڵکاری) دەدات. ئەم وشەیە لە سۆمەری/کوردیەوە چووەتە زمانی فارسی و عەرەبیەوە. |
| hañcamana | کۆبوونەوە<br>meeting | hanjuman/anjuman هەنجومەن/ئەنجومەن: مانای (کۆمیتە، دەستە) دەدات. |
| haom | کەسێک خۆی<br>one's own | xom خۆم: هەمان مانا دەدات. |
| h'a | هەیەتی<br>own | ha هە: لە کوردیدا هەمان مانا دەدات (هەژار، ١٨٢) لە ئیتالیدا دەبێتە ha و لە ئینگلیزیدا دەبێتە has/have. |
| hâmô | هەموو<br>all | hamu هەموو: هەمان مانا دەدات. |
| hâu | ئەو (بۆ نێر و مێ)<br>he, she; this, that | hau/au ئەو/هەو: هەمان مانا دەدات. |
| hãm-bavaiñti [hãm-bû] | هەموو بەیەکەوە، کۆبوونەوە بەیەکەوە<br>to go together, to meet together | hamu-buīn هەموو بوین: هەمان مانا دەدات. |
| hãm-raêthwayeiti [hãm-raêthwa] | پیس بوون بە ڕسواکردنی ڕاستەوخۆ<br>to be polluted by direct defilement | hamu-risuāīatī/hamu-risuā هەموو- ڕسوا/هەموو- ڕسوایەتی: هەردوو وشەکە وەک خۆی لە کوردیدا ماوە. (ڕسوا) لە کوردیدا بە کەسێک دەگوترێت کە سوکایەتی پێ کرابێت و (ڕسوایەتی) بریتیە لە ئاوەڵکردارەکەی. تێبینی دەکرێت کە پاشگری (ئایەتی) لە کوردی و ئاڤێستا و میدیدا بە هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێت. |

| | | |
|---|---|---|
| hara Berezaiti | شاخی ئەلبورز<br>Alborz Mountain | hara barzāīatī هەرە بەرزایەتی: لە کوردیدا مانای (ئەوپەڕی بەزی) دەدات. تێبینی دەکرێت کە لە کوردیدا پاشگری (ایەتی āīatī) وەک خۆی ماوە. ئەم شاخە شوێنێکی گرنگی لە ئاینی مەزدا یەسنی (زەردەشتی) دا هەبووە و زۆر جار لە تێکستە ئاینیەکاندا باسکراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە پێکهاتەکانی ناوەکە لە زمانی فارسیدا مانای نیە، بۆیە وورده وورده فارسەکان بەشێکی ناوی شاخەکەیان گۆڕیوە و دوایی لە سەردەمی ئیسلامدا (ال)ی خراوەتە سەر و بووەتە Alborz و مانا کوردیەکەی نەماوە. |
| harethra | خۆراک، خواردن<br>nourishment, food | harīsaهەریسە: لە کوردەواریدا مانای (چێشتی گەنمە کوتاو بە گۆشتەوە، کەشکەک) دەدات (هەژار، پ.٩٧٢). ئەم خواردنە لە ناو کوردەواریدا لە کاتی شیوەنی حەسەن و حسەیندا دەکرێت (لە ناو کوردی موسوڵمانی سونەشدا دەکرێت). لەوە دەچێت ناوەکە لە بنەڕەتدا زۆر دێرین بێت. |
| haza | هێز<br>power | āzā, hez ئازا, هێز:(ئازا) لە کوردیدا مانای (بەهێز، بوێر) دەدات و (هێز) مانای (قوەت) دەدات. وشەی (ئازا) لە زمانی هوریدا دەبێتە ada ، لە سۆمەریدا usu مانای (هێز) دەدات. |
| hī | ئا (وایە)<br>indeed | ā, e ئا، ئێ: لە کوردیدا (ئێ/ئا) بە هەمان مەبەست بەکاردێن. |
| hizvâ | زوان/زوان<br>tongue | zuān/zimān زمان/زوان: هەمان مانا دەدات. |
| hudâ | لە دروستکراوێکی باشە<br>belonging to the good creation | huda هودە: لە کوردیدا مانای (بەکەڵک) دەدات کە دەبێتە پێچەوانەی (بێهودە). |
| idha | ئێستا<br>now | esa/īse/estā ئێسا/ئیسێ/ئێستا: لە کوردیدا زۆر نزیکە و لە سۆمەریدا دەبێتە aše. |
| ima [aêm] | ئەمە<br>this | ama ئەمە: هەمان مانا دەدات. |
| itha | واسە، کەواتە<br>so, thus, in this manner | uāsa, uāta واسە، واتە: هەمان مانا دەدەن. |
| jahi | کەسێک کە لە ژیانێکی بەرەڵای سێکسیدا بژی، سۆزانی<br>one who leads a licentious life , a prostitute | gāīī گایی: لە کوردیدا مانای (گانکردن) دەدات و لە سۆمەریدا agi مانای (بەژنکردنی کچ) دەدات. |

| | | |
|---|---|---|
| jan | پیاکێشانێکی توند، پیاکێشان<br>to smite, to strike | žan ژەن: دەبێتە ڕەگی وشەی (ژەنین) کە بۆ ڕاوەشاندنی مەشکە و لێدانی ئامێری مۆسقا بەکاردەهێنرێت. |
| juyô [juya] | زیندوو<br>living | žīāu ژیاو: واتە کەسێک کە لە ژیاندا بێت و بە زمانی سۆمەری بە (ژیان) دەگوترێت zi کە ڕەگی وشەکەیە و لە کوردیدا دەبێتە (ژی). لە زمانی یۆنانیدا وشەی zoi مانای (ژیان) دەدات. |
| jvô [jva] | زیندوو<br>alive | (بڕوانە وشەی ڕابردوو). |
| kaine [kanyâ] | کچ (کچی بە ژن نەبوو)<br>a maiden | kina/kanī کنە/کەنی: ئەم وشەیە لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زمانی لیدیدا دەبێتە kana و لە سویدیدا بە (مێ) دەگووترێت kvinna. |
| kairya | کارکردن؛ کەسێکی ئیشکەر، چالاک، پیشە<br>working; industrious, active, skill | kāra,kār,kārī کاری، کارە، کار: وشەی (کاری) مانای (کەسێکی بەکار، ئازا لە کاردا) دەدات، وشەی (کارە) مانای (کەسێکی چالاک) دەدات، بۆ نموونە (ئەو لاوە زۆر بەکارە). (کار) مانای (ئیشکردن) دەدات و هەروەها (کارە) مانای (پیشە) دەدات. بۆنموونە دەگووترێت (ئەو پیاوە چ کارمیە؟). |
| maêsman | میز<br>urine | mīz/mīs میز/میس: لە زمانی کوردیدا نزیکە و بە چیکی دەبێتە moč و بە ڕوسی mocha و بە پۆلۆنی دەبێتە mocz. |
| man | لەیەک چوون، بیرکردنەوە<br>to think، to resemble | manī,hamān مەنی، هەمان: (مەنی) لە کوردیدا مانای (ڕاوێژ) دەدات (هەژار، پ. ٨٣٦) و لە زمانی میدیدا بە شێوەی mana دەنووسرێت کە مانای (هزر) دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزیدا دەردەکەوێت بە شێوەی mind, mean کە یەکەمیان (مانا) دەگرێتەوە و ئەوی تریان (هزر). وشەی (هەمان) لە کوردیدا مانای (هەمان شت) دەدات. |
| mana | من<br>me | min من: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و بە سۆمەری دەبێتە men و بە ڕوسی mne و بە کرواتی mene . |
| mar | مردن<br>to die | mir مر: لە کوردیدا (مر) دەبێتە ڕەگی (مرن/مردن). |
| masan | مەزنی<br>greatness | mazin مەزن: ئەم وشەیە لە کوردیدا بە نزیکی وەک خۆی ماوە و بە زمانی میدی masa هەمان مانا دەدات و بە سۆمەری massu مانای (سەرکردە) دەدات. بە زمانی لوڤی mashana مانای (گەورەکردن) دەدات و masa مانای خودا دەدات. |
| mas | گەورە، مەزن<br>large, great | mazin,mās مەزن، مەس، ماس: لە کوردیدا (مەزن) مانای گەورە دەدات و (مەس) مانای (مەزن) دەدات (هەژار، پ.٨٢٩). بە زمانی سۆمەریش mes مانای (پاڵەوان) دەدات و massu و مانای (سەرکردە). ئەم وشەیە لە زمانی فەرەنسیدا بە masse و لە ئینگلیزیدا mass |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەنوسرێت کە مانای ژمارەی زۆری خەڵک یان شت دەدات و لە لاتیندا بەشێوەی missa, massa دەردەکەوێت. |
| masyô | ماسی<br>fish | māsī ماسی: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە و لە زمانی سۆمەریدا suhurmaš ماسیەکی ئەفسانەییە کە لەوە دەچێت (سورەماسی) کوردی بێت، لەبەر ئەوەی کە ئەو ماسیە ئەمڕۆ لە ناو کورد دا لە سەرەمۆنی جەژنی نەوروزدا بەکار دێت. |
| mashya | پیاو، نەمر<br>mortal, man | mašīa مەشیە: لە ئاینی یارسان (ئەهلی حەق) دا بە دوو یەکەمین مرۆڤی نێر و مێ دەگووترێت (مەشیە) و (مەشیانە)، کە بەرامبەر ئادەم و حەوان. هەروەها ئەوەی کە جێی سەرنجە، خوای لولوبی و کاسیەکان پێی گوتراوە mash-khu (Budick and Iser, 1996, p.306) کە لە ڕوانگەی یارسانەکانەوە و بە زمانی کوردی ئەو وشەیە دەبێتە (خو-مەش/خوای مەش) کە ماناکەی نزیکە لە (خوای ئادەم). شا خۆشینی لوڕستانی (سەدەی دەیەمی زاینی) لە دوو بەیتدا کە بۆ پیر شالیاری نووسیوە دەڵێت (ئەز چەنی تومەن شەهریار بێ گەرد، قەڵای کەنگاوەر ئانە بی وە گەرد، دوڕ نە تای دەریا ئێمەی بەر ئاوەرد، نامەکەی مەشیە ئێمەی بەرد نەو فەرد) (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٨٣). |
| månghٍ | مانگ<br>moon | māng مانگ: هەمان مانا دەدات. |
| mizhda | پاداشت<br>reward | mižda,miždāna مژدە، مژدانە: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی ماوە. لە هوریدا دەبێتە mištanni و لە سانسکریتدا دەبێتە mīdha. |
| nãma | نام/ناو<br>name | nām/nāu نام/ناو: بە هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا هەیە و لە ئینگلیزی و ئەڵمانیدا دەبێتە name، دانیمارکی navn، سویدی namn و فەرەنسی nom. |
| nû | ئێستا<br>now | niho,hanuka نهۆ،هەنوکە: هەمان مانا دەدات. ئەم وشەیە لە زمانی هوریدا دەبێتە hínnu هیتی nu و بە ئینگلیزی دەبێتە now، دانیمارکی و سویدی و هۆڵەندی nu. |
| para | لە بەردەم، دوور لە، لە پێش، پێشتر<br>before, away, beforehand, previously | bar,barī,parī بەر، بەری، پەڕی: (بەر) لە کوردیدا مانای (بەردەم) و(پێشتر) دەدا و بە زمانی هیتی دەبێتە peran. بۆ نموونە دەگووترێت ( لەبەر دەمی کۆشکێکدا) یان (بەر لە ئێستا)، (پەڕی) مانای دوورکەوتنەوە دەدات. وشەی (بەر) لە کوردیدا وەک پێشگریش سەدان وشەی لێ دروسکراوە بە مانای (پێش). بۆ نموونە (بەرکوڵ، بەردەم، بەرپێ، بەرچاو، بەرکۆش، ...). ئەم پێشگرە لە کوردیدا بە هەمان مانا و هەمان شێوە بەکاردەهێنرێت. لە لاتینیدا دەبێتە prae و pre سەدان وشەی ئینگلیزی لێ دروست دەکرێت وەک prepare, pre-book, prearrange, precast, precocious زۆر وشەی هاوشێوەی وشە ئینگلیزیەکان لە فەرەنسی و زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تریشدا دووبارە |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەبنەوە. |
| parayât [par] | پەڕینەوە، پڕکردن<br>to cross , fill | parīn,pir پەڕین، پڕ: وشەی (پڕ) لە کوردیدا دەبێتە ڕەگی (پڕکردن) و (پەڕین) دەبێتە ڕەگی (پەڕینەوە). ئەم وشەیە لە زمانی لیدیدا بەشێوەی fra و لە هیتیدا بە شێوەی parean کە مانای (پەڕینەوە) دەدەن. |
| pares | پرسکردن، پرسیارکردن<br>to ask, to question | pirs پرس: هەمان مانای هەیە و لە زمانی ڕوسیدا دەبێتە prosit′ و لە سلۆڤینیدا دەبێتە vprašati. |
| pasne | پشت، دوا<br>behind | pāžna,pāš,pāšin پاژنە، پاش، پاشن: (پاش) لە کوردیدا مانای (پشتەوە، دواوە) دەدا و (پاژنە) مانای (بەشی پشتەوەی پێ) دەدا و (پاشن) مانای ( دوایی). لە زمانی سۆمەریدا þaš مانای (دواوە) دەدات. لە فەرەنسی و ئینگلیزی و لاتینیدا post مانای (پاش) دەدات و پێکهاتەی زۆر ناویشە. |
| pasu | مەڕ؛ ئاژەڵ، ڕەوە ئاژەڵ<br>sheep ; animal, cattle | paz پەز: لە کوردیدا مانای (مەڕ، ڕەوە مەڕ) دەدات. لە زمانی لاتینیدا pacu و لە سراسیدا دەبێتە buzas. |
| pâdha | پێ<br>foot | pe ,pāta پێ، پاتە: لە کوردیدا (پێ) مانای (قاچ) دەدات و (پاتە) مانای (پێڵاو) دەدات. هەروەها لە زمانی لوڤی و هیتیدا pāta مانای (پێ) دەدات. بەڵام بە سۆمەری pah وەکو کوردی مانای قاچ دەدات. لە زمانی لاتینیدا (پێ) ی کوردی، بووەتە pede، بە فەرەنسی pied و ئیتالی piede. |
| pâiti | پاسکردن، پاراستن<br>to protect, to defend | pāsī پاسی: مانای (پاراستن) دەدات و بە زمانی هیتی دەبێتە pahš و بە زمانی میدی دەبێتە Paθ. |
| perena | پڕبووە لە<br>filled with | pirin پڕن: هەمان مانا دەدات لە حاڵەتی کۆدا. بۆ نموونە (گۆزەکان پڕن لە ئاو). |
| perenô-mângha | مانگی پڕ(مانگی یەک شەوە)<br>the full moon | māngī-pir/pira-māng مانگی پڕ/پڕە- مانگ: هەمان مانا دەدات. |
| peresu | پەراسو<br>a rib | parāsu پەراسو: لە کوردیدا وەک خۆی ماوە. لە زمانی میدیدا prsu بە ناوچەی سەروو کەمەر تەرجومە کراوە. |
| peretu | پرد<br>bridge | pird پرد: ئەم وشەیە لە کوردیدا زۆر نزیکە و لە زمانی هیتیدا parranda مانای (لەمبەر بۆ ئەوبەر) دەدات. لە ئینگلیزیدا وشەی (پرد) ی کوردی دەبێتە bridge، بە هۆلەندی brug و بە ئەڵمانی brücke. |
| pouru | زۆر، پڕ، زۆر هەبوون<br>many, full, abundant | pira پڕە: ئەم وشەیە لە کوردیدا مانای (پڕبوون لە شتێک) دەدات و هەروەها مانای (زۆر) دەدات؛ بۆ نموونە (کچەکە پڕ جوانە). وشەکە لە زمانی میدیدا وەک خۆی ماوە؛ بۆ نموونە کە بە میدی دەگوترێت (ئەسپی زۆرە) دەگوترێت |

| | | |
|---|---|---|
| | | par(u)v-aspa کە بە کوردی دەبێتە (پڕی ئەسپە). |
| pouru-mahrka | پڕ لە مەرگ<br>full of death | پڕە مەرگە pira-marga: هەر هەمان مانا دەدات. |
| raocah | ڕوناکی؛ ڕۆژی ڕوناک؛ ڕوناکی دانەوە<br>light; daylight; shining | ڕۆژە roža: مانای (کاتی ڕوناکیە) دەدات. هەروەها (ڕۆژ) مانای (خۆر) دەدات. |
| raoxshna | پرشنگدار، ڕوناک<br>radiant, bright | ڕۆشنە rošina: وەسفی حاڵەتی ڕوناکیە و ناوی ئەو کونەیە لە دیوار یان لە سەربان‌دا کە تیشکی خۆری لێ دێتە ژورێ. ڕەگی وشەکە لە کوردیدا دەبێتە (ڕۆژ/ڕۆش) کە مانای (خۆر) دەدات. پاشگری (ین، ن) لە کوردی و میدی و ئاڤێستادا دەردەکەوێت. بەو جۆرە وشەکە بووەتە (ڕۆژ/ڕۆش+ن). |
| râna | ڕان<br>thigh | ڕان rān: هەمان مانا دەدات و لە هوریدا دەبێتە urni. |
| sara | دەسەڵات، سەر<br>authority, head | سەر sar: لە کوردیدا مانای (سەری مرۆڤ یان گیاندار، سەرکردە، دەسەڵات) دەدات. لە زمانی میدیدا دەبێتە sar و بە هوری بەشێوەی šarri دەردەکەوێت بە مانای (پاشا) و لە زمانی لیدیدا sarli مانای (سەرکردە) دەدات. لە کوردیدا هەموو مانا کۆنەکانی ماوە. |
| span, spâ | سەگ<br>dog | سپلۆت، سپەر spar,splot: لە کوردیدا دوو ناوی ترن بۆ (سەگ) و بە زمانی میدی دەبێتە spa. بە زمانی لوڤی دەبێتە suwan. |
| star | ئەستێرە<br>star | ئەستێرە/ستێر astera/ster: لە کوریدا زۆر نزیکە و بە زمانی هیتی دەبێتە haster و لە ئینگلیزیدا دەبێتە star. |
| suxra | سور<br>red | سور sur: هەمان مانا دەدات و لە زمانی میدیشدا بە هەمان شێوە دەنووسرێت. |
| sûra | بەهێز، ئازا، بەجەرگ<br>Powerful, brave, strong | زۆر zor: مانای (هێز و توانا، فشار) دەدات. دەبێتە پێکهاتەی وشەکانی (زۆردار، زۆران). لە زمانی هوریدا itsuri مانای (ڕاکەر) دەدات و لە زمانی سۆمەریدا sur مانای (فشار خستنە سەر و گووشین) دەدات. |
| tanu | لەش، کەس<br>body, person | تەن tan: لە کوردیدا مانای (لەش) دەدات. |
| tanu-perethana | لەش پڕ لە گوناح<br>to fill the body with sin | تەن- پەرێشانە tan-parešāna: واتە (لەشی لە داماوی و نەهامەتیدایە). |
| tares | ترسان<br>to fear | ترس tirs: هەمان مانا دەدات. |
| tash | دروستکردن، ئامرازی تاشین،<br>to create, | تاش tāš: دەبێتە ڕەگی (تاشین) کە لە کوردیدا مانای (دروستکردن، داتاشین، دروستکردنی شێوە) دەدات. ئەم وشەیە لە ناوی خوای هوری گەردەلولدا دەردەکەوێت کە |

| | | |
|---|---|---|
| | chisel | پێی دەگووترێت Teššub کە وا دەردەکەوێت مەبەستی (تاشیبا/تاشیەبا) بێت. |
| tava | هی تۆ<br>of thee | toīa تویە: هەمان مانا دەدات. لە زمانی لوڤیدا بە هەمان مانا دەبێتە tūwa/i. |
| taxma | ئازا<br>brave | tokma توکمە: لە کوردیدا مانای (بەهێز، بەرگەگر، بەتوانا) دەدا و لە زمانی میدیدا taxma مانای (ئازا) دەدات. |
| tap | گەرم بوون، گەرمکردن<br>to grow hot, to be heated | tā,tāu,tāb تا، تاو، تاب: (تا) مانای (گەرمی لەش لە نەخۆشیدا) دەدات، (تاو) مانای (گەرمی، هەتاو) دەدات و بەمانای تاو دانی ئەسپ وکەسیش دێت، واتە گەرمکردن. وشەی tab بە زمانی سۆمەری مانای (سوتاندن، تای لەش) ی هەیە و tab بە زمانی هوری مانای (توانەوە) دەدات. |
| uiti | بەوجۆرە، بەم شێوەیە<br>thus, in this manner | uāta واتە: هەمان مانا دەدات. |
| ushtra | وشتر/حوشتر<br>camel | uištir وشتر: هەمان مانای هەیە. |
| vac | قسەکردن، وشە<br>to speak, word | uša,uež وێژ، وشە: (وێژ) مانای (قسە دەکات) دەدات و (وشە) مانای (کەلیمە) دەدات. |
| vas | ویست، خواست<br>to wish, desire | uīs/uīst ویس/ویست: ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریشدا دەبێتە ašte. لە زمانی میدیدا دەبێتە vasa و لە زمانی لوڤیدا دەبێتە wazi. تێبینی ئەوە دەکرێت کە لە زمانی کوردیدا وشەکە بە هەردو جۆرەکەی ماوە. ئەم وشەیە لە زمانی ئینگلیزی و لاتینیدا دەبێتە quest و بە فەرەنسی دەبێتە quête. |
| vâstra | لەوەرگە؛ کێڵگە<br>pasture; field | bastora, bāsara بەستورە، باسەرە: لە کوردیدا (باسەرە) مانای (مێرگ و بژوێن و جێ لەوەری باش) دەدات (هەژار، پ.٤٣). وشەی (بەستورە) مانای (چەمێک دەدات کە لە هاویندا وشک دەبێت) (هەژار، پ.٨١) کە ئەویش جۆرێکە لە سەوزی لە هاویندا. ئەم وشەیە لە لاتینیدا دەبێتە pastura، لە ئینگلیزیدا pasture، بە فەرەنسی pâture و ئیسپانی pastar بە مانای (لەوەرگە) دێن. |
| vehrka | گورگ<br>wolf | uarga ,gurg وەرگە، گورگ: بە هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا هەیە. |
| xan | کانی، سەرچاوە<br>spring, source | kānī کانی: هەمان دوو مانای هەیە. ئەم وشەیە لە زمانی هیتیشدا دەردەکەوێت، لەو زمانەدا وشەی šakuni بە (کانی ئاو) تەرجومە کراوە، بەڵام پێ دەچێت (شاکانی) بێت و مانای (کانی گەورە) بدات. |
| zairi-gaosha | گوێ- زێرین<br>golden-eared | zerī goša زێری گۆشە: هەمان مانا دەدات. |
| zairi | زێری<br>golden | zerī زێری: واتە (لە زێر، زێرین)، ئەم وشەیە لە زمانی میدیدا دەبێتە zar و لە هوریدا دەبێتە hijari. |

| | | |
|---|---|---|
| zan | تێگەیشتن<br>understanding | zān زان: دەبێتە رەگی وشەی (زانین) و بە زمانی سۆمەری دەبێتە zu. لە کوردیدا هەردوو شێوەکەی ماوە. لە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا بەشێوەی جیاواز دەردەکەوێت؛ znati کرواتی، wissen ئەڵمانی، znaya بولگاری، znat′ ڕوسی، znać پۆڵۆنی، know ئینگلیزی. هەروەها بنەچەی وشەی zand ی ئاڤێستاش لە وشەی (زان) دروستکراوە .(Yule and Burnell, 1996, p.982) |
| zaranya | زێرین، لە زێڕ<br>golden, of gold | zerīn زێرین: دەبینرێت لە کوردی و ئاڤێستاشدا پاشگرەکانی وەک (ین، ی) بە هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێت و لە زمانی میدیشدا هەر بە هەمان شێوەیە. |
| zasta | دەست<br>hand | dast دەست: هەمان مانا دەدات و بە زمانی میدی دەبێتە .dasta |
| zaya | زستان<br>winter | zisān/zistān زستان/زسان: (بڕوانە وشەی hama (هاوین)) |
| zâiri | زەرد<br>yellow | zar زەر: مانای (ڕەنگی زەرد) دەدات. لە زمانی میدیدیشدا هەر وەک ئاڤێستا و کوردی دەبێتە zar. |
| zhnu | ئەژنۆ<br>knee | žino ژنۆ: لە کوردیدا بە هەردوو شێوەی (ئەژنۆ، ژنۆ) دەگوترێت. ئەم وشەیە لە زمانی هیتیدا دەبێتە genu و لە زۆر لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا وەکو یەکە. بە ئینگلیزی knee، بە فەرەنسی genou ، بە ئیتالی ginocchio و بە لاتینی دەبێتە genua. |

# بەشی ٣
# زمانی کوردی

**نووسین و تێکستی کوردی**

وەک لە پێشەوە باس کرا، دەتوانرێت نووسینی سۆمەری بە کۆنترین و سەرەتاترین نووسینی کوردی دابنرێت و نووسینی میتانی، هوری، هیتی، لوڤی، کاسی، هتد. هەر زاراوەی کوردین. بەڵام ئایا نەتەوەیەک هێندە لە کۆنەوە نووسینی هەبووبێت، چۆن ئەو نووسینەی بەردەوام نەبووە و هەتاوەکو سەردەمی ئیسلامی هیچ بەردەوامییەک بە نووسینی کوردی نەدراوە؟ ئایا دەشێت دوای ئەو هەموو شارستانیەتە، نووسینی کوردی بە تەواوی نەمابێت؟

وەک زۆر لایەنی تری مێژووی کورد، ئەگەر ئەمڕۆ سەیری سەرچاوەیەکی جیهانی لەسەر کورد بکرێت، زۆربەیان پێیان وایە کە زمانی کوردی هیچ ڕابردوویەکی ئەوتۆی نووسینی نیە و ئەم بۆچوونەش زۆر جار بەشێوەی جیاواز لە سەرچاوە کوردیەکاندا دووبارە کراوەتەوە.

هەتاوەکو ئێستا قۆناغەکانی زمانی کوردی ڕوون نەبوونەتەوە و نازانرێت ئایا لە دوای قۆناغە سەرەتاییەکانی نووسین، لە سەردەمەکانی سۆمەری، هوری، هیتی و کاسیدا، کورد کام ئەلفوبێی بەکارهێناوە. بۆ نموونە ئەو تێکستە مانیەی کە لەسەر قاپێک دۆزراوەتەوە (بڕوانە مانیەکان)، هەتاوەکو ئێستا نەخوێنراوەتەوە کە ڕەنگە، خوێندنەوە یان تەنانەت خستنە ڕووی ئەو تێکستە و بەراوردکردنی لەگەڵ تێکستی نەتەوە کۆنەکانی تردا، زۆر لایەنی قۆناغەکانی گۆڕین لە ئەلفوبێی کوردیدا بخاتە ڕوو.

هەردوو لێکۆڵەری شارەزای زمانە کۆنەکانی فارسی کۆن و ئیلامی، دیاکۆنۆف (Diakonoff) و گێرشێڤیچ (Gershevitch) پێیان وایە کە ئەو ئەلفوبێیەی فارسی کۆنی پێ نووسراوە، لە بنەچەدا ئەلفوبێی میدەکان بووە و فارسەکان دەستکاریان کردووە و زمانی خۆیان پێ نووسیوە (Panaino & Circassia, 2006, p.79, 80). واتە زمانەکە هەرچەندە فارسی کۆن بووە، بەڵام ئەلفوبێکە میدی بووە (بڕوانە وێنەی ١٩). ئەم بۆچوونەش بۆچوونێکی دروستە لەبەر ئەوەی کە فارسەکان زۆربەی هەڵسوکەوت و جلوبەرگیان هەر لە میدەکانەوە وەرگرتووە و وەک نەتەوەیەکی تازە و بچووک زەحمەتە ئەلف و بێی خۆیان هەبووبێت.

(وێنەی ١٩) ئەو ئەلف و بێیەی کە فارسی کۆنی پێ نووسراوە بەڵام لە بنەچەدا میدی بووە.

بەڵگەیەکی تری سەردەمی ئیسلامی لە ئارادایە سەبارەت بە ئەلفوبێی کوردی کە هەندێک لایەنی زمانی کوردی دەخاتە ڕوو. ئەم بەڵگەیە ڕاستی دێرینی ئەلفوبێی نووسینی کوردی و بە ڕەچەڵەک سۆمەری بوونی دەسەلەمێنێت و پەیوەندی بە ئەلفوبێی میدیەوە دەخاتە ڕوو.

بەڵگەکە بریتیە لە کتێبێک کە ئیبن وەحشیە (ابن الوحشية) لە ٨٥٦ ی زایندا نووسیویەتی بە ناونیشانی (شوق المستهام في معرفة رموز الاقلام). وەحشیە نزیکەی هەزار و سەد و پەنجا و شەش ساڵ لەمەوبەر

هەستاوە بە کۆکردنەوەی ئەلف و بێی زمانی هەموو میللەتە کۆنەکانی وەک فیرعەونی، کوردی، کلدانی، نەباتی، یۆنانی، هتد. لەو کتێبەدا. بۆ ئەوەی کە، وەکو خۆی دەڵێت "لە فەوتان بیانپارێزێت". ئەوەی کە جێگای سەرنجە لە سەرەتای نوسینەکەیدا وا باس لە کتێبەکەی دەکات کە مەبەست لە لێی ئەوەیە کە جۆری نووسینی قەومە کۆنەکان کۆ بکاتەوە و دەڵێت "ئامانجم کۆکردنەوە و ڕوونکردنەوەی ئەلفوبێکانە کە لەلایەن دەسەڵاتداری نەتەوە کۆنەکانەوە بەکارهاتووە. کە حەکیم و فەیلەسوفە بەتواناکان بۆ نووسینی کتێب و زانستیەکانیان بە بەکاریان هێناوە، بۆ ئەوەی ئەوانەی بە دوای زانست و زانیاری و نهێنیە خوداییەکاندا دەگەڕێن، بتوانن سوودی لێ وەربگرن، بۆ ئەو مەبەستە ئەلفوبێکان وەک شێوە کۆنەکانیان لەم کتێبەدا دانراون" (Bin Wahshih, 1806, p.1). بەو جۆرە ئیبن وەحشیە نزیکی هەزار و سەد و پەنجا و شەش ساڵ لەمەو بەر، لە کتێبەکەیدا ئەلفوبێی کوردی وەکو یەکێک لە ئەلفوبێ کۆنەکان لەقەڵەم داوە. ئەو نوسەرە دەڵێت پیتە کوردیەکان ژمارەیان بریتیە لە ٣٧ پیت (بڕوانە وێنەی ٢٠).
دەبینرێت کە نوسەر بەرامبەر ٣٠ پیتی کوردی، پیتی عەرەبی داناوە، بەڵام حەوتیانی بەجێهێشتووە لەبەر ئەوەی کە پێی وابووە هاوشێوەی ئەو پیتە کوردیانە لە هیچ نووسینێکی تری جیهاندا نیە. بۆیە نەیتوانیوە پیتیان بەرامبەر دابنێت. لە ئاماژە بە ئەلفوبێی کوردیدا دەڵێت "یەکێک لە ئەلفوبێ کۆنەکانی ترە کە کۆمەڵێک پیتی زیاتری لە پیتە ستانداردەکان هەیە و کوردەکان دەڵێن ئەمە ئەو ئەلفوبێیەیە کە بینوشاد و ماسی سورەتی کتێبەکانیان پێ نووسیوە، ئەو دوانە هەموو زانست و هونەر و کتێبەکانیان بەم ئەلفوبێیە نووسیوە، ئەمەش وێنەی ئەلفوبێیەکەیە کە دەیبینیت. ئەو پیتانەی کە ماونەتەوە هیچ وشە یان هاوشێوەیم لە زمانی تردا نەبینیوە. ئەمە یەکێکە لە ئەلفوبێ سەرسوڕێنەرەکان و وێنە سەیرەکان. من لە بەغدا سی [٣٠] کتێبم بینی کە بەو ئەلفوبێیە نووسرابوون، لە شام دوو کتێبم لەوانە لەلا بوو، کتێبێکیان سەبارەت ڕواندنی مێو و دار خورما و کتێبێکەی تریان سەبارەت بە کێشەکانی ئاو و چۆنێتی دەرهێنانی بوو لە ناوچە نەناسراوەکاندا. من ئەو کتێبانەم لە زمانی کوردیەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی بۆ ئەوەی کە مرۆڤایەتی سوودی لێ ببینێت. بەهۆی ئەوەوە نەمتوانی زووتر ئەم کتێبە تەواو بکەم"( Bin .(Wahshih,1806, p.134,135

ا ب ج د ه و ز ح ط
ي ك ل م ن س ع ف ص
ق ر ش ت ث خ ذ ض ظ
ع پ چ

(وێنەی ٢٠) ئەلف و بێی کوردی کە ئیبن وەحشیە ئاماژەی پێ کردووە.

ئەوەی کە مایەی سەرنجە، دوای ئەوەی کە ئەلفوبێی هەموو زمانە ناسراوەکانی ئەو سەردەمەی خستۆتە ڕوو، ئیبن وەحشیە تەنها سەبارەت بە ئەلفوبێی کوردی دەڵێت " کۆمەڵێک پیتی زیاتری لە پیتە ستانداردەکان هەیە". هەروەها سەبارەت بەو ٧ پیتەی کە جودای کردۆتەوە و پیتی بەرامبەر دانەناوە دەڵێت "ئەو پیتانەی کە دەمێنێتەوە هیچ دەنگێک یان پیتێکیمان بۆ نەدۆزیەوە و لە ئەلفوبێ سەیرەکانە" ( Bin Wahshih, 1806, p.134,135). بەپێی لێکدانەوەکەی ئیبن وەحشیە، نوسینی کوردی ئەو سەردەمە لە ئەلفوبێ سەیرەکانە، لەبەر ئەوەی کە 37 پیتی هەیە، جا ئەگەرسەرنجی ئەلفوبێ میدیەکە بدرێت، دەبینرێت کە ئەویش 36 پیتە، واتە لەو ڕووەوە هاوبەشە لەگەڵ ئەو ئەلفوبێ کوردییەی کە ئیبن وەحشیە ئاماژەی پێ

دەکات. دەبینرێت ئیبن وەحشیە کە شارەزای هەموو ئەلفوبێکانی ئەو سەردەمە بووە و پێی وابووە ئەلفوبێی کوردی پیتی لە هەموو زمانەکانی تر زیاترە، کەچی ژمارەی پیتە کوردیەکان لەگەڵ ئەلفوبێی میدیدا یەک دەگرێتەوە. هەروەها لە هەمان کتێبدا جۆرێک لە ئەلف و بێی فارسی هەیە کەچی دەبینرێت ژمارەیان تەنها ٢٨ پیتە. ئەوە دیسان ئەو راستیە دەسەلمێنێت کە ئەو ئەلف و بێیەی فارسی کۆنی پێ نووسراوە زیاتر ئەگەری ئەوەی هەیە میدی و کوردی بێت و فارس بەکاری هێنابێت. لەبەر ئەوەی کە لە سەدەی نۆهەمدا ئەلف و بێی کوردی ژمارەی پیتەکانی بە نزیکی وەک میدیە بەڵام لە فارسیدا هەشت پیتی کەمکردووە. هەروەها ڕوونکردنەوەی کوردەکان خۆیان، سەبارەت دێرینی بنەچەی کورد و ئەلفوبێی و سۆمەری بوونی زمانی کوردی دەسەلمێنێت (بڕوانە سۆمەریەکان).

ئەلف و بێیەکی تری کوردی هەیە کە تێکستە ئێزیدیەکانی پێ نووسراوە (بڕوانە وێنەی ٢١). ئەم ئەلفوبێیە لە ڕووی شێوەوە سادەترە و وا خۆی دەنوێنێت کە لە ئەلفوبێ کوردیەکەی کە ئیبن وەحشیە باسی دەکات نوێتر بێت. لەبەر ئەوەی کە شێوەی پیتەکانی زۆر سادە و ساکارترە و زیاتر لە پیتی نوێی ئەم سەردەمە دەکات. وا دەردەکەوێت کە ئەلفوبێی ئێزدیەکان قۆناغێکی نوێتری ئەلفوبێی کوردی بێت. ئەم ئەلفوبێیە تەنها دوو تێکستی لێ دۆزراوەتەوە کە هەردوو کتێبی پیرۆزی (جیلوە) و (مەسحافا ڕەش) ی پی نووسراوە[103]. ئەوەی کە مایەی سەرنجە ئەلف و بێی کوردی ئێزدیەکان کە هەتاوەکو سەردەمی نوێ تێکستی کوردی ئاینی ئێزدی پێ نووسراوە، هەر بە هەمان شێوە ٣٤ پیتە کە دیسان ئەویش تەنها دوو پیتی لە ئەلف و بێ میدیەکە کەمترە. بەڵام بۆ نموونە زمانی ئارامی تەنها ٢٤ پیتە، کە لە ڕووی ژمارەوە جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ کوردیدا هەیە.

(وێنەی ٢١) ئەلف و بێی کوردی کە تێکستی پیرۆزی ئاینی ئێزدی پێ نووسراوە.

کتێبەکەی ئیبن وەحشیە تەم و گومان لەسەر ڕووی ڕاستیەکی تر ڕادەماڵێت، ئەوەی کە زمانی کوردی هەتاوەکو سەدەی نۆهەمی زاینی، زمانێک بووە زانست و ئاین و هونەری پێ نوسراوە. جگە لەوەش لە کاتێکدا کە وەحشیە خۆی کلدانیە، ناوی تەواوی (احمد بن ابوبکر بن وحشية النبطي الكداني) بووە، بێ گومان وەک کلدانیەک گوتویەتی کە کوردەکان ئەو زانستانەیان لە کلدانیەکان وەرگرتووە، بەڵام دان بەوەدا دەنێت کە کورد ئەو زانستانەی لابووە و لەسەریانی نووسیوە و ئەویش دوو کتێبی زانستی کوردی تەرجومە

103. ڕاستە ئەلف و بێی کتێبە پیرۆزە ئێزدیەکان پێ ناچێت هێندەی ئەلف و بێکەی تر کۆن بێت، بەڵام بە دڵنیایی ئاینەکەیان یەکێکە لە هەرە کۆنترین ئاینەکانی ناوچەکە کە هەتاوەکو ئەمڕۆ ماوە. هەڵەیەکی گەورە دەبێت ئەگەر سەرەتای ئەو ئاینە بگەڕێنرێتەوە بۆ شێخ عادی هەکاری؛ ئاینەکە زۆر لە سەدەمی شێخ عادی کۆنترە. لێرەدا لەبەر دەرنەچوون لە بابەتەکە ناتوانرێت زیاتر ڕوونکردنەوە بدرێت.

کردۆتە سەر زمانی عەرەبی. هەروەها دانیش بەوەدا دەنێت کە کورد لە زانستی ڕوەک زانیدا لە کلدانیەکانیش بەتواناتر بووە. وەک لە بەشی سۆمەریەکاندا باسکرا، کوردەکان ئاشنای ڕابردووی سۆمەری خۆیان بوون و ئەوەی کە ئیبن وەحشیە سەبارەت بە بۆچوونی کوردەکان لەسەر خۆیان خستویەتیە ڕوو، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە کوردەکان ئەلفوبێی خۆیان بە تەواوکەری زمانی سۆمەری کۆن زانیوە.

(وێنەی ٢٢) بەرمیەک لە کتێبی ڕووەک (کتاب النبات) ی دینەوەری.

جگە لەوە ئیبن وەحشیە بە هەرەمەکی و لاوەکی نالێت کە کورد لە زانستی کشتوکاڵدا کارامە بووە، چونکە بەڵگەی تر هەیە کە پشتگیری ئەو بۆچوونە دەکات. دەبینرێت کە یەکێک لە کۆنترین کتێب کە لە سەدەی نۆهەمی زایندا سەبارەت ڕووەک زانی نوسرابێت، لەلایەن زانایەکی کوردەوە نووسراوە بە ناوی ئەبو حەنیفەی دینەوەری[104] (٨١٥ز- ٨٩٥ز) (Izady,1992, p.41). دینەوەری چەندین کتێبی هەبووە، یەکێکیان سەبارەت بە مێژووی کورد، بە ناوی «انساب الاکراد[105]» (ڕەگەزەکانی کورد) کە کۆنترین کتێبە لە مێژوودا ناوی هاتبێت و لەسەر ڕەچەڵەکی کورد نووسرابێت. ئەم نوسەرە کتێبێکی تریشی سەبارەت بە ڕووەک زانی نووسیوە بە ناوی (کتاب النبات) (Abivardi, 2001, p.472) (بڕوانە وێنەی ٢٢). جێگەی داخە کە ژمارەیەکی کەم لە کتێبەکانی ماون بەڵام چەندین سەرچاوە ئاماژەیان پێ کردووە وەکو یەکێک لە زانا گەورەکانی سەردەمی خۆی. شایانی باسە باشترین و دێرنترین کتێب، سەبارەت بە میکانیکی ئاو و مامەڵەکردن لەگەڵ ئاودا، لەلایەن ئەلجەزیریەوە (١١٣٦ز-١٢٠٦ز) نوسراوە لە ژێر ناوی

[104]. ئەبو حەنفەی دینەوەری (٨٢٨ ز-٨٩٦ز): ناوی تەواوی ئەبو حەنیفە ئەحمەد کوڕی داودی کوڕی وەنەندی دینەوەری بووە. چەند کەسایەتیەکی تری دینەوەری هەن کە هەموویان هەمان نازناوی دینەوەری بەکاردەهێنن. ئەبو حەنیفە خەڵکی دینەوەرە کە لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا شارێکی زۆر دەولەمەند بووە و جێگەی زانست و زانین بووە. ئەم شارە زۆر جار لە شیعرە کوردیەکانی یارسانەکاندا باس دەکرێت و لە سەردەمێکدا شارێکی گرنگی کوردستان بووە و سەنتەرێکی ئاینی کوردی بووە. ئەمڕۆ ئەم شارە شتێکی ئەوتۆی لێ بەجێ نەماوە و شوێنەکەی دەکەوێتە نێوان کرماشان و هەمەدانەوە. ئەبو حەنیفە مێژوونوس، ڕووەکناس، ئەستێرەناس، جوگرافیناس، ماتماتیکی و زمانەوان بووە. ئەم زانایە کاریگەری زۆری لەسەر زاناکانی سەردەمی خۆی هەبووە و تواناکانی بێ وێنەبوون؛ کتێبی سەبارەت هەموو لایەنێکی زانستی داناوە. خاوەنی شانزە کتێب بووە لە زانستی جیاوازدا. یەکەم کەس بووە کە هەتاوەکو ئەمڕۆ لە مێژوودا باسکرا بێت. بە داخەوە زۆربەی کتێبەکانی تری فەوتاون جگە لە دووانیان کە یەکێکیان سەبارەت مێژووە بە ناونیشانی (اخبار الطوال) و ئەوەی تریان بەشێک لە شەش بەشی "کتێبی ڕووەک" (کتاب النبات) ماوە و هەتاوەکو ئەمڕۆ کتێبەکەی بە ناوی"ڕەچەڵەکەکانی کورد" (انساب الاکراد) لەگەڵ هەموو کارەکانی تری بزرن.

[105]. ئەم کتێبە لە سەرچاوەکاندا ئاماژەی پێ کراوە. بەڵام هەتاوەکو ئەمڕۆ نەدۆزراوەتەوە و دەرکەوتنی ئەو کتێبە لەوانەیە زۆر ڕووی ڕابردووی کورد و کوردستان ڕوون بکاتەوە.

(*کتاب* الجامع *بين العلم* والعمل النافع في صناعة الحيل). جەزیری کوردێکی خەڵکی ناوچەی جەزیرە بووە، کۆمەڵێک دیزاینی ئامرازی میکانیکی ئاوی لە کتێبەکەیدا داناوە، کە جێی سەرسوڕمانن و هەتاوەکو ئێستا بە کۆنترین کتێب دادەنرێت کە لە سەر ئەو زانستە نووسرابێت (بڕوانە وێنەی ٢٣). هەروەها ئەگەر سەیری کتێبەکەی ئیبن مستەوفی بکرێت سەبارەت بە مێژووی شاری هەولێر (تاريخ اربل)، ئەوا زۆر ڕووی دەوڵەمەندی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری ئەو سەردەمەی هەولێر کە تەنها یەک شاری کوردستانە، دەخاتە ڕوو.

(وێنەی ٢٣) پەڕەیەک لە کتێبی (کتاب الجامع بين العلم والعمل النافع في صناعة الحيل) ی ئەلجەزیری کورد.

بەڵگەنامە مێژووییەکەی ئیبن وەحشیە و پیتە میدیەکان ئەو ڕاستیە دەخەنە ڕوو کە نووسین بە زمانی کوردی لە دوای سۆمەری، هوری و کاسیەکانەوە هەر بەردەوام بووە. نووسین لە خەتی شێوەییەوە، لە کوردیدا، هاتۆتە سەر نووسینی پیت، هەر وەک لە پیتە میدیەکان و ئەلف و بێی سەدەی نۆهەمی زاینیدا دەردەکەوێت. بەداخەوە، هەرچەندە کە ئیبن وەحشیە بەڕوونی ئاماژە بە چەندین کتێبی کوردی دەکات و باس لەوە دەکات کە کوردەکان بەو زمانە زۆربەی زانستیان نووسیوە، بەڵام هەتا ئێستا هیچ کام لە تێکستە کوردیەکان لە سەردەمی میدەکانەوە نەدۆزراونەتەوە. دەنا ئەگەر تەنها ئیبن وەحشیە لە بەغداد دا ٣٠ کتێبی بینیبێت، دەبێت لە بەغداد و ناوچەکانی تری کوردستاندا بە هەزاران کتێب هەبووبێت.

جێی داخە تێکستی کۆنی کوردی کە بە ئەلف و بێی کوردی نووسرابێت، جگە لەو تێکستانەی کە پێشتر ئاماژەیان پێکرا، ئەمڕۆ هیچیان لەبەردەستدا نیە. سەرەڕای ئەوەی کە وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا چەندین کتێبی زانستی هەبووە کە بە کوردی نووسراون بەڵام بەداخەوە هیچیان نەماون. ئەم حاڵەتە تووشی زمانی فارسیش بووە، لە دوای تێکستە سەرەتاییەکانی فارسی کۆن، تێکستێک هەتاوەکو سەدەی نۆهەمی زاینی نەدۆزراوەتەوە کە بە فارسی دابنرێت و نووسرابێت. بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە پەهلەوی تەواوکەری زمانی فارسی نیە، بۆیە زمانی فارسیش بە هەمان کێشەی زمانی کوردیدا ڕۆیشتووە.

وەک ڕوونکرایەوە تێکستی کوردی زۆر بوون و زانست و هونەر بەو زمانە لە رابردودا نوسراوە، بە داخەوە زۆربەی تێکستە کوردیەکان بزربوون. دوای هاتنی ئیسلام وورده وورده زمانی عەرەبی وەک زمانی چینی دەسەڵات بووەتە ئامرازی پەیوەندی بە زۆرترین خەڵکەوە، هاوشێوەی ئینگلیزی ئەمڕۆ زۆربەی نەتەوەکان بە عەرەبی نووسیویانە بەڵام بە دڵنیایی کورد وازی لە زمانەکەی خۆی نەهێناوە بۆ نووسین. بەڵکو کوردیش وورده وورده ئەو ئەلفوبێیەی وەرگرتوە و بە هەندێک دەستکاریەوە گونجاندویەتی لەگەڵ زمانی کوردیدا.

ئەم ئەلفوبێ نوێیە، زۆر تێکستی کوردی پێ نووسراوە و خۆشبەختانە بەهۆی پەیڕەوانی ئاینی یارسانەوە، ژمارەیەکی باش لە شیعرە کوردیەکان لە دوای سەدەی هەشتەمی زاینیەوە پارێزراون. بۆیە زۆربەی ئەو شیعرانەی کە ماونەتەوە ئاینی و عیرفانین.
بۆ نموونە باڵولی ماهی[106] کە لەسەدەی هەشتەم و نۆهەمی زاییندا ژیاوە، کۆمەڵێک شیعری لێ بەجێماوە کە زۆربەیان ئاینین و پەیوەندیان بە ئاینی یارسانەوە هەیە یان بابە تاهیری هەمەدانی کە ئەویش هەر بە کەسایەتیەکی گرنگی یارسانەکان دەژمێردرێت، کۆمەڵێک شیعری ئاینی زۆر نایابی ماوە. ئەوەی کە جێگای سەرسوڕمانە، هەندێک سەرچاوەی ئەوروپی و تەنانەت کوردیش، پێیان وایە کە کۆنترین تێکستی کرمانجی خوارو (سۆرانی) تەمەنی لە نێوان دووسەد بۆ سێ سەد ساڵە، کەچی بە دەیان شیعری کرمانجی خوارو هەن کە لە سەدەکانی دوانزە و سیانزەدا بە زمانێکی زۆر پاراوی ڕوون و بە کرمانجی خوارو (سۆرانی) لە شارەزوور نووسراون (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٣٦٢-٣٧٤).
ئەمڕۆ بەداخەوە بەڵگەیەکی یەکلا کەرەوە لەبەردەستدا نیە کە وردەکاری و پرۆسەی وازهێنان لە ئەلفوبێی کۆنەوە بۆ بەکارهێنانی ئەلفوبێی عەرەبی، دەربخات. ئەمڕۆ بە هەزاران شیعر بە زاراوەی گۆران و کرمانجی خوارو (سۆرانی) و سەرو بەجێ ماون.

## پەیوەندی زمان و هەندێک لایەنی فەرهەنگی نێوان کوردی و فارسی

هۆی تیشک خستنە سەر پەیوەندی نێوان زمانی فارسی لەگەڵ زمانی کوردیدا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لە زۆر لایەنەوە مێژووی کوردستان و زمانی کوردی لە ژێر ناوی نەتەوەی فارس و زمانی فارسیدا بزر کراوە. بێگومان هۆکارەکانی ئەم دیاردەیە جیاواز و جۆراوجۆرن (بڕوانە کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان). تێگەیشتن لە بنەچە و گۆڕانکاریەکانی زمانی فارسی هەندێک تەم لەسەر لایەنی مێژوویی لا دەبات و بۆچوونە هەڵەکان کەمێک ڕاست دەکاتەوە.
ئاشکرایە کە پەیوەندیەکی پتەو لە نێوانی زمانی فارسی نوێ و کوردیدا هەیە. ئەم پەیوەندیە تەنها بەو دوو زمانە تایبەت نیە، بەڵکو لە نێوان زۆر زمانی دراوسێی جیهاندا هەیە. هەمان جۆرە پەیوەندی لە نێوان ئیسپانی- پۆرتوگالی، هۆڵەندی- ئەڵمانی، سربی- کرواتی، هتد. دا، هەیە و بە پلەی جیاواز بەدی دەکرێت.

---

[106]. باڵولی ماهی لە بنەڕەتدا خەڵکی دینەوەر بووە و ئەو سەردەمە بەو شارە گووتراوە (ماه الکوفة)، لەبەر ئەوەی باجی دینەوەر دەدرا بە موسوڵمانە تازە هاتووەکانی کوفە و (ماه الکوفة) مانای (میدیای کوفە) دەدات (بڕوانە میدەکان). بۆیە هەندێک سەرچاوە بە هەڵە وا دەزانن کە باڵولی ماهی خەڵکی کوفە بووە. بەپێی کاکاردایی کە یەکێک لە نوسەرانی سەدەی هەشتەمی زاینی یارسانەکان بووە، باڵول خەڵکی دینەوەر بووە (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٤٨). ئەم زانا کوردە کەسایەتیەکی ئاینی و عیرفانی بووە و لە سەردەمی هارونە رەشیدا لە ژیاندا بووە. لەبەر ئەوەی بۆچوونە ئاینیەکانی خۆی بە ئاشکرا خستۆتە ڕوو، هارونە ڕەشید فەرمانی کوشتنی داوە. ئەویش ڕاوێژکاری بە ئیمام جەعفەری سادق دەکات، ئیمام جەعفەر ئامۆژگاری دەکات کە خۆی بکاتە شێت. باڵول خۆی دەکاتە شێت بۆ ئەوەی نەکوژرێت. باڵول لە شیعرێکدا ئاماژەی بەو ڕاستیە کردووە و دەڵێت:
دێوانەی زایر، دێوانەی زایر دانای یارانم دێوانەی زایر
زایر و عەبەس کەفتەن نەبابر ڕەجەبم نەسیم، لۆرەمەن تایر
واتە (بە ڕواڵەت شێتم و زانام بۆ یارانم و هەر لە ڕواڵەتدا کەوتومەتە دەشت و کێوان، بەڵام لە ڕاستیدا زانای یارانم و ڕێنماییان ئەکەم، ڕەجەبم بای شەماڵە بۆ دۆستان و لۆرەیشم ئاگرە) (بۆرکەیی، ١٩٩٦، پ.٤٨،٤٧). باڵول چەند شیعرێکی کوردی لێ بەجێماوە و قسە و چیرۆکەکانی وەک داستان هەتاوەکو ئەمڕۆ لە ناو کورد و نەتەوەکانی وەک عەرەب و فارسدا دەگێڕدرێتەوە. نووسەری ئەم کتێبە لە منداڵیدا دایکی یەکێک لە بەسەرهاتەکانی باڵولی بۆ گێراوەتەوە و چیرۆکەکە دەڵێت "ڕۆژێکیان باڵول دەیەوێت بچێتە دیوەخانی خانەدانێکەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی جلەکانی شڕە، هەر لەبەر دەرگاکەوە دەڵێن بڕۆ و ڕێی پێ نادەن کە بچێتە ژوورەوە. دوایی باڵول دەچێت کەوایەکی نوێ دەکاتە بەری و دەچێتەوە هەمان دیوەخان، دەستبەجێ دەکرێتە ژوورەوە و دەخرێتە لای سەرووی خوانەکەوە. کە دەست دەکرێت بە نانخواردن، باڵول دەڵێت "کەوا نان بخۆ، کەوا نان بخۆ"، خەڵکەکەش دەڵێن کاکە گیان تۆ بۆ بە کەواکەت دەڵێیت نان بخۆ، ئەویش دەڵێت "ئەم نان خواردنە لە سایەی کەواکەمەوەیە و بەو دراوە".

بە سەدان وشەی هاوبەش لە نێوان پورتوگالی و ئیسپانیدا هەن کە نوسینەکەیان کتومت وەک یەکە.
پرسیارەکە ئەوەیە ئایا لە رابردووی دووردا فارسی و کوردی هێندە نزیک بوون؟
لێکۆڵینەوە لەسەر زمانی فارسی کارێکی زۆر گرانە، لەبەر ئەوەی کە پێناسەکردنی ئەوەی کە کام زمانە فارسیە و کامە فارسی نیە دەبێتە کێشە. دەبینرێت کە لێکۆڵەرەکان مێژووی زمانی فارسیان دابەش کردوە بەسەر سێ قۆناغدا و هەر قۆناغە و ناوێکیان بۆ داناوە:

١- فارسی کۆن (Old Persian) (ئەو فارسیەی کە لەسەر بەردەکان نووسراون)
٢- فارسی ناوەند (Middle Persian) (ناوێکی ترە بۆ زمانی بەهلەوی)
٣- فارسی نوێ (Modern Persian) (ئەو فارسیەی کە ئەمڕۆ قسەی پێ دەکرێت)

لە کاتێکدا کە بەڵگەی دانانی زمانی فارسی کۆن بە زمانی فارسەکان ناشکرایە، بەڵام ئەو زمانەی کە ئەمڕۆ زمانەوانەکان پێی دەڵێن فارسی ناوەند یان زمانی پەهلەوی (Pahlavi)، زمانی نەتەوەی فارس نەبووە و زۆربەی مێژوو نوسان لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەوە زمانی میللەتی ئەشکانیەکان (Parthian) بووە (Mueller, 1990, (P.xii). هەڵبەت ئەشکانیەکانیش گەلێکی جیاواز بوون بە هەمان شێوەی جیاوازی کورد و فارس.

سەنتەری ناوچەی ژیانی ئەشکانیەکان باکوری خۆرهەڵاتی ئێرانی ئەمڕۆ و ناوچەکەیان جیاواز بووە لە ناوچەی ژیانی میللەتی فارس کە کەوتۆتە سەر کەنداو. ئەشکانیەکان بۆ خۆیان گەلێکی جیاواز بوون لە فارس و زمانەکەیان سەردەمێک زمانی نووسینی ناوچەکە بووە. زمانی پەهلەوی پەیوەندی بە زمانی کوردی، فارسی، ئەفغانی، بەلوجی، هتد هەیە، بەڵام هیچ کام لەو زمانانە نیە. ئیبنو لنەدیم (ابن الندیم) لە سەدەی دەیەمی زاییندا و لە کتێبی (الفهرست) دا ڕوونی دەکاتەوە و بە تەواوی زمانەکانی پەهلە و فارس لەیەکتر جودا دەکاتەوە و وەک دوو زمانی جیاواز مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، بۆیە دەڵێت "بەڵام پەهلەوی دەگەڕێتەوە بۆ پەهلە، کە ناوێکە دراوە بە پێنج وڵات کە بریتین لە ئەسفەهان و رەی و هەمەدان و ماهی نەهاوند و ئازەربایجان" هەروەها لە باسی چەند زمانێکی تری خەڵکی ناوچەکە وەک، دەری، خودی، بەردەوام دەبێت و دەڵێت "بەڵام فارسی، زاناکان و هاوشێوەکانیان قسەی پێ دەکەن و زمانی خەڵکی ناوچەی فارسە) (ابن الندیم، ٢٠١٠، پ.١٥). هەروەها ئەستەخری لە سەدەی دەهەمی زاییندا باشتر ئەو بابەتەی ڕوونکردۆتەوە و پەیوەندی فارسی و پەهلەوی لە کتێبەکەیدا باسکردووە و لە ئاماژە بە فارسەکاندا دەڵێت "هەموو خەڵکی ناوچەی فارس بە یەک زمان قسە دەکەن و لە یەکتری تێدەگەن، تەنها هەندێک جیاوازی نەبێت کە لە هەموویاندا یەکناگرێتەوە. زمانی نووسینیان کە عەجەم پێی نوسیوە و بۆ نامە گۆڕینەوەی مەجوسەکان بەکارهاتووە، ئەو زمانە زمانی پەهلەویە کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە بۆ ئەوەی کە فارسەکان لێی تێ بگەن و زمانی عەرەبی زمانی نامە گۆڕینەوەی سوڵتانەکان و دیوانەکان و خەڵکە گشتی و میرەکانیانە" (الاصطخري، ٢٠١٠، پ. ١/٥٠). ئیبن ئەسیر بابەتەکە بە تەواوی یەکلادەکاتەوە و لە باسکردنی فارسەکاندا دەڵێت "خەڵکانی تر کە شارەزان بە دەنگوباسی فارسەکان دەڵێن: دوای ئەسکەندەر وڵاتی فارسەکان لەلایەن پاشای بێگانەوە حوکم کراوە کە گوێڕایەڵی پاشای وڵاتی شاخ بوون، ئەوانیش ئەشکانیەکان بوون کە دەڵێن حوکمرانی نەتەوەکانیان دەکرد" (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ.٩٨).
وەک ڕوون دەبێتەوە زمانی پەهلەوی هاوشێوەی زمانی عەرەبی، زمانی نەتەوەیەکی ترە و فارس وەک زمانی نووسین بەکاریان هێناوە و جیاوازە لە زمانی خۆیان و باش لێی تێ نەگەیشتوون. نەک ئەوە بەڵکو لەلایەن ئیبن ئەسیرەوە بە ڕوونیش ئەشکانیەکان کە بە زمانی پەهلەوی قسەیان کردووە، بە نەتەوەیەکی جیاواز دانراون. لە سەرچاوە دێرینەکانی سەرەتای ئاینی کریستیاندا چەندین جار ئاماژە کراوە بە جەنگی نێوان فارس و ئەشکانیەکان و وەک دوو نەتەوەی جیاواز و دوو کیانی جیاواز مامەڵەیان لەگەڵدا کراوە ((Karwerau and Kroll, 1985, p.16 and 17).

وەک لە جێگای تری ئەم کتێبەدا باسکرا، مێژوونوسەکانی ناوچەکە وردتر لە ڕۆمان و یۆنانیەکان سەیری هەندێک جیاوازی نەتەوەکانیان کردوە. لە ڕوونکردنەوەکەی ئیبن ئەلنەدیم دا سەبارەت بەو دوو زمانە دەبینرێت لە کاتێکدا کە زمانی پەهلەوی و نەتەوەی پەهلەوی هەبووە، لە هەمان کاتیشدا زمان و نەتەوەی

فارسیش هەبووە، کەواتە چۆن ئەمڕۆ ئەم دوو زمانە بە یەک زمان دابنرێن و چۆن تەواوکەری یەکتر بن؟ بە دڵنیاییی ئەم تێکەڵکردنە بەربەستێکە لەبەردەم تێگەیشتن لە زمانەکانی ناوچەکە و مێژووەکەیان.

بنەچەی زمانی فارسی ڕوونە و نەبوونی تێکستی فارسی لە دوای فارسیە کۆنەکە، ماف بە کەس نادات کە زمانێکی تر بە ڕابووردوی زمانی فارسی لە قەڵەم بدات و ئەستەخری بە تەواوی ڕوونی دەکاتەوە کە زمانی فارسی لەو سەردەمەدا وەک زمانی نووسین بەکار نەهاتووە و فارسەکان زمانی پەهلەوی و عەرەبیان وەک دوو زمانی نووسین بەکارهێناوە .

ئەگەر واز لە زمانی پەهلەوی بهێنرێت و پێش ئەوەی کە پەیوەندی نێوان کوردی و فارسی نوێ سەیر بکرێت، پێویست دەکات کە بزانرێت زمانی فارسی نوێ خۆی لە کوێوە هاتووە؟ ئەوەی ئەم کارە ئاسان دەکات ئەوەیە کە تێکستی فارسی کۆن لە بەردەستدایە کە تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ٢٥٠٠ ساڵ. ئەم تێسکتانەش لە چەند شوێنێکی ناوچەی فارس و هەمەدان و بێستون و چەند شوێنێکی تر بەجێماون. ئەمەی خوارەوە نموونەی کۆنترین زمانی فارسیە:

θātiy Dārayavauš xšāyaθiya tuvam kā xšāyaθiya hya aparam āhy hacā draugā daršam patipayauvā martiya hya draujana ahatiy avam ufraštam parsā yadiy avaθā (Harvey, Lehmann and Slocum, 2011).maniyāhaiy dahyāušmaiy duruvā ahatiy

ئەگەر بە پیتی کوردی بنووسرێت، دەبێتە:

ثاتیێ دارەیەڤەوش خشایەثیە توڤەم کا خشایەثیە هیە ئەپەرەم ئاهی هاکا درەوگا دەرشەم پەتیپەیەوڤا مەرتیە هیە درەوجەنە ئەهەتیێ ئەڤەم ئوفرەشتەم پەرسە یەدیێ ئەڤەثا مەنیاهەیێ دەهیاوشمەیێ دوروڤا ئەهەتیێ.

تەرجومەکەی دەبێتە:

داریوشی شا ڕایدەگەیەنێت: تۆ کە دوایی دەبیتە پاشا، خۆت بە تەواوی لە درۆ بپارێزە. ئەو پیاوەی کە دوای درۆ دەکەوێت، سزای چاکی بدە، ئەگەر ئاوا بیر بکەیتەوە: "دە با مەملەتەکەم پارێزراو بێت" (Harvey, Lehmann and Slocum, 2011).

مانای وشەکان بە تەنها دەبنە:

θātiy ثاتیێ: قسە دەکات، دەڵێت، ڕایدەگەیەنێت
Dārayavauš دارەیەڤەوش: داریوش
xšāyaθiya خشایەثیا: پاشا/شا
tuvam توڤەم: تۆ
kā کا: (ئامرازە)
hya هێیە: ئەوەی
aparam ئەپەرەم: دوایی
āhy ئاهی: دەبێت
hacā هاچا: لە، لێوەی
draugā دراوگا: لە درۆوە
daršam دەرشەم: بە تەواوی
patipayauvā پەتیپەیەوڤا: خۆت بپارێزە
martiya مەرتیە: پیاوەکە
hya هیە: ئەوەی
draujana درەوجەنە: ئەوانەی بە دوای درۆومن
ahatiy ئەهەتیێ: دەبێت
avam ئەڤەم: ئەو
ufraštam ئوفرەشتام: باش
parsā پەرسا: سزا
yadiy یەدیێ: ئەگەر

avaθā ئەڤەثا: بەوجۆرە
maniyāhaiy مەنیاهەیێ: تۆ وا بۆی دەچیت
dahyāušmaiy دەهیەوشمەیێ: مەملەکەتەکەم
duruvā درۆڤا: پارێزراو
ahatiy ئەهەتیێ: با ببێت
ئەم زمانە کۆنترین زمانە کە بە فارسی لە قەڵەم بدرێت و بە سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە و زۆر لایەنی ڕێزمانی و وشەکاری ڕوون کراوەتەوە. لە ووردبوونەوە لە زمانی فارسی کۆندا کۆمەڵێک تایبەتمەندی بەدی دەکرێن کە جێی سەرنجن. لە فارسی کۆندا نێر و مێ و بێ لایەن (natural)) هەیە و سیستەمێکی ئاڵۆزی جێندەری هەبووە ، ئەمڕۆ زمانی فارسی نوێ بە تەواوی وازی لێ هێناوە. لە فارسی کۆندا سیستەمێکی ئاڵۆزی کۆ (جەمع) هەبووە، ئەوان (تاک، جووت، کۆ) یان هەبووە، دیسان ئەمەشیان لە فارسی نوێدا بە تەواوی گۆڕاوە و سیستەمێکی زۆر سادەی بەکۆکردن هەیە. لە هەردوو لایەنی ڕێزمانی جێندەر و کۆدا فارسی کۆن زۆر کاراکتەری سانسکریتی تێدا دەردەکەوێت. بەڵام ئەوەی مایەی سەرنجە، فارسی نوێ لەو دوو ڕووەوە گۆڕاوە بە ئاراستەی زمانی سۆمەری/کوردیدا.
ئامرازی کۆ لە فارسی کۆندا بریتی بووە لە anam؛ لە فارسی نوێدا گۆڕاوە بە ئاراستەی زمانی میدی کە وەک کوردی نوێیە و بریتیە لە (ان) و نزیکە لە سۆمەری کە دەبێتە ene. ئەو ئامرازە هاوبەشە لە زمانەکانی سۆمەری/میدی/کوردیدا و لە وشەیەکی میدی وەک (ئەسپان ژیرە aspan-jira) دا ئەو ڕاستیە دەردەکەوێت. تەنانەت ئەو ئامرازە لە زمانی لیدیشدا هەر بریتی بووە لە (ان).
ئەم گۆڕانە لە فارسی کۆندا هەر لە ڕووی ڕێزمانیەوە ڕووی نەداوە، بەڵکو وشە فارسیەکانیشی گرتۆتەوە. لە بری (تۆ) ئەوان (توڤەم tuvam) یان بەکار هێناوە. لە فارسی کۆندا (شما) نەبووە کە ئێستاکە بەکاری دەهێنن. کەچی نزیکی هەزار ساڵ پێش فارسەکان و لە ناو کوردستاندا هیتیەکان sumes یان بەکارهێناوە بە مانای (ئێوە). ئەمڕۆ لە زاراوەی زازا و هەورامیدا ڕاناوی (شمە) هاوشێوەی هیتیەکان بۆ کەسی دووهەمی کۆ بەکار دەهێنرێت، بەڵام زمانی فارسی نوێ لە سەدەکانی نوێدا وەری گرتووە و وەک ڕاناوی ڕێزگرتن بۆکەسی دووهەمی تاک و کەسی دووهەمی کۆ، بەکاری دەهێنێت. هەروەها لە فارسی نوێدا (تۆ) ش بەکار دەهێنرێت تەنها بۆ ڕاناوی کەسی دووهەمی تاک.
ژمارە (یەک) نزیکی هەزار ساڵ پێش فارسی کۆن لە ناو میتانیەکاندا بەشێوەی aika بەکارهاتووە و زمانەکەیان هەر تەواوکەری زمانی کوردی ئەمڕۆ بووە (بڕوانە هیتیەکان)، هەروەها چەند هەزار ساڵێکیش پێش میتانیەکان لە ناو سۆمەریەکاندا بە (یەکە) گووتراوە iku، کەچی لە فارسی کۆندا aiva بەکارهێنراوە. وشەی (نا) ی کوردی لە فارسی کۆندا بریتی بووە لە (naiy)، ئەم وشەیە لە ناو هوری و سۆمەریدا بریتی بووە لە nu و لە هیتیشدا بە دەگمەن بەکارهاتووە. کەواتە پێش فارسەکان لە کوردستاندا ئەو وشانە بەو شێوەیەی ئەمڕۆ بەکار هاتوە، بەڵام هەتاوەکو ٢٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە ناو فارسەکاندا جیاواز بووە. لە خشتەکەی داهاتوودا چەند وشەیەک خراوەتە ڕوو بۆ ڕوونکردنەوەی هەندێک لەو گۆڕانکاریە:

| فارسی کۆن | ماناکەی بە ئینگلیزی و کوردی | فارسی نوێ | کوردی نوێ | زمانە دێرینەکان | تێبینی |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەیڤەم aivam | یەک one | یک yak | ek/yak | aika میتانی iku سۆمەری | نزیکی سێ هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر لە ناو کوردستاندا میتانیەکان بەو ژمارەیە دەڵێن aika، و سۆمەریەکان بە (یەکە) دەڵێن iku، کەچی فارسی دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر پێی دەڵێت aivam و ئەمڕۆ فارس گۆڕیویەتی |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | | | | و وەک کوردی و میتانی لێ کردووە. |
| توڤا tuva | تۆ you (singular) | تو tu | تۆ/ته to/ta | za سۆمەری<br>ta هیتی<br>ti لوڤی | لە فارسی کۆندا تەنها (توڤا) هەبووە کە لە tvam ی سانسکریت نزیکە. بەڵام لە فارسی نوێدا گۆڕاوە بە (تو). کەچی هەر لە ناوچەکانی کوردستاندا نزیکی هەزار ساڵ پێش فارسی کۆن، لە لایەن هیتی و لوڤیەوە ئەو وشەیە وەک کوردی ئەمڕۆ بووە. |
| توڤا tuva | ئێوە you (singular) | شما šuma | شمه šima | sumes هیتی | دەبینرێت لە فارسی کۆندا وشەی (شما) نەبووە. بەڵام لە فارسی نوێدا هەیە، لە هەمان کاتدا لە زمانی هیتیدا نزیکی یەک هەزار ساڵ پێش فارسی کۆن هەبووە و لە هەر دوو زاراوەی زازا و هەورامیدا هەیە و شێوەی بەکارهێنانی لە هیتیدا وەک کوردیە، لەبەر ئەوەی کە لە کوردی و هیتیدا بە مانای (ئێوە) بەکار دێت، لە فارسیدا بە مانای (تۆ، ئێوە) بەکار دێت. |
| دان dān | ئەزانێ know | دان dān | زا/ زان za, zan | zu سۆمەری | لە فارسی کۆن و نوێشدا هەر جیاوازە لە سۆمەری و کوردی. لە زمانە هیندۆئەوروپیەکانی تردا، نزیکترە لە کوردی و سۆمەری وەک لە فارسی. بۆ نموونە scio لاتین، znati کرواتی، znaya بولگاری، znat′ ڕوسی و znać پۆڵۆنی. |
| داتا dātā | یاسا law | داد dād | dā/dād<br>دا/داد | di/did سۆمەری | لە کوردیدا بە هەردوو شێوە کۆنە سۆمەریەکەی ماوە. تێبینی دەکرێت لە فارسی کۆندا جیاواز بووە و ئێستاکە نزیکترە لە کوردی و سۆمەری. |
| naiy | نە، نا not | nah, nā | na, nā<br>نە، نا | nu سۆمەری | دەبینرێت لە فارسی کۆندا کەمتر نزیک بووە لە سۆمەریەوە و لە فارسی نوێدا نزیک بووەتەوە. |

ئەمانە هەمووی ئەوە دەسەلمێنن کە زمانی فارسی وازی لە زۆر ڕووی بنەڕەتی ڕێزمان و وشە هێناوە و ووردە ووردە هەتاوەکو سەدەکانی سێهەمی پێش زایین لە ژێر کاریگەری زمانی میدی/کوردی دا بووە. بە هەزاران وشەی لە زمانی کوردی وەرگرتووە و ڕێزمانەکەشی بەو ئاراستەیەدا گۆڕیوە. پاشان لە سەردەمی دەسەڵاتی ئەشکانیدا کەوتوتە ژێر کاریگەری زمانی پەهلەویەوە. دواییش کەوتوتە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبیەوە، بە شێوەیەک کە لە ڕووی وشەکاریەوە زیاتر لە نیوەی زمانی فارسی عەرەبیە. هەڵبەتە فارسیش کاریگەری هەیە لەسەر عەرەبی، بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر کەمتر. چونکە کاریگەری وشەکاری عەرەبی بە جۆرێکە کە هەندێک جار لە ڕستەیەکی فارسیدا، جگە لە ئامرازی پەیوەندی، هەموو وشەکان بە

گۆرانکاری ڕێزمانیشەوە هەر عەرەبین . بۆ نموونە ئەگەر بە فارسی بتەوێت بنووسیت (ڕێکخستنی خۆپیشاندان لە بەرژەوەندی نەتەوەیە) دەبێتە (تنظیم تظاهرات به منافع ملت است). دەبینرێت کە وشەکانی (تنظیم، تظاهرات، منافع، ملت) هەمووی عەرەبین و فارسەکان ئامرازی (ات) ی عەرەبیشیان وەرگرتووە و وشەی (منافع) یش لە حاڵەتی کۆی عەرەبیدا، وەک خۆی وەرگیراوە.
لەگەڵ ئەوەی کە زمانی فارسی لەژێر کاریگەری کوردیدا گۆڕانکاری زۆری بە خۆوە بینیوە ، بەڵام هێشتا هەر وەک زمانێکی جودا لە کوردی دەردەکەوێت. لە خوارەوە تەنها هەندێک وشە بە نموونە خراوەتە ڕوو بۆ دەرخستنی پەیوەندی نێوان زمانە کۆنەکانی میسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵ و کوردی نوێ و فارسی نوێ. دەبینرێت هەندێک جار پەیوەندی لە نێوان فارسی و کوردی و زمانە دێرینەکاندا هەیە و هەندێک جاری تر بە تەواوی دوو زمانی جیاوازن.

| زمانە کۆنەکان | وشەی کوردیی نوێ | هەمان وشە بە فارسی نوێ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| mi, mu | me مێ | māda ماده | وشەی (مێ/مێینە) لە کوردیدا وەک سۆمەریە و بە زمانی سۆمەری بە هەردوو شێوەی mi, mu دەنوسرێت. بەڵام لە فارسیدا دەبێتە (ماده). |
| aka | akā ئەکا | kun کن | لە کوردیدا (ئەکا/کا) ڕەگی کردنە . ئەم وشەیە لە سۆمەریدا هەمان وشەیە و بە aka/ak نووسراوە. لە فارسیدا دەبێتە (کن). |
| ku, gu | xo خۆ | xur خورد | ڕەگی وشەی (خواردن) لە کوردیدا دەبێتە (خۆ) و لە فارسیدا دەبێتە (خور). بەڵام لە سۆمەریدا بە ku، gu نوسراوە و نزیکە لە وشە کوردیەکە. |
| ana | auna/anna ئەونە/ئەننە | ānqadar انقدر | دەبینرێت لە کوردی و سۆمەریدا وەک یەکە و لە فارسیدا بە تەواوی جیاوازە و وشەیەکی لێکدراوی نیوە عەرەبی بەکار دەهێنێت. |
| me, man | mā, mān ما، مان | mānda مانده | ئەم وشەیە لە سۆمەریشدا دەبێتە me و لە هوریدا دەبێتە man. هەردوو وشەکە بە هەمان مانا و هەمان شێوە لە کوردیدا ماوە (ما/مان). لە فارسیدا دەبێتە (مانده) کە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. |
| dul | dol دۆڵ | dira دره | دەبینرێت لە سۆمەری و کوریدا بە نزیکی وەک یەکە و لە فارسیدا جیاوازە. تەنانەت لە زمانی ئینگلیزیدا کە دەبێتە dale زۆر لە کوردی و سۆمەریەکە نزیکترە وەک لە فارسی. |
| asta, hastāi, asta | hastī, esk هەستی/ئێسک | istixuān استخوان | ئەم وشەیە لە زمانی میدیدا دەبێتە asta و بە زمانی هیتی بە ئێسقان دەگووترێت hastāi، بە ئاڤێستا asta، لە کوردیدا دەبێتە هەستی/ئێسک و لە فارسیدا |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | (استخوان). دیسان لە فارسیدا بۆی زیادکراوە. |
| utu | hatāu/tāu<br>هەتاو/تاو | āftab<br>افتاب | هەتاو لە بنەڕەتدا سۆمەریە و لای ئەوان (خوای ڕۆژ) بووە و بە شێوەی utu نووسراوە. لە کوردیدا بەشێوەی تاو/هەتاو ماوە و هاوشێوەی سۆمەری و هیتیە، بەڵام لە فارسیدا گۆڕاوە. |
| zi<br>ziana | žī, žiān, žīn<br>ژیان، ژین، ژی | zindagi<br>زندگی | لە کوردیدا بە هەر دوو شێوەکەی هەیە و لە سۆمەریدا دەبێتە zi. جگە لەوەش ziana لە سۆمەریدا مانای ژیانێکی بەهەشتی هەیە و لەگەڵ کوردیدا نەگۆراوە، بەڵام لە فارسیدا گۆراوە و جیاوازە. تەنانەت لە زمانی یۆنانیدا کە بریتیە لە zoi، نزیکترە لە سۆمەری/ کوردی وەک لە نزیکی فارسی لە سۆمەری/کوردی. |
| nu-zu | na-zā/na-zān<br>نەزا/نەزان | nā-dān<br>نادان | لە کوردیدا بەشێوەی (نەزا/نەزان) هەیە و لە لاتینیدا ne-scio، بەڵام لە فارسیدا گۆڕاوە. دیسان دەبنیرێت کوردی و لاتینی و سۆمەری نزیکترن وەک لە فارسی. |
| zrd | zird<br>زرد | dil<br>دل | ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا میدیە و بەشێوەی zrd نوسراوە. وشەکە بە زمانی هیتی دەبێتە kard، بە چیکی srdce، ڕوسی دەبێتە serdtse، بە پۆڵۆنی serce، کرواتی srce، لاتینی دەبێتە cordis و بە یۆنانی kardiá، فەرەنسی cœur ,ئینگلیزی heart. کورد هەردوو وشەی (زرد، دڵ) بەکاردەهێنێت، بەڵام لە فارسیدا هەر (دڵ) هەیە. |
| sava | sava/saua<br>ساڤا/ساوا | nurista<br>نورستە | ئەم وشەیە میدەکان بە sava نوسیویانە و لە کوردیدا وەک خۆی ماوە. |
| brza | بەرز barz | بلند blind | ئەم وشەیە میدی و کوردی و ئاڤێستاییە. بە میدی بە brza دەنوسرێت. بە زمانی ئاڤێستا دەبێتە barz. لە فارسیدا دەبێتە (بلند). |
| u | u<br>و | va<br>و | بریتیە لە ڕاناوی بەیەکەوە بەستن. لە بنەڕەتدا سۆمەریە و بە u دەخوێنرێتەوە. کورد بە هەمان شێوە دەڵێت، بەڵام لە فارسیدا بە (ڤە va) دەخوێنرێتەوە و بۆی زیادکراوە. |
| sumundar | cauandar/<br>camandar<br>چەمەندەر/چەوەندەر | caĝandar<br>چغندر | وشەکە لە کوردی و سۆمەریدا زۆر نزیکن و لە فارسیدا هەندێک گۆڕانی بەسەردا هاتووە. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| izuγni | zīu, zīuīn<br>زیو، زیوین | naqra<br>نقرة | لە زمانی هوری و کوردیدا وەک یەکە و لە فارسیدا بە تەواوی گۆڕاوە. |
| prsu<br>peresu | parāsu<br>پەراسو | dinda<br>دنده | دەبینرێت لە زمانی میدیدا دەبێتە prsu و لە ئاڤێستادا peresu، لە فارسیدا بە تەواوی دەگۆڕێت و دەبێتە (دنده). |
| mes<br>masa<br>masan<br>mashana | mas, mazin<br>مەس، مەزن | buzurg,<br>sardar<br>سەردار، بزرگ | لە زمانی سۆمەریدا mes مانای پاڵەوان دەدات. لە میدیدا masa مانای (مەزن) دەدەن لە کوردیدا. لە ئاڤێستادا دەبێتە masan و لە لۆڤیدا دەبێتە mashana و لە لاتیندا بە مانایەکی نزیک بەشێوەی missa دەردەکەوێت. دەبینرێت سەرەڕای بوونی ئەو وشەیە لە هەموو زمانە دێرینەکاندا و دووبارەبوونەوەی هەردوو مانا و شێوەکەی لە کوردیدا، کەچی لە فارسیدا بوونی نیە. |
| akan | guan<br>گوان | pastān<br>پستان | لە زمانی سۆمەری و کوردیدا زۆر نزیکن، لە فارسیدا تەواو گۆڕاوە. |
| a | au<br>ئاو | manī<br>منی | وشەکە لە کوردی و سۆمەریدا مانای (شەهوەت) دەدات. لە فارسیدا تەواو گۆڕاوە. |
| igen | agīn<br>ئەگین | agar na<br>اگر نه | لە کوردی و سۆمەریدا مانای (دەنا، ئەگینا) دەدان، لە فارسیدا گۆڕاوە. |
| ahan | ahen<br>ئەهێن | qaī<br>قی | لە سۆمەری و کوردیدا دەبێتە ڕەگی (هێنانەوە، ڕشانەوە) لە فارسیدا بەتەواوی دەگۆڕێت. |
| aše | īse/esā<br>ئیسا/ئیسێ | aknun<br>اكنون | ئەم وشەیە لە کوردی و سۆمەریدا مانای (ئێستا) دەدات، لە فارسیدا تەواو گۆڕاوە. |
| bil | pil<br>پل | javāna<br>جوانه | لە سۆمەری و کوردیدا مانای لقی تازەی درەخت دەدات لە فارسیدا بە تەواوی جیاوازە. |
| meli<br>mill | mil<br>مل | gardan<br>گردن | ئەم وشەیە لە مانی سۆمەریدا دەبێتە meli و لە هیتیدا دەبێتە mill و لە فارسیدا تەواو گۆڕاوە. |
| nu | nu<br>نو | xuāb<br>خواب | لە کوردی و سۆمەریدا دەبێتە ڕەگی (نووستن) و لە فارسیدا بە تەواوتی جیاوازە. |
| gu | ko<br>کۆ | majmu/<br>hamagī<br>مجموع/ همگی | ئەم وشەیە لە سۆمەری و کوردیدا بە نزیکی وەک یەکن، لە زمانی فارسیدا تەواو گۆڕاوە. لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی وەک ئینگلیزیدا بە شێوەی co دەردەکەوێت و لە کوردی و |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | | سۆمەری نزیکترن وەک لە فارسی. |
| gu | gue<br>گوێ | kanāra<br>کنار | ئەم وشەیە لە کوردی و سۆمەریدا مانای (گوێ چەم، قەراخ) دەدات. لە فارسیدا بە تەواوی جیاوازە. |
| gal | gal<br>گەڵ | kašāla rān<br>کشالە ران | لە کوردی و سۆمەریدا ناوچەی ئەندامی زاوزێ و نێوان هەردوو ڕانە، لە فارسیدا وشەکە تەواو گۆڕاوە. |

سەرەڕای ئەوەی کە فارسی کۆن بە ئاڕاستەی سۆمەری و کوردی گۆڕاوە، بەڵام ئەگەر تێبینی چەند ڕستەیەکی سۆمەری و کوردی و تەرجومەکەی بۆ فارسی بکرێت، ئەوا هەر هێشتا جیاوازی ئەو زمانە لە زمانی کوردی دەردەکەوێت. لە ڕستەکاندا هەوڵ درا بە زۆریش جۆرێک لە فارسی بنوسرێت کە نزیک بێت لە کوردیەوە بۆ ئەوەی کە ئەو پەیوەندیە نیشان بدرێت، دەنا فارسی نوێ لەوە جیاوازترە کە لە خشتەکە و لەو ڕستانەدا ڕوونکراوتەوە. ئەگەر ڕستەکان بە فارسی کۆن (ئەخامەنی) بنووسرایە، ئەوا فارسیەکی جیاوازتر لە کوردی و سۆمەری خۆی دەخستە ڕوو:

| ڕستەکانی سۆمەری | تەرجومەکەی بە کوردی و تێبینی | تەرجومەکەی بە فارسی و تێبینی |
|---|---|---|
| ama mu zi mu<br>ئامە مو زی مو | āma m ži(žīn) ma<br>ئامەم ژی/ژینمە<br>(بە مانای، دایکم ژیانمە) | mādara m zinadgīe man ast<br>مادرم زندگی من است |
| ama mu še are<br>ئامە مو شە ئارێ | āma m jo ahāre<br>ئامەم جۆ ئەهاڕێ (واتە، دایکم جۆ ئەهاڕێ) | mādara m ju āsiāb mīkunad<br>مادرم جو آسیاب میکند |
| ama mu éš-gàr nu a<br>ئامە مو ئێش گار نوە | ama m īš kar nī a<br>ئامەم ئیشکەر نیە (واتە دایکم ئیشکەر نیە) | mādara m kār kun nīst<br>مادرم کار کن نیست |
| meli mu gur a<br>مێلی مو گورە | mil m gaur ia<br>ملم گەورەیە | gardana m buzurg ast<br>گردنم بزرگ است |
| immal mu dar nu a<br>یمالمو دار نوە | māl m tar ni a<br>ماڵم تار نیە (واتە ماڵم تاریک نیە) | xuna m tārīk nī st<br>خانە ام تاریک نیست |
| ama mu nu me a<br>ئامە مو نو مێە | āma m na mā ua<br>ئامەم نەماوە<br>(واتە،دایکم نەماوە) | madara m na mand ast<br>مادرم نماندە است |
| pap mu nu nu a<br>پاپ مو نو نوە | bāb m na nu e<br>بابم نا نوێ | pidara m namī xābad<br>پدرم نمی خوابد |
| pap mu ušu dinar lá-ìa<br>پاپ مو وشو دینار لایە | dinar ī lā īa sī bāb m<br>بابم سی دیناری لایە | pidara m sīh dīnār maqruz ast<br>پدرم سی دینار مقروض است |
| pap mu gu zubi ninda gu a<br>پاپمو گو زوبی نیندە گوە | bāb m gue ze nan axu ā<br>بابم گوێ زێ نان ئەخوا<br>(واتە، بام گوێ چەم نان | pidara m ĝadaīs rā dar kanāre rudxana mī xurad<br>پدرم غذایش را در کنار رود خانە |

| | ئەخوات) | می خورد | |
|---|---|---|---|

ئەو نموونانەی ڕابردوو تەنها بۆ ڕوونکردنەوە خراونەتە ڕوو دەنا سەدان وشە و ڕستەی هاوشێوەی ئەوانە هەن. دەبینرێت سەرەڕای ئەو هەموو گۆڕانکاریەی کە بەسەر زمانی فارسیدا هاتووە و بەلای کوردیدا گۆڕاوە، هێشتا هەر جیاوازی هەیە لەگەڵ زمانی کوردیدا، لەبەر ئەوەی کە لە بنەچەوە ئەو دوو زمانە زۆر جیاواز بوون. بێگومان جیاوازی کورد و فارس تەنها لە زماندا نەبووە، بەڵکو لایەنی کولتوری و ئاینیشی گرتۆتەوە. دەبینرێت کە لەو شوێنانەدا کە وڵاتی کوردانە، هەڵپەڕکێ دەکرێت و دەهۆڵ و زوڕنا لێ دەرێت، بەڵام ئەو نەریتە لە ناو فارسدا نیە. دەبینرێت کە سەرەڕای هەزاران ساڵ لە هاوسێیەتی، سەمای کوردی بە تەواوی لەگەڵ فارسیدا جیاوازە، کەچی نزیکترە لە سەمای ناوچەی بەڵکان و یۆنانی کە دراوسێی ڕابردووی مێژوویی بوون. سەمای فارسی زیاتر لە سەمای هندیەوە نزیکە و پەیوەندی زمانەوانی و فەرهەنگی لەگەڵدا هەیە.

ئەگەر سەرنجێکی وشە فارسیە کۆنەکانی وەک (درموجانە، نەیی، ئاهی، هاکا) و ڕێزمانی فارسی کۆن بدەین بە تایبەتی لە لایەنی کۆ (جمع) و توخم (جێندەر) دا و سەیری پێگەی جوگرافی فارسەکان بکەین کە بە درێژایی مێژوو لەسەر کەنداو بووە، وا نیشان دەدەن کە فارسی لە بنەچەوە لەگەڵ سانسکریتدا نزیکتر بووە و لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا وازیان لە لایەنی بنەڕەتی ڕێزمانی زمانەکەیان هێناوە و وشەی زاراوە کوردیەکانیان بە خەستی وەرگرتووە و ئەو پەیوەندیە لە ڕووی زمان و سەماکردنەدا دەردەکەوێت.

ئەمە دڵنیای دەکات کە فارسەکان لە سەردەمی کۆنتردا لە ڕووی جوگرافیشەوە هاوبەشیان لەگەڵ شوێنی نیشتەجێبوونی سانکریتی/هیندەکان هەبووە و دوایی بەرەو ناوچەی فارس و ئێرانی ئیمڕۆ هاتوون. بەپێی ئیبن خەلدون لە ناو فارسەکان خۆشیاندا کە باسیان لە ڕەچەڵەکی خۆیان کردووە، خۆیان گەڕاندۆتەوە بۆ یەکێک لە پاشا هەرە دێرینەکانیان لە دوای کیومەرس، کە ناوی (هۆشەنگ) بووە و پاشای هیند بووە و دوایی فارسەکان ناوچەی فارسیان گرتووە (ئیبن خلدون، ٢٠١٠). بەو جۆرە بە هەموو شێوەیەک بەڵگە مێژوویەکان و بەڵگە زمانەوانیەکان پشتگیری لەو بۆچوونە دەکەن.

نوێبوونی فارسەکان لە ناوچەکەدا و وەرگرتنی فەرهەنگی خەڵکی ناوچەکە، بە ووردی لەلایەن مێژوونوسە یۆنانیە دێرینەکانیشەوە باسکراوە کە فارسەکان وابەستەی مید بوون و زۆربەی دابونەریتیان هی ئەوان بووە. چەندین بەڵگەی ئارکیۆلۆجیش، ڕەوەند بوونی فارسەکان و ژێردەستەییان بۆ میدەکان، دڵنیا دەکاتەوە (Boardman, 1988, p.29.30). سترابۆی جوگرافیناس لە نزیکی سەدەی یەکەمی زاییندا ئەو ڕاستیە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت "چارۆکەی فارسی کە ئێستاکە وای پێ دەڵێن، تیربازی و سوارچاکی، ڕەفتارکردن بەرامبەر بە پاشاکان، جلوبەرگی فەرمی و قوربانیکردن بۆ خواکان کە لەلایەن ڕەعیەتەوە خەرجەکەی دەدرێت، ئەوانە هەمووی فارسەکان لە میدەکانەوە وەریان گرتووە". هەروەها سترابۆ بەردەوام دەبێت و دەڵێت "ناوچەی سەرەکی نیشتەجێبوونی فارسەکان لەسەر کەنداوی فارسی بوو لەبەر ئەوەی کە فارسەکان زیاتر لە خوارو تر دەژیان وەک لە بابلی و سوسیەکان (Susii). بەڵام دوای شکاندنی میدەکان ناوچەیەکی زۆریان گرت لەو وڵاتانەی سەر سنوری وڵاتی میدیا" (Strabo, 1856, p.266). لای مێژوونوسە دێرینەکان فارسەکان بەوە ناسرابوون کە پابەند نەبوون بە دابونەریتی خۆیانەوە و هەموو شتێکیان لە نەتەوەکانی دەوروبەریانەوە وەرگرتووە. هیرۆدۆت دەڵێت "هیچ نەتەوەیەک هێندەی فارسەکان بە خێرایی دابونەریتی بێگانە وەرناگرێت. بەو جۆرە جلوبەرگی میدیەکانیان وەرگرتووە و بە جلوبەرگێکی لەوەی خۆیان بەرزتر سەیری دەکەن و لە کاتی جەنگدا زرێپۆشی لەشی میسیری بەکاردەهێنن. هەر شتێکی خۆشگوزەرانی ببیستن دەستبەجێ دەیکەنە هی خۆیان و بەو جۆرە لەو شتانەی تر، لە یۆنانیەکانەوە ئارەزوو و زەوق فێربوون. هەر یەکەیان چەند ژنێکیان هەیە و ژمارەیەکی زیاتر کەنیزەکیشیان هەیە" (Herodotus, 2009, p.23). میدەکان کە خەڵکی ڕەسەنی نیشتەجێی ناوچەکە بوون، کۆمەڵگەکەیان لە ڕووی دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و ئاینیەوە زۆر لە کۆمەڵگەی فارسەکان ئاڵۆزتر بووە کە لە سەرەتادا کۆمەڵگەیەکی خێڵەکی سادە بووە. بۆ نموونە موغەکان، کە کەسایەتی ئاینی میدەکان بوون و ئەرکە ئاینیەکانیان لەسەر شان بووە، بە پێی هیرۆدۆت خۆیان بە خێڵێکی میدی سەیرکردووە و لە ناو فارسدا نەبوون.

لە ڕووی زمانەوە، فارسی نوێ لەلایەن زمانەوانەکانەوە بە تەواوکەری زمانی فارسی کۆن دادەنرێت، بەڵام وەک ڕوونکرایەوە فارسی کۆن لە بنەڕەتەوە گۆڕاوە و کەم و زیاد زمانێکی تر دروست کراوە بە ئاراستەی زمانی پەهلەوی و زمانی سۆمەری/کوردی. لە ڕاستیدا ئەو زمانەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن فارسی نوێ، لە پەهلەوی نزیکە وەک لە فارسی کۆن. بەڵگە زمانەوانی و مێژووییەکان وای دەردەخەن کە فارسی کۆن بە تەواوی لە ناوچووبێت و ئەم زمانە نوێیە لە بنەچەوە لە ژێر کاریگەری نەتەوە ڕەسەنەکەی ناوچەکە کە کوردە، هاتبێتە کایەوە. بۆیە دەبینرێت فارسی نزیکی هەیە لەگەڵ زاراوەکانی خواروی کوردستان کە بریتین لە زاراوەی لوڕ و گۆران.

بە بەراورد بە زمانی کوردی نوێ کە دوای پێنج هەزار ساڵ هێشتا لەگەڵ سۆمەریدا گۆڕانکاریەکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە، فارسی کۆن کە پێش دوو هەزار وپێنج سەد ساڵ لەمەوبەر بەکارهاتووە، گۆڕانکاریەکی زۆری بەسەردا هاتووە بۆ ئەوەی کە ببێتە فارسی نوێ. ئەوەش دیسان ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە فارسەکان نەتەوەیەکی هاتووی ناوچەکەن و زمان و فەرهەنگیان لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا بەلای زمانی میدی/کوردی/سۆمەریدا هاتووە. لە ڕاستیدا زەحمەتە بتوانرێت کە زمانی فارسی نوێ بە تەواوکەری فارسی کۆن دابنرێت. لەبەر ئەوەی فارسی نوێ زیاتر تێکەڵێکە لە زمانی پەهلەوی، کوردی و عەرەبی.

**پەیوەندی زمانی کوردی بە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکانەوە**

پێش ئەوەی کە سەیری ئەم لایەنە بکرێت، دەبێت ئەوە بزانرێت کە ڕەگەز و زمان دوو شتی لە یەک جودان، بەڵام لە سەدەی هەژدەی زایینەوە، زۆر جار ئەم دوو لایەنە جودایە تێکەڵ کراون و بۆ مەبەستی سیاسی بەکار هێنراون.

ڕەگەز بابەتێکی بایۆلۆجیە و مەرج نیە پەیوست بێت بە زمانەوە. بۆ نموونە زمانی جومکان و عەرەبەکان سەر بە گروپی زمانە سامیەکانن و زمانی کوردی و سویدی سەر بە گروپی زمانە هیندۆئەوروپیەکانن، کەچی لە ڕووی ڕەگەز یان جینەوە، لێکۆڵینەوە ڕەگەزیەکان وای دەردەخەن کە جومکان لەگەڵ کورد یان یۆنانی نزیکترن وەک لە عەرەبێکی سعودی (Kleiman, 2004, p.85). بە هەمان شێوەش کوردێک و جوێێک، لە ڕووی جینەوە نزیکترن وەک لە کوردێک و سویدیەک.

ڕەگەزە جیاوازەکانی مرۆڤ پەیوەستی ڕاستەوخۆیان بە ژینگەوە هەیە. تێبینی دەکرێت کە لە وڵاتی گەرم و هەتاودا پێست بۆرتر و قژ تۆخ ترە و لە شوێنە ساردەکانیشدا بە پێچەوانەوە. لە کاتێکدا کە باشوری ئەفریقا زۆربەیان پێست ڕەشن باکوری ئەوروپا و وڵاتی ڕووسیا زۆربەیان پێشت سپین. واتە بە هەزاران ساڵ پێش دروستبوونی زمان، مرۆڤ ڕەگەزی جیاوازی هەبووە و لە ژینگەی جیاوازدا ژیاوە. بەڵام زمان بە بەراورد بە ڕەگەز، بڵاوبوونەوەکەی پرۆسەیەکی نوێیە و زیاتر پەیوستە بە پەیدابوونی سەرەتای شارستانیەتی مرۆڤەوە.

یەکێک لەو کێشانەی کە تووشی تیۆری ڕەچەڵەکی زمانی هیندۆ ئەوروپی هاتووە، ئاراستەی ئەو لێکۆڵینەوانەیە کە هەندێک لایەنی ئەکادیمی گرتویانەتە بەر، کە بریتیە لە گەڕان بە دوای ڕەگەزێکدا کە سەرەتای زمانەکانی هیندۆ ئەوروپیەکان بێت. ئەم تیۆریە لە زۆر لایەنەوە لە ژێر کاریگەری تەورات و بۆچوونی سیاسی سەدەی هەژدەهەمی ئەوروپادا دانراوە (بڕوانە کێشەی ئاریەکان)، بەڵام لە ڕاستیدا لە ڕووی زانستیەوە بوونی یەک ڕەگەز وەک یەکەم ڕەگەزی هیندۆ ئەوروپی، شتێکی هەڵەیە و وەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا لەگەڵ زانستی جیندا ناکۆکە. واتە لە تیۆریەکەدا ڕەگەز و زمان تێکەڵ دەکرێت و لەیەکتری جوداناکرێتەوە و وەک دوو لایەنی جیاواز مامەڵەی لەگەڵدا ناکرێت. وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا زۆر لەوانەی کە بە زمانی هیندۆئەوروپی قسە دەکەن دەشێت کە ڕەگەزیان جیاواز بێت، هاوشێوەی کوردێک و سویدیەک و بەهەمان شێوەی ئەوە لە زمانە سامیەکانیشدا ڕوو دەدات و هەندێک جار دوو ڕەگەز لەیەکتری دەچن بەڵام زمانەکەیان بە تەواوی جیاوازە هاوشێوەی جو- عەرەب. بۆیە دەبێت مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەچەڵەکی زماندا لەم ڕوانگەیەوە بکرێت.

وەک لە فەرهەنگەکاندا دەردەکەوێت، زمانی سۆمەری ڕاستەوخۆ زمانی کوردی کۆنە و لە هەمان کاتدا بەڵگە زمانەوانیەکان وای دەردەخەن کە زمانێکی هیندۆئەوروپیە و پەیوەندی بە هەموو ئەو زمانانەوە هەیە. پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا ئەو زمانانە هەموویان لە سۆمەریەوە هاتوون؟ دەتوانرێت پرسیاری زۆر لەسەر ئەم بابەتە بکرێت و هێشتا زۆر زووە کە وەڵامی هەمووی بدرێتەوە. بەڵام بە دڵنیایی کوردستان بنکەیەکی گرنگ و بنەڕەتی زمانە هێندۆ ئەوروپیەکانە و بنەچەی زۆر وشەکان لەوێوە هاتوون نەک بە پێچەوانەوە. بەپێی ئەوەی کە زمانی سۆمەری، هوری و هیتی کۆنترین زمانی نووسراون و ژمارەیەکی زۆری وشەی هاوبەشەیان لەگەڵ زمانە هێندۆئەوروپیەکاندا هەیە، ئەوە زیاتر ئەو بۆچوونە بەهێز دەکات کە کوردستان و زمانی کوردی، زمان و شوێنی پەیدابوونی سەرەتاکانی زمانی هیندۆئەوروپی بێت.
بەپێی بەڵگە ئارکیۆلۆجیەکان، کوردستان شوێنی سەرەتای شارستانیەت بووە، بەڵگە مێژووییەکانیش زۆر جار شانبەشانی بەڵگە زمانەوانیەکان پشتگیری لەو راستیە دەکەن و دەیسەلمێنن. لە هەمان کاتدا ئەگەر هەر وشەیەکی سۆمەری/هوری/هیتی/کوردی بەراوردی زمانە هیندۆئەوروپیەکان بکرێن، ئەوا پرۆسە و مێژووی بڵاوبوونەوەی ئەو وشانە بە ڕوونی دەردەکەوێت.

| وشەی کوردی نوێ | زمانە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆلیا | زمانە هیندۆ ئەوروپیەکانی تر | تێبینی |
|---|---|---|---|
| gir, agir (ئاگر). girra (هەوای زۆر گەرمی هاوین) | gir/girra سۆمەری (خوای ئاگر) | gira سانسکریتدا (ئاگر) | |
| āur, āir, tāīr, ādir ātar, پێج وشەی ترن بە مانای (ئاگر) لە کوردیدا. | ur سۆمەری (سورکردنەوە) ahari هوری (سوتان) tari هوری (ئاگر) war هیتی (سوتان) atr میدی (ئاگر) | uro لاتین (سوتان) fire ئینگلیزی(ئاگر) feuer ئەڵمانی (ئاگر) ardor ئیسپانی (سوتان) tiro ئیتاڵی (تەقەکردن) âtre فەرەنسی (ئاگردان) و tir (تەقەکردن). | دەبینرێت بنەچەی ئەم وشەیە لە زمانەکانی مێسۆپۆتامیاوە هاتووە و بە هەموو شێوە کۆنەکانی لە کوردیدا دەردەکەوێتەوە؛ لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپیەکانیشدا بە شێوەی جیاواز دووبارە دەبێتەوە. |
| arz, ard کوردی (زەوی، کێڵگە) | uraš سۆمەری (زەوی، خاک) ardi هوری (شار) | erde ئەڵمانی (زەوی) earth ئینگلیزی (زەوی، خاک) urvi سانسکریت (زەوی) | |
| saf ڕەنگی کرداری (سافکردن) و وەسفی حاڵەتی لوسی شتێکە. spi (ڕەنگی سپی)، وەک کردار مانای (توێکڵ لێکردنەوە و پاک کردنەوە) دەدات. | sub سۆمەری (سافکردن) šapiya هیتی (سافکردن) šapp لۆڤی (توێکڵ لێکردنەوە) šapiya لوڤی (مادەی پاکردنەوە) | soap ئینگلیزی (سابون) seife ئەڵمان (سابون) savon فەرەنسی (سابون) | دەبینرێت زمانی کوردی لەگەڵ زمانەکانی مێسۆپۆتامیدا بە تەواوی هاوبەشە و پرەنسیپەکەی لە هەندێک لە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا دەردەکەوێت. |

| | | | |
|---|---|---|---|
| ut (وت/وتی)<br>utār (وتار)<br>ale (ئەڵێ)<br>du (ڕەگی ئەدوێ)<br>gut (ڕەگی گوتن)<br>aiže (ئەیژێ)<br>qisa (قسە)<br>guta (گوتە)<br>uša (وشە)<br>ueža (وێژە)<br>کۆمەڵێک وشەی پەیوەست بە قسەکردن و وشە لە زمانی کوردیدا. | uttar هیتی (وتار)<br>te هیتی (وتی)<br>ti هوری (وتی)<br>kad هوری (گوتی)<br>al هوری (ئەڵێ)<br>du سۆمەری (ئەدوێ)<br>gu de سۆمەری (گوتە)<br>uttar لوڤی (وتار)<br>te لوڤی (وتی)<br>hati لوڤی (وتی)<br>aoj ئاڤێستا (ئەیژێ)<br>vac ئاڤێستا (وشە)<br>du ئاڤێستا (ئەدوێ) | utter ئینگلیزی (گووتنی شتێک)<br>di فەرەنسی (ڕەگی گووتن)<br>dice ئیتاڵی و ئیسپانی (ئەدوێ)<br>voc, voz ئیسپانی (وشە)<br>ajo لاتین (ئەیژێ)<br>katha سانسکریت (گوتە)<br>dico لاتین (ئەدوێ) | سەرنج دەدرێت، هەموو ئەو وشانەی کە ئەمڕۆ لە کوردیدا بەکاردەهێنرێن و پەیوەندیان بە قسەکردن و وشەوە هەن، بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سۆمەری، هوری، لوڤی و هیتی، لە هەمان کاتدا لە زمانەکانی سانسکریت و لاتین و زمانە زیندووە هیندۆئەوروپیەکاندا دانە دانە دەردەکەونەوە. |
| ga (گا) | gu سۆمەری و میدی (گا) | cow ئینگلیزی<br>kuh ئەڵمانی<br>ko سویدی و دانیمارکی<br>koe هۆڵەندی<br>go سانسکریت | لە زمانی کوردی و سۆمەری و میدیدا هەمان مانای هەیە.لە هەندێک لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا مانای (مانگا) دەدات. |
| giri (گریان) | giri سۆمەری | cry ئینگلیزی (گریان)<br>crie فەرەنسی (هاوار کردن)<br>grief ئینگلیزی (تازیەباری)<br>græde دانیمارکی (گریان)<br>gråta سویدی (گریان) | لە سۆمەری و کوردیدا یەکن و لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا بە شێوەیەکی نزیک دەردەکەوێت. |
| mā, mān (بوون، مانەوە) | me سۆمەری (مان، بوون)<br>mān هوری (مان، بوون) | maneo لاتینی (کرداری مانەوە)<br>meno یۆنانی (مانەوە لە شوێندا)<br>māndan فارسی (کرداری مانەوە لە شوێندا) | لێرەدا پرۆسەی گۆڕین لە وشەکەدا دەردەکەوێت. لە سۆمەری و هوری و کوردیدا وەک یەکن و لە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکاندا تۆزێک گۆڕدراون. |
| ko/ge<br>koma/kom<br>(گروپ، کۆمەڵ) | gu سۆمەری<br>kome میدی | co ئینگلیزی و فەرەنسی پێشگرە بە مانای (بەیەکەوە بوون)<br>com پێشگرێکی ترە کە لە زۆربەی زمانەکانی ئەورووپادا | لە کوردیدا وشەکان خۆیان بە تەنها بەکاردێن و وەک پێشگر و پاشگریش چەندین وشەی لێ دروستکراوە، بۆ نموونە (زانکۆ، کۆمەڵ، کۆمار، |

| | | | |
|---|---|---|---|
| | | هەیە و هەمان ڕۆڵی co ی هەیە. | کۆم، کۆبوونەوە، کۆدەنگ). ئەم وشەیە لە مێسۆپۆتامیاوە چووەتە زمانی لاتینیەوە و لەوێوە چووتە زمانە ئەوروپیەکانی ترەوە. بێ گومان لە کوردیدا سەرچاوەکەی زمانی سۆمەری و میدیە و هیچ گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە. |
| anjā (دوای ئەوە) | anga سۆمەری<br>undu هوری<br>handa هیتی | and ئینگلیزی<br>und ئەڵمانی<br>anche ئیتاڵی | زمانی کوردی لە سۆمەری و هوری و هیتی نزیکە و لە زمانە ئەوروپیەکاندا بەشێوەی کەمێک جیاواز و مانای نزیک دەردەکەوێت. |
| dār (درەخت، تەختە) | dur سۆمەری<br>taru هیتی<br>dru ئاڤێشتا | tree ئینگلیزی<br>træ دانیمارکی<br>drevo سلۆڤینی<br>drvo کرواتی | لە سۆمەری و کوردیدا مانای (تەختە، داری دەست) دەدات. لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا زیاتر مانای (درەخت) دەدات. |
| zā, zān هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا مانای (زانین) دەدات. | zu سۆمەری<br>unai لوڤی | scio لاتینی<br>znati کرواتی<br>znaya بولگاری<br>wissen ئەڵمانی | دەبینرێت هەردوو شێوەکەی لە کوردیدا هەیە و لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دووبارە دەبێتەوە. |
| hām, hamān (هەمان شت) | hamun سۆمەری<br>himma هیتی<br>ham میدی<br>hama ئاڤێستا | homos یۆنانی<br>homo ئینگلیزی<br>homo فەرەنسی | لە کوردیدا بە هەردوو شێوەکەی ماوە و لە زمانە کۆنەکاندا بە شێوەی زۆر نزیک و مانای زۆر نزیک دەردەکەوێت و لە هیندۆ ئەوروپیەکانیشدا بە هەمان شێوە. |
| tār, tārik (تار، تاریک) | dar سۆمەری (تاریک) | dark ئینگلیزی (تاریک)<br>atra لاتینی (تاریک) | دەبینرێت پەیوەندی تەواو لە نێوان سۆمەری و کوردیدا هەیە و هەردوو شێوە هیندۆئەوروپیەکە لە زمانی کوردیدا هەیە. |
| pā, pe, pāh (پێ، قاچ)<br>piāda (بەپێ)<br>pāta (پێڵاو) | pah سۆمەری (قاچ)<br>pata هیتی (پێ)<br>puwaliya هیتی (جلکێکە لە قاچەوە) | pede لاتینی (پێ)<br>pied فەرەنسی (پێ)<br>piede ئیتاڵی (پێ)<br>pada سانسکریت (پێ) | دیسان ئەو پەیوەندیەش لە هەموو ئەو زمانانەدا دەبینرێتەوە و لە کوردیدا زۆربەی شێوە دێرینەکانی |

| pelāu (ماناى پێڵاو) | دەپێچرێت | boot ئینگلزی (پێڵاو) bota ئیسپانی (پێڵاو) | ئەو وشەیە هەر ماوە. |
|---|---|---|---|
| kani, kina, kināca سێ وشەن بە ماناى (کچ) | kana لیدی (ژن) | kanyâ ئاڤیستا (کچی بە ژن نەبوو) kvinna سویدی (مێ) kvinne نەرویجی (مێ) | |
| me (مێینە) āma (دایک) | mi, mu سۆمەری (مێینە) ama سۆمەری (دایک) | mãe پورتوگالی (دایک) mamma ئیتالی (دایک) mum ئینگلیزی (دایک) mere فەرەنسی (دایک) | |
| kai (کەی) ke (کێ) ku/kue (کو/کوێ) | kwi لوڤی (کێ، کەی) kwita لوڤی (کوێ) kui هیتی (کێ) kuez هیتی (لە کوێ) | kada کرواتی (کەی) kedy سلۆڤاکی (کەی) kde چیکی (کوێ) qui فەرەنسی و لاتین (کێ) che ئیتالی ( کێ) que ئیسپانی (کێ) | دەبینرێت کوردی لە هەردوو زمانی لوڤی و هیتی زۆر نزیکە، لە هەمان کاتدا هەندێک لە وشەکان لە گروپی ئیتاڵیکدایە و هەندێکیان لە سلاڤیکدا دەردەکەوێت، بەڵام لە گروپی جێرمانیکدا هیچ کام لەم وشانە دەرناکەون. |
| ži (ژی/ژیان) zand (منداڵ خستنەوە) za (زایین، وەچە) žiān (ژیان) zinu (مانەوە لە ژیاندا) | zi سۆمەری (ژیان) ziana سۆمەری (ژیانێکی بەهەشتی) huisnu هیتی (مانەوە بە زیندوویی) zantu میدی (ماناى خێڵ) | zoi یۆنانی (ژیان) ziv کرواتی (ژیان) zindagi فارسی (ژیان) zhivot بولگاری (ژیان) zhizn′ ڕوسی و سلۆڤاکی (ژیان) genno یۆنانی (منداڵ خستنەوە) gens لاتینی (خێڵ) gene فەرەنسی (لەدایکبوون، بنەچە) | وشەی (ژی) بە شێوەی جیاواز لە گروپی سلافی و یۆنانیدا دەردەکەوێت. لە گروپی جێرمانیکدا دەرناکەوێت، بەڵام وشە میدی و کوردیەکە لە گروپی ئیتاڵیکدا دەردەکەوێت و دوایی لە ڕێگای زمانی لاتین و یۆنانیەوە چووەتە گروپی جێرمانیکەوە. لە زمانی کوردیدا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە یان کەم گۆڕاوە. |

ئەو خشتەیەی ڕابردوو تەنها بریتیە لە چەند وشەیەک، دەنا هەر وەکو لە بەشی سۆمەریەکان دا ڕوونکرایەوە، چەندین ڕستەی سۆمەری هەیە کە لە زمانەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵدا هەبوون و کە هەتا

ئێستاش لە زاراوە کوردیە نوێکاندا ماون؛ ئەمڕۆ لە هەموو زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا بە شێوەی جیاواز دووبارە دەبنەوە.
ئەوەی کە مایەی سەرنج ڕاکێشانە ئەوەیە کە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا شێوەی جیاوازی زمانە کۆنەکان لە زاراوە کوردیەکاندا ماون. بۆیە ئەم وشانە بێ پێویست بە نووسینەوەی مێژووەکەیان، هەر یەکەیان لەکاتی بەراوردکردندا مێژووی گوێزانەوەی خۆیان دەخەنە ڕوو. هەروەها ئەوەش دەخەنە ڕوو کە زاراوەکانی زمانی کوردی لە هەموو زمانە کۆنەکانی ڕابردوو پێکهاتوون. بەو جۆرە وشە دێرینەکان لە مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵەوە چوونەتە ناو زمانە هیندۆئەوروپیەکانەوە و ئەم گوێزانەوەیەش لە ڕێگای هاتووچۆی خەڵک و بازرگانی و کۆچی گروپی جیاوازەوە ڕووی داوە.
هەڵبەت ئەم پرۆسەیە زۆر لەوە کۆنترە کە ئەمڕۆ باسی لێوە دەکرێت. دەشێت پرۆسەکە لە سەردەمی پێش داهێنانی نووسین لە ناو سۆمەریەکاندا، لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە دەستی پێکردبێت. لەبەر ئەوەی کە پێش سەردەمی سۆمەریەکان و هاتنی نەتەوە سامیەکان بۆ ناوچەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆل، کوردستان گرنگترین سەنتەری شارستانیەت بووە لە جیهانی کۆندا، هەر بۆیە وشە کوردی/سۆمەریەکان لەگەڵ ئەو شارستانیەتەدا بە ئاراستەی جیاواز، بەرەو ئەوروپا و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا گوێزراوەتەوە. لەبەر ئەوەی وشە سۆمەریەکان لە سانسکریت هەتاوەکو زمانی ڕوسی و سویدیدا ماونەتەوە.
ئەم پرۆسەیە بەرەو ئەوروپا بە قۆناغی جیاواز ڕووی داوە و بەردەوام بووە. وشەیەکی زۆر چووەتە زمانی لاتین و یۆنانیەوە و لەو دوو زمانەوە چوونەتە زمانە جیاوازەکانی ئەوروپاوە. بەڵام وشەکان هەر لە ڕێگای زمانی لاتین و یۆنانیەوە نەچوونەتە ناو ئەو زمانانە، بەڵکو هەندێک جار ڕاستەخۆ چوونەتە ناو گروپی جیاوازی زمانە ئەوروپیەکانەوە؛ بۆ نموونە لقە گروپی جێرمانیک (Germanic). ئەوە دەری دەخات گوێزانەوەکە لە سەردەمێکی زۆر دێریندا ڕویدابێت. بۆیە چەندین وشە هەن لە سۆمەری و کوردی و گروپی جێرمانیکدا دەردەکەون و نەچووەتە ناو زمانی لاتینەوە. بە دڵنیایی ئەو گوێزانەوەیە پێش دەرکەوتنی شارستانیەتی یۆنانی و ڕۆمانەکان ڕاستەخۆ لە کوردستانەوە گوێزراونەتەوە بۆ ناو گروپی جێرمانیکەوە.
بۆ نموونە وشەی gu ی سۆمەری کە مانای (گا) دەدات لە کوردیدا، بە تۆزێک گۆڕانەوە چووەتە زمانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، هۆڵەندی، هتد. کە هەموویان زمانی جێرمانیکن. کەچی نەچووەتە زمانی لاتین و گروپی ئیتالیکەوە کە زمانی فەرەنسی، ئیتالی، ئیسپانی، هتد. لە خۆ دەگرێت.
هەروەها سەرنج دەدرێت کە زمانی کوردی پەیوەندی لەگەڵ زمانەکانی وەک سراسی و لیدی و کاریدا هەیە سەرەرای ئەوەی کە ئەو گروپانە ناوچەی جێنشینیان لە کوردستانی ئەمڕۆ دوور بووە و ژمارەیەکی زۆر دەگمەنیش لە وشەکانی هەر کام لەو زمانانە دۆزراونەتەوە (بڕوانە نەخشەی ١١). پەیوەندی پتەوی ئەو زمانانە پرۆسەی بڵاوکردنەوەی زمانی کوردی/سۆمەری دەخەنە ڕوو و لە هەمان کاتدا نیشانی دەدەن کە زمانی کوردی/سۆمەری خۆی بە زاراوەی جیاواز، هەتاوەکو نزیک یۆنان قسەی پێکراوە. لە ڕاستیدا پەیوەندی زمانی کوردی لەگەڵ ئەو سێ زمانانەدا پرۆسەی گوێزانەوەی زمانی سۆمەری، هیتی، هوری، میدی، مانی، لوڤی، هتد، بۆ هەندێک لە زمانە هیندۆ ئەوروپیەکانی نیشتەجێی ئەوروپا دەخاتە ڕوو. بۆیە هەندێک جار دەرکەوتنی هەندێک وشەی کوردی لە زمانی لاتیندا مایەی سەرسوڕمانە. وشەیەکی وەک (قەیسەر) کە لە ئەوروپادا سەرەتا لە ناو ڕۆمەکان و لە زمانی لاتیندا بەکارهاتووە. وشەکە لە لاتینیدا بە شێوەی caesar دەرکەوتووە بە مانای (قژدار، قژار) و کراوەتە نازناوی قەیسەری ڕۆم. ئەم وشەیە لە کوریدا پێک دێت لە (قژ+ار)، لە لاتینیدا وشەکە هەمووی وەرگیراوە لەبەر ئەوەی بەشەکانی وشەکە شیکردنەوەی نیە. ئەم وشەیە بنەچەکەی لە سۆمەری/لوڤی/کوردیدا دەردەکەوێت. لە سۆمەریدا quz مانای (قژی درێژ/پڕ) دەدات، ki-iz مانای (کۆکردنەوە و پاکردنەوەی قژ یان گژوگیا)، لە لوڤیدا kīša مانای (قژ داهێنان) و لە سانسکریتدا دەبێتە keza. لە کوردیدا (قژ) مانای (توکی سەر) دەدات، (کەزی) مانای (قژ پرچکردن، زوڵف، گیای حەسیر) دەدات، (کش) وشەیەکە لە کاتی قژداهێنانی منداڵ دا بەکاردەهێنرێت. دەبینرێت هەموو مانا و بنەچەی وشەکە لە سۆمەری و لوڤی و کوردیدا ماوە، بۆیە وشە لاتینیەکە تەنها لە زمانی کوردیدا شی دەکرێتەوە.

وشەی (ئەسپ) (بڕوانە ڕوونکردنەوەی وشەکە لە زمانی سۆمەریدا) لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا ماوە، پرۆسەی گۆڕانکاری لە وشەکەدا لە ڕێگای زمانەکانی سۆمەری، هوری، هیتی، لوڤی و میدیدا دەردەکەوێت. سەرەتا لە وشەی si ی سۆمەری کە بەرامبەر (هەس/هەسا) ی کوردیە، دەستی پێکردووە و پاشتر بە (ئەسپ) کۆتایی هاتووە.

وشەی (پەپولە papula) لە زمانی کوردیدا پێکهاتووە لە (papu+la). وشەی (پەپو) لە کۆندا لە کوردیدا مانای باڵندەی داوە و هێشتا ئەو راستیە لە باڵندەکانی وەک (کونە پەپو، پەپو سلێمانکە، پەپو قژە) دا دەردەکەوێت. بە هۆی پاشگری (لە la) وە، لە کوردیدا ماناکەی بووەتە (باڵندەی بچووک)، وەک لە وشەکانی (مێروو/مێروولە، دەرزی/دەزریلە، وورد/ووردیلە، هتد) دەردەکەوێت. ئەم وشەیە بنەچە و شێوەی دروستبوونی لە کوردیدا شی دەکرێتەوە. لە لاتینیدا بووەتە papilio و لە فەرەنسیدا papillon، بەڵام ناتوانرێت هەمان شیکردنەوەی زمانی کوردی بۆ بکرێت. بە هەمان شێوە وشەی (سوتو sutu) ی کوردی پێکهاتووە لە (سوت+و). کە لە ڕەگی وشەی (سوتان) و پاشگری (و) دروست بووە کە لە کوردیدا ڕەگی کردار دەکاتە ناو. ئەم وشەیە چووەتە زمانی ئینگلیزیەوە و بووەتە soot، لە سویدیدا sot و لە چەندین زمانی تری هیندۆ ئەورووپیدا بە مانایەکی نزیک دەردەکەونەوە بێ ئەوەی کە بتوانرێت شیبکرێنەوە و مانا بنەڕەتیەکەیان بدۆزرێتەوە. ئەمە لە وشەی (هەنگوین hanguīn) یشدا دەردەکەوێت؛ وشەکە لە کوردیدا پێکهاتووە لە (هەنگ+وین) کە لە مانای مێرووی هەنگ و پاشگری (وین) پێکهاتووە کە دەبێتە ڕەگی (وینین) و مانای (دۆزینەوە، دیتن) دەدات. مانای وشەکە هەمووی دەبێتە (ئەوەی هەنگ دەیبینێتەوە/دەیدۆزێتەوە). لە زمانی ئینگلیزیدا بووەتە honey، لە ئەڵمانیدا honig و لە سویدیدا honung. دیسان لە کاتێکدا وشەکە لە کوردیدا شیکردنەوە و دروستبوونی ڕوونە، لە زمانە هیندۆئەورووپیەکانی تردا وشەکەیان وەرگرتووە، بۆیە شیکردنەوە و دەرخستنی ڕەگی وشەکە ناکرێت.

وشەی ibsi سۆمەری کە مانای (بەسە) ی کوردی دەدات، لە زمانی کوردیدا بە هەر سێ شێوەی (basīatī/basa/basī بەسە/بەسی/بەسیەتی) ماوە. چووەتە هەردوو زمانی ئیتاڵی و ئیسپانیەوە بەشێوەی basta و بە هەمان مانا. سەرنج دەدرێت شێوە نوێ کوردیەکەی (بەسیەتی) چووەتە ئەو زمانانەوە، ئەوە نیشانی دەدات ئەو وشەیە لە سەردەمی سۆمەریدا نەگوێزراوەتەوە بۆ ناو زمانە هیندۆئەورووپیەکان و ئەو پرۆسەیە لە سەردەمێکی نوێتردا ڕووی داوە. ئەم وشەیە نموونەیەکە کە هەندێک لایەنی مێژوویی و سەردەمەکانی گوێزانەوەی وشە کوردیەکان دەخاتە ڕوو.

هەندێک جار وشەی لێکدراوی کوردی هەیە کە بنەچەکەی سۆمەری و هیتی و ئاڤێستاییە، لە هەمان کاتدا ئەو وشەیە لە زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا بە تەواوی دەردەکەوێتەوە. بۆ نموونە وشەی (لە بەر چی (بەرچی)) ئەم وشەیە لە دوو بەش پێک دێت (بەر+چی)؛ وشەی (بەر) ی کوردی لە سۆمەریدا دەبێتە bar و (چی) کوردی لە هیتیدا دەبێتە kui و لە ئاڤێستادا ci. واتە وشەی bar ci ی کوردی بەشی یەکەمی سۆمەریە و بەشی دووهەمی ئاڤێستاییە؛ لە هیتیشدا بە گۆڕانێکی زۆر کەمەوە دەردەکەوێت. وشەکە لە زمانی ئیتاڵیدا دەبێت perché، فەرەنسی pourquoi، پورتوگالی por que، ئیسپانی por qué. ئەوەی کە مایەی سەرنجە وشە لێکدراوەکە لە هەموو ئەو دوو زمانانەدا لەو دوو وشەیە و بە هەمان مانا دروستکراوە، واتە دوای نزیکی پێنج هەزار ساڵ بە نزیکی نەگۆڕاوە.

بە دڵنیایی زمانی سۆمەری کە کۆنترین زمانی نوسراوی کوردیە، یەکێکە لە دێرین ترین زمانە هیندۆئەورووپیەکان و ڕەگی زۆر وشەی ئەو زمانانە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە. لەبەر ئەوە دەبینرێت کە زوربەی جار وشە بنەڕەتیەکان کە لە زمانە هیندۆئەورووپیەکاندا وشەی جیاوازیان لێ دروستکراوە، بە سادەترین شێوە لە زمانی کوردی نوێدا ماون. بۆیە هێشتا زمانی کوردی وەک زمانی دایک و مۆزەخانەی ئەو زمانانە خۆی دەنوێنێت و دەتوانرێت سوودی زۆری لێ وەربگیرێت بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی زمانە هیندۆئەورووپیەکان.

ئەو نموونە و زانیاریانەی کە خرانە ڕوو، دەری دەخەن کە ئەو تێگەیشتنەی ئەمڕۆ سەبارەت بە بنەچەی زمانە هیندۆئەورووپیەکان لە ئارادایە، بە تەواوی هەڵەیە. بەپێی ئەو بەڵگە مێژوویی و زمانەوانیانەی کە لەم کتێبەدا ئاماژەیان پێ دەکرێت، دەبێت سەرلەنوێ پرۆسەی گۆڕان و مێژووی زمانە ئەورووپیەکان جارێکی

تر لەسەر بنەمای زانستی دابڕێژرێنەوە و لە بۆچوونی سیاسی و ڕوانگەی ئاینی سەدەی هەژدەهەمی ئەوروپا رزگار بکرێن و پۆلێن بکرێنەوە. چونکە ئەم پۆلێن کردنەی کە ئەمرۆ بۆ ئەو زمانانە لە ئارادایە، ناکۆکە لەگەڵ بەڵگە زمانەوانی و مێژووییەکاندا.

**پەیوەندی زمانی کوردی بە زمانە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیاوە**

لە ڕووی وشەکاری و ڕێزمانیەوە، بنەچەی زمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ زمانی سۆمەری؛ ئەم زمانە ڕوونترین پەیوەندی هەیە لەگەڵ زمانی کوردیدا. هەر وەک لە بەشی سۆمەریەکاندا ڕوونکراوەیەوە، سەدان وشەی سۆمەری دوای پێنج هەزار ساڵ هیچ گۆڕانێکیان بەسەردا نەهاتووە. بە دڵنیایی زمانی سۆمەری زمانێکی تەنها نەبووە و زمان و زاراوەی تری هاوشێوەی لەو سەردەمەدا هەبووە. هەروەها جگە لە پەیوەندی فەرهەنگی، زمانی سۆمەری پەیوەندیەکی پتەوی لەگەڵ زمانەکانی هوری، هیتی، مانی، میدی، کاسی، لوڤی، لیدی، هتد. دا هەیە و زۆر جار وەک زاراوەی هەمان زمان دەردەکەون. ئەو لەیەکچوون و جیاوازیەی کە لە نێوان ئەو زمانانەدا هەن، هەمان پەیوەندین کە لە نێوان زاراوە کوردیەکانی ئەمڕۆدا لە ئاستێکی جیاواز و شێوەیەکی تردا ڕەنگی داوەتەوە. بۆیە ئەمڕۆ لە کوردستاندا هەمەڕەنگیەکی زاراوەیی هەیە و هەندێک جار جیاوازی زۆر بەدی دەکرێت لە نێوان قسەکردنی ناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی تر؛ ئەم زاراوانەی ئەمڕۆ درێژکراوەی ئەو سەردەمەن.
بەڵگە زمانەوانیەکان دەری دەخەن کە زمانی کوردی زمانی شارستانیەتی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵە و بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە ١٠٠٠٠ ساڵ. لەبەر ئەوەی زۆربەی شوێنە شارستانیە سەرەتاییەکان لە شاخەکانی زاگرۆس و دەروبەریدا دۆزراوەنەتەوە و دوایی لە شوێنەکانی تردا بڵاوبوونەتەوە. زۆربەی وشە دێرنیەکانی نەتەوە دێرینە ڕەسەنەکانی ناوچەکە لە زمانی کوردیدا ماون. ئەگەر زمانی کوردی پاش نزیکی پێنج هەزار ساڵ گۆڕانی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتبێت، سەرەڕای هاتنی ئەو هەموو نەتەوە نوێیانە بۆ کوردستان، بە دڵنیایی ئەو زمانە زۆر لە پێش سۆمەریەکانەوە هەر بەو شێوەیە بووە و گۆڕانی ئەوتۆی بە خۆیەوە نەبینیوە. بۆیە جێگای سەر سوڕمان نیە کە پێکهاتەی زۆربەی ئەو وشە سادانەی کە کورد هەتاوەکو ئەمڕۆ بەکاریان دەهێنێت لە زمانەکانی هوری، سۆمەری، میدی، هیتی. لوڤی، هتد. وە سەرچاوە هەڵدەگرێت.
گەرچی گومانی تێدا نیە کە ئەم زاراوانەی ئەمڕۆ، لە یەک بنەچەوە هاتوون، بەڵام هێشتا زەحمەتە کە ئەمڕۆ وەڵامی هەندێک پرسیار بدرێتەوە، سەبارەت بە هۆکار و سەردەمەکانی ڕودانی جیا بوونەوە و پەیوەندی لەگەڵ زاراوەکانی ئەمڕۆدا. هەڵبەت یەکێک لەو هۆکارانە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە زۆر شێوەی قسەکردنی جیاواز، لە کوردستاندا و لە سوچی لادێکانیدا ماون، کە هەندێکیان دەیان هەزار ساڵ کۆنن و بەهۆی باری سیاسی و دابەشکردنی کوردستانەوە، هەتاوەکو ئێستا نەتوانراوە تۆماربکرێن و جگە لە چەند هەوڵێکی کەم، نەتوانراوە فەرهەنگێکی تەواوی وشە کوردیەکان بنووسرێت. سەرەڕای هەوڵی چەند زمانەوانێکی وەک مامۆستا هەژار و نووسینی چەند فەرهەنگێکی کوردی و کۆکردنەوەی هەزاران وشە، بەڵام هێشتا هەزاران وشەی کوردی ڕەسەن تۆمارنەکراوە و هەزارانیش لەبیرچوونەتەوە. هێشتا ئاشنای ڕیزمانی زۆر لە زاراوە کوردیەکان نین و پیویست بە کاری ئەکادیمی وورد دەکات بۆ ئەوەی کە پرۆسەی گۆڕان و مێژووی زاراوەکان ڕوونتر ببێتەوە.

**زاراوە کوردیەکان و کۆمەڵێک سەرنج سەبارەتیان**

زمانی کوردی ئەمڕۆ پێک دێت لە کۆمەڵێک زاراوەی جیاواز، سەرەڕای ئەوە هەتاوەکو ئێستا بە هۆی باری سیاسی کوردستانەوە، نەتوانراوە نەخشەیەکی ووردی تەواو بۆ ڕوونکردنەوەی لایەنی جوگرافی و پەیوەندی ڕێزمانی و ئەنسرۆپۆلۆجی ناوچەی زاراوەکان دابنرێت و جیاوازی و لەیەکچوونی بخرێتە ڕوو.
ئەگەر سەرنجی ئەو زاراوانە بدرێت دەبینرێت کە لە هەندێک لایەندا پەیوەندی پتەو لە نێوانیاندا هەیە و لە هەندێکی تریشدا جیاوازی. بێگومان نکوڵی لەوە ناکرێت کە هەوڵی هەمەچەشن دراوە بۆ پۆلێنکردنیان، بەڵام مخابن هەتاوەکو ئێستا ئەو هەوڵانە زۆر کەم و سنوردارن و زانیاری وورد ناگرنە خۆ.

کۆنترین پۆلێنکردن بۆ کورد و زمانەکەی لەلایەن شەرەفخانی بدلیسی (١٥٤٣ ز- ١٦٠٣ ز)ەوە کراوە. شەرەفخان زمانی کوردی لە ڕووی زاراوە و هەندێک تایبەتمەندیەوە کردۆتە چوار بەشەوە. ئەو چوار بەشە بە کرمانج، لوڕ، گۆران و کەڵهور، ناو دەهێنێت. لە سەدەی بیستەمەوە ئەم پۆلێنکردنەی شەرەفخان ڕەگی داکوتاوە و هەتاوەکو ئێستا زۆرینەی پۆلێنکردنەکان هەر چوارن. دکتۆر جەمال نەبەز، پرۆفیسۆر مهرداد ئێزدی، دکتۆر ئەمیر حەسەن پور و زەبیحی، بە گشتی لەسەر ئەوە کۆکن کە زمانی کوردی بکەنە چوار زاراوەی سەرەکی. بۆچوونی هەر یەک لەو لێکۆڵەرانە لەلایەن ئەکادیمیای کوردی زمان (Kurdish Academy of language, 2012) ەوە خراوەتە ڕوو.:

| [illegible] | [illegible] | | [illegible] |
| --- | --- | --- | --- |
| گرووپی باکور | کرمانجی سەروو | کرمانجی | کرمانجی سەرو |
| گرووپی ناوەڕاست | کرمانجی ناوەڕاست | سۆرانی | کرمانجی خوارو |
| هەورامی/دملی | گۆران/زازا | هەورامی | دملی |
| گرووپی خوارو | کرمانجی خوارو | کرماشانی | گۆران |

سەرنج دەدرێت کە هەتاوەکو ئەمڕۆ لێکۆڵەرە کوردەکان لەسەر یەک سیستەمی ناونان بۆ زاراوەکان ڕێک نەکەوتوون. هەندێک لەو ناوانەی کە ئەمڕۆ بەکاردەهێنرێن ڕابردووی مێژوویان نیە. بۆ نموونە دەستەواژەی (سۆرانی) کە بە کرمانجی خوارو دەگووترێت، ناوێکی نوێیە. بەپێی گەڕۆکی بەریتانی، ڕیچ، بابانیەکان بە خۆیان گوتووە (کرمانجی) (Rich, 1836, p.81). لە لێکۆڵینەوەکانی مێجەرسۆندا، کە زۆربەیان لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەنجام دراون، ناوی (سۆرانی) بە هیچ جۆرێک نەهاتووە و ناوچەی سلێمانی بە زمانی خۆی گوتووە (کرمانجی) و سۆن-یش بە کرمانجی ناوی دەبات. بەپێی سۆن کرمانج هەتاوەکو ئەو کاتە لە ناو کورد خۆیدا ئاماژەیەک بووە بۆ هەموو خەڵکێکی کورد، بۆیە زازاکانیش بە کرمانج ناوهێنراون (Soane, 2003, p.3 and 6). لە ڕابردوودا لە ناو کورد خۆیدا بەکارهێنانی (کورد، کرمانج) هیچ جیاوازیەکی ڕوونی نەبووە و زۆربەی جار هەردووکی بە هەمان مەبەست بەکار هاتووە.

لە کاتێکدا کە ئەحمەدی خانی نزیکی چوار سەد ساڵ لەمەوبەر لە شیعرەکانیدا هەردوو ناوەکانی کورد و کرمانجی بەکارهێناوە، هەروەها نزیکی دوو سەد ساڵ لەمەوبەر پاشای بابانی کە سەبارەت بە ڕەگی خۆیان پرسیاری لێکراوە، کورد و کرمانجی بۆ ئاماژەکردن بە خۆی بەکارهێناوە. لە هەمان کاتدا بەڵگەیەک، لە پێش سەدەی بیستەمدا، لە ئارادا نیە بۆ ئاماژەکردن بە زاراوەیەکی کوردی بە ناوی (سۆرانی). وا دەردەکەوێت کە ئەو دەستەواژەیە لەگەڵ دروستبوونی پارتی دیموکراتی کوردستان و تێکەڵبوونی دوو ناوچەی جیاواز لەو حیزبەدا هێنرابێتە کایەوە. لەبەر ئەوەی کە ناوچەی سۆران لە ناوچەی بادینان نزیکە و ئەندامە بادینیەکان هەر کەسێک بە کرمانجی خوارو قسەی کردبێت پێیان گوتووە (سۆرانی). لەگەڵ ئەوەی کە ئیمارەتێکی کوردی هەبووە بەو ناوەوە، بەڵام ناو هێنانی زاراوەی ناوچەیەک بە (سۆرانی)، دیاردەیەکی نوێیە و لەوە ناچێت لە ٧٠ ساڵ تێپەڕێت.

هەندێک پێیان وایە کە ناوی (کرمانج) پێک دێت لە (کورد+مان+جێ) واتە (ئەو کوردانەی کە لە جێ دەمێننەوە) واتە نیشتەجێن. بە دوور نازانرێت کە لەسەردەمێکدا بۆ خۆ جوداکردنەوە لە کوردە کۆچەرەکان بەکارهاتبێت و دوایی لەگەڵ کاتدا مانا و مەبەستە بنەچەییەکەی خۆی بزر کردبێت.

سەبارەت بە لێکۆڵینەوە لە زاراوە کوردیەکان هەندێک لە لێکۆڵەرە ئینگلیزەکان ئاراستەیەکی ئەکادیمی چەوتیان گرتووە و جۆرە بۆچونێکیان داوە کە هەندێک لایەنی مێژووی زمانی کوردیان تێکداوە. دەبینرێت کە تەیارێک لە لێکۆڵەرە ئینگلیزەکان دەستەواژەی وەکو (کوردی ڕاستەقینە (Kurd Proper)) یان هێناوەتە ئاراوە. مەکەنزی سەر بەو تەیاریە کە ئەم دەستەواژەی داهێنا. لە لێکۆڵینەوەیەکیدا سەبارەت بە ڕەچەڵەکی کورد لە ژێر ناونیشانی "ڕەچەڵەکەکانی زمانی کوردی" (The Origins of Kurdish)، بە

شێوەیەکی زۆر سادە و سەرپێیی ڕوانگەی داوە سەبارەت بەوەی کە مید کورد نیە (MacKenzie, 1999)، هەروەها زاراوەکانی گۆران و لوڕی خستوتە دەرەوەی خانەی زمانی کوردیەوە. بۆیە لە یەکێک لە لێکۆڵینەوەکانیدا زۆر ڕاشکاوانە دەڵێت "دوو زمانی تری ئێرانی، زۆر جار بە هەڵە بە کوردی دانراون، کە گۆران و لوڕن" (Mardoukhi and Sultani, 1998, p.38). ئەم تێڕوانینەی ئەو نوسەرە ئاسەواری لەسەر ڕوانگەی ئەکادیمی بەریتانی و ئەورووپی جێهێشتووە و بوەتە هۆی ئەوەی کە لە زۆر زانکۆ و دەزگای بەریتانیدا هەندێک جار تێکستە گۆرانەکان بخرێنە ناو خانەی زمانی فارسیەوە ( Mardukhi and Sultani, 1998).

مەکەنزی بێ متمانە کردن بە بەڵگەی مێژوویی ئەمەی کردووە، دەنا دەبینرێت کە لە ڕابوردوودا، بەپێی بەڵگە مێژووییەکان، نەک هەر کەس نەیگووتوە گۆران یان هۆرامی لە کرمانجی کەمتر کوردن، بەڵکو تەنانەت ئەو ناوچانەی کە گۆران و هۆرامیەکانی تێدا دەژین و زۆر لەو ناوچانەی کە کرمانجەکانی باکور و باشوری تێدا ژیاون لە سەردەمی ئاشوریەکاندا زیاتر بە (گوتی) ناو هێنراون.

دەبێت لێکۆڵەر پشت بە هەندێک سەرچاوەی مێژوویی زمانەوانی و ئارکیولۆجی ببەستێت هەتاوەکو بڕیار بدات کورد کێیە. دوای ئەوە دەتوانێت بڕیار بدات کە کوردی ڕاستەقینە کێیە و کوردەکەی تر کێیە. کەچی ئەو بێ پەنابردن بە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی ئەو هەڵە گەورەیەی کردووە. لە کاتێکدا کە لە ڕووی ئەکادیمیەوە ئەو جۆرە ناوانە بە تەواوی هەڵەن لە هەمان کاتدا سەرچاوە مێژووییەکان بە تەواوی ئەو جۆرە بۆچوونە بێ بنەمایانە هەڵدەوەشێننەوە. هەڵبەت هەندێک لێکۆڵەری نوێ هەستی بە لاوازی ئەو بۆچونانەی هاوشێوەی مەکەنزی کردوە، بۆیە یەکێک لەوانە دکتۆر لیزنبێرگ ( Dr. Leezenberg) کە لێکۆڵینەوەی ووردی سەبارت بە بۆچوونی مەکەنزی کردووە و لە ئاماژە دا بە بڕیارە توندەکانی سەبارەت بە کورد دەڵێت "داڕشتنەوەی زمانەوانی زمانە سەرەتاییەکان (proto-langauges)، بۆچوونێکی تیۆریە و بە هیچ شێوەیەک ناتوانرێت وەک ڕێگایەکی هاوتای خودی گۆڕانی مێژووی ڕەگەزی دابنرێت، بە لایەنی کەمەوە ئەگەر پشتگیری بەڵگەیی لایەنی پەیوەستی وەک مێژوو، ئارکیولۆژی یان ئەنسرۆپۆلۆژی لەگەڵ نەبێت" (Leezenberg, 2011, p.15). لێرەدا لێکۆڵەر وەک کەسێکی ئەکادیمی بە کارێکی نەگونجاوی دەزانێت کە بەبێ بەڵگەی مێژوویی و ئارکیلۆژی و ئەنسرۆپۆلۆژی، بۆچوون سەبارە بە ڕەگەزی نەتەوەیەک بدرێت. بێگومان ئەو بۆچوونەی لایزنبێرگ هەر لە خۆیەوە نەبووە، چونکە لە جیهانی ئەکادیمیدا ئەو شێوەی لێکۆڵینەوەیە قبوڵ ناکرێت، بەڵام لە حاڵەتی کورد دا و بە هۆی بە سیاسی کردن و سوود وەرگرتن لە هەندێک بۆچوون، ئەو دیاردەیە کراوەتە جۆرێک لە راستی قبوڵ کراو.

جێگای سەرسوڕمانە کە مەکەنزی بێ ئەوەی شارەزای مێژوو بێت و کەسێک بێت کە لەو بوارەدا کاری کردبێت، کەچی زۆر بە دڵنیایی و جاری واش هەیە وەک کەسێکی نائەکادیمی و توڕە، ڕوانگەی لاوەکی سەبارەت بە مێژووی کورد داوە. هەڵبەت ئەوە لایەنێکە کە لە دەرەوەی تایبەتمەندی ئەودا بووە، کەچی زۆر بە ڕەوای زانیوە بۆچوونی زۆر زەق و دڵنیا و بێ هێشتنەوەی هیچ گومانێک، بخاتە ڕوو. ڕاستە مەکەنزی شارەزایی لەسەر زمانی کوردی هەبووە، بەڵام لەو لایەنەشدا کە شارەزایی تێدا هەبووە، زۆر جار لە جیاوازی ڕێزمانی ناوچەیی ناو ٬ هەمان زاراوە بێ ئاگا بووە و هەندێک جاریش تەنها پێنج کاتژمێرێکی بۆ ئاشناییەکەی بە زاراوە کوردیەکان تەرخان کردوە، کەچی لێکۆڵینەوەی لەسەر نوسیون (Meho and Maglaughlin, 2001, p.170) و ڕوانگەشی لەسەر داون.

دیارە مەکەنزی هەوڵی نەداوە بزانێت کە دەستەواژەی (کورد) لە مێژوودا لە سەرەتای سەدەکانی زایینەوە وەک چەترێک بۆ ئاماژەکردن بە کۆمەڵێک زاراوە یان دەڤەری جیاوازی کوردستان بەکارهاتووە، بێ ئەوەی کە هیچ کام لەو زاراوە و دەڤەرانە لەوەی تریان کەمتر یان زیاتر بە کورد زانرابێت. پێشتریش لە سەدەکانی پێش زاییندا "گوت" بە هەمان شێوە ناوێکی گشتی بووە و زۆر جار بۆ مید، مانی و هوری بەکارهاتووە و لە تۆماری بابلیدا گوتی و مید وەک یەک خەڵک مامەڵەی لەگەڵدا کراوە و هەمان شتیش لەگەڵ مید و سۆمەریدا کراوە (بڕوانە سۆمەریەکان).

بێگومان دەبێت ئەوە بزانرێت کە بناغەی بۆچوونەکانی مەکەنزی لەسەر ئەو بنەمایە دانرابوو کە بنەچەی زمانە هیندۆزاگرۆسی (ئێرانی)ەکان، زمانی فارسی کۆن و سانسکریتی بێت، بەڵام هەزاران بەڵگەی ئەم

کتێبە دەیسەلمێنن کە ئەو بۆچوونانە لە هەموو ڕاستیەکەوە دوورن. لەبەر ئەوەی کە بنەچەی زمانی کوردی لە سانسکریتەوە سەرچاوە وەرناگرێت و ئەو پەیوەندیەی کە بە فارسی کۆنەوە هەیەتی بەو جۆرە نیە کە هەتا ئێستا باس دەکرێت، بۆیە چیتر پێویست ناکات بە گرنگ سەیری لایەنی ڕێزمانی لێکۆڵینەوەکانی مەکەنزی، سەبارەت بە زمانی کوردی بکرێت. بێگومان پێویستە بەیاد بهێنرێتەوە کە لە ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان زمانی کوردی و فارسیدا دەردەکەوێت کە زمانی فارسی نوێ بە ئاڕاستەی کوردی گۆڕاوە و فارسی لە کوردی دەچێت نەک بە پێچەوانەوە.

هەندێک لەو بۆچوونە بێ بەڵگە و نا ئەکادیمیانە بەکارهێنراون بۆ مەبەستی سیاسی و هەندێک جار بوونەتە هۆی ئەوەی کە لە ناو کەمینەیەک لە هۆرامی و زازا و گۆرانەکاندا توزێك گومان لە کورد بوونی خۆیان بکەن. شایانی باسە کە هەتاوەکو ئەو کاتەی کە ئەکادیمیە ئەوروپیەکان هاتن و بە شێوەیەکی لاوەکی کۆمەڵێکیان لە خانەی کورد بەدەرکرد، وەکو ئەوەی پۆلێنی باڵندە بکەن، هیچ کات لە مێژوودا ئەم بابەتە نەهاتۆتە کایەوە.

بۆچوونی لەو جۆرەی مەکەنزی زیاتر لە فەرهەنگێکی کۆلۆنیالیزمیانەوە هاتووە و ڕەنگدانەوەی بۆچوونی ئەو سەردەمەی هەندێک لە ئەکادیمیە ئینگلیزیەکانە بەرامبەر نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات. چۆن دەسەڵاتدارە سیاسیەکان ڕێگایان بە خۆیان دەدا کە دوو خەت بەسەر وڵاتی کوردستاندا بکێشن و بیکەنە چوار بەش، بە هەمان شێوە ئەکادیمیەکی وەک مەکەنزی بە ڕەوای زانیوە لە ژوورێکی زانکۆکانی بەریتانیادا دابنیشێت و تەنها لەسەر هەندێک بنەمای ڕێزمانی بڕیار بدات کە هەندێک کوردن و هەندێک کورد نین و هەندێک کوردی ڕاستین و هەندێک کوردی ڕاستی نین.

لە ڕاستیدا دیاردەی زاراوە کوردیەکان لەلایەن مێژوو نوسە ئیسلامەکانیشەوە دەرکی پێکراوە و ئاماژەی پێ کراوە، بەڵام ئەوان لە خانەی کوردیدا ئەو جیاوازیەیان بینیوە. کەسێکی وەک ئەلعومەری (١٣٠١ز-١٣٤٩ ز) سەبارەت بە کورد و زاراوەکانی لە کتێبی (مسالك الابصار في ممالك الامصار) دا دەڵێت "کوردەکان، هەرچەندە زۆر جۆریان هەیە کە لە بەشەکانی ئەم کتێبەدا باسکراون، بەڵام ئەو بەشانە پێکهاتەی جۆرێکی گشتین"( العمري، ٢٠١١). عومەری بە دەستەواژە زمانەوانیە سادەکانی ئەو سەردەمە دەیەوێت بڵێت کە کورد هەرچەندە زاراوەی جیاوازی هەیە، بەڵام هەموویان بە یەک زمان و یەک نەتەوە دادەنرێن. عومەری باسی کوردەکان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا دەکات و دێتە سەر باسی گۆرانەکان، ئەو بە (کوران) ناویان دەبات، لەبەر ئەوەی نە پیتی (گ) و نە پیتی (ۆ) لە عەرەبیدا نین و دەڵێت "تایفەیەکیان هەیە لە شاخەکانی هەمەدان و شارەزوور پێیان دەگووترێت گوران، ئەمانە هەموویان لە ناوچەیەکدا نیشتەجێن کە پێی دەگووترێت ڕیاوست (ریاوست) ی ئەمیر محەمەد، وە شوێنی دووهەمیان پێی دەگووترێت دەرتەنگ و ئەمیرەکەیان ئەمیر محەمەدە"( العمري، ٢٠١١). دەبینرێت کە ئەو ناوچە جوگرافیەی کە ئەو باسی لێوە دەکات، هەر هەمان ناوچەیە کە گۆرانەکان ئەمڕۆ تێیدا دەژین. شایانی باسە کە ئەم بۆچوونە و هەمان ناو لەلایەن قەشقەندی (١٣٥٥-١٤١٨) و شەرەفخانی بدلیسی (١٥٤٣-١٦٠٣) وە دووبارە کراوەتەوە. هەروەها مەسعودیش (٨٩٦ز- ٩٥٦ز) نزیکی پێنج سەدە پێش عومەری ئەو بۆچوونە دووبارە دەکاتەوە کە کوردەکان بە زاراوەی جیاوازی کوردی قسەیان کردووە و هەر کام لەو زاراوانە بە کوردی دادەنێت و دەڵێت "هەر کام لە جۆری کوردەکان زمانێکی کوردی خۆیان هەیە" (المسعودي، ٢٠١١). جگە لەمانەش ئەولیا چەلەبی (١٦١١ز-١٦٨٢ز) کە بە ڕەگەز تورک بووە، سەبارەت بە زمانی کوردی دەڵێت "خاوەنی شاری جودی کە کوردوم شایە و ئۆمەتی نوح بووە، شەش سەد ساڵ ژیاوە و بە نێو هەموو کوردستاندا گەڕاوە، کە گەیشتۆتە مەیفارقین ئاوو هەواکەی زۆر چۆتە دڵیەوە و تێیدا نیشتەجێ بووە، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی زۆر بوون، ئەم خەڵکە لە خۆیانەوە زمانێکیان داهێنا کە نە عەرەبی و نە فارسی و نەعیبری و نە دەریە، ئەمڕۆ بەو زمانە دەڵێن کوردی و لە کوردستاندا بەکار دەهێنرێ. بە لام زمانی کوردیش دوازدە شێوەیە کە وشەکانیان لە یەکتر ناچێ و بۆ لەیەکتر گەیشتنی تەرجومانیان پێویستە" (چەلەبی، ١٩٧٨،پ.٩٠) هەر چەندە زاراوە کوردیەکان هێندە جیاواز نین کە چەلەبی باسی لێوە دەکات، بەڵام دیسان ئەو ڕاستیە دووبارە دەکاتەوە، کە بە درێژایی مێژوو هەموو زاراوەیەکی کوردی، هەر کوردیە و بە کوردیش دانراوە، نەک لەلایەن کوردەوە، بەڵکو لەلایەن

بیگانەشەوە. ئەوەی کە چەلەبی دەڵێت هەر دووبارەکردنەوەی بۆچوونی سۆمەریەکانە سەبارەت بەوەی کە ئەوان پێیان وا بووە سەرەتا بە یەک زمان قسەیان کردووە و دوایی زمانەکان دروست بووە و ئەو بۆچوونەش لە تەوراتدا دووبارە بووەتەوە (بڕوانە سۆمەریەکان). پێدەچێت کە دەرکەوتنی زاراوە کوردیەکان بگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش سۆمەریەکان و ئەوان ئەو ڕاستیەیان وەک داستان گێڕاوەتەوە و هەتاوەکو سەدەی حەڤدەی زاینی ئەو داستانە هەر لە ناوچەکەدا بە تۆزێک گۆڕانەوە ماوە، بۆیە چەلەبی ئاماژەی پێکردووە (بڕوانە سۆمەریەکان). بە دڵنیایی جیابوونەوەی زاراوە کوردیەکان شتێکی نوێ نیە و ئەو هەمەچەشنی زاراوەییەی کە ئەمڕۆ دەبینرێت، سەرچاوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێکی زۆر دێرین و ڕەنگدانەوەی ئەو هەمە چەشنیەیە کە لە ژێر ناوەکانی سۆمەری، گوتی، هوری، هیتی، لوڤی، ئیلامی، میدی، مانی، کاسی، هتد. دا دەردەکەوێت و ئەمڕۆ بووەتە سۆرانی، لوڕی، هۆرامی، زازا، گۆران، بادینی، کرمانجی، هتد.

ئەگەر سەیرێکی شیعری کۆنی زاراوە جیاوازەکانی کوردیش بکرێت، ئەوا زۆر ڕونتر و ئاشکرا تر خاوەن شیعرەکان کوردی بوونی خۆیان بە شانازیەوە دەڵێن سەرەڕای جیاوازی زاراوەکانیان. بۆ نموونە باوە سەرهەنگی دەودانی، لە ساڵی ٩٣٦ ز دا لە ناوچەی شاهۆی هۆرامان هاتۆتە دنیاوە و یەکێک بووە لە پەیرەوانی ئاینی یارسان، لە شیعرێکیدا دەڵێت:

"سەرهەنگ دەودان، سەرهەنگ دەودان، ئەز کە ناممەن سەرهەنگ دەودان،

چەنی ئێرمانان مەکێلم هەردان، مەکۆشم پەری ئاینی کوردان"

ماناکەی دەبێتە (من کە سەرهەنگی دەودانم و ناوم سەرهەنگی دەودانە، لەگەڵ مریدەکان و خوڵامانی خۆمدا بە هەموو شوێن و جێگایەکدا دەسوڕێمەوە بۆ زیندو کردنەوە و بوژاندنەوەی ئاینی کوردان" (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٦٣). هەروەها کەسێکی وەک شاوەیس قولی کە لە ساڵی ١٤١٢ ز دا لە دێی دەرزیانی شاهۆدا لە دایک بووە، دەڵێت:

"ئەسڵمەن جەکورد، ئەسڵمەن جەکورد، بابۆم کوردەنان ئەسڵمەن جەکورد

من ئەو شێرەنان چەنی دەستەی کورد، سلسلەی سپای زوحاک کەردم هورد"

کە ماناکەی دەبێتە (بنەچە و ڕەگەزی من کوردە، بابم کوردە و لەو ڕەسەنەم، من ئەو شێرەم کە لەگەڵ دەستەیەک کورد دا سوپای زوحاکمان لەناو برد) (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٣٨٣). هەروەها خانای قوبادی (١٧٠٤ز- ١٧٧٨ز) لە شیعرێکدا دەڵێت:

"ڕاستە مەواچان فارسی شەکەرەن          کوردی جە فارسی بەل شیرین ترەن

پەی چێش نە دەوران ئی دنیای بەدکێش  مەعلومەن هەر کەس بە زمان وێش"

واتە (ڕاستە ئەڵێن فارسی وەک شەکر وایە، بەڵام کوردی لە فارسی شیرین ترە، بۆچی ناچەرخی دنیای بەد کێش، هەرکەس ئاشنایە بەزمانی خۆی ) (بۆرەکەیی، ١٩٩٦، پ.٤٣٥).

ئەم شیعرانە لە سەردەمێکدا نووسراون کە هێشتا ناسیونالیزمی ئەوروپی ڕووی نەکردبووە ناوچەکە و هەڵقوڵاوی بیرو بۆچوونێکی سروشتی کوردین و بە ئاشکرا تێیاندا دەردەکەوێت کە هۆرامیەکان بە زمانەکەی خۆیان گوتووە کوردی و فەخریان بە کوردبوونی خۆیانەوە کردووە.

هەروەها کاتێک کە ئەحمەدی خانی لە نێڕێکی چیرۆکی مەم وزیندا دەیەوێت هۆکاری نووسینی مەم و زین ڕوون بکاتەوە، دەڵێت:

"دا خەڵق نەبێژتن کو ئەکراد          بێ مەعریفەتن، بێ ئەسڵ وبونیاد

ئەنواعی میللەل خوادان کتێبن          کورمانج تەنێ دبێ حسێبن"

ماناکەی دەبێتە (تاکو بێگانە نەڵێن کورد نەزانن بێ هونەر و نوسەر و زمانن، بۆ ئەوەی کە خەڵکی خاوەن هزر پێمان نەڵێت کە دڵداری لە ناو کورد دا نەبوو) (ئەحمەدی خانی، ١٩٨٩، پ.٢٤). خانی بە زاراوەی کرمانجی سەروو قسە دەکات، بەڵام ئەویش وەک هۆرامیەک هەر بە هەمان شێوە خۆی بە کورد زانیوە و هیچ کام لەوانە خۆی نە بە کەمتر نە بە زیاتر بە کورد نەزانیوە لەوی تریان و مێژوو نوسانیش دیسان ئەم ڕاستیەیان دووبارە کردۆتەوە.

دەبینرێت کە زۆر لە شاعیرە کوردەکان بە هەردوو زاراوەکە شیعریان نووسیوە و هەردووکیشیان بە یەک زمان زانیوە. دیارە بەهۆی ئەو مێژووە کۆنەی ئەو زاراوانە لەگەڵ یەکتریدا هەیانبووە، شاعیران بە دیاردەیەکی سروشتی سەیری جیاوازی نێوان ئەو زاراوانەیان کردووە. بۆیە خەڵکانی وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣١ ز- ١٩١٠ز) و مەستورە خانمی کوردستانی (١٨٠٥ز ١٨٤٨ز) و چەندین شاعیری کوردی تر بە هەردوو زاراوەی گۆران و کرمانجی خوارو شیعریان گوتووە.
ئەم بەڵگە مێژووییانە هەموویان پێچەوانەی ڕوانگەکانی مەکەنزین سەبارەت بە بڕیارە بێ بنەماکەی و داهێنانی دەستەواژەی "کوردی ڕاستەقینە" و تەنانەت دەرکردنی هەندێک لە گروپە کوردەکانی وەک گۆرانەکان لە خانەی نەتەوەی کورد. سەرچاوە مێژووییە کوردیەکان و بێگانەکانیش ئەوە دوپات دەکەنەوە کە ناوی "کورد" ناوێکی گشتی بووە بۆ هەموو زاراوە و گروپە جیاوازە کوردیەکان بەکارهاتووە، جا ئەو گروپە زازا، هۆرامی، گۆران، لوڕ، لەک، کەڵهوڕ، کرمانج، سۆران یان هەر ناوێکی دووهەمینی لە خۆی نابێت. هیچ گروپێک لە مێژوودا کوردی ڕاستەقینە و گروپێکی تر کوردی ناڕاستەقینە نەبووە؛ هەموویان، سەرەڕای جیاوازی زاراوە و هەندێک جار باش لە یەکتر نەگەیشتنیش خۆیان بە کورد زانیوە. کەچی لێکۆڵەرەکان لەبری هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لەو دیاردەیەی کە دەیان بەڵگەنامەی مێژوویی پشتگیری دەکات، هاتوون هەموو مێژوویان ڕەتکردۆتەوە و لە ژوورێکی زانکۆکانی ئەوروپادا دانیشتوون و بە ئارەزووی خۆیان کوردیان پۆلێن کردووە. ئەگەر مەکەنزی تەنها سەیری ناوی زانا و سۆفیگەری وەک ئیبراهیم شارەزووری کوردی گۆرانی (ابراهيم الشهرزوري الكردي الكوراني) بکردایە ئەوا بۆی دەردەکەوت کە بۆچوونەکەی لە بناغەوە هەڵەیە.

**ئایا لوڕەکان کوردن؟**

لە ژینگەیەکی سروشتیدا و دوور لە کاریگەری دەرەکی سەپێنراو، خەڵک خۆی بڕیاری هەڵبژاردنی ناسنامەی خۆی دەدات و کەس مافی سەپاندنی ناسنامەی بەسەر خەڵکانی تردا نیە. لە ژینگەی کوردستاندا مافی خەڵک و ڕاستی مێژوویی هەمووی تێکەڵ کراوە و بە گشتی ڕاستیەکان لە خەڵک تێکدراوە. لە ڕووی مێژوویی و فەرهەنگیەوە، لوڕەکان بە درێژایی مێژوو بە کورد دانراون و خۆشیان بە کورد داناوە. بەڵام لە سەدەی بیستەمدا و لە ژێر کاریگەری لێکۆڵەرە ئەوروپیەکان و ئایدیۆلۆجیای پان ئێرانیزم و ناسیونالیزمی فارسی و ئێرانیدا، گۆڕان لە بۆچوونی هەندێک لە لوڕەکاندا ڕووی داوە.
ناوی لوڕیەکان وا دەردەکەوێت کە پێکهاتبێت لە وشەکانی (لۆ هوری lo huri) کە ماناکەی بە زمانی کوردی دەبێتە (پیاوە هوریەکان، پیاوە خۆرپەرستەکان) و بە زمانی هوری وشەکانی (لو خورویی lu xurrúγi) ماناکەی دەبێتە (پیاوە هوریەکان). ئەم ناوە لە ناو کەڵهورەکانیشدا دەردەکەوێت کە دراوسێی لوڕەکانن. کەڵهورەکان ناوەکەیان پێک دێت لە (کەڵ+هوری) کە ماناکەی لە کوردیدا دەبێتە (ئازا/نایاب/مەزن+هوری) واتە (هوریە نایابەکان، خۆرپەرستە نایابەکان) لە زمانی هوریدا وشەی (کل خورویی kil xurrúγi) ماناکەی دەبێت (هوریە نایابەکان). ئەوەی کە دڵنیای دەکات وشەی (خۆر/هۆر) ی کوردی هەر مانایەکی نزیکی هەبووە لە زمانی هوریدا، ئەوەیە کە هوریەکان بە کاتی بەیانیان دەڵێن xurri کە ماناکەی لە وشەی (خۆر) ی کوردی نزیکە و دەبێت ئەوەش بزانرێت کە وشەی (خۆر) لە کوردیدا بە هەردوو شێوەی (خۆر/هۆر) هەیە.
ئەم پەیوەندیە هەر لە ناودا نیە، دەبینرێت شەرەفخانی بەدلیسی کە مێژووی نەتەوەی کوردی نووسیوە، لوڕەکانی بە بەشێک لەو چوار گروپی پێکهاتەی نەتەوەی کوردی داناوە و هەتاوەکو سەدەی بیستەم کاتێک کە لە لوڕەکانیان پرسیوە ڕەچەڵەکی لوڕ لە کوێوە هاتووە، لوڕەکان هاوشێوەی هەموو کوردێک چیرۆکەکەی سلێمانیان گێڕاوەتەوە (Edmonds, 2010, p.185).
جگە لەوەش ئەگەر سەرنجی هەندێک دیاردە و لایەنی کولتوری لوڕەکان بدرێت، ڕاستیە مێژووییەکە بە ڕوونی خۆی دەنوێنێ. بۆ نموونە ئەگەر ئەمڕۆ سەیری ناوچەی لوڕەکان بکرێت، دەبینرێت یەکێک لە

ناوچە گرنگەکانی نیشتەجێبوونی لوڕەکان بریتیە لە (شهرکرد)[107] کە مانای (شاری کورد) دەدات. بە درێژایی مێژوو، ئەو ناوچەیە هەر لوڕەکانی تێدا بووە. ئایا دەکرێت شاری لوڕەکان بە ناوی کوردەوە بێت و خۆیان کورد نەبن؟ ئەی کوردەکان کێ بن کە ئەو شارەیان بە ناوەوە ناونراوە؟ هەروەها دەبینرێت کە لوڕەکان وەک هەموو کوردێک هەڵپەڕکێ دەکەن و دەهۆڵ و زوڕنا، کە ئامێری تایبەت بە هەڵپەڕکێی کوردیە، لە ناو لوڕەکاندا هەیە و وەکو هەموو بەشەکانی تری کوردستان تایبەتمەندی خۆیان هەیە، بەڵام بە تەواوی جیاوازە لە فارسی.

یەکێک لە ئاینە ڕەسەنەکانی کورد کە ئاینی یارسانی (کاکەیی) یە، دانەر و پەیڕەوکارانی لە ناو گۆران و لوڕکان و هەندێک جار سۆرانەکانیشدا هەبوون. لە کتێبی پیرۆزی سەرئەنجامی یارسانەکاندا شعیری لوڕی و گۆرانی بە شێوەیەک تێکەڵ بووە کە لە یەکتر جودا ناکرێتەوە. کەسایەتی وەک شاخۆشین و بابە تایەری هەمەدانی و چەندینی تر کە بە کەسایەتی گرنگی ئەو ئاینە دادەنرێن، هەموویان لوڕن، لە هەمان کاتدا زۆرینەی پەیڕەوکەرانی ئەو ئاینە لە گۆرانەکانن. گوێزانەوە و بۆچوونی ئاینی و ڕوانگەی فەرهەنگی نێوان لوڕ و گۆرانەکان بە ڕوونی ئەو هاوبەشیە مێژووییە نیشان دەدات کە لە نێوان بەشە جیاوازەکانی کورد دا بە درێژایی مێژوو هەبووە.

یەکێک لەو تایبەتمەندیانەی کە لە ناو کورد دا بە درێژایی مێژوو دەرکەوتووە و مێژوونوسان ئاماژەیان پێکردووە، دیاردەی دەسەڵاتدارێتی ئافرەت بووە. دەرکەوتنی ئافرەتی بە دەسەڵات هەمیشە بەشێك بووە لە فەرهەنگ و مێژووی کورد، بە پێچەوانەی زۆر لە نەتەوە دراوسێکانی، کورد بە سەدان ئافرەتی ناوداری تێدایە. یەکێک لەو ئافرەتە لوڕە بەناوبانگانەی کە بە توندی بەرامبەر بە ڕەزا شا وەستایەوە، (قەدەم خێر) بوو. قەدەم خێر بە فەرهەنگ و هەڵسوکەوت وەک هەموو ئافرەتێکی کورد بووە کە بەدرێژایی مێژوو هەموو ڕۆڵێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی پیاویان بینیوە.

بەداخەوە لایەنی سیاسی باڵی کێشاوە بەسەر دانانی لوڕەکان لە خانەی دەرەوەی کورد دا. چونکە ئەگەر سەرنج بدرێت زاراوەی لوڕی هەر هەمان ئەو زاراوەیە کە فەیلیەکان لە باشوری کوردستان لە ناوچەکانی نزیک بەغدا قسەی پێ دەکەن. فەیلیەکان لەبەر ئەوەی کە لەژێر کاریگەریی ناسیۆنالیزمی فارسی و پان ئێرانیزمدا نین، هەر خۆیان بە کورد دەزانن. ئەگەر لەسەر بنەمای زمان لوڕەکان لە فارسی نزیک بخرێنەوە، ئەوا ئەو بۆچوونە هەڵەیە. لەبەر ئەوەی کە وەک لەم کتێبەدا ڕوونکراوەیەوە، بە پشت بەستن بە سەدان بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی، دەردەکەوێت کە فارسی نزیکبووەتەوە لە کوردی و سۆمەری نەک کوردی بەلای فارسیدا.

هیچ گومانێک نیە کە لوڕەکان بە درێژایی مێژوو خۆیان بە کورد ناساندووە و تەنها لە سەدەی بیستەمدا و لەژێر کاریگەری ناسیونالیزمی فارسی و پان ئێرانیزم و لێکۆڵینەوە ئەکادیمیە ئەوروپیەکاندا گومانیان لە کوردبوونی خۆیان لە لا دروست بووە. دەنا لوڕەکان بە پێی بەڵگەنامە مێژووییەکان، لێکچوونی مۆسیقا و سەما، زمان، ئایین، پەیوەندی کۆمەڵایەتی، هتد. وەک هەموو کوردێکی ترن.

**دابەشکردنێکی نوێ بۆ قۆناغەکانی زمانی کوردی**

بە ڕەچاوکردنی ئەو هەزاران بەڵگانەی کە خراونەتە ڕوو، چیتر ئەو تیۆریە کۆنانە و ئەو شوێنەی کە بۆ زمانی کوردی کە لەلایەن زمانەوانەکانەوە لە ناو نەخشەی دابەشکردنی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دانراوە، کە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا بۆ نموونە خرایە ڕوو، مانا نادات و ناتوانرێت متمانەی بکرێتە سەر. بە هیچ جۆرێکیش گوزارش لە پێگەی زمانی کوردی لە ناو زمانە دێرینەکاندا ناکات. دابەشکردنی زمانی کوردی بۆ قۆناغی جیاواز کارێکی ئاسان نیە، لەبەر ئەوەی کە زمانی کوردی لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە لە چەند زاراوەیەکی جیاواز پێکهاتووە و ئەو جیاوازیە هەر بەردەوام بووە. بۆیە لەبەر نەبوونی بەڵگەی ڕوون و

---

[107]. هەندێک هەوڵ دراوە بۆ ئەوەی کە ڕوونکردنەوەی مانای ئەو شارە بگۆڕدرێت و وشەی (کورد) بگۆڕدرێت بە شتێکی تر، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی ڕوون نەخراوەتە ڕوو و وا دەردەکەوێت کە مەبەستی سیاسی لە پشتەوە بێت.

پرۆسەی گۆڕانکارمیەکان زۆر گران دمبێت کە بتوانرێت قۆناغەکانی هەر کام لەو زاراوانە لەو سەردەمەوە ڕێکبخرێت و بە شێوەیەکی دروست دابەش بکرێت. بە مەبەستی ئاسانکاری دەتوانرێت زمانی کوردی بکرێت بە سێ قۆناغی سەرەکیەوە؛ قۆناغی کوردی کۆن، قۆناغی کوردی ناوەند و قۆناغی کوردی نوێ. هەر وەک لە خوارەوە ڕوونکراونەتەوە:

١. قۆناغی کوردی کۆن: زمانی سۆمەریەکان کە کۆنترین زمانی نوسراوە لە جیهاندا و بناغەی ڕێزمان و وشەکاری کوردی نوێیە، دەتوانرێت بە قۆناغی سەرەتای زمانی کوردی دابنرێت. ئەم قۆناغە زمانی هیتی و هوری و کاسی و لۆلۆبی و چەندین زاراوە و زمانی تری تێکەڵ بووە و بووتە هۆی دروستبوونی زاراوەی جیاوازەکانی ئەمڕۆ. لەبەر نەبوونی تێکست پێش سۆمەریەکان، ناتوانرێت شتێکی ئەوتۆی ڕوون سەبارەت زمانی پێش سۆمەریەکان بگووترێت، بەڵام قۆناغی زمانی کوردی کۆن هەتاوەکو هەزارەی یەکەمی پێش زایین بەردەوام دەبێت و ئەو زمانە لە مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆلیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە گشتی، لە ژێر ناوی جیاوازدا قسەی پێکراوە.

٢. قۆناغی کوردی ناوەند: بەپێی ئەو بەڵگانەی کە خرانە ڕوو، دەتوانرێت زمانی مانی و میدی، کە لە ژێر زاراوەی جیاوازدا بەکار هاتووە، بە قۆناغی ناوەندی زمانی کوردی دابنرێت. ئەم قۆناغە بە نزیکی لە هەزارەی یەکەمی پێش زایینەوە دەست پێ دەکات کە زمانی ئەو سەردەمەی کوردستان و بەشێک لە مێسۆپۆتامیا بووە.

٣. قۆناغی کوردی نوێ: هەموو ئەو زاراوانەیە کە لە کوردستاندا قسەی پێ دەکرێت و لە نزیکی سەدەی هەشتەمی زاینەوە کۆنترین شیعری پێ نووسراوە. دەتوانرێت کە سەدەی هەشتەمی زانینی، واتە سەردەمی باڵولی ماهی (باڵولی دیوانە) بە دەستپێکردنی ئەم قۆناغە دابنرێت.

# کورد و ڕەچەڵەکی کورد

**ناوی کورد لە کوێوە هاتووە؟**

هەتاوەکو ئەمڕۆ چەندین بۆچوونی جیاواز سەبارەت بە ڕەچەڵەک و مانای ناوی کورد لە ئارادان. هەندێک ناوەکە دەگەڕێنێتەوە بۆ سەردەمی فارسەکان و هەندێکی تر دەیگەڕێنێتەوە بۆ زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ. هەندێک دەڵێن مانای ناوەکە بریتیە لە (ئازا، جەنگاوەر، پاڵەوان) هەندێکی تریش دەڵێن کە (کورت) پێچەوانەی مانای (درێژ) دەدات.

ئەمڕۆ ڕێکەوتنێکی تەواو لەسەر بنەچەی ناوی کورد نیە و هەندێک جار نەگونجانی زۆر لە نێوان بۆچوونەکاندا بەدی دەکرێت. بەڵام گەر بە قوڵایی مێژووودا سەیر بکرێت، دەبینرێت کە لەو ناوچەیەدا کە ئەمڕۆ بە کوردستان ناو دەبرێت، زۆر جار ئاماژە بە خەڵکانێک بە شێوەی جیاواز و تا ڕادەیەک نزیک لە ناوی "کورد" کراوە. بۆ نمونە (گود،گوت، قوت، کوت، قاردو، کاردا، کاردی، گوردو، گوردی، قەرەدو، قوتێ، قوتی، کوتی، کاردوخی هتد).

وشەی (گود gud) لە زمانی سۆمەریدا مانای (ئازا، جەنگاوەر، پاڵەوان) دەدات، بەڵام نەتەوە سامیەکان زۆرجار پیتی (د) دەکەنە (ت) و (ک) دەکەنە (ق) بۆیە ناوەکە لای ئەوان کراوە بە (Kut, Qut). هەروەها ئەگەر تەرجومەی وشەی (گود gud) ی سۆمەری بکرێت بۆ زمانی ئەکەدی، ئەوا وشەکە دەبێتە (کەرادو qarrādu) (University of Pennsylvania, 2006). بەو جۆرە ئەو دوو ناوە جیاوازە لەلایەن دوو زمانی جیاوازی سەرەتای شارستانیەتی مێسۆپۆتامیاوە بەکارهاتوون، هەردووکیشیان هەر هەمان مانایان داوە. لەبەر کۆنی ناوەکە و بەکارهێنانی لەلایەن نەتەوەی جیاوازەوە، ئەو جیاوازیە لە تێکستە مێژووییەکاندا دروست بووە. بۆ نموونە شێوە زمانی ئاشوری وای لەو دوو ناوە کردووە کە بکرێنە (کورتێ Kurte) و (کوتی Kuti) یان (قوتی Quti). لە ڕاستیدا ئەوانە هەمووی هۆکاری ئەو جیاوازیەن کە لە ناوەکەدا[108] بەدی دەکرێت و لە سەرەتای شارستانیەتی مێسۆپۆتامیاوە کە خەڵک گوتوویەتی (گوت) هەر هەمان مەبەستی لە (قاردو/کرادو/کورد) بووە. لەبەر ئەوەی کە هەردوو ناوەکە تەرجومەی یەکترین بۆ دوو زمانی سەرەکی مێسۆپۆتامیا. لە سەردەمی برەوی زمانی سۆمەری و هوری و مانی و میدیدا ناوەکە زیاتر بە گود/گوت ناسرابوو. لەگەڵ برەوی زمانە سامیەکاندا، بە تایبەتی زمانی ئارامی، وورده وورده ناوی گود/گوت بزر بوو و تەرجومە سامی و ئارامیەکەی ناوەکە زاڵ بوو، بۆیە لە دوای سەدەکانی زایینەوە ناوی کورد شوێنی گود/گوتی گرتەوە و وورده وورده گود/گوت لە ناوچوو، بەڵام سەرەرای ئەوە لە هەندێک سەرچاوەدا و لە سەدەکانی زاییندا هەر ناوە کۆنەکە هەندێک جار دەردەکەوێت کاتێک کە لە قورئاندا شاخی (کاردو/قاردو) بە (جودی) باس دەکرێت؛ لە قورئاندا هەر بە ناوە کۆنەکەی کە (گود) بووە هاتووە، تەنها جیاوازیەکە لەوەدایە کە پیتی (گ) کە لە عەرەبیدا نیە، گۆڕاوە بە (ج) و ناوەکە کراوەتە (جود).

سەرچاوەیەکی زۆری ئاشوری و بابلی و ئەکەدی و سۆمەری ماوە کە دەتوانرێت متمانەیان بکرێتە سەر بۆ نووسینەوەی مێژووی رابردووی دێرین؛ ئەم سەرچاوانە لە سەردەمی جیاواز و لەلایەن نەتەوە و لە ناوچەی جیاوازیشدا نووسراون. بۆیە بۆ ئاماژەکردن بە هەمان خەڵک وشەکانی وەک gud و qarradu و kurd بە شێوەی جیاواز بەکارهاتووە و بە شێوەی gud, gut, qut, kut, qardu, kurda, kardy, godu, gordi نوسراوە.

لێکۆڵەر درایڤەر، هەوڵێکی زۆری داوە بۆ لێکدانەوەی ناوی کورد و لە لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانیدا سەلماندوویەتی کە ناوەکانی Karda, Qarta, Qurtie, Gortu, Carduch, Kurt سەرەرای جیاوازیان، هەموویان کۆمەڵێک ناوی ترن بۆ کورد (Driver, 1992, P. 67 & 68). جگە لە گرنگی لێکۆڵینەوەکەی درایڤەر، بەڵگەی مێژوویی زۆر گرنگ هەیە کە بە ڕوونی پشتگیری لەو بۆچوونە دەکات. یەکێک لەو بەڵگە مێژووییە گرنگانەی کە دەبێتە پاڵپشتێکی پتەو بۆ ئەو ڕوانگەیە، ناوهێنانی کەشتیەکەی نوح و

---

[108]. هەتاوەکو ئەمڕۆش دەبینرێت کە ناوەکە لە لایەن نەتەوە دراوسێکانیەوە بە جیاواز دەگووترێت. فارس بە (کۆرد) ی ناو دەبات و تورک بە (کیورت).

ناوچەکەیەتی لە تێکستە مێژوویی و ئاینیەکاندا کە دەتوانێت بیسەلمێنێت کە ئەو ناوانە سەرەڕای جیاوازیان هەر هەمان ناون. ئەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ پێی دەگووترێت جەزیرە هەتاوەکو ناوچەی وان، لە بنەڕەتدا ناوی کوردیان (Gordene, Kordene) بووە، بەڵام ئارامیەکان بەشێکی ناوەکەیان تەرجومە کردووە و کردویانەتە (بیت قاردو) [109]. لە تۆماری یۆنانی و ڕۆمانەکاندا ناوە هوری/کوردیەکە وەک خۆی هێڵراوەتەوە و کراوەتە Kordene/Cordene (بڕوانە دەوڵەتی کوردیان).

بە درێژایی مێژوو سەرچاوە ئاینی و مێژووییە جیاوازەکان باسی ناوچەکەیان کردووە و لە هەمان کاتدا بە شێوەی جۆراوجۆر ئاماژەیان بە نوح کردووە و باسی شاخ و ناوچەکەیان کردووە کە کەشتیەکەی لەسەر گیرساوەتەوە. ئەمڕۆ ئەو شاخە دەکەوێتە نێوان شاری شیرناخ و جەزیرە لە باکوری کوردستان و پێی دەگووترێت چیایێ جودی (Çiyayê Cûdî) و(تورکەکان کردوویانەتە Cudi Dağı)، ئەو ناوچەیە پێشتریش لە تۆماری سۆمەریەکاندا باسکراوە. لەم خشتەیەی خوارەوەدا دەبینرێت کە ناوی کورد لەو ناوچەیەدا لە داستانەکەی نوح و ڕووداوەکانی تردا بەشێوەی جیاواز باسکراوە:

- سەرچاوەی سۆمەری: لە نزیکی هەزارەی سێهەمی پێش زاییندا لە تێکستی سۆمەریەکاندا ناوی ناوچەیەک هاتووە بەشێوەی (خاکی کاردا (Land of Kurd)). ئەم ناوچەیە بە تەنیشت ناوچەی (سو)وە ناو براوە کە هەندێک بە سوبارتو (Subartu)ی ناو دەبەن. ئەو جێگایە دەکەوێتە ژێر دەریاچەی وانی ئەمڕۆ (Driver, 1992,67). هەروەها لە تێکستە ئاشوریەکانیشدا دیسان خاکی کورتێ هەر لە نزیک شوبارتو (Shubartu) ناوی هاتووە (King, 1904, p.48). دەبینرێت کە هەردوو سەرچاوە سۆمەری و ئاشوریەکە باسی هەمان ناوچە دەکەن. بێگومان سەرچاوە سۆمەریەکە بە کۆنترین سەرچاوە بۆ ناوی کورد لە مێژوودا دادەنرێت، لەبەر ئەوەی کە هیچ نوسینێک لە پێش سۆمەریەکاندا نەدۆزراوەتەوە.
- ئەرشیفی ماری [110] (Mari Archive): لە ئەرشیفی ماریدا بە سەدان جار ناوچەیەک بە ناوی Kurda (کوردا) هاتووە کە لە ڕووی جوگرافیەوە هەر هەمان ناوچەی جەزیرەی ئەمڕۆیە. هەروەها ناوی Kurda لە ئەرشیفی دوکان (The Shemshāra Archives) [111] دا چەندین جار باسکراوە ( Eidem and Læssøe, 2001)، بەڵام لە ئەرشیفی ماریدا زۆر بە وردی زانیاری سەبارەت بە kurda دراوە کە بەپێی ئەو سەرچاوەیە لە ڕووداوەکانی ئەو سەردەمەدا ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە و لە چەندین نامەی دیپلۆماسی و ڕێکەوتنەکاندا باسکراوە (Young, 1992) . شوێنی ناوچەی kurda هەر هەمان ناوچەی جەزیرەی ئیمرۆیە، لەبەر ئەوەی کە ناوچەکە لەگەڵ ناوچەی (تور عابدین) دا باسکراوە. مارگەریت فاڵکنەر پێی وایە کە هەمان ناوچەی Kurda هەتاوەکو سەردەمی ئاشوری نوێش هەر بە شێوەی Gurete پارێزراوە و ئەم ناوچەیە یەکێک بووە لە حەوت شاری دەسەڵاتی میتانیەکان کە ناوی خواکانیان وەک شایەت هاتووە (Young, 2001, p.14). نازناوی پاشای ناوچەی کوردە/کوردیان، بریتی بووە لە šar Kurda (Pitard, 1987, p, 42) کە ماناکەی بە زمانی هوری دەبێتە (پاشا/سەرکردەی کوردە).

[109]. ئەگەر تێبینی بکرێت لە زمانی کوردیدا دەگووترێت گەرمیان (گەرم+یان) و کوێستان (کێو+ستان) کە هەریەکەیان ئاماژەیە بە ناوچەی سارد و ناوچەی گەرم. کورد هەردوو وشەکانی (یان، ستان) بەکاردەهێنێت وەک ئاماژە کردن بە ناوچە یان وڵات. شایانی باسە کە وشە و پاشگری (یان) هوریە و بنەچەی وشەی (ستان) یش هەر سۆمەریە کە ئەوان بە aŝte ناویان هێناوە. کورد ئەمڕۆ لە وشەکانی وەک (دارستان، کافرستان/کافرسان، پارسان، ...) بەکاری دەهێنێت. وشەی (یان) ئەگەر تەرجومە بکرێتە سەر زمانی ئارامی، دەبێتە (بیت). لەبەر ئەوە هەمیشە ئارامیەکان ناوە کوردی دەڤەرەکانیان تەرجومە کردۆتە سەر زمانی خۆیان، هەندێک جار بەشێکی وشەکەیان هەر بە کوردی هێشتۆتەوە. بۆیە ناوچەی (کوردیان) لە سەرچاوە ئارامیەکاندا تەرجومە کراوە بۆ (بیت قاردو) و (گەرمیانی)ش کراوەتە (بیت گرمای).

[110]. ئەم ئەرشیفە یەکێکە لە گەورەترین کۆمەڵە ئەرشیفی کۆن کە لە ٢٥٠٠٠ تێکس پێکهاتووە و لە ناو وڵاتی سوریای ئەمڕۆدا لە ساڵەکانی هەزار و نۆسەد و سیدا لەلایەن فەرەنسیەکانەوە دۆزراوەتەوە و هێشتا تەرجومەکەی تەواو نەبووە. تێکستەکان بۆ مێژووی جیاواز دەگەڕێنەوە و زۆربەیان مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پێش هەزارەی دووهەمی پێش زایین.

[111]. ئەم ئەرشیفە لە ساڵی ١٩٥٧ دا، پێش دروستکردنی بەنداوی دوکان لە شوێنی ناوەکەی ئەمڕۆدا، لە لایەن تیمێکی دانیمارکیەوە دۆزرایەوە. ئەم جێگایە جگە لە کۆمەڵێک پاشماوە، ژمارەیەکی زۆریشی لە تێکست بە زمانی ئاشوری تێدا دۆزرایەوە کە دوایی تەرجومە کران. تێکستەکان زانیاری زۆریان سەبارەت بە ناوچەی کوردستانی ئەمڕۆ تێدایە کە زۆربەیان بریتین لە نامەی دیپلۆماسی و ڕێکەوتن و بەرپاکردنی جەنگ و بەرقەرابوونی ئاشتی (Eidem and Læssøe, 2001).

- تێکستە ئاشوریەکان: لە کۆمەڵێک تێکستی ئاشوریدا کە لە دووتوێی کتێبێکدا لەلایەن کینگ (L.W.King) بڵاوکراوەتەوە، چەندین جار ناوی وڵات/خاکی کورتێ (Land of Kurte) هاتووە و کینگ پێی وایە کە "خاکی کورتێ" دەکەوێتە لای سنوری باکوری وڵاتی سوریاوە (King, 1904, p.48). ئەوەش هەمان ناوچەی جەزیرەیە و لەو تێکستانەشدا چەندین جار ناوی (کورتێ Kurte) و (Shubaru شوبارو) بەیەکەوە هاتووە. ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە کە وۆڵکەر لە کتێبێکدا کە سەبارەت بە یەکێک لە شەهیدەکانی کریستیانی سەدەی چوارەمی شاری هەولێر نوسیویەتی، هەمان (بیت قاردو/کاردو) ی بە خاک/وڵاتی کورد (Land of Kurd) تەرجومە کردووە، بێ ئەوەی کە ئاگاداری ئەوە بێت کە ئاشوریەکان لە ١٢٥٠ ی پ.ز دا، هەمان ناوچەیان بە (Land of Kurte)[112] ناوهێناوە کە ناوچەی جەزیرەی ئەمڕۆیە (Walker, 2006, P.26). دیسان سەرەڕای زیاتر لە دوو هەزار ساڵ لە نێوان تێکستە سۆمەری و ئاشوریەکەدا، هەموویان بە گۆڕانێکی کەمەوە باسی هەمان خەڵک و ناوچە دەکەن.
- تێکستی پیرۆزی جوەکان: ئەو شاخەی کە کەشتیەکەی نوحی لەسەر گیرساوەتەوە، لە تێکستی پیرۆزی جوەکاندا کە بە هەگادە (Haggada) ناسراوە، بە شاخی کاردو/قاردو باس کراوە و لە بەشی حێزێکیە (Hezekiah) دا، کە پاشای جوەکان بووە، سەبارەت بە پاشای ئاشوری سەنحاریب دەگێڕێتەوە کە لە یەکێک لە جەنگەکانیدا سەرکەوتوو نەبوو بوو بەسەر جوەکاندا و دەڵێت "لە کاتی گەڕانەوەیدا بۆ ئاشوریا، سەنحاریب پارچە دارێکی گەورەی دۆزیبووەوە کە وەک بت دەیپەرست، لەبەر ئەوەی کە بەشێک بوو لەو کەشتیەی کە نوحی لە لافاوەکە پێ ڕزگار بوو بوو. سەنحاریب سوێنی خوارد کە کوڕەکانی بکاتە قوربانی بۆ ئەو بتە ئەگەر لە هەوڵی داهاتوویدا سەرکەوتوو بێت. بەڵام کوڕەکانی ئەو سوێنەی باوکیان گوێ لێ بوو و باوکیان کوشت و ڕایان کرد بۆ کاردو(Kardu)[113]، لەوێ جوە دیلکراوەکانیان بەردا کە ژمارەیان زۆر بوو بوو. لەگەڵ ئەواندا بەرەو ئورشەلیم (قودس) کەوتنە ڕێ و ئاینەکەی خۆیان لەوێ گۆڕی. هەردوو حەکیمەکان، شەمایە و ئەبتالیۆن بەرەی ئەو دوو کوڕەی سەنحاریب بوون" (Ginzberg, 2008, P.475). دەبینرێت دیسان کەشتیەکەی نوح و کاردو بەیەکەوە ناویان هاتووە.
- زێنەفۆن (Xenophon) (٤٣٠پ.ز-٣٥٤ پ.ز): زێنەفۆن[114] کە کەسایەتیەکی سەربازی و مێژوونوسی یۆنانی بووە، لە کتێبەکەیدا بە درێژی باسی ناوچەی کاردوخیان (Carduchian) دەکات (Xenophon, 1845). بەپێی وەسفکردنی زێنەفۆن بۆ شوێنی جوگرافی ناوچەکە، وا دەردەکەوێت کە ئاماژە بە هەمان ناوچەی جەزیرە و وانی ئەمڕۆ بکات. دەبینرێت کە زێنەفۆن کوردەکان و ناوچەکەیانی بە کاردۆخی باسکردووە، بەڵام هەر هەمان ناوچەی کاردوخی، لە نزیکی ٤٠٠ ساڵ دوای گەشتەکەی زێنەفۆن، لەلایەن سترابۆ (Strabo) (٦٤ پ.ز- ٢٤ ز) ی جوگرافیناسەوە باسکراوەتەوە. سترابۆ لە کاتێکدا کە ئاماژەی بە ناوە کۆنەکە کردووە کە زێنەفۆن بۆ ئاماژەکردن بە کورد بەکاری هێناوە، لە هەمان کاتدا ڕاستیشی کردۆتەوە. لە باسی ئەو ناوچەیەدا سترابۆ دەڵێت " نزیک ڕوباری دیجلە ئەو شوێنانەن کە دەگەڕێنەوە بۆ گۆردیایی (Gordyæi )، کە پێشینان پێیان دەگووت کاردوخی (Carduchi)" (Strabo, 1857, P.157). لێرەدا بەهۆی سترابۆوە دەردەکەوێت کە کاردوخی (Carduchi) و گۆردیایی (Gordyæi ) هەر هەمان ناون.
- پلوتارک (Plutarch) (٤٦ز- ١٢٠ز): پلوتارک مێژوونوسێکی سەدەی یەکەم و دووەمی زاینی بووە و بە درێژی باسی ناوچەی جەزیرە و بەتایبەت باسی پاشاکەی دەکات و ڕۆڵی لە جەنگی نێوان ڕۆمەکان و

[112]. مەبەست لە تەرجومەی ئینگلیزی وشە ئاشوریەکەیە.

[113]. دەبێت ئەوە بزانرێت کە ئەم ناوە لە تەرجومەی ئینگلیزی تێکستە پیرۆزەکانی جوومەوە وەرگیراوە، بۆیە بەشێوەی (کاردو) نووسراوە. دەنا بە زمانی جوەکان زۆربەی جار هاوشێوەی زمانی ئارامی بە (قاردو) نووسراوە.

[114]. زێنەفۆن ناوی ناوچەکەی لە ئەرمینیەکانەوە وەرگرتووە، بۆیە پاشگری (ch) خراوەتە سەر، دەنا نزیکی دوو هەزار ساڵ پێش هاتنی زێنەفۆن لە ئەرشیفی ماریدا ئەو ناوچەیە بە کوردە/کوردا (Kurda) باسکراوە. دەبینرێت کە سترابۆ لە نزیکی سەدەی یەکەمی زاینیدا ناوەکەی ڕاستکردۆتەوە وکردویەتیە Gordyæi و نزیک بووەتەوە لە ناوە دروستە کۆنەکە. پاشتر هەندێک سەرچاوەی تری یۆنانی کردویانەتە کوردیان/گۆردیان (Gordyene/Crodyene) کە مانای وڵاتی کوردان دەدات.

ئەرمەنیەکان بە ووردی دەگێڕێتەوە. بلوتارک ناوی ناوچەی جەزیرەی بە Gordyene هێناوە و پاشاکەشی بە Zarbienus باسکردووە (Plutarch, 1959, p.569).

- هیپۆلیتۆس (Hippolytus) (١٥٥ز-٢٣٦ز): هیپۆلیتوس کە کەسایەتیەکی کریستیانی ڕۆم بووە و لە سەدەی دووهەم و سێهەمی زایندا ژیاوە، سەبارەت بە کەشتیەکەی نوح و گەشتەکەی دەڵێت "ئەمجا گەڕایەوە بەرەو ڕۆژئاوا، ئەمجا بەرە و باشور و لە کۆتاییدا ئاراستەی بەرەو ڕۆژهەڵات گۆڕی لە نزیک شاخی کاردو (Kardu)". لە بارەی ناوی ئەو شاخە بەردەوام دەبێت و دەڵێت " سەبارەت شاخی کاردو، ئەو شاخە لە ڕۆژهەڵاتە. لە خاکی کوڕەکانی ڕابانە و ڕۆژهەلاتیەکان پێی دەڵێن شاخی گوداش (جوداش). عەرەب و فارسەکان پێیّ دەڵێن ئارارات"[115] (Robert and Donaldson 2004, P.495). دیارە هیپۆلیتۆس دەستنیشانی شوێنەکەی بە دروستی کردووە، بەڵام لەڕاستیدا هەر وەک لە قورئاندا دەردەکەوێت عەرەبەکان بەو شاخەیان گووتوە (جودی) نەک ئارارات، جگە لە هەندێک لە سەرچاوە ئەورووپیەکان، هەتاوەکو ئێستا هیچ سەرچاوەیەکی ئیسلامی یان سەرچاوە بە زمانی عەرەبی نیە کە بەو شاخە بڵێت ئارارات.
- ئەمیانوس مارسێلینۆس (Ammianus Marcellinus) (٣٢٥ز- ٣٩١ ز): مارسێلینۆس کە مێژوو نوسێکی ڕۆمان بووە و لە سەدەی چوارەمی زاییندا باسی ڕووداوەکانی ناوچەکە دەکات، لەگەڵ ناوچەی Zabdiceni (زەبدیان) چەند جارێک باسی Corduena (کوردیان) دەکات کە دیسان هەمان ناوچەی جەزیرەی ئەمڕۆیە (Marcellinus, 1986) و لەگەڵ بۆچوونی دینەوەریدا یەک دەگرێتەوە کە زابدیان (بازبدي) و کوردیانی (باقردي[116]) بەیەکەوە باسکردووە.
- قورئان: لە قورئاندا هەمان شاخ بە شاخی جودی باسکراوە و قورئان دەڵێت (وقيل يا ارض ابلعي ماءك و يا سماء أقلعي و غيض الماء و قضي الأمر واستوت على الجودي و قيل بعدا للقوم الظالمين). دەبینرێت ئەو ناوەی لە قورئاندا بەکارهاتووە (جودی) یە.
- ئەبو حنیفەی دینەوەری (٨٢٨ ز-٨٩٦ ز): دینەوەری کە خۆی کورد بووە، لە سەدەی نۆهەمدا و لە (كتاب ابار الطوال) دا باسی کەشتیەکەی نوح دەکات و دەڵێت "لەنگەرگرتن و جێگیربوونی کەشیەکەی نوح لەسەر لوتکەی جودی بوو لە شاخی بەقەردی (بقردي) و بازەبدی (بازبدي) لە خاکی جزیرە" (الدينوري، ١٨٨٨، پ.٣). دەبینرێت ئەبو حەنیفە لەلایەکەوە دەڵێت شاخی جودی و ئەمجا دەڵێت (بقردي) کە ناوەکە گۆڕانکاری و کورتکردنەوەیە لەلایەن عەرەبەکانەوە بۆ ناوە ئارامیەکە کە بریتی بووە لە (بيت قاردو)، یۆنانیەکان بە Cordene نوسیویانە و بە هوری/کوردی بریتیە لە (کوردیان). لێرەدا دیسان دەبینرێت کە هەردوو ناوی (جود/گود) لەگەڵ (کورد/قرد) تێکەڵ کراوە.
- مەسعودی (٨٩٦ز-٩٥٦ز): لە باسی کوردە کریستیانەکانی ناوچەی موسڵدا دەڵێت "ومنهم اليعقوبية والجورقان وهم نصارى، وديارهم مما يلي بلاد الموصل وجبل الجودي." (المسعودي، ٢٠١١) واتە "تێیاندا یەعقوبیە و هەیانە جۆزقانیە[117] و ئەوان کریستیانن، شوێنی ژیانیان لە دوای ناوچەی موسڵ وشاخی جودیە"
- بنیامینی تودێلا (Tudela) Benjamin of[118](سەدەی دوانزەهەمی زاینی): بنیامینی تودێلا سەبارەت بە کەشتیەکەی نوح دەڵێت "دوو ڕۆژە ڕێ لە جەزیرەی ئیبن عومەرەوە دورگەیەک هەیە لە ناو روباری

---

115. زۆربەی سەرچاوە کۆنەکان ئاماژە بە شاخی کاردو دەکەن، بەڵام لە سەردەمێکدا ناوی ئارارات هەندێک جار بەکارهاتووە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە هەندێک جار لە سەدەکانی پێش زاییندا بۆ ماوەیەک ئەرمەنیەکان دەسەڵاتیان هەتاوەکو ناوچەی جەزیرە ڕۆیشتووە، لەبەر ئەوە کە لەو ڕۆژانەدا زانیاری سەبارەت ئەو شاخە دراوە، بە ناوی ئەرمینیاوە دراوە. وا دەردەکەوێت کە شاخی ئارارات بەهۆی ئەوەوە تێکەڵ کرابێت، دەنا زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان زیاتر شاخی کاردو/جودی/قاردو/گاردو بەکاردەهێنن.

116. عەرەبەکان ناوی (کوردیان) یان لە زمانی ئارامیەوە وەرگرتووە کە ئارامیەکان بە (بيت قاردو/کاردو) کە مانای (وڵاتی کورد) دەدات؛ عەرەبەکان (بيت قاردو) ی ئارامیان گۆڕیوە بۆ (باقردي/بقردي).

117. ئەوانە دوو مەزهەبی کریستیانیی کوردەکان بوون لە دەوروبەری موسڵ و جەزیرەدا.

118. بنیامینی تودێلا گەڕۆکێکی جوی ئیسپانی بووە، کە لە سەدەی دوانزەهەمدا هاتوتە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان و زانیاری ووردی سەبارەت ئەو سەردەمە داوە، بە تایبەتی سەبارەت بە جوەکانی ناوچەکە.

دیجلەدا، لە دامێنی چیای ئارارات[119] و چوار میل دور لەو شوێنەی کە کەشتیەکەی نوحی تێدا جێگیر بووە؛ عومەری کوڕی خەتاب کەشتیەکەی لە سەر لوتکەی دوو شاخەکە لابرد و لەوێدا مزگەوتێکی دروست کرد. هێشتا لە ناوچەی دەوروبەری کەشتەیەکەی نوح پەرستگەی عیرسای (synagogue of Esra) جوەکان لەوێ مابوو کە لە کتێبە پیرۆزەکاندا باسکراوە و لەلایەن جوەکانی سەدەی نۆهەمەوە سەردان کراوە" (Tudela, 1848, p.93). دەبینرێت کە بنیامینیش کەشتیەکەی نوح دەبەستێتەوە بە ناوچەی جەزیرەوە، هەرچەندیشە بە هەڵە دەڵێت شاخی ئارارات، لەبەر ئەوەی کە ئەو شاخە زۆر دوورە لە ناوچەی جەزیرەوە و ئەو شوێنەی ئەو وەسفی دەکات، هەر جەزیرە خۆیەتی کە عومەری کوڕی خەتاب، لەبەر پیرۆزی ناوچەکە بۆ هەموو ئاینەکان، مزگەوتی تێیدا دروست کردووە.

- ئیبن ئەسیر (١١٦٠ز-١٢٣٣ ز): ئیبن ئەسیر کە خۆی کورد بووە و خەڵکی ناوچەی جەزیرە و شارەزای دەڤەرەکە بووە، سەبارەت بە کەشتیەکەی نوح دەڵێت " ثم ذهبت في الأرض تسير بهم حتى انتهت الى الجودي، وهو جبل بقردى بأرض الموصل، فاستقرت عليه" (ابن الاثير، ٢٠١٠، پ. ٢٣) کە ماناکەی دەبێتە "ئەمجا بەسەر زەویدا ڕۆیشت، بردنی هەتاوەکو لەسەر جودی گیرسایەوە کە ئەوە شاخی بەقەردیە لە خاکی موسڵ"[120]. دەبینرێت لێرەدا هاوشێوەی ئەبو حەنیفە ، ئیبن ئەسیر دڵنیای دەکات کە شاخی جودی و (قاردو/باقردي) یەک ناون.
- ئەولیا چەلەبی (١٦١١ز-١٦٨٢ز): چەلەبی سەبارەت بە کورد دەڵێت "بە قسەی مەقدیسی، لە دوای تۆفانی نوح یەکەم شوێن شاری جودی ئاوەدان کراوەتەوە، دوای ئەو قەڵای شەنگار و سێیەم مەیفاریقینە. بەڵام خاوەنی شاری جودی کە کوردوم شایە و ئۆمەتی نوح بووە، شەش سەد ساڵ ژیاوە و بە نێو هەموو کوردستاندا گەڕاوە، کە گەیشتۆتە مەیفارقین ئاووهەواکەی زۆر چۆتە دڵیەوە و تێیدا نیشتەجێ بووە، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی زۆر بوون، ئەم خەڵکە لە خۆیانەوە زمانێکیان داهێنا کە نە عەرەبی و نە فارسی و نەعیبری و نە دەریە، ئەمڕۆ بەو زمانە دەڵێن کوردی و لە کوردستاندا بەکار دەهێنرێ (چەلەبی، ١٩٧٨،پ.٩٠). بە ڕوونی دەبینرێت ئەولیا چەلەبیش کورد و ناوەکەی دەبەستێتەوە بەو ناوچەیەوە، کە نزیکی دوو هەزار ساڵ پێشتر زەینەفۆن بە کاردوخی ناوی هێناوە.

ئەو زانیاری و سەرچاوانەی کە لە سەرەوە خراونەتەڕوو، ئەو ڕاستیە دووپات دەکەنەوە کە ناوەکانی (جود، کوت، گوت، کاردو، کوردە، کورتێ، قورتێ، قوت، قاردو) هەرچەندە بە شێوەی جیاوازیش نووسراون، بەڵام هەموویان یەک ناون کە ئاماژە بە ناوی شاخ و ناوچەیەک دەکەن. هەروەها ئەم بەڵگانە ڕاستیەکی تر دەسەلمێنن ئەوەی کە ناوی کوردیش بە هەموو جیاوازیەکانیەوە هەر هەمان ناوە و بە شێوەی جیاواز نوسراوە. واتە ناوی (گوت) یان هەر ناوێکی تری نزیک لەو ناوانەی کە بۆ چیا و ناوچەی جودی بەکار هێنراوە، ناوی ترن کە بە درێژایی پێنج هەزار ساڵ لە سەرچاوەی جیاواز و لە سەردەمی جیاوازدا بەکارهێنراوە بۆ ئاماژەکردن بە نەتەوەی (کورد).

شایانی باسە کە ناوچەی جەزیرە نزیکی پێنج هەزار ساڵە بە ناوی (کوردیان) ناوبراوە لەبەر ئەوەی کە ئەم وشەیە مانای (خاک/وڵاتی کوردان) دەدات. وۆلکەر بێ ئەوەی کە ئاگاداری ئەو ڕاستیە بێت، ناوی ئارامیی (بیت قاردو/باقردي) تەرجومە کردووە بە (خاکی کوردان (Land of the Kurds)) (Walker, 2006, P.26). لە هەمووی گرنگتر، بەپێی ئیبن وەحشیە، کورد خۆشی ئاماژەی بەوە کردووە کە کتێبی شارە سۆمەریە سەرتاییەکان هی خۆی بووە و شاری (قوثامی Quthami) کە لە سەرچاوە دێرنەکاندا بە

---

[119]. دەبینرێت دیسان تودیلاش وەک زۆر لە ئەوروپیەکان، ئاراراتی لەگەڵ ناوچەی جەزیرە و شاخی جودیدا تێکەڵ کردووە. بەڵام ئەوەی کە گرنگە ئەویش هەر شاخی جودی دەبەستێتەوە بە ناوچەی جەزیرەوە.

[120]. لە سەردەمی ئیسلامیدا لە ڕووی ئیداریەوە زۆر جار ناوچەی موسڵ زۆر فراوانتر بووە لەوەی ئێستا و هەتاوەکو کوردستانی باکور و ناوچەی جەزیرەی و وان و هەکاری ئەمڕۆ ڕۆیشتووە، بۆیە ئیبن ئەسیر ناوچەی جەزیرەی خستۆتە سەر موسڵ. ئەو جیاوازیەی لە نێوان یەکەی ئیداری کۆن و نوێدا هەیە، بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێک خەڵک وا تێبگەن کە شاخی جودی نزیکی موسڵی ئێستایە. بەڵام لە ڕاستیدا سنوری ئیداری موسڵ گۆڕاوە و شاخی جودی نەک هەر دەکەوێتە دەرەوەی سنوری موسڵی ئەمڕۆ، بەڵکو دەکەوێتە دەرەوەی سنوری عێراقی ئەمڕۆ.

Gutium ناسراوە و پێکهاتووە لە (Guti+um)، هەر شاری ئەوان بووە و ئەمڕۆ ئەو ناوچەیە هێشتا ناوە کۆنەکەی نەتەوەی کوردی ماوە و بە (کوت) ناسراوە. ئەمڕۆ ئەم شارە دەکەوێتە باشوری ڕۆژهەڵاتی عێراق. بەڵگەکان بە تەواوی ڕوونی دەکەنەوە کە هەمیشە (گود، کورد) دوو وشە بوون هەمان مانایان هەبووە، بۆیە کورد لە سەرەتای شارستانیەتەوە بە هەردووکی ناسراوە و ناوچەکانی جەزیرە و ناوچەی سۆمەریەکان هەر بە وڵاتی کورد ناسراوە (بڕوانە سۆمەریەکان).

**چۆنێتی بەکارهێنانی ناوی کورد و پەیوەندی نەتەوەی کورد لەگەڵ نەتەوە سامیەکان**

ئەو ناوانەی کە پێشتر باسکران هەر تەنها بۆ ئاماژەکردن بە خەڵکی ناوچەی جەزیرە و وان بەکارنەهێنراون، بەڵکو لە سەرەتای نووسینی مێژووی ناوچەی مێسۆپۆتامیاوە، واتە لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە نزیکی ٥٥٠٠ ساڵ لەمەوبەرو ئینجا پاشتریش، ئاماژە بە خەڵکی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیا کراوە بە کۆمەڵێک ناوی لەیەک چوو. زۆر جار ناوەکانی وەک (گود، گوت، کاردو، قرد، جود، قاردو، کورد، گۆرد، کاردوخ)، بۆ ئاماژەکردن بە کاسی و ئولوبی و هوری و میدی و مانی و هەموو گروپە دەسەڵات دارەکانی ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیا بەکارهاتووە و بە ناوچەکەیان گوتووە (گوتیم Gutium) کە دیسان ئاماژەیە بە وڵاتی کورد. لە ڕوانگەی نووسینی مێژووەوە، مامەڵەکردن لەگەڵ ناوی گوتیەکان هەمان کێشەی مامەڵەکردنی لەگەڵ ناوی کوردی ئەمڕۆدا هەیە، لەبەر ئەوەی هەر هەمان ناون و هەر هەمان مانای نەتەوەییان بۆ هەموو گروپە جیاوازەکان هەیە. تێنەگەیشتن لە سروشتی بەکارهێنانی ناوی (گوت) لە تێکستە دێرینەکاندا، بووەتە هۆی ئەوەی کە بابەتی گووتیەکان ببێتە کێشە بۆ مێژوونوسان و هەتاوەکو ئێستا هیچ مێژوونوسێک، جگە لە چەند زانیاریەکی پەرشو بڵاو، نەیتوانیوە بەشێک لە مێژووی گوتیەکان بنووسێت. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ناوی گوتی لە کاتێکدا بۆ بەشێکی تایبەت لە نەتەوە شاخاویەکان بەکارهاتووە، لە هەمان کاتدا هاوشێوەی ناوی (کورد)، هەندێک جار ناوێکی گشتی بووە بۆ هەموو گروپە ناسامیەکانی ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیا و مانای ناوەکە بە پێی سەردەمەکان گۆڕینیان بەسەردا هاتووە. بۆ نموونە دەبینرێت مەسعودی، عومەری و چەلەبی هەرسێکیان ئاماژە بەوە دەکەن کە کوردەکان بە زمانی جیاواز قسە دەکەن. بەڵام هەموویان لەلایەن ئەو سێ مێژوونوسەوە بە کورد دانراون (بڕوانە زاراوە کوردیەکان و کۆمەڵێک سەرنج سەبارەتیان). لە هەمان کاتدا شاعیرە هەورامیەکان و گۆرانەکان و کرمانجەکان، سەرەڕای جیاوازی زاراوەکانیان، هەموویان خۆیان بە کورد داناوە و زمانەکەیان بە کوردی لە قەڵەم داوە. هەمان دیاردەش لەگەڵ گوتیەکاندا ڕوویداوە؛ لەم بارەیەوە، لێکۆڵەر ڤان دی مێیروپ (Van De Mieroop, 2012) لە بابەتێکدا سەبارەت گوتیەکان ئەو دیاردەیەی بە وردی خستۆتە ڕوو. ئەو پێی وایە کە لە کاتێکدا "گوتی" ناوێک بووە دراوە بە خەڵکێکی تایبەت، لە هەمان کاتدا ئاشوری و بابلیەکان ئەو ناوەیان بۆ ئاماژەکردن بە مید و مانیەکان بەکار هێناوە و هەندێک جار وەک ناوێکی گشتی بۆ خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی بابل بەکارهاتووە. هەروەها ڤان دی مێیروپ لە کۆتایی بابەتەکەیدا دەڵێت "لە کاتێکدا کە چەندین ئاماژەکردن بە گوتی و گوتیم دەتوانرێت کۆبکرێتەوە، بەڵام دەرفەتمان پێ نادەن کە مێژووی خەڵکێک یان وڵاتێک بنووسینەوە".

لەبەر ئەو هۆیە و تێنەگەیشتن لەو دیاردەیە نەتوانراوە مێژووی گوتیەکان بنووسرێتەوە و ناوی "گوت" هاوشێوەی ناوی "کورد" ناوێکی گشتی بووە بۆ کۆمەڵێک گروپی جیاواز. لە ڕاستیدا کورد و کوردستانیش تووشی هەمان کێشە بووە؛ لەبەر ئەوەی کە ناوەکە ناوی میللەت بووە و بۆ گروپی هەمەجۆر بەکارهاتووە. چۆن هەورامی، گۆران، کرمانج، لوڕ، لەک، زازا، هتد. بە درێژایی مێژوو بە کورد دانراون، بە هەمان شێوە، بابلیەکان لە گێڕانەوەی مێژووی ناوچەکەدا هوری، مانی، میدی و سۆمەرییان بە گشتی بە مید داناوە و میدیشیان بە گوتی داناوە (بڕوانە میدەکان). تێکەڵکردنی ناوی گوت و مید لە مێژوودا، لە بەشی میدەکاندا بە درێژی ڕوونکراوەتەوە و دەردەکەوێت کە میدەکان و گووتەکان هەر یەک نەتەوەن و تەنها جیاوازی ئەوەیە کە میدەکان بنەماڵەیەکی کوردی بەهێز بوون و نەتەوەکەیان گوت/کورد بووە. بێگومان ئەو بە گوتی کردنەی میدەکان هەندێک جار لەگەڵ هوری و مانی و نەتەوە ناسامیەکانی تری ئەو ناوچەیەدا ڕووی داوە. هەروەها لە بەشی میدەکاندا ڕوونکرایەوە کە بابلیە سامیەکان لە سەدەکانی پێش زاینەوە گوت و میدیان

تێکەڵ کردووە و میدی و سۆمەرییان بە یەک نەتەوە سەیر کردووە؛ چونکە ڕابردووی سۆمەریەکانیان بە میدی لە قەڵەم داوە. هەروەها دەبینرێت کە لە سەدەکانی زاینەوە لە سەرچاوە پەهلەوی و ئەرمەنیەکاندا مید و کورد بە یەک نەتەوە سەیرکراون (بڕوانە سیستەمی کۆمەڵایەتی کوردستان).
هاوشێوەی ڤان دی میێروپ کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، هەندێک لە لێکۆڵەری تر هەستیان بە لایەنەی تری پەیوەندی نێوان ئەو گروپە دێرینانە کردووە کە ئەمڕۆ زۆر جار بە جیاواز سەیر دەکرێن. ساگس لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە مێسۆپۆتامیا، کاتێک کە دەربارەی پەیوەندی نێوان خەڵکی زاگرۆس و سۆمەریەکان دەدوێت دەڵێت "ئەو دوو خەڵکە بە ڕوونی هەمان خوا، ئینانا (Inanna) یان پەرستووە، هەمان فەرهەنگیان هەبووە و وا دەردەکەوێت کە لە زمانی یەک تێگەیشتوون. ئایا دەشێت کە ئەوە ئاماژەیەک بێت بەوەی کە وڵاتی سۆمەریە سەرەتاییەکان سەرەتا لە ڕۆژهەڵات بووبێت، پێش ئەوەی کە لە خوارووی مێسۆپۆتامیادا نیشتەجێ ببن؟" (Saggs, 2000, p.32). لێرەدا دەبینرێت کە لێکۆڵەرەکانیش هەستیان بەم پەیوەندیە کردووە و ئاماژەیان بە ئەگەری هاوڕەگەزی خەڵکەکە کردووە بێ ئەوەی کە هۆکارەکەی ڕوون بکەنەوە.
ئەم بەڵگە و ڕوانگانە ئاشکرای دەکەن کە سەرەتا مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆل کۆمەڵێک زاراوە و فەرهەنگی پەیوەستی تێدا ژیاوە. بەڵام دوای هاتنی میللەتە سامیەکانی وەک ئەکەدی و ئارامی و ئاشوری، زمان و فەرهەنگی نەتەوە سامیە نوێکان لە ناوچەکەدا زیاتر بەربڵاو بووەتە و بۆتە هۆی دەرکەوتنی کێبڕکێیەکی بەردەوام لە نێوان کورد و ئەو نەتەوانەدا و ئەو کێبڕکێیە لەگەڵ نەتەوە نوێکانی وەک فارس، عەرەب و تورکدا ڕووی داوە[121] کە ئەوانیش پاش نەتەوە سامیە سەرەتاییەکان هاتوون بۆ داگیکردنی ناوچەکە.
پرۆسەی پاڵنان بە نەتەوە ڕەسەنەکانی مێسۆپۆتامیا هەزاران ساڵی خایاندووە، لە هەزارەی سێهەمی پێش زایینەوە نەتەوە سامیەکان سەرەتا لە ژێر ناوی ئەکەدی و دوایی ئاشوری و کلدانی و بابلیدا وورده وورده لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات هاتوون و شوێنیان بە نەتەوە ڕەسەنەکانی مێسۆپۆتامیا لەق کردووە. دوایی نەتەوەکانی وەک فارس و یۆنانی و ڕۆمانی و ئەشکانی و عەرەب و پاشتریش تورک ڕوویان کردۆتە ناوچەکە و درێژەیان بەم پرۆسەیە داوە کە هەتاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە.
شایانی باسە کە تەنانەت لە سەدەی چواردەهەمی زاینیشدا خوارووی مێسۆپۆتامیا [بەشیك لە عێراقی ئیمڕۆ] هەر شوێنی گوزەرانی کورد بووە. ئەوەتا ئیبن بەتوتە (١٣٠٤ز- ١٣٧٧ز) لە سەدەی چواردەهەمی زایندا کە نزیکی هەشت سەد ساڵ دوای هاتنی عەرەبەکانە بۆ ناوچەکە، هێشتا لە باسی شاری حلە (بابلی کۆن) دا، نیوەی بە کورد و نیوەکەی تری بە (أهل الجامعين)[122] ناو دەبات و دەڵێت "هەمیشە شەڕ و پێکدادان لە نێوانیاندا بووە"(ابن بطوطة، ٢٠١٠، پ.١٠٣). لێرەدا وا دەردەکەوێت کە ئیبن بەتوتەش ئەو ڕاستیە دووبارە بکاتەوە کە پێشتر ئیبن وحشیەی کلدانی ئاماژەی پێ کردووە کە بەربەرەکانی فەرهەنگی لە نێوان ئەو دوو میللەتەدا هەبووە و ڕەگەکەشی بۆ سەردەمی سۆمەریەکان دەگەڕێنێتەوە.
لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە بەردەوام بەرەبەرەکانی، لەگەڵ کۆمەڵێک میللەتی سامیدا هەبووە کە لە ڕۆژئاواوە ڕوویان دەکردە ناوچەکە. شاری بابل، کە سەنتەرێکی گرنگی ئەو سەردەمە بووە، گۆڕەپانی ئەو بەرەبەرەکانیە بووە. بۆیە دەبینرێت وەک بەشێک لەو دیاردەیە، لە سەدەی پانزەهەمی پێش زایندا کاتێک کە کاسیەکان بابلیان گرتەوە، ناوە سامیەکەیان گۆڕی بە کاردونیاش (Kar-Duniash)[123].

---

[121]. فارسەکان هەرچەندە زۆر پێش عەرەب و تورکەکان لە ناوچەی فارسدا سەریان هەڵداوە، بەڵام بە بەراورد بە مێژووی مێسۆپۆتامیا نەتەوەیەکی نوێن.

[122]. نازانرێت ئیبن بەتوتە مەبەستی لە (اهل الجامعين) چیە، ئایا عەرەب بوون؟ یان تێکەڵەیەکی نەتەوە ئارامیە کۆنەکانی بابل؟ وا دەردەکەوێت کە خەڵکە ئارامیەکان بوون. هەرچۆنێک بێت، هەتاوەکو ئەمڕۆش بەشێکی زۆر لە دانیشتوانی شاری حلە بە ڕەگەز کوردن.

[123]. لەبەر ئەوەی کە شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە زمانی کاسیەکان نازانرێت، هەتاوەکو ئێستا نەتوانراوە مانای ناوی Kar-Duniash بزانرێت چونکە نەتوانراوە بەشەکانی وشەکە شیبکرێتەوە.

**تێنەگەیشتن لە ناوی کورد و تۆمارکردنی بەشێوەی جیاواز**

چەند خاڵێکی مێژوویی هەیە بووەتە هۆی ئەوەی کە چۆن تێگەیشتن لە گوتیەکان زەحمەت دەکات، بە هەمان شێوە تێگەیشتن لە کورد زەحمەت تر دەکات. ئەم دوو ناوە بە درێژایی مێژوو بە لێڵی ماونەتەوە و هۆکارەکانیشی دەتوانرێت بکرێت بە چەند خاڵێکی گشتیەوە:

١. سیستمی کۆمەڵایەتی کوردستان

سیستەمی کۆمەڵایەتی کوردستان و بوونی چینەکان بەشێوەیکی زەق بووەتە هۆی ئەوەی کە سەرچاوە یۆنانی و ڕۆمانەکان مامەڵەی نەتەوە لەگەڵ ناوی بنەماڵە کوردەکانی وەک مانی و میدی و هەزمبانی دا بکەن. لە سەرەتای شارستانیەتی مێسۆپۆتامیاوە، زمانی کوردی بە زاراوە جیاوازەکانیەوە، زمانی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە، هەتاوەکو دوای هەزارەی یەکەمی پێش زاین، کورد گەورەترین نەتەوەی ناوچەکە بووە و بە چەندین زاراوەی جیاوازی کوردی قسەکراوە. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە کۆمەڵگەی کوردی، کۆمەڵگەیەکی چینایەتی بووە، بۆیە چینی حوکمران بۆ خۆ جیاکردنەوە لە میللەت ناوی بنەماڵەکانیان بۆ خۆیان داناوە. جا لەبەر ئەوەی کە میدەکان تەنها بنەماڵەیەکی کوردی حوکمڕان بوون، لەلایەن بابلی و ئاشوریەکانەوە بە گوتی ناوهێنراون، بەڵام ئەوان بە خۆیان گوتووە مید و لەوە دەچێت بە گەلەکەیان گووتبێت گوت/کورد بۆ خۆ جیاکردنەوە لە خەڵکی ئاسایی. دەبینرێت کە سەرچاوە ئەرمەنیەکانیش چەندین جار هەر لە ئاماژە بە کورد دا دەڵێن کوردە میدەکان و تەنانەت هەندێک لە تێکستە کوردیەکانیش لە ژێر ناوی مید دا دانراون (بڕوانە میدەکان). سەرچاوە ئەرمەنیەکان زۆر ڕوونن لەمەدا و لە تێکستێکی سەدەکانی ناوەڕاستدا ئاماژە بە کورد دەکرێت وەک "خێڵە میدیەکان" و دەڵێت "من باسی ئەو خێڵە میدیانە ناکەم کە لە کوردن" [124] (Asatrian, 2009, P.21 & 22).

هەزمبانیەکان هەتاوەکو سەدەی چوارەمی زاینی لەلایەن یۆنان و ڕۆمانەکانەوە بە نەتەوە ناوهێنراون بەشێوەی Adiabene، کەچی هەر ئەم بنەماڵەیە و لە هەمان ناوچەدا لە سەدەی نۆهەمی زاینەوە لە سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکاندا زۆر جار ناوی هەزمبان و کوردیش دەکەنە پاشکۆی ناوی پاشاکانیان. شایانی باسە کە تیرەی سەلاحەدین کە ناوەکەی (ڕەوەندی/ڕەوادی) بووە، بەشێک بووە لە خێڵی گەورەی هەزمبانی کە لە هەزارەی یەکەمی پێش زاینەوە و لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی ئاشوریەوە، هەتاوەکو هاتنی مەغۆلەکان لە ناوچەی هەولێردا حوکمرانییان کردوە و ناویان وەک حوکمڕانی ناوچەی هەزمبانی هاتووە (بڕوانە هەزمبانیەکان).

هەروەها لە کارنامەی ئەردەشیری پاپەگان (Karname Ardashir Papagan) دا، کە بە زمانی پەهلەوی لە نزیکی سەدەی شەشەمی پێش زاییندا نوسراوە، باسی یەکەم شەڕی ئەردەشیری پاپەگان دەکات لەگەڵ پاشای کورد دا کە لە سەدەی سێهەمی زاییندا بەرپای دەکات و دەڵێت "ئەردەشیر دوای ئەوەی کە ئەردەوانی پێنجەمی پاشای ئەشکانی (پارث) یەکانی کوشت، سوپایەکی گەورەی لە زابۆل کۆکردەوە و چوو بۆ جەنگ لەگەڵ پاشای میدی کوردان (کردان شاهی ماسی)" (وهبی، ٢٠٠٦، پ.١٧) (بڕوانە میدەکان). کاتێکیش کە لە ساڵی ٢٢٤ زایندا نامە گۆڕینەوە لە نێوان ئەردەشیری پاپەگانی ساسانی و ئەردەوانی پاشای ئەشکانیدا ڕوو دەدات، ئەردەوان بە ئەردەشیر دەڵێت "ئەی کوردی گەورەبوو لە ناو ڕەشماڵی کوردانداا" (Dodgeon, 1994, 239). لەوێدا ئەردەوان دەیەوێت کە بڵێت تۆ لە ڕەچەڵەکێکی حوکمڕان نیت و کوردیت، مەبەستیشی لە کورد هەر ئەو ڕاستیەیە کە حوکمڕانانی کوردی ئەو سەردەمە، بۆ خۆ جیا

---

[124]. ئاساتریان سەرەڕای دەرخستنی ئەو هەموو زانیاریانە لە لێکۆڵینەوەکەیدا، هێشتا پێی وا نیە کە مید کورد بێت، لەسەر ئەو بناغەیەی کە گوایا ئەم هەموو بەڵگانە تەنها یادەوەری ئەرمەنیەکانن لەگەڵ میدیەکان کە جاران لە شوێنی کوردەکاندا ژیاون و ئەو ناوهێنانە تەنها پەیوەستە بەو دیاردەیەوە. بەڵام وەک لەو نموونانەی سەرەوەدا دەبینرێت، لە سەدەکانی پێش زایندا زۆر جار گوت بە گشتی بۆ (مید و مانیەکان) بەکار هاتوون و بەیەک نەتەوە دانراون، بەڵام لە دوای سەدەکانی زاینەوە، جگە لە ناوی شاخی کەشتیەکەی نوح، کە ئەویش بەهۆی کۆنی ڕووداوەکەوە هەردوو (گود، جود، کورد، کاردو) ی هێشتۆتەوە، دەنا ناوی گوت بە تەواوی گۆڕاوە و بەگشتی ناوی (کورد) بەکار هاتووە و شوێنی گرتۆتەوە.

کردنەوە لە خەڵکە ئاسایی (ڕەعیەت)ە کە، سەرەڕای ئەوەی کە هەمان زمان و هەمان ڕەچەڵەکیان هەبووە، ناوی بنەماڵەکانی وەکو میدو مانی- یان بە خۆیانەوە دەنا و خەڵکەکەیان بە کورد ناو دەبرد. ئەم سیستەمە کۆمەلایەتیەی کوردستان بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێک لە سەرچاوەکان بۆچوونێکی تەواو هەڵەیان سەبارەت بە کورد نوسیبێت.
وەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا، ناوەکانی گوت و کورد لە سەرەتای شارستانیەتی میسۆپۆتامیاوە هەر هەبوون، بەڵام لە دوای سەدەی سێیەم و چوارەمی زاینەوە، ناوی کورد جێی زۆربەی ناوەکانی گرتەوە و ئەو ناوە وورده وورده درا بە هەموو نەتەوە دێرینەکانی میسۆپۆتامیا. پرۆسەی گۆڕانی ناوەکە بۆ کورد، بە وردی لە سەرچاوەکاندا دەبینرێت.
کەواتە بەڵگە زمانەوانیەکان و هەموو ئەو بەڵگە جۆراوجۆرانەی کە لە نەتەوە دێرینەکانی میسۆپۆتامیا ماونەتەوە، ئەوە دەگەیەنن کە ناوی "کورد" ناوێکە بۆ نەتەوەیەک بەکارهاتووە کە لە ڕووی زمانەوە لە کۆمەڵێک زاراوەی جیاواز پێکهاتووە و لە بنەچەدا کۆمەڵێک گروپی زاراوە جیاواز بوون، بەڵام لە سەدەکانی سێیەم بۆ چوارسەدی زاینەوە لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەموویان لە لایەن کورد خۆی و ئەوانەی کە کوردیش نەبوون هەر بە کورد دانراون. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکیانەی کە ڕێگیریان لە نوسینەوەیەکی لۆژیکی مێژووی کورد وکوردستان کردوە.
٢- بوونی کۆچەر و زاراوەی جیاواز لە ناو کورد دا
لە کوردستاندا، لە کاتێکدا کە سەدان و هەزاران شار و شارۆچکە هەبووە کە خەڵک تێیدا نیشتەجێ بوون، لە هەمان کاتدا بە درێژایی مێژوو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی کۆچەر هەبوون، ئەوەش یەکێک لە تایبەتمەندیەکانی کۆمەڵگەی کوردستان بووە و سەرچاوەی جیاواز ئاماژەیان پێکردووە. کەسێکی وەک سترابۆی جوگرافیناسی یۆنانی لە سەرەتای سەدەی یەکەمی زایندا باسی کورتی (Curtii) دەکات و کاتێک کە باس لە وڵاتی میدەکان دەکات دەڵێت "بەشەکانی تری ئەم وڵاتە هەمووی بەپیتە، بەڵام بەرەو باکور ناوچەی شاخاوی، ڕەقەلانی و ساردەکانە کە شوێنی ژیانی خێڵی کادوسی، ئەماردی، تەبیری و کورتی (Curtii) و نەتەوە هاوشێوەکانی ترە، کە کۆچەر و دزن. ئەم خەڵکانە بە هەموو زاگرۆس و نیفاتیسدا[125] بلاوبوونەتەوە. کورتی لە ناوچەی فارسن و ماردی (لەبەر ئەوەی پێیان دەگووترێت ئەمەردی) و ئەوانەی تر کە لە ئەرمینیان کە ئێستاکە هەمان ناویان هەیە، هەر خاوەنی هەمان جۆرە خەسلەتن" (Strabo, 1856, p.263). ئەو کوردە کۆچەرانەی کە سترابۆ لە نزیکی سەدەی یەکەمی زاییندا لە ناوچەی فارس باسیان دەکات، مێژوونوس و جوگرافیناسە موسوڵمانەکانی وەک یەعقوبی، ئەستەخری و چەندینی تر، لە سەدەی نۆهەمی زاینەوە دووبارەی دەکەنەوە و بەپێی قسەی یەعقوبی تەنها ژمارەی ڕەشماڵی ئەو کوردانە لە ناوچەی فارسدا بە پێنج سەد هەزار خەملێنراوە (اليعقوبی، ١٨٨٣، پ.٧).
بوونی کۆچەر لە ناو کورد دا بە درێژایی مێژوو مانای نەتەوەی کوردی لەلای مێژوو نووسان لێڵ و هەندێک جار نەگەتیڤ کردووە. ئەم دیاردەیە هەر بەرامبەر کۆچەری کورد نەبووە، لە ڕاستیدا لە قورئانیشدا سەبارەت کۆچەری عەرەب ئایەتێک هەیە کە دەڵێت " الأعراب أشد كفراً ونفاقاً " (التوبة: 97) کە ماناکەی دەبێتە (عەرەبە کۆچەرەکان کافرترین و دووڕو ترینن)، دیارە لە قورئاندا مەبەستی لە هەموو عەرەب نیە و تەنها ئەوەیە بە کۆکردنی ناوی نەتەوەی عەرەب لەوێدا لە زمانی عەرەبیدا ماناکە لە (نەتەوەی عەرەب) هوە دەبێتە (کۆچەری عەرەب). ئەم ڕووە نەگەتیڤەی خەڵکی کۆچەر، مێژوونوسە موسوڵمانەکان سەبارەت هەموو تورکەکان، نەک تەنها کۆچەرەکانیان، بەکاریان هێناوە. ئەوەتا بۆ نموونە یاقوتی حەمەوی دوای ئەوەی کە بە دوورودرێژی باسی خراپەکاری و نەزانی تورکەکان دەکات، سەبارەت تورک دەڵێت "پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت فەرمویەتی " اتركوا الترك ما تركوكم" کە ماناکەی دەبێتە (واز لە تورک بهێنن کە ئەوان وازیان لێهێناون) (الحموي، ٢٠١٠، پ. ٤٠٩). هەروەها کێشەی تێکەڵکردنی کۆچەر و میللەت لە ناوی عەرەبیشدا ڕووی داوە، تەنانەت لە ناو ڕۆمان و یۆنانەکاندا لە

[125]. ناوچەیەکی شاخاویە لە ئەرمینیا.

ڕابردوو دا، وشەی (شاسۆو Shasou) بە (عەرەب) تەرجومە کراوە (Palmer,2006, p.959). کەچی دەشێت هەمان وشە مانای (کەسێکی شوان و ڕەوەند) یش بدات. دەبینرێت وشەی (شاسۆو) لە ڕووی پیتسازیەوە هیچ پەیوەندی بە ناوی (عەرەب)ە وە نیە، بەڵام بۆ ئاماژەکردن بە عەرەبیش بەکارهاتووە. وەک چۆن ناکرێت بگووترێت مادەم ئەم وشەیە مانای عەرەب دەدات کەواتە عەرەب نەتەوە نیە و وشەی "عەرەب" ئاماژە نیە بۆ نەتەوە و تەنها ئاماژەیە بۆ باری کۆمەڵایەتی، ئاواش ناکرێت بگوترێت کە ناوی کورد ئاماژە نەبووە بۆ نەتەوە. کەچی بەهۆی هەلومەرجی سیاسی کوردستانەوە بۆچوونی هەندێک لە مێژوونوسان بەرامبەر بەکورد بەم جۆرەیە. لەوە دەچێت کە داهێنانی ناوی کرمانج بەهۆی ئەم کێشەیەوە ڕوویدابێت. واتە لە سەردەمێکدا کە مێژووەکەی نازانرێت، هەندێک لە کوردەکان، بۆ خۆ جیاکردنەوە لە کوردی ڕەوەند، ناوی خۆیان ناوە (کرمانج)، چونکە زۆر سەرچاوە پێی وایە کە ماناکەی دەبێتە (کورد+مان+جێ)[126]، واتە (کوردە ماوەکان لەجێ/کوردە نیشتەجێکان).
کێشەکە لەوەدایە کە بابەتی جیاوازی زاراوە کوردیەکان و کۆچەرە کوردەکان، لە دەربڕینی ناوی (کورد) دا تێکەڵ کراون. بۆیە کە بە زمانی عەرەبی کاتێک کە بە کورد گوتراوە (اکراد)، بەپێی ناوەرۆکی بابەتەکە، ماناکەی گۆڕاوە. لە لایەکەوە دەشێت مەبەست لێی گرووپە جیاوازەکانی نەتەوەی کورد بوو بێت و لەلایەکی ترەوە دەشێت مەبەست لە (اکراد) یەکی تر بێت کە بە عەرەبی مانای (خێڵە کۆچەرە کوردەکان) دەدات و کە عەرەب بۆ خێڵە کۆچەرەکانی خۆشی (اعراب) بەکاردەهێنێت.
ئەم بۆچوونە بە تەواوی لە ڕوانگەی هەندێک لە مێژوونوسە ئیسلامیەکاندا دەردەکەوێت. بۆ نموونە لە سەدەی دوانزە و سێانزەدا کەسێکی وەک یاقوت الحموي (١١٧٩ز- ١٢٢٩ز) دێتە شارەزوور[127]، دوای ئەوەی کە دەڵێت خەڵکی شارەزوور هەمووی کوردن و باسێکی قەلاکانی ناوچەکە دەکات و ناوی خێڵە کوردەکان دەهێنێت، دەڵێت "کورد لە شاخەکانی ئەو ناوچەیە لەسەر دابونەریتی خۆیان ڕێبوار دەترسێنن و پارەوپولیان دەدزن و مردن و گرتنیش ئەوەیان پێ تەرک ناکات و ئەوە سروشتی کوردە" و لە هەمان کاتدا دەڵێت "ئەم ناوچەیە هێندە کەسی نایاب و مەزن و ئیمام و زانا و قازی گەورە و زانای ئاین (فقهاء) ی تێدایە کە لە ژماردن نایەن و لە ژماردنیاندا هەناسە توانای نامێنێت لە درێژیدا. لەوانە قازیەکانی بنەماڵەی شارەزووری خاوەن شکۆ و مەزن، کە بنەماڵەیەکی گەورەن بە کردار و قسە. من هیچ بنەماڵەیەکی تر ناناسم لە ئیسلامدا کە هێندە ژمارەی زۆری قازی لەیەک بەرەوە هاتبێتن و بنەماڵەی عەسرون (عصرون) یش کە ئەوانیش قازی و خەڵکانی پایەبەرزن لە شام و میسر، لەوانەی کە بڕیاری حەڵاڵ و حەرام دەدەن کە هەر لەوانن و زۆری تر لە زانایانی ئاینی شافعی، ئەوانەی کە هەموو قوتابخانەکانیان پڕکردۆتەوە".
دەبینرێت حەمەوی ئەو دوو ڕووەی کوردستان دەخاتە ڕوو، ڕوویەک کە ڕەوەند بووە و وەک هەموو ڕەوەندێک دابونەریتی ڕەوەندی خۆی هەبووە و ڕوویەکی تر کە نیشتەجێ و خاوەنی شارستانەیت بووە و زاناکانی جیهانی ئیسلامی و قوتابخانەکانی پڕکردۆتەوە. دیارە حەمەوی ئەم بۆچوونەی بێ بناغە نەبووە[128]، چونکە زانا کوردەکان لە ژمارە نایەن و هەزاران کتێبیان لە دوو بەجێ ماوە. بۆ نموونە لە سەدەی دوانزەهەمی زاینیدا یەکێک لە زانا کوردەکان بە ناوی ئەبو شەمسەدین محەمەد کوڕی مەحمودی شارەزوری کە لە ژێر ناوی (نزهة الارواح و روضة الافراح في تاريخ الحكماء والفلاسفة) کتێبێکی لەسەر مێژووی فەلسەفە لە سەرەتای مرۆڤایەتیەوە نووسیوە، کە بۆ ئەم سەردەمەش جێی سەرسوڕمانە و نیشانی دەدات کە لە کوردستاندا ئاستی خوێدن و زانست چەندە بەرز بووە. ئیبن وەحشیە کە دەڵێت کورد لە زانستی کشتوکاڵدا لە کلدانیەکان بەتواناتر بوون، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە لە کاتێکدا کورد خەڵکی

---

[126] . دەشێت ئەم ناوە دروست بێت و سۆمەریەکان ناوی لەو جۆرەیان زۆر دروست کردووە و پێکهاتەی ناوەکە هەمووی سۆمەری و هوریە. وشەی (جێ) لە سەردەمی سۆمەریەوە هەیە و بە ki نووسراوە و وشەی (man) لە زمانی هوریشدا هەر هەمان مانای هەیە لە زمانی کوردیدا.
[127] . ناوچەی سلێمانی و دەروبەری هەتا نزیک هەورامانی گرتۆتەوە.
[128] . نابێت فاکتەری پروپاگەندە پشتگوێ بخرێت، زۆر جار نەتەوە نەیارەکانی کورد، کوردیان بە نەگەتیڤانە باس کردووە (بڕوانە کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان).

ڕەوەندی هەبووە، لە هەمان کاتدا بەشێکی زۆری نیشتەجێ بووە و بە توانایی لە زانستی کشتوکاڵدا و لە سەدەی نۆهەمی زاینیدا، مێژووی دێرینی نیشتەجێبوونی کورد دووپات دەکاتەوە.
هەرچەندە لە قسەکانی یاقوتی حەمەویدا جۆرێک لە نەگونجاوی دەردەکەوێت، لە هەمان کاتدا ڕاستیەکی مێژوویی دەردەخات، کە کۆمەڵگەی کوردەواری لە کاتێکدا کە شوێنی قوتابخانە و خوێندن و زانست بووە، لە هەمان کاتدا بەشێک لە کۆمەڵگەی کوردەواری کۆچەر بووە و کۆچەری کورد بە هەموو کوردستاندا، لە ناوچەی جەزیرەوە هەتاوەکو ناوچەی فارس، بڵاوبوونەتەوە. ئەم ڕاستیە هەتاوەکو کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم بەردەوام بووە لە کوردستاندا و کوردە کۆچەرەکان زۆر جیاواز بوون لە کوردە نیشتەجێکان. زۆر جار کە کوردە ڕەوەندەکان ڕوویان دەکردە هەندێک ناوچە، کوردە نیشتەجێکان ترسیان لێ دەنیشت و هەندێک جار دووچاری کێشە بوونەتەوە و زۆرجار پارە و زێڕ لە ترسا شاردراوتەوە[129]. لە هەمان کاتدا مزگەوتەکانی ناو شار و شارۆچکەکانی کوردستان هەمیشە شوێنی خوێندن و زانست بوون بۆ کورد خۆی و بۆ بێگانەش کە زۆرجار لە شوێنی جیاوازی وڵاتە ئیسلامیەکانەوە ڕوویان کردۆتە کوردستان بۆ خوێندن. لە سەردەمی نوێدا شارەکانی وەک سنە، کرماشان، مەهەباد، سلێمانی، هەولێر، دیاربەکرد، تەوێڵە، بیارە، ماردین، هەڵەبجە، کۆیە، ماردین، حەلەب، جەزیرە و چەندین ناوچە و شار و شارۆچکەی تر کە هەتاوەکو داهاتنی قوتابخانەی نوێ، سەنتەری زانستی بوون و شوێنی پاراستنی زۆر لە کتێب و تێکستە کوردیەکان بوون.

**کورد کێیە؟**
بەڵگە زمانەوانی و مێژووییەکانی ئەم کتێبە هەمووی ئەوە دەسەلمێنن، کە نەتەوەی کوردی نوێ پێکهاتووە لە تێکەڵێکی سۆمەری، هوری، ئیلامی، هیتی، لوڤی، میدی، لولوبی، مانی، کاسی، هتد. و زاراوە کوردیەکانی ئەمڕۆ ئاوێنەی هەمەچەشنی ڕابردووی مێسۆپۆتامیا و ئەنادۆڵیایە و بە دوور نازانرێت کە ئەگەر لێکۆڵینەوەی وورد و زانستیانە لەسەر زاراوە کوردیەکان بکرێت، ئەمڕۆش بتوانرێت هەر یەک لەو زاراوانە و جیاوازیان بگەڕێنرێتەوە بۆ ڕابردووی دێرینی گروپە دێرینەکان و ڕەگی هەر یەک لەو زاراوانە و پەیوەندیان بە زمانە کۆنەکان بدۆزرێتەوە. بە دڵنیایی ئەو جیاوازیەی کە لە نێوان زاراوە کوردیەکاندا هەیە، دیاردەیەکی دێرینە. بەڵام ناونانی هەموو زاراوەکان بە کوردی، سەرەڕای جیاوازییان، خەڵکەکەشی بە کورد؛ هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هاوبەشیەکی فەرهەنگی پتەو لە نێوان ئەو گروپانەدا کە زۆر دێرین ترە لە هاتنی نەتەوەکانی تا ڕادەیەک نوێی وەک ئەرمەنی، فارس، عەرەب و تورک و تەنانەت ئاشوریەکانیش، بۆ ناوچەکە.

**مانەوەی ڕابردووی سۆمەری و گروپەکانی تر لە ژیانی ڕۆژانەی کوردەواریدا**
زۆر شتی ئاسایی هەن کە هەتا ئەمڕۆش لە کوردەواریدا دەکرێن و دەگووترێن، بێ ئەوەی بزانرێت کە ئەو کردار و هەڵسوکەوت و نەریتانە، پەیوەندی ڕاستەو خۆیان بە سەردەمی سۆمەری و مید، هیتی، هتد. وە هەیە و ڕیشەیان بۆ ئەو ڕابوردووە دەگەڕێتەوە. ئەو گۆرانیە کوردیانەی کە بە (لۆ لۆلۆ، لێ لێ لێ، لێ لێ من، ئەی لۆلۆ، لامۆئێ لامۆئێ، لایلایە لایلایە، ئەی لە من) دەست پێ دەکەن، هەموویان لای سۆمەریەکان ناوی گۆرانی بوون. بۆ نموونە ilum, ilulamma, ilulu, illu, ilu, ilalum, elel, elil, ellila هەمووی گۆرانی سۆمەرین. هەروەها ilu ی سۆمەری کە ناوی گۆرانیەکی شادی و شینکردنیش بووە، هەتاوەکو ئەمڕۆ ئەو شینکردن و گۆرانیە شادیەی سۆمەری لە کوردیدا ماوە بەشێوەی ( lai laia, hai lo, hai le le, lamuee, lololo لای لایە، هەی لێ لێ، هەی لۆ لۆ، لۆلۆلۆ، لامۆئێ). تەنانەت شینکردنی وەک (گریە و هەڵا) کە بە کوردی مانای (شیوەنکردن) دەدات، لای سۆمەریەکان بە giri'ilu نووسراوە و

[129]. دایکی نووسەری ئەم کتێبە لە زمانی نەنکیەوە هەندێک ڕووداوی لەو جۆرەی بۆ گێڕاوەتەوە کە کاتێک کوردە ڕەوەندەکان ڕوویان دەکردە هەندێک ناوچە، چۆن خەڵکەکە لە ترسا هەرچیان هەبوو دەیانشاردەوە، لەبەر ئەوەی کە زۆر جار ڕەوەندەکان شەرکەر و بێ باک بوون و پەلاماری زێڕ و خشڵی خەڵکیشان داوە.

هەمان مانا دەدات. ئەمانە لە ناو هوری و هیتیەکانیشدا دووبارە بوونەتەوە. دەرنەکەوتنی لە ناو مید و کاسی گروپەکانی تردا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە شتێکی ئەوتۆ لە تێکستی ئەوان نەماوە.
جۆرێک لە شەیتان (جنۆکەی خراپە) لە سۆمەریدا ناوی هاتووە بە شێوەی ulu, ala, hulu کە لە کوردیدا ناوی ئەو جنۆکە خراپە بە شێوەی ئاڵە/هاڵە ماوەتەوە؛ ئەمڕۆ لە ناو کورد دا ناوی جنۆکەیەکی خراپە کە دەبێتە دوژمنی زەیسان (ژنی تازە منداڵ بوو)، کورد پێی وایە زەیسان و کۆرپە ساواکەی لە ژێر مەترسی ئەو جنۆکەیەدان و ئەگەر هەر کامێکیان بمرن، دەڵێن (ئاڵە/هاڵە بردویتیەوە) (هەژار.پ. ١٠، ١١ و ٩٨٣).
سۆمەریەکان پێیان وابووە کە کاتێک دان کلۆر دەبێت، ئەوە بەهۆی کرمێکەوە ڕوو دەدات کە خوێنی دانەکە دەمژێت (Rao, 2008, p.172). هەتاوەکو ئەمڕۆش کورد بە دانی کلۆر دەڵێت (دانی کرمێ). دیارە ڕوانگەی کورد بۆ ئەو نەخۆشیە لە ڕوانگەی سۆمەریەوە هاتووە.
یەکەیەکی کێش هەیە لە کوردەواریدا کە هەتاوەکو سەدەی بیستەم بەکار دەهات و پێی دەگووترا (مەن) کە نزیکی سێ کیلۆیە. لای سۆمەریەکان mana هەیە کە ئەویش یەکەیەکی کێشە. خوای ئاگری سۆمەری بە هەر دوو جۆری gir/girra دەنووسرێت. جگە لەوەی کە لە کوردیدا مانای (ئاگر/گڕ) دەدات، ئەمڕۆ کە هەوای زۆر گەرمی هاوین دێت، کورد دەڵێت (گڕە هات). وا دیارە لە رابردوودا کورد پێی وا بوو بێتکە ئەو هەوایە خوای ئاگر ناردبێتی. لەبەر ئەوەی کە کورد بە هەوای فێنکی هاوین دەڵێت (بای شەماڵ) کە ئەویش خوای شاخ بووە لە لای کاسیەکان و بە šumalia نووسراوە. شیکردنەوەی ئەم وشەیە لە کوردیدا دەبێتە (شا +ملا) کە (شا) لە کوردیدا گەورەیە و (ملا) بەرزایی چیایە.
ناوی پلە و پایە سۆمەریەکان وەک کوردی ئەمڕۆ بوون، بۆ نموونە patesi ئەو دەسەڵاتدارە بووە کە حوکمی ناوچەکانی کردووە و دەسەلاتی ئاینی و سیاسی هەبووە (Odijk, 1989, p.9). ئەمڕۆ لە زمانی کوردیدا (پاتشا/پادشا) بە هەمان مانا بەکاردەهێنرێت. گەورەترین پاشای سۆمەری کە دەسەڵاتی هەبووە بەسەر پاشا بچووکەکاندا نازناوی lugal kiši/kiššati (پاشای گشت) ی هەبووە کە بە کوردی نوێ دەبێتە (لۆ کەڵ گشی/ گشتی) و هەمان مانا دەدات. وشەی (کش) ی سۆمەری هەمان وشەی (گش/گشت) ی کوردی هەیە و (لۆ) لە کوردیدا هەمان مانای lu ی سۆمەری هەیە، کە دەبێتە (کابرا، فلانەکەس) و gal لە سۆمەریدا مانای (کەڵ) دەدات لە کوردیدا. بەو جۆرە ئەو نازناوە دراوە بە پاشای گشت؛ ماناکەی لە کوردیدا دەبێتە (کەسی مەزنی گشت). وشەی aga مانای تاجی پادشایی هەبووە و هەتاوەکو ئەمڕۆ (ئاغا) لە لای کورد نازناوێک نیە کە بدرێت، بەڵکو دەبێت بە خوێن ئاغا بێت. بە دڵنیایی ئاغاکانی ئەمڕۆی کوردستان لە سەردەمێکی کۆنەوە ئەو نازناوەیان هەبووە. زمانی کوردی هێندە کاریگەری هەبووە، هەندێک لە نازناوی پاشاکانی مێسۆپۆتامیا هەتاوەکو سەردەمی ئاشوریەکانیش هەر بە سۆمەری/کوردی ماونەتەوە و ئەمڕۆ بە تەنها لە زمانی کوردیدا هەمان مانای پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەری ماوە. چەندین نازناوی تر بە مانای پاشای پاشاکان هەتاوەکو ئەمڕۆ تەنها لە کوردیدا ماناکەی وەکو خۆی ماوە. دەبینرێت کە Lugal Babili دەبێتە (لۆ کەڵ بابلی), šar Sumeri u Akkadi بە کوردی دەبێتە (سەر سۆمەری و ئەکەدی), واتە (سەرکردە/پاشای سۆمەری و ئەکەدی). تەنانەت پاشای ناوچەی جەزیرە کە لە مێژووی دێریندا بە (کوردیان) ناسرابوو، نزیکی چوار هەزار ساڵ لەمەوبەر بە šar Kurda ناسرابوو (Pitard, 1987, p, 42)، کە بە زمانی هوری هاوشێوەی کوردی بە مانای (پاشا/سەرکردەی کوردە) دێت، ئەمڕۆ کورد دەڵێت "سەر کوردە".
لە ڕاستیدا هەموو ئەو نازناوانەی ئەمڕۆ لە ڕۆژهەڵاتدا بەکاردێن، بنچەکەیان بۆ زمانی کوردی و کوردستان دەگەڕێنەوە. بۆ نموونە (بەگ) لە زمانی میدیدا بە baga نووسراوە و لای ئەوان مانای (سەرگەورە، خوا) ی هەبووە. ئەم نازناوە لە ناو مانیەکانیشدا هەبووە و بە هەمان مانای میدی بەکار هاتووە. یەکێک لە حوکمڕانەکانی مانیەکان ناوی بەگزادە (bagdatti) بووە و یەکێک لە خواکانیان ناوی بەگبەرد (bagbartu) بووە، کە مانای (خوای بەرد) دەدات (بڕوانە مانیەکان). ئەم نازناوە هەتاوەکو ئەمڕۆ لە کوردەواریدا مانا کۆنەکەی بزر نەکردووە و (بەگ) نازناوێکە بۆ کۆمەڵێک بنەماڵەی حوکمڕان کە بە دڵنیایی بنەچەیان بۆ زیاتر لە سێ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە و (بەگ) هەمیشە بەشێک بووە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و هەرەمی دەسەڵات لە کوردستاندا. بدلیسیەکان کە حوکمڕانی بدلیسیان دەکرد و شەرەفخان

یەکێک بوو لە پیاوە ناودارەکانیان، بەگ بوون. چینی دەسەڵاتداری جافەکان هەموویان بەگزادەن و بابانەکان بە هەمان شێوە بەگن و چینی دەسەڵاتداری لەهۆنیەکان هەر بەگن و چەندین نموونەی تر هەتاوەکو ئەمڕۆ ماوە لە کوردیدا . تورکەکان لە سەدەی دەیەمی زاینیەوە کە هاتنە ناوچەکە ووردە ووردە ئەم نازناوە کوردییەیان وەرگرتووە و بەکاری دەهێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی کە لە کوردی وەرگیراوە، لەو کۆمەڵگایەدا ماناکەی بزر بووە و بە تەواوی وشەکەشیان گۆڕیوە و کردوویانەتە "بێی" (bey). تورکەکان لە سەردەمی عوسمانیەکاندا کە حوکمڕانی مسیریان دەکرد، لەگەڵ خۆیان ئەم وشەیەیان بردۆتە میسر و ئەمڕۆ لە ناو زمانی ڕۆژانەی عەرەبی میسریدا بەکاردێت هەر بە هەمان مانا تورکیەکەی؛ بێ ئەوەی کە هیچ بنەچیەکی کۆمەڵایەتی لەو کۆمەڵگەیەدا هەبێت. بەهەمان شێوە فارسەکان وشەی "ئاغا" ی سۆمەری/کوردیان وەرگرتووە و بۆ بانگکردنی بەڕێزانە بۆ پیاو بەکاری دەهێنن. بەڵام پێگە کۆمەڵایەتیەکەی لە فارسیدا نیە و ئاغا لە ناو فارسدا بەو مانا سۆمەری/کوردیە نیە.

هەروەها وشەی (سەر) کە لە کوردیدا مانای (لەسەر شتێک، سەری لەش، سەرکردە) ی هەیە، بنەچەکەی بۆ سۆمەری، هیتی، لوڤی، هوری، میدی و سراسی دەگەڕێتەوە. نازناوی (شا) بە مانای (پاشا) بۆ یەکەمجار لەلایەن هیتیەکانەوە بە شێوەی haššu دەرکەوتووە و لای مانیەکان بە دەسەڵاتدارە ناوچەییەکانی خۆیان دەگووت šaknu کە بە ڕوونی مانای (شاکان) ی تێدا دەردەکەوێت. بۆیە جێی سەرسوڕمان نیە کە نازناوی (قەیسەر) ی ڕۆم لە زمانی لاتینیدا بە شێوەی caesar دەنووسرێت. زۆربەی سەرچاوەکان بناغەی مانای وشەی (قژار/قژدار) دەگەڕێنەوە بۆ دروستبوونی نازناوی قەیسەری ڕۆم (Hunt, 2009, p.19). وشەیە (قژ+ار) ئەمڕۆ تەنها لە زمانی کوردیدا شیکردنەوەی بۆ دەکرێت. وشەی qižar ی کوردی، بنەچەکەی لە زمانی سۆمەری و لوڤیدا دەردەکەوێت (بڕوانە فەرهەنگەکانی سۆمەر و لوڤی).

لە ناو سۆمەریەکاندا هەردوو ژمارە حەوت و چل، دوو ژمارەی گرنگ بوون. تەنانەت ژمارە چل لە سۆمەریدا ناوی خوای Ea-Enki بووە و هەردوو ماناکەی داوە؛ ئەو ژمارەیە بۆ ئەوان شوێنێکی پیرۆزی هەبووە. بە هەمان شێوە، ژمارە چل بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لە ناو کوردەواریدا خۆی چەسپاندووە و لە ژیانی ڕۆژانە و سەرەمۆنی ئاینیدا زۆرجار دەردەکەوێت. ئەمڕۆ کورد[130] بۆ مردن چلە دەکات، کە منداڵ لەدایک دەبێت چلەی[131] دەردەکات، کورد دەڵێت دوای ئانخواردن هەتاوەکو چل پارو سونەتە، ترشیات یان شەراب لە دوای چل ڕۆژ دەگات، بۆ خۆ پاککردنەوەی ئاینی دەروێشەکان چل ڕۆژ دەچنە خەڵوەتەوە، لەو پرۆسەیەدا چل جام ئاو بە خۆیاندا دەکەن. لە لادێکاندا زۆربەی جار هەوڵ دراوە کە بە لایەنی کەمەوە چل کەس بۆ نوێژی کۆمەڵ (جەماعت) کۆبکەنەوە بۆ ئەوەی کە نوێژەکەیان خێری زۆر بێت. کوردی

[130]. سەرەتای ساڵی هەشتاکان و لە کاتی جەنگی نێوان ئێران و عێراقدا، حکومەتی عێراقی چەکێکی تازەی هێنابووە ناوچەی پێنجوێن و لەوێوە بۆردومانی ئێرانی دەکرد. چەکەکە پێکهاتبوو لە موشەک هەڵدەر لەسەر ئۆتۆمبێلەوە و لە چەند چرکەیەکدا ژمارەیەکی زۆر موشەکی هەڵدەدا. هێندە ژمارە چل کاریگەری لەسەر خەڵکی کورد هەیە، خەڵکەکە ئەو چەکە تازەیان ناونابوو "چل چل" بێ ئەوەی کە بزانرێت ئەو چەکە چەند موشەک هەڵدەدا. واتە ئەمڕۆش کە خەڵکی کورد وشەی نوێ دروست دەکات، هێشتا کاریگەری فەرهەنگی سەردەمی سۆمەریەکانی لەسەرە. لەبەر ئەوەی ژمارە چل بەکاردەهێنێت و ناو بە دووبارە کردنەوەی هەمان وشە دروست دەکات (چل چل)، کە دووبارەکردنەوە بۆ دروستکردنی ناو لە زمانی سۆمەری، هیتی و هوریدا کراوە.

[131]. چلە دەرکردنی منداڵ هەتاوەکو ئەم ساڵانەی دوایی دەبوو بۆ هەموو منداڵێک بکرێت. ڕۆژی بڕیاردانی چلە بە پێی منداڵ دەگۆڕێت. بۆ نموونە کۆی دایک و باوک و خوشک و برای منداڵە تازە لەدایکبووەکە لە چل دەردەکرێت و لەو ڕۆژەدا چلەی دەردەکرێت. بۆ نموونە ئەو منداڵە ئەگەر دایک و باوک و سێ خوشک و برای هەبێت، ئەوا پێنج ڕۆژ لە چلەکە دەردەکرێت و لە ڕۆژی سی و پێنجدا بۆی دەکرێت. لە چلەدا سەرەتا دایک خۆی دەشوات لەبەر ئەوەی کە دایک و منداڵ نابێت خۆیان بشۆن هەتاوەکو چلە. لە چلەدا منداڵ لە دەفرێکی پڕ ئاودا دادەنرێت کە شانەیەکی تێدا دانرابێت و سەرەمۆنیەکە بە دوو کەس دەکرێت و چل جار دەگووترێت "ئەوە چی دەکەیت" کەسەکەی تر دەبێت جامێک ئاو بە منداڵەکەدا بکات و بڵێت "نیەتمە چلەی (بۆ نموونە) هەڤاڵ لە هەموو ئینس و جنس و تەیر و تیور و هەموو گیانلەبەرێک دەربکەم" بەو شێوەیە ئەم دێڕە چل جار دەگووترێتەوە و چل جام ئاو بە منداڵەکەدا دەکرێت و بەوە چلەی منداڵ دەردەکرێت. ئەمڕۆ ئەگەر لە ئافرەتە تەمەندارەکان بپرسرێت بۆ لە کاتی چلە دەرکردندا ئەو قسانە دەکەن، لە وەڵامدا دەڵێن "با چلەی منداڵەکە لە هی گیانلەبەران نەکەوێت". ئافرەتە پیرەکان کە ئەو وەڵامە دەدەنەوە، خۆیان بە ڕوونی نازانن و ئەمڕۆش نازانرێت مەبەستیان لەمە چیە. دەشێت ئەوە لە بۆچوونێکی دێرینەوە هاتبێت کە هەموو گیانلەبەرەکان لە یەک ڕۆحەوە پەیدا ببن و دوای چل ڕۆژ بە چلە دەرکردن لەیەکتری جیا بکرێنەوە.

موسوڵمان زۆر جار کە سوێن دەخوات دەڵێت "بە چل قورئان". زەیسان (ژنی تازە منداڵ بوو) دەبێت دوای چل ڕۆژ خۆی بشوات؛ لە هەموو چیرۆکەکاندا ڕووداوەکان بۆ چل ڕۆژ و چل شەو بەردەوام دەبێت. ئەگەر دوو بوک لە ناو دوو خێزانی ئاشنادا بهێنرێت و هەردووکیان لە ماوەی چل ڕۆژدا شوو بکەن، دەبێت ئەو دوو بوکە دەرزی بگۆڕنەوە دەنا کورد پێی وایە لەوانەیە منداڵیان نەبێت و کێشەیان تووش ببێت. بە هەمان شێوە ئەوە بۆ منداڵی لە دایکبووی دوو خێزان کە یەکتری بناسن ڕوو دەدات، کاتێک کە پێش ئەوەی یەکێکیان چل ڕۆژ تەواو بکات ئەوی تریان لەدایک ببێت، دەبێت دایکەکانیان شت بگۆڕنەوە. کورد پێی وایە هەموو وەرزەکانی ساڵ لە چل ڕۆژدا دەگەنە ئەوپەڕی بەهێزی، بۆیە چلەی زستان بەوپەڕی ساردی دادەنرێت و چلەی هاوین بەوپەڕی گەرمی. هەروەها لە ناو یارسان (ئەهلی حەق) مەکاندا چل فریشتە هەن بە ناوی (چل تەن) و ئەوانە لە ناو ئێزدیەکاندا پێیان دەگووترێت (چل میر). یارسانەکان پێیان وایە دەبێت منداڵ بەلایەنی کەمەوە چل ڕۆژ و یەک چرکە ژیابێت بۆ ئەوەی کە تەمەنەکەی بە بەشێك لە سوڕی ١٠٠١ی گیان بەبەرداکردنەوە (incarnation) بژمێردرێت و هەندێک جار لە چلەی زستاندا ڕۆژوو دەگرن (Hamzeh'ee, 1990, p.101, 121, 130 and 186). لە ناو ئێزدیەکاندا جەژنێک هەیە بە ناوی (جەژنی چلەی هاوین)؛ ئەم جەژنە لای ئەوان جەژنێکی گرنگە وچل ڕۆژ پێش دەستپێکردنی ئەو جەژنە ئێزدیەکان بەڕۆژوو دەبن و ئەو ماوەیە بە دوعاکردن و خواپەرستیەوە بەسەر دەبەن. بە کۆتایی هاتنی ئەو چل ڕۆژە جەژن دەست پێ دەکات و ڕێ و ڕەسمی جەژنەکە لە پەرستگای پیرۆزی لالش بەڕێوە دەچێت و بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام دەبێت.

هەروەها ناوی یەکێک لە شاخە هەرە بەرزەکانی ناوچەی سەقز بریتیە لە (چل چەمە)، شاخێک لە نزیک شەنگار هەیە بە ناوی (چل مێر). یەکێك لە مزگەوتە هەرە گەورە و بەناوبانگەکانی شاری سنە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بریتی بووە لە مزگەوتی (چل ستون) (Yonana, 1934, p.18). یاریەکی کوردی هەیە بە ناوی (چلپەردە) کە تێیدا چل کوچک بە شوێن یەکدا هەڵدەگرنەوە (هەژار، پ.٢٠٥). تیپێکی مۆسیقای کوردی هەیە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بە ناوی "چل دەف". کە کورد دەیەوێت بڵێت زۆرم پێ گووتیت، دەڵێت "چل جارم پێ گووتیت". چەندین پەندی کوردی هەن کە دیسان گرنگی ژمارە چلی تێدا دەردەکەوێت. کورد دەڵێت "سەگی هار تەمەنی چل ڕۆژە" یان دەڵێت "بە حوشتریان گووت کوڕت بوو، حوشتریش دەڵێت کە من بارم چل مەن بێت، چ نێر بێت چ مێ"؛ لەم پەندەی دواییدا کورد دووبارەی ژمارە چلی سۆمەری دەکاتەوە و هەروەها (مەن) کە یەکەیەکی کێشی کوردیە، لە هەمان کاتدا سۆمەریە و (بار) کە یەکەی کێش و قەبارەی کوردیە لە هەمان کاتدا لای سۆمەریەکان bur یەکەیەکی قەبارە بووە.

ژمارە حەوتیش لای کورد گرنگی هەیە، بەڵام وەک لای سۆمەریەکان، بە ڕێژەیەکی کەمتر دەردەکەوێت لە ژمارە چل. بۆ نموونە زۆربەی خێزانی چیرۆکە کوردیەکان حەوت منداڵیان هەیە؛ لە ناو یارسانەکاندا مێژووی جیهان دەکرێت بە حەوت بەشەوە، کە لە هەر سەردەمێکدا خودا لە ڕوخساری مرۆڤدا دەرکەوتووە، هەروەها لای ئەوان حەوت فریشتەی گرنگ هەن و لە چەند شتێکی تردا ژمارە حەوت دووبارە دەبێتەوە (Hamzeh'ee, 1990, p.71, 99, 117 and 136). لە چیرۆکە کوردیەکاندا زۆربەی گەشتەکان حەوت شەو و حەوت ڕۆژیان پێ دەچێت، پشیلە حەوت ڕۆحی هەیە، گروپێک لە ئەستێرە هەیە پێی دەگووترێت (حەوتەوانە) کە لە حەوت ئەستێرە پێکهاتووە، ئەگەر چاکەیەکی تایبەت بکەیت حەوت پشتت دەچێتە بەهەشتەوە. حەوت ڕۆژ دوای منداڵ بوون و مردنی کەسێک (حەوتم) دەکرێت کە تێیدا خواردن دەبەخشرێتەوە (هەژار، پ.٢٣٢). لە ناو کەڵهوڕەکاندا جۆرێک لە ترس دەرکردنی منداڵ هەیە کە تێیدا حەوت جار پرۆسەی ترس دەرکردنەکە دووبارە دەکرێتەوە و کەڵهوڕەکان پێی دەڵێن (ترس وڕین)[132]،

---

[132]. "ترس وڕین" بریتیە لە سوتاندنی گیایەک کە لە کوردەواریدا پێی دەڵێن نەستەن یان نەستەنی. ئەو گیایە لە تاوەیەکدا لەگەڵ خوێ تێکەڵ دەکرێت و ئاگری دەخرێتە ژێر بۆ ئەوەی کە بسووتێت و بۆنێکی خۆش بڵاودەکاتەوە. لەو کاتەدا کەسێک لە کەسی دووهەم دەپرسێت ئەوە چی دەکەیت، ئەویش دەڵێت ئەوە ترسی ئازاد (بۆ نموونە) دەوەڕم، بەو جۆرە هەتاوەکو حەوت جار ئەو گفتوگۆیە دووبارە دەکرێتەوە.

جۆرێکی تر لە ترس دەرکردنی[133] منداڵ هەیە کە تێیدا حەوت پشکۆ لە ئاودا دەکوژێنرێتەوە و چەندانی تر. لە ڕاستیدا لە کاتێکدا کە ئەو دوو ژمارەیە لە ژیانی ڕۆژانەی کورد دا ڕۆڵی گەورە و تایبەتیان هەیە لە هەمان کاتدا بەشێوەیەکی گشتی لە زۆربەی ئاینەکانی وەک جودایزم، کریستیان، ئیسلام، هیندویزم، هتد. شوێنی تایبەتی خۆیان کردۆتەوە.
هەروەها زۆربەی ئەو گوند و شارۆچکانەی کە ناوەکانیان بە کوردی ماونەتەوە و نەگۆڕاون بە زمانی عەرەبی، فارسی و تورکی، هێشتا مانای ناوەکانیان لە کوردیدا هاوجووتە لەگەڵ ماناکەیان لە زمانی سۆمەری، هوری، هیتی، لوڤی، میدی، ئاڤێستا، هتد. دا. بۆ نموونە گوندی کانی مانگا (کانی+مێ+ین+ گا)؛ (کانی) بنەچەکەی هیتیە، وشە کوردیەکانی (مێ) و (گا)، هەردووکیان سۆمەرین. بەرگەڵو (بەر+گەڵو)؛ هەردوو وشەکە سۆمەرین. سەرگەڵو (سەر+گەڵو)؛ وشەی (سەر) لە زمانی هیتی، میدی و لوڤیدا دەردەکەوێت و (گەڵو) بە مانایەکی نزیک بنەچەکەی سۆمەریە. گەلی عەلی بەگ، (گەلی) بنەچەکەی سۆمەریە و (بەگ) لە هەردوو زمانی مید و مانیدا بەکارهاتووە. کانی سپیکە: (کانی) هیتیە و (سپی) بە مانایەکی نزیک بنەچەکەی هیتی و لوڤیە. بازیان (باز+یان) (باز) بنەچەکەی سۆمەری و هوری و (یان) هوریە. بە سەدان ناوی تر بنەچە دێرینەکەیان هێشتا ماوە.
تەنانەت سڵاوکردنی هیتیەکان کە بریتی بووە لە assu ئەمڕۆ لە کوریدا لە ناوچە جیاوازەکاندا بە چوار شێوەی جیاواز وەک خۆی ماوە و دەبێتە uaši , xošī, xāsī, bāšī. هیتیەکان جۆرێک نانیان هەبووە پێیان گووتووە šalakar ئەمڕۆ ئەو نانە لە کوریدا پێی دەگووترێت (شلکی) و سۆمەریەکان بە هەویر دەڵێن šilig. باڵندەی کەو کە ئەمڕۆ بووەتە بەشێک لە دابونەریت و فەرهەنگی کوردی، لە ناو هیتیەکاندا ناوی kakkapi بووە، کە ئەمڕۆ لە ناو کوردەواریدا بۆ بانگکردنی کەو دەگووترێت (کاکبە کاکبە) و پێ دەچێت لە ناو هیتیەکانیشدا کەو وەک کورد بە خێوکرابێت و ئەو گرنگیەی هەبووبێت.
ئەو زمانەش کە ئەمڕۆ کورد قسەی پێ دەکات، لە هەندێک ناوچەدا لە نێوان ٨٠%-١٠٠% سۆمەریە و وشەی هوری، هیتی، میدی، لوڤی و ئاڤێستایی تێدایە.

## جوگرافیای کوردستان

لە سەردەمی پێش سۆمەریەکانەوە هەموو مێسۆپۆتامیای کۆن و زۆربەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە کۆمەڵێک زمان و زاراوە قسەی تێدا کراوە کە بە هەموویان زمانی کوردی ئەمڕۆ پێک دەهێنن. لە ڕابردوودا زۆربەی ناوچەکانی ڕۆژئاوای وڵاتی ئێرانی ئەمڕۆ و ئازەربایجان و عێراق و سوریا و تورکیا وڵاتی کوردان بووە و بە زاراوە کوردیەکان قسەی تێداکراوە. بۆ چەند هەزار ساڵێکە نەتەوە نوێکانی وەک ئەکەدی، ئاشوری، ئارامی، فارس، یۆنانی، ئەشکانی، ڕۆم، عەرەب، تورک، هتد. لە سەردەمی جیاوازدا لە هەموو لایەکەوە ڕوویان کردۆتە ناوچەکە و ڕۆژ بەڕۆژ ناوچەی جێنشینی کوردان ڕوو لە بەرتەسکبوونەوە دەکات و ئەم پرۆسەیە هەتاوەکو ئەمڕۆ بەردەوامە.
لە سەردەمی دێریندا وڵاتی سۆمەری، گووتی، هوری، هیتی، لوڤی، میدی، مانی، ئیلامی، کاسی، هتد. وڵاتی کوردان بووە. لە ناو ئەم وڵاتەدا چەندین جێگای بچووک ناویان هاتووە. وەک وڵاتی لولوبیەکان (Lullubum)، سوباریەکان (Subarum)[134] و ناوچەی میتانیەکان. ئەم ناوانە لە سەردەمی جیاوازدا گۆڕاون و لە سەردەمی ئاشوریەکاندا دوای کزبوونی هوری و سۆمەریەکان، وورده وورده مانی و میدەکان شوێنی ئەو دەوڵەتە دێرینانەی جارانیان گرتەوە، بۆیە زۆر جار بە گوتی دەناسران و بەو جۆرەش

[133]. جۆرێک لە ترس دەرکردنە کە بۆ منداڵ دەکرێت بەوەی کە پێش خۆر ئاوابوون منداڵە ترساوەکە دادەنیشێنن و دوو کەس بەیەکەوە یەکێکیان جامێک ئاو لەسەر سەری منداڵەکە دادەنێت و ئەوی تریان حەوت پشکۆ دەخاتە ناو ئاگرەکە هەموو جارێک پێش ئەوەی کە پشکۆکە بخاتە ناو ئاگرەکە، کەسی دووەم دەپرسێت "ئەوە چی دەکەی" ئەویش وڵامدەداتەوە "نیەتمە ترسی (بۆ نموونە) ئازاد دەربکەم" و پشکۆیەک دەکاتە ناو ئاوەکە و ئەو ووتەیە حەوت جار دووبارە دەکرێتەوە.
[134]. وا دەردەکەوێت ئەم ناوچەیە هەر زێباری ئەمڕۆ بێت، لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیە زۆر دوور نیە لە ناوچەی زێباری ئەمڕۆی کوردستان کە دەکەوێتە نزیک هەولێر و سەرو شارۆچکەی ڕەواندزەوە.

(نەخشەی ژمارە ١٢a) یەکێک لە نەخشە کۆنە ئەوروپییەکان کە لە ساڵی ١٦٨٤ز لە ئەورپادا دروستکراوە و کوردستانی بە شێوەی CURDISTAN تێدا دەسنیشان کراوە، ئەوەی کە جێی سەرنجە عێراق کەوتۆتە خواروی شاری بەغدا و تورکیا لە نێوان

وڵاتەکەیان بە گوتیم ناسرابوو. لە ڕووی جوگرافیەوە وڵاتی میدیا بەشێکی کوردستانی ئەمڕۆ بووە و هەندێک جار بەشێکی بە ناوی ( gutim)[135] باسکراوە.
لە دوای سەدەی حەوتەمی پێش زاینەوە و کۆتایی هێنان بە دەوڵەتی ئاشوری و بەهێزبوونی میدەکان، سەرەتا زۆربەی کوردستان لە ژێر ناوی دەوڵەتی میدیدا بووە و کوردستان بە میدیا دەناسرا، لە دوای سەدەی سێهەمی پێش زاین و بچووک بوونەوەی دەوڵەتی میدیەکان و لە نزیکی سەدەی دووهەمی پێش زاینەوە بە ڕوونی کوردستان لە ژێر سێ ناوچەی سەرەکی جوگرافی و دەسەڵاتی حوکمڕانیدا باسکراوە کە هەر یەکەیان پاشای کوردی خۆیان هەبووە. ئەو سێ ناوچەیە لەلایەن زۆر لە مێژوونوس و جوگرافیناسە یۆنانی و ڕۆمانەکانەوە باسکراون. ناوچەکان بریتی بوون لە وڵاتی میدیا (Media) و وڵاتی هەزەبانیەکان (Adiabene) و کوردیان (Grordene/Coryene) (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٩). بۆ یەکەم جار کە لە دوای کزبوونی میدەکان، ئەو دەسەڵاتانە وەک کیانێکی جوگرافی و یەک وڵات باسکرابێت، لەسەدەی چوارەمی زایندا ڕووی داوە. ئەمیانۆس مارسیلینۆس (Ammianus Marcellinus) ی مێژوونوسی ڕۆمان، هەموو نەینەوا و هەمەدان[136] و هەولێر بە یەک وڵاتی هەزەبان (Adiabene) دادەنێت (Marcellinus, 1894, p.334)(بڕوانە هەزەبانیەکان). نابێت ئەوە لە یاد بکرێت، کە لە سەردەمی مارسیلینیۆسدا کوردستان لە بەشێکی باکور و لە ڕۆژئاواوە لە ژێردەستی ڕۆمەکاندا بووە. مارسیلینیۆسیش وەک مێژوونوسێکی ڕۆمان، بەشەکانی باکور و ڕۆژئاوای کوردستانی نەخستۆتە سەر وڵاتی کوردستان، لەبەر ئەوەی کە خۆی سەربازی ڕۆمەکان بووە و ئەو زەویە ئەو کاتە ڕۆم دەستی بەسەرا گرتبوو، لە ئەنجامدا ئەو بە وڵاتی ڕۆمی داناوە. سەرنج دەدرێت ئەو ناوچەیەی کە مارسیلینۆس وەک یەک کیان ئاماژەی پێ دەکات، بە نزیکی هەر هەمان ئەو ناوچەکانەیە کە دوای بچووک بوونەوەی وڵاتی میدیای گەورە، لە ناوچەکانی میدیای ئازەربایجان و هەزەبان و کوردیان پێک دەهات. لە ڕووی حوکمڕانی و جوگرافیەوە کوردستان لە نزیکی سەدەی سێهەمی پێش زاینیەوە بە گشتی لەو سێبەشەدا بینراوە و لەو سەردەمەدا وڵاتەکە پێکهاتبوو لە هەمەدان و دەروبەریەوە بەرەو باشور و ڕۆژهەڵات و بەرەو باکور ئازەربایجانی دەگرتەوە. هەروەها ناوچەی ئیداری ئەو سەردەمەی نەینەوای دەگرتەوە کە ئەویش هەکاری و جەزیرە و وانی تێدا بووە. لە سەردەمی ڕۆمەکاندا بەشی ڕۆژئاوا و باکوری کوردستان لەلایەن ڕۆمەوە دەستی بەسەردا گیرابوو بێ ئەوەی کە دانیشتوانە کوردەکەی گۆڕابێت.
ئەوەی کە مایەی سەرنجە ئەوەیە کە بۆچوونەکەی مارسیلینۆس، سەبارەت بە ناوچە جێنشینەکانی کورد کە لە سەدەی چوارەمی زایندا ئاماژەی پێکردووە، لەگەڵ وەسفی هەموو مێژوونوسە ئیسلامیەکانی سەدەکانی نۆهەمی زایندا یەک دەگرێتەوە جگە لەو ناوچانەی کە ڕۆمەکان داگیریان کردبوو و مارسیلینۆس بە خاکی ڕۆمی زانیوە. وەک حەلەب و ئورفە و ماردین و زۆربەی کوردستانی باکور. بۆ نموونە ئەلعومەری سەبارەت کورد دەڵێت "من تەنها ئەوانەم باسکرد کە شارەزایان بووم و تەنها ناوی ئەوانەم هێنا کە خاوەن ناوچە و ئیمارەت بوون لە شاخەکانی هەمەدان و شارەزور و هەولێر کە لە جەزیرەی دیجلە کۆتایی دێت لە ناوچەکانی (کوار)[137] موسڵ، ئەوانەی دوای دیجلە و فرات واز لێ دەهێنین لەبەر بێ ئاشناییمان پێیان. بەڵام

[135]. پاشگری um ماژەیە بۆ ناوچەی دەسەڵاتی گروپەکان، بۆیە سەرنج دەدرێت بۆ ناوی ناوچەی جوگرافی هەموو گروپە دێرینەکان ئەو پاشگرە بەکارهاتووە.

[136]. پەیوەندی ناوچەکانی کوردستان لە هەموو ڕوویەکەوە بەردەوام بووە. لە یەکێک لەو گرێبەندی زەوی فرۆشتنانەی کە زیاتر لە حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر لە کوردستاندا نووسراوە، تێیدا دەبینرێت کە کەسایەتیەکی بابانی زەوی لە ناوچەکانی هەمەدان هەبووە و فرۆشتوویەتی (مەسعود محەمەد، ٢٠٠٨، پ.٦٨). ڕیچ لە کتێبەکەیدا لە چەند شوێنێکدا ئاماژە بە پەیوەندی و بازرگانی ناوچەی هەمەدان لەگەڵ ناوچەی سلێمانی دەدا و کوردسان (Rich, 1836). هەروەها هاتنی شێخ عیسێ و شێخ موسێ لە نزیکی سەدەکانی دوانزەی زاینیدا لە هەمەدانەوە بۆ ناوچەی بەرزنجە و لە دواییدا گۆڕینی ئەو گوندە بە شوێنێکی ئاینی گرنگ بۆ یارسانەکان و شێخە موسوڵمانەکانی بەرزنجە، ئاستی پەیوەندی توند و تۆڵی فەرهەنگی و ئاینی نێوان ناوچەکانی کوردستان دووپات دەکاتەوە.

[137]. وشەی (کوار) لە بنەڕەتدا وشەیەکی سۆمەریە کە سۆمەریەکان بە شێوەی kur نووسیویانە بە مانای (ناوچە، دەڤەر، وڵات). عەرەبەکان، کە گەیشتنە ناوچەکە وشەکەیان لە خەڵکە ڕەسەنەکە وەرگرتووە، لەوێدا وشەکەیان لە (کور) ەوە کردۆتە (کوار) و

ئەوەی کە باسم کردووە کورتەی بابەتەکەیە لەبەر ئەوەی کە تەنها کوردەکانی جەزیرە و دێکانی ماردین ماوە" (العمري، ٢٠١٠). مەسعودی-ش لە کتێبی (التنبیه و الاشراف) دا دیسان ناوچەکانی فارس، خراسان، کرمان، ئەسفەهان و ناوچەی ماهەکان (میدیەکان) بە ماهی[138] کوفە، ماهی بەسرە و ماهی سبذان و هەموو هەمەدان و شارەزور و ئازەربایجان و ئەرمینیا و جەزیرە و شام وەک جێگای نیشتەجێبوونی کورد باس دەکات (المسعودي، ٢٠١٢).

مەحمود کاشغەری (محمود الکاشغري) لە ساڵی (١٠٧٢ز- ١٠٧٤ز) لە کتێبی (دیوان اللغات الاکراد) دا لە ناو نەخشەی جیهاندا وڵاتی کوردان (ارض الاکراد) ی دەستنیشان کردووە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١).

دەبیرێت لە نەخشەکەی کاشغەریدا هاوشێوەی ئەمڕۆ ناوچەکانی وەک فارس، کرمان، خراسان، خاکی کوردان هەمووی بە وڵات دانراون. ئەمە لەگەڵ ئاڤێستادا یەک دەگرێتەوە کە کوردی لەگەڵ کرماندا ناوهێناوە و بەشێوەی "کورد و کرمان" (Kurd and Kirman) (West, 2004, p.15) دەرکەوتوون، کە دیسان ئەوە ڕوون دەبێتە کە لە ڕۆژئاواوە لە ئاڤێستاشدا ناوچەی کورد (کوردستان) لە وڵاتی میدیاوە دەست پێ دەکات.

هەندێک جار لەسەردەمی هاتنی ئیسلامدا ناوچەی کوردستان بە (جبل) ناسراوە و یەعقوبی لە سەدەی نۆهەمی زایندا لە کتێبی (البلدان) دا باسی وڵاتی شاخ (کور الجبل) بە وڵاتی کوردان دەکات (الیعقوبي، ١٨٨٣، پ.٧). دوایی بەپێی گۆڕینی هەلومەرجەکان و ناوچە ئیداریەکان ناوچەی کوردستان لە گۆڕاندا بووە. حەمدەڵای مستەوفی (١٢٨١ز-١٣٤٩ز) لە سەدەی چواردەهەمی زاییندا دەڵێت کە سەنتەری دەسەڵات لە کوردستاندا لە ڕابردوودا شاری بەهار بووە. شاری بەهار دەکەوێتە نزیکی هەشت میل باکوری هەمەدان (زکي، ١٩٦١، پ.٥). لە ڕاستیدا لە ڕابردوودا پایتەختی میدەکانیش هەر لە هەمەداندا بووە. مستوفی دەستنیشانی ناکات کە لە ڕابردوو مەبەستی کام سەردەمە، تەنها دەڵێت لە ڕابردوودا و نازانرێت ئایا مستوفی مەبەستی لە دەوروبەری سەدەکانی دەیەمی زایینە یان باس لە سەردەمێکی دێرینتر دەکات.

کوردستان بە درێژایی مێژوو لە ناو جەرگەی ئوستانی فارس لە کەنداوەوە دەست پێ دەکات هەتاوەکو باکوری سوریا و دەریای ناوەڕاست. بەپێی قسەی یەعقوبی تەنها ژمارەی ڕەشماڵی ئەو کوردە کۆچەرانەی کە لە ناو جەرگەی وڵاتی فارسەکان (ئوستانی فارس) دا دەژیان و بە وڵاتی خۆیان داناوە، بە پێنج سەد هەزار ڕەشماڵ خەمڵێنراوە (الیعقوبي، ١٨٨٣، پ.٧).

ئەم وڵاتەی ئەمڕۆ پێی دەگووترێت کوردستان لە ئەنجامی هاتنی نەتەوە جیاوازەکانی وەک ئەکەدی، ئاشوری، فارس، هتد. وورده وورده بچووک بووەتەوە و لە سەدەی شەشەمی زاینەوە و دوای هاتنی عەرەبەکان و دوایی لە سەدەکانی سیانزەوە دوای هاتنی تورکەکان، بووەتە هۆی جارێکی تر بچووک بوونەوەی لە هەموو لایەکەوە و ئەم وڵاتەی ئەمڕۆی لێ دەرچووە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٢b).

**ناوی کوردستان**

کوردستان ناوێکی نوێی وڵاتی کوردانە، لە سەردەمی بابلی و ئاشوریدا بە گشتی بە Gutim ناسرابوو. ئەمەش لە مێژوودا حاڵەتێکی گونجاوە و زۆر وڵات هەیە لەلایەن خەڵک و نەتەوەکانی دەوروبەریانەوە بەشێوەی جیاواز باسکراون. بۆ نموونە بە درێژایی مێژوو خەڵکانی تر بە وڵاتی ئەرمەنەکان دەڵێن (ئەرمینیا Armenia)، کەچی لای ئەرمینیەکان ناوەکە بریتیە لە (هەیەستان Hayastan). گۆڕانی ناوی وڵاتی کوردیش هەر بەو شێوەیە ڕووی داوە. دەنا ناوی "کوردیان/گۆردیان Cordene/Gordyan " کە لە بەڵگەنامە یۆنانیەکاندا لە سەدەی یەکەمی زاینەوە زۆر بەکارهاتووە و سێ هەزار ساڵ پێش زاینیش لە

کردویانەتە کۆ. ئەم وشە سۆمەریە هەتاوەکو سەدەکانی چواردیەمی زاینیش هەر لە ناوچەکەدا بە هەمان مەبەست بەکارهاتووە و لە تێکستەکەدا ئەلعومەری مەبەستی لە دەڤەرەکانی موسڵە؛ یەعقوبی بۆ ئاماژەکردن بە وڵاتی کوردان هەر (کور الجبل) بەکاردەهێنێت (الیعقوبي، ١٨٨٣، پ.٧).

[138] لەوێدا عەرەبە موسوڵمانەکان ئەو ناوە نوێیەیان داناوە، مەبەست لە بەکارهێنانی (ماه) وڵاتی (میدیا) یە و عەرەبەکان دەڤەرەکانی میدیایان کردۆتە کۆ و بۆیە دەڵێن (ماهات) (بڕوانە میدەکان).

(نەخشەی ژمارە ١٢b) نەخشەی کوردستان، دوای چەندین هەزار ساڵ لە هاتنی نەتەوە نوێکان و بچوک کردنەوەی وڵاتەکە.

سەردەمی سۆمەریەوە و دوایی لەلای ئاشوریەکانیش بەکارهاتووە بەشێوەی تەرجومەی ئینگلیزی "خاکی کورد Land of Kurda/Kurte" هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ ناوی (کوردستان) دا. ئەمڕۆ لە کوردیدا دەگووترێت (گەرمیان، کوێستان)، کە ئەگەر پاشگرەکانی (یان، ستان) کە هەردووکی لە بنەچەدا هوری و کوردین، شوێنەکانیان ئاڵوگۆڕبکرێت، ئەوا دەکرێت بگووترێت (گەرمستان، کێویان) و هەر هەمان ماناش دەدا. بۆیە (کوردیان، کوردستان) هەر هەمان ناوە و هیچ جیاوازیەکیان نیە. ناوی (کوردیان) وەک وڵاتی کوردان زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ کۆنە، بەڵام ناوە نوێکەی وەک هەموو ناوە نوێکانی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لە دوای سەدەکانی ناوەڕاستەوە بەکارهاتووە.

ئەمڕۆ زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن ناوی کوردستان بەم شێوە نوێیەی لەلایەن حەمدوڵای مستوفی (١٢٨١ ز- ١٣٤٩ ز) ەوە لە ١٣٤٤ ز دا ناوهێنراوە ئەم بۆچوونە ڕاست نیە لەبەر ئەوەی کە پێشتر لە سەرچاوە ئەرمەنیەکاندا لە (١١٣٨ز-١١٤٤ز) ناوی هێنراوە (Astrian, 2009, p.19)، کە ئەوە نزیکی زیاتر لە دوو سەد ساڵ پێش مستەوفیە. هەروەها مارکۆ پۆلۆ (١٢٥٤ ز- ١٣٢٤ ز) هەر دیسان پێش حەمدوڵای مستەوفی، وەک یەکەم ئەورووپی ئاماژەی پێکردوە.

مارکۆ پۆلۆ تەنها ناوی کوردستان دەهێنێت و زانیاری سەبارەت وڵاتەکە نادات. لە شوێنێکدا دەڵێت "پیاوێکی نارد بۆ دیمەشق و ئەوی تریان بۆ کوردستان" (Marco Polo and Murray 1845, p.229).

ناوی کوردستان بە پرۆسەیەکدا گۆڕاوە و لە کات و سەردەمی جیاوازدا و لەلایەن مێژوو نوسانی جیاوازەوە بە شێوەی جیاواز ناوهێنراوە و پرۆسەی گۆڕانی ئەو ناوە بە ڕوونی دەردەکەوێت. ئەوەی کە ئاشکرایە، ناوە نوێکەی کوردستان کتوپڕ پەیدا نەبووە، بەڵکو دەتوانرێت لەو سەرچاوانەدا ڕەگی ناوەکە بۆ زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ بگەڕێنرێتەوە، هەر وەک لە خوارەوەدا ڕوونکراوەتەوە:

| سەرچاوە | تێبینی |
|---|---|
| سەرچاوە سۆمەریەکان | لە نزیکی هەزارەی سێهەمی پێش زاییندا لە تێکستی سۆمەریەکاندا ناوی کوردستان هاتووە بەشێوەی (خاکی کاردا (Land of Kurd)) کە بە تەنیشت خەڵکی سو (سو) (هەندێک بە سوبارتو (Subartu)ی نووسیوە) ناویان هاتووە و لە ژێر دەریاچەی وانی ئەمڕۆدا بووە (Driver, 1992,67). |
| سەرچاوە بابلیەکان | لە سەرچاوە بابلیەکاندا لە ئاماژە بە کوردستاندا ناوی گوتیم (Gutium) بەکارهاتووە. |
| سەرچاوە ئاشوریەکان | لە سەرچاوە ئاشوریەکاندا خاکی کورتی (Land of Kurte) و گوتیم (Gutium) ئاماژەی پێکراوە. |
| سەرچاوە یۆنانیەکان | لە سەرچاوە یۆنانیە سەرەتاییەکاندا لە بری ناوچەی گوتیمی بابلی، ئەوان وڵاتی میدیایان بەکاردەهێنا و دوایی بۆ ئاماژەکردن بە دوو بەشی هەمان ناوچە، هەزمبان (Adiabene) و میدیایان بەکاردەهێنا و بۆ ناوچەی وان و جەزیرە کاردۆخی (Karduchi). لە سەرچاوەکانی دوای سەدەی یەکەمی زاینیەوە یۆنان و ڕۆمانەکان کاردۆخیان گۆڕی بە (کوردیان/گۆردیان). |

# ئافرەت لە مێژووی کورد و کوردستاندا

ئەگەر بە قوڵایی مێژوودا سەیر بکرێت و سەرنجێک لە ڕابردووی فەرهەنگی نەتەوە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵ بدرێت، دەبینرێت کە سۆمەریەکان کاریگەری فەرهەنگی و زانستییان لەسەر خۆرهەڵات و هەموو مرۆڤایەتی هەبووە. بەڵام هەموو نەریتێکی کۆمەڵایەتی سۆمەریەکان نەیتوانیوە کاریگەری لەسەر نەتەوەکانی تر هەبێت. یەکێک لەو نەریتە کۆمەڵایەتیانەی کە لەلای سۆمەریەکان هەبووە و نەی توانیوە لە کۆمەڵگەکانی دراوسێیدا جێگای خۆی بکاتەوە، ڕۆڵ و جێگای ئافرەتە لە کۆمەڵگەی سۆمەریدا. ئەم نەریتە کۆمەڵایەتیە خاڵێکی هاوبەش بووە لە نێوان سۆمەری و هوری و هیتی و گوتیەکاندا، بەڵام دیاردەیەکی کەلتوریی جیاواز بووە لەگەڵ نەتەوە دراوسێ وهاوسەردەمەکانیان، لەوانە بابلیە سامیەکان، ئەکەدیەکان و ئاشوریەکان.

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە لە ناو سۆمەریەکاندا هەندێک جار ئافرەت پاشا بووە. بە دڵنیایی قبوڵکردنی پاشا نزیکی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر لە کۆمەڵگەیەکدا کە متمانەی لەسەر ماسولکە بووبێت، دیاردەیەکی ئاسایی نیە لە مێژوودا. دەبینرێت کە لە لای سۆمەریەکان ئافرەت ڕۆڵێکی گرنگی لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا بینیوە و زۆربەی ماف و ڕۆڵەکانی پیاوی هەبووە، لەوانە مافی خاوەنداریەتی ماڵ و موڵک و مامەڵە پێوە کردنی، هەروەها مافی هەبووە کە ڕۆڵی کەسایەتی مەزن و پێشڕەوی ئاینی ببینێت.

لە ناو گوتیەکانیشدا ئافرەت ڕۆڵی گرنگی هەبووە و تەنانەت لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زایندا، بەپێی ئەرشیفی شەمشارە، یەکێک لە پاشای گوتیەکان شاژنێک بووە بە ناوی نەواریتوم (Nawaritum)؛ ئەم شاژنە هێندە دەسەڵاتدار بووە کە توانیویەتی لە دژی دەسەڵاتی ناوچەی لارسا، دە هەزار سەرباز بنێرێت (Eidem and Læssøe, 2001, p.32). دیارە قبوڵکردنی ئافرەتێک بە شاژن لەو سەردەمە و لە ناو گوتیەکاندا لە تایبەتمەندی فەرهەنگییەکەوە هاتووە کە ئافرەت تێیدا ئازاد بووە و ڕۆڵ و دەسەڵاتی قبوڵکراو بووە.

نەریتی ڕۆڵی بەرچاوی ئافرەت، بەهەمان شێوەی سۆمەری و گوتیەکان، لە ناو هوریەکانیشدا هەبووە. زۆر ڕووی کۆمەڵایەتی هوریەکان، لەو ژمارە تێکستە زۆرەی کە لە Nuzi[139] دۆزراوەتەوە، ڕوون بووەتەوە. مافی ئافرەت لە یاسای هوریەکاندا زۆر بە ئاشکرا دەبینرێت. ئافرەت مافی هەبووە کە خاوەنی موڵک و ماڵ بێت و بازرگانی بکات و ڕۆڵی گەورە بگێرێت؛ بەو جۆرە دەستوری هوریەکان بەشێوەیەکی تایبەت بەشێکی زۆری لە خزمەتی ئافرەتدا بووە. ڕۆڵی ئافرەت هێندە تایبەتە لە ناو هوریەکاندا کە کیم (Kim, 2006) بابەتێکی تایبەتی لەسەریان نوسیوە، لە ژێر ناونیشانی "مافی ئافرەتانی نوزی و ڕەگەزی هوریەکان" (Nuzi, Woman's Rights and Hurrian Ethnicity). ئەو لێکۆڵەرە گەیشتوتە ئەو ئەنجامەی کە هوریەکان، بە بەراورد بە بابلیە سامیەکان، لە ڕووی مافی میراتی و خاوەنداریتی و مامەڵەکردنی بازرگانیەوە بە تەواوی جیاواز بوون.

هیتیەکان، هاوشێوەی گوتی و سۆمەری و هوریەکان، بە شێوەیەکی تایبەت لە لایەنی ڕۆڵی گرنگی ئافرەت لە کۆمەڵگەکەیاندا جیاواز بوون لە ئاشوری و بابلیەکان. لای ئەوان خودا مێینەکان هەمان ڕۆڵی خوادا نێرەکانیان هەبووە. لە تێکستە هیتیەکاندا دەردەکەوێت کە لە هەندێک حاڵەتدا ئافرەت بۆی هەبووە ئەو پیاوە ڕەتبکاتەوە کە کەسوکاری بۆی هەڵبژاردوە و تەنانەت مافیشی هەبووە کە مێردەکەی تەڵاق بدات. شاژنی دەوڵەتی هیتیەکان، هاوبەشییان کردووە لە حوکمڕانیدا و دوای مردنی مێردەکانیان هێشتا هەر نازناوی پاشایی خۆیان دەما (Littleton and Cavendish, 2005, p.699). کەچی لای ئەکەدیەکان، کە هاو سەردەمی سۆمەریەکان بوون و بۆ ماوەیەک حوکمی سۆمەریەکانیان کرد، ژنی مارەبڕاو دەبوو لە ماڵەوە بمێنێت و بۆ هەتایی بە سەرداپۆشراوی بژی و ئەو سەرپۆشە بەشێک بووە لە سیمبولی دەسەڵاتی پیاو

[139]. شوێنەوارێکی مێژوویی و شارێکی هوریە لە نزیک شاری کەرکوکی ئێمڕۆ و ژمارەیەکی ئێجگار زۆر تێکستی هوری تێدا دۆزراوەتەوە.

بەسەر ئافرەتەوە و ئافرەتی ئەکەدی بە هیچ جۆرێک ئەو مافانەی ئافرەتی سۆمەریان نەبووە (Tetlow, 2004).
ئەگەر سەیرێکی سەردەمی حامورابی بکرێت، دەبینرێت کە لە ناو یاساکانی ئەو پاشایەدا خاوەندارێتی زەوی لە ئافرەت قەدەغە کراوە. لەو سەردەمەدا، دوو جۆر لە خاوەندارێتی زەوی هەبووە، یەکێکیان تایبەت و ئەوی تریان گشتی. زەوی گشتی ئەو زەویە بووە کە پاشا دەیبەخشیە کەسێک، ئەو زەویە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەمایەوە، بە مەرجێک ئەو کەسەی کە بە میرات زەویەکەی بۆ دەمایەوە نێر بوایە. سەبارەت بە زەوی تایبەتیش لە ناو بابلیە سامیەکاندا، کاتێک کە باوک دەمرد و کچێکی لێ جێ دەما، کچەکەی زەویەکانی بە تەواوی پێ نەدەدرا، بەڵکو تەنها مافی بەکارهێنانی موڵکەکەی هەبوو؛ بۆی نەبووە کە زەویەکە بفرۆشێت هەتاوەکو شووی نەکردایە. ئیتر ئەو کاتە مێردەکەی دەیتوانی بڕیاری فرۆشتنی زەویەکە بدات نەک ئافرەتەکە (Kim, 2006) .
لە ناو ئاشوریەکاندا ڕەفتاری ئافرەت بە تەواوی کۆنترۆڵ کرابوو، ئافرەت تەنها دوای شوکردن بۆی هەبووە کە بە تەنها بچێتە دەرەوە، بەو مەرجەی کە سەری داپۆشێت. بەڵام کچ ، ئافرەتی کۆیلە و لەشفرۆشەکان بۆیان نەبوو سەریان داپۆشن. ئەگەر ئافرەتێکی لەش فرۆش خۆی داپۆشیایە، ئەوا جلەکانی لێ دەستێنرا و پەنجا شەلاقی لێ دەدرا و شلەمەنی گەرم دەکرا بەسەریدا. لە کۆشکی ئاشوریەکاندا هەموو جوڵەیەکی ئافرەتەکان لەژێر چاودێریدا بووە. ئەگەر ئافرەتێکی کۆشک بە بێ یاوەری کەسێک لەگەڵ پیاوێکدا ببینرایە، ئەوا سزاکەی دەبووە کوشتنی هەردووکیان (Van de Mieroop, 2007, p.183).
ئاشوریەکان سیستەمێکی زۆر توندڕەوی حوکمڕانیان هەبووە و ئەو توندیەش زۆر جار بەسەر ئافرەتاندا دەشکایەوە. بڕیاردانی سەرداپۆشین و سەردانەپۆشین و ئەو هەموو ڕێسایانە، جۆرێک بوو لە دووپاتکردنەوەی دەسەڵاتی پیاو و لاوازکردن و نەهێشتنی ڕۆڵی ئافرەت لە ناو کۆمەڵگەی ئاشوریدا.
بە درێژایی مێژوو دوو فەرهەنگی جیاواز لە مێسۆپتامیا و ئەناتۆلدا هەبووە؛ یەکێکیان فەرهەنگی سۆمەری و هوری و کاسی و هیتی کە خەڵکە ڕەسەنەکەی ناوچەکە بوون و لەفەرهەنگدا نزیک بوون، کە تێیدا ئافرەت ڕۆڵی بە نزیکی وەک ڕۆڵی پیاو بوو، دەیتوانی بازرگانی بکات و خاوەندارێتی زەوی بێت و لە هەندێک حاڵەتدا پیاو تەلاق بدات و سەر دانەپۆشێت و وەکو پیاو ببێتە کەسایەتی ئاینی و تەنانەت خوا مێینەکانیش زۆربەی جار لە هەمان ئاستی خوا نێرەکاندا بوون. ئەوەی تریان کە دەتوانرێت وەسفبکرێت بە سیستەمێکی باوک سالاری، تێیدا پیاو هەموو دەسەڵاتێکی لەدەستدا بووە. واتە نێر حوکمڕانی دەکرد و چارەنوسی ئافرەت بەدەست ڕەگەزی نێرەوە بوو. لەم کۆمەڵگەیەدا ئافرەت، نەک هەر تەنها دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵکو تەنانەت وەکو سمبوڵێکی ژێر دەستەیی پیاو، دەبوو زۆربەی جار سەرداپۆشراو بوایە و زۆر جاریش لەسەر لادانی لەو فەرمانانە شەلاقی لێ دەدرا. ئەو تایبەتمەندیە لە فەرهەنگی ئاشوری و ئەکەدی و ئارامی و بابلیە سامیەکاندا ڕەنگی دابووەوە کە لە بنەچەدا خەڵکی ناوچەکە نەبوون. دوایش لە مێژووی نوێدا لە ناو عەرەبەکاندا لە ژێر کاریگەری نەتەوە سامیەکاندا کە هاوبەشیان لەگەڵیاندا هەبووە، کە ئەوان خۆیان لە جەزیرەی عەرەبەوە ڕوویان کردۆتە مێسۆپۆتامیا، ئەو فەرهەنگە هاوبەشە بە زیندوویی هێڵراوەتەوە. بە پێچەوانەشەوە، فەرهەنگی سۆمەری و هوری و کاسی و هیتی و گوتیەکان بە زەقی لە ناو کولتوری کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە، هۆکارەکەشی هاوبەشی فەرهەنگی نێوان ئەو گروپ و نەتەوانە بووە.
بێگومان ئەم دیاردەیە بەڵگەیەکی ترە کە پەیوەندیەکی زۆر دێرین و قوڵتر و ڕاستەوخۆ لە نێوان کورد و ئەو کۆمەڵگایانەدا دەسەلمێنێت و دەری دەخات کە کورد هەر تەواوکەری ئەو فەرهەنگە دێرینەیە. دەبینرێت کە ئەم نەریتە لە هەموو سەردەمەکانی مێژووی کۆمەڵگەی کوردەواریدا دەرکەوتووە و یەکێک بووە لەو تایبەتمەندیانەی کە لەنەتەوەکانی دراوسێی وەک فارس، عەرەب و تورک جودای کردۆتەوە و هەمیشە

سەرنجی ڕۆژهەڵاتناسانی ڕاکێشاوە. بۆ نموونە فاتمەش ڕەش (Kara Fatima)[140] کە میری خێڵێکی گەورەی کورد بووە لە ناوچەی مەرەش. لە جەنگی ساڵی (١٨٥٣-١٨٥٦ز) ی کریمین (Crimean) دا لە دژی ڕوسەکان، بە سوپایەکی گەورەوە چوەتە ئەستەمبوڵ بۆ هاریکاری کردنی عوسمانیەکان. هەندێک لە ئەوروپیەکان کە لەو سەردەمەدا لە ئەستەمبوڵ بوون و ئەم دیمەنەیان بینیوە، زۆر سەرنجی راکێشاون و ڕۆژنامە و گۆڤارە ئەوروپیەکانی ئەو سەردەمە بە شێوەی جیاواز بابەتەکەیان گێراوەتەوە. بۆ ئەوروپیەکان دیاردەیەکی سەیر و نامۆ بووە کە ئافرەتێک چەکدار بێت و سەرکردەی سەدان پیاو بکات و بەرەو بەرەکانی جەنگ بڕوات. لەبەر ئەوەی کە ئەو سەردەمە کامێرا نەبووە کە وێنەی فاتمە ڕەش بگیرێت، بۆیە لە زۆر لە گۆڤارە ئەوروپیەکاندا، هەر یەکەیان بە شێوەیەک و دوای دەمیان ساڵ وێنەی ئەو ئافرەتە کوردە جەنگاوەرەی بە دەست کێشاوە (بڕوانە وێنەی ٢٤ و ٢٥). چیرۆکی فاتمە ڕەش وەک جۆرێک لە داستان لە ناو میدیای ئەو سەردەمەی ئەوروپیەکاندا گێردراوەتەوە و هەر یەکە بە جۆرێکی جیاواز باسی دەکات .(Dodd, 1856, p.33) (Powell, 1893, p.305, 306)

(وێنەی ٢٤ و ٢٥) دوو وێنەی دەستکردی فاتمە ڕەش. کە لە بڵاوکراوە ئەوروپیەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کێشراون.

ئەگەر چاوێک بە مێژوودا بخشێنرێت، دەبینرێت نموونەی حاڵەتی ڕۆڵی بەهێزی ئافرەت، لە ناو کورد دا بەشێوەیەکی بەرچاو بەردوام بووە و لە هەموو سەردەمێکدا ئافرەتی کورد لەلایەنی جیاوازی ژیاندا ڕۆڵی دەرکەوتووی هەبووە، لەوانە:

- لە سەدەی یەکەمی زایندا، کاتێک کە مانوبازی پاشای هەزەبانی کورد مرد، هێلێنای ژنی، وەکو شاژنە هوری و هیتیەکان، دوای مردنی مێردەکەی هێشتا هەر نازناوە شاژنیەکەی وەکو خۆی مابوو و هەر شانبەشانی کوڕەکەی حوکمرانی دەکرد و لە سیاسەت و زۆربەی کاروباری دەوڵەتی هەزەبانیدا بەشداری بەرچاوی هەبوو (بڕوانە هەزەبانیەکان). کەچی سەیر دەکرێت لە هەمان سەردەمدا ئافرەتی ئەشکانیەکان

[140] لەبەر ئەوەی کە ئەو ناوە لە سەرچاوە تورکیەکانەوە وەرگیراوە، وشەی (ڕەش) تەرجومە کراوەتە Kara ی تورکی. لە کوردیدا (ڕەش) هەرچەندە ناوی ڕەنگێکە، لە هەمان کاتدا ئاماژەیە بۆ ئازایی و بوێری و وەک نازناوی ئازایی بەکار هاتووە. لە سەدەی بیستەمدا کەمالیستەکان ئافرەتێکی تورکیان ناونا (کەرەفاتمە/قەرەفاتمە) و گەورەیان کرد بەمەبەستی سڕینەوەی ناوبانگی جیهانی فاتمە ڕەشی کورد.

(Parthians) کە نەتەوەیەکی دراوسێی کورد بوون، بەپێی نەریتیان دەبوو دەموچاویان داپۆشن (Lindsay, 1856, p.96).

- زەرینای[141] ئامێدی: ئەم ئافرەتە لە سەدەی شەشەمی زاینیدا ژیاوە و کچی شێرۆخانی ئامێدی بووە؛ لە کاتی هاتنی سوپای ئیسلامدا بۆ کوردستان، سەرکردایەتی بەشێکی سوپای کوردانی دژی هاتنی موسوڵمانەکان کردووە.

(وێنەی ٢٦) حەپسەخانی نەقیب بە تەنها لە وێنەکەی دەستی چەپ و لە وێنەکەی دەستی ڕاستدا سێهەم کەسە لە ناو دانیشتووەکاندا.

- خانزادی میری سۆران: ئەم شاژنە کچی حەسەن بەگە و هاوسەری شەکەڵی بەگی میری سۆران بووە. دوای ئەوەی کە هاوسەرەکەی ژەهر خوارد کرا، خانزاد دەسەڵاتی گرتە دەست و بە جۆرێک حوکمڕانی کردووە کە لە ناوچەکەدا ناوبانگی دەرکردووە و وەک داستانێکی فۆلکلۆری لێ هاتووە و خەڵکی ناوچەکە گۆرانیان بەسەردا هەڵداوە (زەکی، ٢٠٠٥، پ. ٤٣٦)

- مامە نێرگزە ڕەشەی شوانی ناوچەی گەرمیان، مامە پرشنگی میلانی و مامە پورە حەلیمەی پشدەر؛ ئەمانە سێ سەرکردەی تری ئافرەتی کورد بوون کە بەرامبەر سوپای عوسمانی وەستاونەتەوە (Gunter, 2009, p.211). بە داخەوە شتێکی ئەوتۆ سەبارەت بە ژیانیان نازانرێت.

- حەپسەخانی نەقیب (١٨٩١ ز- ١٩٥٣ ز): لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕۆڵێکی چالاکی سیاسی هەبووە و لە ساڵی ١٩٣٠ دا یەکەم کۆمەڵەی ئافرەتانی دامەزراند و هەر لە هەمان ساڵدا نامەیەکی ئاراستەی کۆمەڵەی نەتەوەکان لە جنێف کرد و پشتگیریەکی زۆری لە سمکۆ خانی شکاک و کۆماری مهاباد کردووە و ماڵەکەی خۆی کردۆتە یەکەم قوتابخانەی کچان لە کوردستاندا. هەتاوەکو ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، ئەم ئافرەتە ڕۆڵێکی گرنگی لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی شاری سلێمانیدا هەبووە (بڕوانە وێنەی ٢٦).

- مەستورە خانمی ئەردەڵانی (١٨٠٥ ز- ١٨٤٨ ز): یەکێک بووە لە ئافرەتە شاعیر و مێژوونوس و زاناکانی کورد کە تەنها ٤٤ ساڵ ژیاوە (بڕوانە وێنەی ٢٧). لەو تەمەنە کورتەیدا نزیکی ٢٠٠٠٠ دێڕ شیعری بە زمانی فارسی و هەردوو زاراوەی کرمانجی خوارو (سۆرانی) و گۆران داناوە و کتێبێکی سەبارە بە مێژووی ئەردەڵانیەکان نوسیوە و کتێبێکی بە ناوی (عقاید و شرعیات) بە زمانی فارسی لەسەر ئاینی ئیسلام نووسیوە. مەستورە خانمی کوردستانی چەندین شیعری دڵداری بۆ خەسرەوخانی ئەردەڵانی مێردی نووسیوە کە میری دەوڵەتێکی بەهێزی وەک ئەردەڵانیەکان بووە (بۆرەکیی، ١٩٩٦، پ.٥٠٩). سەرەڕای نووسینی کتێبی ئیسلامی و مێژوو، بە دڵنیایی نووسینی شیعری دڵداری لە لایەن ئافرەتەوە بۆ

141. ناوێکی کوردی کۆنە لە سەردەمی میدیەکاندا بە شێوەی zarniya بە مانای (زێڕین) نوسراوە.

هاوسەرەکەی و هاوسەرەکەش میری دەوڵەتێکی بەهێز بێت، بە تەواوی بە پێچەوانەی دابونەریتی نەتەوەکانی دەوروبەر بووە. هەروەها نووسینی مێژووی دەوڵەتێک لە سەدەی نۆزدەهەمدا و لە لایەن ئافرەتەوە، لە کەم کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵات و بگرە ڕۆژئاواشدا ڕوویداوە.

(وێنەی ٢٧) پەیکەری مەستورە خانمی کوردستانی.

- لە کتێبی سەرئەنجامی یارساندا، ناوی دەیان شاعیر و کەسایەتی هاتووە کە ڕۆڵی پێشڕەوی ئاینیان لە ناو یارسانەکاندا بینیوە و شیعرەکانیان بووەتە بەشێک لە سەرەنجام. بۆرەکەیی هەندێک لە شیعری کۆمەڵێک لەو کەسایەتیە ئاینیە ئافرەتانەی بڵاوکردۆتەوە. لەوانە دایە تەورێزی هەورامی (سەدەی دەیەمی زاینی)، جەلالە خانمی لورستانی (سەدەی دەیەمی زاینی). ڕێحان خانمی لوڕستانی (سەدەی یانزەیەمی زاینی)، فاتمە لوڕەی گۆران (سەدەی یانزەیەمی زاینی)، لزا خانمی جاف (سەدەی یانزەیەمی زاینی)، خاتوو مەی زەرد (سەدەی یانزەیەمی زاینی)، دایە خەزانی سەرکەتی (سەدەی یانزەیەمی زاینی)، خاتوو دایراکی ڕەزبار (سەدەی چواردەیەمی زاینی)، یای حەبیبەی شارەزووری (سەدەی چواردەیەمی زاینی)، نێرگز خانمی شارەزووری (سەدەی چواردەیەمی زاینی)، خاتوو ڕەزبانۆی دەرزیانی (سەدەی پانزەیەمی زاینی)، پور فەرەیدونی شیرازی (سەدەی چواردەیەمی زاینی). ئەم ئافرەتانە هەر تەنها شاعیر نەبوون، بەڵکو هەندێک جار ڕۆڵی پێشڕەوی ئاینیان بینیوە لە ناو خەڵکدا (بۆرەکیی، ١٩٩٦).

- خاتوو پیرۆزی کچی حەسن کەنۆش: ئەم ئافەرەتە هاوسەردەمی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بووە و لە نێوان سەدەی نۆزدە و بیستەمی زاینیدا ژیاوە، بەهێزترین شیعری هەجوی لە وەڵامی شێخ ڕەزادا نوسیوە (شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ١٩٩٩، پ.١٢٦، ١٢٧، ١٢٩). لەو سەردەمەدا لە ناو هیچ نەتەوەیەکی ڕۆژهەڵات و بگرە ڕۆژئاواشدا ئەو جۆرە شیعر و ئەو دەربڕینە ڕاشکاوانە نەبسیتراوە کە لەلایەن ئافرەتەوە نووسرابێت. بەداخەوە جگە لەو شیعرەی کە بۆ هەجووی شێخ ڕەزای نووسیوە، هیچ کام لە شیعرەکانی تری نەماون.

- عادیلە خانم (١٨٥٩ ز- ١٩٢٤ ز): کچی عەبدولقادری ساحێبقران بووە و باوکی دوای لەناوچوونی دەوڵەتی بابانەکان ڕووی کردۆتە شاری سنە و عادیلە خانم لە شاری سنە لەدایک بووە (بڕوانە وێنەی ٢٨). لە ساڵی ١٨٩٥دا شووی کردووە بە عوسمان بەگی سەرکردەی خێڵی گەورەی جاف. عادیلەخان ڕۆڵێکی گەورەی لە بەڕێوەبردنی شاری هەڵەبجە و خێڵی جافدا هەبووە و توانا و هەڵسوکەوتی ئەم ئافرەتە سەرنجی

ئەوروپیەکانی ڕاکێشاوە و چەند ڕۆژهەڵاتناسێک سەبارەت عادیلەخان و شێوەی حوکمڕانی لە کتێبەکانیاندا ئاماژەیان پێکردووە و حوکمڕانە ئینگلیزەکان مەدالیایەکی بەریتانی ئەو سەردەمەیان پێ بەخشیوە (زەکی، ٢٠٠٥، پ.٤٠٤).

(وێنەی ٢٨) وێنەی عادیلە خان لە گەڵ ئەفسەر و سەرباز و ئافرەتێکی ئینگلیزدا، لە سەرەتای سەدەی بیستەم گیراوە.

ئەوانەی کە باسکران تەنها چەند ئافرەتێک بوون بە نموونە و سەدان ئافرەتی تری ناودار بە درێژایی مێژوو لە کۆمەڵگەی کوردەواریدا دەرکەوتوون. ئەمین زەکی (٢٠٠٥) لە کتێبەکەیدا ناوی زیاتر لە ٢٠ ئافرەتی تری کوردی هێناوە کە هەندێکیان حوکمڕان و هەندێکیان شاعیر بوون و ڕۆڵی گەورەیان لە سەردەمی خۆیاندا بینیوە و چەندین شیعریان لە دوا بەجێماوە.
فەرهەنگی کورد و چۆنێتی مامەڵەکردنی بەرامبەر بە ئافرەت لە کۆمەڵگەدا، کاریگەری لەسەر کۆمەڵگەکانی تری ناو کوردستان و ڕۆژهەڵاتیش هەبووە. بۆ نموونە ئەسێناس بەرزانی (Asenath Barzani)(١٥٩٠ ز- ١٦٧٠ ز) کە جوێکی کورد بووە، زۆربەی سەرچاوەکان بە یەکەم ئافرەتی دادەنێن کە لە مێژووی کۆنی جودا بووبێتە ڕابای (Schwartz, 2010, p.180). ئەم ئافرەتە شاعیر، فریشتە ناس، عیرفانی، ڕێبەری کابەلایی و مامۆستای قوتابخانەی جو بووە لە موسڵ و یەکێک بووە لە کەسایەتیە زانا جوەکانی کوردستان. بوونی ئافرەتی خاوەن پلەی ئاینی وەها و لە سەدەی حەڤدەهەمدا، لە ناو جوەکانی جیهاندا لە هیچ کۆمەڵگەیەکی تری جوی تردا ڕووی نەداوە.
یەکێک لەو داستانانەی کە لە ناو یۆنانی کۆندا دروست بووە، داستانی ئافرەتانی ئەمەزۆن (Amazon)[142] بووە (بڕوانە وێنەی ٢٩). بە پێی سەرچاوە یۆنانیە کۆنەکان، ئەمەزۆن دەوڵەتێک بووە کە هەمووی لەلایەن ئافرەتەوە حوکمڕانی کراوە. وا دیارە دەوڵەتێکی مێژوویی بووە کە زۆر لە حوکمڕانەکانی ئافرەت بووبێتن و دوایی لە ناو یۆنانیەکاندا شێوەی داستانی وەرگرتبێت و هەندێک دەستکاری کرابێت. شوێنی دەوڵەتەکە بە

[142]. ناوەکە لە سەردەمی هیرۆدۆت، واتە سەدەی چوارەمی پێش زایین، زۆر کۆنتر بووە لەبەر ئەوەی کە شاعیری یۆنانی هۆمەر (Homer) لە سەدەی هەشتەمی پێش زایینی لە داستانی ئیلیاد (Iliad) دا ئاماژەی پێ کردوون. لەوە دەچێت ناوەکە هەمان مانا کوردیەکەی خۆی بدات و لە بنەچەدا بریتی بووبێت لە هەمە ژن/هەموو ژن (hamažin/hamužin) و لەبەر ئەوەی کە یۆنانیەکان پیتی (ها) دەکەنە (ئەلف) و (ژ) دەکەن (ز)، ناوەکە کراوەتەوە ئەمەزۆن (Amazon). وشەی hama بە شێوەی جیاواز لە زمانی هیتی و میدی و سۆمەریدا دەرکەوتووە و وشەی (ژن) لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا ماوە بە تایبەتی لقی سلاڤیەکان و لە زمانی سراسیدا بە شێوەی goni نووسراوە.

تەواوی دەستنیشان نەکراوە و هیرۆدۆت و سترابۆی مێژوونوس، بۆچوونی جیاوازیان هەیە لەسەری، بەڵام بە گشتی لە ناوچەکانی کوردستانی ئەمڕۆدا بووە. هۆکاری دروستبوونی ئەو داستانە هەر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە ناو کوردەکاندا هەمیشە ئافرەت ڕۆڵێکی هەبووە کە لە نەتەوەکانی دەوروبەری جیاواز بووە، بۆیە وەک داستانێک بابەتەکە لە ناو یۆنانیەکاندا خۆی هێشتۆتەوە.

(وێنەی ٢٩) وێنەیەکی خەیاڵی دەستکردیی داستانی شاژن سالستەری ئەمەزۆنەکان کە سەردانی ئەلێکسەندەری مەقدۆنی دەکات. لە ساڵی ١٦٩٦ز دا کێشراوە.

ڕۆسێری (Rothery) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا لێکۆڵینەوەیەکی زۆری لەسەر مێژووی دەوڵەتی ئەمەزۆن کردووە، لە هەندێک شوێندا نەیتوانیوە بنەچەی ئەو داستانە و مێژووەکەی نەگەڕێنێتەوە بۆ کورد. ئەو لێکۆڵەرە لە ئاماژە بە ئەمەزۆنیەکاندا فاتمە ڕەش وەک نموونە دەهێنێتەوە و دەڵێت "دەنگۆکان هەتاوەکو درەنگ هەر بەردەوام بوون، تەنانەت لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمی زاینیدا بەردەوام بوونی ئافرەتی جەنگاوەر بەرگوێ دەکەوێت. یەکێک لەو حاڵەتە دیارانە، شاژن سالستەر (Thalestris)[143] ێکی نوێیە، کە سەرکردەی خێڵێکی کوردیە و بە "پاکیزەی ڕەش" (Black Virgin)[144] ناودەبرێت، کە لە سەرەتای جەنگی کریمیندا سەرکردایەتی هەزار جەنگاوەری دەکرد، دوای ئەوەی کە لەگەڵ جەنگاوەرەکانی لەبەردەم سوڵتاندا نمایشیان کرد، چوو لە ژێر سەرکردایەتی عومەر پاشادا لە جەنگی ڕوسدا لەسەر ڕوباری دانوب کەوتە جەنگ" (Rothery, 1910, p.94). هەر تەنها ڕۆسەری ئاماژەی بەو دیاردەیە نەکردووە، بەڵکو هەر کام لە مێژوو نوسان و گەڕۆکە ڕۆژئاواییەکان سەرنجیان داوە و تێبینیان کردووە کە ئافرەت لە کۆمەڵگەی کوردیدا ڕۆڵی کۆمەڵایەتی جیاواز بووە و تا ڕادەیەکی زۆر سەربەست بووە و سەرداپۆشراو نەبووە.

143. Thalestris پاشایەکی ئافرەتی ئەمەزۆنەکان بووە و وەک داستانێکی تر بووە کە لە ناو یۆنانیەکاندا باسکراوە. گوایە چەندین ڕۆژ لەگەڵ ئەلێکسەندردا ماوەتەوە، بەو هیوایەی کە سکی لێی پڕبێت و منداڵێکی بەهێزی ببێت.

144. "پاکیزە ڕەش" نازناوێکی ترە کە لە میدیای ئەو سەرەمەدا شانبەشانی چەندین نازناوی تر بۆ فاتمە ڕەش بەکارهاتووە. دەشبینرێت ڕۆسێری دەڵێت فاتمەڕەش سەرکردایەتی ١٠٠٠ پیاوی دەکرد، لە هەندێک سەرچاوەی تردا دەڵێت ٥٠٠ و ٤٠٠ پیاو. کە ئەمە دیسان بەشێک بووە لە بەداستان بوونی فاتمە ڕەش لە ئەوروپادا.

لەڤجۆی (Lovejoy) کە نووسەرێکی ئافرەت بووە، لە کتێبەکەیدا لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، دیسان لە ئاماژە بە ئەمەزۆنیەکاندا جەنگاوەرێکی کوردی وەک نموونە هێناوەتەوە و لە باسکردنی هێرشی تورکەکاندا دەڵێت "من خۆم لە قولاّییمدا ڕۆحێکی ئەمەزۆنیانەم هەیە. پێم ناخۆشە کە هیپۆلیتا (Hippolyta[145]) و سوپاکەی بە گازی ژەهراوی و ئەفسون ناوچەی سمیرنا (Smyrna) یان نە پاراست کاتێک کە تورکەکان لە ناوچەی ئەنگۆرە (Angora) وە هاتنە خوارێ. لەم سەردەمەدا ئەمەزۆنیەکان لە ناو کورد دا ماون. ئافرەت هەیە کە جەنگاوەرە و ئارەزووی لە جەنگاوەریە. یەکێک لە کوردەکان کە بریندار کرابوو، هاتە نەخۆشخانەی ئیسمید بۆ چارەسەر. ئەم کەسە توانایەکی باشی سەربازی هەبوو، تفەنگی نوێ و چەکی تری شەڕی پێ بوو". لەڤجۆی بەردەوام دەبێت و دەنووسێت "ئافرەتێکی کوردی ئەمەزۆنی ئەمڕۆ هەر هەمان پشتێنەکەی بەستووە. ئەم تفەنگچیە بریندارە کە لەلایەن هەرقل "Hercules"[146] ەوە ڕزگار کرابوو، هێنرایە نەخۆشخانەکەی ئێمە لە ئیسمدی. پیاوەکەی ڕۆڵی هەڵگر و گواستنەوەی چەک و تەقەمەنی بۆ تاقمەکە دەگێڕا. ئەم ئافرەتە تفەنگچیەکی دەست ڕاست بوو، ئەم جەنگاوەرە ئافرەتە شایەنی دابونەریتی ئەمەزۆنی وڵاتەکەیەتی" (Lovejoy, 1933, p.206).

بە هەمان شێوە ئەدمۆنس (Cecil John Edmonds) یش، کاتێک کە سەبارەت بە قەدەم خێری[147] سەرکردەی لوڕ قسە دەکات، ئاماژە بە ئەمەزۆنیەکان دەکات (Edmonds, p.201, 2010). هەر چەندە مەبەست لە بەراوردەکردنەکەی ئێدمۆندس بەراوردکردنێکی مێژووی تایبەت بە ئەمەزۆنیەکان نیە، بەڵام دیسان بەشێک لەو ڕاستیە دەخاتە ڕوو کە هەمیشە ڕۆڵی ئافرەت لە هەموو سەردەمێکی مێژووی کوردستاندا دیاردەیەکی تایبەت بووە.

بۆ نموونە میستەر ڕیچ کە لە ساڵی ١٨٢٠ بە کوردستاندا گەڕاوە، زۆر لای سەیر بووە کە کورد لە نەتەوەکانی تری ئەو ناوچەیە جیاواز بووە لە ڕووی ڕۆڵی ئافرەت و پەیوەندی بە پیاوە و پەیوەندی منداڵ بە خێزان و بە باوکیەوە. سۆن-یش لە ساڵی ١٩٠٧ دا کە هاتۆتە کوردستان لە کاتی مانەوەیدا لە شاری سلێمانی باسی ڕاستەوخۆ قسەکردنی لەگەڵ ئافرەتی کورد و خۆ دانەپۆشینیان و ڕۆڵی ئافرەت زۆر دەکات. لە شوێنێکدا سۆن باسی ڕووداوێک دەکات کە لە سلێمانی لێی ڕوودەوە کاتێک کە لەگەڵ کابرایەکی کورد دا شەو لە ماڵی ئافرەتێکی ناسراوی کابرای کورد لە سلێمانی دەمێننەوە و دەڵێت "ئا لێرە تۆزێک حەوامەوە و کاتم بەسەر دەبرد بە گفتوگۆکردن لەگەڵ ژنی ماڵەکە، کە ژنێکی جوانی کورد بوو تەمەنی لە سی ساڵ تێنەدەپەڕی، کە بەهۆی دابونەریتی گونجاوی کوردستانەوە ئازادە و دەتوانێت بەبێ سەرداپۆشین بیگوزەرێنێ و هەموو مامەڵەیەک لەگەڵ پیاواندا بکات وەک بونەوەرێکی ژیر. هەموو ئیشوکارەکانی خۆی دەیکات کە وای لێ دەکات تەنها ڕەگەز بێت لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا بتوانێت بە نزیکی وەک هەموو ئافرەتێکی ئەوروپی ئازاد بێت". ئەمجا بەرداوام دەبێت و دەڵێت "لە وڵاتی فارسەکان یان لە ناو موسوڵمانەکانی تردا، بۆ دوو پیاوی غەریب لە ماڵێکدا بمێننەوە کە هەمووی ئافرەت بێت، وەک ئەم حاڵەتەی ئێمە، کارێکی هێندە خراپە کە کەس نەیبیستووە، بەڵام لێرە هیچ جیاواز نیە لەوەی کە چۆن لە ئینگلتەرا مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت" (Soane, 1912, p.268). هەبەرد (Hubbard) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا و لە گەشتەکەیدا بۆ کوردستان باس لە ئافرەتی کورد دەکات و دەڵێت "سەرپۆش و هەموو بابەتەکانی لە کوردستاندا هەر ناوی نیە و ئافرەت لە ڕووی ڕەفتارکردنەوە وەک ئافرەتی ئینگلتەرا سەربەستن. یەکەم هاتووچۆم بە ناو شاری هەڵەبجەدا ئەم بۆچوونەی لەلا دروستکردم. لە شوێنی وڵاتی

---

[145]. Hyppolyta شاژنیکی ئەمەزۆنی ناسراو بووە و کە لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا وەک داستانێک ئاماژەی پێ دەکەن کە گوایە پشتێنێکی ئەفسوناوی هەبووە کە لە باوکیەوە بۆی ماوەتەوە.

[146]. لێرەدا لەڤجۆی بابەتی داستانە یۆنانیەکەی تێکەڵی ڕووداوەکەی ئەو ڕۆژە کردووە. لەبەر ئەوەی کە هەرقل و هیپۆلیتا لە داستانە یۆنانیەکاندا باسکراون و چەند بەسەرهاتێک لە نێوانیاندا ڕوویداوە. لەڤجۆی دەیەوێت ئەو ئافرەتە کوردە ببستێتەوە بە داستانە ئەمەزۆنەیەکە و مانایەکی مێژوویی بەو ڕووداوە بدات کە ئافرەتێکی کورد بەو جۆرە توانای جەنگی هەبووە.

[147]. ئەم شاژنە کچی قەدخودا قەندی خێڵی قەڵاوەندی لوڕە. لە سەردەمی خۆیدا بە جوانی، زیرەکی و ئازایی کاراکتەریی ناوبانگی دەرکردووە. هێندە ناوبانگی دەرکردووە، لە ناو لوڕەکاندا پاڵەوانێتیەکەی کراوەتە گۆرانی. ئەم ئافرەتە بەرامبەر هەوڵەکانی ڕەزا شا وەستایەوە کە دەیویست دەسەڵاتی لوڕەکان کەمبکاتەوە (Edmonds, 2010, p.201).

خێوە ڕەش پۆشە محەمەدیەکان [مەبەستی وڵاتە ئیسلامیەکانە] دا تەنها سرکە و قریوەی ئافرەتەکان دێت یان هەر بە بینینی ئەوروپیەک دەستبەجێ وەک کەروێشکی ترساو بزر دەبن. کەچی ئافرەتە چاکە بەتەمەنەکانی هەڵەبجە لە بەر دەرگاکانیاندا خەریکی قسەو باس بوون هەر وەک میسس براون و میسس جۆن لە لادێیەکی وڵاتی خۆماندا، بەو جۆرە بە تێپەڕبوونی کەسێکی غەریب، هیچ باکیان نەبوو" (Hubbard, 1917, p.178)

ڕیچ لە کتێبەکەیدا چەندین جار ئاماژەی بە ڕۆڵی گرنگی ئافرەت و خۆدانەپۆشینی کردووە و بەراوردی کردوون بە ئافرەتی عەرەب، تورک و فارس و ئەمانی هەمیشە لەو ڕووەوە بە جیاواز لە قەڵەم داوە. تەنانەت لە کتێبەکەیدا دەڵێ "دوێنێ شەو نامەبەرێک بۆ پاشا لە بەغداوە بە سێ ڕۆژ گەیشت. نامەبەرەکە دەنگوباسی ئەوەی هێناوە کە دایکی مەحمود پاشا لە لایەن پاشای بەغداوە پێشوازیەکی باشی لێکراوە و ئەگەری ئەوە هەیە پێشنیارەکانی ئەویان پێ قبوڵ بکرێت." (Rich, 1836, p.108) بەو جۆرە پاشای بابان دایکی خۆی ناردووە بۆ بەغدا بۆ ڕێکەوتنی دیبپلۆماسی لەگەڵ پاشای بەغدا و بۆ کورد ئاسایی بووە کە ئەوە بکات. ڕیچ تێبینی کردووە کە ئافرەتی کورد، بە بەراورد بە ئافرەتی تورک و فارس و عەرەب، لە هەموویان زیاتر ڕێز گیراون و ڕۆڵیان لە کۆمەڵگەدا هەبووە بۆیە دەڵێت "ژیانی ئافرەت لە کوردستاندا زۆر زۆر باشترە لە تورکیا و وڵاتی فارس؛ دەتوانرێت بگووترێت مێردەکانیان هاوشانی خۆیان سەیریان دەکەن و ئەوان ڕقیان دەبێتەوە لەو ملکەچییەی کە ئافرەتی تورک تێیدا دەژی و گاڵتەی پێ دەکەن" (Rich, 1836, p.285).

ئافرەتی کورد و پەیوەندی لەگەڵ پیاو و پێگەی لە کۆمەڵگەدا، زۆر سەرنجی ڕیچی ڕاکێشاوە. بۆ نموونە ئافرەتێکی بینیوە کە وەک پاسەوانی یەکێک لە پیاوە دەسەڵاتدارەکانی سلێمانی کاری کردووە و بە جلی کوردی پیاوانەوە بووە و چەکدار بووە. ڕیچ باسی ئازایەتی ئەو ئافرەتەی کردووە کە چۆن وەک هەموو پیاوێکی ئازا لە جەنگدا چووە بە گژ پیاودا. هەروەها باسی ئەوە دەکات کە لە شاری سلێمانیدا ئافرەت خۆی داناپۆشێت و حەزی لە هەڵپەڕکێیە و بەردەوام دەبێت و دەڵێت "ئافرەتی کورد ئاشقی هەڵپەڕکێن. لە کاتی زەماوەند دا ئەگەر بانگهێشتیش نەکرابن، ئەوان هەر دەچن بۆ ئاهەنگەکان و تەنانەت دیاری بچووک دەبەن بۆ بوک بۆ ئەوەی کە بتوانن بەشداری هەڵپەڕکێکە بکەن. ئافرەتەکان هەمیشە لە ناو خەڵکدا هەڵپەڕکێ دەکەن بێ سەر داپۆشین، هەرچەندیشە ژمارەی پیاوەکان لەو ناوەدا زۆر بێت" (Rich, 1836, p.286).

سەماکردنی ئافرەتی کورد، ڕەنگدانەوەی ڕۆڵ و پێگەیەتی لە ناو کۆمەڵگەدا. لەبەر ئەوەی ئەویش لە هەڵپەڕکێدا هەمان خۆشی دەبینێت و هەر هەمان سەمای نێرینە دەکات و سەماکەی ئەو جیاواز نیە. بە پێچەوانەی نەتەوەکانی دەوروبەری، کە زۆربەی جار سەماکردنی ئافرەت لە بنەچەوە بۆ مەبەستی ئارەزووی پیاوان دانراوە، بە درێژایی سەماکە ئافرەت تێیدا سەما بۆ پیاو دەکات و ڕۆڵ بۆ ئەو دەبینێت نەک بۆ خۆی. بۆیە هەتاوەکو ئەمڕۆ سەمای ڕۆژهەڵاتی (الرقص الشرقي)[148] لە ناو تورک، عەرەب و فارسدا بڵاوبووەتەوە، هێشتا هەر نەهاتۆتە ناو کوردەوە.

هەروەها ئازادی ئافرەت لە جلی کوردی ئافرەتاندا ڕەنگی داوەتەوە. جلوبەرگی فۆلکلۆری کوردی، جلێکی ڕەنگاو ڕەنگە و ئافرەت بە تەواوی هەست و نەستی خۆی لە ڕێگای ئەو جلەوە دەخاتە ڕوو. کڵاوی فۆلکلۆری ئافرەتی کورد، تەنها کڵاوێکە بۆ جوانی و وەک پیاو بەکاری دەهێنێت، تەنها جیاوازی ئەوەیە کە هی ئافرەتان زیاتر ڕەنگاو ڕەنگە و خشڵی پێوە دەکرێت و هەمیشە لە ژێر کڵاوەکەوە قژ دەهێنرێتە خوارەوە. هەتاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم، بەگشتی بە هیچ جۆرێک سەر داپۆشین لە کوردستاندا نەبووە. لە ڕاستیدا پرۆسەی کاریگەری فەرهەنگی دراوسێکان و سەرەتای سەر داپۆشین لە ناو ئافرەتاندا، بە تەواوی لە سەدەی بیستەمدا لەگەڵ سەپاندنی دابەشکردن و داگیرکردنی کوردستاندا دەستی پێکردووە بەهۆی سەپاندنی دابونەریتی نەتەوە دراوسێکانی وەک تورک، عەرەب و فارسەوە. ئەوەتا هەموو گەڕۆکە ڕۆژئاواییەکان هەتاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم ئاماژە دەکەن بەوەی کە لە کوردستاندا سەر داپۆشینیان

---

148. ئەمڕۆ زۆر ئافرەت بۆ ئارەزووی خۆی سەمای ڕۆژهەڵاتی دەکات، بەڵام لە بنەچەدا ئەو سەمایە بە مەبەستی خۆشگوزەرانی پیاو نەک ئافرەت، هاتۆتە کایەوە.

نەبینیوە، کەچی لە ساڵی پەنجاکاندا هێنی هانسن (Henny Hansen)، کە ئافرەتێکی دانیمارکی ڕەگەزناس (Ethnologist) بووە، هاتۆتە ناوچەی دوکان و سلێمانی لە کوردستانی باشور و بە تایبەت باسی چۆنێتی ژیانی ئافرەتی کردووە (Hensen, 1960). بەپێی هانسن ئەو کاتە لە شارە گەورەکانی کوردستاندا ئافرەت بە تەواوی سەری داپۆشیبوو و بە هیچ شێوەیەک سەری دەرنەدەخست، کەچی لە لادێکاندا کە هێشتا کاریگەری فەرهەنگی داگیکردنی نەتەوە دراوسێکانی لەسەر نەبووە سەری ڕووت بووە و بە وێنەش ئەوەی ڕوونکردۆتەوە. واتە نزیکی دوای چل بۆ پەنجا ساڵ دوای سۆن، لە کوردستاندا وورده وورده سەرەتای سەرداپۆشین لە شارەکاندا دەستی پێکردووە. ئەم پرۆسەیە هەتاوەکو سەرەتای هەشتاکانیش بەردەوام بوو، ئافرەتی لادێ عابای نەبوو، تەنها لە شاردا عەبا هەبوو. لە دوای هەشتاکانەوە وورده وورده، ئافرەتی شار عەباو لەچکی کەمکردۆتەوە، ئەمجا سەر داپۆشین کەوتۆتە ناو لادێکانی کوردستانەوە. گۆڕانەکە هەر لە جلوبەرگدا نەبووە، بەڵکو دیاردەیەکی تریشی لەگەڵدا هاتووە کە دیاردەی کوشتنی ئافرەتە کە پێی دەگوترێت "کوشتنی شەرەف". ئەم دیاردە نوێیەی سەرەتای سەدەی بیستەم، هەتاوەکو ئەمڕۆ هەر بەردەوامە و ئاینە جیاوازەکانی کوردستانی گرتۆتەوە. بۆ نموونە لە سەرەتای هەشتاکاندا، لاوێکی کریستیان لە شاری سلێمانی، خوشکەکەی کوشت، لەسەر ئەوەی کە شوی کردبوو بە موسوڵمانێک[149].

(وێنەی ٣٠) وێنەیەکی دەستکردیی ئافرەتێکی کورد بە جلیماڵەوە لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، ساڵی ١٨٨٥ ز.

شانبەشانی دیاردە نوێکانی سەرداپۆشین و کوشتن، هێشتا هەر ڕۆڵە کۆنەکەی ئافرەت لە ناو کوردەواریدا بەردەوامە. بۆ نموونە ئەمڕۆ تاقە ڕێکخراوی چەکداری و سیاسی لە ڕۆژهەڵات و بگرە لە جیهانیشدا کە ڕێژەیەکی بەرچاوی ئافرەتی تێدا بێت کە ڕۆڵی سیاسی و سەربازی بگێرێت، لە ناو پارتی کرێکارانی کوردستان دا دەردەکەوێت . بەشدار بوونی ئافرەتان لە ناو ئەو پارتەدا، تەنها دیاردەیەکی ڕووکەش نیە، ئەوان هاوشێوەی پیاوەکان دەچنە ناو جەنگەوە و هەمان ڕۆڵ دەبینن و چەندین ئەندامی باڵایان لە ناو پەکەکەدا هەیە و چەندین ئافرەت لە ناو ئەو پارتەدا لە جەنگەکاندا کوژراون. لە ڕاستیدا ڕۆڵی ئافرەت لە ناو ئەو پارتەدا هەر بەردەوامی ڕۆڵی ئافرەتە ئەمەزۆنیەکانە.

---

[149] بە داخەوە مێژووی تەواوی ئەم ڕووداوە نەتوانرا دەست بکەوێت و وەک سەرچاوە بەکاربهێنرێت، بەڵام نووسەری ئەم کتێبە ئەو کاتە لە کوردستان بوو و ئاگاداری ئەو ڕووداوە بووە. هێنانەوەی نموونەی ئەو لاوە کریستیانە، مەبەست لێی ئەوەیە کە ئەو دیاردە نوێیەی لە نەتەوە دراوسێکانی کوردەوە بەهۆی دابەشکردنی کوردستانەوە سەپێنراوە، هەموو بەشەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری گرتۆتەوە و هەر تایبەت نەبووە بە یەک ئایین.

ئافرەتی کورد هەندێک جار ڕۆڵی سیاسی تەواوی بینیوە لە ناو بزووتنەوە چەکداری و سیاسیەکانی کوردستداندا. یەکێک لە شەهیدە سەرەتاییەکانی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی باشوری کوردستان لەیلا قاسم (١٩٥٢ز-١٩٧٤ز) بوو. ئەو ئافرەتە بە هۆی بەشداری بوونی لە ڕێکخراوە سیاسیە کوردیەکانی ئەو سەردەمەدا، ڕژێمی بەعس لە سێدارەی دا. لەیلا قاسم بە یەکەم ئافرەت دادەنرێت لە مێژووی عێراقدا کە لە سێدارە درابێت و بگرە لە ڕۆژهەلاتیشدا حاڵەتێکی دەگمەنە یان هەر نیە.

(وێنەی ٣١a) کۆمەڵێک ئافرەتی کورد لە ناوچەی موکریان بە جلی کوردیەوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا گیراوە.

ئەمڕۆش یەکێک لە ئافرەتە هەرە چالاکەکانی باکوری کوردستان لەیلا زانایە. ئەم ئافرەتە نازایە، سەرەڕای ئەوەی کە ئەندامی پەرلەمانی تورکیا بوو، لە ساڵی ١٩٩٤ دا لەسەر ئەوەی کە لەو پەرلەمانەدا لە بەشێکی سوێنەکەیدا بە کوردی قسەی کرد، ١٥ ساڵی زیندانی کرا. هەر لە زینداندا بوو کە دوو جار هەڵبژێردرا بۆ خەڵاتی نۆبڵ و لە ساڵی ١٩٩٥ دا خەڵاتی زاخارۆفی لەلایەن پەرلەمانی ئەوروپیەوە پێدرا، بەڵام هەتا دەرچوونی لە زنیدان لە ساڵی ٢٠٠٤، نەیتوانی خەڵاتەکەی وەربگرێت. ئەم ئافرەتە بەهۆی داکۆکیکردنی لە مافی ئافرەت، هەتاوەکو ئەمڕۆ لە تورکیادا تووشی دادگایکردن و دژایەتیکردن دەبێتەوە و یەکێکە لە کەسایەتیە چالاکەکانی بزووتنەوەی باکوری کوردستان.
ئەم بۆچوونە لە ناو ئەدەبی کوردیشدا ڕەنگی داوەتەوە. لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە شاعیرە کوردەکان بە گشتی داوای هەقی ئافرەتیان کردووە، زۆر جاریش بە ڕوونی داوای سەرپۆش لابردنیان کردووە کە تازە هاتبووە ناو کوردەوە و بەرێگریان داناوە بەرامبەر ڕۆڵبینینی ئافرەت. ئەوەتا بێکەس دەڵێت:
نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە
وا من پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە ؟
لە ناو عەرەبی عیراقدا تەنها دوو شاعیری کورد کە بە عەرەبی دەیان نوسی، بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە سەر داپۆشینیان وەک جۆرێک لە زیندانیکردنی ئافرەت لە قەڵەم داوە و بە ئاشکرا داوای لابردنیان کردووە. مەعروف ڕەسافی[150] (١٨٩٢ ز- ١٩٤٥ ز) و جەمیل سدقی زەهاوی[151]

[150]. ناوی تەواوی مەعروف عەبدولغەنی محەمەد جەباریە و لە شاری بەغدا لە دایکبووە. ڕەسافی یەکێک بوو لە شاعیرە هەرە گەورەکان کە بە زمانی عەرەبی دەینوسی و نازانرێت ئایا کوردی زانیبێت یان نا. ڕەسافی لە خێڵی جەباریە کە خێڵێکی کوردی ناوچەی کەرکوکە. عەباس ئەلعەزاوی لە کتێبی "خێڵەکانی عێراق" (عشائر العراق) دا ئاماژەی بە ڕەچەڵەکی کوردی ڕەسافی کردووە. ڕەسافی ئەمڕۆ پەیکەرێکی گەورەی لە یەکێک لە شوێنە سەرەکیەکانی شاری بەغدا بۆ کراوە و شەقامێکی بە ناوەوەیە و یەکێکە لە ناسراوترین شاعیرەکانی عێراق و جیهانی عەرەبی.

(١٨٦٣ ز-١٩٣٦ ز) کە هەردووکیان لە سەدەی بیستەمدا پێشڕەوی داکۆکیکردن بوون لە مافی ئافرەت. هەروەها لە میسریشدا ئەو کەسایەتیە ڕۆشنبیریەی کە لە سەدەی بیستەمدا داکۆکی لە ئافرەت کردووە، ئەحمەد شەوقی[152] بووە، کە هەر بە ڕەچەڵەک کوردە.

زەهاوی لە شیعرێکدا سەبارەت لابردنی سەرپۆش دەڵێت:

"مزقي يا ابنة العراق الحجابا    أسفري فالحياة تبغي انقلابا
مزقيه واحرقيه بلا ريث    فقد كان حارسا كذابا"

(وێنەی ٣١b)
ڕەشبەڵەکێکی ناوچەی موکریان، سەرەتای سەدەی بیستەمی زاینی.

ماناکەی دەبێتە (ئەی کچی عیراق سەرپۆشەکەت بدڕە، سەر ڕووت بکە ژیان شۆڕش دەخوازێت، بی دڕێنە بێ دوو دڵی ئەوە پاسەوانێکی درۆزن بوو). هەروەها مەعروف ڕەسافی دەڵێت:

"ونحتقر الحلائل لا لجُرمٍ فنُؤذيهنّ أنـواع الأذاة
ونُلزِمهنّ قعر البيت قهراً ونحسبهنّ فيـه من الهَنـات
لئن وَأدوا البنات فقد قَبَرنـا جميع نسائنـا قبل الممـات
حجبناهنّ عن طلب المعالـي فعِشـن بجهلهنّ مهتّكـات

ماناکەی دەبێتە (بە سوک سەیری ژنەکانمان ئەکەین و بێ هیچ گوناهێک بە هەموو جۆرێک ئازاریان دەدەین، لە کونی ژوور بە زۆر توندیان دەکەین و واش ئەزانین ئەوان خۆشحاڵن تێیدا، گەر کچەکان منداڵ بونایەتەوە هەموو ژنەکانمان پێش مردن لە چاڵ دەنا، بواری مەزنبوونیانمان بە سەرپۆش گرتووە و سەراپای ژیانیان بە نەزانی خۆیانەوە دەناڵێنن). کردەوەی ئەو شاعیرانە لەو سەردەمەدا حاڵەتێکی تایبەت بووە و ئەوان ڕۆڵی پێشڕەویان بۆ خەڵک بینیوە؛ بێ گومان ئەوەش پەیوەندی بە فەرهەنگ و شێوەی پەروەردەکردنیانەوە هەبووە.

---

151. ناوی جەمیل محەمەد فەیزی ئەحمەد حەسەن ڕۆستەم خەسرەو ئەمیر سلێمان زەهاویە و باوکی لە نەوەی بابانەکانی سلێمانیە. یەکێک بووە لە شاعیرە ناسراوەکانی عێراق. لەگەڵ شوکری فەزلی (١٨٨٢ ز- ١٩٢٦) و شێخ ڕەزای تاڵەبانیدا شەڕە شیعریان کردووە.

152. ئەحمەد شەوقی (١٨٦٨ز- ١٩٣٢ز) لەدایکبووی وڵاتی میسرە و لە سەدەی بیستەمدا بەناوبانگترین و گەورەترین شاعیری بە زمان عەرەب دانراوە و نازناوی ئەمیری شاعیرەکان (امير الشعراء) ی پێ دراوە. ئەم شاعیرە چەندین بەرهەمی ئەدەبی لێ بەجێماوە و کاریگەری زۆری لەسەر شاعیرانی سەردەمی خۆی هەبووە. ئەحمەد شەوقی لە بەشی یەکەمی کتێبەکەی بە ناونیشانی (الشوقيات) دا باس لە ڕەچەڵەکی باوک و دایکی خۆی دەکات و دەڵێت "گوێم لە باوکم بووە خوا لێی خۆش بێت کە دەیگووت بنەچەمان لە کوردە عەرەبەکانە" (زەکی، ٢٠٠٥، پ.٩٢). لێرەدا شەوقی و باوکی لە ژێر کاریگەری بۆچوونی ئەو سەردەمەدا بوون کە بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە پێیان وابوو بنەچەی کورد لە عەرەبەوە هاتووە.

(وێنەی c ٣١) وێنەیەکی دەستکردیی ڕەشبەڵەکێکی کوردی، لە ساڵی ١٨٩٥ز دا کراوە.

هیچ کەس بە وێنەی بەنازیر بۆ تۆی سەرەک وەزیرانی ڕابردووی پاکستان ئەو ڕاستیەی نەخستۆتە ڕوو. کاتێک کە لە یەکێک لە موقابەلەکانیدا لە ٢١ مانگی حەوتی ٢٠٠٣ دا گووتی کە ڕەچەڵەکی کوردە و هەست بە کورد بوونی خۆی دەکات لەبەر ئەوەی کە دایکی کوردە و گووتی "کەلتوری کوردی دایکم ڕۆڵێکی گەورەی بینیوە لەوەی کە ببمە سەرەک وەزیران". یەکەم سەرەک وەزیران نەک هەر لە پاکستاندا بەڵکو لە جیهانی ئیسلامیدا ئەو ئافرەتە بووە. ئەو خۆشی دان بەوەدا دەنێت کە فەرهەنگی کوردی دایکی و شێوەی بەخێوکردنی کوردانەی بووەتە هۆی ئەوەی کە ببێتە سەرەک وەزیرانی وڵاتێک کە لە ڕووی ئاینیەوە زۆر توندە.

(وێنەی ٣١d)
ڕەشبەڵەکێکی کوردی
سەرەتای سەدەی بیستەم.

نموونەی مێژوویی زۆرن کە نەریتی جیاوازی کورد، لە نەتەوە دراوسێکانی، سەبارەت بە ئافرەت و ڕۆڵی لە کۆمەڵگەدا دەخەنە ڕوو. ئەم دیاردەیە بە بێ هیچ گومانێک، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە مێژووی دێرینی کوردستانەوە هەیە و ئەمڕۆش هەر کاریگەری ماوە و لە داهاتووشدا هەر بەردەوام کاریگەری لەو کۆمەڵگەیەدا دەمێنێت.
چەند سەد ساڵێکە ناسنامەی کورد، لە تێکست و تیۆریە مێژووییەکاندا، تێکدراوە و تاراددیەک نەتەوەکە لە ناسنامەی ڕابردووی خۆی بچڕێنراوە. بۆ زیاتر لە سەدەیەکە مێشکی تاکی کورد بە ئەفسانە و فەنتازیای ئاریەکانەوە سەرقاڵ کراوە و ڕابردووەکەی لێ بزرکراوە. کەچی سەرەڕای ئەوانەش، هێشتا ئاسەوار و ژێلەمۆی ئەو ڕابردوە لە فەرهەنگی کوردەواریدا هەر بە ڕوونی ماوە.

# مۆسیقا و سەمای کوردی

مۆسیقا و سەمای کوردی لایەنێکی کەلتوری نەتەوەی کوردە کە توانیویەتی بەشێک لە فەرهەنگ و مێژووی تێدا بپارێزێت. بۆ کورد گۆرانی و مۆسیقا بەشێکی گرنگی ژیانە و لە کاتی خۆشی، ناخۆشی، خواپەرستی، سەما و کارکردندا گۆرانی دەگوترێت.
مۆسیقای فۆلکلۆری کوردی بنەچەکەی بۆ ڕابردوویەکی دوور دەگەڕێتەوە و شێوەی گۆرانی گووتنەکان ئەو ڕاستیە دووپات دەکاتەوە. لە ڕاستیدا شێوە و کاراکتەری گۆرانی فۆلکلۆری کوردی، تایبەتمەندە و لە گۆرانی هیچ کام لە نەتەوەکانی دەوروبەری ناچێت. هەر ناوچەیەک شێوە گۆرانی گووتنی جیاوازی خۆی هەیە و یەکبوونی بنەچەی ڕابردوویان سەرەڕای دووری ناوچەکان و جیاوازی زاراوەکان، بە ڕوونی دەردەکەوێت. مۆسیقای کوردی ئەمڕۆ هەر تەواوکەری مۆسیقای سۆمەری، ئیلامی، هوری، هیتی، میدی و هەموو گروپە ڕەسەنەکانی میسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵە. هەندێک جار سەرچاوە مێژووییە دێرینەکان ئاماژەیان بە تایبەتمەندی گۆرانی گوتنی کوردی لە ناوچە شاخاویەکاندا کردووە. لە تێکستێکی ئاشوریدا لە ساڵی ٨٨٠ پ.ز دا، لە ئاماژە بە ناوچەی لۆلۆبیەکاندا کە ناوچەی سلێمانی و شارەزووری گرتۆتەوە، نووسراوە "خەڵکی سیپیرمێنا (Sipirmena) لە زامووا[153] وەک ئافرەت دەچریکێنن" (Zadok, 2005). لێرەدا وا دەردەکەوێت کە تایبەتمەندی شێوە گۆرانی هۆرە و سیاچەمانە سەرنجی ئاشوریەکانی ڕاکێشا بێت کە تازە دەستیان بەو ناوچەیە گەیشتووە. ئەو گۆرانیە بە گشتی بە لەرەیەکی تایبەت و لە چینێکی بەرزی دەنگیدا دەگووترێت، دیارە ئاماژەکردنی سەرچاوە ئاشوریەکە هەر بەو تایبەتمەندیە بووە.
بە گشتی مۆسیقای فۆلکلۆری کوردی و شوێنی بەکارهێنانیان ئەمڕۆ دەتوانرێت بکرێت بە چەند بەشێکەوە:
١-لاوک : بە زۆری لە ناوچەکانی کرمانجی سەرودا دەچڕێت و بە گۆرانی بێژەکان دەگووترێت دەنگ بێژ. لاوک لە ڕابردوودا بەشێکی گرنگی کۆبوونەوە کۆمەڵایەتی و کۆڕی دیوەخانەکان بووە. ئەم گۆرانیە بە گشتی بریتیە لە گێڕانەوەی داستانی پاڵەوانێتی و خۆشەویستی. بە هۆی هەلومەرجی کوردەکانی ئەرمینیاوە لە سەدەکانی ڕابردودا، گۆرانی لاوک لەو وڵاتەدا زیاتر بوژانەوەی بە خۆیەوە بینیوە و ژمارەیەکی باش لە چیرۆکە کوردیەکان پارێزراوە. بەڵام لە تورکیادا لەبەر قەدەغەکردنی گۆرانی و مۆسیقای کوردی بەدرێژایی دەیان ساڵ، بووەتە هۆی لاواز بوونی ئەم کەلەپورە دێرینەی کورد لە باکوری کوردستاندا. لەم چەند ساڵەی دواییدا بەهۆی گۆڕانی هەلومەرج لە باکوری کوردستاندا، هەندێک بوژانەوەی بەخۆیەوە بینیوە.
٢-حەیران: لە هەولێر و دەروبەری، پشدەر، ڕەواندز، موکریان، خۆشناوەتی، دەشتی دزەیی، بتوێن، هتد. دەگووترێت. حەیران هاوشێوەی لاوک و بەیت زۆربەی جار چیرۆکی خۆشەویستی و داستانی پاڵەوانێتە و لە ڕابردوودا لە دیوەخانەکاندا بۆ کۆڕ گەرمکردن سوودی لێ وەرگیراوە.
٣-هۆرە: ناوچەکانی کرماشان، ئیلام، لەکستان، لوڕستان، قەسری شیرین، دینەوەر، زەهاو، ماهیدەشت، شارەزور، کەلار، ناوچەی کەلهوڕ نشینەکان، گەیلانی غەرب، سونقوڕی کولیایی، هتد. دەگرێتەوە. هۆرە شێوەی جیاوازی هەیە و بە ناوی جیاوازەوە ناسراوە وەک هۆرەی جاف، هۆرەی قەڵغانی، هتد. ئەم جۆرە گۆرانیە بە زۆری لە ناو کەلهوڕ و گۆرانەکاندا دەگووترێت و هەندێک جار ئەو سنورەش دەبڕێ و ناوچەکانی کەلار و شارەزور و لە ناو کرمانجی خوارو (سۆرانی) دا بە تایبەت جافەکاندا دەگووترێت. زۆربەی هۆرەکان چیرۆکە شیعر و بەسەرهاتی فۆلکلۆری کوردین. بنەچەی هۆرە زۆر کۆنە و لە ڕووی داڕشتنی میلۆدیەوە زۆر سادەیە و تەنها لە چەند دەنگێکی مۆسیقایی تێپەڕ ناکات، کە ئەوە دێرنی دووپات دەکاتەوە، بەڵام گووتنی ئەرکێکی قورسە و زۆر متمانە دەکاتە سەر یارکردن بە قورگ. بە دوور نازانرێت

[153]. زاموا ئەو ناوچەیە بووە کە بە درێژایی مێژوو پێی گوتراوە شارەزور و لە دوای بازیانەوە هەتاوەکو سلێمانی بەرەو شارەزوری ئەمڕۆی گرتۆتەوە.

ناوی (هۆرە) هەر لە ناوی (هوریەکان) ەوە هاتبێت یان جۆرێک لە گۆرانی ئاینی پێ گووترابێت کە بۆ (خۆر/هۆر) گووترابێتن.

٤-سیاچەمانە: بەگشتی لە ناوچەی هەورامان دەگوترێت. ئەم جۆرە گۆرانی گووتنە هاوشێوەی هۆرە لە ڕووی مێلۆدی مۆسیقاوە زۆر سادەیە بەڵام گووتنی لە هۆرەش گرانترە و پێویستی بە کۆنترۆڵکردنێکی سەختی قورک هەیە.

٥- بەیت: هەموو ناوچەی موکریان دەگرێتەوە و ئەمیش جۆرێکە لە گۆرانی بۆ گێڕانەوەی چیرۆکی هەمەجۆری کوردی.

٦- گۆرانی و مۆسیقای هەڵپەڕکێ: ئەم جۆرە مۆسیقایە تایبەتە بۆ هەڵپەڕکێ و چەندین ریدمی جیاوازی هەیە و هەندێک جار خاو و هەندێک جار خێرا. لە لادێکاندا، هەندێک جار شایەرەکان و هەندێک جار هەموو سەماکەران پێکەوە گۆرانی دەڵێن و لەگەڵ ئامێری مۆسیقا و بی ئامێری مۆسیقاش بەڕێوە دەچێت. کورد لەسەر ڕیدمی جیاوازی مۆسیقا سەما دەکات و سەرەتای هەڵپەڕکێ بە ریدمێکی خاو دەست پێ دەکرێت بۆ گەرم بوون و وورده وورده ریدمەکە خێرا دەکرێت. لەگەڵ گەرمبوونی شاییدا شانبەشانی گۆرانی و مۆسیقاکە سەماکەران قریوەیەکی بەهێز دەکەن. زۆربەی جار لە لادێکاندا گۆرانی بێژ، هەر لە هەمان کاتی هەڵپەڕکێکەدا شیعری گۆرانیەکان ڕێک دەخات و شیعرەکان هەندێک جار بەسەر ئافرەتەکان و هەندێک جار بەسەر پیاوان و بەتایبەتی سەرچۆپی کێشدا، دەگووترێت.

٧- مەقامە کوردیەکان: لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا دەگووترێن و هاوبەشییان لەگەڵ هەموو مۆسیقای ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە بەڵام هەندێک گۆڕان و تایبەتمەندیەکی ڕوونی کوردی خۆیان هەیە.

٨- مۆسیقا ئاینیەکان: ئەم مۆسیقایانە لە سەرەمۆنی ئاینی ئێزدی، یارسان، قادری، عەلەویەکاندا سوودی لێ وەردەگیرێت. ئێزدیەکان لە سەرەمۆنیە ئاینیەکانیاندا تەمبور و شمشاڵ و دەف بەکاردەهێنن و هەندێک جار کە پیاوە ئاینیەکانیان شمشاڵ و دەف دەژەنن، خەڵکەکە دەست دەدەن لە ئامێرەکان و دەستی خۆیان ماچ دەکەن یان ئامێرەکە ماچ دەکەن و بە پیرۆز سەیری دەکەن. لە ناو یارسان و عەلەویەکاندا تەمبور ژەنین بەشێکی گرنگی ئەرکی ئاینیە و سرودە ئاینیە پیرۆزەکان بە تەمبورەوە دەگووترێن؛ زۆربەی جار تەمبور ژەن دوای تەواوکردنی سرود گووتنەکە ماچێکی تەمبورەکەی دەکات و هاوشێوەی ئێزدیەکان ئەوانیش تا ڕادیەک وەک ئامێرێکی پیرۆز مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. هەروەها بۆ دەروێشە قادریەکانیش دەف لێدان و گۆرانی بەشێکە لە سەرەمۆنی زیکرکردن. قادریەکان بە شێوەیەکی پڕ جۆش و خرۆش سەر ڕادەوەشێنن و دەف بەشێوەیەکی بەهێز لەگەڵ زیکر کردندا بەکاردەهێنن و لەگەڵ ئەو ڕیدمە بەهێزەدا دەروێشی قادری دەکەوێتە حەڵەتێکی ڕۆحی و هاوارکردنەوە؛ زیکر بەشێکی گرنگە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی تەریقەی قادریەکان. لە هەندێک ناوچەی وەک سنەدا لە مانگی ڕەمەزاندا، جۆرێک لە مۆسیقا لێ دراوە کە پێی گووتراوە نەقارەخان. ئەم مۆسیقایە لە ئێواراندا پێش شکاندنی ڕۆژوو بە دەهۆڵ و زوڕنا لێ دراوە (ڕەمزازی، ٢٠٠٨).

٩. گۆرانی کاتی دروێنە: ئەمە جۆرێکە لە گۆرانی گووتن کە هاوکاری جوتیارەکان دەکات لە کاتی دروێنەی هەرموەزدا. بە هۆیەوە جووتیارەکان دەتوانن بە خۆشیەوە کارەکە ئەنجام بدەن و گۆرانیەکان هەستێکی یەکگتوویی لە ناویاندا دروست دەکات و لە هەمان کاتدا بە هۆی ڕیدمی گۆرانیەکەوە هەموویان بەیەکەوە دەمێننەوە و کارەکە بە ڕێکوپێکی ئەنجام دەدەن. زۆربەی جار هەموو بەشداربووان یان بەشێکی زۆریان گۆرانی دەڵێن و وەشاندنی داسەکەیان دەبێتە ڕیدمی سەرەکی گۆرانیەکە. گوێگرتن لە گۆرانی، دەنگی وەشاندنی داس و بڕینی گیا وشکەکان، دەبێتە بەشێک لە گۆرانیەکە و کاریگەریەکی زۆر سەرنج ڕاکێش دروست دەکات.

١٠. گۆرانی شینکردن: ئەم گۆرانیانە بە ڕیدمی جیاواز و شێوەی جیاواز لە ناو کوردەواریدا ماوە. کورد لە تازێ باریدا جۆرە شینێک دەکات، کە تێیدا تازێ بار بە دەنگ و ئاوازێکی خەمگین گۆرانیەکی لاوانەوە دەڵێت بۆ دروستکردنی جۆرێک لە ئارامی و دەربڕینی هەستی کەس لێڕۆیشتن. تازیەبار بە *(لای لایە)* شیوەنەکە دەکات و بەو شیوەنەش دەڵێن *(لاوانەوە)*. زۆربەی گۆرانیەکانی شیوەنکردن بە گشتی ئارامن و بە شێوەی مەقامات دەگووترێن. هەندێک جار بە تایبەتی کە کەسی مردوو لاو بێت و کەسوکاری بۆی

بەپەرۆش بن، ئافرەتی کورد شیوەنکردن لەسەر ڕیدمێکی سادەی چوار لەسەر هەشت دەکات و هەردوو دەستی بە سنگیدا دەکێشێت. ئەوش وەک ڕیدمێکی بەهێز بۆ هاوکاریکردنی شیوەنکردنەکە بەکاردەهێنێت. لەو شینکردنەدا کۆمەڵێک ژن پێکەوە هەڵدەستنە سەرپێ و بە دەم سنگ کوتانەوە شیعرەکان ڕێک دەخەن کە کاریگەریەکی گەورە لە ناو ئافرەتە شیوەنکەرەکاندا دروست دەکات. لە هەندێک ناوچەی وەک سنە، ئیلام، لوڕستان و کرماشان دا جۆرێک شین دەکرێت بە یاوەری دەهۆڵ و زوڕنا کە پێی دەگووترێت چەمەری، ئەم جۆرە شینکرندە لە کاتی مردنی کەسێکی لاودا دەکرێت و پێش تەرمی کەسی مردوو دەخرێت و ژنانیش بە خۆڕنین بە دووی دەکەون (ڕەزازی، ٢٠٠٨). پێ دەچێت کە بنەچەی ئەم شیوەنکردنانە دەیان هەزار ساڵ بێت، لەبەر ئەوەی کە ناوی شیوەنەکان لە زمانەکانی سۆمەری، هوری و هیتیدا هەبووە و لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا دەردەکەونەوە. بۆ نموونە alailan شیوەنکردن لە ناو هوریەکان و لە زمانی هیتیدا دەبێتە lahlahhima و لە سۆمەریدا ilu. بە ئینگلیزی بە شینکردن دەڵێن wail و لە زمانی لاتیندا بە شیوەن دەڵێن eiulo. گۆرانیە فۆلکلۆریە کوردیەکانیش بە هەمان شێوە بنەچە دێرینەکەیان تێدا دەردەکەوێت. لە زمانی سۆمەریدا ناوی زۆربەی گۆرانیە کوردیەکانی ئەمڕۆ دەبینرێت. بۆ نموونە ilum, ilulamma, illu, ilu, ilalum, elel, elil, ellila, elalum ئەمانە هەمووی جۆری جیاوازی گۆرانی سۆمەرین کە هەتاوەکو ئەمڕۆ لە پێشەکی گۆرانیە کوردیەکاندا دەگووترێن و لە زۆربەی گۆرانیە ئەوروپیەکاندا lalala هەر دەگووترێتەوە.

(وێنەی ٣٢)
وێنەی دەستکردیی سوپایەکی کوردی لە کاتی جەنگدا دوو تەپڵ لێدەر پێشڕەویی دەکەن، ساڵی ١٨٥٦ ز.

ڕەزازی (٢٠٠٨) دەڵێت کە هەتاوەکو ساڵی شەستەکانی سەدەی ڕابردوو جۆرێک لە مۆسیقای جەنگ بە ناوی "سوارۆ" هەبووە کە بە دوو تەپڵ و بەسەر ئەسپەوە لێدراوە. لەبەر نەبوونی ئەو مۆسیقایە بە تۆمارکراوی، بەداخەوە ڕەزازی هیچ زانیاریەک سەبارەت جۆری ڕیدمەکە و ووردەکاریەکانی نادات، بەڵام ئافرەتێکی گەڕۆکی ئینگلیز بە ناوی لەیدی شیل لە ساڵی ١٨٥٦ز دا وێنەی ئەو تەپڵ لێدەرانە دەکێشت کە مۆسیقای سوارۆ لێدەدەن و ڕەزازی ئاماژەیان پێ دەکات (بڕوانە وێنەی ٣٢). لەیدی شیل تۆزێک لەسەریان دەدوێت و دەڵێت "بینینی ٣٠٠ بۆ ٤٠٠ سوارەی کورد لە کاتی جوڵە و دەستپێکردنی پەلاماردا، دیمەنێکی نایابە. لە نزیک یەکەوە دەڕۆن و ڕێگاکە پڕدەکەنەوە و بەشێوەی نیوە غاردان دەڕۆن، ئەوانیش وەک ئەفغانیەکان؛ ڕمەکانیان بە بەرزی دەگرن و پارچەیەکی ڕەش دەئاڵێنن لە ژێر نوکی ڕمەکانیان؛ دیمەنە زیتەکەیان؛ دەنگە بەرزە تینوەکەیان کە لە قوڕگیانەوە دێت، هەستێکی جەنگاوەریان پێ دەبەخشێت. سەرکەردەکان لە پێشەوەن و لە تەنیشتیانەوە تەپڵ لێدەرەکانن کە ئامێرە جەنگیەکانیان بە ووزەیەکی زۆرەوە لێ دەدەن؛ هەمیشە ئەوان لە پێشەوەن" (Lady Sheil, 1856, p.337).

دوای هەزاران ساڵ لە تێکەڵ بوونی نەتەوە نوێکانی ڕۆژهەڵات، سەرەڕای ئەوە هەندێک لە گۆرانیە کوردیەکان هیچ پەیوەندیەکیان بە مۆسیقا و گۆرانی نەتەوە دراوسێکانەوە نیە؛ بە تایبەت هۆرە، لاوک،

سیاچەمانە و چەمەری. بە داخەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ ئەم لایەنەی فۆلکلۆری کوردی لێکۆڵینەوەی تەواوی لەسەر نەکراوە و هەڵسەنگاندنێکی وای بۆ نەکراوە کە مرۆڤ بتوانێت بۆچوونی ڕوونی لەسەر بدات. بە دڵنیایی بەراوردکردنی مۆسیقاکان و پەیوەندی و جیاوازیان، دەتوانێت زۆر ڕووی ڕابردووی دێرینی کورد و ژیانی گروپە ڕەسەنەکانی میسۆپۆتامیا و ئەناتۆلیا ڕوون بکاتەوە. بۆ نموونە ناوچەی جوگرافی هۆرە بە گشتی هەمان ناوچەی دەسەڵاتی دەوڵەتی حەسنەویە کە لە کرماشان و هەمەدانەوە هەتاوەکو شارەزوور دەگرێتەوە. مۆسیقای ئەو ناوچەیە ڕەنگدانەوەی ئەو دەسەڵات و فەرهەنگە مێژووییەیە کە لەو ناوچانەدا بەرپابووە و دەشێت کە ببەسترێتەوە بە ڕابردووی سەنتەری دەسەڵاتی میدەکانەوە. حەیران تا ڕادەیەک ڕەنگدانەوەی دەسەڵات و فەرهەنگی هەزبانیەکانە و بەیت زیاتر لە سەنتەری ناوچەی مانیەکاندا دەبینرێتەوە. لاوک لە سەردەمی دێریندا ڕەنگدانەوەی فەرهەنگی هیتی و لوڤیەکانە و لە سەردەمی نوێتردا ئیمارەتی حەمیدی و مەروانی و هەکاری و چەندین دەسەڵاتی تر کە لەو ناوچانەدا هەبوون.

(وێنەی ٣٣a) دوو پەڕە لە کتێبی (الرسالة الشرفية) ی سەفیەدینی ورمێی (صفي الدين الارموي) (١٢١٦ز-١٢٩٤ز) کە لەسەر تیۆری مۆسیقا دایناوە.

مۆسیقای کوردی ئەمڕۆ بریتیە لە درێژکراوەی مۆسیقای سەردەمی سۆمەری، هوری، لوڤی، میدی، هتد. و توانای کورد لە مۆسیقادا، لە سەردەمی ئیسلامیشدا بەردەوام بووە. یەکێک لە مۆسیقاناسە کوردەکان کە ئەو لایەنەی تێدا دەرکەوتووە ناوی زریاب[154] بووە. زریاب یەکێکە لە مۆسیقاژەنە کوردەکان کە لە سەدەی هەشتەم و نۆهەمی زاینیدا ژیاوە و کاریگەری گەورەی لەسەر مۆسیقای ڕۆژهەڵات و مۆسیقای ئیسپانی هەبووە (بڕوانە وێنەی ٣٣b). ئەم مۆسیقا ناس و عود ژەنە نایابە، لە بنەچەدا قوتابی ئیسحاق موسڵی بووە کە ئەویش مۆسیقاناسێکی کورد بووە. زریاب سەردەمێک لە بەغدا لای خەلیفە، مۆسیقای ژەندووە و دوایی ڕووی کردۆتە وڵاتی ئەندەلوس کە لەوێ ناوبانگی زیاتری دەرکردووە. هیچ مۆسیقازانێکی ڕۆژهەڵات لە مێژوودا هێندەی زریاب کاریگەری لەسەر مۆسیقای ڕۆژئاوا بە گشتی و مۆسیقای ئیسپانی بە تایبەتی دانەناوە. بە داخەوە هیچ لە بەرهەمەکانی زریاب نەماون بەڵام دوو مۆسیقاناسی تری کورد ناویان هاتووە؛ سەفیەدینی ورمێیی (صفي الدين الأرموي) (١٢١٦ز-١٢٩٤ز) و بەدرەدینی هەولێری (بدرالدين الاربلي) (١٢٨٧ز-١٣٢٩ ز) (Izady, 1992, p.265). ئەم دوو زانا کوردە کتێبیان سەبارەت تیۆری و زانستی مۆسیقا داناوە؛ ورمێی دوو کتێبی بە ناوی (الرسالة الشرفية) و (كتاب الادوار في الموسيقى) و هەولێری کتێبێکی بە ناوی (جواهر النظام في معرفة الانغام) داناوە، کە هەتاوەکو ئەمڕۆ بە یەکێک لە باشترین کتێبی تیۆری مۆسیقا دادەنرێن لەسەردەمی ئیسلامدا. جگە لە مۆسیقا، هەڵپەڕکێی کوردی بەشێکی گرنگ و زیندووی فەرهەنگی کوردیە و لە کوردستاندا بە سەدان جۆری جیاواز هەڵپەڕکێ هەیە و هەر ناوچەیەک

[154]. ئەبێت ئەم ناوە لە بنەچەدا پێکهاتبێت لە زەریاو (زەری+ئاو) و ماناکەی دەبێتە (ئاوی زێڕ). هەردوو وشەکان (زەڕ+ئاو) دوو وشەی دێرینی کوردین و وا دەردەکەوێت لە تۆمارکرندا لە ژێر کاریگەری زمانی پەهلەویدا کە هەتاوەکو ئەو سەردەمە لە زۆر ناوچەدا زمانی تۆمارکردن بووە، کرابێتە "زریاب". ئەمەش زۆر جار لەگەڵ ناوە کوردیەکاندا ڕوووی داوە، بۆ نموونە (شارەزوور) کراوەتە (شهرزور) کە هەرگیز کورد وای پێ ناڵێت.

لەوەدا تایبەتمەندی خۆی هەیە. لە ڕاستیدا مرۆڤ بۆ ئەوەی کە نەخشەی کوردستان بکێشێت، تا ڕادەیەک تەنها ئەگەر نەخشەی جوگرافی هەڵپەڕکێ بە جۆرە جیاوازەکانیەوە بکشێت، ئەوا نەخشەی کوردستانی کێشاوە. ئەم هەڵپەڕکێیانە هەندێک جار چوونەتە ناو نەتەوە دراوسێکانی کوردەوە.

(وێنەی ٣٣b) عود ژەن و مۆسیقاناسی کوردی سەدەی نۆهەمی زاینی، زەریاب، وێنەکە لە سەدەی سایزنەدا لە ئەوروپا کێشراوە.

بۆ نموونە عەرەبەکانی ناوچەی نزیک لە کوردەکانی وڵاتی عێراق هەڵپەڕکێیەک بە شێوەیەکی سادە دەکەن، جگە لەوەی کە هەڵپەڕکێکەیان بە شێوەیەکی سادە وەرگرتووە، هەر ناوە کوردیەکەشی بۆ بەکاردەهێنن و پێی دەڵێن (الچوبي) کە هەر (چۆپی) کوردیە. لە ناو تورکیشدا جۆرێکی سادەی هەڵپەڕکێ دەکرێت کە لە کوردیان وەرگرتووە و بەشێوەیەکی زۆر سادە ئەنجام دەدرێت. هەتاوەکو ئیمڕۆ هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی سەبارەت مێژووی هەڵپەڕکێی کوردی نەخراوەتە ڕوو؛ ئەوەی کە ڕوونە شێوەی سەماکردنی کورد هاوبەشی هەیە لەگەڵ نەتەوەکانی تر. ئەم سەمایە بە شێوە جیاوازەکانیەوە لە ناوچەی لوڕستانەوە دەست پێ دەکات هەتاوەکو بەڵکان و یۆنان بەردەوامە و ئەوە دەری دەخات کە بە دڵنیایی ڕابردووی ئەم پەیوەندیە زۆر دێرینە.

(وێنەی ٣٣c) وێنەی دەستکردیی چوار قەوالی ئێزدی لە کاتی مۆسیقا لێداندا، ساڵی ١٨٥٣ ز دا کراوە.

ئەوەی کە لێرەدا باسکرا تەنها ئاماژەیەکی گشتی و سەرپێیە سەبارەت بە گۆرانی و مۆسیقای کوردی و مێژووەکەی. بێگومان بە بێ زانیاری تەواو و تۆمارکراو سەبارەت نەخشەی جوگرافی، بە نۆتەکردن، لێکدانەوەی ڕیدمی، نووسینەوەی تێکستی گۆرانیەکانی هەر کام لەو جۆرە مۆسیقا و گۆرانیە فۆلکلۆریە کوردیانە، زۆر گران دەبێت کە بتوانرێت بۆچوونی ڕوون سەبارەتیان بخرێتە ڕوو.

# بەشی ٤
# کێشەکانی مێژووی کورد و کوردستان

مێژووی کورد یەکێکە لە ئاڵۆزترین مێژووی نەتەوەکانی جیهان. ئەم مێژووە هەندێک جار هێندە لاوەکی و سەرپێیی نووسراوە کە هەموو لایەنێکی لۆژیکی و زانستی لەدەست داوە. هەڵبەت ئەم ئاڵۆزیەش هەر لە خۆیەوە نەهاتووە، بەڵکو دوای سەدان ساڵ و بە تایبەتی لە سەردەمی نوێدا چەندین فاکتەری جیاوازی مێژوویی و سیاسی بوونەتە هۆکاری شێواندنی ئەو مێژووە. گەلێک جار خەڵکانێک لە دەرەوەی کوردستان "کتێبی مێژوویی" یان سەبارەت بە کورد نووسیوە، بە ئاشکرا دەبینرێت کە هیچ نە لە کورد و نە لە سەرەتای مانای کورد تێنەگەیشتوون. لەو بارەیەوە لمبێرت ( Limbert, p.41, 1968) لە سەرەتای لێکۆڵینەوەیەکیدا سەبارەت بە بێ مانایی ئەو بەڵگانەی دەربارەی کورد خراونەتە ڕوو یان ئەو مێژووەی کە بۆی نووسراوە دەڵێت "گەڕۆکێکی ئینگلیز داوای لە کابرایەکی لادێیی کردووە ناوی گوندێکی پێ بڵێ لە ناوچەکەدا و کابرای لادێیی وەڵامی داوەتەوە "نازانم"، بەوجۆرە کابرای گەڕۆک گوێڕایەڵانە نووسیویەتی بەلای گوندی (نازانم) دا تێپەڕیم".

لمبێرت تەنها کەسێک نیە کە سەرنجی ئەو دیاردەیەی دابێت، دەبینرێت کە کەسێکی وەکو ئاساتریان (Asatrian)یش کە لێکۆڵەرێکی ئەرمەنیە، گەرچی لە ئەنجامدا ئەویش هەمان ڕێچکەی شێواندنی گرتۆتە بەر، بەلام لە سەرەتای لێکۆڵینەوەیەکیدا سەبارەت بە مێژووی کورد، گوتەی ڤیلکێفسکیچ (Vil'cevskij) دەهێنێتەوە بە نموونە کە لە ساڵی ١٩٤٥ز دا سەبارەت بە کورد نووسیویەتی و دەڵێت "کورد بە مەبەستی ئارەزوو لەلایەن هەموو کەسێکەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە، بۆیە (بەجدی) لەلایەن کەسەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر نەکراوە" (Asatrian, 2009, p.2). ڤیلچێفسکی و لمبێرت لە ساڵی ١٩٤٥ز و ١٩٦٨ز دا ئەو بۆچونەیان هەبووە و لە ساڵی ٢٠٠٩ز و دوای نزیکەی نیو سەدە ئاساتریان هەمان بۆچوونی ئەوان دووپات دەکاتەوە دەربارەی ناڕوونی و ئەو جیاوازیە زۆرانەی کە لە نێوان بۆچوونی مێژوونووساندا سەبارەت بە مێژووی کورد هەیە.

هۆکارەکانی ئەم مێژووە بێ سەروبەرە کە هەتاوەکو ئێستا سەبارەت بە کورد نووسراوە، زۆرن و بناغەکەی لە شەو و ڕۆژێکدا دانەنراوە. بنەچەی کێشەکە بەتایبەتی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە مێژووی خۆرهەڵات، لە دوای سەدەی حەڤدە و هەژدەهەمی زایینیەوە، لە ئەوروپاوە بناغەی بۆ دانراوە نەک لە خۆرهەڵات خۆیدا. دەبینرێت کە لەو ساتەوە مێژوونوسە ئەوروپیەکان، لەسەر بناغەی فەنتازیا و ئارەزووی دۆزینەوەی ڕەچەڵەکێکی شکۆ دار بۆ خۆیان مێژووی خۆرهەڵاتیان نوسیوەتەوە نەک بۆ مەبەستی دۆزینەوەی ڕاستیەکی مێژوویی. واتە مێژوویەکیان لە ڕوانگە و بەرژەوەندی بینینی ئەوروپیەکانەوە بۆ خۆرهەڵات نوسیوە. سەرەڕای ئەو هەموو لێکۆڵینەوە گرنگانەی مێژوونوسە ئەوروپیەکان ئەنجامیان داوە، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا پێی هەستاون، کە تەمومژیان لەسەر هەندێک لایەنی مێژووی خۆرهەڵات لاداوە و زۆر لە زمانە دێرینەکانی ناوچەکە خوێنراوەتەوە. لە هەمان کاتدا ناتوانرێت ئەو هەموو شێواندنەی مێژووی ناوچەکە فەرامۆش بکرێت کە لە سەدەکانی حەڤدەهەمەوە دەستی پێکراوە و بووەتە هۆی دانانی بناغەیەکی شێواو بۆ ئەو مێژووە.

لە سەردەمی نوێشدا باری سیاسی کورد و دابەشکردنی وڵاتەکەی، بوەتە هۆی ئەوەی کە مێژوویەک بنووسرێت کە زیاتر خزمەتی ئەم نەخشە سیاسیە زۆرە ملێیە بکات کە بەسەر وڵاتی کوردستاندا سەپێنراوە. ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی کە بۆچوونەکان سەبارەت بە مێژووی کورد و نیشتمانەکەی زۆر جیاواز بن. بۆیە دەبینرێت کە هەندێک مێژوونووس ڕابردووی کورد دەگەڕێنێتەوە بۆ زیاتر لە ٥٠٠٠ ساڵ و هەندێکی تر پێی وایە کە لە هاتنی ئیسلامیشدا بۆ ناوچەکە، هێشتا کورد وەک نەتەوە نەناسراوە. شایانی ئاماژە پێکردنە کە هەر کام لەو بۆچونانە پشتی بە بەڵگەی ئارکیۆلۆژی یان زمانەوانی نەبەستووە.

یەکێک لەو بوارانەی کە دەیتوانی ڕۆڵێکی گرنگ لە ڕونکردنەوەی مێژووی کورد و ناوچەکەدا ببینێت زمانە. لە کاتێکدا کە زمانی کوردی ئەمڕۆ زمانێکی زیندووە و لە هەمان کاتدا زمانی ئەو گەلانەیە کە لە ڕابردوودا لە کوردستاندا ژیاون و زۆربەیان لێکۆڵینەوەی زۆریان لەسەر کراوە و زانیاری زۆر سەبارەتیان هەیە، کەچی هەرگیز هەوڵ نەدراوە بە هیچ شێوەیەک بەراوردێکی فراوان لە نێوان هیچ کام لەو زمانانە و زمانی کوردیدا بکرێت.
بە کورتی ئەمڕۆ مێژووی کوردستان بە شێوەی جیاواز نوسراوە و هەندێک بۆچوونەکان بەهیچ شێوەیەک لەیەکتر نزیک نین؛ ئەمەش ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کێشەیەک لە باباتەکەدا هەیە. بەڵام ئەم کێشەیە تەنها مێژووی کوردی نەگرتوتەوە، بەڵکو مێژووی خۆرهەڵاتیش دەگرێتەوە و لە هەندێک لایەنەوە هەموو بنەمایەکی لۆژیکی لەدەستداوە. لەبەر ئەوەی ئەو مێژووە بە گشتی ئەوە ڕادەگەیەنێت کە هەموو شارستانیەتی سۆمەری و هوری و هیتی و کاسی، سەرانسەر لەناوچووە و سەر لە نوێ شارستانیەتێکی تر دەستی پێکردوە کە ناویان لێ ناوە فارس و کە خۆشیان لە سەر مانای وشەکە یەکلانەبوونەتەوە.
ئەم بۆچوونە لەگەڵ سروشتی ژیان و زانست و مێژووی مرۆڤایەتیدا ناگونجێت و هیچ شارستانیەتێکی گەورە بێ بەجێهشتنی کۆمەڵێک زانیاری و کاریگەری لە ناو نەچووە. بۆ نموونە ئەمڕۆ یۆنان کە وڵاتێکی بچووکە و ڕۆڵێکی بچووکی لە گۆڕەپان و ژیانی مرۆڤایەتیدا هەیە، بەڵام زۆربەی ئەو وشە زانستیانەی لەم سەردەمەدا لە زمانە ئەوروپیەکاندا بەکاردەهێنرێن، بنەچەکەی لە یۆنان و ڕۆمانەکانەوە وەرگیراون، لەبەر ئەوەی لەو ناوچانەدا سەردەمانێک شارستانیەتی مرۆڤ بوژانەوەیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە. هەرچەندە ئەمڕۆ ئەو گەشەسەندنە لە ناوچەکەدا نەماوە، بەڵام کاریگەری فەرهەنگی و زمانەوانی لەسەر هەموو ئەوروپا بەجێهێشتووە. هەروەها زۆربەی مێژوونوسان لەسەر ئەوە کۆکن کە زۆر لەو زانست و زانیاریانەی کە ئەمڕۆ لەبەردەستدان، بنەچەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ سۆمەریەکان. واتا زمانی سۆمەریەکان بەدرێژایی چەند هەزار ساڵێک زمانی زانست و ئاین و هونەر بووە، ئایا دەکرێت کە بەو هەموو شارستانیەوە، وەک نەتەوە بە تەواوی نەمابن و هیچیش لە زمانەکەیان نەمابێت و کاریگەری لەسەر زمانەکانی تر جێنەهێشتبێت؟ ئەگەر زانست و زانیاری سۆمەریەکان بۆ مرۆڤایەتی گوێزرابێتەوە، ئایا دەکرێت کە زمانەکەیان بە تەواوی هیچ ئاسەوارێکی نەمابێت؟ بە دڵنیایی نموونەکانی مێژوو ئەوەمان بۆ دەسەلمێنین کە ئەمە لەگەڵ لۆژیکی سروشتی شارستانیەت و مرۆڤایەتیدا ناگونجێت.
گەر بەراورد لە نێوان قسەکانی ئیبن وەحشیە، کە لە سەدەی نۆهەمی زاییندا نوسیویەتی، لەگەڵ بۆچوونەکانی بڕێک لە مێژوونوسە ئەوروپیەکانی سەدەی بیستەمدا، سەبارەت بە کورد بکرێت، دەبینرێت کە لە ئیبن وەحشیە لە سەدەی نۆهەمی زاییندا ئەلف وبێی کوردی بە یەکێک لە ئەلف و بێ کۆنەکان دەزانێت و باسی کارامەیی کورد لە زانستی کشتوکاڵدا دەکات. هەروەها بە تەنها نەتەوەشی دەزانێت کە کێبڕکێی لە زانستدا لەگەڵ کلدانیەکاندا کردوە (بڕوانە سۆمەریەکان) و کورد خۆی بە خاوەنی شارستانیەتی مێسۆپۆتامیا داناوە. بەڵام ڕوانگەی زۆر لە مێژوونوسە ئەوروپیەکان و ڕۆژهەڵاتناسەکان بە جۆرێکە کە کورد هەتاوەکو سەدەکانی ناوەڕاست، زۆر جار تەنها بە جەنگاوەر باس دەکەن و وای بۆدەچن کە کورد ئاماژە نەبووە بە نەتەوە. نەتەوەیەک کە لە سەدەی نۆهەمی زاییندا مێژووەکەی لەلایەن زانایەکیەوە بە ناوی ئەبو حەنیفەی دینەوەریەوە نووسراوە لە کتێبێکدا بە ناونیشانی "ڕەچەڵەکەکانی کورد" (انساب الاکراد) (بڕوانە تێکستی کوردی). بە دڵنیایی فراوانی جیاوازی بۆچوونەکان سەبارەت بە کورد ئەوە دووپات دەکەنەوە کە ئەم مێژووەی ئەمڕۆ سەبارەت بە کورد نووسراوە، بێ مانا ترین مێژووە و هەر لە بناغەوە هەڵەیە.
وەک باسکرا شێواندنی مێژووی وڵاتی کوردستان و نەتەوەی کورد بەدرێژایی چەندین ساڵ و بەهۆی چەندین فاکتەری مێژووییەوە ڕوویداوە کە دەتوانرێت لە چەند خاڵێکدا ڕوونبکرێنەوە:

**١. کێشەی دەرک نەکردن بە سروشتی ناوی نەتەوەی کورد**

سروشتی بەکارهێنانی ناوی نەتەوەی کورد جیاوازە لە هی نەتەوەکانی دراوسێی، چونکە ئەم ناوە دراوە بە کۆمەڵێک گروپی جیاواز. دەبینرێت کە لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا بابلیە سامیەکان، ناوەکانی مید و سۆمەریەکانیان و هەندێک جار گوتی و میدییان تێکەڵ کردووە. هەروەها لە سەرچاوە مێژووییەکاندا زۆر

جار میدەکان، کاسیەکان، هوریەکان و مانیەکان جگە لەو ناوانەی خۆیان، لە هەمان کاتدا پێیان گوتراوە گوتی. پاشتر لە دوای سەدەی سێهەم و چوارهەمی زایینەوە "کورد" ناوێک بووە بۆ ئاماژەکردن بە هەموو نەتەوە ناسامیە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیا. واتە ناوەکە وەک چەترێک بەکارهاتووە بۆ کۆمەڵێک گروپی هەمەجۆر و ئەوەش بۆتە هۆی گرانی تێگەیشتنی ئەو مێژووە. مێژوونوسە ئەوروپاییەکانی سەدەی حەڤدە و هەژدەهەم و دواتریش هەر دەرکیان بەو کێشەیە نەکردووە . ئەمڕۆ بۆ ئەوەی کە مێژووی کورد لەسەر بنەمایەکی زانستیانە بنووسرێت، دەبێت ڕەچاوی ئەو خاڵە بکرێت و ڕابردووی هەموو گروپە جیاوازەکانی وەک هیتی، هوری، مانی، کاسی، سۆمەری، گوتی، میدی، هەزمانی، لوڤی، هتد. بە ووردی مینە بکرێت. مێژوونوسە کوردەکانی سەدەی نۆهەمی زایین دەرکیان بەم ڕاستیە کردوە، بۆیە ئەبو حەنیفەی دینەوەری(٨٢٨ ز-٨٩٦ز)، لەو کتێبەیدا کە سەبارەت بە کورد نوسیویەتی، لەژێر ناوی "ڕەچەڵەکەکانی کورد" (انساب الاکراد) دا، کە هەرچەندە بە داخەوە کتێبەکەی بزرە، بەڵام لە ناونیشانی کتێبەکەدا دەردەکەوێت کە ئەو نووسەرە نەتەوەی کوردی بە کۆمەڵێک ڕەچەڵەک داناوە، چونکە بە کۆ ناوی دەبات. هەروەها ئەو ڕوانگەیە لە بۆچوونی هەندێک لە مێژوونوسە ئیسلامەکانی سەدەی نۆهەمی زایینی هەتاوەکو سەدەی دوانزەهەمی زاینیدا دەردەکەوێت (بڕوانە زاراوە کوردیەکان و کۆمەڵێک سەرنج سەبارەتیان).

نابێت ئەوە لە یاد بکرێت کە ناوی کورد لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە gud، کە وشەیەکی سۆمەری بووە و مانای (جەنگاوەر، پاڵەوان) ی داوە. وشەی gud بە زمانی ئەکەدی دەبێتە qarrādu. بەو جۆرە لە سەرەتای شارستانیەتی مێسۆپۆتامیاوە هەر ئەو دوو ناوەیە کە بەشێوەی gut, gud, qut, qardu, qarrādu, kurte, kurd, kurt دووبارە دەبنەوە، لەبەر ئەوەی کە ئەو دوو ناوە هەر هەمان مانا دەدەن. بۆیە لە سەرەتای شارستانیەکەدا کە زمانی سۆمەری/کوردی زیاتر بەکار هاتووە، زیاتر وشەی gut/gud بزاڵ بووە، بەڵام لە دواییدا بەهۆی زاڵ بوونی زمانی ئارامی زیاتر qardu, kurte, kurd بەکارهاتووە (بڕوانە ناوی کورد). بەڵگە ئارکیۆلۆژی و جوگرافی و مێژووییەکان پشتگیری تەواو لەم بۆچوونە دەکەن. بێگومان یەکێک لە هۆکارە گرنگەکانی تێنەگەیشتن و تێکدانی مێژووی کورد و کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ دەرک نەکردن بە سروشتی نەتەوەی کورد و چۆنێتی بەکارهێنانی ناوەکەی.

**٢- کێشەی تیۆری ئاریەکان**

وەک لە بەشی زماندا باسکرا، زمانی کوردی خراوەتە ناو لقە گروپی زمانە زاگرۆسی (ئێرانی)ەکان و ئەویش دەکەوێتە ژێر چەتری خێزانی زمانە هیندۆئەوروپیەکانەوە. ئەم بۆچوونەش بناغەیەکی ڕوونی زمانەوانی لە پشتەوەیە، لەبەر ئەوەی کە چەندین بەڵگەی وشەکاری و لایەنی ڕێزمانی هاوبەش لە نێوان ئەو گروپە زمانانەدا هەیە.

کێشەکە لەوەدایە ئەمڕۆ لە کتێبە مێژووییەکان و لە ناو خەڵکیشدا شانبەشانی زمانە هیندۆئەوروپیەکان، باس لە ڕەچەڵەکی ئاریش دەکرێت و تێکەڵ دەکرێن. دەبینرێت کە ناوەکانی ئاری و هیندۆئەوروپی بەشێوەیەک تێکەڵ کراون کە هەندێک جار ئەکادیمیەکانیش لە بەکارهێنانیاندا سەریان لێ تێکچووە. بەڵام خۆشبەختانە هێشتا دەتوانرێت سەرەتای دروستبوونی دەستەواژەی ئاری و تیۆریەکانی سەیربکرێتەوە و بزانرێت لەسەر کام بناغە دانراوە. مێژووی تیۆری زمانی هیندۆئەوروپی زۆر کۆن نیە و لە سەرەتادا کابرایەکی دادوەری ئینگلیز بەناوی سێر ولیەم جۆنس (Sir William Jones)، لە ساڵی ١٧٨٦ دا لە هیندستان، سەرنجی پەیوەندی لە نێوان زمانی سانسکریت و یۆنانی کۆن و لاتینیدا دابوو. جا ئەگەرچی جۆنس ئاماژەی بەو پەیوەندیە کرد بەڵام هیچ ناوێکی تایبەتی بۆ ئەو گروپە زمانە دانەنا.

سەرەڕای ئەوەی کە پێش ئەو مێژووەش لەلایەن خەڵکانی ترەوە سەرنجی پەیوەندی نێوان هەندێک لە زمانە ئەوروپیەکان درابوو، بەڵام ئەوە یەکەمین جار بوو کە کەسێک بەو جۆرە هەموو ئەو زمانانە پێکەوە ببەستێت کە لە ڕووی جوگرافیاوە زۆر لەیەکتری دوور بوون (Renfrew,1989)؛ چونکە جۆنس جگە لە دوو زمانی لاتین و یۆنانی کۆن، زمانی سانسکریتیشی خستبووە ناو تیۆریەکەیەوە.

دوا بەدوای ئەوە لە ساڵی ١٨١٣ دا لێکۆڵەرێکی ئینگلیز بە ناوی تۆماس یەنگ (Thomas Young)، بۆ یەکەمجار دەستەواژەی هیندۆ ئەوروپی (Indo-Eropean) بۆ ئەو گروپە زمانە دانا. هەندێک جاریش لە

ژێر کاریگەری لێکۆڵەرە ئەڵمانەکاندا، دەستەواژەی هیندۆ- ئەڵمانی (Indo-Germanic) بە هەمان مەبەست بەکار هاتووە. چونکە هەر لە سەرەتاوە ناوەکە لەگەڵ بۆچوونی ئەو سەردەمەی ئەکادیمیە ئەڵمانەکاندا نەدەگونجا، بۆیە دەستەواژەی هیندۆ- ئەورووپی لای ئەوان زۆر قبوڵکراو نەبوو.
ئەو لێکۆڵینەوانەی کە سەبارەت بە زمانە ئەورووپیەکان دەکرا، بەشێک بوون لە کۆمەڵێک کاری هاوشێوەی تر، لەسەر بنەمای ئاراستەیەکی فکری ئەو سەردەمەی ئەورووپیەکان ئەنجام دەدرا. لەبەر ئەوەی کە ئەوان، لە ژێر کاریگەری تەورات و تەنانەت لێکدانەوەی هەڵەی ئەو کتێبە، پێیان وابوو ئەم زمانانە نەک تەنها لە یەک بنەچەی زمان، بەڵکو لە یەک ڕەگەزیشەوە هاتوون. ئامانجی ئەورووپیەکان لەو گەڕانەدا، دۆزینەوەی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نەبوو، بەڵکو دۆزینەوەی ڕەچەڵەکی زمان یان ڕەگەزی خۆیان بوو. بە کورتی ئەورووپیەکان لەو سەردەمەدا، لەو کۆشش و گەڕانەیاندا سەرگەرمی ئەوە بوون کە ڕابردوی ڕەچەڵەکی زمانەکانیان لە یەک گەلی بنەچەدا بدۆزنەوە. بەو جۆرە ئەم بابەتە بووە مایەی مشتومڕێکی زۆر لە ئەورووپا و چەندین لێکۆڵینەوەی، بە تایبەتی لە ئەڵمانیادا، لەسەر دەکرا.
ئەڵمانەکان لە سەدەی هەژدە و نۆزدەدا زۆر بە چڕو پڕی بۆ ڕەگەزێ دەگەڕان کە بیکەن بە بنەچەی ئەڵمان. هەوڵەکەشیان لەوەدا بوو کە شوێنێک بدۆزنەوە لە خۆرهەلاتدا بێت، لەبەر ئەوەی کە خۆرهەڵات بنەچەی ئاینە کۆنەکان بووە. هەڵبەت ئەوان لە ژێر کاریگەری تەوراتدا بوون و ئەو سەردەمەش ئاینی کریستیان کاریگەری گەورەی لەسەر کۆمەڵگەی ئەورووپی و نووسینی مێژوو هەبوو. ئەڵمان و ئەورووپیەکان لەم کارەیاندا پەنایان نەدەبرد بۆ بەڵگە زانستیەکان بەڵکو ئەو کاتە کە هێشتا دۆزینەوە ئارکیۆلۆجیەکان نەکرابوو، ئەوان لە ڕۆژهەڵاتدا تەنها نەتەوەکانی وەک جو، فارس، مید و هندیان دەناسی و هیچ کام لە نەتەوەکانی وەک سۆمەری و هوری نەناسرابوون. بۆیە هەوڵەکەیان لە چوارچێوەی ئەو نەتەوانەدا، دۆزینەوەی ڕابردوویەک بوو کە لەگەڵ بیروباوەڕی ئاینی و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەدا گونجاو بێت. لە ئەنجامدا گەلێکیان هەڵبژارد بۆ ڕۆڵی بنەچەی ڕەگەزی زمانە هیندۆ ئەورووپیەکان و گووتیان ئەو گەلە (ئاری Aryan) بووە و مانای ناوەکە، ڕەسەن (noble) بووە. گوایە ئەو گەلە لە سەردەمێکدا لە باکوری هیندستاندا ژیاوە و دوایی بووەتە سێ بەشەوە: مید و فارسەکان و سانسکریت و پاشتر وردە وردە بەشەکانی تری زمانە هیندۆ ئەورووپیەکان لەو بنەچەوە دروست بوون. یەکەمین جار ئەم بڕیارە لەلایەن Christian Lassen (1800-1876) وە درا، کاتێک کە داوای کرد وشەی (ئاری) لەبری دەستەواژەی (هیندوئەورووپی) بەکاربهێنرێت وەک ناوێکی گشتی بۆ خێزانی زمانە هیندۆئەورووپیەکان و ئەو گەلانەی کە قسەیان پێکردووە، لەبەر ئەوەی ناوی "ئاری" هەستێکی هاوبەشی ڕەچەڵەکی و بڵاوبوونەوەی جوگرافی دەدا بەو گەلە نەک لەسەر بنەمای مێژوویی.
پێشتر ئەڵمانەکان لە ساڵی ۱۷۷۰ دا بە وشەی Arier ئاشنا بوون. ئەوان ئەو وشەیەیان لە زمانەوانێکی پسپۆڕی هیندی و فارسی، بەناوی Abraham Hyacinthe Anquetil-Duperron وەرگرتبوو کە ئەویش وشەکەی لە ئاڤێستا و Rigvida (کە سەرچاوەی هیندی کۆنە) وەر گرتبوو ( Eigen and Larrrimore, 2006, p.175). بەڵام هەڵبژاردنی ئەو ناوچەیە لەسەر بنەمایەکی چەوت دانرابوو، چونکە بە هۆی تێگەیشتنێکی هەڵەی ئەوان لە تەورات داڕێژرابوو. لەبەر ئەوەی کە لە تەوراتدا دەگووترێت هەموو مرۆڤایەتی لە سەرەتاوە لە باخی ئەدێن (جنات عدن Garden of Eden)[155] وە هاتووە. ئەورووپیەکان لە سەدەی هەژدەهەمدا (باخی ئەدێن) یان بە شوێنێک مەزندە دەکرد کە دەکەوێتە لای کشمیر و ناوچەی تبتەوە و هەتاوەکو سەدەی بیستەم لەسەر ئەو باوەڕە بوون. بەڵام لە دوای دەرکەوتنی تێکستە سۆمەریەکانەوە و لە سەدەی بیستەمەوە دەڵێن کە بنەچەی زۆر لە زانیاریەکانی تەورات لە سۆمەریەوە وەرگیراوە و باخی ئەدێنیش هەر لە وڵاتی سۆمەریەکان و مێسۆپۆتامیادا بووە.

---

[155]. لە هەردوو ئاینی کریستیان و جودایزمدا، بڕوا دەکرێت کە باخی ئەدێن ئەو شوێنە بێت کە ئادەم و حەوا ژیانیان تێدا دەست پێ کردووە. زاناکان لە سەردەمی جیاوازدا هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ دۆزینەوەی ئەو شوێنە . هەندێک دەڵێن ئەو چیرۆکە لە ناو سۆمەریەکاندا باسکراوە، چونکە چیرۆکی (ئادەم) لای سۆمەریەکان بە شێوەی Adamu نوسراوە و ئەو ناوچەیە لەلای سۆمەریەکان بە شێوەی Edin باسکراوە و هەر لە وڵاتی سۆمەردا بووە (Tsumura, 1989, p.123).

هەڵبەت ئەو کاتە بەپێی بۆچوونی کەسەکان و خواست و بەرژەوەندی وڵاتە ئەورووپیەکان جێگای ئەو باخە گۆڕانکاری پێ کراوە. بۆ نموونە لێکۆڵەرێکی ئەڵمانی بەناوی جولیۆس کلاپرۆس (Julius Klaproth) (١٧٨٣ز- ١٨٣٥ ز) کە موچە خۆری حکومەتی ڕوسیای قەیسەری ئەو سەردەمە بوو، لەسەر داوای ئەو حکومەتە، کە بە نیاز بوو سنوری دەسەڵاتی بەرەو ناوچەی قۆقاز بەرفروان بکات و دەیویست ڕەواییەکی مێژوویی بە پرۆژەکەی بدات، ئامارێکی بۆ زمانەکانی ئەو ناوچانە کرد. کلاپرۆس لە ئەنجامی کارەکەیدا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە دوای لافاوەکە[156] کۆمەڵێک لە نەتەوەکان لە ناو شاخەکاندا جێگیر بوون و بنەچەی گەلی ئاری گەڕاندەوە بۆ شاخەکانی هیمالایە و قۆقاز. بێگومان لە پاداشتی ئەو کارەدا حکومەتی ڕوسی کردیانە ئەندامی ئەکادیمیای ڕوسی زانست و دوایی نازناوی ئەکادیمی پاشایانەشی لەلایەن ئەو حکومەتەوە پێ بەخشرا(Eigen and Larrrimore, 2006, p.173).

لە هەمان کاتدا ئاڕاستەیەکی ڕەگەزپەرستیانەی سیاسی ترسناک، بێ پاڵپشتکردن بە بەڵگەی زانستی، شانبەشانی ئەم تیۆریە لە گەشەکردندا بوو. بۆ نموونە August Wilhelm Shclegel (1767-1845) پێی وابووە کە هیندیەکان دوو ڕەگەز و دوو ڕەگی زمانەوانی جیاوازیان هەبووە. یەکەمیان هیندی وڵاتەکە، کە خەڵکێکی کێوی و ڕەش پێست بوون، چەکی سادەیان پێ بووە و لە دارستانە پان و بەرینەکاندا ژیانێکی سادەیان بەسەربردوە، دووهەمیان نەتەوە هیندۆ ئەورووپیەکان کە لە ناوچەی بنجابەوە بەرەو خوارەوە کۆچیان کردوە هەتاوەکو هیندستان. شلێگڵ پێی وابوو کە ئەوانەی بە زمانی سانسکریتی قسەیان دەکرد لە ڕەگەزێکی سپی پێست بوون و هەر ئەوان خەڵکەکەیان ئاشنای شارستانیەت کردوە (2006, p.176). بەڵام نە بەڵگەیەکی زانستی ، نە ئارکیلۆژی و نە مێژوویی نادات کە گوایا ئەوانە سپی پێست بوون و ئەوانەی تر ڕەش پێست. هەروەها لاسن (Lassen) کە یەکێک بوو لە خاوەنی تیۆری ئاریەکان، دەڵێت "خەڵکی ئاری هەرگیز ڕێیان نەداوە کە خەڵکەکانی سەر بە خێڵە ڕەش پێستەکان حوکمیان بکەن. ئاریە کۆنەکان هەمیشە سەلماندوویانە کە ڕەگەزی حوکمڕانن و خەڵکە لاواز و ملهوڕەکانیان ڕاوناوە کە ئەوان ئەو هێز و توانایەی ئەمانیان نەبووە" (Eigen and Larrrimore, 2006, p.176). ئایا بۆچی ئەم نەتەوە ئەفسانەییە هێندە نایاب بووە کە نەیهێشتووە کەس حوکمی بکات، یان بۆچی خەڵکەکەی تر ملیان داوە بەمان و ئەم زانیاریانە لە کوێوە هاتوون؟ لە ڕوانگەیەکی ئەکادیمیەوە، ناتوانرێت ئەمە بە مێژوو نووسین دابنرێت، زیاتر بۆچوونێکی لایەنگرانەی کەسەکەیە و هیچ پەیوەندی بە مێژووەوە نیە، بەڵکو تەنها ڕەنگدانەوەی سیاسەتی کۆلۆنیالیستی ئەو سەردەمە بووە کە لە ئەوروپادا بڵاو بووە.

لە ڕاستیدا ئەم تیۆریە لە هەموو سەردەمێکدا بۆ مەبەستی سیاسی بەکار هاتووە. فیگوێریا (Figueira, 2002) بە درێژی لە دوو توێی کتێبێکدا باس لە بەکارهێنانی ناسنامە جیاوازەکان بۆ مەبەستی جیاواز دەکات و بەشێکی زۆری نوسینەکەی بۆ ئەفسانەی ئاریەکان تەرخان کردووە. فیگوێریا دەیگێڕێتەوە کە چۆن بەریتانیەکان سوودیان لەو تیۆریە بینیوە و چۆن بە یارمەتی ئەو ئەفسانە مێژووییە خۆیان لەگەڵ هندیەکان کردۆتە هاوڕەگەز و مانایەکی مێژوویی و ڕەوایان بە داگیرکردن و حوکمڕانیکردنی هندستان داوە و خۆیان بە تەواوکەری ئاریەکان داناوە. هەروەها لە هەمان کاتدا چینە خوێنەوار و دەسەڵاتدارە هندیەکان سوودیان لە بەکارهێنانی ئەو تیوریە وەرگرتووە بەوەی کە خۆیان بە هاوخوێن و هاوشانی ئینگلیزەکان زانیوە. ئەم چینە خوێنەوار و دەسەڵاتدارەی هیندستان تیۆریەکیان هەبووە کە پاڵپشتی ئەو بۆچونە بکات کە هیندەکان لە بنەچەدا لە ڕەچەڵەکێکی پاکی ئاری بوون و ئاینی هیندوسی کە ئاینی بنەڕەتی ئاریەکان بووە، موسوڵمان و ئاینەکانی تر تێکیانداوە. ئەم بیرۆکەیە هەتاوەکو ئەمڕۆش هندۆسەکان وەک چەکێکی سیاسی سوودی لێ وەردەگرن.

هەمان تیۆری هەتا ئەمڕۆ لە ئێراندا سوودی لێ وەردەگیرێت بە مەبەستی مانا دان بەم نەخشە سیاسیەی ئێران. زۆر لە فارسەکان خۆیان بە ئاری دەزانن و بە کوردیش دەڵێن تۆش ئاری ڕەسەنیت و هەمووومان لەیەك ڕەچەڵەکین و نەتەوەکانی عەرەب و تورک دەبنە هۆی تێکدانی وڵاتی ئاریەکان. بەو شێوەیە

[156] ئەو سەردەمە لە ئەوروپادا کە مێژوو دەنووسرا، سەرەتای مێژوو دەگەڕێنرایەوە بۆ لافاوەکەی نوح و هەموو شتێک لەوێوە دەستی پێ دەکرد و مێژوو لەسەر ئەو بناغەیە دانرابوو.

دمیانەوێت کورد حوکمڕانی ئێران بە بەشێک لە ڕاستیەکی مێژوویی بزانێت و لە ناو ئەو ناسنامە ئەفسانەییەدا قبوڵی دەسەڵاتیان بکات و لە هەمان کاتیشدا مانایەکی مێژوویی بدەن بە پان ئێرانیزم. زۆربەی جار بە کورد دەڵێن تۆ لە "خێڵە ئاریە سەرەتاییەکانی"وەکو ئەوەی کە مەدالیای شانازیان بە کورد بەخشیبێت. وەک پێشتر باسکرا، ناتوانرێت نکۆڵی لە پەیوەندی نێوانی زمانە هیندۆئەوروپیەکان بکرێت، چونکە لە پرۆسەی بەراوردکردندا، ئەو پەیوەندیە بە ئاشکرا دەبینرێت. بەڵام دەستنیشانکردنی یەک ڕەگەز وەک بنەچەی ئەو زمانانە شتێکی مەحاڵە، لەبەر ئەوەی کە زمان و ڕەگەز دوو بابەتی جیاوازن. مەرج نیە هەموو ئەوانەی کە بە زمانی هیندۆ ئەوروپی قسە دەکەن، لە هەمان ڕەگەز بن و جگە لەوەش هیچ بەڵگەیەکی زانستی نیە کە پاڵپشتی لەو بۆچوونە بکات.
لەگەڵ گۆڕانی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەڵمانەکاندا سەرەتای ئەم تیۆریە گۆڕانی بە خۆیەوە بینیوە. ئەیگن و لاریمۆر (Eigen and Larrrimore, 2006) لە دوو توێی کتێبێکدا، لەژێر ناونیشانی "داهێنانی ڕەگەز لە لایەن ئەڵمانەکانەوە" (The German Invention of Race) پرۆسەی دانانی زۆر لە تیۆریە سەرەتاییەکانی ڕەگەزی ئاریان، نوسیوە. ئەم دوو نوسەرە لە کتێبەکەیاندا پرۆسەکەیان بە دوور و درێژی خستۆتە ڕوو. لە سەرەتای ئەو کتێبەدا دەڵێن "ئەفسانەی ئاریەکان، بەشداریەکی زەرەرمەندانەی تری ئەڵمانەکان بوو بۆ بیرکردنەوەی ڕەگەزیی کە بە تەواوی لە دەرەوەی "زانستی" ڕەگەزەوە سەری هەڵداوە" (2006, p.5). ئەم دوو لێکۆڵەرە پێیان وایە کە تیۆری ئاریەکان لە سەر بنەمای زانستی دانەڕێژراوە، بۆیە دەستەواژەی "ئەفسانەی ئاریەکان" ی بۆ بەکاردێنن و دوویاتی دەکەنەوە کە لێکۆڵینەوەکان لە دەرەوەی زانستی ڕەگەزدا ئەنجام دراوە و کتێبەکەیان بۆ ئەو بابەتە تەرخان کردووە. هەر لەوبارەیەوە هێریک (Herrick) یش ئەو تیۆریە بە ئەفسانەی ئاریەکان ناو دەبات و دەڵێت "بەرەو کۆتایی سەدەی هەژدەیەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، لێکۆڵەرە ئەوروپیەکان تەنها ئاریەکانیان دانەهێنا، بەڵکو هەروەها ناوچەی بنەچەی جوگرافی و ڕێڕەوی ترانزێتیشیان بۆ ئەوروپا بۆ ڕەگەزێکی ڕەسەن داهێنا " (Herrick, 2008, p.176).
لە لێکۆڵینەوەکانی ئەم سەردەمەی ئەوروپادا ئەو ئاراستە ڕەگەزپەرستیانە و هەندێک لایەنی ئەفسانەیی ئاریەکان لە ناوەندە زانستیەکاندا ڕەتکراونەتەوە، بەڵام بناغەی تیۆریەکە، بەتایبەتی ئەو لایەنەی کە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی لەسەر دامەزراوە ، هێشتا هەر بەردەوامە. بۆیە هەتا ئێستاش لە زۆربەی کتێبەکاندا ئەو بۆچونەی کە میدەکان بە خەڵکێکی کۆچکردوو بۆ کوردستان و ناوچەکە دادەنێن ، وەک ڕاستیەک ماوەتەوە. کەچی بەپێچەوانەوە، وەک لە بەشی میدەکانی ئەم کتێبەدا ڕوونکرایەوە، زۆربەی سەرچاوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە میدەکان نەک هەر کۆچکردوی ئەو دەڤەرە نین بەڵکو خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەن. بێگومان هەر کاردانەوەی ئەو تیۆریەیە کە بووەتە ڕێگرێکی سایکۆلۆجی لەبەردەم زۆرێک لە مێژوو نووساندا و نەهێڵێت کە بە هیچ جۆرێک بیرێک لە بەراوردکردنی زمانە ناسامیە کۆنەکانی مێسۆپۆتامیا لەگەڵ زمانی کوردیدا بکەن. کەچی دەبینرێت هەموو پەنایەک بۆ ئاڤێستا و سانسکریت براوە، بێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی زانستی سەبارەت بە دێرینی ئەو دوو زمانە هەبێت (بڕوانە زمانی ئاڤێستا).
هەندێک لە بۆچوونەکان کە تیۆری ئاریەکانی لەسەر دامەزراوە، داڕشتنیان هێندە ڕەگەز پەرستیانەیە کە ئەگەر لەم سەردەمەدا بوایە لەوانەبوو لە ئەوروپا قەدەغە بکرانایە و خاوەنەکانیان ببرانایە بۆ دادگا. بەڵام هەر ئەو بۆچوونەیە کە لەو سەردەمەدا باو و قبوڵکراو بووە، دوایی بووەتە بناغەی ڕوانگەی نازیەکان بۆ ڕەگەز و دانانی ئەڵمان بە ڕەگەزێکی تایبەت کە بنەچەکەی لە هیندستانەوە هاتبێت. ئەم تیۆریە بە مەبەستی جیاواز بەکارهاتووە و لە سەردەمی هیتلەردا لۆگۆی ئاڵای ئەڵمانەکان بریتی بوو لە سیمبۆلی هیندیە کۆنەکان کە بە سواستیکا (Swastika) ناسراوە و بەو جۆرە ڕەگەزی ئاریەکان بوو بە ڕەگەزە نایابە پیرۆزەکە. دیارە لە مێژوودا خەڵکانێک بە (ئاری) ناو هێنراون و ناوچەیەکیش هەبووە بەو ناوەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٣). بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە وشەکانی (ئاری، هوری) یان هەر وشەیەکی تر کە ئەو چەند پیتەی تێدا بێت، بە مانای لاوەکی لێکدراونەتەوە و بگرە نەتەوەیەک لەسەر بناغەی تەنها چەند وشەیەک دروستکراوە، چونکە لەو سەردەمەی ئەوروپادا ئامانجە سەرەکەیەکە دۆزینەوەی ڕابردوویەکی پڕ شکۆمەندی بووە بۆ خۆیان نەک دۆزینەوەی ڕاستیەکی مێژوویی.

(نەخشەی ژمارە ١٣) نەخشەی وڵاتی ئاریا (هاریا)

پێش ئەوەی کە ئەو ناوانە بە پەلە ببەسرێن بەیەکەوە و ئەفسانەیەکیان لێ دروست بکرێت، دەبێت زیاتر لێکۆڵینەومیان لەسەر بکرێت. لەبەر ئەوەی کە بەڵگەکان ئاماژە بە خەڵک و ناوچەی جیاواز و ناوهێنان (تەلەفوزی) ی جیاواز دەکەن بۆ ئەو ناوە.

بۆ نموونە هیرۆدۆت دەڵێت "میدەکان لە سەردەمی کۆندا، هەموو خەڵک پێی دەگوتن ئاریەکان (Arians)" (Herodotus, 1860, p.61). دەشبینرێت کە زۆربەی جار لە ناو یۆنانەکاندا، پیتی (ها) دەکرێتە (ئەلف)، دیاکۆنۆف دەڵێت هیرۆدۆت و زۆر لە مێژوو نووسە یۆنانیەکان لە بری ناوی هاریا (Haria)، نووسیویانە ئاریا (Aria) (Diakonoff, 1985, p.127). جگە لەوەش وڵاتی هەزەبانی (Hazabani) لە ناو یۆنانەکاندا بە ئەدیابانە (Adiabne) تۆمار کراوە. کە ئەمە دیسان ئەو بۆچونەی دیاکۆنۆف پشتڕاست دەکاتەوە کە یۆنانیەکان زۆر جار پیتی (ها) دەکەنە (ئەلف). ئەو بۆچوونەی هیرۆدۆت هەڵە نیە و ئەو ئاماژە بەوە دەکات کە میدەکان لە ڕابردوودا بە (هوری) ناسرابوون و لەوانەشە ناوی (هوری) لەڕووی ئایینی و نەتەوەییەوە مانایەکی تایبەتی بە هوریەکان دابێت. شایانی باسە بە زمانی کوردی ئەمڕۆ وشەی (هوری/خۆری) دەشێت دوو مانا بدات (خۆر پەرست، کەسێک کە لە خۆرەوە هاتبێت)،(بڕوانە ڕەگەزی میدەکان) و لە زمانی هوری خۆیدا کە هێشتا زۆر ڕووی زمانەوانی یەکلا نەکراوتەوە، وشەی xurri مانای کاتی بەیانیان دەدات و هەر ئەو ناوش بۆ ئاماژەکردن بۆ خۆیان بەکار هاتووە. هەروەها لە ڕووی زمانەوە میدیەکان و میتانیە هوریەکان بە نزیکی هەر هەمان زمان قسەیان کردووە کە زمانێکی کوردی کۆنە (بڕوانە هیتیەکان)، بە پێچەوانەشەوە فارسی کۆن زۆر دوورە لە زمانی هوری. ئەوە دیسان پشتگیری لە بۆچوونی هیرۆدۆت دەکات کە میدەکان لە ڕابردوودا بە هوریش ناسرابوون.

ئەوەی کە جێی سەرنجە هیرۆدۆت سەرەڕای ئەوەی کە زۆر باسی فارسەکان دەکات و زانیاری زۆریان سەبارەت دەدات، بەڵام بە هیچ شێوەیەک ناڵێت کە لە ڕابردوودا فارسەکان بە (ئاری/هاری/هوری) ناوبراون، لەبەر ئەوەی کە فارسەکان لە وڵاتی هوریەکان دوور بوون و هوری بوونیان زەحمەت بووە، بەڵام لە تێکستی سەر بەردەکاندا، پاشای ئەخامەنی فارس لە ئاماژە بە خۆیدا، ناوی (ئاری) دەهێنێت.

ئەوەتا داریوشی پاشای ئەخامەنی لە یەکێک لە تێکستەکاندا دەڵێت "من داریوشم، پاشای گەورە، پاشای پاشاکان، پاشای هەموو خەڵکی وڵاتەکان، پاشای ئەم زەمینە مەزنە لە دورو نزیکەوە، کوڕی هیستاسپیسی ئەخامەنی فارس، کوڕی فارس، ئاری و لە ڕەگەزی ئاری" (Routledge, 1852, p.63). دەتوانرێت وشەی (ئاری) لەم گوتانەی داریوشدا بە سێ مانا لێک بدرێتەوە. یەکەمیان ئەوەیە کە داریوش ئاماژە بە ڕەچەڵەکی خۆیان بکات کە لە ناوچەکانی لای خوراسان و ئەفغانستانەوە هاتبێتن، ئەو ناوچەیە لە لایەن یۆنانەکانەوە بە ئاریا (Arya) لە قەڵەم دراوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٣) و لە بنەچەدا وەک لەسەرەوە باسکرا، ناوەکە هاریا (Haria) بووە و فارسەکان لە نووسیندا کرودویانەتە ئاریا (بڕوانە کێشەی تێکەڵکردنی ناوی ئێران). ئەم ناوە لە سەرچاوە مێژوومیەکانی سەردەمی ئیسلامیشدا دووبارە هەر ئاماژە بووە بە هەمان ناوچە. ئیبن ئەسیر سەبارەت بە ڕووداوێکی مێژوویی دێرین دەڵێت "کاتێک کە گەیشتە شاری ئێران (ایران شهر) کە ئەوە بریتیە لە نیسابور (نیشاپور) (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ.١٤٠)، کە ئەمە ناوچەی خوراسانە و لەگەڵ سەرچاوە یۆنانیەکاندا یەک دەگرێتەوە و بە هەمان شێوەش مەسعودی وەک دەفەرێکی زۆر بچووک لە هەمان ناوچەدا ئاماژەی پێکردووە (مسعودي، ٢٠١١، پ.٧٥ و ٧٦).

دووەمیان هەرچەندە کە فارسەکان هوری نەبوون، بەڵام داریوش ویستبێتی ڕەچەڵەکی خۆی بگەڕێنێتەوە بۆ ڕەچەڵەکی میدەکان کە لە ڕابردودا بە هوری ناسرابوون و هیێرۆدۆت ئاماژەی پێکردووە. داریوش ئەوەی کردووە بۆ ئەوەی کە هەمان ڕابردووی میدەکان بۆ خۆیان هەڵبەسێت کە هەمیشە چاویان لێکردوون.

سێیەمیان ئەوەیە کە وشەی ar لە هەموو زمانە دێرینەکاندا مانای پۆزەتیڤانەی هەیە. لە زمانی سانسکریتدا مانای (ڕەسەن، نایاب) دەدات، کە دەشێت داریوش مەبەستی لە نەتەوە نەبێت و هەر بە هەمان مەبەست بەکاری هێنابێت و ویستبێتی بڵێ ئێمە لە ڕەچەڵەکێکی نایابین و مانای نەتەوەیی نەدات. لەبەر ئەوەی کە داریوش لە تێکستەکەیدا باسی بنەماڵەی ئەخامەنی و نەتەوەی فارسی کردووە، ئیتر چۆن لەوێدا وشەی (ئاری) دیسان هەر مانای نەتەوەی دابێت. یان لەوانەیە داریوش خۆیانی بۆ Urania ی خوای فارسەکان گەڕاندبێتەوە، کە بەپێی هیرۆدۆت، خوایەک بووە کە فارسەکان لە عەرەب و ئاشوریەکان وەریان گرتووە .Herodotus, 2009, p.41 and 42)

بەپێی پێگەی جواگرافی فارسەکان و شوێنی ژیانیان، هوری بوونیان دەتوانرێت بە تەواوی ڕەتبکرێتەوە و هیرۆدۆت بە ڕوونی دەڵێت لە ڕابردوودا بە میدەکان گوتراوە ئاری (هوری) و بە هیچ جۆرێک ئاماژەی بە فارسەکان نەکردووە. واتە ئەو وشەیەی کە داریوش ئاماژەی پێ دەکات و ئەوەی هیرۆدۆت ئاماژەی پێ دەکات سەبارەت بە ڕەچەڵەکی میدەکان، دوو وشەی جیاوازن، دوو مانای جیاواز دەدەن و لە بەکارهێنانەکەشیدا ئەوە ڕوون دەبێتەوە.

جگە لەوەش ئەگەر سەرنج بدرێت لە سەردەمی حوکمی سۆمەری و ئاشوری و هوری و کاسیدا بە هیچ شێوەیەک باسی ناوی (ئاری/ئاریەکان) نەکراوە. بەڵام باسی (هوریەکان) کراوە بە شێوەی (خۆری khuri/xuri). هەروەها زۆر لە کتێبە مێژووییە نوێ ئەورووپیەکان و بە تایبەتی ئێرانیەکان دەڵێن گوایە ئاریەکان و ئەمجا فارسەکان زەردەشتی بوون و ئەم ڕوانگەیە وەک ڕاستیەکی لێ هاتووە. کەچی بەڵگە مێژووییەکان بە تەواوی بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونانەن و بە تەواوی شتێکی تر دەڵێن. هیرۆدۆت لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا کە خۆی چووەتە ناو فارسەکان، بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بۆ زەردەشت و ئاینی مەزدایەسنی (زەردەشتی) ناکات وەک ئاینی فارسەکان، بەڵکو ئەو سەبارەت بە ئاینی فارسەکان دەڵێت "هیچ وێنەیەکی خواکانیان نیە، هیچ پەرستگە و شوێنێکی پەرستنیان نیە و پێیان وایە بوونی ئەوانە نیشانەی ناژیریە. پێم وایە ئەوە لەو بۆچوونەوە هاتووە کە ئەوان بڕوایان بەوە نیە کە خوا و مرۆڤ لە هەمان سروشت بن کە ئەوە یۆنانەکان بڕوایان پێیەتی. بەڵام ئەوان دەچنە سەر بەرزترین شاخ و لەوێ قوربانی بۆ خوای ئاسمان (Jupiter) دەکەن کە ئەو ناوەیە دەیدەن بە هەموو ئاسمان. بە هەمان شێوە قوربانی بۆ ڕۆژ و مانگ دەکەن، بۆ زەوی، بۆ ئاگر، بۆ ئاو و بۆ با. ئەوانە ئەو خوایانەن کە پەرستنیان لە سەردەمی کۆنەوە بۆ ماوەتەوە. دوایی تر دەستیان کرد بە پەرستنی Urania کە لە عەرەب و ئاشوریەکانەوە وەریان گرتووە.

ئاشوریەکان ئەو خوا مێیە بە Mylitta ناو دەبەن و عەرەبەکان بە ئەللات (اللات)[157]". ئەمجا هیرۆدۆت بەردەوام دەبێت و دەڵێت "بۆ ئەو خوایانە فارسەکان بەم شێوەی خوارەوە قوربانی پێشکەش دەکەن: هیچ مێزێک دانانێن، ئاگر ناکەنەوە، هیچ خواردنەوەیەک تێناکەن؛ شمشاڵ لێ نادەن،....." (Herodotus, 2009, p.41 and 42). واتە هیرۆدۆت بە تەواوی ڕوونی دەکاتەوە کە لە سەدەی پێنجەمی پێش زاییندا فارسەکان نەک زەردەشتی نەبوون بەڵکو هەندێک لە خواکانیان عەرەبیش بووە و چەندین خوای جیاوازیان هەبووە.

وەک پێشتر باسکرا ئێستا تاڕادەیەک لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا هەندێک لایەنی ئەو تیۆری و بۆچوونە سیاسیە بێ مانایە ڕەتکراوەتەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە هەتاوەکو ئێستا لێکۆڵەرەکان لەو چوارچێوەدا کاردەکەن، چونکە زیاتر پشت بەو سەرچاوانە و ئەو بناغەیە دەبەستن کە لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەوە دانراون، بۆیە ڕەنگدانەوەی ئەو ڕوانگەیە لە ناو لێکۆڵینەوە ئەکادیمی و زمانەوانیەکانی سەبارەت بە مێسۆپۆتامیا، هەر بەردەوامە. دەبینرێت کە مێژوونوسە ئەوروپیەکان، لە دوای ساڵی ١٠٠٠ پ.ز هەموو شتێک دەگەڕێننەوە بۆ فارس، وەکو ئەوەی کە مێژووی ناوچەکە لەو نەتەوەیەوە دەستی پێکردبێت. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگرێتەوە کە ئەوروپیەکان لە سەردەمی نوێدا گەیشتنە ناوچەکە و میدیان نەدۆزیەوە، لەبری ئەوەی کە تیۆریەکەیان بخەنە ژێر گومان و بەدوای وەڵامێکی زانستییانەی ئەو دیاردەیەدا بگەڕێن، بەپەلە فارسەکانیان بە جۆرێکی ئەفسانیی وا گەورەکرد کە لە هەموو بنەمایەکی مێژوویی لایدا. بێگومان ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە فارسەکان گەلێکی بچووکی سەر کەنداو بوون و پاشتر بە درێژایی چەند سەدەیەک بوونە هێزی دەسەڵاتداری ناوچەکە، بەڵام ئاخۆ دەتوانرێت لەگەڵ ڕۆڵ و جێگای شارستانیەتی میللەتەکانی وەک سۆمەری و هوری و هیتی و مانی و میدەکاندا بەراورد بکرێت ؟ کەچی هەتا ئەمڕۆش لە ناو تێکستە ئەوروپیەکاندا هەموو شارستانیەت و مێژووی خۆرهەڵات لە ناو دەستەواژەی فارسەکاندا توێنراوەتەوە.

ئاراستەی هەموو پرۆژەیەک بە پێی مەبەست و ئامانجی پرۆژەکە دادەڕێژێت. سەرەتا لە سەدەکانی هەژدەی زاینەوە کە لە ئەوروپاوە دەستکراوە بە نووسینی مێژووی خۆرهەڵات، ئامانج لەو پرۆژەیە دۆزینەوە یان دروستکردنی ڕابردوویەکی پڕ شکۆمەندی بووە بۆ ئەوروپیەکان و ئەڵمانیەکان بە تایبەتی؛ لەو پرۆسەیەدا نەتەوەی ئاری لەسەر بناغەی کۆمەڵێک تیۆری و ئەفسانە هێنراوەتە کایەوە و ئامانجەکە هێنراوەتە دی و نەتەوەیەکی ئەفسانەیی دروست کراوە. بەڵام لە سایەی ئەو ئاراستە هەڵەیەدا، لەبەر ئەوەی کە بناغەی سەرەتایی لێکۆڵینەوەکان زانستی نەبوون، ئاراستەی کاری مێژوونوسەکانی پاشتریشی چەوت کردووە. لە دەرئەنجامدا هەندێک نەتەوە سودیان لەو تیۆریە نازانستیە وەرگرتوە، بۆیە دەبینرێت کە بە مەبەستی گەورەکردنی نەتەوەی ئاری و دوور لە ڕێچکەی مێژوویی، نەتەوە و زمانی فارسی و سانسکریت کراونەتە نەتەوە و زمانی ئەفسانەیی و ڕابردووی زمانە هیندۆئەوروپیەکان بە تەواوی تێکدراوە، بەڵام قوربانیی یەکەمی ئەم هەڵەیە، مێژووی کورد و کوردستان بووە.

لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا ئەوروپیەکان کۆمەڵێک کاری زۆر نایابیان ئەنجام داوە و توانراوە زۆر لە زمانە دێرینەکانی مێسۆپۆتامیا و ئەنادۆل توانراوە بخوێنرێتەوە. بەهۆی ئەو کارانەوە سەردەمێکی مێژووی مرۆڤایەتی ڕوونکراوەتەوە. ئەو ئاراستەی کارەکردنە گەر لەسەر ئەو ڕێچکەیە بەردەوام بوایە، ئەوا بە دڵنیایی ئەمڕۆ تێگەیشتنێکی زۆر ڕوونتر لە ئارادا دەبوو سەبارەت بە مێژووی شارستانیەتی مرۆڤایەتی و مێسۆپۆتامیا. ڕێگری یەکەم و بەربەستی سەرەکی ئەو ئاراستە زانستیە، تیۆری ئاریەکان بووە کە بە تەواوی هەوڵەکانی لە ڕێچکەی خۆی لاداوە. بۆیە ئەم تیۆریە بە گشتی گەورەترین زیانی بە نووسینەوەی مێژوو گەیاندووە و بووەتە ڕێگر لە بەردەم تێگەیشتن لە ڕابردوو و سەرەتای شارستانیەتی مرۆڤایەتی و گەورەترین زەرەرمەند لەم پرۆسەیەدا کورد بووە. کارەکان بە تەواوی تێگەیشتنێکی هەڵە سەبارەت ئەم

[157]. ئەللات (اللات) خوایەکی عەرەبەکانە کە هەتاوەکو سەرەتای هاتنی ئیسلام لە ناو عەرەبەکاندا دەپەرسترا، کە بە ڕوونی ئەوە دووپات دەکاتەوە زانیاریەکانی هیرۆدۆت دروست بوون.

نەتەوەیە و مێژووەکەی دروست کردووە و ڕوخسارێکی بۆ دروست کردووە کە بە تەواوی پێچەوانەی ڕاستیە مێژووییەکانە و مرۆڤایەتی خۆی بێ بەش کردووە لە تێگەیشتنی زانستیانەی خۆی.

**٣- کێشەی تێکەڵکردنی مانای فارس (Persian)**
ئەمڕۆ ئەگەر مێژوو نوسێک بیەوێت لێکۆڵینەوەیەک، بە پشتبەستن بە دۆکیومێنتە مێژووییەکانی ئەوروپا، سەبارەت بە ڕابردووی خۆرهەڵات بنووسێت، یەکێک لەو ناوانەی کە چەندجارە دەبنەوە و کێشەی بۆ دروست دەکەن ، دەستەواژەی فارسە. ئەم دەستەواژەیە لە بنەڕەتدا هەرچەندە ئاماژەیە بۆ ڕەگەزی فارس، بەڵام لە ناو کتێبە ئەوروپیە نوێکاندا مانایەک و لە کتێبە مێژووییە ئیسلامی و یۆنانیەکاندا مانایەکی تری هەیە. بەئاشکرا دەبینرێت کە ئەو ناوە لە ڕوانگەی ئەوروپیدا بەتەواوی لە مانا بنەڕەتیە مێژووییەکەی خۆی لایداوە.
**ناوی فارس و مێژووی حوکمڕانیان:**
فارسەکان نەتەوە و ڕەگەزێکن مەڵبەندی ژیانیان لە ناوچەیەکدا بووە کە دەکەوێتە سەر کەنداو. هەتا ئەمڕۆش ئەو ناوچەیە بریتیە لە یەکەیەکی ئیداری ئێران، بەناوی (ئوستانی فارس). لە یەکێک لە تێکستە ئاشوریەکاندا، لە ساڵی ٦٩١ ی پ.ز، فارسەکان لە ژێر ناوی پارسواش (Parsuaš) دا هەر لە هەمان ئەو شوێنەی ئەمڕۆدا باسکراون (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢). دیاکۆنۆف پێی وایە پێشتر لە سەدەی نۆهەمی پێش زاینیشدا ئەو ناوە هاتووە (Diakonoff, 1985, p.88). شایانی باسە کە ناوێکی تر لە تێکستی ئاشوریەکاندا هەیە و بە شێوەی (Parsua) نوسراوە ، بەڵام ئەو ناوە هیچ پەیوەندی بە خەڵکەوە نیە لەبەر ئەوەی کە لە شێوەی نووسینی ئاشوریدا ئاماژەیە بۆ ناوچە نەک دانیشتوان.
سەرەڕای ئەوەی کە لەلایەن لێکۆڵەرە تایبەتمەندەکانی وەک زادۆک و دیاکۆنۆف[158] ئەو بۆچونە ڕەتکراوەتەوە کە ئەو ناوە پەیوەندی بە نەتەوەی فارسەوە هەبێت، بە تایبەتی لە بەر ئەوەی کە هەردوو ناوەکە لە هەمان کاتدا باسکراون، ئەوەش بەڵگەیە کە ئاماژەن بە دوو شتی جیاواز، کەچی زۆر جار سەرچاوە فارسیە نوێکان هەوڵ دەدەن بیبەستنەوە بە ڕابردووی فارسەوە. زادۆک لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر Parsua کردووە و گەیشتۆتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەو ناوە هیچ پەیوەندیەکی بە Parsuaš نیە (Zadok, 2001). شایانی ئاماژە پێکردنە کە ناوی پارسوای لای کوردستانی ئەمڕۆ بە تەنها لە سەردەمی ئاشوریەکان باسی لێوەکراوە و دوایی نەماوە. هەروەها سەرچاوە مێژوویەکانی تریش تەنها پشتگیری لە ناوی پارسواش دەکەن کە لە سەردەمی ئاشوریەکانەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ هەر ئاماژە بووە بەو ناوچەیەی کە لە سەر نەخشەی ئێرانی ئەمڕۆدا پێی دەگوترێت ئوستانی فارس و لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا بە (بلاد الفارس) باسکراوە و ئەوە وڵاتی فارسەکان بووە.
لە ناو کتێبە ئیسلامیەکاندا، ناوەکانی وەک فارس، عەجەم و کورد باسکراون. وشەی فارس ئاماژە بووە بۆ قەومی فارس و وشەی عەجەم بە گشتی ئاماژە بووە بۆ نەتەوە ناسامیەکانی ناوچەی خۆرهەڵات. هەندێک جار کە مێژوو نووسە ئیسلامیەکان باسی سوپای ناوچەکەیان کردووە هەموو نەتەوە ناسامیەکانیان بە عەجەم باسکردووە، هەندێک جاری تر بە تایبەت بۆ ئاماژەکردن بە ئەشکانیەکان بەکارهاتووە کە بە زمانی پەهلەوی قسەیان کردووە. بۆ نموونە ئیبن خەلدون سەبارەت بە یەکێک لە جەنگەکانی نێوان عەرەبە موسوڵمانەکان و خەڵکانی ناوچەکە کە لە دەڤەری ئەهواز ڕوو دەدات دەڵێت "کاتێک کە بیروز لە ناوچەی نێوان ڕوباری تیر و مەنازر لە ئەهواز لەگەڵ کۆمەڵێک لە عەجەمەکان کۆبووەوە کە زۆربەیان کورد بوون" (ابن خلدون، ٢٠١٠). بەو جۆرە لە زمانی عەرەبیدا هەندێک جار نەتەوە نا سامیەکان بە گشتی بە عەجەم دەناسران و فارس و کورد بە جیا باسکراون. بەڵام لە ناو کتێبە ئەوروپیە نوێکاندا (فارس)

[158]. ئیگۆر دیاکۆنۆف (Igor Diakonoff) (١٩١٥ز-١٩٩٩) مێژوو نوسێکی بە ڕەگەز ڕوسیە و لێکۆڵینەوەی زۆری لەسەر ڕابردووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و زمانە کۆنەکانی هەیە و چەندین لێکۆڵینەوەی بەنرخی لەسەر ئەو بابەتە هەیە و پرۆفیسۆر ڕان زادۆک (Ran Zadok) تایبەتمەندە لەسەر زمان و مێژووی گەلە زاگرۆسی (ئێرانی) مەکان و مێژووی جوەکان و چەندین کتێبی نایابی هەیە و ئێستاکە لە زانکۆی تەل ئەبیبی ئیسرائیل مامۆستایە.

مانایەکی جیاوازی وەرگرتووە، زۆر جار هەر شتێک لە خۆرهەڵاتەوە هاتبێت، ئەگەر عەرەب نەبووبێت، ئەوان بۆ کار ئاسانی خۆیان بە فارس لە قەڵەمیان داوە. هەڵبەتە ئەوان لە سەرەتادا زانیویانە کە ناوچەکە دەیان نەتەوەی جیاوازی تێدا بووە کە میللەتەکانی ئەمڕۆی وەک بەلوج، گیلەکی، مازەندەرانی، تالیشی، هتد. پێک دەهێنن. بەڵام وەک چۆن لە کتێبە کوردیە کۆنەکاندا، کورد کە ئاماژەی بە "فەرەنگ" کردووە، مەبەستی هەموو میللەتە ئەوروپیەکان بووە، لە ئەورووپاش بە هەمان شێوە وشەی فارس، لە دوای سەدەی دەهەمی زایینەوە، هەموو مانایەکی مێژوویی لە دەستداوە. سەرەرای بێ مانایی بەکارهێنانی ناوی (فارس) لە ژیانی ڕۆژانەدا و لەلایەن خەڵکی ئاسایی ئەورووپاوە بە مەبەستی ئاماژەکردن بۆ هەموو خەڵکە نا سامیەکانی ناوچەکە، کە هێشتا دەشێت قبوڵ بکرێت، بەڵام بەکارهێنانی لەلایەن خەڵکی ئەکادیمی و لە هەمان چوارچێوەدا، جۆرێکە لە ڕیزنەگرتن و بە کۆکردن (جوملەکردن) ی مێژوو و فەرهەنگی نەتەوەکانی خۆرهەڵات.

هۆتسما (Houtsma) لە یەکەم ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا سەبارەت بە وڵاتی فارس (Persia) دەڵێت "ناوی فارس (Persia) لە بنەڕەتدا خۆرئاواییە و لەوانەیە لە سەدەکانی ناوەندەوە دەست بە بەکارهێنانی کرابێت بۆ ئەو وڵاتانەی کە ناوچەی ئێران دەگرێتەوە. لە ناوهێنانی پارسای "Persae" وە هاتووە کە لەلایەن یۆنان-ڕۆمانەکانەوە بە ئەخمەنیەکان دەگووترا، ناوێکە دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی فارس (Persis)". هەروەها بەردەوام دەبێت و دەڵێت "ناوی فارس (Faris) (نوێ Pars :Persia) لە کاتی ئیسلامدا هەر تەنها ئاماژە بووە بۆ هەمان ناوچەی فارس (Persis)"[159] (Houtsma, 1993, p.1038) . دەبینرێت کە هۆستسما دووپاتی دەکاتەوە دەستەواژەکە لە ناو یۆنان و ڕۆمانەکان و موسوڵانەکانیشدا هەر مانا دروستەکەی خۆی هەبووە، کە بە خەڵک و ناوچەی جوگرافی ئوستانی فارس گووتراوە و ئەوروپیەکان بە Persis ئاماژەیان پێ کردووە. سەرەرای ئەوە لە ناو ئەوروپیەکاندا ئەو ناوە ماناکەی خۆی لە دەستداوە. ئەمە ئاشکرای دەکات کە ئەگەر دەستەواژەی "فارس" لە مانا تێکدراوەکەی ئەمڕۆ دەر بهێنرێت و بخرێتە چوارچێوەی ناوە مێژووییەکەی، ئەوا دەبینرێت کە ڕەگەزی فارس نەتەوەیەکی بچووک بووە کە لە سەردەمی ئاشوریەکانەوە ڕوویکردۆتە ناوچەیەک کە ئەمڕۆ پێی دەگووترێت (ئوستانی فارس). فارسەکان لە نزیکی دوای ٥٥٠پ.ز - ٣٣٦پ.ز وە لە ژێر ناوی بنەماڵەی ئەخامەنیدا حوکمڕانیان گرتە دەست، کە بە هەمووی نزیکی ٢٢٤ ساڵ دەکات و ئەو کۆمەڵە ساڵەش بۆ حوکمڕانی ئەو ناوچەیە ماوەیەکی زۆر نیە. دوای ئەوە یۆنانەکان حوکمڕانیان گرتە دەست و دەسەڵات لە دەست فارسدا نەما و هیچ پاشایەکیان لە دوای ئەو مێژووە حوکمی نەکردووە. بەڵام بە درێژایی سەردەمی حوکمی فارسەکان و دوای هاتنی یۆنانیەکانیش کە دەسەڵاتی ئەخامەنیان کۆتایی پێ هێنا، میدەکان وەک پاشای سەربەخۆ دەسەڵاتیان هەر بەردەوام بووە و لە ناوچەکانی باکوری میدیادا فەرمانڕەواییان دەکرد (بڕوانە میدەکان). دوایی شانبەشانی میدەکان ئەشکانیەکان حوکمڕانیان لە نێوان ٢٤٧ پ.ز هەتاوەکو ٢٢٤ ز بەردەوام بووە. کە نزیکی چوار سەد و حەفتا ساڵ حوکمڕانیان کردووە و دوو ئەوەندەی ماوەی دەسەڵاتی فارسەکان حوکمڕان بوون. لەو ماوەیەشدا هیچ بەڵگەیەک نیە سەبارەت بە بوونی پاشایەکی بەهێزی فارس، بەڵکو ئەوان لە ژێر دەسەڵاتی ئەشکانیدا بوون و ئیبن ئەسیر بابەتەکە بە تەواوی یەکلادەکاتەوە و لە باسکردنی فارسەکاندا دەڵێت "خەڵکانی تر کە شارەزان بە دەنگوباسی فارسەکان دەڵێن: دوای ئەسکەندەر وڵاتی فارسەکان لەلایەن پاشای بێگانەوە حوکم کراوە کە گوێڕایەڵی پاشای وڵاتی شاخ بوون، ئەوانیش ئەشکانیەکان بوون کە دەڵێن حوکمڕانی نەتەوەکانیان دەکرد" (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ.٩٨).

بە درێژایی ئەو سەردەمە کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی سێ بنەماڵەی میدی، هەزمبانی و کوردیاندا بووە کە هەموویان دەوڵەتی کوردی بوون. ئەم سێ دەوڵەتە کوردیە هەتاوەکو بەهێزبوونی ساسانیەکان کە لە نێوان ٢٢٤ ز هەتاوەکو ٦٥١ ز حوکمیان کردووە و دوای ئەوە موسوڵمانەکان هاتنە ناوچەکە.

---

[159]. مەبەستی لە ئوستانی فارسی ئەمڕۆیە کە یۆنانیەکان پێیان گوتووە (پارسیس).

ساسانیەکان کە ئەمڕۆ لە کتێبە مێژووییەکاندا بە فارس لە قەڵەم دەدرێن بنەماڵەیەکی فارس نەبوون، بەڵکو کورد بوون. لەگۆڕینەوەی نامەدا لە نێوان ئەردەشیر و ئەردەوانی پاشای ئەشکانیدا دەبینرێت کە ئەردەوان بە کورد لەقەڵەم دەدات. ساسان کە یەکەم دەستەی بنەماڵەی ساسانەکان بوو، خۆی کورد بووە و لە کارنامەی ئەردەشیری پاپەگاندا باس دەکرێت، هەروەها نەک ساسان خۆی بەڵکو هاوسەرەکەی کە لە تیرەی (بازرەنگی) بووە و ناوی ڕامبەهەشت بووە، چەندین سەرچاوە هەر بە کوردی دەزانێت. (لغت نامه) سەبارەت بازرەنگی دەڵێت " لە ناو خەڵکدا وەک ئەفسانە وا باوە کە بازرەنگ خێڵێکی کوردەکانی ناوچەی ئیستەخر بووە لە ناوچەی فارس" و هەروەها ئاماژە بە بە بۆچوونی ڕەشید یاسمی مێژوونووسیش دەدات کە ئەویش هەر بە کوردی داناون (لغت نامه، ٢٠١١). هەڵبەت هۆکاری ئاماژە پێ نەکردنی لەلایەن سەرچاوە دێرینە فارسیەکانەوە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فارسەکان هەموو حوکمڕانێکی ناوچەی خۆیان بە فارس ناوبردوە، بۆ نموونە تەنانەت کەسێکی وەک ئەلێکسەندەری مەقدۆنی لەلایەن فیردەوسیەوە بە فارس لە قەڵەم دراوە و بە نیوە برای داریوش داناوە (Adib-Moghaddam, 2010, p.36, 37). دەنا ساسانیەکان بنەماڵەیەکی کورد بوون کە حوکمڕانی نەتەوەکانی ناوچەکەیان کردووە.

فارسەکان هەمیشە خەریکی دروستکردنی ڕابردوویەکی پڕ شکۆمەندی بێ بناغە بوون بۆ خۆیان، هەندێک لە مێژوونوسەکان دەرکیان بەم دیاردەیە کردووە. ئیبن ئەسیر لە سەدەی دوانزەهەمدا لە ئاماژە بە یەکێک لەو ڕووداوە مێژووییانەی کە فارسەکان بۆ خۆیان دروستکردووە، دەڵێت "ئەمەشیان درۆیەک لە درۆ سارد و سڕەکانی تری فارسە، ئەوان درۆ و دەلەسەی لەوە سەیرتریان هەیە کە ئێمە وازمان لە باسکردنیان هێنا" (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ. ٢٤). لەوانەیە ڕاستی کوردبوونی ساسانیەکان بۆ خوێنەر جێگای سەرسوڕمان بێت، بەڵام هەردوو بنەماڵەی حوکمڕانی ئێران، سەفەویەکان و زەندیەکان[160] کورد بوون. سەفەویەکان چەندین سەرچاوە بە کوردیان دادەنێت (Martin, 2004, p.217) و زەندیەکان هەتاوەکو ئەمڕۆش بە کوردی قسە دەکەن. کەچی لەم سەردەمەشدا سەرەڕای بەرەوپێشچوونی تۆمارکردنی زانیاریەکان، زۆرجار بە هەڵە بە فارس لەقەڵەم دەدرێن.

سەرەڕای نزیکی سێ هەزار ساڵ لە هاتنی فارسەکان، کەچی هەتاوەکو ئەمڕۆ جیاوازیەکی زۆر لە نێوان فارس و کورد دا بەدی دەکرێت. لەڕوی زمانەوانیەوە، وەکو لە بەشی زمانی کوردیدا ڕوونکرایەوە، دەبینرێت کە فارسی کۆن، پەیوەندی لەگەڵ سۆمەری و کوردی ئەمڕۆدا کەمترە وەک لە فارسی نوێ، ئەمەش بەڵگەیەکی زمانەوانیە و دەیسەلمێنێت کە لەسەردەمێکدا فارسەکان هاتوونەتە ناوچەکە و زمانەکەیان بە کارتێکردنی زمانی خەڵکی ناوچەکە، گۆڕانی بنەڕەتی بەسەردا هاتووە. هەروەها سەمای کوردی کە بەشێوەی دەستگرتن لە نێوان پیاوان و ژناندا دەکرێت و هەموو سووچێکی کوردستان بە هەموو بەشەکانیەوە دەگرێتەوە، کەچی هەر کە پێ دەنرێتە ناوچەی فارس، شێوەی سەماکردن بە تەواوی دەگۆڕێت و هیچ پەیوەندیەکی بە سەماکردنی کوردیەوە نامێنێت. دەکرێت تەنها بە دەستنیشانکردنی ناوچەکان بەپێی جیاوازی یان لەیەکچونی هەڵپەڕکێ و دەهۆڵ و سوڕنا، نەخشەی وڵاتی کوردستان لە وڵاتی فارسەکان جودا بکرێتەوە.

ئەوەی کە جێی سەرنجە، کورد لە ڕووی سەماوە لە نەتەوەکانی وەک یۆنان و بەڵکان و ڕوسەکان نزیکترە وەک لە فارس. سەمای فارسی بنەچەکەی هاوبەشی لەگەڵ سەمای هیندەکاندا هەیە و بە ڕوونی دەرکی پێ دەکرێت. هەروەها ڕیدمی مۆسیقای فۆلکلۆری کوردی بە تەواوی جیاوازە لە فارسی. دەبینرێت کە لاوک، حەیران، سیاچەمانە و چەمەری کە هەمووی ستایڵی گۆرانی کوردین و لە ناوچەی جیاوازی کوردستان بوونیان هەیە، بە تەواوی جیاوازن لە مۆسیقای فارسی و بگرە هیچ پەیوەندیەکیان پێوەی نیە. فۆلکلۆر

160. زەندیەکان پێ دەچێت ناوەکەیان لە سەردەمی میدەکانەوە هەر مابێتەوە. بەپێی هێرۆدۆت، یەکێک لە شەش خێڵە سەرەکیە میدیەکان ناوی ئاری زەندی (Arizandi) بووە؛ بەپێی ئەوەی کە Zantu لە زمانی میدی خۆیدا مانای خێڵ دەدات، هەروەها بەپێی ئەوەی کە یۆنانیەکان لە سەرچاوەکاندا پیتی ئەلف دەکەنە ها، ئەوا دەبێت ناوەکە (هوری زەندی) بوو بێت و ئەمڕۆ هەر بەشی دووهەمی ناوەکە مابێت و کرابێتە (زەندی).

بەشێکی گرنگە و لەیەکچوونی فۆلکلۆر، هەندێک لایەنی هاوبەشی مێژوویی نیشان دەدات، پێچەوانە بوونیشی ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم دوو نەتەوەیە لە بنەچەوە جیاوازن.

**جوگرافیای وڵاتی فارس:**

وەک پێشتر باسکرا، لە سەردەمی ئاشوریەکانەوە ناوچەیەک بەناوی پارسواش (Parsuaš) ئاماژەی پێکراوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ٢)، کە هەمان ناوچەیە کە لە سەردەمی ئیسلامدا بە وڵاتی فارس (بلاد الفارس) باسکراوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١). ئەمڕۆ ئەو ناوچە پێی دەگووترێت (ئوستانی فارس) کە ناوچەیەکی بچووکە لەسەر کەنداو.

لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پ.ز وە بەڵگە مێژووییەکان کە سەبارەت میللەتە کۆنەکانی خەڵکی ناوچەکە لە ئارادان و یەکەمجار باسی فارسی تێدا کراوە، پشتگیری لەو ڕوانگەیە دەکەن. پاشتر لە سەردەمی یۆنانەکاندا جوگرافیناس و مێژوونوسەکان، لەنێوانیاندا سترابۆ و هیرۆدۆت، هەر هەمان ناوچە بە وڵاتی فارسەکان دەزانن کە ئاشوریەکان باسیان لێوەکردووە. سترابۆ لە نزیکی سەدەی یەکەمی زاییندا دەڵێت "ناوچەی سەرەکی نیشتەجێی فارسەکان لەسەر کەنداوی فارسی بوو لەبەر ئەوەی کە فارسەکان زیاتر لە خوارو تر دەژیان وەک لە بابلی و سوسیەکان (Susii). بەڵام دوای شکاندنی میدەکان ناوچەیەکی زۆریان گرت لەو وڵاتانەی سەر سنوری وڵاتی میدەکان" (Strabo, 1856, p.266). کەواتە هەتاوەکو سەدەی یەکەمیش دوای ئەوپەڕی فراوانبوونی دەسەڵاتیان، فارسەکان تازە توزێک هاتوونەتە سەروترەوە بەرەو سنووری وڵاتەکانی دەوروبەری وڵاتی میدەکان، دەنا هەر لەسەر کەنداودا ژیاون و هەر نیشتەجێی (ئوستانی فارس) ی ئیمڕۆ بوون. ئەم نەخشەیە هەتاوەکو سەردەمی هاتنی عەرەبەکان بەردەوام بووە، بۆیە دەبینرێت کە هەموو مێژوو نووسە ئیسلامیەکان هەمان ناوچەیان بە وڵاتی فارس (بلاد الفارس) ناو بردوە. بێگومان ئەوەش بەڕوونی لە نەخشەکانی مەحمود کاشغەری (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١) و چەندین نەخشەی سەردەمی ئیسلامدا دەبینرێت. دووبارە و چەندبارە بوونەوەی ئەو ڕوانگەیە لە سەرچاوە و لە سەردەمی جیاوازدا، ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێت کە ئەو ناوچەیەی لەسەرەتادا لەلایەن ئاشوریەکانەوە بە پارسوامیش ناوبراوە، هەر هەمان ناوچەیە کە لە سەردەمی ئیسلامدا بە (بلاد الفارس) ناسراوە و ئەمڕۆ بوومتە (ئوستانی فارس) و ئەوە وڵاتی فارسەکان بووە.

هەندێک لە مێژوونوسان، قەلەمڕەوی دەسەڵاتی پادشایی و ناوچەی ڕەگەزیی نەتەوەکان تێکەڵ دەکەن. بۆ نموونە لە دوای سەرکەوتنی فارسەکان بەسەر میدەکاندا، دەوڵەتی میدی کۆتایی نەهات، بەڵکو دەوڵەتی فارس بوو بە دەوڵەتی دەسەڵاتداری بەهێزتری ناوچەکە و پاشاکەشیان بووە پاشای پاشاکان. واتە دەسەڵاتی بەسەر پاشای ناوچەکانی تردا هەبوو، ئەو دەسەڵاتەش بەپێی ئاستی هێزی پاشاکە دەستنیشان دەکرا. پابەندی پاشا بچووکەکان بریتی بووە لە باجدان و ناردنی سوپا و هەر کەسە بەپێی توانای دەوڵەتەکەی پابەندی خۆی خستۆتە ڕوو. بۆ نموونە لە سەردەمی بەهێزبوونی دەوڵەتی ئەخامەنی فارسیدا، فارسەکان هەتاوەکو یۆنان باجیان وەرگرتووە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دانیشتوانی ئەو ناوچانە هەتا یۆنان هەمووی فارس بوون، بەڵکو تەنها ئەوەیە کە پاشاکانی ناوچەکە قبوڵی پاشایەکیان بە گەورەترین پاشا کردووە و ملکەچییان کردووە.

**کاریگەریەکانی بەهەڵە بەکارهێنانی دەستەواژەی (فارس) لەسەر مێژووی کورد و ناوچەکە:**

یەکێک لە ڕووداوە گرنگەکانی مێژووی یۆنانەکان سەرکەوتنیان بوو بەسەر دەوڵەتی فارسەکان دا . ئەمە بەسەرهاتێک بوو کە چەندین ساڵ لە ناو یۆنانەکان و دوایی لە ناو نەتەوەکانی تری ئەوروپادا دەگێڕدرایەوە. بۆیە ئەوروپیەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئەگەر کەسیان لە ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەراست نەناسیایە، فارسەکانیان دەناسی. هەر ئەمەش بوومتە هۆی ئەوەی کە ئەوروپییەکان، هەندێک جار هاوشێوەی ئاماژەکردنی کورد بۆ فەرەنگ، دەستەواژەی فارس بۆ هەموو نەتەوە و وڵاتەکانی ناوچەکە بەکاربێنن. بۆیە ئەگەر سەرنجی کتێبە ئەوروپیەکانی سەدەی حەڤدە و هەژدەی ئەوروپا بدرێت، دەبینرێت کە لە ئاماژە دا بە رابردووی ناوچەی کوردستان ،لە سەدەکانی یەکەم و دووهەمی زاییندا، وای باس دەکەن کە ئەو ناوچەیە لە ڕابردوودا هەمووی فارس بووبێت. بێ ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی سەبارەت بەوە هەبێت.

لە کاتێکدا لە سەدەی پێنجەمی پێش زایینەوە یۆنانەکان بە ڕوونی خەڵکە جیاوازەکان و ناوچە جیاوازەکان باس دەکەن و وڵاتی فارسیان هەر بەو ناوچەیەی ئەمڕۆی ئوستانی فارس باسکردوە و لە ناو سەرچاوە ئیسلامیەکانیشدا هەر بە هەمان شێوە بووە. هەروەها لە سەرچاوە مێژووییەکان و لە ڕووداوەکانی پەیوەست بە ڕۆم و کڵێساکانی ناوچەکەدا ئاماژە بە پاشا کوردەکانی وەک هەزەبانی، میدی، کوردیانی، شانبەشانی پاشای فارس و پاشای ئەشکانی، پێکەوە دەکرێت. کەچی لە سەردەمی نوێدا ناوی هەموو ئەو پاشایانە سڕاوەتەوە و هەموو رابردوویان لە ناوێکی ئەفسانەییدا توێنراوەتەوە و هەموو شتێک کراوەتە (فارس Persian). بەو شێوەیە لە دوای سەدەکانی ناوەڕاستەوە لە کتێبە ئەورووپییەکاندا ئەو وشەیە مانای خۆی لە دەستداوە و زۆر جار بۆ هەموو خەڵکی ناوچەکە بەکارهاتووە. جا لەبەر ئەوەی کە زۆربەی تێکست و سەرچاوەکانی مێژوو لەسەردەمی نوێدا لەلایەن خۆرئاواوە نوسراوە، ئەم ناوهێنانە زۆرجار دەبێتە مایەی سەرلێشێوان بۆ مێژوونوسێکی خۆرهەڵاتی. وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا هۆی سەرەکی تێکدانی مانای (فارس) بۆ ئەوە دەگڕێتەوە کە ئەورووپیەکان لە سەدەی هەژدەهەمەوە لە ڕابردووی خۆیان دەگەڕان و لەگەڵ پرۆسەی گەڕانەکەدا کۆمەڵێک ئەفسانەیان بە دەوری ئاریەکاندا داهێنا کە لە هەموو پرەنسیپێکی مێژوو دوور بوو. بۆ پشتگیری کردن لە ئەفسانەی ئاریەکان ئەورووپیەکان نەتەوەی فارسیان لە هەموو مانایەکی مێژوویی دەرکرد و کردیانە نەتەوەیەکی ئەفسانەیی. ئەم بۆچوونە ئەفسانەیی و هەڵەیە کاریگەری لەسەر هەموو تۆمارە مێژووییەکان هەیە، بۆ نموونە فەیلەسوف و سۆفیگەری وەک سورەبەردی/سورەوەردی (سوهرەوەردی)[161] کە کوردە، لە کتێبە ئەورووپیەکاندا بە فارس ناوی دەبەن، لە کاتێکدا کە هەتاوەکو ئەمڕۆش ناوچەی سورەوەرد هەر کوردن و ناوەکەش کوردیە. هەڵبەت کە مێژوونوسی ئەورووپی هیچ بەڵگەیەکی نیە کە سورەوەردی فارس بێت، بەڵام لەوانەیە ئەوان مەبەستیان لە وڵاتی ئێران بێت، لەبەر ئەوەی بۆ ئەوان، فارس و ئێران و ناوچەکە هەمووی تێکەڵ کراوە بێ ئەوەی لە ڕاستیدا وابێت.

هەموو بەڵگەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە سورەوەردی کوردە، تەنانەت سورەوەردیەکی تریش هەیە کە کەموزیاد هاوسەردەمی سورەوەردی سۆفیە، شیعری کوردی لێ بەجێماوە (بۆرەکەیی، ١٩٩٦). هەروەها شەمسەدینی شارەزوری کە یەکێک بووە لە هاوڕێ نزیکەکانی سورەوەردی و پاشتر پەرەی بە فەلسەفە و بە ڕێڕەوی سورەوەردی دا کورد بووە. هەروەها سورەوەردی زۆربەی ژیانی لە ناوچەکانی کوردستان

---

[161]. ئەم زانایە ناوی شەهابەدین یەحیا کوڕی حەبەش کوڕی ئەمیرەک بووە و بە سورەوەردی ناسراوە و لە نێوان ساڵانی (١١٥٣ ز- ١١٩١ز) دا ژیاوە. لەبەر ئەوەی خەڵکی سورەورد بووە کە گوندێکە سەر بە ناوچەی زەنجانی ئەمڕۆی ئێران و بە درێژایی مێژوو گوندێکی کوردی بووە. هەندێک جار ناوەکەی تێکەڵ بە سێ زانای تری سورەوەردی دەکرێت کە ئەوانیش کەسایەتی گرنگی کورد بوون. ئەم زانایە خوێندنی منداڵی لە سورەورد تەواو کردووە و دوایی چووەتە شارەکانی وەک ئەسفەهان و مەراغە. یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانی فخرەدینی ماردینی بووە کە کۆڕی فەلسەفی زۆر لە نێوانیاندا هەبووە. هەروەها شەمسەدینی شارەزوری هاوڕێ و دۆستی نزیک و قوتابی بووە و دوای مردنی خۆی ئەو بەردەوامی بە بیروباوەڕەکانی داوە . ئەم زانایە زۆر بە ناوچە جیاوازەکانی کوردستاندا گەڕاوە و سەردەمێکی زۆری ژیانی لە شاری دیاربەکر بردۆتە سەر. دوایی ڕووی کردۆتە حەلەب و لە دیوەخانی مەلیک زاهیری ئەیوبی کوڕی سەڵاحەدین ماوەتەوە. شارەزاییەکی زۆری هەبووە لە فەلسەفە و دیندا و چەندین کتێبی نووسیوە. لەو ماوەیەی کە لە لای کوڕی سەڵاحەدین بووە بەهۆی ئەوەی کە شوێنی لای ئەو پاشایە زۆر بەرزکراوەتەوە، نەیارێکی زۆری بۆ دروست بووە و وەڵامیان ناردووە بۆ سەلاحەدین کە گوایە ئەگەر سورەوەردی بمێنێت، ئەوا بڕوای ئاینی کوڕەکەی سەلاحەدین تێک دەچێت. لە ئەنجامدا سەلاحەدین فەرمانی بە کوڕەکەی دا کە لە ناوی بەرێت و بەو جۆرە لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا کوژرا، بۆیە ئەمڕۆ هەندێک جار بە پیری کوژراو (شیخ المقتول) ناسراوە. سورەوەردی بە یەکێک لەو کەسانە دادەنرێت کە فەلسەفە و تەسەوفی لە نووسینەکانیدا بەیەکەوە ناوێتەکردووە (الدکتور محمود محمد علي محمد ، ١٩٩٩، پ.٢٤ و ٣٢). لەو تەمەنە کورتەیدا بووەتە خاوەنی ڕێچکەیەکی سوفیگەری کە بە سورەوەردی ناسراوە و کۆمەڵێک کتێبی زۆری لێ بەجێماوە. سورەوەردی ناوێکی کوردیە و هەردوو مانای ((سورەوەردی) سورە بەردی، (سورەوەردی) زەوی کێڵراوی سور) ی هەیە.

بەسەر بردووە. بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە ئەورووپییەکان هەر کەسێک ئەگەر بە فارسی نوسیبێتی ئەوان دەستبەجێ بە فارسیان لە قەڵەم داوە. ئەوان بە ڕەوای دەزانن، بە بێ هیچ بەڵگەیەک، کەسایەتیەکی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە فارس لە قەڵەم بدەن، بەڵام ئەگەر کەسێک بە کورد باسبکرێت، ئەوا دەبێت چەندین بەڵگە بخرێتە ڕوو و زۆر بەدەگمەنیش باسی کەسایەتیەک بە کورد دەکەن، ئەوان دەڵێن بنەچەی کەسەکە کوردە و هەمیشە گومانێکی لەسەر بەجێ دەهێڵن. وەکو ئەوەی کە تەنها فارس بۆی هەبێت خاوەنی کەسایەتی بێت. بێگومان وەک پێشتر باسکرا ئەمە جۆرێکە لە (جوملەکردنی) مێژوو و ڕابردووی خەڵکی ناوچەکە و نارێزیەکە بەرامبەر نەتەوەکانی تر. شایانی باسە، ئەورووپییەکان بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ مێژووی خۆیان ناکەن، بۆ نموونە (بێرنارد شۆ، جەیمس جۆیس) کە بە ڕەگەز ئیرلەندی بوون و بەدرێژایی ژیانیان بە زمانی ئینگلیزی نووسیویانە هەرگیز یەک وشەیان بە زمانی ئیرلەندی نەنووسیوە، هەر بە ئیرلەندی لە قەڵەم دەدرێن و هەرگیز بە ئینگلیز ناو نەبراون.

ڕێچکەی ئەورووپییەکان سەبارەت بە ناوهێنانی (فارس) لە کتێبە مێژووییەکانیاندا، تەمومژێکی وای دروست کردوە کە زۆر زەحمەت بێت بێ ڕەچاوکردنی ئەم کێشەیە، بە متمانە بە سەرچاوە ئەورووپییەکان بتوانرێت مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕوونبکرێتەوە و مێژووی کوردستان بنووسرێت. لەبەر ئەوەی مێژووەکە لە چوارچێوەی ئەو دەستەواژە دروستکراوەدا توێنراوەتەوە بێ ئەوەی کە ڕاستیەکی مێژوویی لە پشتەوە بێت. ئایا دەکرێت کە بە نەتەوەکانی ئەڵمان و فەرەنسی و ئیسپانی و ئیتاڵی و پورتوگاڵی بگووترێت ڕۆمان و مێژووی هەموویان لە چوارچێوەی ڕۆمانەکاندا بتوێنرێتەوە؟ یان بگووترێت ئەڵمانەکان مێژوویان نەبووە لەبەر ئەوەی کە ناوی ڕۆمەکان لەو ناوچەیەدا هاتووە؟ لەوانەیە ڕۆمەکان کاریگەریەکی فەرهەنگی تەواویان لەسەر نەتەوە ئەورووپییەکان و زمانەکەیان هەبووبێت، بەڵام فارس نە فەرهەنگ و نە زمانی ئەو کاریگەریەی نەبووە و بگرە بەشێکی زۆری فەرهەنگ و زمانەکەی لە نەتەوەکانی ناوچەکە وەرگرتووە. کەچی لە ئەورووپا بۆ کارئاسانی خۆیان ناوێکی گشتی وەک (فارس) داهێنراوە و مێژووی زمان و نەتەوەکانی ئەو ناوچەیە لە چوارچێوەی ئەو ناوانەدا، بە تەواوی تێکدراوە.

هەتاوەکو ئەمڕۆ کەس نەیتوانیوە بە تەواوی مێژووی کورد بنووسێت، لەبەر ئەوەی کە لە ژێر چەتری ناوی فارسدا کورد بزر کراوە و سەرچاوە مێژووییەکان کە زۆربەیان ئەورووپین نەتەوەیەکی ئەفسانەیی تێدا دروستکراوە کە هەموو مانای مێژووی ناوچەکەی تێک داوە. بۆ مێژوونوسێکی کورد یان ناکورد، گەر نەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و دەرک بەو ڕاستیە نەکات ئەوا مەحاڵە کە بتوانێت مێژووی کورد بنووسێتەوە و لە ڕاستیەکان تێ بگات.

### ٤- کێشەی تێکەڵکردنی ناوی ئێران

ناوی ئێران، دەستەواژەیەکی ترە کە دیسان دەبێتە کێشە بۆ مێژوو نوسان و بۆ کەسانی تریش کە بیانەوێت لە مێژووی خەڵکی ناوچەکە بگەن. لە بنەڕەتدا دەستەواژەی ئێران بە دوو مەبەست بەکار دەهێنرێت، یەکەمیان بۆ ئاماژەکردنە بە ناوی دەوڵەتێک کە ئێستا بە ئێران ناسراوە و دووهەمیان ناوێکە کە زمانەوانەکان دایان ناوە بۆ ئاماژەکردن بە گروپێکی زمان کە زمانەکانی کوردی، فارسی، پەهلەوی، بەلوجی، گێلەکی، تالیش... هتد دەگرێتە خۆ.

زۆر لە سەرچاوەکانی سەر بە وڵاتی ئێرانی ئەمڕۆ، دەڵێن ناوی ئێران (Iran) لە بنەڕەتەوە لە (Aryan) وە هاتووە کە پێک هاتووە لە (Ar+yan) واتە وڵاتی ئاری. بەڵام ئەگەر بەو لۆژیکە سەیری ناوی عێراق (Iraq) بکرێت، کە عەرەبەکان پیتی یەکەمیان کردۆتە (ع) ، دەبێت ناوی ئەو وڵاتەش لە بنەڕەتدا لە (Ar+ak) پێکهاتبێت. واتا هاوشێوەیە لەگەڵ ناوی (Iran) و ناوەکەی ئەویش لە وشەی ir دا هاوبەشە و پەیوەندی بە ئاریەوە هەیە. کەچی ئەمڕۆ سەرچاوە مێژووییەکان بێ بوونی یەک بەڵگەی مێژوویی زۆر جار هەوڵ دەدەن ئەفسانەی میللەتی ئاری ببەستنەوە بە ناوی ئێرانی ئەمڕۆوە. بەڵام لە کاتێکدا کە نەتەوەی ئاریەکان وەک نەتەوەی ڕەچەڵەک بریتی بێت لە ئەفسانەیەک ئیتر چۆن دەتوانرێت و لەسەر کام بناغە ئەو پەیوەندیە بسەلمێنرێت؟

لەڕاستیدا هیچ بەڵگەیەک نیە کە پشتگیری لەو بۆچوونە بکات کە ناوی "ئێران" ی ئەمڕۆ پەیوەندی بە ناوی نەتەوەی ئەفسانەیی ئاریاوە هەبێت. لە سەردەمی حوکمی سۆمەری و ئاشوری و میدی و ئەخامەنی و ئەشکانیدا و هەروەها بە درێژایی سەردەمی یۆنانەکان و ڕۆمانەکانیش، واتە تا سەرەتای سەدەکانی زایینی، ئەو وڵاتەی کە ئێستاکە ئەو ناوەی هەیە، بە هیچ شێوەیەک ناوی ئێران نەبووە و بەو ناوە نەناسراوە و لە هیچ نەخشەیەک و تێکستێکی ئەو سەردەمانەدا کە ئاماژەی پێکرا ئەو وڵاتە بەم شێوەیەی ئەمڕۆ باس نەکراوە و بەڵگەیەکیش نیە کە پشتگیری لێ بکات.
لە کاتێکدا کە کوردستان لە سەدەی چوارەمی زایینەوە وەک کیانێک سەیرکراوە (بڕوانە جوگرافیای کوردستان)، یەک بەڵگەی یۆنان و ڕۆمان نیە کە نیشانی بدات کیانێک هەبووە بە ناوی ئێرانەوە. کەواتە ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە ناوەکە ناوێکی نوێیە و لە سەرچاوە مێژووییە دێرینەکاندا ئاماژەی پێ نەکراوە.
هەڵبەت لە مێژوودا ناوچەیەک لە لایەن یۆنانەکانەوە بە ئاریانە (Ariana) و ئاریا (Aria) ئاماژەی پێکراوە (بڕوانە نەخشەی ١٣)، بەڵام ئەو ناوچەیە بریتیە لە دەڤەرێک لای خوراسان (Gibb, 1954, p.210)، واتە بەشێکی زۆر کەمی ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی ئێرانی ئەمڕۆی گرتوتەوە. بۆ یەکەم جار لە سەرچاوەی خەڵکی ناوچەکە خۆی لە سەدەی سێهەمی زاییندا وُ لە سەردەمی ساسانیەکاندا ناوی (ئێران) بە مانای شوێنێک لەم خاکەی ئەمڕۆ هێنرایە کایەوە بەشێوەی (ایران شهر)، بێ ئەوەی کە بزانرێت لەو سەردەمەدا بە چ مانایەک و بۆچی ئەو ناوە بەکار هات و لەلای ئەوان مەبەست لێی کوێ بووە.
هەندێک لە سەرچاوە مێژووییە ئیسلامیەکان ئەو کێشەیە بە تەواوی یەکلادەکەنەوە و دەیسەلمێنن کە ناوی ئێران ئاماژە بووە بە ناوچەیەکی زۆر بچووکی خراسان و بگرە ئەو ناوە تەنها بۆ ئاماژەکردن بۆ یەک شار بەکارهاتووە. مەسعودی باسی ئێران دەکات وەک ناوچەیەکی بەرتەسکی بچووک کە شانبەشانی ناوچەکانی خوراسان و طبرستان (مازندران) بووە (مسعودي، ٢٠١١، پ.٧٥ و ٧٦). ئەم بۆچوونەی مەسعودی لەگەڵ بۆچوونی ئیبن ئەسیردا یەگ دەگرێتەوە کە لە سەدەی دوانزەهەمدا و لە کتێبەکەیدا سەبارەت بە مێژووی ناوچەکە، لە ئاماژە بە ناوچەیەکدا دەڵێت "کاتێک کە گەیشتە شاری ئێران (ایران شهر) کە ئەوە بریتیە لە نیساپور (نیشاپور)" (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ.١٤٠). ئەمڕۆ نیشاپور شارێکە لە نزیک مەشهەد و دەکەوێتە ئوستانی خوراسانەوە، کە بە ڕوونی بۆچوونی مێژوونوسە یۆنانەکان سەبارەت بە (ئاریا) و ڕوونکردنەوەی مێژوونوسە ئیسلامیەکان لە پێناسەکردنی وڵاتی ئێراندا ڕوونە و هەرگیز لە دەڤەرێکی بچووک زیاتر نەبووە. لە ڕاستیدا سەرەتا ناوەکە بۆ شاری نیشاپور بەکارهاتووە و دوایی مێژوو نوسە فارسەکان لە دوای سەدەی دەیەمی زایینەوە ویستویانە ئەو ناوە بۆ ئاماژەکردن بە ڕابردووی دەسەڵاتی سیاسی ئەشکانیەکان کە نەتەوەیەکی تر بوون، بیکەنە هی خۆیان. پێش هاتنی دەوڵەتی ساسانی، ئەشکانیەکان لە سەردەمێکدا قەڵەمڕەوی دەسەلاتیان هەتاوەک و بابل و کوردستان دەڕۆیشت، واتە باج وەرگرتنیان هەتاوەکو ئەو دەڤەرە دەڕۆیی. بەڵام نەتەوەیەک نیە لە مێژوودا بە ناوی نەتەوە و وڵاتی ئێران بەم مانایەی ئەمڕۆ. بۆیە ئەو کیانەش کە فارسەکان ویستویانە دروستی بکەن بە هیچ جۆرێک کیانێکی نەتەوەیی و ڕەنگدانەوەی فەرهەنگ یان زمانێکی یکگرتوو نەبووە، بەڵکو تەنها فارسەکان ویستویانە بەکاری بهێنن بۆ ئاماژە بە قەڵەمڕەوی ئەشکانیەکان کە خۆیان فارس نەبوون و نەتەوەیەکی جیاواز بوون. ئەم بۆچوونەش تەنها لای خۆیان دروست بووە و بناغەی مێژوویی نەبووە.
هەڵبەتە لە شیعری فیردەوسی و چەند شاعیرێکی سەدەکانی نۆهەمی زایینەوە ناوی ئێران هێنراوە و هەندێک لە مێژوونوسە ئیسلامیەکانیش ناویان هێناوە، بەڵام دیسان بێ ئەوەی کە بزانرێت بە ڕوونی جوگرافیای ئەو وڵاتە چۆنە و مەبەست لێی کوێیە و هەر یەکە لە مێژوونوسەکان بۆچوونی جیاواز دەخەنە ڕوو. لە دوای دروستبوونی سەفەویەکان و لە سەدەی شانزەیەمی زایینەوە زیاتر ئەم ناوە بەکارهاتووە بۆ ئاماژەکردن بە ناوچەیەک کە لە ئەنجامی قەڵەمڕەوی دوو هێزی نوێی عوسمانی و سەفەویدا پەیدا بووە نەک ئەوەی کە ئێرانی ئەمڕۆ لە ڕابردوودا بەم شێوە جوگرافیەی ناسرابێت و ئەم وڵاتە بەم شێوەیەی کە هەیە، هیچ پێشینەیەکی مێژوویی هەبێت. واتە نەخشەی جوگرافیی ئێرانی ئەمڕۆ لە دوای سەفەویەکانەوە دروست بووە، لە ئەنجامی بەربەرەکانی دەسەڵاتی نێوان ئەو دوو دەوڵەتە. خەڵکانی وەک ئیبن حەوقەل و ئەستەخری و کاشغەری چەندین نەخشەی ناوچەکەیان کردووە و هەرگیز وڵاتی ئێرانیان لە نەخشەکانیاندا

نەخستوتە ڕوو، بەڵام وڵاتی فارس کە ئوستانی فارسە، بە ڕوونی لە زۆربەی نەخشە ئیسلامیەکاندا ڕوونە. ئەوەی ئەمڕۆ دروست کراوە و باسی لێوە دەکرێت، هەوڵی سیاسیە بۆ ماناداں بەم نەخشە سیاسیەی کە پێک هاتووە لە ئەنجامی سنووری سیاسی و دەسەڵاتی نێوان عوسمانی و سەفەوی.
وەک لە بەشی زمانیشدا باسکرا ناوی (ئێرانی) بۆ لقەگرووپی زمانە زاگرۆسی (ئێرانی) مکان بەکاردەهێنرێت. زمانی کوردی دەکەوێتە ناو ئەو لقە گروپە کە لێکۆڵەرەکان ناوی زمانە (ئێرانیەکان) یان بۆ داناوە؛ وەک چۆن بۆ زمانی ئینگلیزی، ئەڵمانی، دانیمارکی، سویدی، نەرویجی، ئایسلەندی، ناوی گروپی زمانە ئەڵمانیەکان (Germanic Languages) دانراوە. لەبەر ئەوەی کە هەموویان سەر بە یەک گروپن و زمانی کوردی لەگەڵ گروپەکەیدا هاوبەشی هەیە. بۆ نموونە کە ناوی ئەڵمانی هەڵبژێردراوە مەبەست لەوە نیە کە سویدی ئەڵمانی بێت، بەڵکو زمانی سویدی بەشێکە لە گروپێکی زمان کە زمانەوانەکان ناوی جێرمانیک-یان بۆ هەڵبژاردووە. هەڵبەت ناوەکە هیچ لە جیاوازی نەتەوەکان ناگۆڕێت، بۆیە دەشکرا ناو بنرێت (زمانە باکوریەکان، زمانە ئەوروپیە باکوریەکان) یان هەر ناوێکی تر. بۆ نمونە خێزانی زمانە سامیەکان کە کۆمەڵێک زمان لەخۆ دەگرێت، لەوانە عەرەبی، عیبری، هەمبەری و ...هتد، ناوەکە هیچ پەیوەندیەکی نە بە ڕەگەز نە بە وڵاتی یەکێک لە نەتەوەکانەوە نیە، بەڵکو تەنها بریتیە لە ئاماژەکردن بە پەیوەندیەکی نزیکی زمانەوانی لە روی وشەکاری و ڕێزمانیەوە.
ئەم گروپە زمانەوانیەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن "ئێرانی" بە هەمان شێوە ناوێکە و دەکرا ناو بنرایە "گروپە زاگرۆسیەکان"، "گروپە خۆرهەلاتیەکان". جگە لەوەش دەستەواژەی ئێران خۆی زۆر نوێترە لەوەی کە بتوانێت ئاماژە بەو زمانانە بکات. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوانەی ئەو ناویان داناوە، وایان زانیوە کە لە بنەچەدا ئەو زمانانە لە ناوچەی ئێرانەوە هاتوون ئەو ناویان بۆ داناوە. ئەمڕۆ ناوی گروپی (ئێرانی) نەدەبووە کێشەیەک ئەگەر لە مانا مێژوویەکەی نەگۆڕیایە و لە مانا زمانەوانیەکەی لانەدرایە. بەڵام وەک هەزاران بەڵگەی زمانەوانی و مێژوویی ناو ئەم کتێبە ڕوونی کردەوە، "ئێران" و "ئێرانی" هیچ پەیوەندیەکی بە کوردەوە نیە. جگە لەوە بنەچەی ئەو لقە زمانە و زمانی کوردی نوێ لە کوردستان و مێسۆپۆتامیادا پەیدا بووە نەک لەو وڵاتەی کە ئەمڕۆ ناونراوە ئێران. ئەمڕۆ لە ئێراندا ئەم ناوە، زۆربەی جار کراوەتە ئامرازێکی سیاسی کە بۆ ماناداں بە نەخشەی ئێران و سەرلێشێوانی کورد و نەتەوەکانی تر بەکاردەهێنرێت. بە کورد دەڵێن "تۆ ئێرانیت"، ئەم جۆرە بەکارهێنانە، بەمەبەستی سیاسی و نەتەوەیی، دەیانەوێت ناوی ئاری و ئێرانی جوگرافی نوێ و ناوە زمانەوانیەکە تێکەڵ بکەن و سیاسەت و مێژوو بەهۆیەوە تێکەڵ بکەن.
لەبەر ئەو بەکارهێنانە نەگونجاوە، بە درێژایی ئەم کتێبە ناوەکە کراوەتە گروپی (زمانە زاگرۆسیەکان)، بۆ ئەوەی کە مانا سیاسی و ئەفسانییەکە لە لایەنی ئەکادیمی و زمانەوانی جیا بکرێتەوە و مانا مێژووییە دروستەکەی پێ بدرێتەوە. واتە لەبری ئەوەی کە بگوترێت کە کوردی زمانێکی ئێرانیە، دەتوانرێت بگووترێت زمانێکی زاگرۆسیە. دەبینرێت کە بە گۆڕینی ناوەکە هیچ لە مانا مێژوویی و ئەکادیمیەکەی کەم ناکاتەوە، بەڵکو بەرگە سیاسیەکەی لە کۆڵ دەکاتەوە. هەروەها ئەم گۆڕینی ناوە زیاتر و گونجاوتریش گوزارش لە بنەچەی زمانی کوردی دەکات کە ڕەگەکەی دەگەڕێتەوە بۆ زمانەکانی وەک سۆمەری، هوری، کاسی، لوڤی، ئیلامی، هیتی، لولوبی کە هەموویان بنەچەی دێرینیان هەر لە زاگرۆسەوە پەیدا بووە.
دەستەواژەی (ئێران) دەستەواژەیەکە زیاتر بۆ لایەنی سیاسی سوودی لێ وەرگیراوە و زۆر جار بووەتە هۆی ئەوەی کە تەمومژ بخاتە سەر ڕاستیە مێژووەکان. دەستەواژەکە هەمیشە ڕێگر بووە لەبەردەم لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی زانستی دوور لە کاریگەری سیاسی.

**٥- کێشەی سیاسی**

کوردستان ناوچەیەکی جوگرافی مێژووییە کە بە درێژایی هەزاران ساڵ کیانێکی دەرکێشراو بووە (بڕوانە جوگرافیای کوردستان) و زۆر دێرینترە لە زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە ئەمڕۆ لە خۆرهەلاتدا بوونیان هەیە. بەڵام لە سەرەتای سەدەی شانزەی زاینیەوە، وڵاتی کوردستان لە نێوان دوو دەوڵەتی نوێی ئێران و عوسمانیدا دابەشکرا. سەرەڕای ئەوە، هەمیشە دەسەلاتە کوردیە ناوچەییەکان نیمچە سەربەخۆ و

زۆرجاریش سەربەخۆ بوون و چەندین جاریش هەوڵی سەربەخۆیی گشتی دراوە. هەتاوەکو سەرەتای سەدەی بیستەم زۆر جار کورد لە نەتەوەی عەرەبی هاوسێی ئازاد تر و سەربەخۆ تر بووە. لە ساڵەکانی ١٩٢٠ دا پرۆسەی دابەشکردنی کوردستان دەستی پێکرد و نەخشەیەکی نوێ بۆ خۆرهەڵاتی ناوەڕاست دروستکرا کە هیچ پێشینەیەکی مێژوویی و جوگرافی نەبوو، جگە لە بەرژەوەندی بەریتانیا و فەرەنسا.
بەو جۆرە هێزە دەرەکیەکان کە ئەو دوو وڵاتە زلهێزە بوون، نەتەوەی کوردیان لە نەتەوەیەکی خاوەن دەسەڵاتەوە کردە نەتەوەیەکی ژێر دەستی میللەتەکانی تورک، عەرەب و فارس. پێشتر بە هیچ شێوەیەک کورد ژێر دەستەی هیچ کام لەو نەتەوانە نەبووە، بەڵکو هاوشێوەی نەتەوەکانی تری ئەو ناوچەیە بووە و بەشداری تەواوی لە پرۆسەی سیاسی ناوچەکەدا کردوە. دابەشکردنی کوردستان لەئەنجامی پرۆسەیەکی سروشتی گۆڕانکاری لە هێزەکانی ناوچەکەدا نەبووە، بەڵکو بەهۆی هاتنی هێزی دەرەکی ئەوروپییەوە و لە ڕێگەی سەپاندنی نەخشەیەکی بێ پێشینەی مێژووییەوە ئەم دابەشکردنە ڕوویداوە.
لەو کاتەوە کوردستان خراوەتە ناو نەخشەیەکی سیاسی نوێ و بەسەر چوار دەوڵەتدا دابەشکراوە، ئیتر لەو دەمەوە، لەو وڵاتانەدا کە کوردستانیان بەسەردا دابەشکراوە، نووسینەوەی مێژووی ناوچەکە بە ئاراستەی خزمەتکردنی ئەو نەخشە نوێیەدا براوە. بەئاشکرا دەبینرێت کە دەزگا ئەکادیمیەکانی ئەو وڵاتانە هەر یەکەیان مێژوویەک لە ڕوانگەی بەرژەوەندی تایبەت و سیاسی خۆیەوە دەنووسێتەوە، بە هەمان ئاراستەی خزمەتکردن و مانا دان بەو نەخشە کێشراوەی کە زلهێزەکان کێشاویانە.
کاردانەوەی پراکتیزەکردنی ئەم سیاسەتە بووەتە هۆی ئەوەی کە لە وڵاتی ئێران و لە سەردەمی شای ئێراندا بگوترێت "زمانی کوردی پاکترین زاراوەی فارسیە"، هەرچەندە ئەمڕۆ ئەوە نالێن بەڵام هەتا ئێستاش کورد وەک خێڵ باس دەکەن و بە نەتەوەی دانانێن. بۆ نمونە زەبیحوڵای سەفا (١٩١١ ز-١٩٩٩ز) کە لە سەدەی ڕابردوودا پرۆفسیۆری زانکۆی تاران بووە، لە باسی ناوی شاعیرێکی سەردەمی سەفاریەکان (Saffarids صفاریان[162]) بە ناوی بەسام-ی کورد (BASSĀM-e KORD)، دەڵێت "نازناوی "کۆرد" (Kord) (لە کتێبی مێژووی سیستان (تاریخ سیستان) دا بە شێوەی "کورد" نوسراوە) مەبەست لێی "شوان" بووە و لەوە ناچێت کە هیچ پەیوەندیەکی بە خێڵە خۆرئاواییە ئێرانیەکانەوە هەبێت کە بە کوردەکان دەناسرێن" (Safa, 1988). دەبینرێت سەفا بێ هیچ ڕوونکردنەوە و دەرخستنی سەرچاوەیەک، مانای شوان بە نازناوی شاعیرەکە دەدات کە (کورد) بووە و لە مانای نەتەوەییەوە دەیکاتە شوان. لە هەمان کاتدا سەفا لەبەردەوامی ئەو سیستمی بیرکردنەوەیەدا، کورد بەنەتەوە نازانێت و تەنها بە خێڵی ئێرانی باسیان دەکات.
هەڵبەت ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە تەنها لەلای زەبیحوڵای سەفا نیە، بەڵکو لای زۆرێک لە مێژوونوسە فارسەکان، تەنها فارس مافی نەتەوە بوونی هەیە و هەر ئەوان نەتەوەن. ئەو نازناوەی کە بەسام-ی کورد بەکاری هێناوە و ئاغای سەفا بە دڵنیاییەوە بە ڕەوای نازانێت کە کورد بوویێت و بە مانای (شوان) لێکی دەداتەوە، لەلایەن سەدان گەورە پاشای کورد و کەسایەتی ئاینی و ئەدەبی کورد، لەگەڵ ناوەکەیاندا بەکارهاتووە. جا ئەگەر بە لۆژیکی بۆچونەکەی سەفا ئەو نازناوە لێکبدرێتەوە، دەبێت هەموو میرە کوردەکان خۆیان بە شوان زانیبێت و شاعیری مەزنی کورد، نیزامی گەنجەوی[163]، دایکی خۆی بە سەرۆکی شوانەکان زانیبێت کاتێک دەڵێت "مادر من رئیسه کرد بود".

---

[162]. دەسەڵاتێکی ناوچەیی دەڤەری سیستان بووە و لە دوای سەدەی نۆهەمی زایینەوە حوکمی بەشێک لە ئێرانی ئەمڕۆیان کردووە.

[163]. نیزامی گەنجەوی (١١٤١ ز- ١٢٠٩ ز) شاعیرێکی گەورەی کوردە و خەڵکی گەنجەیە، کە دەکەوێتە کۆماری ئازەربایجانی ئەمڕۆوە و لە ڕابردوودا وڵاتی کورد بووە. نیزامی چەندین شاکاری لێ بەجێماوە و ئەو بەرهەمانەی کە لێی بەجێماون فارسین؛ نازانرێت کە ئایا شیعری کوردی هەبووە یان نا. هەندێک لە شاکارەکانی بریتین لە خەسرەو و شیرین، لەیل و مەجنون، ئەسکەندەرنامە، هتد. ئەم شاعیرە خۆی لە شیعرێکدا ئاماژە بە کورد بوونی خۆی دەکات و دەڵێت "مادر من رئیسه کرد بود " واتە "دایکم لە ئەشرافەکانی کورد بوو" یان "دایکم ناوی رەئیسەبوو کە کورد بوو". وا دەردەکەوێت هۆکاری باس نەکردنی باوکی ئەوەبێت کە هەر لە منداڵیدا باوکی مردوە و دایک و خاڵی بەخێویان کردووە. ئەم شاعیرە چەند جارێک ژنی هێناوە و جیا بووەتەوە، تەنها ژنی کە ئاماژەی پێ کردووە ئافاق (Afaq) بووە کە هەر وەک خۆی کورد بووە (Talattof and Clinton and Luther, 2000, p.2). نیزامی بە یەکێک لە شاعیرە هەرە ناسراوەکانی ئەدەبی فارسی دادەنرێت و دەوڵەتی ئازەربایجان

مۆسیقای کوردیش بەشی خۆی لە پیادەکردنی ئەو سیاسەتە پێ بەخشراوە، بۆیە ئەمڕۆ لە ئێراندا ئەو مۆسیقایە بە ناوچەیی (محلی) ناوی دەبەن. چونکە لای ئەوان مۆسیقای کوردی تەنها مۆسیقایەکی ناوچەییە و مۆسیقای فارسی مۆسیقای گشتی وتەواوە. زۆر جاریش ئەگەر ناچار بن باسی کەسایەتیەکی کوردی مێژوویی بکەن، بێگومان بە ئێرانی لە قەڵەمی دەدەن; ئەوش لە باسی (نیزامی شاعیر) دا دەبینرێت. بەڵام ئەگەر باسی حافزی شیرازی بکەن، هەر بە فارسی دەناسێنن. ئەم ڕێچکەی نوسینە لای مێژوونوسە فارسەکان وەک ستانداردی لێهاتووە و وای دەردەخات کە خۆیان بە ڕەگەزێکی تایبەت بزانن و نەتەوەکانی تر تەنها بە خێڵی ئێرانی و فەرهەنگەکەشیان فەرهەنگێکی لاوەکی ناوچەیی.

ئەو مێژووە ئەفسانەییەی کە فارسەکان بۆ خۆیان نووسیوە، لە ڕابردووشدا هەندێک جار مێژوونوسانی بێزار کردووە و بە ئاشکرا بۆچوونی خۆیان سەبارەتی ڕاشکاوانە خستۆتە ڕوو. مێژوونوسی گەورەی کورد، ئیبن ئەسیر، لە سەدەی دوانزەهەمدا سەبارەت بەو مێژووە ئەفسانەییەی کە فارسەکان بۆ خۆیان نوسیوە، لە باسکردنی مێژوویەکی ڕابردوودا کە فارسەکان باسیان لێوە کردووە دەڵێت "ئەمەشیان درۆیەک لە درۆ سارد و سڕەکانی تری فارسە، ئەوان درۆ و دەلەسەی لەوە سەیرتریان هەیە کە ئێمە وازمان لە باسکردنیان هێنا" (ابن الاثیر، ٢٠١٠، پ. ٢٤).

بەڵگە مێژووییەکان دەری دەخەن کە زۆر لە بۆچوونی فارسەکان سەبارەت بە کورد بە تەواوی پێچەوانەیە و هیچ مانایەکی مێژوویی نیە. لە وڵاتێکی دیموکراتیدا، ئەو جۆرە دەستەواژانەی هەندێک لە مێژوونوسەکانیان ئەمڕۆ بەکاری دەهێنن، دەکرێت هەموو تاکێکی کورد، بە تاوانی سوکایەتی پێکردن، نووسەرە ئێرانیەکانی پێ بداتە دادگا. لە تورکیادا هەموو شتێک بە تورک لە قەڵەم دەدرێت. تەنانەت هەندێک لە ئەکادیمیە تورکەکان ڕەچەڵەکی کورد دەگەڕێننەوە بۆ ئەو خێڵە تورکانەی کە لە ئاسیاوە هاتوونەتە کوردستان؛ نەک ئەوە بەڵکو ئەو بۆچوونە لە ناوەندە ئەکادیمیەکاندا بە جدی باسی لێوە دەکرێت (Özoglu,2004, p.25). هەندێک لە ئەکادیمیە تورکەکان زمانی سۆمەری و هەموو زمانە کۆنەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە ڕەچەڵەکی زمانی تورکی دادەنێن (Ergener, 2002).

(وێنەی ٣٤)
شاعیری کوردی سەدەی دوانزەهەمی زاینی، نیزامی گەنجەوی، لەسەر پارەی وڵاتی ئازەربایجان دانراوە.

لە کاتێکدا کە هاتنی تورکەکان لە مێژوومیەکی تا ڕادەیەک نوێدا ڕوویداوە و هەزاران سەرچاوە ئاماژەیان بە هاتنی تورکەکان کردووە و زۆربەیان وای بۆ دەچن کە لە دوای سەدەی دەهەمی زاینەوە ڕوویان کردۆتە ناوچەکە. بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەموو هەوڵێک لەو وڵاتەدا دەدرێت بۆ دروستکردنی ڕابردوویەکی ئەفسانەیی بۆ تورک لە ناوچەکەدا[164] و لە هەمان کاتدا سڕینەوەی رابردووی کورد لەسەر خاکی خۆی. لە

پەیکەری گەورەیان بۆ ئەو شاعیرە کردووە و وێنەی لەسەر پارەی ئەو وڵاتەش دانراوە (بڕوانە وێنەی ٣٤)، بۆیە ئەو دەوڵەتە هەوڵێکی زۆر دەدات کە بیکاتە تورک و چەند شیعرێکیان بۆ دروست کردووە بۆ ئەوەی ناسنامەی کوردی لەم شاعیرە مەزنە بستێننەوە.

[164]. هەردوو نەتەوەی تورک و هەنگاریەکان لە ڕووی زمانەوە یەک بنەچەیان هەیە و سەرچاوە مێژووییەکان بە ڕوونی باس لە هاتنی ئەو نەتەوانە دەکەن لە ئاسیاوە بۆ ناوچەکە، کەچی هەردووکیان لە هەوڵێکی زۆردان بۆ بەستنەوەی خۆیان بە

کاتێکدا کە لە ئێراندا ڕەحمێک بە کورد کراوە و بە خێڵی ئێرانی ناوی دەبەن، ئەوا لە تورکیادا زۆر جار بوونی کورد بە تەواوی ڕەتکراوەتەوە و لە کتێبە مێژووییەکاندا ئەوانیش بە خێڵی تورکی شاخاوی لە قەڵەم دەدەن. بۆیە لە تورکیادا، ئەگەرچی چەندین سەرچاوەی مێژوویی سەردەمی عوسمانی تێدایە کە دەتوانێت زۆر لایەنی مێژوویی ڕوونبکاتەوە، بەلام لەو ژینگە ناهەموارەدا بۆ لێکۆڵینەوە، زۆر زەحمەتە کە بتوانرێت لێکۆڵینەوەی مێژوویی دوور لە هەستی دەمارگیری ئەنجام بدرێت. شایانی باسە کە هەتاوەکو نەوەدەکانی سەدەی بیستەم لە تورکیادا قسەکردن بە زمانی کوردی قەدەغە بووە و هەتاوەکو ئەمڕۆش وشەی "کوردستان" هەر قەدەغەیە.
تەنانەت ئەرمینیا کە وڵاتێکە چاوەڕوانی ئەوەی لێ ناکرێت ڕۆڵی لە تێکدانی مێژووی کورد دا هەبێت، کەچی بە ئاشکرا و بە مەبەستی سیاسی لەوێش چەندین هەوڵ دراوە بۆ تێکدانی ئەو مێژووە. یەکێک لەو لێکۆڵەرە ئێران ناسانەی کە هەوڵی بەو ئاڕاستەیەدا داوە، پرۆفیسۆرێکە بە ناوی گارنیک ئاساتریان (Garnik Asatrian). ئەم بەڕێزە لەگەڵ ئەوەی کە شارەزاییەکی باشی لە زمانەکانی ناوچەکەدا هەیە و چەندین لێکۆڵینەوەشی لەسەر کورد نوسیوە، کەچی سەرەڕای ئەوەی کە زمانی ئایینی و قسەکردنی ئێزدیەکان کوردیە، بەلام ئاساتریان بە کوردیان دانانێت. مەبەستی ئەو لێکۆڵەرە زۆر ڕوون و ئاشکرایە. لەلایەک هەموو هەوڵێک دەدات کە بیسەلمێنێت کە کورد لە باکوردا نەبووە و لە خوارەوە هاتووە و هاوبەشی خاکی لەگەڵ ئەرمەنیەکاندا نیە. لەلایەکی تریش دەیەوێت کوردە ئێزدیەکانی ئەرمینیا لە نەتەوەی کورد جودا بکاتەوە و لە ناو ئەرمینیادا بیانتوێنێتەوە، نەوەک لە داهاتودا ببنە کێشە بۆ ئەو وڵاتە. ئاساتریان سەرەڕای دەرخستنی چەندین سەرچاوەی ئەرمەنی سەبارەت بە کورد بوونی میدەکان، کەچی ئەو بە کوردیان نازانێت (Asatrian, 2009, Brill). ئەوەی جێی سەرنجە هەر ئەو ئێزدیانەی کە ئاساترین بە نەتەوەیەکی جیاواز لە کورد دایان دەنێت، عەرەبەکان، بەمەبەستی کەمکردنەوەی ژمارەی کورد لە عێراقی ئیمڕۆدا، هەوڵیان داوە بە عەرەبیان لە قەڵەم بدەن.
عەرەبەکان کە نەتەوەیەکن لە دوای ئیسلامەوە بەرەو عێراقی ئیمڕۆ و سوریا هاتوون، سەرەڕای ئەوەش هەتاوەکو سەدەی نۆهەمی زایینی کە عەرەب لەوپەڕی دەسەلاتدا بوو، لە نەخشە ئیسلامیەکاندا تەنها بەسرە و کوفە و بیابانەکانی سوریا بە وڵاتی عەرەب لە قەڵەم دراوە، بەلام ئەوان هەموو ڕۆژهەلاتی ناوەراست بە وڵاتی خۆیان دەزانن و هەر کەسێک بە زمانی عەرەبی نووسیبێتی بە عەرەبی لە قەڵەم دەدەن.
فاکتەری سیاسی، ڕۆڵێکی بنەڕەتی لە تێکدانی مێژووی کورد وکوردستاندا هەبووە و بۆتە هۆی ئەوەی کە هەندێک جار دەزگا ئەکادیمیە جیهانیەکانیش بکەونە ژێر ئەو کاریگەریە. بۆ نموونە وشەی (کۆشک)[165] کە لە کوردیدا هەیە و چووەتە زمانی ئینگلیزی و بووەتە kiosk، لە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد دا کە یەکێکە لە فەرهەنگە هەرە بەناوبانگە ئینگلیزیەکانی جیهان، دەڵێت وشە ئینگلیزیەکە لە فەرەنسی وەرگیراوە و ئەوانیش لە تورکی وەریان گرتووە، کەچی هەمان وشە لە زمانی پەهلەویدا هەیە و هەتاوەکو ئەمڕۆش ئەو وشەیە لە زمانی کوردیدا دەتوانرێت شیبکرێتەوە. ئایا دەشێت پەهلەویش لە تورکی وەری گرتبێت کە سەردەمانێک زمانی حوکمڕانی بووە کە تورک لە ناوچەکەدا هەر بوونیان نەبووە؟ یان وشەی Jackal ی ئینگلیزی کە لە کوردیدا دەبێتە (چەقەڵ) بە هەمان شێوە فەرهەنگی ئۆکسفۆرد دەڵێت لە تورکی وەرگیراوە.
بەو شێوەیە وەک ڕەنگدانەوەیەکی هەلومەرجی سیاسی کوردستان، ڕوانگەی دەزگا ئەکادیمیە جیهانیەکانیش ئەوەیە کە ئەوەی وڵاتی نەبێت ناتوانێت زمانەکەی ببێتە سەرچاوە و ئەوانیش نەیانتوانیوە خۆیان لە کاریگەری سیاسی بپارێزن.

---

سۆمەریەکانەوە. بە مەبەستی دروستکردنی رابردوویەک بۆ خۆیان لەسەر خاکێک کە لە رابردوودا تێیدا نەبوون، دەیانەوێت ئەو ڕاستیە مێژووییە بە هێنانەوەی بەڵگەی نادروست داپۆشن.
[165]. ئەم وشەیە لە کوردیدا شیکردنەوەی هەیە و پێکهاتووە لە (کۆ+ئێشک) واتە (هەمووی ئێشکی بۆ دەگیرێت/هەمووی دەپارێزرێت) کە لە لەگەڵ مانای وشەی (کۆشک) گونجاوە و وشەی (کۆ) لە بنەچەدا سۆمەریەوە و وشەی (ئێشک) هوریە (بروانە فەرهەنگی سۆمەری و هوری).

**٦- کێشەی ڕۆژهەڵاتناسەکان**

بناغەی مێژووی نوێی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لەلایەن ئەورووپییەکانەوە دارێژراوە. ئەوانیش پێش ئەوەی کە بێنە ناوچەکە و دەست بە نووسینەوەی ئەو مێژووە بکەنەوە، کۆمەڵێک زانیاری گشتییان سەبارەت بە چەند نەتەوەیەکی ئەو ناوچەیە هەبوو، لەوانە جوو، میدی، بابلی، ئاشوری، فارس. بێگومان بە پشت بەستن بەو زانیاریە کەمە و هەروەها لە ژێر کاریگەری سیاسەتی دارێژراوی حکومەتاکانیان و ڕەوتی فیکری ئەوروپا، ئاراستەی نوسینەکەیان بەو ڕێچکەیەدا بردووە.

مێژوونوس و کەسایەتی سەربازی ڕۆمانی، مارسیلینیۆس، لە سەدەی چوارەمی زاییندا کاتێک کە بە لای هەولێر و موسوڵدا دێت، دەڵێت جاران بەم ناوچەیەیان دەگووت ئاسوریا (بڕوانە جوگرافیای کوردستان). کە لەوێدا مەبەستی لە سەردەمی داگیرکردنی ناوچەکەیە لەلایەن ئاشوریەکانەوە، کەچی لە سەدەی هەژدە و نۆزدەی زاییندا هێشتا هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، نزیکی هەزار و چوار سەد ساڵ دوای ئەوەی مارسیلینیۆس چیتر پێی ناڵێت ئاشوریا، ئەوان بە هەڵە هەر بە ئاشوریا ناوی دەبەن. هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان ئا بەو جۆرە مێژووی ڕۆژهەلاتیان نووسیوە.

بۆیە دەبینرێت کە لێکۆڵەری ئینگلیز Claudius James Rich ، ناسراو بە میستەر ڕیچ، لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا جۆرە ڕوانگەیەکی نوسیوە کە بەلای کەمەوە جێگای ڕامان و سەرسوڕمانە. ئەم بەڕێزە خۆی لە کتێبەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە (Rich, 1836) کە ئەو سەبارەت بە زمانی کوردی و نەتەوەی کورد شتێکی ئەوتۆی نەزانیوە و هاتووە شارەزای کورد ببێت، کەچی سەرەڕای ئەو نەشارەزاییە، بێ هیچ بەڵگە و لێکۆڵینەوەیەک، وشە کوردیە ڕەسەنەکان بە فارسی تێکدراو لە قەڵەم دەدات. ئایا کەسێک کە هیچ لە زمانێک نەزانێت و شارەزای مێژووەکەی نەبێت چۆن ڕێگا بەخۆی دەدات کە ئەو جۆرە بۆچوونانە بخاتە ڕوو؟ بۆ نموونە سەبارەت با ناوی تانجەڕۆ (Tanjaro) دەڵێت ئەوە تێکدانی وشەی فارسی (تاج رود) ە، یان سەبارەت بە دێیەک لە نزیک شاری بانە بە ناوی (نوێژگە Nwezhga) وە، دەڵێت ئەو ناوە فارسیە و بریتیە لە (نمازگە) و لە کوردیدا تێکدراوە، بێ ئەوەی کە سەبارەت بە ڕەچەڵەکی ناوەکە و مێژووی ناوەکە و زمانی کوردی شتێکی ئەوتۆ بزانێت یان بەڵگەیەک بۆ پشتگیری بۆچونەکانی بە خوێنەر بدات. بێگومان ڕیچ ئاگادار نیە کە فارسەکان پیتی (ژ) ی کوردی دەکەنە (ز)، بۆنموونە ژن/زن، باژێر/بازار، ژنۆ/زنو هتد. ئەگەر وشەی (زان) بە نموونە وەربگرین، ڕەچەڵەکی ناوەکە سۆمەریە و لە میدی و پەهلەویشدا دووبارە بووەتەوە و لە کوردیدا وەک خۆی ماوە، بەڵام فارسەکان پیتی (ز) یان کردۆتە (د). دەبینرێت بەڵگەی هەزاران ساڵ هەیە کە بنەچەی وشەی (زا/زان)، بەهەردوو شێوەکەی لە کوردیدا ماوە، بەڵام لە فارسیدا تەنها (دان) هەیە، واتە فارسەکان ئەو وشەیان لە زمانەکانی ترەوە وەرگرتوە و گۆڕیویانە. دیارە ئەمە بەڵگەیەکە کە تەواو بۆچوونەکەی ڕیچ هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە دوایی کتێبەکەی ڕێچ بوو بە بناغە و سەرچاوە بۆ سەرەتای زۆرێک لە کاری لێکۆڵەرە ئینگلیز و ئەورپیەکان.

ڕیچ بێ ئەوەی کورد خۆی بناسێت و زانیاریەکی پتەوی لەسەر زمانی کوردی وزاراوەکانی هەبێت و بەبێ هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی، دەڵێت گۆرانەکان بە زاراوەیەکی تری کوردی قسە دەکەن و لە هەمان کاتدا هەندێک جار بە نەتەوە لە قەڵەمیان دەدا. هەروەها سەرەڕای ئەوەی کە دەڵێت گۆرانەکان بە کوردی قسە دەکەن، کەچی هەندێک جار بە خەڵکە ڕەعیەتەکە ناویان دەبات، بێ ئەوەی لەودیاردەیە بگات کە گۆرانەکان، وەکو هەموو کوردەکانی تر، چینی حوکمڕان و چینی ڕەعیەتیان هەیە. ڕیچ دەڵێت "خەڵکی کوردستان لە دوو ڕەگەزی جیاواز پێکهاتوون؛ یەکێکیان ئەوانەن کە خێڵ پێک دەهێنن، ئەوی تریان بریتیە لە ڕەعیەت یان گۆران" (Rich, 1836, p.80). ڕیچ لەم بۆچوونەیدا زۆر هەڵە بووە، لەبەر ئەوەی کە گۆرانەکان تەنها لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی بابانەکاندا حوکمران نەبوون، بەڵکو لە ناوچەکانی تری کوردستاندا، وەک کرماشان و هەمەدان، لە سەردەمی میستەر ڕێچ و پێشتریش، بە درێژایی مێژوو خاوەن دەسەڵات بوون و مێژوو نوسان ئاماژەیان پێ کردوون. بەڵام ئەم بۆچوونە بێ بناغەیەی ڕیچ، لەلایەن مەکەنزی و مینۆرسکیەوە دووبارە کراوەتەوە و بێ ئاگاییان لە مێژووی دێرینی کورد، بووەتە هۆی دروستکردنی تیۆری جیاکردنەوەی گۆران لە کورد.

سۆن لە کتێبەکەیدا بە هەمان شێوە لە ساڵی ١٩٠٧ دا دێت بۆ کوردستان بە مەبەستی فێربوونی زمانی کوردی و شارەزا بوون لە کورد، کەچی دیسان ئەویش زمانی گۆران و هەورامیەکان دەکاتە زاراوەیەکی فارسی بێ ئەوەی کە هیچ سەبارەت ڕابردوو و مێژووی گۆران و هەورامیەکان بزانێت و تا ئەوکاتە شتێکی ئەوتۆ سەبارەت زمانەکەیان بزانێت (Soane, 1912). لە ڕاستیدا ڕیچ، سۆن و مەکەنزی لەبەر ئەوەی لە سەرەتادا فارسی فێربوون، پێیان وابووە کە هەموو شتێک هەر فارسیە و بەو ئاراستە بێ بنەما و نائەکادیمیە قسەیان سەبارەت گۆران و هەورامیەکان کردووە. بۆیە مەکەنزی تەنها لەسەر چەند بنەمایەکی زمانەوانی، کە هەندێکیان بە تەواوی هەڵەن، بۆچوونەکانی سەبارەت گۆران و هەورامی لەلا گەڵاڵە بووە.
بۆچونەکانی مەکەنزی و زمانەوانەکانی تر پشت بەو تیۆریە دەبەستن کە پێی وایە زمانی سانسکریت و فارسی کۆن، دێرینترین بنەچەی زمانە زاگرۆسی (ئێرانی)ەکانن. بەڵام بە ڕوونی هەزاران وشە و بەڵگە مێژووییەکانی ناو ئەم کتێبە بەتەواوی ئەو تیۆریە هەڵدەوەشێننەوە کە ئەوان بۆچوونەکانیان لەسەر دانابوو.
بێگومان نابێت ئەوە لەیاد بکرێت کە زۆر جار لایەنی زانستی مێژوویی و شێوەی دارشتنی تێکستە مێژووییەکان ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەردەمەکەن. بۆیە وەک چۆن ئینگلیزەکان مافیان بە خۆیان دا وڵاتی نوێ لە ناوچەکەدا، بەبێ پێشینەیەکیٚ مێژوویی دروست بکەن، یان بەبێ گوێدان بە خواستی گەلی کورد، وڵاتەکەی دابەش بەکەن؛ بۆچوونەکانی مەکەنزی و هەندێک لە ڕۆژهەڵاتناسەکان، ڕەنگدانەوەی ئەو فرهەنگە بووە.
یان کەسێکی وەک ماریا ئۆشیا کە خۆی بە شارەزا دەزانێت لە بواری کورد دا، لە کتێبێکدا لە ساڵی ٢٠٠٤ دەڵێت "تەنانەت بوونی کوردستان خۆشی بابەتێکە کە بووەتە جێی مشتومڕ و گفتوگۆ و ناکۆکی بیروڕاش زۆرە سەبارەت بە فراوانی ئەو ناوچەیە. چەند هەوڵێکی جدی دراوە بۆ ڕەتکردنەوەی شوێنێکی تایبەت کە بە زۆری کوردی تێدا ژیابێت و تەنها زۆرینەی ڕەگەزی کوردی تیابووبێت. لە ڕاستیدا بەڵگەکان دەتوانرێت بخرێنە ڕوو کە ئەو ناوچەیەی کە دەستنیشان کراوە و دۆکیومێنت کراوە، لەوە دەچێت پێش ٢٠٠ ساڵ لەلایەن ئەوروپیەکانەوە خرابێتە نەخشەوە و لەلایەن نووسەرە کوردەکانەوە ٤٠٠ ساڵە ئەوە کراوە" (O'Shea, 2004, p.35). دیارە ئەگەر ئۆشیا هەوڵی بدایە کە ڕوونکردنەوەکانی یەعقوبی، قەلقەشەندی، سەبارەت بە ناوچە کورد نشینەکان بخوێنێتەوە کە یەعقوبی لە سەدەی نۆهەمی زاینیدا لە کتێبی (البلدان) دا باسی وڵاتی شاخ (کور الجبل) بە وڵاتی کوردان دەکات (الیعقوبي، ١٨٨٣، پ.٧)، یان نەخشەکەی کاشغەری ببینیایە کە نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەر بە ڕوونی لەسەر نەخشەی جیهاندا دەنوسێت (ارض الاکراد)، یاخود ئەگەر سەیری ڕوونکردنەوەکانی ئەولیا چەلەبی بکردایە، ئەوا ڕێگای بەخۆی نەدەدا کە ئەو جۆرە بۆچوونەی هەبێت.
کەسێکی وەک فاوڵەر کە نەزانە بە کورد و ڕابردووەکەی، لەوە دەچێت تەنها تۆزێک زانیاری لە فارسەکان سەبارەت کورد بیستبێت، بە مەبەستی زیادکردنی فرۆش بۆ کتێبەکەی لە ساڵی ١٨٤١ز دا خۆی وەک زانایەک نیشان دەدا و سەبارەت مێژووی کورد دەنووسێت و دەڵێت "جگە لە قورئان، کورد هیچ لە کتێب نازانێت؛ هەمیشە ڕقیان لە زانستە و مرۆڤ ژیانی زۆر بێ نرخە لایان" (Fowler,1841, p.20). هەر دوای نزیکی حەفتا ساڵ سۆن لە ئاماژە بە نەتەوەی کورد دەڵێت "ئەوان لە هەموان کەمتر ناسراون لە ناو ڕەگەزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، هەرچەندە یەکێکن لە ئازاترین، سەربەخۆترین و زاناتر لە هەموویان" (Soane, 1912, p.42).
بەو جۆرە بە ڕوونی دەردەکەوێت کە کەسێک کورد بە نەزانی تەواو و کەسێکی تر لە هەمووان بە زاناتری دادەنێت. بۆیە سەرنج دەدرێت کە بۆچوونەکان لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر بە تەواوی دەگۆڕێن و زۆر جار دژ بە یەکن و زیاتر لایەنی بۆچوونی شەخسیان پێوە دیارە وەک لە لێکۆڵینەوەی زانستی و ئەکادیمی.
لە ڕاستیدا هەزاران بۆچوونی بێ بناغە سەبارەت بە کورد و مێژووی کورد گووتراوە، کوردیش بەهۆی هەلومەرجی سیاسیەوە نەیتوانیوە فریا بکەوێت و وەڵامی ئەم هەموو هەڵە بێ مانایانە لە کاتی خۆیدا بداتەوە.
هەندێک جار کەسانێک، بە زانیاریەکی کەمەوە لەسەر کورد، بێ متمانە بە بەڵگەیەکی مێژوویی یان ئەرکیۆلۆژی، بۆچونی هێندە سەیر و سەمەرەیان گوتووە کە جێگەی سەرسوڕمانە. کەچی بۆچوونەکانیان

وەک ڕاستیەک خستوەتە ڕوو. کێشەکە لەوەدایە کە ئەو نوسینە بێ بناغانە ئەمڕۆ وەک ڕاستیەکی مێژوویی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت.
لەبەر ئەوە هەندێک لە لێکۆڵینەوەکان لەسەر کورد جگە لە خۆ فەرزکردن و دیکتاتۆریەتی ئەکادیمی، ناتوانرێت هیچ بەهایەکی تری بۆ دابنرێت. بێگومان دەبێت ڕەچاوی سەردەمی هەندێک لە لێکۆڵینەوەکانی سەدەی نۆزدە و بیست بکرێت، کە سەردەمی کۆلۆنیالیزم بووە و کارەکانیان لە ژێر کاریگەری ئەو فەرهەنگەدا بووە، بەڵام دووبارەکردنەوەی ئەو بۆچونانە لە لایەن مێژوونوسانی ئەم سەردەمەوە، تەنها دەتوانرێت بخرێتە خانەی تاوانی ئەکادیمیەوە.
بناغەی مێژووی کورد لە لایەن ئەوروپیەکانەوە دانراوە نەک کورد خۆی، چەندین بەڵگەنامە نیشانی دەدات کە ئەوروپیەکان لە سەرەتاوە بێ بوونی زانیاری، بناغەیەکی هەڵەیان بۆ مێژووی کورد و کوردستان داناوە. سەرەڕای ئەوە، ئەو زانیاریە نادروستانەی کە خستویانەتە ڕوو، بەهۆی هەلومەرجی کوردستانەوە بووتە بناغە بۆ مێژووەکەی کە چەوترین مێژووە بۆ گەلێک نووسرابێت.

### ٧- کێشەی تێکەڵکردنی ناوی عەرەب

بە بەراورد بە مێژووی دێرینی میسۆپۆتامیا، عەرەبەکان یەکێکن لە نەتەوە نوێکان. پێش هاتنی ئیسلام سەنتەری ژیانی عەرەب لە ناوچەکانی جەزیرەی عەرەبی ئەمڕۆ و کەناری ناوچە بیابانەکانی ئەمڕۆی عێراق هەتاوەکو بیابانی سوریا بوو. لە ڕابردوودا بەشێکی زۆر لە عەرەبەکان بە ڕەوەندی دەژیان؛ بۆیە بۆ ئاماژەکردن بە عەرەب، ڕۆمان و یۆنانەکان وشەی (شاسۆو Shasou) یان بەکاردەهێنا بە مانای (ڕەوەند، شوان، عەرەب) (Palmer,2006, p.959).
دوای بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ناوچەکەدا، لە ڕێگەی ئایینەکە و بەهۆی حوکمڕانی عەرەبەکانەوە زمانی عەرەبی تەشەنەی کرد و زۆربەی نەتەوەکانی ئەو ناوچەیە وورده وورده ئەو زمانەیان، شان بەشانی زمانەکانی وەک کوردی، فارسی، ئارامی و کلدانی بۆ نووسین، بەکاردەهێنا. هەروەها زۆر لە نەتەوە کۆنەکانی میسۆپۆتامیا زۆر جار بە عەرەبی دەیان نووسی و زۆر لە کتێبە کۆنە کوردی و فارسی و ئارامی و قەبتی و کلدانی و ئەرمەنیەکان تەرجومە دەکرا بۆ زمانی عەرەبی. بەهۆی ئەوەوە زۆر لە وشەی زمانی خەڵکی ناوچەکەی وەک کوردی، ئارامی، فارسی، کلدانی، هتد. چووەتە زمانی عەرەبیەوە و هەر ئەوان زمانەکەیان دەوڵەمەند کردووە، دەنا زمانی عەرەبی لە بنەچەدا زمانی دەسەڵات بووە نەک زانست. ئەگەر تەنها سەیری کۆمەڵێک وشە بکەین کە ئەمڕۆ بە عەرەبی لە قەڵەم دەدرێن، بنەچەکەیان هەمووی کوردین و ئەمڕۆ سەدان وشەی کوردی لە زمانی عەرەبی ستاندارد و قسەکردندا بەکار دێن:

| کوردی نوێ | عەرەبی ستاندەرد و قسەکردن | بنەچەی وشەکە |
|---|---|---|
| گەنج | کنز | ئەم وشە کوردیە لە زمانی میدیدا بەکارهاتووە. میدیەکان بەشێوەی ganja نووسیویانە. عەرەب وەری گرتووە و پیتی (گ) کردۆتە (ک) و (ج) ی کردۆتە (ز). |
| گەوهەر | جوهرة | ئەم وشەیە بنەچەکەی میدیە و میدەکان بەشێوەی gauθra نووسیویانە. عەرەب پیتی (گ) ی گۆڕیوە بۆ (ج). |
| ئێسێ، ئێسا | هس | ئەم وشە کوردیە لە زمانی سۆمەریدا بەکارهاتووە و بەشێوەی aše نووسیویانە. عەرەب وشەکەی درەنگ لە کوردی وەرگرتووە و تەنها لە زمانی قسەکردنی عەرەبی عێراقدا بەکار دەهێنرێت، بەڵام لە عەرەبی ستاندارد دا بوونی نیە. |
| بەرز | بارز | ئەم وشە کوردیە لە زمانی میدیدا بەکارهاتووە. لە زمانی میدیدا هەموو شێوەکانی brz, brzana دەردەکەوێت و لە زمانی ئاڤێستاشدا هەر |

| | | |
|---|---|---|
| | | دەردەکەوێت و هاوشێوەن لەگەڵ کوردیدا. عەرەب وشەکەی لە کوردییەوە وەرگرتووە و تۆزێک ماناکەی گۆڕیوە. |
| سەجەرە | شجرة | ئەم وشە کوردیە لە زمانی میدیدا بەشێوەی čiθra نووسراوە. هەمان مانای وشە کوردیەکەی هەیە، کە بریتیە لە (بنەچەی بنەماڵەیی). لەعەرەبیدا مانای (درەخت) دەدات و ماناکەی گۆڕاوە و دەبێت بگوترێت (شجرة العائلة) ئەمجا مانای وشە کوردی/میدیەکە دەدات. |
| سەرە | سرة | ئەم وشە کوردیە، بنەچەکەی هوریە و ئەوان بە شێوەی siri نووسیویانە. کە لە بنەچەی مانای (سەر) موە وشەکە دروستکراوە. عەرەب وشەکەی درەنگ لە کوردی وەرگرتووە، بۆیە نەچووەتە زمانی ستانداردی عەرەبیەوە و لە زمانی قسەکردنی عەرەبی عێراقدا دەردەکەوێت. |
| مێرگ | مرج | ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا سۆمەریە و بە murgu بە مانای (خۆراکی ڕەشەوڵاخ/ئالیک) بەکاریان هێناوە، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا مانەکەی گۆڕاوە و کراوەتە شوێنی سەوزایی. عەرەبەکان دیسان پیتی (گ) ی کوردی/سۆمەریان گۆڕیوە و کردوویانەتە (ج). |

لەگەڵ هاتنی ئیسلام و بڵاوبوونەوەی ئاینەکە، زۆر خەڵکی ناوچەکە وورده وورده ناوی عەرەبیان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد. بۆیە زۆر جار لە مێژوودا خەڵکی کورد، ئارامی، کلدانی و فارسەکان، ئەگەر لە تێکستەکانیاندا بەڵگەی تر نەدەن سەبارەت ڕەچەڵەکی خۆیان، زۆر گرانە بەهۆی ناوەکانیانەوە بتوانرێت ڕەگەزیان بزانرێت. ئەمە هەندێک جار بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەوروپیەکان دەستەواژەی عەرەب بە شێوەیەکی گشتی و دەست نەپارێز بەکاربهێنن. بەو جۆرە هەزاران کەسایەتی مێژوویی ئەو سەردەمە، لە کتێبە ئەوروپیەکاندا بە عەرەب لە قەڵەم دەدرێن و ناوچەکان بە عەرەبی دادەنرێن یان ئەگەر کەسێک بە زمانی عەرەبی نووسیبێتی و ناوەکەی وشەیەکی ناعەرەبی تێدا بێ، ئەوا بە کەسەکە دەڵێن فارس، بێ ئەوەی کە هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی هەبێت بۆ پاڵپشتکردنی. بۆ نموونە زۆرجار لەبری بەکارهێنانی (مێژوونووسی ئیسلامی) زۆرجار ئەوان دەنووسن (مێژوو نووسی عەرەبی) بێ ئەوەی کە نووسەر عەرەب بێت. لە ڕاستیدا بەکارهێنانی موسوڵمان زۆر دروست تر دەبوو لە بەکارهێنانی عەرەب، لەبەر ئەوەی کە موسوڵمان تەنها ناسنامەیەکی ئاینیە و دەشێت کەسی موسوڵمان لە هەر نەتەوەیەک بێت.
هەروەها ئەو ناوپێدانە گشتیە وای کردووە کە وڵاتەکانی وەک میسر و مەغریب و سوریای ئەمڕۆ لە ناو مێژووی ئەوروپادا بە هەڵە بە عەرەبی لە قەڵەم بدرێن. ئەم حاڵەتە زیاتر بەهۆی ئاینی ئیسلامەوە ڕووی داوە. دەنا ئەمڕۆ هەموو وڵاتەکانی ئەمریکای باشور، جگە لە بەرازیل، بە ئیسپانی قسە دەکەن، بەڵام هەر کام لەو گەلانە ناوێکی بۆ خۆی داناوە بە شێوەی کۆڵۆمبی، ئەرجەنتینی، ڤەنزوێلی، هتد، کەس تەنها لەبەر ئەوەی بە ئیسپانی قسە دەکات خۆی بە ئیسپانی نازانێت. لە راستیدا حاڵەتی میسر و سوریا و وڵاتەکانی مەغریبیش هەمان حاڵەتە و خەڵکی ئەو وڵاتانە بە عەرەبی قسە دەکەن. هەڵبەت عەرەب لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئیسلامدا چووەتە ئەو وڵاتانە، بەڵام زۆرینەی خەڵکەکە بە ڕەگەز عەرەب نەبوون. زۆربەیان ئارامی، قبتی، کورد، کلدانی، ئەرمەنی، ئامازیغی بوون و ئەمڕۆ بە عەرەب لە قەڵەم دەدرێن. بێ گومان ناتوانرێت ڕێ لە خەڵک بگیرێت هەر ناسنامەیەکی ڕەگەزیی بیەوێت بۆ خۆی هەڵبژێرێت، بەڵام ناتوانرێت ڕابردووی خەڵکی ناوچەکە بە عەرەب لە قەڵەم بدرێت، لەبەر ئەوەی کە بەڵگەی مێژووییەکان دەیسەلمێنن کە وا نەبووە.
بەمەبەستی دژایەتی کردنی دەسەلاتی تورکە عوسمانیەکان، ئەوروپیەکان و بە تایبەتی بەریتانیەکان، ڕۆڵێکی گەورەیان هەبووە لە سەدەی بیستەمدا لە بەکارهێنان و گەورەکردنی ناسیۆنالیزمی عەرەبی و سەپاندنی ئەو ناسنامە نوێیە. پیادەکردنی ئەم سیاسەتەش بووەتە هۆی ئەوەی کە وڵاتێکی هەمە نەتەوەی

وەک سوریا بە عەرەب لە قەڵەم بدرێت و ناوێکی ئەوروپی بۆ هەڵبژێرێت[166]. کەچی هەرگیز لە مێژوودا هەتاوەکو سەدەی بیستەم، سوریا بە وڵاتی عەرەبی دانەنراوە، چونکە لە بنەچەدا وڵاتێکی تێکەڵی کورد و ئارامی بووە و دوای هاتنی ئیسلام نەتەوەی عەرەبی بۆ هاتووە و ئەوەش بە ڕوونی لە نوسینی مێژوونوسە ئیسلامیەکاندا دەبینرێت. بۆ نمونە ئیبن حەوقەل لە سەدەی دەیەمی زاینیدا و دوای نزیکەی چوار سەد ساڵ لە هاتنی عەرەبەکان هەر هێشتا لە باسی وڵاتی عەرەب (بلاد العرب) دا وڵاتی شام (سوریا) و میسر بە تەواوی لە دەرەوەی وڵاتی عەرەبدا دادەنێت و تەنها بیابانەکانی سوریا و عێراق هەتاوەکو بەسرە و هەموو جەزیرەی عەرەبی لەناو سنوری ئەو وڵاتەدا دادەنێت (ابن حوقل، ١٩٩٢، پ. ٣٠ و ٣١). واتە ئەگەر لەوپەڕی دەسەڵاتی عەرەبدا و دوای چوار سەد ساڵ لە هاتنی عەرەبەکان تەنها چەند شارێکی باشور و خۆرئاوای عێراق و بیابانەکانی سوریا بە بەشێک لە وڵاتی عەرەب دانرابێت، ئاساییە بپرسرێت کە ئایا چۆن ئەو هەموو وڵاتە لە پاشتردا بە عەرەب دانران کە دەسەڵاتی عەرەبی ڕووی لە لاوازی کردووە؟ لە ڕاستیدا هەتاوەکو سەردەمی نوێ و پێش بەکارهێنانی عەرەب لەلایەن ئەوروپییەکانەوە بۆ دژایەتیکردنی تورکەکان و دروستکردنی ناسیونالیزمی عەرەب، هێشتا زۆربەی ئەو وڵاتانەی کە ئەمڕۆ بە عەرەبی دادەنرێن لە ڕووی دیموگرافیەوە وڵاتی عەرەب نەبوون و لە مێژووشدا بە عەرەب لە قەڵەم نەدراون. بەشێکی زۆری ناسنامەی عەرەبی لە دەرەوە و بە مەبەستی سیاسی بەسەر خەڵکی خۆرهەڵاتدا سەپێنراوە و بۆ بەشێکی زۆری ئەو ناوچەیە، ناسنامەیەکی دروستکراوی سیاسیە.

سەرنج دەدرێت کە لە سەدەی بیستەمی زاینیدا فەرەنسیەکان سوریایان خستە ژێرەستی خۆیان، تاقە دەسەڵاتی بەهێزی سروشتی لەو ناوچەیەدا بە پلەی یەکەم بریتی بوو لە دروزەکان بە سەرکردایەتی سوڵتان ئەترەش، کە کوردن و مارۆنییەکان لە ناوچەی لوبناندا کە پەلێکی ئارامین. بەڵام دوایی، لە نێوانی دوو شەڕی جیهانیدا، بە هاندانی بەریتانیەکان، ناسیونالیستی عەرەب دروستکرا و ناسنامەی ناوچەکە بە هۆی هێزی دەرەکیەوە شێوێنرا.

لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە ناسنامە و نەخشەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست زۆر جار لە ئەوروپاوە دانراوە و ئەمەش بووەتە هۆی دروستکردنی ناسنامەیەکی نوێ کە لەگەڵ سروشتی دیمۆگرافی ناوچەکەدا ناگونجێت و پێشینەی مێژوویی نەبووە. بۆیە دەبینرێت کە فەرهەنگ و مۆسیقا و ڕابردووی خەڵکی ناوچەکە خزێنراوەتە ژێر ناوێک کە لە ڕاستیەوە دوورە. عەرەبەکان لە بنەڕەتدا نەتەوەیەکی بچووک بوون و ڕوویان کردۆتە ناو شارستانیەتێکی مەزنەوە. زوڵمێکی گەورە دەبێت بەرامبەر بە مێژووی مرۆڤایەتی کە شارستانیەتی سەردەمی پەیدابوونی ئیسلام بە عەرەبی لە قەڵەم بدرێت. چونکە ئەمە جگە لە بەکۆ (جوملە) کردن و پشتگوێخستنی ڕۆڵی نەتەوەکانی تر و زانستی مرۆڤایەتی، هیچ مانایەکی تر نابەخشێت.

جێی سەرنجە ئەوەیە کە ئەوروپیەکان ئەوەیان بەرامبەر خۆیان نەکردووە. واتە هەر لەبەر ئەوەی کە ماوەیەک ئینگلیز و فەرەنسیەکان دەسەڵاتدار بوون و زۆر بەرهەمی زانستی بەو دوو زمانە تۆمارکراون، کەس لە ئەوروپا ڕازی نابێت کە هەموو فەرهەنگی ئەوروپا بە ئینگلیزی یان بە فەرەنسی دابنێت؛ کەچی لێکۆڵەرە ئەوروپیەکان ئەوەیان بەرامبەر بە ڕۆژهەڵات کردووە.

لە سایەی ئەم ناسنامە ئەوروپیە نوێیەدا زۆر لە کەسایەتیە کوردەکان، ڕابردوویان سڕاوەتەوە و ناوچەکە بەزۆر بەرگێکی نامۆی پێ بەخشراوە. کەسایەتیە مێژووییە کوردیەکانی وەک ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلەکان و ئەبو فیدا[167] ی جوگرافی ناس و سەدان کەسایەتی تر، هەندێک جار بە عەرەب لە قەڵەم دەدرێن و بەشێک

---

166. ناوی "سوریا" ناوێکی خۆرهەڵاتی نیە و لە بنەچەدا ئەوروپیەکان لە سەرچاوە یۆنانیەکانەوە وەریان گرتووە. زیاتر لە هەزار و سێ سەد ساڵە ئەو ناوچەیە بە "شام" ناو هێنراوە. کەچی ئەوروپیەکان لە سەدەی بیستەمدا و لە کاتی دانانی نەخشەی دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتدا، ئەم ناوە ئەوروپیەیان دا بەو وڵاتە بێ ئەوەی کە خەڵکەکە خۆی ئەو ناوەی بۆ خۆی هەڵبژاردبێت. کە ئەوە نیشانی دەدات تەنانەت ناوی وڵاتەکەش لە ڕوانگەیەکی ئەوروپیەوە دانراوە.

167. - ئەبو فیدا (١٢٧٣ز- ١٣٣١ ز): ئەم میرە کوردە (Gunter, 2009, p.2) لە خێزانی ئەیوبیەکان بووە و سەرەڕای ئەوەی کە ئەمیرێکی زۆر ئازا و بەتوانا بووە لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، لە هەمان کاتدا بە مێژوونوس و جوگرافی ناسێکی گرنگی سەدەی سیانزەهەم دادەنرێت. دوو کتێبە گرنگەکەی بریتین لە "مێژووی ئەبوفیدا" (تاریخ ابو الفداء) و ئەوی تریان "تقویم البلدان".

لە ڕابردوو و مێژووی کورد و ڕۆژهەڵات لە ژێر ئەو ناسنامەیەدا ونکراوە کە لە مێژووی ناوچەکەدا وا تۆمارنەکراوە و ئەوروپیەکان لە سەدەی بیستەمدا بەسەر ڕۆژهەڵاتدا سەپاندوویانە.

**٨- کێشەی نووسینەوەی مێژوو**

بناغەی نووسینەوەی مێژووی نوێی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، بە متمانە بە سەرچاوە ئەوروپیەکان و لە ڕوانگەیەکی ئەوروپیەوە دانراوە. ئەوروپیەکانیش بناغەی بۆچونەکانیان سەبارەت بە مێژووی ئەو ناوچەیە، لەسەر تێکستە مێژووییەکانی یۆنان و ڕۆمانەکان دارشتووە. یۆنان و ڕۆمانەکان هەر لە سەرەتاوە ئاڕاستەیەکی تایبەتی مێژوو نووسینیان هەبووە کە زۆر جار لەگەڵ ئاڕاستەی مێژوو نووسینی خەڵکی ناوچەکە و بابلی و ئاشوریەکان نەگونجاوە.
یۆنانیەکان یەکەم ئەوروپی بوون کە مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بنووسن. خەڵکانی وەک هیرۆدت و کتیسیاس (Ctesias) و زمینەفۆن، کە لە سەدەکانی پێش زایینەوە دەستیان کردووە بە نووسینەوەی مێژوو، بوونە سەرچاوەی سەرەکی بناغەی مێژووی خۆرهەڵات بۆ ئەوروپیەکان. کتیسیاس-ی مێژوونوس خۆی دکتۆری یەکێک لە پاشا فارسەکان بووە و زمینەفۆنیش سەرکردەی هێزێکی بەکرێگیراو بوو کە فارسەکان هێنابوویانە ناوچەکە. جا لەبەر ئەوەی ئەوان لەسەردەمی بەهێزی فارسەکاندا مێژوویان نووسیوەتەوە و خۆیان ڕاستەوخۆ کاریان بۆ فارسەکان کردووە و موچە خۆریان بوون، بۆیە ڕوانگەیەکی فارسی لەلایەن مێژوونوسە یۆنانیە سەرەتاییەکانەوە بەسەر مێژووی ناوچەکەدا سەپێنراوە.
بیرۆسوس کە مێژوونوسێکی بابلی بووە، لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا دەرکی بەو نەگونجانە کردوە. مێژووی بابلی لە کتێبێکدا نوسیوەتەوە کە زۆر جیاواز بووە لەو ڕوانگە مێژووەی کە کتێسیاس سەبارەت بە ناوچەکە نوسیویەتی. لێکۆڵەر گمرکین (Gmirkin) پێی وایە کە بیرۆسوس بەشێکی زۆری کارەکەی بۆ پەرچدانەوەی ئەو مێژووە بووە کە کتێسیاس ، سەبارەت بە مێژووی ناوچەکە نوسیویەتی. چونکە ڕوانگەی بیرۆسوسی بابلی سەبارەت بە مێژووی ناوچەکە، لە بناغەوە جیاواز بووە لە بۆچوونی کتێکساس بۆ ئەو مێژووە(Gmirkin, 32006 ; p.116). بێگومان خەڵکی ناوچەکە، لەبەر ئەوەی کە زانیاری زیاتریان لەسەر دەڤەرکەیان هەبووە و باشتر خۆیان و دەوروبەرەکەیان ناسیوە، مێژوویەکی دروستریان سەبارەت بە ناوچەکە نوسیوە. سەرەڕای ئەو ڕاستیەی کە نوسەرانی وەک کتێسیاس و هیرۆدۆت و مێژوونوسە یۆنانیەکانی تر، کە هەندێکیان کارمەندی فارسەکان بوون و بە ئارەزووی ئەوان مێژوویان نوسیوە یاخود وەکو گەرۆکێک کە زانیاریەکی سەرپێیان سەبارەت بە ناوچەکە هەبووە، بەڵام ئەوروپیەکان ئەو نوسینانەیان کردۆتە بناغەی ڕوانگەیان بۆ مێژووی ئەو دەڤەرە. بەدرێژایی مێژوو، بۆچوونی خەڵکی میسۆپۆتامیا سەبارەت بە مێژووی خۆی بە تەواوی جیاواز بووە لە بۆچوونی یۆنانیەکان؛ ئەم جیاوازی ڕوانگەیە هەتاوەکو ئەمرۆش هەر بەردەوامە.
بۆ نموونە بابلیەکان و ئاشوریەکانیش، زیاتر میدەکانیان بە گوتی لە قەڵەم داوە، بەڵام یۆنانەکان باسی گوتییان هەر نەکردووە و هەندێک جار هەمان کەسایەتی و لە هەمان سەردەمدا کە یۆنانەکان بە میدی لە قەڵەم دەدەن، بابلیەکان بە گوتی دادەنێن (بڕوانە میدەکان). بە درێژایی سەردەمی ئیسلام، کورد بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا باس کراوە، دەبینرێت کە هەمان ئەو ناوچەیەی بابلیەکان بە وڵاتی (گوت) و خەڵکەکایان بە (گوتی) باس کردووە، لە سەرچاوە یۆنانی و ڕۆمانیەکاندا بە (مید) باسکراوە و دوایی سەرچاوە ئیسلامیەکان (گوت) یان کردۆتە (کورد). کەچی سەرچاوە ئەوروپیەکان وەک بەردەوامی دان بە ڕێچکە و ڕوانگەی یۆنان و ڕۆمانەکان، بە زۆربەی وڵاتی کوردستانیان گوتووە وڵاتی مید و هەندێک جار ئاشور و هەروەها دەوڵەتە کوردی و بنەماڵە کوردیەکانیان بە نەتەوە سەیر کردوە، بەڵام سەرچاوە بابلی و ئیسلامی و پەهلەوی و ئاشوریەکان کە هی خەڵکی ناوچەکە بوون بە تەواوی پێچەوانەی ئەو ڕوانگەیە بووە.
یۆنانەکان هەریەکە لە خەڵکی میدیا، کوردیان (Cordene) و هەزمبان (Adiabene) یان هەندێک جار بە نەتەوە سەیر کردوە، کەچی دەبینرێت ئاشوری و بابلیەکان، میدەکان- یان بە گوتیش باسکردوە. واتە بە هەردوو مانای نەتەوەیی و بنەماڵەیی باسیان کردوون. هەروەها لە سەرچاوەی پەهلەویدا پاشای مید بە پاشای (میدی کوردەکان) سەیرکراوە. یان هەزمبانیەکان، کە لە هەولێردا لە سەدەی چوارەمی پێش زاینەوە

حوکمڕانیان کردووە، لە سەرچاوە ئیسلامیەکاندا هەردوو ناوە بنەماڵەییەکە و نەتەوەییەکەیان پێوەیە و زۆر لە ئەمیرەکانیان هەردوو (الهذباني الكردي) بەشێک بووە لە ناوەکانیان. کەچی یۆنانیەکان بە هەزمەبەنیەکان دەڵێن Adiabene و بە نەتەوە سەیریان کردوون.
کەنیسە خۆرهەڵاتیەکان و کەنیسەکانی کوردستانیش، کە لە دوای سەدەی چوارەمەوە کەوتنە ژێر کاریگەری کەنیسەی ڕۆم و یۆنان، هەر هەمان ڕێچکەی ئەمانیان گرت. بۆیە لە کتێبی کەسێکی وەک تۆماس مەرگەیی (Thomas of Marga, 1893)، کە قەشەیەکی باڵای خەڵکی ناوجەرگەی کوردستان بووە و وا دەردەکەوێت کە هەر کورد بووبێت، لە سەدەی نۆهەمدا لە کەرکوکدا نوسیویەتی، باسی کەنیسەکانی ئەو ناوچەیە دەکات، کەچی باسی کورد زۆر بە دەگمەن دەکات و تەنها لە ئاماژەدا بە ناوچەی کوردیان باسیان دەکات. پابەندبوونی کەسایەتیە کریستیانەکان بە ڕێچکەی ترادیسیۆنی مێژوو نووسینی یۆنان و ڕۆمانەکانەوە پاڵی پێوە ناون کە باسی فارس و مید و هەزمبانیەکان بکەن بێ باسکردنی کورد. کەچی لە هەمان سەردەمی تۆماس مەرگەییدا خەڵکێکی وەک مەسعودی باسی زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی کردووە لە ڕێگای باسکردنی خێڵە گەورەکانی کوردستانەوە. بۆیە دەبینرێت کە تۆماس مەرگەیی کە خەڵکی ناوچەکەیە باسی هەزمبانیەکانی کردوە بێ ئەوەی کە بڵێ کوردن، کەچی لەهەمان سەردەمی تۆماس مەرگەییدا، مسعودی باسی زوربەی ناوچەکانی کوردستانی کردوە لە ڕێگای باسکردنی خێڵە گەورەکانیەوە و هەزمبانەکانی بە کورد ناو بردوە. پاشتریش ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلەکان و چەندین مێژوونوسی تر هەزمبانەکانیان بە کورد ناو هێناوە. لە نوسینەکاندا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە هەردوو لایان باسی هەمان خەڵکیان کردوە، بەڵام دەستەواژەی جیاوازیان بەکارهێناوە بۆ ئاماژەکردن پێیان.
کەسێکی وەک ئیبن وەحشیە کە وەکو تۆماس مەرگەیی لە سەدەی نۆهەمدا ژیاوە، بۆچی باس لە نووسینی کوردی و بوونی زانست و کتێبە کوردیە زانستیەکان و کێبڕکێی نێوان کورد و کلدانی بکات، بەڵام تۆماس مەرگەیی کە خۆی خەڵکی ناوجەرگەی کوردستان بووە و لەوێ لە دایکبووە، بە هیچ جۆرێک ئاماژە بە کورد نەکات؟ دیارە پابەند بوونی تۆماس مەرگەیی بە پەیڕەوی ترادیسیۆنی کڵێساکان، کە لەژێر کاریگەری ڕێچکەی مێژوو نووسینی یۆنان و ڕۆمانەکاندا بووە، هۆکاری سەرەکییە کە بەو شێوەیە باس لە بابەتەکانی بکات. لەو نموونانەدا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە کەنیسەکانی کوردستان لە دوای سەدەکانی چوارەمی زاینەوە لە نووسینەوەی مێژوودا لەسەر ڕێچکەی یۆنان و ڕۆمانەکان ڕۆیشتوون.
بە هەمان شێوەش بنیامینی تودێلا، کە جوێکی ئیسپانی بووە و کە لە نێوانی ١١٦٠ز-١١٧٣ ز دا هاتوتە کوردستان و ناوچەکە و کتێبێکی سەبارەت گەشتەکەی نووسیوە، لە گەشتەیدا تودێلا باسی کوردستان ناکات. لەبری ئەوە، ئەو ناوچەیە بە وڵاتی میدەکان ناو دەهێنێت و تەنانەت کاتێک کە باس لە هاتنە دەرەوەی ساڵانەی خەلیفەی ئیسلام و ڕێزەوکردنی دەکات لە بەغدا، دەڵێت "خەلیفە بە یاوەری پاشای مید، فارس و عەرەبەکان بوو" (Wright, 1848,p.96). کەچی تێبینی دەکرێت لە سەدەی دوازدەهەمدا، ئیبن ئەسیر و هەموو مێژوو نوسە ئیسلامیەکان کە سەبارەت ئەو ناوچەیەیان نووسیوە، هەمان ئەو خەڵکەی کە تودێلا لە کتێبەکەیدا بە میدیەکان ناویان دەبات ئەوان بە کورد ناویان دەبەن. یان ئەو جێگایەی کە تودێلا بە وڵاتی مید ناوی دەبات، کاشغەری لە نەخشەکەیدا لە سەدەی نۆهەمدا بە وڵاتی کوردان (ارض الاكراد) باسی کردووە. بە دڵنیایی تودێلا لە سەفەرەکەیدا پەیوەندی لەگەڵ خەڵکدا کردوە و قسەی لەگەڵ کردوون، هەروەها زانیویەتی کە باسی میدەکان دەکات مەبەستی لە باسکردنی کوردەکان بووە، بەڵام ئەو لە ڕوانگەی ئەوروپاییەکانەوە ناوی نەتەوەکانی ناوچەکەی نوسیوە و ئەگەر باسی کوردی بکردایە لەوانەبوو خوێنەری ئەوروپی ئەو سەردەمە هێچ لە بابەتەکە حاڵی نەبن، بۆیە ناوێکی بەکارهێناوە کە خوێنەری ئەوروپی پێی ئاشان بێت و هەر بەردەوامی داوە بە ڕێچکەی نووسینی مێژووی یۆنان و ڕۆمەکان. ئاشکرایە کە ئەو سەردەمەی تودێلا هاتوتە کوردستان ناوی میدەکان بە هیچ شێوەیەک لە هیچ سەرچاوەیەکەی مێژوویی خەڵکی ناوچەکەدا نەمابوو، کەچی ئەو وا باسیان دەکات کە بینیونی و ئەو وڵاتەی کە مێژوونوسە ئیسلامیەکان بە وڵاتی کوردی لەقەڵەم دەدەن، ئەو لە ڕوانگەی ئەوروپاوە بە میدی لە قەڵەمی دەدات.
بەکارهێنانی دوو ناوی جیاواز لە هەمان سەردەمی مێژوویدا بۆ ئاماژەکردن بە هەمان وڵات و هەمان گروپ دەیسەلمێنێت کە ناوەکان بە دوو ڕوانگەی جیاواز بەکارهێنراون. واتە ئەگەر لە هەمان کاتدا هەمان

خەڵک بە دوو ناوی جیاواز باس کرابن، ئەوا کەسەکە دەبێتە هەر هەمان کەس بێت، بەڵام لەلایەن نەتەوەی جیاوازەوە ناوی جیاوازیان بۆ دانراوە. واتە ئەگەر دوو کەس لە هەمان کاتدا بچنە ناوچەیەک، یەکێکیان کە کوردە بڵێت ئەم ناوچەیە هەمووی شێری تێدایە و وڵاتی شێرە و دووەمیان ئینگلیز بێت و بچێتە هەمان ناوچە و بڵێت ئەم ناوچەیە هەمووی وڵاتی شێرە و هەر شێری تێدایە، بەڵام وەک ئینگلیزێک لەبری وشەی (شێر) ی کوردی، lion بەکاربهێنێت، ئەوە هیچ لە راستەیەکە ناگۆڕێت و هەر باسی (شێر) دەکەن سەرەڕای جیاوازی ناوەکە. هەتاوەکو ئێستاش نمونەی ئەو جیاوازی بۆچونە بۆ زۆر وڵات و نەتەوە هەر ماوە. بۆ نمونە ئەو وڵاتەی کە لە هەموو وڵاتانی عەرەبدا بە "نەمسا" ناسراوە و خەڵکەکەی بە "نەمساوی"، دانیشتوانەکەی بە وڵاتەکەیان دەڵێن "Österreich ". جا ئەگەر عەرەبێک و ئەڵمانێک لە نوسینی مێژووی ئەو وڵاتەدا ئەو دوو ناوە جیاوازە بەکار بهێنن، هیچ لەوە ناگۆڕێت کە هەردووکیان باسی هەمان وڵات و هەمان خەڵک دەکەن.

بە هەمان شێوە، لە نوسینی مێژووی ناوچەکەدا، دوو ڕێباز پەیڕەو کراوە؛ یەکێکیان ئەو ڕێبازەیە کە لە لایەن بابلی و خەڵکەکانی تری ناوچەکە و دوایی هەندێک لە سەرچاوە ئیسلامیەکان پەیڕەویان کردوە، ئەوەی تریان ترادیسۆنی یۆنان و ڕۆمانەکانە کە پاشتریش کڵێساکانی خۆرهەڵات و هەر لە ژێر کاریگەری ئەواندا هەندێک لە موسوڵمانەکانیش پەیرەویان کردووە. ئەوروپیەکانیش لە دوای نەمانی دەوڵەتی ڕۆمانەکان، هەر پەیرەوی ئەو ترادیسۆنە ڕۆمانیەیان کردووە. بۆیە ئەگەر ئەمرۆ مێژووی نووسراوی یۆنانی و ڕۆمان و ئەوروپیەکان، سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، لەگەڵ تێکستە بابلی و سۆمەری و کوردی و فارسی و پەهلەوی و ئیسلامیەکان لەیەکتر بدرێت و ئەو جیاوازی بەکارهێنانی ترادیسیۆن و ناوانە ساغ بکرێنەوە، ئەوا مێژووی کورد و هەندێک دیاردەی ڕابردووی خۆرهەڵات، مانایەکی زۆر ڕوونتر دەدات و لەو سەر لێ شێوانەی ئەو دوو ترادیسیۆنە دروستی کردووە، ڕزگاری دەبێت.

ئەم کێشەیە هۆکارێکی تر بووە بۆ تێنەگەیشتنی ئەوروپیەکان لە مێژووی خۆرهەڵات و پشتگوێخستنی کورد لە سەرچاوە مێژوومیە ئەوروپیەکاندا.

**٩- کێشەی تێکەڵکردنی ناوی کریستیانەکانی کوردستان**

**کریستیانەکانی کوردستان کێن؟**

ئەمرۆ کریستیانەکانی کوردستان و ناوچەکە، بۆ ئاماژەکردن بە خۆیان چەندین ناو بەکاردەهێنن. بێگومان بەکارهێنانی ئەم هەموو ناسنامەیە نەک بابەتەکەی ئاسان نەکردوە، بەڵکو لە راستیدا هێندەی تر ئاڵۆزی کردووە. ئەم ئاڵۆزیە نوێ نیە و لە سەرچاوە مێژووییەکاندا هەمان کێشە دەبینرێت. لە سەرچاوە یۆنانی و ڕۆمان و ئەورپیەکاندا کرسیتیانەکان بە شیوەی Aramic, Syrian, Assyrian, Chaldian, Nestorian هتد، باس کراون. دەبینرێت کە وشەی سریان/سیریان لەلایەن یۆنانیەکانەوە ئاماژە بووە بۆ هەر کەسێک کە بە ئارامی قسە بکات ، بەڵام هەندێک جار مەرجیش نەبووە کە زمانی گروپەکە پەیوەندی بە زمانەکانی (ئارامی، ئاشوری) وە هەبێت . سترابۆ لە سەدەی یەکەمدا جوەکان و فینیقیەکانیش بە سیریان (Syrian) ناو دەبات، هەروەها بە خەڵکی کەپەدۆکیەکان (Cappadocian) دەڵێت سوریە سپیەکان (Strabo, 1857, p.142)، کە بە دڵنیایی کەپەدۆکیەکان زمانێکی هیندۆئەوروپی قسەیان کردووە و دوور بووە لە زمانی ئارامیەوە.

بەڵام کریستیانەکانی کوردستان لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا، لەلایەن مێژوونوسە موسڵمانەکانەوە بە کورد و هەندێک جاریش بە نەستوری یان بە یەعقوبی ناو هێنراون. بێگومان ئەو دوو ناوەی دواییان ئاماژە نین بە ڕەگەز، بەڵکو بریتین لە دوو مەزهەبی جیاوازی کریستیان. مەسعودی لە سەدەی نۆ هەمدا بە دوور و درێژی باسی کوردی کردووە و لە بەشی کوردەکانی ناوچەی موسڵدا دەڵێت "........ومنهم اليعقوبية والجورقان وهم نصارى، وديارهم مما يلي بلاد الموصل وجبل الجودي." (المسعودي، ٢٠١١). واتە

"تێیاندا یەعقوبیە و هەیانە جۆزقانیە[168] و ئەوانە کریستیانن، شوێنی ژیانیان لە دوای ناوچەی موسڵ وشاخی جودیە". هەموو ئەو کەسایەتیانەی کە لە سەرەتای بڵاوکردنەوەی کریستیانیدا باسی بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان دەکەن، جگە لە چیرۆکە ئەفسانەییە کریستیانەکانی وەک مار قەرداخ کە ڕەچەڵەکی مار قەرداخ بۆ سەنحاریب[169] (Walker, 2006) دەگەڕێنێتەوە ، بە هیچ جۆرێک باسی ئەوە ناکەن کە ئەوانەی ئاینەکەیان کریستیانە لە کام ڕەگەز و نەتەوەن. بۆ نموونە مار ماری (Harrak, 2005) لە سەدەی یەکەمی زاینی و تۆماس مەرگەیی لە سەدەی نۆهەمی زاینیدا، کاتێک کە باسی کوردستانی ئەمڕۆ دەکەن بەهیچ جۆرێک ناڵێن کە ئەوانە ئاشورین، تەنها دەڵێت موغین یان هەڵگری بیروباوەڕی ترن. لە زانیاریەکاندا ئاینی خەڵکەکە وا دەردەکەوێت کە پاشماوەی ئاینە کۆنەکانی ناوچەکە بن.

ئاین و ناسنامەی کریستیانەکانی کوردستان و ناوچەکە بووەتە مایەی مشتومڕێکی زۆر و هەندێک ئاڵۆزی دەبینرێت سەبارەت بەوەی کە ئایا کریستیانەکان کوردن، ئایا ئاشورین، ئایا کلدانین یان کێن و مێژوویان چۆن دەست پێ دەکات؟ وەک زۆر لایەنی مێژووی کوردستان، لایەنی سیاسی فاکتەری سەرەکی تێکدانی ئەم مێژوومیە، بەڵام تێکەڵکردنی ئاین و ڕەگەز فاکتەرێکی گرنگی ئاڵۆزبوونی بابەتەکەیە. هەرگیز بە درێژایی مێژوو ئاینی کریستیان، ئاینی هیچ گەلێکی تایبەت نەبووە، چونکە لە کاتێکدا کە عیسا خۆی بە ڕەگەز جوو بووە، بەڵام ئاینەکەی بێ جیاوازی بە ناو هەموو نەتەوەکاندا بڵاوکراوەتەوە.

لە ڕاستیدا هەتاوەکو سەدەی بیستەم کرسیتیانەکانی کوردستان لە هەموو کتێبە ئیسلامی و ئەوروپیەکاندا زیاتر بە ناوی مەزهەبەکانیان بە نەستوری یان یەعقوبی یان بە کورد یان بەکلدانی ناوهێنراون. هەتاوەکو ساڵی ١٩١٠ کاتێک کە لێکۆڵەرێکی ئینگلیز بە ناوی ویگرام (W.A. WIGRAM) کتێبێکی لەسەر کریستیانەکانی کوردستان و ئێران نووسی. ئەم کتێبە بووە هۆی سەرەتای شێواندنی ناسنامەی کریستیانەکانی کوردستان و ناوچەکە و ئاڵۆزکردنی ئەو مێژووە. ویگرام کە مێژوونوسێکی بەتوانابووە و شارەزایەکی باشی مێژووی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بووە، ویستی کتێبێک لەسەر کریستیانەکانی ئەو ناوچەیە بنوسێت. بە مەبەستی ئەوەی کە سەر لە خوێنەری ئینگلیز تێک نەدات و بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتنیان لەو مێژووە، هەوڵی دا کە تەنها ناوێک بۆ هەموویان بەکار بهێنێت، لەبری ئەو هەموو ناوەی کە لە ڕابردوودا لە ئەوروپا بۆ کریستیانەکان بەکار دەهێنران. ئەوەتا نوسەر بۆ خۆی لە پێشەکی کتێبەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی ئەو کریستیانەکانی بە (ئاشوری) ناوهێناوە و دەڵێت "نووسەر بە درێژایی ئەم کتێبە بۆ کڵێسای مەبەست، ناوی "ئاشوری" بەکار هانیوە. **هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی مێژووی نیە بۆ ئەم ناوە**، بەڵام ئەو ناوە هەمە جۆرانەی کە بەکارهاتوون لەلایەن نووسەرە جیاوازەکانەوە وەک (کریستیانە "شەرقیەکان"، فارسەکان، سوریەکان، کلدانیەکان، نەستوریەکان) هەموویان لەبەر هۆی هەمەجۆر، سەر لە خوێنەری ئینگلیز تێک دەدەن" (Wigram,1910, p.vii) . کەواتە ویگرام ناوی (ئاشوری) بەکارهێناوە بە مەبەستی ئاسانکاری بۆ خوێنەری ئینگلیز دەنا ناوەکە مانا و ڕابردووی مێژوویی نەبووە.

هەتاوەکو دەرچوونی کتێبەکەی ویگرام، زۆربەی جار کەنیسەی کریستیانەکانی کوردستان و خۆرهەڵات لای ئەوروپیەکان بە ناوی کەنیسەی کوردستان، شەرقی، فارسی، سوری، کلدانی و نەستوری ناو هێنراون. بەو جۆرە دەستەواژەی ئاشوری لە سەدەی بیستەمدا هێنرایە ئاراوە، بێ ئەوەی کە ناوەکە هیچ بنەمایەکی مێژوویی هەبێت و ئەو کەسەی کە ئەو ناوەی هێنایە ئاراوە، خۆی ئەو ڕاستیەی ڕوونکردۆتەوە.

---

[168]. لەوە دەچێت مەسعودی مەبەستی لە مەزهەبی کریستیانی (شاریەگان) ی بێت، بەپێی تۆماس مەرگەیی، ئەمانە کۆمەڵێک بوون بە ناوی Shahrighan (شاریەگان) و پێیان وابووە عیسی هەر پێغەمبەر بووە (Thomas of Marga, 1893, p.cix) کە ئەوە بە پێچەوانەی بیروباوەڕی زۆربەی کریستیانەکان بووە.

[169]. گەڕانەوەی ڕەچەڵەکی کەسێک بۆ ڕابوردویەکی شکۆ دار یان بەستنەوەی بە پاشایەکی بەناوبانگەوە، کردەوەیەک بووە کە زۆر جار لە خۆرهەڵاتدا ڕووی داوە و هەتا ئێستاش زۆر کەسایەتی ئەوە دەکەن. تەنانەت سەدام حسەینیش ڕەچەڵەکی خۆی گەڕاندبووە بۆ حەزرەتی عەلی. لە حاڵەتی مار قەرداخدا ئەو پەیوەندیە شتێکی مەحاڵ بووە، لەبەر ئەوەی کە سەنحاریب و مار قەرداخ نزیکی ١٠٠٠ ساڵ لە نێوانیاندا بووە.

هەڵبژاردنی ناوی ئاشوری لەلایەن ویگرامەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئینگلیز و ئەوروپاییەکان بەو ناوە ئاشنا بوون، چونکە ناوی ئاشوری لە کتێبە ئاینیەکانی وەک تەوراتدا زۆر باس کراوە و تەوراتیش کاریگەری زۆری لەسەر کریستیانەکان هەبووە. ئەوەی کە ویگرام کردوویەتی داهێنانی ناوێك بووە بۆ ئەم کڵێسایە بۆ ئاسانکاری بۆ خوێنەرە ئینگلیزەکان. دەنا بە درێژایی مێژوو، کریستیان لە کوردستان و خۆرهەڵاتدا ئاماژەکردن بووە بۆ ئاین نەک نەتەوە. لەو ساتەوە ئەم ناوە وورده وورده لەلایەن نوسەرە خۆرئاواییەکانەوە بەکارهاتووە. بەڵام چەند ساڵێکی کەم لە دوای بڵاوبوونەوەی ئەم کتێبە جەنگی جیهانی یەکەم هاتۆتە پێش و ئینگلیزەکان کە پلانی دوور و درێژیان بۆ ناوچەکە هەبووە، بە مەبەستی سیاسی ئەم ناوە نوێیەیان کردۆتە ڕاستیەک و هەوڵیان داوە کە کریستیانەکانی کوردستان بە لای خۆیاندا ڕابکێشن و لە کوردەکانیان جیا بکەنەوە. بۆیە کەسێکی وەک سۆن (E.S.Soane) کە خۆی بە نهێنی لەلایەن حکومەتی بەریتانیەوە نێردرابوو، بە گەشتێک دێتە کوردستان و دوایی لە کتێبێکدا لە ساڵی ١٩١٢دا ووردەکاریەکانی گەشتەکەی بڵاودەکاتەوە، سەبارەت بە کریستیانەکان دەڵێت "زمانی ئەم ئاسوریانە، هەندێک جار پێی دەڵێن سریانی نوێ یان ئارامی، ئەم زمانە ماوەتەوە و قسەی پێ دەکرێت، ئێستاکە لەلایەن زۆرینەی خەڵکەکەوە کە موسڵمانن لە ناوچەی دەشتی سێرتدا بە زمانی کریستیانەکان ناسراوە. هەرچەندە ئەوان خۆیان بە کورد دەناسێنن، بەڵام ڕەگەزیان کلدانیە" (Soane, 1912, p.52). دەبینرێت کە قسەکانی سۆن خۆی لە خۆیدا تێکەڵ و پێکەڵە و تەنها دەیەوێت، بۆ پیادەکردنی ئەو سیاسەتە، بە زۆر ناسنامە نوێکە بسەپێنێت بەسەر کریستیانەکانی کوردستاندا. هەروەها تێبینی دەکرێت کە ناوە کۆنەکە کە بریتیە لە (کلدانی)، هێشتا زاڵە بەسەر قسەکانی سۆندا. سۆن لەلایەکەوە پێیان دەڵێت ئاسوری و لەلایەکەوە پێیان دەڵێت کلدانی و سەرەڕای ئەوەی کە هەندێک لە کریستیانەکان دەڵێن کوردین، بەڵام سۆن خۆی بێ هیچ ڕوونکردنەوەیەک بڕیاری داوە کە بە کوردیان نەزانێت. دوایی دەڵێت "لە کوردستانی باشور و لە کوردستانی ئێراندا، لەوێ کە کورد و کلدانیەکان جلوبەرگی وەک یەکتری لەبەر دەکەن و بە خۆشحاڵیەوە خۆیان بە هاوخوێن دادەنێن، کریستیانەکە زۆربەی جار بەینی زۆر خۆشە لەگەڵ دراوسێ جەنگاوەرەکەیدا [سۆن لێرەدا مەبەستی لە کوردە]" (Soane, 1912, p.66).

دەبینرێت زۆر لە کریستیانەکان هەتاوەکو ئەو کاتە هەر خۆیان بە کورد زانیوە و سەرچاوە مێژوویەکانیش هەر وای دەسەلمێنن. بەڵام وورده وورده ئینگلیزەکان و گروپە تەبشیریەکان ئەو ڕاستیە مێژوویەیان شێواندووە بۆ مەبەستی سیاسی و ئاینی. بەو جۆرە هەندێک لە کریستیانە کوردەکانی ئەمڕۆ خۆیان بە ئاشوری یان بە ئارامی یان بە کلدانی دەزانن، بێ ئەوەی کە وابێت. ئەم دیاردەیە بە هەمان شێوە بەرامبەر بە ئێزدیەکانیش کراوە، ئەو ئێزدیانەی کە نەک خۆیان بەڵکو ئاینەکشیان هەر بە زمانی کوردیە و بە کوردیش نوێژ دەکەن، کەچی هەندێک لە خۆرهەڵات ناسەکان بێ دەرخستنی بەڵگە، بڕیاریان داوە کە ئەوانە کورد نین.

**ئەی ئاشوریەکانی کوردستان کێن؟**[170]

وەک باسکرا، هەتاوەکو سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای سەدەی بیستەم کریستیانەکان کە بە ئارامی قسەیان دەکرد و کە لە ناوچەرگەی کوردستاندا دەژیان، بە نەستوری ناوهێنراون. لە ڕاستیدا هیچ کاتێک کریستیان ئاینی تاقە قەومێکی تایبەت نەبووە و لە کوردستاندا خەڵکی بەڕەگەز کورد و خەڵکی ئارامی هاتوونەتە سەر ئەو ئاینە. ئارامیەکان لە سەردەمێکی کۆنەوە ڕوویان کردۆتە کوردستان و مێسۆپۆتامیا و بریتی بوون لە کۆمەڵێک تیرە کە هەندێکیان لە پێش ئاشوریەکان و هەندێکی تریان لە دوای فراوانبوونی دەسەلاتی ئاشوریەکان، هاتنە ناوچەکە، هەروەها بەشێکیشیان، ئاشوریەکان خۆیان بە مەبەست هێنابوویانە ناوچەکە. زێنەفۆن لە گەشتەکەیدا کە لەسەدەی چوارەمی پ.ز دا بە هەندێک ناوچەی کوردستاندا ڕۆیشتووە و کاتێک دەگاتە نزیک ناوچەی ئەرمینیەکان دەڵێت "ئەمانە ئەرمین و مەگدۆنی و کلدانین، هەموویان سوپای بەکرێ

---

170. نوسەری ئەم کتێبە بە هەموو شێوەیەک ڕێزی هەموو نەتەوەیەک یان گروپێک دەگرێت لە هەڵبژاردنی ئەو ناسنامەیەی کە ئەو نەتەوەیە یان گروپە بە گونجاوی بزانن بۆ خۆیان. مەبەست لە دەرخستنی ئەو بەڵگەنامە مێژوویانە ڕەتکردنەوەی ناسنامەی ئەو خەڵکانە نیە کە ئەمڕۆ خۆیان بە "ئاشوری" لە قەڵەم دەدەن، بەڵکو تەنها دەرخستنی ڕاستیەکی مێژووییە.

گیراون و سەر بە ئۆنۆتاس و ئەرتوخۆسن"، پاشتریش سەبارەت بە کلدانیەکان بەردەوام دەبێت و دەڵێت "سەبارەت کلدانیەکان دەڵێن، ئەمانە خەڵکی ئازاد و شەڕکەرن؛ چەکەکانیان بریتی بوو لە قەڵغانێکی درێژ و ڕمێک"(Xenophon, 1836, p.240) .

ئەوەی کە جێی سەرنجە نزیکی ٢٢٠٠ ساڵ دوای زەینەفۆن، لە سالی ١٨٢٠ دا کاتێک کە ڕیچ دێتە کوردستان لە شوێنێکدا بە دوورو درێژی باسی کریستیانە نەستۆریەکان دەکات و دەڵێت "بۆ گەیشتنە ئاسیای بچووک [مەبەستی خۆرهەلاتی ناوەراستە] لەو ڕێگایەوە، دەبوو ئەو [مەبەستی لە نامەبەرەکەیە] بە ناوچەی کێوی و سەختی کلدانیە کریستیانەکاندا بڕوات، کە پێم وایە ئەوان تاقە کریستیانن لە خۆرهەڵاتدا کە بە سەربەستی ماون بەرامبەر محمەدیەکان، کە لە بەردەمیاندا ناو و ڕێزێکیان بۆ خۆیان دروست کردووە" (Rich, 1836, p.275). میستەر ڕیچ بەردەوام دەبێت و دەڵێت "کێویترین و سەربەخۆترین لە خێڵەکانی جۆلەمێرگ و هەکاری، بریتیە لە خێڵە کلدانیە کریستیانەکان. ئەمانە چوار خێڵن و گوێ بە پاشای هەکاریش نادەن [مەبەستی لە پاشای کوردە] و لە بارێکی تەواو کێویدا دەژین. ئەمانە پەیرەوی کریستیانی و مەزهەبی نەستۆری دەکەن. پیاوەکانیان زۆر نایابن لە هێز، باڵا و ئازایەتیدا و دەڵێن پەرینەوە بەناو ئەواندا مەترسی زیاترە وەک بە ناو خێڵە موسوڵمانەکاندا. لە ناوچەیەکدا دەژین لە نێوان ئامەد و جۆلەمێرگدا، لەو ناوەدا تەنها یەک خێڵی موسوڵمان هەیە. ئەمانە بە دەگمەن شتێک دەدەنە پاشای هەکاری، مەگەر کاتێک کە ناوبژیوانیان دەکات و بە جوانی داوایان لێ دەکات، دەنا هەرگیز بە زۆرملێ ئەومیان پێ ناکرێت" (Rich, 1836, p.276). ئەمجا ڕیچ ئاماژە بە سەرچاوەیەکی تر دەدات و دەڵێت "گیبۆن، باسی ئەم خەڵکە کێویە دەکات و دەڵێت "کلدانیەکان ناو و مەزاجیان لە چۆنایەتی ئەو خاکە ئاسنینەوە وەرگرتووە؛ لە سەردەمی کۆرشەوە بە ناوی جیاوازی وەک کلدانی و زانیان (Chaldeans and Zanians) ناسراون، کە بەردەوام خەریکی شەڕ و ئاژاوەن. لە ژێر دەسەڵاتی جوستانیاندا، تەنها خوا و ئیمبراتۆری ڕۆمانیان دەناسی" (Rich, 1836, p.276).

دیسان ڕیچ لە باسکردنی جولەمێرگدا دەڵێت "جولەمێرگ پایتەختی ناوچەی کوردی هەکاریە و لە هەمان ناوچەدا کۆچ هانێس (Kotch Hannes) هەیە، کە شوێنی نیشتەجێی پاتریارکی کلدانیەکانە، کە لە کاتی هەڵگیرساندنی شەڕ لە نێوان پاشای هەکاری و پاشای فارسدا هەمیشە سەرکردەی پەلێک لە سوپا دەکات، پایتەختەکەی دەکەوێتە سنووری نێوان جۆلەمێرگ و سەلماس. ناوبانگی بەوە دەکردوە کە لە بەکارهێنانی تفەنگ و شمشێردا زۆر بە توانایە، وەک هەر کام لە دزەکانی تاقمەکەی. ناونیشانە کلدانیەکەی بریتیە لە کاتۆلیک (catolik) و لە کەنیسەیەکی گەورەدا نیشتەجێیە"(Rich, 1836, p.277).

ئەگەر سەیری ئەو وتانە بکرێت، پەیوەندیەکی تەواو هەیە لە نێوان ئەو وەسفەی زەینەفۆن و ڕیچ و گابۆندا. بەڵام وەک دەردەکەوێت بە درێژایی مێژوو جگە لە کریستیانە کوردەکان، بە کریستیانە ئارامیەکانیان گووتووە، کلدانی. هەڵبەت کێشەکە لەوەدایە کە یۆنانی و ئەورووپیەکان زۆر جار ئارامی و کلدانیان تێکەڵ کردووە، کە هەرچەندە لە رووی زمانەوە پەیوەندیەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە بەڵام دوو نەتەوەی جیاوازن. هەندێک لەو کریستیانانەی کە لە کوردستاندا دەژین، بریتین لەو ئارامیانەی کە بە تایبەتی لە دوای هاتنی ئاشوریەکان هاتوونەتە ناوچەکە. بەڵام کلدانیەکان دانیشتوی باشور و هەندێک ناوچەی ناوەراستی میسۆپۆتامیا بوون.

دەتوانرێت بە درێژایی مێژوو، کریستیانەکانی کوردستان بکرێن بە سێ بەشەوە:

١.کرسیتیانە کوردەکان: ئەمانە ئەو کریستیانانەن کە لە سەردەمانێکی کۆنەوە چوونەتە سەر ئاینی کریستیان و لە رووی رەگەزەوە کوردن، لە بەشە جیاجیاکانی کوردستاندا دەژین. بەڵام وەک پێشتر باسی لێوەکرا، لە دوای سەدەی بیستەمەوە و لە ژێر کاریگەری دەرەکیدا بەتایبەتی ڕۆژهەڵاتناسە ئەورووپیەکاندا هەندێکیان کەوتونەتە گومان لە ڕەگەزی خۆیان. لەبەر ئەوەی کە زمانی ئاینی کریستیان لە ڕۆژهەڵاتدا ئارامی بووە بۆیە زۆربەیان بە ئارامیش قسە دەکەن، بەڵام زمانەکە بۆ ئەوانە تەنها زمانی ئاینەکە بووە. بۆیە لە سەرەتای بڵاوکردنەوەی ئاینی کریستیاندا کەسایەتی کورد پلەی بەرزی لە ناو کرسیتانەکاندا هەبووە و خەڵکانی وەک یوسف شارەزووری کە قەشەی باڵای ناوچەی گەرمیان بووە و جوبرائیل شارەزووری و چەندین کەسایەتی تر ناویان هاتووە (Marga, 1893, p.cv) .

٢. کریستیانە ئارامیەکان: ئەمانە ئەو خەڵکانەن کە لە بنەڕەتدا لەگەڵ فراوانبوونی دەسەڵاتی ئاشوریەکاندا لە ناوچەکانی سوریاوە هاتوونەتە کوردستان و میسۆپۆتامیا و ئەمانە بە زاراوەیەکی زمانی ئارامی قسە دەکەن. هەندێکیان نزیکی زیاتر لە سێ هەزار ساڵە لە کوردستاندا دەژین، بەڵام پارێزگاری زمانەکەی خۆیان کردووە. زمانەکەیان نزیکە لە زمانی جوەکانی کوردستان، بەڵام دوو زاراوەی جیاوازن و تا ڕادەیەکیش لەیەکتریش تێدەگەن. ئارامیە کریستیانەکان هەزاران ساڵە لەگەڵ کورد دا دەژین، بۆیە لە زۆر ڕووی کۆمەڵایەتی و مۆسیقا و هەڵپەڕکێ و جولوبەرگەوە، هاوشێوەیی زۆریان لەگەڵ کورد هەیە و تەنانەت هەندێک لە خێڵەکانیان، ناوی کوردیان هەیە، بۆ نموونە خێڵی Nochia (ناوچیا) و بەرواری و چەندین خێڵی تر کە ناوەکەیان کوردیە. تەنانەت زۆربەی جار فۆلکلۆریان کوردی بووە. لیلیان کە لە پێش ١٩١٤ ز دا کتێبێکی سەبارەتیان نووسیوە، دەڵێت "فۆلکلۆری ئاشوری زۆر لە ژێر کاریگەری کوردەکاندایە؛ ئەوان گۆرانی کەمیان هەیە و هەمیشە ئارەزووی گووتنەوەی گۆرانی کوردی و گێڕانەوەی چیرۆکی کوردی دەکەن" (Lilian, 1914, p.7).

لە سەدەی بیستەمەوە و لە ژێر کاریگەری ئینگلیزەکان، ئەمڕۆ نەستوررییە ئارامیەکان بە خۆیان دەڵێن ئاشوری. بەڵام وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا و ویگرام ئاماژەی پێکردووە، هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی نیە کە ئەو خەڵکە ئاشوری بن و هەرگیز بە ئاشوری نەناسراون. لە ڕابردوودا سەنتەری سەرەکی نیشتەجێبوونی ئارامیەکان وڵاتی سوریا و نوردن و لوبنان بووە و دوایی بە هەموو خۆرهەڵاتدا بڵاوبوونەتەوە. لە سەردەمی ئیسلامدا لە وڵاتی سوریا و باشور و ناوەڕاستی عێراقی ئەمڕۆ هەتاوەکو ناوچەی موسڵ، خەڵکی ئارامی تێدا بووە و کۆمەڵگەی بچووکیان لە زۆر لە شارە بچووکەکانی کوردستان هەبووە.

ئەمڕۆ بەشێکی کەمیان لە کوردستان و ئێران و سوریا و عێراقدا ماون، زۆربەیان لەبەر هۆکاری ناڵەباری ناوچەکە کۆچیان کردووە بۆ ئەمریکا و ئوستراليا و ئەوروپا و زۆربەیان لە دەرەوەی وڵاتی خۆیاندا دەژین. کارێکی گران نابێت کە لە ڕووی زمانەوانیەوە ئەمڕۆ بەراورد بکرێت لە نێوان زمانی ئەو خەڵکانەی کە خۆیان بە ئاشوری دەزانن لەگەڵ زمانی ئاشوریەکاندا کە ڕێزمانی هەردووکیان نووسراوە و لە سەردەمی ئاشوریەکانیشدا، زمانی ئارامی و ئاشوری دوو زمانی جیاواز بوون و لە هەمان کاتدا بەکارهاتوون، بەو جۆرە هەندێک لایەنی مێژوویی ئەو خەڵکە ڕوونبکرێتەوە.

٣- کریستیانە کلدانیەکان: کریستیانە کلدانیەکان وا دەردەکەوێت کە هەر تەواوکەری ئەکەدیەکان بن و جۆرێک بن لە بەردەوامی ئەو فەرهەنگە. ئەمانە زیاتر لە سێ هەزار ساڵە دانیشتوی بابل و میسۆپۆتامیا بوون و خاوەنی چەندین نەلف و بێی خۆیان بوون و کەمینەیەکیان لە ناوچەی جۆراوجۆری عێراقی ئیمڕۆدا هەن. بەڵام لە ڕابردوودا دانیشتوی ناوەڕاست و خواروی عێراق بوون. لەبەر لەیەکچوونی زمانەکایەن زۆر جار مێژوونوسە یونانیەکان لە ڕابردوودا و ئەوروپیەکان لەم چەند سەدەیەی دواییدا، لەگەڵ ئارامیەکاندا تێکەڵیان دەکەن. پێش هاتنی عەرەبەکان زۆربەی کتێبە زانستی و ئاینیەکان بە زمانی ئارامی و کلدانی بووە و کاریگەری ئەو زمانە هەتاوەکو چین ڕۆیشتووە. لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا کلدانیەکان وەک خەڵکانی زانا و خاوەن زانست سەیرکراون.

**زمانی بڵاوکردنەوەی ئاینی کریستیان و ئاسەواری لەسەر ناوی شوێن و کەسایەتیەکان لە کوردستاندا:**

سەرەتا، زمانی بڵاوکردنەوەی ئاینی کریستیان زمانی ئارامی (سریان) بووە، لەبەر ئەوەی کاتێک کە ئەو ئاینە لە ئیسرائیلەوە سەری هەڵدا و لە کوردستان و ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاو بووەوە، زمانی ئارامیان بەکارهێنا بۆ بانگەواز و پیادەکردنی ئاینەکەیان. زمانی ئارامی لە سەدەی یەکەمدا گەورەترین زمانی نووسین بووە؛ ئەم زمانە هەندێک جار بە ئارامی، سریان، ئاشوری ناوهێنراوە. هەر چەندە زمانی ئارامی و ئاشوری دوو زمانی جیاوازن، بەڵام پەیوەندیەکی زۆر لە نێوانیاندا هەیە. زمانی ئارامی بە ناوی خەڵکانێکەوە ناونراوە کە بە ئارامیەکان ناسراون و لە بنەڕەتدا لە سەنتەری سوریا و دوایی لە هەموو ناوچەکەدا وەک زمانی نووسین بڵاوبووەتەوە و کاریگەری هەتاوەکو چین ڕۆیشتووە. لە دوای هاتنی ئاشوریەکانەوە بەشێکی زۆریان لە باشور هەتاوەکو ناوچەکانی موسڵدا دەژیان. تەنانەت عیسای پێغەمبەریش هەرچەندە خۆی بە ڕەگەز جوو بووە، بە زاراوەیەکی ئارامی قسەی کردووە و کتێبی تەلمودی پیرۆزی جوەکانیش هەر بەو زمانە نووسراوە و جووەکانی کوردستان و هەندێک لە کریستیانەکان هەر بە

زمانێکی ئارامی قسە دەکەن (Sabar, 2002, p.xiii). بۆیە ئەگەر چی تێکستە سەرەتاییەکانی ئاینی کریستیان بە زمانی ئارامی بووە، بەڵام نوسین و قسەکردن بەو زمانە، مەرج نیە بەڵگەی ڕەگەزی کەسێک بووبێت.
لە ژێر ئەو کاریگەرییەدا، زۆربەی کریستیانەکانی کوردستان لەو سەردەمەدا ناوی ئارامییان لە خۆیان ناوە. بە هەمان شێوەی ئەمڕۆ کە کەسێک دەبێتە موسڵمان ناوی عەرەبی بۆ خۆی دادەنێت، بەڵام ئەو ناوگۆڕینە کەسەکە ناکاتە عەرەب. سەرنج دەدرێت لە ڕابووردوودا، پاش ئەوەی کە ڕۆمانەکان ئاینی کریستیانیان کردە ئاینی دەوڵەتەکەیان، لە دوای چەند سەدەیەک زمانی لاتینیان کردە زمانی ڕەسمی ئاینەکە، جا لەگەڵ ئەوەی کە ئەوروپا بووە کریستیان بەڵام کەس بە هەموویانی نەگوت لاتین. بەو جۆرە جگە لەو کەسانەی کە بە ڕەگەز ئارامی بوون، قسەکردن و نووسین بەو زمانە بە هیچ جۆرێک ناسنامەی ڕەگەزی نیە و نەبووە. ئەو زمانە هاوشێوەی زمانی ئینگلیزی ئەمڕۆ، ئامرازێک بووە بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکە بە ناو زۆرترین خەڵکدا.
لە سەردەمی ئاشوریەکانەوە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی ئارامی ڕوویان کردۆتە ناوچەکە و ئەو هاتنەیان لە سەرچاوە ئاشوریەکاندا باسی لێوەکراوە. هەروەها ئاشوریەکان لە سەدەی هەشتەمی پێش زاییندا کۆمەڵێک خەڵکی ئارامی (سریان) یان بە تایبەت گوێزایەوە بۆ ناوچەکانی کوردستان و هەندێک لە خێڵە میدی (گوتی) یەکانی وەک خێڵی بودیان یان گویزایەوە بۆ سوریای ئەمڕۆ (Diakonoff, 1985, p.78).
ئەم هۆکارانە کۆمەڵێک ناسەواریان لە کوردستاندا لەسەر ناوی کەسایەتی و جێگا و شوێن جێهێشتوە، بۆیە کە ناوی گەرمیان کە کوردی و هوریە، لە سەرچاوە ئارامی و دوایی ئیسلامیەکاندا نیوەی تەرجومە کراوەتە ئارامی و نیوەی بە کوردی هەر ماوەتەوە. دەنا هیچ بەڵگەیەک نیە بیسەلمێنێت کە خەڵکەکە لە ناوچەی جزیرە، هەولێر، گەرمیان و ناوچەکانی تری کوردستان بە زمانی ئارامی قسەیان کردووە.
لەگەڵ ئەوەی کە کاریگەری ئارامی بەهۆی زمانەکەوە لە سەر ناوی کەسایەتیەکان لە ناوچەکەدا هەبووە، بەڵام هەندێک جار ناوی کەسایەتیە کریستانەکان بە تەواوی بە کوردی ماوەتەوە. بۆ نموونە یەکەم قەشەی باڵا (bishop) ی هەولێر لە سەدەی یەکەمی زاییندا ناوی paqida (پاکیزە)[171] بووە (Lieu, 1992, p.35) و پاکیزە خۆی سەرەتا کۆیلەی موغێک بووە و دوایی بوەتە کریستیان و کوڕی کابرایەک بووە بە ناوی بێری (Beri)[172] (Foster, 1977, p.93). پاکیزە ناوی خۆی و باوکی هەر کوردی بووە.
هەروەها لە سەدەی یەکەمی زاینی و لە کاتی گەڕانی مار ماری بە کوردستاندا و بڵاوکردنەوەی ئایینی کریستیان، زۆربەی ناوی خەڵکەکانی ئەو ناوچەیە کوردی بووە، وەک زەردەشت و کوردەوا و دۆستی... هتد. جگە لەوەش تۆماس مەرگەیی باس لە دوو کەسایەتی گرنگی کریستیان دەکات یەکێکیان ناوی یوسف شارەزووری بووە کە قەشەی باڵای ناوچەی گەرمیان بووە و ئەوی تریان ناوی جوبرائیل شارەزووری بووە (Thomas of Marga, 1893, p.cv) . بەو شێوەیە جگە لەوانەی کە دوای هاتنە سەر ئایینەکە ناوی خۆیان گۆڕیەوە بۆ ناوی ئارامی بۆ خۆ گونجاندن لەگەڵ ئایینە نوێکەدا (ئەمڕۆ ئەم دیاردەیە لە هەموو هاتنە سەر ئایینێکدا بەدی دەکرێت)، دەنا هەموو ناوی کەسەکان و شوێنەکان هەر کوردی بوون. بۆیە دەبینرێت کە ناوەکانی وەک زۆزان[173]، گەلالە، شارەگرد (شرگاط) و داسن کە ناوی کوردین، لە سەدەی یەکەمدا لە لایەن مار ماریەوە باسکراون و هەتاوەکو ئەمڕۆ ماون (Harrak, 2005).
بە گشتی ئاڵۆزی تێگەیشتن لە بنەچە و مێژووی کرسیتیانەکانی کوردستان و گۆڕینی ناسنامەیان لەلایەن هێزی دەرەکی بۆ مەبەستی سیاسی، هۆکارێکی ترە لە ئاڵۆزکردن، تێکدان و تێنەگەیشتن لە مێژووی کورد و کوردستان.

---

171. ئەم ناوە لە کوردیدا پێکهاتووە لە (پاکی+زا) کە مانای (وەچەی پاکی، لە پاکی پەیدابوو) دەدات.

172. ئەم ناوە ئەگەر (بێری) بێت لە کوردیدا مانای (مەڕدۆش) دەدات و ئەگەر (پیری) بێت، ئەوا مانای کەسێکی بە ساڵاچوو یان زانا دێت.

173. زۆزان لە کتێبەکەی مار ماریدا چەند جارێک ناوی هاتووە و ناوەکە لە کوردیدا مانای (کێوان، هەوارگەی کۆچەران) دەدات. ئەم ناوچەیە نێبن ئەسیر وچەندین سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامیش بە ناوچەیەکی کوردی ئاماژەیان پێ کردوە.

**١٠. کێشەی پروپاگەندەی نەتەوەکان بەرامبەر بە کورد**

پروپاگاندە هەمیشە ئامرازێک بووە کە داگیرکەران لە هەموو سەردەمێکدا بەکاریان هێناوە وەک بەشێک لە پرۆسەی سەپاندنی داگیرکردن و شکاندنی نەتەوەی دەگیراو و ناچارکردنی بە قبوڵکردنی داگیرکەر. سەرکردە و زانای هندی، گاندی، لە یەکێک لە وتیەکانیدا سەبارەت ئەو پرۆسەیە دەڵێت "سەرەتا وەلات دەخەن، دوایی گاڵتەت پێ دەکەن، .......". گاندی هەر لە خۆیەوە ئەوەی نەگوتووە، سەرچاوە مێژووییەکان پڕن لە پروپاگەندەی سەیر بەرامبەر بە کورد، بەشێوەیەک کە هەندێک جار هەر لە تێکستەکە خۆیدا بێ مانایی پروپاگەندەکان دەردەکەون. ئەگەر چاوێک بە تێکستە مێژووییەکاندا بخشێنرێت دەبینرێت کە بەپێی نزیک بوونەوە لە سەردەمی نوێ، پروپاگەندەکان ناشرینتر و توند تر دەبن و شێوەکانیان دەگۆڕێت. لە سەرەتای شارستانیەتی مێسۆپۆتامیاوە و لەو ڕۆژەوە کە نەتەوەکانی وەک ئەکەدی و ئاشوری و دوایی ئارامی ڕووی کردۆتە ناوچەی مێسۆپۆتامیا، کێبڕکێیەک لە نێوان دوو گروپی بە ڕەچەڵەک جیاواز دروست بووە. لە ئەنجامدا هەمیشە لە تێکستە ئەکەدی و ئاشوریەکاندا نەتەوە ڕەچەڵەکەکانی مێسۆپۆتامیا بە ناشرینی باسکراوە. بەهەمان شێوە سەرەڕای ئەوەی کە کاسی، هوری، مانی و میدی کە هەموویان لە ژێر ناوی گوت دا ئاماژەیان پێ کراوە، هەموویان خاوەنی شارستانیەتێکی دارێژراو بوون کە بە ڕوونی سەرچاوەکان پاڵپشتی لێ دەکەن، کەچی دەبینرێت تێسکتە بابلیە سامیەکان، ئەکەدی و ئاشوریەکان بە شێوەیەکی زۆر ناشرین ئاماژەیان بە گوتیەکان کردووە. دوایی لەگەڵ گۆڕانی ناوی نەتەوەکەدا هەمان ڕەفتار بەرامبەر کورد کراوە. تەنانەت لەگەڵ ئەوەی کە کورد خۆی هەتاوەکو سەدەی نۆیەمی زاینی خۆی بە سەرەتای شارستانیەت و لافاوەکەی نوحەوە بەستۆتەوە و خۆی بە سۆمەری زانیوە (بڕوانە سۆمەریەکان)، کەچی لە باسی ڕەچەڵەکی کورد دا نەتەوە نەیارەکانی کورد وەک بەشێک لەو پروپاگەندەیە چیرۆکێکیان داناوە گوایە حەزرەتی سلێمان بە دێو و درنجدا کەنیزەکی بۆ هێنراوە و لە ڕێگادا ئەو کەنیزەکانە لەگەڵ دێو و درنجەکان جووت بوون و کورد بەرەی ئەو کەنیزەکانەیە و واتە زۆڵە. فارسەکان هەقایەتێکی توزێک نەرم تریان بۆ کورد داناوە و دەڵێن کورد لەو کەسانە پەیدا بوون کە لە دەست زوحاکی زۆردار دەربازکراون و چوونەتە شاخەکان و لەوێ زیادیان کردووە و کوردیان پێکهێناوە.

کەسێکی وەک بیرۆسوس (بڕوانە میدەکان) کە خۆی کلدانی بووە، لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا، سەرەتای شارستانیەتی مێسۆپۆتامیا دەگەڕێنێتەوە بۆ مید/سۆمەریەکان و بێ پێچ و پەنا ئەو ڕاستیەی خستۆتە ڕوو. کەچی ئیبن وەحشیە کە خۆی هەر دیسان کلدانی بووە، سەرەڕای ئەوەی کە دەڵێت بە هۆی سەرقاڵی تەرجومەکردنی دوو کتێبی کوردی، بۆ ئەوەی کە مرۆڤایەتی سوودی لێ وەربگرێت، دواکەوتوە لە نوسین و بڵاوکردنەوەی یەکێک لە باشترین کتێبەکانی و دان بەوەشدا دەنێت کە کورد لە کلدانیەکان بەتواناتر بووە لە زانستی کشتوکاڵ و تایبەتمەندی ڕووەکدا، هەروەها باس لەوە دەکات کە کورد خاوەنی هەموو زانستەکان بووە، لە هەمان کاتدا دەڵێت کە کورد ئەو زانستانەی لە کلدانیەکانی وەرگرتووە. دەبینرێت ماوەی نێوان بیرۆسوس و ئیبن وەحشیە نزیکی هەزار و دوو سەد ساڵ بوو، لەو ماوەیەدا کلدانیەکان چیتر کورد/مید بە خاوەنی زانستەکان نازانن و خۆیان کردۆتە خاوەنی ڕەگی زانستەکان. کە لێرەدا گۆڕانی بۆچوونی کلدانیەکان نیشان دەدات. ئەوەی کە گومانی تێدا نیە ئەوەیە کە کێبڕکێ لە نێوان کورد و نەتەوە نوێکاندا بەردەوام بووە و ئەو کێبڕکێیە لە نووسینی شیعر و مێژوودا ڕەنگی داوەتەوە و زۆر مێژوونوسانی سەردەمی نوێش دەرکیان بەو ڕاستیەیان نەکردووە. ئیبن وەحشیە بە ڕوونی باسی کێبڕکێ دەکات لە نێوان کورد و کلدانیەکاندا لەسەر ئەوەی کە کورد خۆی بە خاوەنی زانست و شارستانیەتی سەرەتایی مێسۆپۆتامیا زانیوە (بڕوانە سۆمەریەکان). لەوانەیە کەسێکی وەک ئیبن وەحشیە کە زانا بووە و هەتاوەکو ڕادەیەک ڕاستگۆ بووبێت و زۆر شتی ناشرینی بەرامبەر بە کورد نەگووتبێت؛ دەبینرێت یاقوتی حەمەوی (١١٧٩ ز-١٢٢٩ ز) زۆر توندڕەوانە ئەو بۆچوونەی خستۆتە ڕوو. کاتێک کە دێتە شارەزوور، سەرەتا باس لەوە دەکات کە خەڵکی شارەزوور هەمووی کوردن و باسی زانایی و ژمارەی مامۆستا و شارەزایی و کارامەیی خەڵکی ئەو ناوچەیەی کوردستان دەکات کە چۆن زۆربەی قوتابخانە ئیسلامیەکان لەوان بوون و زۆرترین زانا لە جیهانی ئیسلامیدا لەو ناوچەیە بووە و قازی میسر و شام هەر لەوان بووە و هەر ئەوان حەڵاڵ و حەرامیان بۆ خەڵک دەسنیشان کردووە، لە هەمان کاتدا کوردی ئەو ناوچەیە بە دز لە قەڵەم دەدات و نەک

ئەوە بەڵکو دەڵێت هەندێک پێی وابووە کە ئایەتێک هەیە دەڵێت ("قرأ قوله تعالى: الأكراد: أشدُ كُفراً ونفاقاً فقيل له: إن الآية " الأعراب أشد كفراً ونفاقاً " التوبة: 97") ماناکەی دەبێتە " ئایەتی خوای گەورە دەخوێنێتەوە بە: "کوردەکان: کافرترین و دووڕووترینن" و پێی گوتراوە ئایەتەکە بریتیە لە "عەرەبەکان کافرترین و دووڕووترینن" (الحموي، ٢٠١٠، پ.٣/٦٩). دەبینرێت تەنانەت هەوڵ دراوە ئایەتی قورئان بگۆڕدرێت بۆ لەکەدارکردنی کورد. لێرەدا وا دەردەکەوێت کە حەمەوی کوردە نیشتەجێکانی بە زانا و دانا دانابێت و کوردە ڕەوەندەکانی بە خراپ باس کردبێت. بەڵام حەمەوی هیچ ڕوون کردنەوەیەک نادات و لەگەڵ ئەوەی کە زۆر بە تایبەت باسی زانا و دانایی خەڵکە دەکات لە هەمان کاتدا کورد بە خراپ باس دەکات و هیچ گونجانێک لە قسەکانیدا نیە. بەو جۆرە زۆر جار بێ بەڵگە ئەو بۆچوونە نەگەتیڤە بەسەر هەموو کورد دا سەپێنراوە.
کەسێکی وەکو ئەبو موسلمی خوراسانی کە یەکێک بوو لە کەسایەتیە کوردە بە تواناکان کە عەباسیەکان پشتیان پێ بەست بۆ خۆ بەهێزکردن، بەڵام هەر کە بەهێز بوون، کوشتیان و شاعیرێکی ئەو سەردەمەی عەباسیەکان یەکسەر جنێو بە باوباپیرە کوردەکەی ئەبو موسلمی خوراسانی دەدات و دەڵێت " ابا مجرم ما غير الله نعمه على عبده حتى يغيرها العبد أفي دولة المهدي حاولت غدر .ألا إن أهل الغدر آباؤك الكرد" ماناکەی دەبێتە (ئەی تاوانبار (ابا مجرم) خوا بەخشندەیی خۆی ناگۆڕێ بەرامبەر کۆیلەکەی ئەگەر کۆیلە خۆی نەیگۆڕێ ، لە دەوڵەتی مەهدیدا هەوڵی غەدرت دا کە غەدریش هەمیشە پیشەی باوباپیرە کوردەکانتە) (جکر خوین، ١٩٩٦، پ.١٣٨).
هەندێک کەس ڕاستگۆ تر بوون و ڕاستیەکانیان وەک خۆی خستۆتە ڕوو. ئەگەر سەرنجی کتێبەکەی ئەولیا چەلەبی (١٦١١ز-١٦٨٢ز) بدرێت (چەلەبی، ١٩٧٨)، دەبینرێت کە ئەو گەڕۆکە سەرەڕای ئەوەی کە بە یاوەری ئەو پاشا تورکە هاتووە کە بە سوپاوە هێرش دەکاتە سەر عەبداڵ خانی پاشای کورد و لەسەر تەختی پاشایی لای دەبات، بەڵام بەشێکی باشی کتێبەکەی تەنها بۆ زانایی و توانای ئەم پاشا کوردە تەرخان کردوە و دەڵێت کە شاعیرە، مۆسیقا ژەنە، فەرش چنە، پزیشکە و شارەزایی لە هەموو زانستەکانی وەک فەلسەفە، مێژوو، ئەدەب... هتد دا هەیە. بە گوتەی ئەولیا چەلەبی "خوای گەورە ئەوەندەی هۆش و زیرەکی و وریایی و زانایی و تێگەیشتنی داوە بەم پیاوە کە لە سەدان پیشە و هونەر و وەستاییدا کەسی ناگاتێ، جەمشیدێکە بۆ خۆی، ئەگەر تەواوی زانیارییەکانی ئەو لێرەدا باس بکەین دەبێتە کتێبێکی گەورە" (چەلەبی، ١٩٧٨، پ.١٢٤). چەلەبی هەندێک جار نەیتوانیوە ڕاستی زانایی ئەم پاشا کوردە و نەزانی پاشا تورکەکەی خۆی بشارێتەوە و بەراوردی توانای زمانەوانی نامە گۆڕینەوەکانیان بکات. کەچی ئەمڕۆ لە وڵاتی تورکیادا، بە شێوەیەکی داڕێژراو، دەوڵەتی تورکی هەموو هەوڵێک دەدات کە ناسنامەی کوردی و هەموو شتێکی کوردی لەکەدار و ناشرین بکات و هەوڵ دەدرێت کوردبوون بکرێتە شتێکی نەنگی.
یاخود بە درێژایی مێژوو دەیان سەرچاوەی ئیسلامی ئاماژەیان بەوە کردووە کە ئەو کەسەی حەزرەتی ئیبراهیمی سوتاند کورد بووە (بڕوانە بەشی سۆمەریەکان). کەچی بەپێی سەرچاوە ئاینی و مێژووییەکانیش حەزرەتی ئیبراهیم سەرەتا لە ناو نەتەوەکەی خۆیدا پێغەمبەرایەتی کردووە و ئەو کەسەشی کە بڕیاری سوتاندنی داوە، کە نەمرودە، هەر هاو نەتەوەی ئەو بووە و هەردووکیان کورد بوون. بەڵام دیسان کێبڕکێی نەتەوەیی نێوان کورد و نەتەوە نوێکان، هۆکاری سەرەکی ئەم دیاردەیە و هەمیشە لایەنە خراپەکە بۆ کورد بەجێهێڵراوە و بەشە باشەکەی لە کورد بزر کراوە. بەو جۆرە حەزرەتی ئیبراهیم کورد سوتاندوویەتی و ئەم پروپاگەندەیە لەلایەن چەندەها سەرچاوەی مێژوویی ئیسلامیدا دووبارە بووەتەوە بێ ئەوەی کە لە قورئان یان حەدیسدا ئاماژە بە شتی لەو جۆرە کرابێت.
کەسێکی وەک نیزامی گەنجەوی (١١٤١ ز- ١٢٠٩ ز) کە یەکێکە لە بەتواناترین شاعیری کورد و چەندین کاری نایابی ئەمڕۆ بە زمانی فارسی ماوەتەوە. وەک خەسرەو و شیرین، لەیل و مەجنون، ئەسکەندەرنامە، هتد. ئەم شاعیرە خۆی لە شیعرێکدا ئاماژە بە کورد بوونی خۆی دەکات و دەڵێت "مادر من رئيسه كرد بود" واتە "دایکم لە ئەشرافەکانی کورد بوو". هۆکاری ئاماژەنەکردن بە ڕەچەڵەکی باوکی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گەنجەوی لە تەمەنی منداڵیدا باوکی مردووە و دایکی و خاڵی بەخێویان کردووە. ئەگەر باوکیشی لە نەتەوەیەکی تر بووبێت، ئەو هەر لە منداڵیدا لەلای خاڵە کوردەکەی و دایکی بە خێو بووە و بێ گومان

پەروەردەی فەرهەنگێکی کوردی بووە. بەڵام ئەمڕۆ ئەم شاعیرە مەزنە کوردە بە شاعیری مێژوویی دەوڵەتی ئازەربایجان دادەنرێت و وێنەی لەسەر پارەی ئەو وڵاتە دانراوە (بڕوانە وێنەی ٣٤). بۆیە تورکە ئازەرییەکان هەوڵێکی زۆریان داوە و شیعرێکیان بۆ دروست کردووە بەو نیازەی بیکەنە تورک، لە هەمان کاتدا فارسەکان لەبەر ئەوەی کوردە ناوی ئێرانی لێ دەنێن. بەو جۆرە کورد کە خاوەنی ئەو زانایەیە، دەبێت لە دوورەوە سەیری کێشەی نێوان فارس و تورکە ئازەرییەکان بکات لەسەر ئەم شاعیرە مەزنە کوردە.
بە هەمان شێوە فیردەوسی لە شعیرەکانیدا کە سەر بە نەوەتەی فارس بووە و بە درێژایی مێژوو کێبڕکییان لەگەڵ میدە کوردەکاندا کردووە، بە خەستی هێرش دەکاتە سەر کورد و بە خراپ لە قەڵەمیان دەدا. هەندێک جار ئەم نەگونجاویە لە سەرچاوە مێژووییەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمی ئەوروپییەکانیشدا کە هاتوونەتە ناوچەکە لە ژێر کاریگەری ڕوانگەی ئەو نەتەوانەدا بۆ کورد، شتی نەگەتیڤی بێ مانایان سەبارەت بە کورد گوتووە. کەسێکی وەک ڕیچ (Rich, 1836) کە لە کتێبەکەیدا کوردی زۆر بە نایاب باس کردووە و بە خەڵکێکی زۆر باش لە قەڵەمی داون، بە نزیکی لە هەمان سەردەمدا کەسێکی وەک میلنگتن (Millingen, 1870) لە کتێبەکەیدا بە ناونیشانی "ژیانێکی کێوی لە ناو کوردەکاندا" (Wild Life among the Koords) کورد زۆرجار بە خراپ باس دەکات. ئایا دەکرێت هەمان نەتەوە لە هەمان سەردەمدا جارێک زۆر نایاب و خەڵکی باش و فریشتە بن و جارێکی تر زۆر خراپ و پیاو خراپ بن؟
ئەوروپییەکان لە ژێر کاریگەری نەتەوە نەیارەکانی کورد دا هەندێک جار بە مەبەست و هەندێک جار بێ مەبەست، ڕوخسارێکی شەڕانگێزیان داوە بە کورد و بەو جۆرە کورد وا پیشان دەدرێت کە هەمیشە هەر خەریکی شەڕ بووە و هیچی تر. زۆربەی سەرچاوە ئەوروپییەکان لایەنی فەرهەنگی کوردیان بە تەواوی پشتگوێ خستووە و زۆر جار کە سەرەتا دەست بە کتێبەکانیان دەکەن، دەستبەجێ دێنە سەر ئەو خاڵەی کە کورد جەنگاوەر بووە و هەر خەریکی شەڕ بووە. هەندێک جار کەسایەتیە کریستیانەکان کە هاتوون بۆ هاوکاریکردنی کریستیانەکانی کوردستان، کوردیان بە شێوەیەکی ناشرین نیشان داوە و کوردیان بە تاوانبار و پیاو کوژ لەقەڵەم داوە بەرامبەر کریستیانەکان. کەچی سەرچاوەی تر هەیە کە بۆ مەبەستی ئاینی نەهاتۆتە ناوچەکە، بە پێچەوانەوە دەڵێن خێلە کرسیتیانەکان کێوی ترین خەڵکی ئەو ناوچەیەن و کوردەکان لەوان بە نەرمتر لە قەڵەم دەدەن (بڕوانە کێشەی تێکەڵکردنی ناوی کریستیانەکانی کوردستان).
سەرەڕای ئەم هەموو نەگونجاویە کەس نەچووە باسێکی کەسایەتیە کوردەکان بکات کە نەک لە کوردستاندا بەڵکو لە هەموو جیهان و ڕۆژهەڵاتدا لە سەردەمی نوێ و دێریندا جێ دەستیان دیار بووە. بۆ نموونە خەڵکانی وەک ئیبن ئەسیر، ئەبو هیجای هەزەبانی، ئەلمستەوفی، نیزامی گەنجەوی، زریاب، ئیسحاقی موسڵی، ئەبو حەنیفەی دینەوەری، سورەوەردی، مەولانا خالد، بابا تایەری هەمەدانی، باڵولی ماهی، عیزی زەریر، سەلاحەدینی ئەیوبی، ئەبو فیدا، جەعفەری بەرمەکی، شەرەفخانی بدلیسی، ئەحمەد شەوقی، هتد.
کەس ناپرسێت و لێکۆڵینەوە ناکات کە چۆن فەیلەسوفێکی وەک سورەوەردی کورد خاوەنی ڕێچکەیەکی سۆفیگەری تایبەتە و کەمتر لە چل ساڵ ژیاوە، چۆن شارەزووری لە نزیکی سەدەی دوانزەهەمدا لە ناو کوردستاندا مێژووی فەلسەفەی نووسیوە کە هەتاوەکو ئەمڕۆ یەکێک لە باشترین کتێبە دێرینەکانە سەبارەت بە مێژووی فەلسەفە، چۆن ئەبو فیدا باشترین کتێبی جوگرافی داناوە کە یەکێکە لە باشترین سەرچاوە جوگرافیە ئیسلامیەکان، چۆن کتێبە مێژووییەکانی ئیبن ئەسیر ئەمڕۆ نایابترین سەرچاوەن بۆ مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کورد لە سەردەمی ئیسلامدا، چۆن لە کوردستاندا و لە ناوجەرگەی هەوراماندا تێکستی یۆنانی بدۆزرێتەوە و ڕێکەوتنامەی زەوی فرشتن لەوێ بدۆزرێتەوە، چۆن بە پێی ئیبن وەحشیە لە سەدەی نۆهەمی زاییندا چەندین کتێبی کوردی زانستی هەبووە و هەتاوەکو ئەو کاتەش کورد لە کشتوکاڵدا لە کلدانیە بابلیەکان بە تواناتر بووە، چۆن زریابی مۆسیقاناس هێندە کاریگەری مۆسیقای هەبووە لەسەر ئەندەلوسیەکان، چۆن کتێبەکەی ئیبن خەلەکان یەکێکە لە نایابترین سەرچاوە بۆ زانیاری سەبارەت کەسایەتیەکانی ڕۆژهەڵات، بۆ وەک یاقوتی حەمەوی دەڵێت شارەزووریەکان لە سوریا هەتاوەکو میسر قازی لەوان بووە و هەر ئەوان بڕیاری حەرام و حەڵاڵیان داوە، چۆن باڵولی ماهی هەتاوەکو ئەمڕۆ هێندە کاریگەری لەسەر نەتەوەکانی دراوسێی کورد هەیە، بەشێوەیەک کە بەسەرهات و و قسەکانی وەک داستانی لێهاتووە، چۆن شاعیر و پێشبینێکی وەک ئێل بەگی جاف نزیکی چوار سەد ساڵ لەمەوبەر لە شیعرەکانیدا

پێشبینی زۆر لە ڕووداوەکانی ئەمڕۆی کردووە، چۆن قوتابخانە ئاینیەکانی کوردستان هەتاوەکو سەدەی هەژدە و نۆزدەی زاینیش شوێنی خوێندنێکی بەرز بووە و چەندین کەسایەتی گرنگی دروست کردووە، چۆن جامی، بەسامی کورد، ئەحمەد شەوقی، مەعروف ڕسافی و یەشار کەمال کە هەموویان کوردن، بە زمانەکانی عەرەبی و فارسی تورکی نووسیویانە و کەسایەتیە گرنگەکانی هەر یەک لەو زمانانەن.
بۆ ئەوەی کە سروشتی پروپاگەندە و مێژووەکەی بەرامبەر بە کورد ڕوون بێتەوە، دەتوانرێت سەیری نموونەی زیندووی ئەمڕۆ بکرێت. لەم ڕۆژگارەدا ئەگەر مێژوونوسێک بچێتە وڵاتی تورکیا و زانیاری کەم بێت لەسەر ئەو وڵاتە و سەرچاوەی لێکۆڵینەوەکانی دەزگا ئەکادیمیەکانی ئەو وڵاتە بێت، ئەوا تورکەکان بەو کەسە دەڵێن تورکیا بە تەنها وڵاتی تورکە و لە ڕابردووشدا هەر وڵاتی تورک بووە و کورد بوونی نەبووە؛ لەوانەیە چەندین "بەڵگەنامە" بۆ ئەو مێژوونوسە بخەنە ڕوو. مێژوونوسەکەش ئەگەر کەسێکی ئاسایی بێت، لەوانەیە ئەوەی دەزگا ئەکادیمیەکانی تورکیا پێی ڕادەگەیەن، دەستبەجێ بیخاتە ناو کتێبەکەیەوە و بەوجۆرە مێژوونوسەکە مێژوویەک بۆ تورک تۆمار بکات. لە ڕابردووی دێریندا زۆرجار مێژووی ناوچەکە لەسەر ئەو بناغەیە تۆمارکراوە.
لە ڕاستیدا ئەم جۆرە هەوڵە بە درێژایی مێژوو دراوە. کاتێک کە ئەکەدیەکان گەیشتنە ناوچەی میسۆپۆتامیا، وورده ووردە پەیکەری پاشای خۆیان لەسەر شوێنەکان دروست دەکرد و دەیانوسیت مۆرکی خۆیان بدەن لە ناوچەکەی کە تازە داگیریان کردبوو. ئەوە لەلایەن ئاشوریەکان و دوایی لای بابلیە سامیەکانیش دووبارە بووەتەوە و ووردە ووردە بابلیە سامیەکان چەندین بەڵگەنامیەکان خستۆتە ڕوو سەبارەت بەوەی کە ئەوان خەڵکی ناوچەکە بوون و هەر ئەوانیش شارستانیەتی ناوچەکەیان دەست پێکردووە. دوایی کە فارسەکان بۆ ماوەیەک دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەوانیش هەمان کردوەیان کردووە و هەموو هەوڵێکیان سڕینەوەی فەرهەنگە ڕەسەنەکە بووە. دوای فارسەکان هەمان کردوەوە لەلایەن عەرەبەوە کراوە و ئەمجا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لەلایەن تورکەکانەوە هەمان کردوەوە کراوە. بەو جۆرە هەموو ئەم نەتەوە نوێیانە کە هاتوونەتە ناوچەکە وەک جۆرێک لە پروپاگەندە، کەمپەینی خۆیان دەست پێکردووە بۆ سڕینەوەی شوێنەواری نەتەوە ڕەسەنەکە کە کوردە و لەبری ئەوە مێژوویێکیان بۆ خۆیان تۆمارکردووە. ئەم پرۆسەیە هەتاوەکو ئەمڕۆ لەلایەن عەرەب و تورک وفارسەوە بەردەوامە و وای لێهاتووە کە هەندێک جار ئەوان کورد بە خەڵکێکی نامۆ سەیر دەکەن و هەر یەکەیان خۆی بە خاوەنی وڵاتی کورد دەزانێت و هەر یەکە ڕێگەی جیاوازی گرتۆتە بەر بۆ سڕینەوەی فەرهەنگی کوردی. تورکەکان هەتاوەکو ئەم دواییە کوردیان بە تورکی شاخاوی دەناسی، فارسەکان کورد بە خێڵی ئاری و ئێرانی دادەنێن و زۆر لە ئەکادیمیەکانیان کورد بە نەتەوە باس ناکەن، عەرەبەکان نوکتە لەسەر نەزانی کورد دەکەن و ئەگەر کەسێکیشیان تووڕە ببێت ئەوا بە کوردەکە دەڵێت بگەڕێوە بۆ ئێران.
مێژووی ئەم پروپاگەندەیە هێندە دێرین وبەردەوام و بەهێزە کە وایان لە کورد کردووە، خۆشی بکەوێتە ژێر کاریگەری ئەو کەمپەینانەوە و تا ڕادەیەک ئەو وێنە درۆیینەی کە سەبارەت کورد دروستکراوە، قبوڵی کردووە و لای بۆتە جۆرێک لە ڕاستی و کەس بڕوا ناکات کە کورد خاوەنی ڕابردوویەکی دێرین بێت. ئەم کردەوانە شتێکی نامۆ نیە بە مێژوو، بۆ نموونە ڕۆمەکان زۆربەی نەتەوەکانی دەرەوەی خۆیان بە نەزان سەیر کردووە و ئەگەر بۆ نموونە سەیری بۆچوونی ڕۆمە داگیرکەرەکانی بەریتانیای کۆن بکرێت، ئەوا دەبینرێت هەمان کردەوە سەبارەت بە خەڵکی ڕەسەنی بەریتانیا کراوە. بەڵام لە حاڵەتی کورد دا زۆر لەو پروپاگەندانە بوونەتە بەشێک لە مێژوو و ئەکادیمیەکان زۆر جار پرسیاریان لە ڕاستی و دروستی نەکردووە.
پروپاگەندەکان بۆ هەزاران ساڵە بەردەوامە و سەری لە لێکۆڵەری کورد خۆشی تێکداوە. کێشەکە لەوەدایە زۆر جار هەندێک لە مێژوونوسان ڕەچاوی ئەم خاڵەیان نەکردووە و بۆچوونی نەگەتیڤی بێ بناغەی مێژوویان وەک خۆی وەرگرتووە و خستوتویانەتە ناو لێکۆڵینەوە مێژووییەکانیانەوە. بەو جۆرە مێژووی کورد نەیتوانیوە لە پروپاگەندەی بێ مانا ڕزگاری ببێت. لە ئەنجامدا سەرەڕای ئەوەی کە هیچ نەتەوەیەک لە ڕۆژهەڵاتدا هێندەی کورد خاوەنی ڕابردووی دێرین و شکۆمەندی نیە، لە هەمان کاتدا هیچ نەتەوەیەک هێندەی کورد لە مێژوودا بە هەڵە باس نەکراوە و پروپاگەندەی جیاوازی بۆ دروست نەکراوە.

**١١. کێشەی دێرینیی میللەتی کورد و هەمەچەشنی نەتەوەکە**

دێرینی نەتەوەی کورد بووەتە ڕێگرێک لەبەردەم مێژوونوسان کە لە مێژووەکەی بگەن. لەبەر ئەوەی کە مێسۆپۆتامیا سەنتەرێکی شارستانیەت و گەشانەوەی ئابوری بووە، زۆر نەتەوە لە وڵاتانی دوورەوە بە مەبەستی داگیرکردن ڕوویان کردۆتە ناوچەکە. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە مێژوونوسان بتوانن نەتەوە نوێکانی وەک فارس، ئاشوری، عەرەب، تورک، هتد. بناسن، بەڵام مێژووی کورد بە لێڵی بمێنێتەوە بۆیان.
هەر یەک لەم نەتەوە نوێیانە کە هاتوونەتە مێسۆپۆتامیا، ویستویانە ئەم خاکە نوێیە بکەن بە وڵاتی خۆیان و ڕابردووی مێژوویی خۆیانی پێوە ببەستنەوە. بەو هۆیەوە مێژووی نوێی ئەوان ڕوونە و مێژووی نەتەوەی کورد کە لە هەمووی دێرینترە بزر کراوە.
یەکەم نەتەوە کە هەوڵی داگیرکردنی بەشێک لە کوردستانی دابێت، ئەکەدیەکان بوون. ئەوان لە ڕووی زمان و دابونەریتەوە لە کورد جیاواز بوون، دوای ئەوان ئاشوریەکان هاتن کە بە نزیکی هاوفەرهەنگی ئەکەدیەکان بوون و پەیوەندی زمانەوانیان لەگەڵیاندا هەبووە؛ دوای ئاشوریەکان فارسەکان بوون، ئەمجا یۆنانیەکان هاتن کە ئەوانیش ماوەیەک بەشێکی زۆری وڵاتی کوردیان داگیر کرد. دوای یۆنانیەکان ئەشکانیەکان (پارثەکان) بوونە داگیرکەری بەشێکی کوردستان و ئەمجا ڕۆمانەکان کە لە دوای سەدەکانی یەکەمی زاییینەوە زۆربەی کات بەشێکی باکوری کوردستانیان داگیرکردبوو، لە دوای ئەوان عەرەبەکان کە نزیکی هەزار و چوار سەد ساڵە پرۆسەی هاتنی عەرەبەکان بەردەوامە و دوای عەرەب تورکەکان هاتن.
لە ڕاستیدا داگیرکردنی وڵاتی کوردان لەلایەن تورک و عەرەب و فارسەکان بەردەوامە و ئەم نەتەوە نوێیانە بە هەموو جۆرێک هەوڵی گۆڕینی ناوی ناوچەکان و کۆنترۆڵکردنی وڵاتی کوردان دەدەن. هەتاوەکو ئەمڕۆش ئەم هەوڵە بەردەوامە و هەموو ڕێگەیەک بەکارهاتووە بۆ سڕینەوەی ئاسەواری کورد لە ناوچەکەدا. لەو ڕۆژەوە ئەم نەتەوانە هاتوونەتە ناوچەکە، هەر یەکە هەوڵی داوە کە مێژوویەک دروست بکات، کە ڕابردوویەکی دێرین و پڕ شکۆمەندی بۆ خۆی پێک بهێت و هەوڵی سڕینەوەی فەرهەنگ، مێژوو، زمان و ناوی شوێنەکانی داوە. هەر یەک لەم نەتەوانە لە سەردەمی دێرینەوە بەئارەزووی خۆی مێژووی بۆ ناوچەکە نووسیوەتەوە.
زوربەی ئەو مێژوونوسانەی کە خۆیان بە ڕەچەڵەک و مێژووی کوردەوە خەریک کردوە، بە ڕێژەیەکی زۆر متمانەیان کردۆتە سەر ناوی کورد لە کارەکانیاندا. ئەو ڕێچکەیە خۆی لە خۆیدا هەڵە نیە، بەڵام بە تەنها گەڕان بە دوای ناوی (کورد) دا، مێژوونوس تووشی سەرلێشێوان دەکات بە تایبەتی کە سروشتی هەمەچەشنی نەتەوەی کورد و ئاڵۆزی و دێرینی مێژووەکەی، وا دەکات کە ئەو کارە گرانتر بێت.
بە درێژایی مێژوو ئەگەر تەنها سەیری ناوی هەندێک لە کەسایەتیە کوردەکان بکرێت، ئەوا ئەو راستیە دەردەکەوێت. بۆ نموونە کاتێک کە سەیری ناوی پاشایەکی هەزمبانی دەکرێت :

**الهذباني الأمير الكبير الإمام العالم شرف الدين يعقوب بن محمد بن الحسن بن عيسى الكردي الموصلي**

لێرەدا ئەم ئەم میرە یەکەم خەڵکی موسڵە، دووەم هەزمبانیە، سێیەم کوردە. دەبینرێت سێ ناسنامەی خۆی لە ناوەکەیدا بەرجەستە کردووە. لە سەردەمی هاتنی ئیسلامدا زۆر لە کەسایەتیە کوردیەکان ئەوەیان کردووە، بەڵام مەرج نیە هەموو سەردەمێک هەزمبانیەکان پەیڕەوی هەمان سیستمی ناویان کردبێت، لەوانەشە کردبێتیان بەڵام بەڵگە بەدەستەوە نیە کە ئەوە بسەلمێنێت.
هەزاران ناوی لەو جۆرە لە سەردەمی ئیسلامیدا هەن و کەسایەتیەکان لە ڕێگای ناوەکانیانەوە ناسنامەی هەمەچەشنی خۆیان و لە هەمان کاتدا سروشتی ناسنامەی نەتەوەییان دەخەنە ڕوو. کێشەکە لەوەدایە کە لە دوای سەدەی شەشەمی پێش زاییینەوە، زۆربەی ئەو بەڵگە مێژووییانەی کە باسی ناوچەکە دەکەن و لەلایەن خەڵکی ناوچەکەوە نووسراون، زۆر کەمیان ماونەتەوە. ئەمڕۆ بە تەواوی متمانە دەکرێتە سەر بەڵگەنامە مێژووییەکان کە لەلایەن یۆنان و ڕۆمانەکانەوە نووسراون. چەندین بەڵگەنامە باس لە پاشای هەزمبانی (Adiabene) یەکان دەکات، بەڵام یۆنانیەکان ناسنامەی ئەو پاشایانەیان بە هەزمبانی لە قەڵەم داوە و هەندێک جار (هەزمبانی) بە نەتەوە لە قەڵەم دەدەن. واتە هەمان ئەو هەزمبانیەی کە یۆنانیەکان بە

Adiabene لە قەڵەمیان داون و لە سەردەمی ئیسلامیدا کورد بوون، یۆنانیەکان باس لە کوردبوونیان ناکەن و بە نەتەوەی هەزمبانیان لە قەڵەم دەدەن.
بە هەمان شێوە ئەوە لەگەڵ میدەکاندا کراوە؛ دەبینرێت سەرچاوە یۆنان و ڕۆمانەکان تەنها بە میدیان لە قەڵەم دەدەن، کەچی بابلیەکان میدەکانیان بە گووت لە قەڵەم داوە. دوای سەدەی سێهەمی زاینەوە لە سەرچاوە پەهلەوی و ئەرمەنیەکاندا مید و کورد لە تەک یەکدا ناوهێنراون، بێ ئەوەی کە ئەوە لە سەرچاوەی یۆنانی و ڕۆماندا بەدی بکرێت (بڕوانە میدەکان).
مێژوونوس ئەگەر دەرک بە دێرینی نەتەوەی کورد و سروشتی ئاڵۆز وفراوانی ڕابوردوی زاراوە و ناوی بنەماڵە حوکمڕانەکان نەکات، ئەوا توشی هەڵە دەبێت. هەر ئەم دەرک نەکردنەیە کە بووەتە هۆی ئەوەی کە زۆر لە ئەوروپیەکان کە لە سەدەی بیستەمدا بناغەی مێژووی نوێی کوردیان داناوە، تەنها بە دوای ناوی (کورد) دا بگەڕێن؛ ئەو جۆرە لێکۆڵینەوەیە ئەنجامێکی ئاڵۆزی بۆ ئەو مێژووە دروست کردوە. بە دڵنیایی هەزاران بەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی دەری دەخەن کە ئەم ڕێچکەیە بە تەواوی بووەتە هۆی لێڵ بوونی ڕابردووی مێسۆپۆتامیا و مێژووی ناوچەکە و لە دەرئەنجامدا مێژووی کوردی پێ شێوێنراوە.

### ١٢. کێشەی تۆمارکردنی ناوی خەڵک و ناوچەکان بەشێوەی جیاواز

هیچ ناوچەیەک هێندەی مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵیا دۆکیومێنتی نووسراوی دێرینی لێ بەجێ نەماوە. ئەم دۆکیومێنتانە هەندێکیان تەمەنیان بۆ زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. هەر یەکەشیان لەلایەن نەتەوە و گروپ و زاراوەی جیاواز نووسراون. هۆکاری نووسینیان بە زمانی جیاواز و لە لایەن خەڵکی جیاوازەوە بووتە هۆی ئەوەی کە هەندێک جار هەمان ناوچە بە چەندین جۆر ناوهێنرابێت و هەندێک جار ئەگەر ناوی خەڵک یان شوێنێک ماناکەی ڕوون بووبێت، ئەوا لەلایەن نەتەوە نوێکانەوە ناوەکان تەرجومەکراون.
جاری وا هەیە کە نەتەوەیەک یان گروپێکی نوێ هاتۆتە ناوچەکە و بووەتە دەسەڵاتدار، بە تەواوی ناوێکی نوێی لە شوێن و خەڵکەکە ناوە، بێ ئەوەی کە گۆڕانی ئەوتۆ لە پێکهاتەی خەڵکەکەدا ڕوویدابێت. لەبەر ئەوە ئەگەر بە نموونە ناوێکی وەک "هەزمبان" وەربگیرێت، دەبینرێت لە سەردەمی ئاشوریدا بە Ahazum ناو براوە، یۆنانیەکان کردویانەتە Adiabene و بە ئارامی کراوەتە (حدیاب) و سەرچاوە ئیسلامیەکان کردویانەتە (هدبان/هذبان) و کورد خۆی پێی دەڵێت (هەزمبان) (بڕوانە هەزمبانیەکان).
بەکارهێنانی ئەم ناوە بە شێوە جیاوازەکانی لە سەردەمی جیاوازدا، بووەتە هۆی ئەوەی کە مێژوونوسان دەرک بە پەیوەندی ناوەکانی ئەو دەوڵەتە نەکەن و وای لەقەڵەم بدەن کە دەوڵەتی (Adiabene) لە سەردەمی یۆنانیەکاندا کۆتایی پێهاتبێت و پەیوەندی نەبێت لەگەڵ دەوڵەتی هەزمبانیەکانی سەردەمی ئیسلامدا کە بە (هذبان) نوسیویانە. واتە دەرک بەو ڕاستیە نەکراوە کە هەموو ئەو ناوانە ئاماژەن بە هەمان دەوڵەت لەسەردەمی جیاواز و لەلایەن خەڵکی جیاوازەوە، لە بری ئەوە وەک دەوڵەتێکی نوێ مامەڵەی لەگەڵ کراوە.
بە هەمان شێوە ناوی "کورد" تێبینی دەکرێت لە سەرەتای مێژووی مێسۆپۆتامیاوە بە شێوەی جیاواز باسکراوە (بڕوانە ڕەچەڵەکی کورد)، بەڵام ,هەر لەبەر ئەو هۆکارانەی پێشتر ئاماژەی پێکرا ناوی ئەم نەتەوەیە بە شێوەکانی (گود، کوت، قوت، کورد، قاردو، کاردو، گۆرد، گورد، ....) باسکراوە و لە کاتێکدا کە نەتەوەی وەک بابلیەکان ناوی (گوت) یان بۆ ئاماژەکردن بە هەموو نەتەوە ناسامیە ڕەسەنەکانی مێسۆپۆتامیا بەکارهێناوە، یۆنان و ڕۆمەکان ئەوەیان نەکردووە و دیسان ئەوە بووەتە هۆی ئەوەی کە نەتوانرێت لە سایەی ڕەچاوکردنی ئەو ڕاستیەدا مێژووی کورد بنوسرێتەوە.
یان هەندێک جار ڕەچاوی ئەوە نەکراوە کە لە هەموو سەردەمێکدا زمانی جیاواز وەک زمانی سەرەکی نووسین بەکارهاتووە بێ ئەوەی کە خەڵکەکان گۆڕابێتن. ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی کە کاتێک گەڕۆکێک یان مێژوو نوسێک ڕووی کردۆتە ناوچەکە، ناوەکەیان بەو زمانە نووسیوە کە ئەو سەردەمە باو بووە بۆ نووسین و ئەنجامەکەشی ئەوە بووە کە ئەو ناوە بە هەڵە لەیەک بدرێتەوە، هەر تەنها لە بەر ئەوەی کە ئەو زمانە بەکارهاتووە وابزانرابێت کە ئەو خەڵکە هەمووی سەر بەو نەتەوەیە بن. ئەم دیاردەیە هەتاوەکو سەردەمی نوێش بەرچاو دەکەوێت. لە سەردەمی نوێدا کاتێک کە گەڕۆکێک هاتوتە کوردستان ئەگەر تورکی یان فارسی زانیبێت و پرسیاری شوێنەکانی لە خەڵکە کوردەکە کردبێت، بێ گومان ئەوان مەجبور

بوون کە بە فارسی یان تورکی وەڵامی بدنەوە و بەو جۆرە ناوی زۆر شوێن لە بەڵگەنامەکاندا بەو زمانە تۆمار کرداوە. بۆ نموونە لەبری (شاخ، چیا، کێو، کوڕ، هتد) ناوی (داغ) ی تورکی و (کوە) ی فارسی بەکاربێت و لەبری ناوی (شارەزور) بنووسن (شهرزور) کە بە هیچ شێوەیەک کورد پێی نەگووتووە (شهرزور)، بەڵکو گوتوویەتی (شارەزور) و چەندین حاڵەتی تری لەو جۆرە. لە سەردەمی برەوی دەسەڵاتی ئەشکانیەکاندا زۆر شوێن ناوی پەهلەوی لێنراوە، لەبەر ئەوەی کە زمانی فەرمی نووسین لە ناوچەکەدا بۆ چەند سەدەیەک پەهلەوی بووە، بۆیە زۆر لە ناوچە کوردیەکان لە بەڵگەنامە پەهلەویەکاندا ناوی پەهلەویان هەیە. بە هەمان شێوە ئەگەر یەکێک لە ڕابردووی نوێی تورکەکان نەزانێت، ئەوا وا دەزانێت زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی باکور تورکیە، سەرەڕای ئەوەی کە ناوە دێرینە کوردیەکانیان ماون، بەڵام لە بەڵگەنامە فەرمیەکانی ئەو وڵاتەدا هەموو ناوچەیەک ناوە تورکیە نوێکەی بۆ دانراوە.

تەنانەت ئەمڕۆ شارێکی وەک (سلێمانی) کە کورد هەمیشە هەر ئەو ناوەی بۆ بەکارهێناوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە باشوری کوردستان وەک بەشێک لە عیراق دانراوە، بۆیە ناوی (سليمانية Sulaymania) کە شێوە عەرەبیەکەیەتی، بووەتە ناوێکی نێودەوڵەتی بۆ ئەو شارە بێ ئەوەی کە خۆی لە بنەچەدا وا بێت. ئەمە لەم سەردەمەدا لەگەڵ ناوەکانی وەک ئامێدی/عمادية، ئاکرێ/عقرة، هەڵەبجە/حلبچە و هەزاران ناوی تردا ڕووی داوە. ئەم کێشەیە بۆ هەزاران ساڵە بووەتە هۆی ئەوەی کە مێژوو نوسان دەرک بەم ڕاستیە نەکەن و لەو ڕوانگەیەوە بڕیار بدەن کە کێ لە ناوچەکاندا ژیاوە.

نزیکی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر، زۆربەی ناوی شار و لادێکان بە زاراوە کوردیە جیاوازەکان بووە. لە سەردەمی دەرکەوتنی نەتەوە نوێکانەوە، ناوی شار و لادێکان هەوڵی گۆڕانیان دراوە. هەندێکیان بە جۆرێک ناوە بنەچە کوردیەکەی گۆڕاوە کە چیتر ناناسرێتەوە، هەندێکیان بە نیوەیی گۆڕاوە و هەندێکی تریان هەوڵی گۆڕانی دراوە، بەڵام ناوە کوردیەکە هەر ماوەتەوە. لە کاتێکدا ئەو ناوە نوێیانە لە بەڵگە نامە دێرینەکاندا تۆمارکراوە بۆ ناوی شوێنەکان، بەڵام زۆربەی جار خەڵکەکە ناوە کوردیەکەیان بەکارهێناوە.

ئەم پرۆسەیە لەلایەن ئەکەدی، ئاشوری، ئارامی، فارس، عەرەب و تورکەوە ئەنجام دراوە و هەتاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە. لە خوارەوە ناوی چەند شار و ناوچەیەک بە نموونە هێنراونەتەوە:

- ئازەربایجان: ئەم وڵاتە لە نزیکی ٣٣٤ پ.ز وە بەو ناوە دەناسرێت. نازانرێت پێش ئەو مێژووە ناوی چی بووە. کاتێک کە ئەلێکسەندەری مەقدونی ویستی فارسەکان بشکێنێت، یەکێک لە پاشا میدەکان کە ناوی (ئاتەرپاس) بووە و یۆنانیەکان بە Atropates نوسیویانە، هاوپەیمانی ئەسکەندەر بووە لە شکاندنی فارسەکاندا. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە فارس و میدەکان هەمیشە لە ناڕێکیدا بوون و میدەکان هەمیشە هەوڵی لابردنی دەسەڵاتی تازە گەورەبووی فارسەکانیان داوە. لە دوای ڕوخانی دەوڵەتی فارسەکان لە ٣٣٠ پ.ز لەلایەن ئەسکەندەرەوە، ناوچەی میدیای ئازەربایجان کە بەشێک لە وڵاتی مید خۆی بووە، درا بە (ئاتەرپاس) ی پاشای میدی کە حوکمڕانی بکات. بۆ پتەوکردنی هاوپەیمانێتیەکە، کچی (ئاتەرپاس) درا بە یەکێک لە سەرکردەکانی سوپای ئەلێکسەندەر. ئەلێکسەندەر هاوپەیمانیەکی دۆستانەی لەگەڵ ئاتەرپاسدا هێشتەوە و دوای مردنی ئەلێکسەندەر لە ٣٢٣ پ.ز دا، وڵاتی میدیا لە نێوان ئاتەرپاس و جەنەڕاڵێکی یۆنانیدا بە ناوی پیسۆن (Pithon) بەشکرا. بەشەکەی سەرەوە هەر بە ناوی میدیای ئاتەرپاسیان (Media Atropatene) مایەوە و ئەمڕۆ کراوەتە ئازەربایجان و بەشەکەی خوارەوە ناونرا میدیای گەورە (Media Major). هەرچەندە سەرەتا (ئاتەرپاس) ی میدی و ناوچەکەی وابەستەی دەسەڵاتی یۆنانی بوون، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم ئاتەرپاس ناوچەکەی بە تەواوی لە یۆنانیەکان سەربەخۆ کرد و نازناوی پاشای وەرگرتەوە (Gmirkin, 2006, p.153). ناوی پاشاکە میدیە و میدیەکان خوێندویانەتەوە بە (ئاترپات Atrpat) کە بە کوردی ئەمڕۆ دەبێتە (ئاتەرپاس/ئاگرپاس) واتە (پارێزگاری ئاگر). شایانی باسە وشەی (پاس) ی کوردی لە زمانی هیتیدا بریتی بووە لە pahš و لە زمانی میدیدا دەبێتە pat. لە زمانی میدیدا وشەی (ئاتەر/ئاگر) هەر وەک کوردیە و میدەکان بە atr نوسیویانە. هەر ناوی ئەم پاشا کوردە میدیە بوو کە ناوی (ئازربایجان) ی ئەمڕۆی لێ دروستکراوە. لەبەر ئەوەی کە ناوەکە پاشگری (یان ian) ی

کوردی/هوری وەرگرتووە کە بە مانای (وڵات، ناوچە) دێت. ناوەکە بە کوردی ئەمڕۆ پێک دێت لە (ئادر[174]+پاس+یان) و هەمووی دەبێتە (وڵاتی ئاگرپارێز) کە ناوی ئەو پاشا کوردەی پێ دراوە. بۆیە ناوەکە کە لە سەردەمی یۆنانەکاندا دروست بووە، بووەتە Atropatian ودوایی لە کاتی هاتنی ئیسلامدا بە کوردی و بەشێوەکانی (ئاگرپاسیان/ئاتەرپاسیان/ئادرپاسیان) خوێنراوەتەوە. لە زمانی عەرەبیدا کە هیچ مانایەکی نیە، ناوەکە کراوەتە (اذربیجان) و ئەمڕۆ ناوەکەی خۆی بزر کردووە و ئەم ناوە نوێیەی بۆ بەکاردەهێنرێت.

➢ ڕوباری دیژلە (دیجلە): لە هەموو سەردەمێکدا ناوی ئەم ڕووبارە کوردی بووە. لە سەردەمی هوریەکاندا بە arandzah (ئەرمند زێ) ناسرابوو، ئەمڕۆ ڕووبارێک هەیە بە ناوی زێی ئەلوەند/ئەلوەند زێ (aluandze) کە زێییەکی گەورە و سەرەکی پێکهاتەی ڕووباری دیجلەیە و بە شارۆچکەی خانەقینا تێدەپەڕێ و دەچێتە سەر دیجلە. دەبێت ئەوەش بزانرێت کە بە زمانی سۆمەری وشەی zubi مانای (زێ) دەدات لە کوردیدا. ئەمڕۆ بە هەڵە وا دەزانرێت کە ناوی ڕووباری دیژلە عەرەبیە، بەڵام ئەوە دوورە لە ڕاستی، لەبەر ئەوەی کە دوای سەردەمی هوریەکانیش لە چەند سەرچاوەیەکی یۆنانی پێش هاتن و بوونی عەرەب لە ناوچەکەدا ئاماژەیان پێ کردووە. پلینی لە سەدەی یەکەمی زاییندا، لە کتێبەکەیدا the natural history لە ئاماژەدا بە ڕووباری دیجلە دەڵێت "ڕووبارەکە لە سەرەتای دەستپێکردنی هاتنە خوارەوەیدا، هەرچەندە خاوە، ناوی Diglito ی هەیە. بەڵام دوایی کە ڕەوتی ڕووبارەکە خێرا دەبێت ناوی Tigris وەردەگرێت، کە لەبەر خێراییەکەی ئەو ناوەی پێ دراوە، ئەم وشەیە بە زمانی میدی مانای تیر دەدات" (Pliny, 1890, p.75). ئەمە دڵنیای دەکات کە ناوەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ماناکەی پەیوەندی بە خێراییەوە هەبووە. لەبەر ئەوەی کە پلینی دەڵێت "هەرچەندە خاوە بەڵام ناوی (دیژلیتۆ) ی هەیە". وەک پلینی ئامەژەی پێکرد، وشەی (tigr) بە زمانی میدی مانای (تیر) دەدات کە زۆر کەم گۆڕاوە لە کوردیدا، بەڵام یۆنانیەکان پیتی (س) دەخەنە دوای هەموو ناوێك بۆیە لای ئەوان کراوەتە Tigris. ئەم ناوە لەگەڵ ناوی (دیژلیتۆ) بەکارهاتوە بۆ ئاماژەکردن بەو ڕووبارە، بەو جۆرە ناوەکە لە دوو ناوچەی کوردستان دوو ناوی جیاوازی هەبووە و هەردوو ماناکەش پەیوەست بووە بە تیژیەوە. Tigris کە ناوە ئەورووپیەکەیەتی بنەچەکەی کوردی/میدیە و بە داخەوە گران دەبێت کە بتوانرێت ناوی (دیژلیتۆ) ی کوردی بە تەواوی ڕوونبکرێتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە وشەی (تیژ) لە سەرەتای وشەکەدا دەردەکەوێت و پێ دەچێت کە (تیژ لا) بێت. هەرچۆنێک بێت ئەمڕۆ هەردوو ناوەکەی ماون و لە ناو ئەورووپیەکاندا پێی دەڵێن Tigris و لە ڕۆژهەڵاتیشدا پێی دەگووترێت (دیجلە) کە هەردوو ناوەکە لەلایەن کوردەوە دانراوە.

➢ دەماوەند: ئەم شاخە دەکەوێتە نزیک شاری تارانی پایتەختی ئێرانی ئەمڕۆ. دیپلۆماتی بەریتانی جەیمس مۆریێ (James Justinian Morier 1780-1849) ئاماژە بەوە دەکات کە هەموو ساڵێک لە ٣١ ی مانگی هەشتدا لە دامێنی دەماوەند دا جەژنێک دەکرێت کە پێی دەگووترێت جەژنی کورد ( Eyd Courdi)[175] (Morier, 1818, p.357). لە ڕاستیدا وشەی (زەماوەند) لە کوردیدا پێک دێت لە (زاما/زاوا+وەند) و مانای (ئاهەنگی زاوا، شایی) دەدات و ناوەکە پشتگیری لە جەژنە مێژووییەکە دەکات. لە فارسیدا وشەی (زاما) ی کوردی دەکەنە (داماد)، بەڵام وشەی (دماوند) مانای نیە لە فارسیدا، تەنها ناوە کوردیەکە گۆڕدراوە و پیتی (ز) کراوە بە (د). ناوچەی دەماوەند لە مێژووی ڕابردوودا بەشێک لە وڵاتی میدەکان بووە و زیاتر ناوچەی کوردنشین بوون.

➢ ئەلبورز: زنجیرە چیایەکە لە وڵاتی ئێرانی ئەمڕۆدا و شاخی دەماوەند دەکەوێتە ناو ئەو زنجیرە چیایەوە. ئەم شاخە لە بنەڕەتدا ناوەکەی بریتی بووە لە Hara Berezaiti (هەرە بەرزایەتی) ناوەکە کوردیە و مانای (ئەوپەڕی بڵندی) دەدات و لە ئاڤێستاشدا هەر ناوە کوردیەکەی هەبووە (بڕوانە فەرهەنگی ئاڤێستا)،

---

[174]. ئەم وشەیە لە زاراوەی زازاکیدا دەبێتە (ئادر âdır).

[175]. دەبێت ئەوە بزانرێت کە جەیمس موریێ ناوی جەژنەکەی لە زمانی فارسیەوە وەرگرتووە بۆیە بە Eyd Courdi ناوی دەهێنێت ، دەنا کورد بە دڵنیایی خۆی بەو جەژنەی گوتووە (جەژنی کوردی) لەبەر ئەوەی کە فارس وشەی (عید) ی عەرەبی بەکاردەهێنێت و کورد هەمیشە وشەی کوردی ڕەسەنی (جەژن) بەکاردەهێنێت کە بنەچەکەی سۆمەریە و لای ئەوان بە ezen نووسراوە.

ناوەکە دوو گۆڕانی بە خۆیەوە بینیوە؛ بەشی (هەرە) لە ناوەکە لابراوە و لە کاتی هاتنی عەرەبەکاندا (ال) ی عەرەبی خراوەتە سەر. بەو جۆرە وشەی (بەرز) ی میدی/کوردی و ناوەکە کراوەتە (ئەلبورز) و ئەمڕۆ ناوە کوردیەکە بە تەواوی گۆڕاوە؛ ئەم ناوە نوێیەی بۆ دانراوە کە هیچ مانایەک نادات.

- بازیان: دەروازەیەکی سروشتی نێوان دوو شاخە کە دەکەوێتە پێش ناوچەی سلێمانیەوە. وشەی (باز) وشەیەکی سۆمەری و هوری وکوردیە. لە سۆمەریدا بەشێوەی bad نووسراوە و وەک کوردی مانای کراوەی هەیە و بە هوری بە baz نووسراوە؛ مانای چوونە ژوورەوە دەدات. ئاشوریەکان کە لە سەدەی نۆهەمی پێش زاییندا هاتن و کوردەکانیان لە دەروازەی بازیاندا شکاند، ناوی ئەو شوێنەیان بە (Babite) نووسیوە (Læssøe, 1963, p.134). ئاشوریەکان ناوە کوردیەکەیان تەرجومە کردووە بۆ زمانی خۆیان، لەبەر ئەوەی کە لە ئارامیدا، وشە و پاشگری کوردی (یان) دەبێتە (بیت) لە زمانی ئارامی و ئاشوریدا و وشەی (باز) ی هوری/کوردی دەبێتە (باب). هەرچەندە لە سەردەمی ئاشوریەکاندا هەوڵی گۆڕینی ئەو ناوە دراوە، بەڵام ناوە ڕەسەنەکە وەک خۆی هەتاوەکو ئەمڕۆ ماوەتەوە و (بابیت) نەماوە. بەپێی ئەوەی کە ناوەکە سۆمەری /هوری/ کوردیە، بۆیە لەوانەیە تەمەنی بۆ حەوت هەشت هەزار ساڵ بگەڕێتەوە.
- گەرمیان: ناوچەیەکی مێژوویی کوردستانە خانەقین و کفری و خورماتو و چەندین شار و شارۆچکەی تر دەگرێتەوە. لە بنەڕەتدا ناوەکە پێک دێت لە (گەرم+یان) کە لە کوردیدا مانای (ناوچە/دەڤەری گەرم) دەدات. وشەی (گڕ) لە کوردیدا مانای (ئاگر، کڵپە) دەدات و لە سۆمەریدا ĝir مانای کڵپە دەدات و gir/girra ناوی خوای ئاگرە، وشەی (ماە mah) لە سۆمەریدا مانای گەورەی هەیە و هەتاوەکو سەردەمی میدەکان و دوای هاتنی ئیسلامیش ئەو وشەیە لە کوردیدا مابوو و لە زمانی پەهلەویدا هەمان مانای هەیە. هەروەها لە سۆمەریدا gir-mah مانای تەنوری هەیە و ئەمڕۆ لە کوردیدا مانای (گەرمی) هەیە. پاشگری (یان) وشەیەکی هوری و کوردیە، مانای (خانوو، شوێن، ناوچە) دەدات. وەک لە ناوی (بازیان) دا باسکرا، وشەکە بەرامبەر وشەی (بیت) ی ئارامیە. ئارامیەکان لە کاتی هاتنیان بۆ ناوچەکە، زیاتر لە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر ناوی ناوچە کوردیەکەی گەرمیانیان نیوە تەرجومەکردووە بۆ (بیت جرمای/Bet Garmai) و دوایی عەرەبەکان کە لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا هاتنە عێراقی ئەمڕۆ، ئەو ناوەیان لە سەرچاوە ئارامیەکانەوە وەرگرتووە و ناوەکەیان کردە (باجرمی).
- کوردیان (Kordene): لای یۆنان وڕۆمەکان (کوردیان) بە (Gordene, Kordene, Corene) نووسراوە، بەڵام ئارامیەکان بەشێکی ناوەکەیان تەرجومە کردووە و کردویانەتە (بیت قاردو)، لەبەر ئەوەی کە ئەم ناوە لە دووبەش پێک دێت (کورد+یان). وەک باسکرا وشەی (یان) ی کوردی/هوری مانای (شوێن، وڵات، دەڤەر) و هەر هەمان مانای (ستان) دەدات، هیچ جیاوازیەکی مانایان نیە و هەردووکیان هەر هەمان مانا دەدەن . بە هەمان شێوە، وشەکانی گەرمیان و کوێستان هەردووکیان دوو ناون بۆ ئاماژە کردن بە دوو ناوچە. لە زمانی کوردیدا (کوردیان) و (کوردستان) هەر هەمان مانا دەدەن، بۆیە (کوێستان، گەرمیان) بە دوو پاشگری هەمان مانا و هەمان مەبەست بەکارهاتوون. ئەم ناوچەیە لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە و لە هەزارەی سێهەمی پێش زاییندا لە تێکستی سۆمەریەکاندا ناوی هاتووە بەشێوەی (خاکی کاردا ( Land of (Kurd)) (Driver, 1992,67) و بە (خاکی کاردا Land of Krad) ناو براوە. لە ئەرشیفی ماریدا بە (کورد Kurda) ناوهێنراوە و بە ووردی زۆر زانیاری سەبارەتی دراوە (Young, 1992). ئارامیەکان وەک ناوچەی گەرمیان ناوەکەیان تەرجومە کردوە و کردویانەتە (بیت کاردو/بیت قاردو). دوایی عەرەبەکان سەرەتا کە هاتنە ناوچەکە بە (بقردي، باقردي) ناویان دەهێنا. لە دواتردا ناوە کوردیەکە گۆڕدرا بە (جەزیرە) کە ناوێکی عەرەبیە و مەبەست لێی (دورگە) یە، لەبەر ئەوەی کە دەکەوێتە نێوان دوو ڕووبارەوە. بەو جۆرە ناوەکە بە تەواوی گۆڕاوە.
- سەری کانی: ناوی شارۆچکەیەکە لە کوردستانی ڕۆژئاوا. لە سەدەی بیستەمدا و دوای بە عەرەبکردنی ئەو وڵاتە، ناوەکە گۆڕاوە و تەرجومە کراوەتە عەرەبی بە (رأس العين). لە بنەڕەتدا ئەو شارە لەلایەن میتانیە هوریەکانەوە بە شێوەکانی wassukanni/washukanni ناوهێنراوە کە پایتەختیان بووە. بێرتمان (Bertman) ئەو شارە بە (تل فخردين) دەخەمڵێنێت (Bertman, 2005, p.31) کە دەکەوێتە نزیک ناوچەی (سەری کانی) ئەمڕۆ. هەردوو پێکهاتەی ناوەکە کە بریتیە لە

(wassu/washu+kanni)، لە بنەڕەتدا تێکەڵێکی وشەی سۆمەری/لوڤی/هیتی/لیدین. ئەم وشەیە لە زمانی سۆمەریدا بریتی بووە لە ašša، هیتی assu، لوڤی wasu و لیدی wiśśi کە مانای (باش/خاس) دەدا و بە شێوەکانی باش/وەش/خاس (uaš/bāš/xās) لە کوردی نوێدا ماوە. بەشی دووهەمی وشەکە کە بریتیە لە kanni لە وشە لێکدراوە هیتیەکانی پەیوەست بە مانای (کانی) کوردیدا دەردەکەوێت. واتە لە کوردی کۆندا بریتی بووە لە (خاسە/وەشە/خۆشە کانی). ئەوەی کە ئەو ڕاستیە دووپات دەکاتەوە ئەوەیە کە سەرچاوەیەکی ئاوی گەورە لەو ناوەدا هەیە و دەڕژێتە ڕووباری خاپورەوە. لەگەڵ کاتدا کورد ناوەکەی کردۆتە (سەری کانی) کە ئەویش پێکهاتووە لە (سەر+کانی) و هەردووکیان وشەی کوردی/هوری/هیتی/میدین. لەبەر ئەوەی کە هەموو ماناکانی وشەی (سەر) لە زمانەکانی میدی/هیتی/کوریدا ماون (بڕوانە فەرهەنگی سۆمەری، هوری، هیتی، لوڤی، میدی، لیدی). ناوە نوێکەی کە هەر تەرجومەی ناوە کوردیەکەیە، لەلایەن حکومەتی وڵاتی سوریاوە دانراوە بە مەبەستی بەعەرەبکردنی ناوچە کوردیەکان و گۆڕینی ناوە کوردیە ڕەسەنەکەی.

➢ کەژی یاری Kašyari: ئەم شاخە لەلایەن ئاشوربانیپاڵی دوو، پاشای ئاشوریەکانەوە لە ساڵی ٨٧٩ پ.ز دا لە یەکێک لە هێرشەکانیدا ناو هێنراوە بە Kašyari کە ناوێکی هوریە و ماناکەی لە کوردیدا دەبێتە (کەژی یاری)، بەپێی ئەوەی کە لە کوردیدا مانای وشەی (یار) دەبێتە (ناوی خوا لای یارسانەکان، خۆشەویست، ڕەگی (یاریدان) کە مانای هاوکاریە و لە زمانی هیتی و لوڤیشدا ئەو مانایەی ماوە). لەبەر ئەوە لە کوردیدا دەشێ مانای (چیای خودا، چیای خۆشەویستی، چیای هاوکاری) بدات، چیاکە دەکەوێتە ناوچەی نەسیبین. ئارامیەکان کە لە دوای ئاشوریەکان ڕوویان کردۆتە ناوچەکە، ناوە کوردی/هوریەیان گۆڕیوە بۆ ( تورو دعیزلو) سەرچاوە ئینگلیزیەکان بە Mt.Izla (شاخی عیزلە) ناوی دەبەن (Johnson, 2004, p. 6). بە داخەوە ناوە کوردی/هوریەکە بە تەواوی گۆڕاوە و چیتر ئەو ناوەی نەماوە.

جگە لەو ناوانەی کە ئاماژەیان پێکرا، لە هەر چوار پارچەکەی کوردستاندا و لە سەدەی بیستەمدا ئەم پرۆسەیە بەردەوامە. لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بە تایبەتی شارۆچکە و گوندەکانی باکوری کوردستان (کوردستانی تورکیا) و ڕۆژئاوای کوردستان (کوردستانی سوریا) بە تەواوی ناوەکانیان گۆڕاون و هەزاران گوند، شارۆچکە و ناوچەی کوردی، ناوی تورکی و عەرەبیان بۆ داناون و تا ڕادەیەکیش لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ئێران) و باشوری کوردستان (کوردستانی عێراق) دا هەمان کردەوە کراوە، بەڵام بەرێژەیەکی کەمتر ئەنجامدراوە. ئەمرۆ هەزاران گوند و شارۆچکەی کوردستان ناوی نوێی سەپێنراوی بۆ دانراوە. زۆربەی ئەو گوندانەی کە ناوەکەیان وەک خۆیان ماوە و نەتوانراوە بگۆڕدرێن، بنەچەی ناوە کوردیە ڕەسەنەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ زمانی سۆمەری، هوری، هیتی، میدی، لوڤی، ئاڤێستا، هتد. و هێشتا هەمان مانای زمانە دێرینەکەشیان ماوە.

جیاواز تۆمارکردنی ناوی خەڵک و شوێنەکان و هەوڵدانی گۆڕینیان لە سەردەمی جیاواز و بە مەبەستی جیاواز، هۆکارێکی ترە کە بووەتە ڕێگر لەبەردەم تێگەیشتن لە مێژووی کورد و کوردستان.

# بەشی ٥
# کورتەیەکی گێڕانەوەی مێژووی کورد لە سەرەتای شارستانیەتەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ

**سەرەتایەک**

بەڵگە ئارکیۆلۆژیەکان نیشانی دەدەن کە سەرەتای شارستانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان دەستی پێکردووە. چەندین شوێنەواری گرنگ لە کوردستاندا دۆزراونەتەوە کە سەرەتای شارستانی مرۆڤ نیشان دەدەن. بۆ نموونە دێیەکی وەک چەرمو کە تەمەنی نزیکی ٩٠٠٠ ساڵە، یەکێکە لە گوندە سەرەتاییەکانی نیشتەجێبوونی مرۆڤ و لە ناو پاشماوەکانیدا دوو جۆر گەنم و جۆرێک جۆ دۆزراوەتەوە. لەوەش گرنگتر، ئەو ئاسەوارانەی کە لە "گرێ ناڤۆکێ "Girê Navokê ( Gobelki Tepe) لە باکوری کوردستاندا لە نزیک شاری ئورفە دۆزراوەتەوە، بووەتە مایەی مشتومڕێکی زۆر، لەبەر ئەوەی کە لە ناو ئاسەواراکاندا کاری هەڵکۆڵینی زۆر نایاب لەسەر پایەی گەورەی یەکپارچەی بەرد ئەنجام دراوە (بڕوانە وێنەی ٣٥ و ٣٦). گرنگی کارە هونەریەکە لەوەدایە کە تەمەنی ئەو شوێنەوارە نزیکی ١٢٠٠٠ ساڵە و ئەو کاتە کەلوپەلی کانزایی لە ئارادا نەبووە، بۆیە نازانرێت چۆن ئەو کارە نایابە هونەریانە ئەنجام دراون. ئەوە کۆنترین شوێنەوارە لە جیهاندا کە ئەوپەڕی توانای داهێنانی مرۆڤ نیشان بدات و کۆنترین شوێنە کە بیر و بڕوایەکی ئاینی و کۆمەڵایەتی ئاڵۆز و فەرهەنگێکی داڕێژراوی ڕوون نیشان بدات.

(وێنەی ٣٥ و ٣٦) دوو وێنەی شارستانیەتی "گرێ ناڤۆکێ "Girê Navokê
(Göbekli Tepe) کە تەمەنی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکی ١٢٠٠٠ ساڵ.

بە داخەوە بەهۆی هەلومەرجی کوردستانەوە هەتاوەکو ئێستا کاری ئەوتۆ لە ناوچە جیاوازەکاندا نەکراوە. سەرەڕای ئەوەش ئەو شوێنەوارانەی کە دۆزراونەتەوە هەموویان ئەوە دەسەلمێنن کە کوردستان شوێنی سەرەتای شارستانی مرۆڤایەتی بووە لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا. لای سۆمەریەکان، لە تەورات و قورئان و زۆر لە تێکستە کریستیانەکاندا، بەشێوەی جیاواز ئاماژە بە هەندێک ناوچەی کوردستان بە تایبەتی ناوچەی شاخی جودی و سەرەتای دەستپێکردنەوەی ژیان کراوە و لە ناو گروپە دێرینەکاندا ئەو ڕاستیە ئارکیلۆژیە، لە ناو چیرۆکەکانیاندا دەربڕاوە. هەروەها دەبینرێت کە هەموو سەرچاوە مێژوویی و ئاینیەکان لافاوەکەی نوح دەگەڕێننەوە بۆ شاخی (جودی) کە دەکەوێتە کوردستانی باکورەوە (بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٤).

لەبەر ئەوەی کە شوێنەوارەکانی خوارووی مێسۆپۆتامیا تەمەنیان لە حەوت هەزار ساڵ تێ ناپەڕێت و ئەوانەی کوردستان تەمەنیان چەندهەزار ساڵێک دێرینترن، ڕاشکاوانە دەتوانرێت مەزندە بکرێت کە سەرەتای شارستانیەکە لە ناوجەرگەی کوردستانەوە دەستی پێکردووە و دوایی بەرەو خواروی مێسۆپۆتامیا ڕۆشتووە و بە خۆرهەڵاتدا بڵاوبوەتەوە.

(نەخشەی ژمارە ١٤) ناوچەکانی چەرمو، جودی و گرە ناڤۆکی.

بێ گومان هەموو شارستانیەتێکی ئاڵۆز، پێویستی بە زمانێکی داڕێژراو هەیە بۆ دەربڕین. بەو پێیەی کە کۆنترین تێکستی نوسراوی جیهان سۆمەریە، کە ئەویش شێوەیەکە لە کوردی کۆن، هەموو ئەو شارستانیانە بە زمانی کوردی و لەلایەن کوردەوە لە ناوچەکەدا دەستپێکراون[176].

[176]. ئەوەی کە جێی سەرسوڕمانە ئەولیا چەلەبی لە باسی کورد دا هەمان بۆچوون دەخاتە ڕوو و دەڵێت "بە قسەی مەقدیسی، لە دوای تۆفانی نوح یەکەم شوێن شاری جودی ئاوەدان کراوەتەوە، دوای ئەو قەڵای شەنگار و سێیەم مەیفاریقینە. بەڵام خاوەنی شاری جودی کە کوردوم شایە و ئۆمەتی نوح بووە، شەش سەد ساڵ ژیاوە و بە نێو هەموو کوردستاندا گەڕاوە، کە گەیشتۆتە مەیفارقین ئاوو هەواکەی زۆر چۆتە دڵیەوە و تییدا نیشتەجێ بووە، کوڕ و کوڕەزا و نەوەی زۆر بوون، ئەم خەڵکە لە خۆیانەوە زمانێکیان

کوردەکان نزیکی حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەر، دوای ئەوەی کە سەرەتای شارستانیەتیان لە ناوچە شاخاویەکاندا دامەزراند، وورده وورده هەندێکیان ڕوویان کردۆتە دەشتایی و زەویە نزمەکان، کە ژینگەکەی بۆ کشتوکاڵ ئاسانتر و دەرفەتی بەرفراوانبوون زیاتر بووە. لەبەر ئەوەی کە لە ناوچە شاخاویەکاندا ئەگەرچی کشتوکاڵ کراوە و سوود لە بەروبومەکەی بینراوە، بەڵام بەهۆی سەختی ئەو ژینگەیەوە توانای زیادکردنی بەرهەم سنووردار بووە. بێگومان داکشان بەرەو ناوچەکانی باشور دەرفەتی زیادکردنی بەرهەمهێنانی داوە.
لەگەڵ زیادکردنی بەرهەمهێناندا توانای ئابووری بەهێز بووە و باج کۆکردنەوە زیادی کردوە و توانراوە دەسەڵات بەهێز بکرێت. لەگەڵ بەهێز بوونی دەسەڵاتیشدا ئاینەکان ئاڵۆزتر بوون و کەسایەتی ئاینی و چەندین پلە و پایەی جیاواز هاتوونەتە کایەوە. لە هەمان کاتدا خەڵکانی تایبەتمەندی پیشەیی و هونەری وەک بەیکەرتاش و مۆسیقا ژەن دروست بووە و چینەکانی کۆمەڵگە بە تەواوی دەرکوتوون. بۆیە سۆمەریەکان کە هەر کورد بوون، لەکاتێکدا کە سیستەمێکی کشتوکاڵیی داڕێژراویان هەبوو، لەهەمان کاتدا خاوەنی مۆسیقا و ئەدەبێکی داڕێژراو بوون و ڕێکخراوێکی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتیان لە ناوچەکانی خواروی مێسۆپۆتامیادا پێک هێنا.
سۆمەریەکان سەرەتای شارە دەوڵەت (City State) یان لە خواروی مێسۆپۆتامیدا دامەزراند، وەک بەردەوامی دانێک بەو شارستانیەی کە لە ناوچە شاخاویەکاندا پێشتر دامەزرابوو. لە دەوروبەری ٣٤٠٠ پ.ز دا سۆمەریەکان بۆ یەکەم جار نووسینیان داهێنا و بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نووسین هاتە کایەوە و یەکێک لە زاراوەکانی زمانی کوردی نووسرا کە زمانی سۆمەریە. یەکەم تێکست لە مێژوودا لەشاری ئوروک (Uruk) دۆزراوەتەوە (Van de Mieroop, 2004, p.28). داهێنانی نووسین گەورەترین شۆڕش بوو لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کە تێیدا بۆ یەکەمجار مرۆڤ توانی ئەو ئەزموونەی هەیەتی بە نووسین تۆماری بکات. نووسین سەرەتا تەنها شتی زۆر سادە بووە و زیاتر پێکهاتبوو لە سەمبوڵ بۆ بەیاد هێنانەوەی حساباتێکی سادە، کە بە مەبەستی تۆمارکردن و دەستنیشانکردنی ناو یان شوێنی حسابەکە و برەکەی بوو، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا نووسینووردتر و ئاڵۆزتر دەبوو و زانیاری زیاتری دەخستە ڕوو.
سۆمەریەکان کۆمەڵێک شاریان لە خواروی مێسۆپۆتامیادا دامەزراند و ئەم شارانە جۆرێک لە کێبڕکێ لە نێوانیاندا بووە و لە ئەنجامی ئەو کێبڕکێیەدا هەر جارە و دەسەڵاتی پاشای گەورە دەچووە دەست شارێک. زۆربەی ئەو دەسەڵاتە لە شارەکانی دەوروبەری بابل بوو وەک ئور (Ur)، ئوروک (Uruk) و کش (Kish). هەندێک جار دەسەڵات دەچووە ناوچەکانی خۆرهەڵات وەک شارەکانی ئاوان (Awan) و لە باکور هەمازی (Hamazi) و لە ڕۆژئاوادا ماری (Mari) و چەندین شاری تر. کوردەکان ئەو سەردەمە هەر لە باشوردا نەبوون بەڵکو زۆربەی خۆرهەڵاتی ناوەراست لە ژێر ناوی جیاواز و زاراوەی جیاوازی زمانی کوردیدا قسەیان کردووە. هەتاوەکو هەزارەی سێهەمی پێش زایین هەموو زاگرۆس و مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆڵ هەمووی بە زاراوە جیاوازەکانی کوردی قسەیان کردووە کە ئەمڕۆ بە هوری و لوڤی و سۆمەری و لولوبی و هتد ناسراون.
هەندێک لە نازناوە سۆمەریە/کوردیەکان لە لای سەرجۆنی ئەکەدی و دوایی هەتا سەردەمی ئاشوریەکانیش بەردەوام بووە و بە شێوەی (شەر کشاتی šar kiššati[177]) دەنووسرا (Clark, 1913, p.55). هەمان ناو

داهێنا کە نە عەرەبی و نە فارسی و نەعیبری و نە دەریە، ئەمڕۆ بەو زمانە دەڵێن کوردی و لە کوردستاندا بەکار دەهێنرێ (چەلەبی، ١٩٧٨،پ.٩٠). لەوێدا دەردەکەوێت کە بە ڕوونی ئەولیا چەلەبی ئەو ڕاستیە مێژوویییەی لە کورد وەرگرتووە کە هەتاوەکو ئەو کاتە ئەو ڕووداوەی بە شێوەیەکی سادە و دەماودەم هێشتووتەوە و بۆچوونەکە کتومت ڕەنگدانەوەی ڕاستیەکی مێژوویی و ئارکیلۆژیە و لەگەڵ چیرۆکە سۆمەریەکاندا دەگونجێت (بڕوانە سۆمەریەکان).
[177]. ئەم ناوە کتومت مانای (سەر گشتی) واتە (پاشای گشت/سەرکردەی گشت) ی داوە و هەتاوەکو ئەمڕۆ هەمان مانای ماوە. لە سەرچاوە جیاوازەکاندا بە هەردوو شێوەی (شار کشاتی/سار کساتی) دەنووسرێت. هەردوو وشەکە لە بنەرەتدا سۆمەری و کوردین.

لەلای هیتیەکانیش بەکار دەهات (Malamat, 1988, p.211) کە لە کوردی نوێدا دەبێتە (سەر گشتی) و هەر هەمان مانای (سەرکردە/پادشای هەموو) دەدات و چەندین نازناوی تر بەو شێوەیە بەکاردەهاتن.
سۆمەری و هەموو گرووپە ڕەسەنەکانی وەک هوریەکان بناغەی شارستانیەتی مێسۆپۆتامیایان دانا و زۆر لەو زانیانەی کە هەتاوەکو ئەمڕۆش سوودی لێ وەردەگیرێت، سەرچاوەکەی هەر بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە و کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لەسەر ئاین و هونەر و نووسین و مۆسیقای نەتەوەکانی دەوروبەریان. بە هەمان شێوە کاریگەری فەرهەنگ و زمانی ئەوان، ڕۆژهەلات و ئەوروپاشی گرتۆتەوە؛ هەر بۆیەش وشە سۆمەری/هوری/لوفی/میدی/لیدی/کوردیەکان، هەتاوەکو ئەمڕۆ لە زمانە هیندۆئەوروپیەکاندا ماون.

## هاتنی ئەکەدیەکان

سۆمەریەکان، هەتاوەکو هاتنی یەکەم نەتەوەی سامی لە ژێر ناوی ئەکەدیدا، تاکە دەسەلات بوون لە ناوەڕاست و خواروی مێسۆپۆتامیادا. ئەکەدیەکان نەتەوەیەک بوون کە لە کۆتایی هەزارەی سێهەمی پێش زایینیدا هاتن و یەکەم داگیرکەری بێگانە بوون کە ڕوویان کردۆتە ناوچەکە. ئەکەدیەکان دەیانویست لە ڕێگای جەنگ و توند و تیژیەوە دەسەلاتی خۆیان بەهێز بکەن و سیستەمی ناوچەکەیان بەرە و قۆرخکردن و بە سەنتڕالکردنی دەسەلات دەبرد؛ خەریک بوون فەرهەنگ و سیستەمێکی نوێی حوکمڕانیان دەهێنایە ئەو ناوچەیەوە.
نازانرێت سەرەتا ئەکەدیەکان لە کوێوە هاتبنە مێسۆپۆتامیا، بەلام بەپێی ئەو تێکستە بابلیانەی کە سەبارەت ئەکەدیەکان نووسراوە، ئەوان بە هێزێکی بێگانە و نامۆ لە قەلەم دەدەن کە هاتوونەتە ناوچەکە (Lewy, 1970, p.735). وا دەردەکەوێت کە لە هەزارەی سێهەمەوە هاتبن، لەبەر ئەوەی کە ئەوان بە زمانێکی سامی قسەیان کردووە و زمانەکەیان پەیوەندی بە زمانی میسری کۆنەوە هەیە؛ دەشێت کە بنەچەکەیان لە نزیک میسرەوە هاتبێت. هەروەها سەنتەری دەسەلاتی ئەکەدیەکان هەرچەندە نازانرێت لە کوێ بووە، بەلام سەرچاوە مێژووییەکان وا نیشان دەدەن کە لە باکور بووە؛ هەندێک سەرچاوە سەنتەری ئەو دەسەلاتە بە نزیک شاری بەغدای ئەمڕۆ دادەنێت (Van De Mieroop, 2007, p.64). سەرەتا سەرجۆن ئەو بنەماڵەیەی لە شاری کش (Kish) وە دەستپێکرد و وورده وورده دەوڵەتێکی بەهێزی دامەزراند کە ناوچەکە پێشتر بە خۆیەوە نەبینی بوو. هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە ئەکەدیەکان ویستیان سیستەمی حوکمڕانی بە تەواوی بگۆڕن و زیاتر لە سەنتەردا قۆرخی بکەن و دەسەلاتی پاشاکانی تر کەم بکەنەوە. چیتر دەسەلاتداری شارە دەوڵەتەکانیان (City state) بە پاشا سەیر نەدەکرد، بەڵکو تەنها بە دەسەلاتدارێکی ژێر دەسەلاتی خۆیان سەیریان دەکردن و نازناوێکی بچووکتریان بۆ دانابوون و بە ensi ناویان دەهێنان.
لەگەڵ هاتنی ئەکەدیەکاندا، سەرەتای دەستپێکردنی کێبڕکێی نێوان دوو نەتەوە دەستی پێکرد کە لە ڕووی فەرهەنگ و زمانەوە جیاواز بوون و ئەم کێبڕکێ و جیاوازیە فەرهەنگیە هەتاوەکو ئەم سەردەمەش بە شێوەیەک هەر بەردەوامە. جیاوازیەکی زۆر هەبوو لە نێوان نەتەوە سامیەکانی وەک (ئەکەدی، کلدانی، ئاشوری) بەرامبەر (گوتی، سۆمەری، هیتی، هوری). ئەو جیاوازیە بە شێوەیەکی زەق لە سیستەمی حوکمڕانی و لە مەڕ ڕۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵگەدا بە ڕوونی بەدی دەکرا (بڕوانە ئافرەت لە مێژووی کورد و کوردستاندا). سەرەڕای ئەو جیاوازیە، ئەکەدیەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا کەوتنبوونە ژێر کاریگەری فەرهەنگ و زمانی سۆمەریەوە، بۆیە هەرچەندە زمانی ئەکەدی بۆ نوسینی کاروباری بەڕێوەبردن بەکار دەهات بەلام ئاین و ئەدەب هەر بە زمانی سۆمەری مایەوە و لە ناو دەستەواژە ئەکەدیەکاندا زۆر وشەی سۆمەری بەکاردەهێنرا کە هەتاوەکو ئەمڕۆش هەر لە کوردیدا ماوە.
هاتنی ئەکەدیەکان دژایەتیەکی زۆر دەکرا و لەبەر نامۆیی دەسەلاتیان بە فەرهەنگی ناوچەکە هەر زوو زوو لە ناوچە جیاجیاکانی مێسۆپۆتامیادا دەسەلاتدارێک هەلدەستا لە دژیان و لەلایەن حوکمڕانەکانی ناوچەکەوە ئەو هەولانە پشتگیری زۆر دەکرا (Van De Mieroop, 2007, p.64). ئەوان باجێکی زۆریان خستبووە سەر شارەکانی مێسۆپۆتامیا و دەیانویست دەسەلاتی قۆرخکردووی سەنتەر، بەو باجە زۆرە بەهێز بکەن.
سەرجۆن (٢٣٧٠ پ.ز- ٢٣١٥ پ.ز) کە دامەزرێنەری دەسەلاتی ئەکەدیەکان بوو، لە ساڵی ٢٣٥٠ پ.ز دا وەک یەکەم پاشای ئەکەدی زۆربەی ناوچەکەی داگیر کرد (Gates, 2003, p.52)، بەلام ئەم

داگیرکردنە وا نەبوو کە هەموو ناوچەکەیان بە تەواوی لە ژێر دەستدا بێت، بەڵکو داگیرکردنەکە بریتی بوو لە سەپاندنی باج و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی پاشاکانی تر بە ئاڕاستەی بەهێزکردنی خۆیان. بۆیە بۆ هێشتنەوەی ئەو حاڵەتە نا ئاساییە و ڕاگرتنی لەو بارەدا، سەرجۆن و پاشا ئەکەدیەکانی دوای ئەویش، لە سەردەمی حوکمڕانیاندا دەبوو چەندین شەڕ بەرپا بکەن لە پێناوی هێشتنەوەی دەسەڵاتە نامۆکەیان کە خەڵکی ناوچەکە پێیان قبوڵ نەدەکرا. هەر زوو زوو ژمارەیەک لە پاشای ناوچەکە یەکیان دەگرت و دەیانویست خۆیان لە دەستی باج و دەسەڵاتی ئەکەدیەکان ئازاد بکەن.

لە ڕاستەوە (وێنەی ٣٧) پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی دەربەند گاورە/قەرەداخ. (وێنەی ٣٨) پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی ئانوبانینی پاشای لۆلۆبی لە سەرپێڵی زەهاو. ( وێنەی ٣٩) پەیکەری نارام سین، مۆزەخانەی لۆڤەر.

پاش مردنی سەرجۆن دوو کوڕەکەی بە ناوەکانی ریموش و مان- ئیشتوشو حکومڕانیان گرتە دەست. هیچیان وێنەی نارام سین کە لە دوای مان- ئیشتوشو هات دەسەڵاتدار و بەهێز نەبوون. نارام سین یەکەم پاشای ئەکەدی بوو کە خۆی بردە ئاستی خوا. ئەم پاشایە هەوڵی زۆری دا کە ناوچەی ژێر دەسەڵاتی بە ئاڕاستەی خۆرهەڵات و باکور بەرفراوان بکات و هێرشی کردە سەر ناوچەرگەی کوردستانی ئەمڕۆ و بەرەو زاموا دەسەڵاتی فراوان دەکرد کە ناوچەکانی ئەمڕۆی شاری سلێمانی و شارەزووری دەگرتەوە و ئەو کاتە لۆلۆبیەکانی تێدا بوو. ئەو شوێنانەی کە دەسەلاتی نارام سینی پێ گەیشتبوو، هیچ پاشایەکی ئەکەدی پێشتر دەسەڵاتی بەو ڕادەیە نەڕۆشتبوو، بۆیە پەیکەرێکی بۆ یادەوەری و بەرزڕاگرتنی ئەو سەرکەوتنە بۆ خۆی هەڵکەند[178]؛ ئەوە یەکەمجار بوو کە پاشایەکی ئەکەدی بگاتە ئەو ناوچەیە. ئەو سەرکەوتنە

[178]. پەیکەرێک ئەمڕۆ لە دەربەند گاورە لە نزیک قۆپی قەراخ ماوە (بڕوانە وێنەی ٣٧) زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەم پەیکەرە هەر هەمان پەیکەری نارام سین بێت، بەڵام ئەو بۆچوونە لە سەردەمێکی کۆندا دانراوە و بەڵگەکان ئەو بۆچوونە بەدرۆ دەخەنەوە. لە ڕاستیدا پەیکەری نارام سین لە مۆزەخانەی لۆڤەرە و دەتوانرێت بەراورد بکرێت. جیاوازیەکی ڕوون هەیە لە نێوان پەیکەرەکەی قۆپی قەراخ و پەیکەرەکەی مۆزەخانەی لۆڤەر. جگە لەوە ئەگەر تێبینی پەیکەری ئانوبانینی (Anubanini) پاشای لولوبی بکرێت (بڕوانە وێنەی ٣٨) کە لە ناوچەی سەرپێڵی زەهاوە، دەبینرێت شێوەی جلوبەرگ و کڵاوەکەی لە پەیکەرە هەڵکەندراوەکەی قەراخ دەچێت. پەیکەرەکەی قەراخ پەیوەندی بە نارام سینەوە نیە و جلوبەرگی پەیکەرەکەی پاشای دەربەند گاورە زیاتر لە جلوبەرگی پاشای سۆمەری، گودیا (Gudea) دەچێت. پۆستگەیت و د.ڕاوف کاری زۆریان لەسەر پەیکەرەکانی کوردستان کردووە و بەراوردی ووردیان کردووە لە نێوان ئەو پەیکەرانەدا و پێیان وایە کە شێوەی کڵاوەکەی پەیکەرەکەی پاشای

دەسکەوتێکی گەورە بوو بۆ نارام سین، سەرەڕای ئەوە ئەم پاشایە بە ئاسانی ئەو توند وتیژیەی بۆ نەدەچووە سەر. هەر لە سەردەمی ئەودا گەورەترین هەڵگەڕانەوە ڕوویدا و زۆربەی ناوچەکە لە دژی هەستان. تەنانەت لە یەکێک لە گرنگترین و مەترسیدارترین شەڕەکاندا، ١٨ دەسەڵاتداری جیاواز یەکیان گرت بۆ شکاندنی نارام سین، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون (Chavalas, 2006, p.30).

دوای نارام سین، شەر کاڵی شەری šar Kali šari[179] (٢٢٢٣ پ.ز- ٢١٩٨ پ.ز) دوایەمین پاشای ئەکەدی بوو لەبەر ئەوەی کە لە هەموو لایەکەوە هێرش دەکرایە سەر ناوچەکە و دەبوو جەنگ لەگەڵ عاموریە سامیەکان بکات کە لە ڕۆژئاواوە دەهاتن و گوتیەکان کە لە خۆرهەڵاتەوە هێرشیان دەبرد و ئیلامیەکان کە لە باشورەوە دەهاتن، تا لە کۆتاییدا بە دەستی گوتیەکان کۆتایی بە دەسەڵاتی ئەکەدیەکان هات. گوتیەکان کە دانیشتووی خۆرهەڵاتی بابل بوون، بەشێکی زۆری مێسۆپۆتامیایان خستە ژێر دەستی خۆیان و دوای ڕووخانی ئەکەدیەکان، پایتەختەکەشیان کە(ئەگاد) بوو، ڕۆڵە سیاسیەکەی لە دەستدا و هەتاوەکو ئەمڕۆ نەدۆزراوەتەوە (Arnold, 2004, p.27).

گەرچی ئەکەدیەکان دەسەڵاتیان نەما بەڵام دوای خۆیان مۆدێلێکی نوێی حوکمڕانیان لە مێسۆپۆتامیا بە جێهێشت کە بریتی بوو لە قۆرخکردنی دەسەڵات لە سەنتەردا و بەرفراوانکردنی قەڵەمڕەوی دەوڵەت.

## گوتیەکان

سەرچاوە مێژووییەکان زۆر نا ڕوونن سەبارەت بە گوتیەکان. بە دڵنیایی گوتیەکان هاو زمان بوون لەگەڵ سۆمەریەکان و هەر بە شێوەی دوو زاراوەی جیاوازی کوردی قسەیان کردووە. جیاوازی ئەو دوو گروپە، وەک جیاوازی کوردی شاخ و کوردی نیشتەجێی تەختایی بووە کە هەتاوەکو سەردەمی نوێ ئەو جیاوازیە لە نێوان کوردی نیشتەجێ و کوردی ڕەوەند دا هەر هەبووە و سەرچاوەکانیش لە هەموو سەردەمێکدا ئاماژەیان پێکردووە (بڕوانە کورد و ڕەچەڵەکی کورد). پێش گوتیەکان، ئەکەدیەکان ناوچەکەیان بە تەواوی خستبووە حاڵەتی جەنگەوە و هاتنی گوتیەکانیش بەشێک بوو لە هێرشی کۆمەڵێک گروپی جیاواز بۆ ناوچەکە. نەتەوە سامیەکان لە ڕۆژئاواوە بە ژمارەی زۆر ڕوویان کردبووە ناوچەکە و لە خوارووی خۆرهەڵاتدا ئیلامیەکان بە هەمان شێوە کۆمەڵێک هێرشی زۆریان بۆ دەکرد. بە گشتی مێسۆپۆتامیا بە سەردەمێکی ناهەموار و شپرزەدا دەڕۆیشت، بۆیە گوتیەکان هاتنە سەر مێسۆپۆتامیایەکی ناجێگیر و پڕ لە کێشە. گوتیەکان خۆیان خەڵکی ڕەسەنی ڕۆژهەڵاتی مێسۆپۆتامیا بوون و لە ڕووی زمانەوە زاراوەیەکی کوردی نزیک زاراوەی سۆمەری قسەیان کردووە.

---

دەربەند گاورە، وا دەردەکەوێت هی سەردەمی گودیای پاشای سۆمەری بێت (Postgate and D.Roaf, 1997, p.152). جگە لەوەش لە سەرووی ئەو پەیکەرە و لەسەر لوتکەی شاخی قەرەداخ قەڵایەک ماوە؛ وا پێ دەچێت کە هەر قەڵای لولوبیەکان بووبێت و پەیکەرەکەش هی یەکێک لە پاشاکانی ئەو ناوچەیە بێت, پەیکەرەکەی دەربەند گاورە لە نێوان دۆڵێکی تەنگدایە و بە دەگمەن خەڵک ڕێی تێ دەکەوێت، لەبەر ئەوە زۆر زەحمەتە کە نارام سین بیری لەوە کردبێتەوە کە لە دۆڵێکی شاراوەدا پەیکەری بۆ هەڵبکەنرێت کە ناوچەی خۆی نەبووە. هەروەها ئەو تەنها لە هێرشێکدا دەستی بەو ناوە گەیشتوە، دەنا ئەکەدیەکان هەرگیز نەگەڕاونەتەوە ئەو ناوچەیە. بەڵام بە هەڵە ئەورووپیەکان لە سەدەی ڕابردوودا، لەبەر ئەوەی کە نارام سین ناسراو بووە، بەویان دەستنیشان کردووە و دەستنیشانکردنەکەش لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە نەکراوە، بەڵکو تەنها ناوهێنانێکی لاوەکی بووە. پەیکەری نارام سین لە بنەڕەتدا وەک پەیکەرێک لە ناوچەی بابلی کۆن هەڵگیراوە و ئیلامیەکان لە پەلاماری بابلدا وەک دەسکەوتی شەڕ بردویانە و لە شاری سوسەی پایتەختی ئیلامیەکان مابووەوە. لەوێ دوای هەزاران ساڵ، شوێنەوارناسی فەرەنسی، جاک دی مۆرگان، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا دۆزیەوە و بردی بۆ فەرەنسا و ئەمڕۆ لە مۆزەخانەی لۆڤەرە (Gates, 2003, p.53) (بڕوانە وێنەی ٣٩).

[179]. (شەر کەڵی شەری šar kali šari) ماناکەی دەبێتە ((سەر کەڵی سەران (پاشای پاشاکان) (Sasso, 1995, p.836). ئەگەر ناوەکە کوردی ئەمڕۆ بوایە بە شێوەی (سەر کەڵی سەران sar kali sar an) دەنووسرا، کە دەبینرێت زمان و فەرهەنگی کوردی هێندە زاڵ بووە، هەندێک جار ناوەکانیان هەتاوەکو ئەمڕۆ بە نزیکی هەمان مانا دەدات. لە ناو هوری و هیتیەکانیشدا (شەران šaran) بە مانای (سەران/پاشاکان) هاتووە. ئەکەدیەکان ناوە کوردیەکەیان وەرگرتووە بێ ئامرازی کۆی کوردی (ان) کە سۆمەریەکان بە ene نووسیویانە.

سۆمەریەکان هاتنی گوتیەکانیان بە جۆرێک لە سزای خوایی دەزانی بۆ ئەکەدیەکان کە ناوچەکەیان تێک دابوو؛ بە دووریش نازانرێت هەر بە هاندانی ئەوان هاتبێتن. سۆمەریەکان بە تایبەت دژی نارام سین بوون. لە یەکێک لە تێکستە سۆمەریەکانی بابلدا، کە وا دەردەکەوێت لە سەردەمی بوژانەوەی سۆمەریەکاندا نووسرابێت، دوای ئەوەی کە وەسفی سەرجۆن دەکات، بەهۆی پشتگیری کردنی لە خوای ئینلیل لە ناپور، باس لەوە دەکات کە نارام سین ئەو کارەی سەرجۆنی نەکردووە و پەلاماری پەرستگەی خوای ئینلیلی داوە و بە تەواوی ڕوخاندویەتی. لە ئەنجامدا ئینلیل گوتیەکانی ناردووە، وەک سزایەک بۆ نارام سین و کۆتایی بە بنەماڵەی ئەکەدیەکان هێناوە. هەروەها تێکستەکە هەموو دەسەڵاتدارەکان ئاگادار دەکاتەوە کە نابێت هیچیان هیچ خوایەک پەسەند بکەن بەسەر خوای ئینلیلدا (Arnold, 2004, p.27). کە دیارە خوداوەندەکان لەو سەردەمەدا بەشێک بوون لە فەرهەنگ و ناسنامەی ناوچەکان و ڕوخاندنی پەرستگە و سوکایەتیرکردن بە خوا ناوچەییەکان وەک هەمان سوکایەتیکردنە بە زمان و فەرهەنگی گەلێکی ئەم سەردەمە. ئەو سەردەمە خواکان جگە لەوەی کە ڕۆڵی ئاینیان هەبوو، بەشێک بوون لە ناسنامەی هەر کام لەو گروپانە.
هەرچەندە هیچ بەڵگەیەکی نووسین لە گوتیەکان دەرنەکەوتووە، بەڵام ئەو هەموو بەڵگە زمانەوانیانەی کە لە زمانی مانیەکان و میدەکاندا هەیە دەریدەخەن کە زمانەکەیان هەر دیالێکتێکی کوردی بووە. بۆیە لە سەدەکانی دواییدا لەلایەن بابلیەکانەوە میدی و مانی بە هەمان نەتەوە سەیر کراون و لە ڕاستیدا هەموویان تێکەڵکراون (بڕوانە کورد و ڕەچەڵەکی کورد). لەوە دەچێت کە هۆکاری بەجێ نەمانی تێکسی گووتی، بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەوان زمانی سۆمەریان بە زمانی خۆیان زانیبێت. جیاوازیەکەش هێندە نەبووبێت کە وەک زمانێکی جیاواز سەیری بکەن؛ بۆیە هەر ئەو زمانەیان بۆ کاروباریان بەکارهێناوە.
یەکێک لە پاشای گوتیەکان ناوی igigi بووە کە وا دەردەکەوێت دوو بارە بوونەوەی وشەی igi سۆمەری بێت، کە بە مانای (یەکی) کوردی دێت و بە زمانی سۆمەری و کوردی مانای (تایبەت و خەسڵەتی باشی) هەیە. دەبینرێت کە ئەمڕۆ بە کوردی دەگووترێت یەکی یەکی (yekiyeki)، وشەکە مانای کەسێکی دانسقە و نایاب دەدات. وا دەردەکەوێت کە لە زمانی گوتیەکاندا هەر بەو مەبەستە بەکارهاتبێت.
گووتیەکان لەبەر ئەوەی کە حوکمڕانی شاخاوی بوون و شاخیش دەرفەتی بەرفراوانی حوکمڕانی نەدەدا و شێوەی حوکمڕانی جیاواز بوو لە دەشت، بۆیە کە مێسۆپۆتامیایان گرت، لە سەرەتادا تەنها یەک پاشایان نەبوو، بەڵکو پاشای جیاواز حوکمی دەکرد و هێشتا ئاشنای چۆنێتی حوکمڕانی ناوچەی تەختایی نەبوون، کە لە ڕووی بەڕێوەبردنەوە زۆر لە کۆمەڵگەی شاخەکان ئاڵۆزتر بوو. گوتیەکان بۆ ماوەی نزیکی ١٠٠ ساڵێک حوکمیان گرتە دەست لە نێوان (٢١٨٠پ.ز- ٢٠٧٠پ.ز)، کەچی شتێکی ئەوتۆ سەبارەت ووردەکاری حوکمڕانیان نازانرێت کە لەلایەن خۆیانەوە نووسرابێت، بەڵام بە گشتی بڕوا دەکرێت کە ژمارەیەک پاشایان حوکمڕانی مێسۆپۆتامیایان کردووە.
هەر شان بە شانی هاتنی گوتیەکان و لە ناوەڕاستی سەدەی بیست و یەکی پێش زاییندا، سۆمەریەکان وورده وورده بوژانەوەیەکی فەرهەنگی و سیاسیان بە خۆیانەوە دەبینی و دیسان دەسەڵاتی سیاسی و فەرهەنگیان خستەوە دەست خۆیان و سەردەمێکی نوێی سۆمەری هاتە ئاراوە کە ئەمڕۆ مێژوو نوسان ناوی بوژانەوەی سۆمەریەکان (Sumerian Renaissance) یان لێ ناوە. بە دڵنیایی سۆمەریەکان و گوتیەکان هەردووکیان لە هەمان نەتەوە بوون، بۆیە هەر لە هەمان کاتی هاتنی گوتیەکاندا سۆمەریەکان لە خوارووی مێسۆپۆتامیادا ئەو پەڕی بوژانەوەیان بە خۆیانەوە دەبینی. بۆ نموونە گودیا (Gudea) (٢١٤١پ.ز-٢١٢٢ پ.ز) لە لاگەش (Lagash) دەوڵەتێکی بەهێزی دەست پێکردەوە و چەندین کاری ئەدەبی مێژوویی لەو سەردەمەدا نووسراون و هەتاوەکو ئەمڕۆ گەورەترین تێکستی سۆمەری کە دۆزرابێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئەو پاشایە (Arnold, 2004, p.29).

دوای گودیا چەند پاشایەک لە ناوچەی جیاوازی باشوری مێسۆپۆتامیادا دەسەڵاتیان فراوانبوو و هەتاوەکو ئوتو هێگەل (utu-hegal) ی پاشای شاری ئوروک لە جەنگێکدا پاشای گوتی، تیگران (Tigran)[180] ی شکاند و گوتیەکانی لە خواروی مێسۆپۆتامیادا دەرکرد؛ بەو جۆرە قوناغی بوژانەوەی سۆمەریەکان بەردەوام بوو هەتاوەکو نزیکی ١٩٤٠ پ.ز. دەرکردنی گوتیەکان تەنها بریتی بوو لە کزکردنی دەسەڵاتیان لە ناوچەکانی خواروودا، دەنا بە درێژایی ڕۆژهەڵاتی شاری بابل هەتاوەکو باکور هەر بەدەست خۆیانەوە مابووەوە.

مێسۆپۆتامیا بە گشتی پێکهاتبوو لە دوو بەشی دەسەڵاتی سەرەکی؛ یەکێک لە باکور و ئەوی تریان لە باشور. ئەوەی باشور زۆربەی کات بەدەست سۆمەریەوە بوو، بەڵام ئەوەی باکور و خۆرهەڵات هوریەکان و گووتیەکان بەسەریدا زاڵ بوون. هوریەکان خاوەن شارستانیەتێکی داڕێژراو بوون و ئەوانیش هاوشێوەی سۆمەریەکان خاوەنی زۆر داهێنان بوون؛ هونەر، نووسین، ئایین، مۆسیقا، هتد. لای هوریەکان لە ئاستێکی بەرزدا بوو. کۆنترین نوتەی مۆسیقا لە مێژوودا دەگەڕێتەوە بۆ هوریەکان و ئەمڕۆ چەند هەوڵێک دراوە بۆ خوێندنەوەی ئەو مۆسیقایانە و تەنانەت تۆمارکردنی لەسەر ئامێری دەنگی. شاری هوریەکان لە شوێنی هەمەجۆری باکوری مێسۆپۆتامیا و سوریا و ئەناتۆڵدا بوون. چەندین تێکست لە شاری نوزی (کەرکوکی ئیمڕۆ) و چەند شارێکی تری سوریا و باکوری کوردستاندا دۆزراونەتەوە کە ئاستی ئاڵۆزی و داڕێژراوی کۆمەڵگەی هوریەکان دەردەخات لە ڕووی تۆمارکردن و یاسا و مامەڵەکردن لەگەل کڕین و فرۆشتندا.

لەوپەڕی بەهێزیاندا، هوریەکان هەتاوەکو نزیکی میسر دەسەڵاتیان دەڕۆیشت. لە کاتێکدا کە لە خوارەوە سۆمەریەکان دەسەڵاتیان بەرەو کزی دەڕۆیشت، هوریەکان لە ژێر سەرکردایەتی یەکێک لە ناوچە هوریەکاندا بە ناوی میتانی؛ لەوە دەچێت دوایی هەر ئەمان بناغەی میدیەکانیان دانابێت، دەسەڵاتیان گەشانەوەی بە خۆیەوە دەبینی و زۆربەی ناوچەکەیان خستبووە ژێر دەسەڵاتی خۆیان. ئەمان تەنها هێزی ڕێگر بوون لە بەردەم فراوانبوونی دەسەڵاتی میسریەکان بەرەو باکور.

سەردەمانێک میتانیە هوریەکان گەورەترین ڕۆڵیان دەبینی و بوو بوونە بەهێزترین دەسەڵات و ناوچەکەیان خستبووە ژێر ڕکێفی خۆیان. هاوسێی هوریەکان هیتیەکان بوون کە لە ناوچەکانی ئەنەتۆلیا و سوریای ئەمڕۆدا بوون. ئەم دوو گروپە، بە تایبەتی هوریەکان کە لە هیتیەکان کۆنتر بوون، دەسەڵاتیان بەسەر ئەو ناوچانەدا کێشا بوو. هوریەکان لە ژێر دەسەڵاتی میتانیەکاندا زۆربەی ناوچەکەیان خستە ژێر دەستی خۆیان بەڵام دەسەڵاتی هیتیەکان سنووری بۆ هوریەکان دانا و وورده وورده هیتیەکان بەهێز دەبوون و دەبوونە مایەی هەڕەشە بۆ هوریەکان، لە ئەنجامدا ئەمان بوونە بەهێزترین دەوڵەت لە باکوری مێسۆپۆتامیا و ئەناتۆلیا. لە ساڵی ١٥٩٥ پ.ز دا هیتیەکان پەلاماری بابلیان دا و کۆتاییان بە حوکمی عاموریەکان هێنا کە لە دوای کۆتایی هێنان بە قوناغی بوژانەوەی سۆمەیەکانەوە، لە نزیکی سەدەی نۆزدەهەمی پێش زاینەوە حوکمڕانی بابلیان دەکرد. عاموریەکان (Amorites) لە بنەچەدا خێڵی سامی بوون کە لە ڕۆژئاواوە هاتبوونە ناوچەکە و دەسەڵاتیان لە باشوری مێسۆپۆتامیادا گرتبووە دەست و لەگەڵ کاتدا فشار دەخرایە سەر سۆمەریەکان و لە سەریشەوە هەمان فشار لەلایەن خێڵە ئارامیەکانەوە لەسەر هوریەکان بەردەوام بوو.

دەسەڵاتی بابل لە کزیدا بوو و لە ئەنجامدا دەسەڵات لەو ناوچە گرنگەدا بۆشایی تێکەوتبوو. ئەم کەلێنە لەلایەن گروپێکی نوێوە بە ناوی کاسیەکان پڕکرایەوە کە لە خۆرهەڵات هاتبون. کاسیەکان هەلی بۆشایی دەسەڵاتیان لە بابل بە دەرفەت زانی و بابلیان لە نزیکی ١٥١٠ پ.ز دا گرتە دەست و بۆ نزیکی سێ سەد ساڵ حوکمڕانی ناوچەکەیان کرد. کاسیەکان خۆیان لە سەدەی هەژدەهەمی پێش زایینەوە لە خۆرهەڵاتەوە هاتبوون، لەبەر ئەوەی کە هەتاوەکو ئەمڕۆ شتێکی ئەوتۆ سەبارەت زمانەکەیان ڕوون نەبووەتەوە. هەندێک جار خەڵکانێکی وەک مانیەکان کە بە زمانێکی نزیک لە کوردی ئەمڕۆ قسەیان کردووە (بڕوانە مانیەکان)،

---

[180]. وشەی tigr لە زمانی میدیدا مانای (تیر) دەدات. بە پێی ئەوەی کە میدەکان ئامرازی بەکۆکردنیان وەک کوردی ئەمڕۆ بووە و بریتی بووە لە (ان)، وشەی tigran بە زمانی میدی مانای (تیرەکان) دەدات کە بە دوور نازانرێت هەر ئەوە مانای ناوی پاشا گوتیەکە بێت.

لەلایەن مێژوو نوسانەوە لە ڕووی ڕەگەزەوە بە تێکەڵێکی کاسی و هوری دانراون. بۆهیمەر (Boehmer) پێی وایە "مانییەکان گروپێکی هوری بوون لەگەڵ تێکەڵێکی کەمی کاسیدا" (Zadok, 2002, p.112). لە ڕاستیدا ئەم گروپانە زۆرجار لەلایەن مێژوو نوسانەوە تێکەڵ دەکرێن و تێکەڵبوونی فەرهەنگی میدی، لۆلۆبی، مانی، کاسی، گوتی و سیسی (Sythian) بە جۆرێکە کە کەسێکی وەک دیاکۆنۆف پێی وایە کە بۆ لێکۆڵەران ئەستەمە کەلوپەلی هەریەکەیان لەوەی تر جودا بکاتەوە (Diakonoff, 1985, p.139). بەو پێیەی کە مانییەکان بە کاسی دابنرێن دەبێت کاسیەکانیش هەر بە زاراوەیەکی کوردی قسەیان کردبێت (بڕوانە مانییەکان).

کاسیەکان دەسەڵاتی بابلیان گرتە دەست و بۆ سەپاندنی فەرهەنگی خۆیان، ناوە سامیەکەی شاری بابلیان گۆری بۆ ناوێکی نوێی کاسی و کرایە کاردونیاش (Karduniash)[181]. کاسیەکان هاوشێوەی مید و مانیەکان لە ئەسپ سواریدا بە توانا بوون و هەر ئەوان ئەسپیان بە بابل ناساند. لە ناو کاسی و میاتانی و هیتی و دوایی مید و مانیدا ئەسپ سواری و ماڵیکردنی ئەسپ وەک جۆرێک لە زانست سەیرکراوە و هەر بۆیە کۆنترین ڕێنمایی ڕاهێنانی ئەسپ لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لە لایەن کەسێکی میتانیەوە نووسراوە بە ناوی "کیکولی". تەمەنی ئەو تێکستە بۆ ٣٥٠٠ ساڵ دەگەڕێتەوە کە بە زمانێک نووسراوە لە کوردی نوێ نزیکە و زۆر کوردی ئەمڕۆ دەتوانێت لە تێسکتەکان تێبگات (بڕوانە هیتیەکان).

لە بەشی سەرەوەی مێسۆپۆتامیادا هیتیەکان ئیمبراتوریەتێکی زۆر بەهێزیان دامەزراند و دەسەڵاتیان هاو سنوری دەسەڵاتی میسریەکان بووە و جەنگێکی گەورەی مێژوویی لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتە ڕوویدا و دوایی ڕێکەوتنێک لە نێوانیاندا کرا. هیتیەکان بەهێزترین قەڵایان لە باکوری کوردستاندا دروست کردووە و پاشماوەی قەلاکانیان هەتاوەکو ئەمڕۆ لە ناو شوێنەوارە هیتیەکانی باکوری کوردستاندا بە بەهێزی ماوەتەوە و نموونەی بەهێزترین قەڵان لە مێژوودا. ئەو کارەمەیی و شارەزاییەی هیتیەکان هەتاوەکو سەردەمێکی درەنگ لە ناو کوردەکانی باکور و ناوچەی جەزیرە و بۆتاندا مابوو؛ سەرچاوە یۆنانی و ئیسلامیەکان ئاماژەیان پێکردووە (بڕوانە دەولەتی کوردیان). هیتیەکان گەلێک تێکسیان لێ بەجێماوە و پاشماوەکانیان شارستانیەتێکی داڕێژراو و ئاستی بەرزی پێشکەوتنی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی پێوە دیارە.

ئاشوریەکان کە لە ڕۆژئاواوە دەهاتن، وورده وورده دەسەڵاتی هوری و هیتیەکانیان کەم دەکردەوە. ئاشوریەکان خۆیان لە بنەچەدا خێڵی کۆچەری سامی بوون و نزیکی ١٧ پاشایان پێش ئەوەی کە بێنە ناوچەکە لە ڕەشماڵدا ژیابوون و تێکستە ئاشوریەکان لە ئاماژە بە بنەچەی خۆیان باسی ئەو ڕابوردووەی کردووە (Laessoe, 1963, p.22). وەک پێشتر ئاماژەی پێکرا، هاتنی ئاشوریەکان بەشێک بوو لە شەپۆلی ئەو نەتەوە سامیانەی کە لە ڕۆژئاواوە ڕوویان کردبووە ناوچەکە و وورده وورده لە ناوچە بنەچە هوریەکانی وەک هەولێر و نەینەوادا خۆیان بەهێز دەکرد و ڕۆژ بە ڕۆژ دەسەڵاتی کورد لە خواروی مێسۆپۆتامیا و سوریا و باکوری مێسۆپۆتامیا دەکەوتە ژێر فشارەوە.

لە کاتێکدا کە لە تێکستە بابلیەکاندا[182] کە زۆربەی خەڵکەکەی بە ڕەگەز سۆمەری بوون، نەفرەت لە سەرجۆنی ئەکەدی دەکرا و ئەکەدیەکانیان بە هێزێکی نامۆ و بێگانە لە قەڵەم دەدا، لە هەمان کاتدا ئاشوریەکان وەک هێزێکی بێگانەی نوێ و نزیک ڕەگەزی ئەکەدیەکان، شانازیان بە ئەکەدیەکانەوە دەکرد و خۆیان بە تەواوکەری ئەو فەرهەنگە دەزانی و زۆر جار هەر هەمان ناوی ئەکەدیان لە خۆیان دەنا (Lewy, 1970, p.735). جگە لەوەی کە ئەکەدیەکان بۆ ئاشوریەکان نموونەیەکی حوکمڕانی بوون کە چاویان لێ دەکردن، لە ڕووی زمانیشەوە پەیوەندیەکی پتەو لە نێوان زمان و فەرهەنگی ئەکەدی و ئاشوریدا هەبوو.

---

[181]. هیچ سەرچاوەیەک لە بەردەستدا نیە کە مانای ناوی کاردونیاش ڕوون بکاتەوە.

[182]. بابل شار بووە و بابلی نەتەوە نەبووە. سەردەمانێک، پێش ئەوەی کە نەتەوە سامیەکان ڕوو بکەنە ئەو ناوچەیە، خەڵکی بابل هەمووی سۆمەری بوون. دوای دوای هاتنی نەتەوە سامیەکان شاری بابل هەر شارێکی فرە نەتەوەی سۆمەری/کوردی و سامی بووە. بۆیە هەتاوەکو سەدەکانی دوانزەی زاینی نیوەی خەڵکی ئەو شارە هەر کورد بووە.

لە ئەرشیفی شەمشارە (بڕوانە کورد و ڕەچەڵەکی کورد) دا، زۆر لەو نامە دیپلۆماسی و سەربازیانە دۆزراوەتەوە کە قۆناغی بڵاوبوونەوە و گەشەسەندنی ئاشوریەکانی تێدا دەردەکەوێت و نیشانی دەدات کە چۆن ئاشوریەکان وردە وردە دەسەڵاتی سیاسیان سەردەمانێک لە ڕێگای هاوپەیمانە ناوچەییەکانیانەوە گەیشتوتە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان.

ئاشوریەکان ساڵانە پەلاماری ناوچەکانی دەوروپشتی خۆیان دەدا و تاڵانیان دەکرد و زۆر جار هەندێک لە پاشا ناوچەییەکانیان بە زیندوویی دەسوتاند، ئەوان بە شێوەیەکی زۆر توند و تیژ مامەڵەیان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا دەکرد. لە ڕووی فەرهەنگی ئاینیەوە، ئاشوریەکان هێشتا هەر لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی هوری و سۆمەریدا بوون بەڵام لەگەڵ تێپەربوونی کات و بەهێزبوونی نەتەوە سامیەکان لە باکور و باشوری مێسۆپۆتامیادا، وردە وردە زمان و زاراوە جیاوازە سامیەکانی وەک ئارامی، ئاشوری، کلدانی، هتد. لە ناوچەکەدا خۆیان دەسەپاند. تەنانەت دوای ڕوخانی دەوڵەتی ئاشوریش، زمانی ئارامی ڕۆڵی هاوشێوەی زمانی ئینگلیزی ئەمڕۆی هەبوو. واتە بووە زمانی سەرەکی نووسین بۆ پەیوەندیکردنی دیپلۆماسی و نووسینی تێکستی ئاینی و زانستی و وردە ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە زمانی کوردی کۆن هەیبوو، کەم دەکرایەوە.

ئاشوریەکان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستانەوە هەمیشە بەرەنگاری دەکران و دوو دەوڵەتی کوردی، میدەکان و مانیەکان، کە هەر پاشماوە و میراتگری هوری/میتانیەکان بوون، بەرامبەر فراوانبوونی دەسەڵاتی ئاشوریەکان دەوەستان. لە ڕاستیدا مانیەکان پەیوەندیان لەگەڵ ئاشوریەکاندا ئارامتر بوو، تەنانەت هەندێک جار هاوپەیمانیشیان بوون؛ بەڵام میدەکان زۆربەی جار لە گەڵ ئاشوریەکاندا لە شەڕدا بوون. ئەم دوو دەوڵەتە ڕۆڵێکی گەورەیان هەبوو لە ناوچەکەدا و ئاشوریەکان تەنها لە سەردەمی بەهێزییاندا، دەستیان دەگەیشت بە ناوچەی ژێر دەسەڵاتیان. دەنا زۆربەی جار بۆ ئاشوریەکان سەخت و گران بوو کە بگەنە ناوچەکانیان، بە تایبەتی ناوچەی میدەکان.

لە سەردەمی ئاشوریەکاندا ئورارتو[183] لە نزیک ئەرمینیای ئەمڕۆدا وەک هێزێک دەرکەوت و دوایی لە نزیکی هەشت سەدی پێش زایینداا بۆ یەکەم جار لە مێژوودا ناوی فارسەکان هاتووە. سەرەتا فارسەکان دەسەڵاتیان زۆر سنوور دار بوو و لە ناوچەی (ئوستانی فارس) ی ئەمڕۆ تێنەدەپەڕی. ئورارتو-ش کە دەکەوتە سەرو ناوچەی دەسەڵاتی مانیەکانەوە، هێزێکی نوێ بوو.

لە دوای سەدەی هەشتەمی پێش زاینەوە هێزە دەسەڵاتە سەرەکیەکانی ناوچەکە بریتی بوون لە میدەکان، مانیەکان، ئاشوریەکان، بابلیەکان و ئورارتو. هاوپەیمانی نێوان ئەم هێزانە بەپێی هەلومەرجە جیاوازەکان دەگۆڕان. بە گشتی مانی و میدی دەکەوتنە ژێر هێرشی ساڵانەی ئاشوریەکان و تاڵان دەکران و زۆر لە ناوچەکانیان دەخرانە ژێر باجێکی گەورەوە.

لە ساڵی ٦١٢ پ.ز دا میدەکان بە هاوکاری بابلیەکان کۆتاییان بە دەسەڵاتی ئاشوری هێنا و بوونە زلهێز و زۆربەی کوردستان و ناوچەکەیان بەدەستەوە بوو. میدەکان سەردەمێکی بەهێزیان بە خۆیانەوە بینی و زۆربەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات کەوتەوە ژێر دەستیان. ئەم دەسەڵاتە بەردەوام بوو هەتاوەکو لە ٥٥٠ پ.ز. دوای ئەو مێژووە فارسەکان کە نەتەوەیەکی تا ڕادەیەک نوێ و بچووک بوون لە ناوچەکەدا، کۆتاییان بە دەسەڵاتی گەورەی میدەکان هێنا. بەڵام کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی باڵادەستی میدەکان کۆتایی هێنانی هەموو دەسەڵاتیان نەبوو، بەڵکو تەنها لەبری ئەوەی کە پاشای پاشاکان بن، بوونە پاشای بچووکتر. واتە پاشای فارس بووە پاشای پاشاکان و پاشای مید تەنها نازناوی پاشای مایەوە.

بۆیە فارسەکان لە کاتی دەسەڵات فراوانکردنیاندا هەر متمانەیان دەکردە سەر میدەکان و بە هاوکاری میدەکان لە ٥٣٩ پ.ز دا کۆتاییان بە دەسەڵاتی بابلیەکان هێنا و فارسەکان بۆ ماوەی ٢٨٢ ساڵ حوکمڕانی ناوچەکەیان کرد؛ دەسەڵاتی فارسەکان هێندە بەرفروان بوو کە هەتاوەکو میسر و یۆنان دەڕۆیشت. هاتنی

---

[183]. زۆر لە سەرچاوەکان ئورارتو (Urartu) بە ڕەچەڵەکی ئەرمەنیەکان دادەنێت، هەرچەندە پەیوەندی زمانەوانی لەگەڵ زمانی ئورارت و زمانی کوردی ئەمڕۆدا هەیە، بەڵام نەتوانراوە لەم کتێبەدا کاری تەواو لەسەر ئەو زمانە بکرێت و ئەو بابەتە یەکلا بکرێتەوە.

هێزێکی نوێ لە یۆنانەوە بۆ ناوچەکە، بە سەرکردایەتی ئەلێکسەندەری مەسیدونی (مەقدۆنی) لە ٣٣٠ پ.ز دا، کۆتایی بە حوکمی ئەخامەنی فارسەکان هێنا و ناوچەکە هەتاوەکو هیندستان و میسر کەوتە ژێر دەسەڵاتی مەقدۆنی و یۆنانەکان.
لە کاتی هاتنی ئەلێکسەندەردا پاشای میدی ئاتەرپاس (ئادر پاس/ئاگرپارێز) (بروانە میدەکان)، هاوپەیمانی ئەلێکسەندەر بوو لە جەنگیدا بەرامبەر بە فارسەکان. دواییش تاقە پاشای ناوچەکە بوو کە وەک پاشای سەربەخۆ مایەوە و میدیای ئازەربایجان (ئادرپاسیان) بە سەربەخۆیی هێشتەوە و خۆشی وەک پاشای سەربەخۆ حوکمڕانی دەکرد (بڕوانە میدەکان). لەو سەردەمەدا فارسەکان بە تەواوی کز بوو بوون و حوکمڕانی سەربەخۆیان نەمابوو. ئەوان کەوتبوونە ژێر حوکمڕانی یۆنانیەکانەوە، بەڵام میدەکان بەشێکی باشی کوردستانیان بە سەربەخۆیی بەدەستەوە مابوو.

(وێنەی ٤٠) پارچەیەکی چەرم کە بە زمانی یۆنانی گریەستێکی لەسەر نووسراوە و لە ناوچەی هەورامان دۆزراوەتەوە کە تەمەنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێهەمی پ.ز.

لە ٣١٢ پ.زاینەوە، بۆ چەند سەدەیەک ئیمبراتۆریەتێکی نوێی یۆنانی لە ناوچەکەدا، بە ناوی ئیمبراتۆریەتی سەلوسی (Seleucid Empire) دروستکرا کە زۆربەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستی حوکم دەکرد. لەسەرەتادا یەکێک بوو لە دەوڵەتە هەرە بەهێزەکانی ئەو سەردەمەی جیهان و پاش زیاتر لە سەد ساڵ، وورده وورده دەسەڵاتی ئەو دەوڵەتە ڕووی لە لاوازی کرد و ڕۆژ بە ڕۆژ بچوکتر دەبووەوە، هەتاوەکو لە ٦٣ پ.ز دا کۆتایی بە دوایەمین دەسەڵاتی هێنرا.
هاتنی یۆنانیەکان بووە هۆی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و زمانی یۆنانی. بەو جۆرە زمانی یۆنانی بەشێوەیەکی بەرفراوان کاریگەری لەسەر ناوچەکە هەبوو. قوتابخانەکانی کوردستان هەتاوەکو سەدەی پانزەهەمیش کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی لەسەر بووە و ئەو کاریگەریەش لە شیعری شاعیرە کوردەکانی سەدەی نۆهەم هەتاکو حەڤدە و هەژدەدا ڕەنگی داوەتەوە[184] (بۆرەکەیی، ١٩٩٦). تەنانەت بەڵگەنامەی

[184]. فەلسەفەی یۆنانی بەشێوەیەکی بەرچاو کاریگەری هەبووە لەسەر زانا کوردەکان. کتێبە گرنگەکەی شەمسەدینی شارەزووری لە سەدەی دوانزەی زاینیدا سەبارەت مێژووی فەلسەفە، بەڵگەی برەوی فەلسەفە بووە لە خوێندگە کوردیەکانی ئەو سەردەمەدا. بۆیە هەتاوەکو ئەمڕۆش ناوی ئیفلاتون بەشێوەیەکی بەرچاو لە ئەدەب و چیرۆک و قسەی ڕۆژانەی کوردیدا بەدی دەکرێت. لە کوردەواریدا تەنانەت لە لادێکانیشدا ئەگەر باس لە چاکنەکردنەوەی شتێک بکرێت دەگووترێت "ئیفلاتونی حەکیمیش بۆی چاک ناکرێت"، بێ ئەوەی کە ئەو کەسە بزانێت مەبەستی لە ئیفلاتونی فەیلەسوفە. نووسەری ئەم کتێبە لە منداڵیدا دایکی چیرۆکی ئیفلاتون و ئەرستۆی فەیلەسوفی بۆ گێڕاوەتەوە وەک چیرۆکێکی کوردی فۆلکلۆری، بێ ئەوەی کە دایکی و نووسەر خۆشی لەو تەمەنەدا بزانێت مەبەست لەو دوو کەسایەتیە ئەو دوو فەیلەسوفە یۆنانیە بووە. چیرۆکەکە دەڵێت "ڕۆژێکیان کابرایەک

مولکداریش هەندێک جار بە یۆنانی نووسراوە و هەندێک لەو بەڵگەنامانەی کە لە هەوراماندا دۆزراونەتەوە و بە زمانی یۆنانی نووسراون، تەمەنیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی پ.ز (Minns, 1915) (بڕوانە وێنەی ٤٠).

**کوردستان لە دوای هاتنی ئەلێکسەندەری مەقدۆنیەوە**

لە دوای هاتنی یۆنانەکانەوە، سەرەتا یەکەم دەسەڵاتی سەربەخۆ ناوچەی ئازەربایجان بوو کە لەلایەن ئاتەرپاسی پاشای میدی هاوپەیمانی ئەلێکسەندەر بە سەربەخۆیی هێڵرایەوە. دەسەڵاتی یۆنانیەکان وردە وردە دوای نزیکی سەدەیەک لە دوای نەمانی ئەلێکسەندەر بەرەو کزی دەچوو. لە خۆرهەڵاتەوە لە نزیک خوراسان و دەوروبەری ئەشکانیەکان خەریک بوون بەهێز دەبوون و لە ناوچەکانی کوردستاندا چەند دەسەڵاتێکی وەک میدەکان، هەزەبانیەکان (Adiabene) و کوردیانەکان (Gordyene) بەرەو بوژانەوە دەچوون. سەرەڕای ئەم سێ هێزە سەرەکیە، پاشای بچووکتریش لە کوردستاندا هەبوون، بۆ نموونە پاشای کەرکوک (بڕوانە هەزەبانیەکان)، بەڵام دەسەڵاتە سەرەکیە حوکمڕانەکان بریتی بوون لەو سیانەی کە ئاماژەیان پێکرا.

هەزەبانیەکان سەنتەرەکەیان لە ناوچەی کۆیە و هەولێر هەتاوەکو سوریا و ئازەربایجان بوو، میدەکان لە هەمەدانەوە هەتاوەکو ئازەربایجان و کوردیانەکان لە ناوچەی جەزیرە و وان و دەوروبەری حوکمڕانیان دەکرد. ئەم سێ دەسەڵاتە لە ڕووداوە سیاسی و جەنگیەکانی ئەو سەردەمەدا بە شێوەی جیاواز ڕۆڵیان هەبوو، جارێک لەگەڵ ئەشکانیەکان و جارێک لەگەڵ ڕۆمەکاندا لە جەنگدا بوون. لە سەدەی یەکەمی زاینیدا بەهێزترین پاشای کورد، پاشای هەزەبانیەکان بوو کە دەسەڵاتی ڕۆژبەڕۆژ بەرەو بەهێزی دەچوو. هەتاوەکو سەدەی سێیەمی پێش زایین هەر سێ دەسەڵاتی مید، هەزەبان و کوردیان بەردەوام بوون. بەرەو کۆتایی سەدەی سێیەمی زاینی پاشاکانی هەزەبان، کەرکوک و میدی، هێزەکانیان یەکخست بۆ هاوکاری پاشای ساسانی و ڕوخاندنی دەسەڵاتی ئەشکانیەکان. پاش چەند ساڵێک و بەرەو کۆتایی سەدەی سێیەمی زاینی ساسانیەکان کە بنەماڵەیەکی کورد بوون و حوکمڕانی هەموو نەتەوەکانی ناوچەکەیان دەکرد، کۆتاییان بە دەسەڵاتی ئەشکانیەکان هێنا و بوونە پاشای گەورەی هەموو ناوچەکە و کۆتاییان بە دەسەڵاتی پاشا بچووکەکانی ناوچەکە هێنا. واتە لەبری پاشای هەزەبان و مید و کوردیان و کەرکوک، ئەوان مەرزبانیان دادەنا کە ڕۆڵی نوێنەری پاشا و دەسەڵاتداری ناوچەییان هەبوو، نەک پاشا وەک جاران. بەو جۆرە ساسانیەکان حوکمڕانیەکی سەنتەر بەهێزیان پێکهێنا کە دەسەڵات زۆربەی لای خۆیان قۆرخ کرابوو.

لە سەرەتای سەدەی یەکەمەوە، هەردوو ئاینی جودایزم و کریستیان لە ناوچەکانی کوردستاندا بڵاودەکرایەوە. لە هەندێک لە شارەکانی کوردستان، بە تایبەتی ناوچەی هەزەبان و گەرمیان و جەزیرە، چەندین کەنیسەیان تێدا بوو و چەندین ڕێبازی ئاینی کریستیانی جیاواز هاتبووە ئاراوە. لە ناویاندا ناوچەی هەزەبان و گەرمیان بووبونە سەنتەری ئاینی کریستیان. لە دوای سەدەی چوارەمی زاینی و بە فەرمیکردنی ئاینی کریستیان لەلایەن ڕۆمەکانەوە، بڵاوکردنەوەی ئەم ئایینە برەوێکی زۆری بەخۆیەوە بینی و زۆر لە گوندەکانی کوردستان کڵێسەیان تێدا بوو. بێگومان هەندێک جار سوود لەو ئاینە دەبینرا بۆ مەرامی سیاسی، بۆ نموونە لە کاتێکدا کە نەستۆریەکان لە ناو ڕۆمەکاندا بە مەزهەبێکی لادەر لە ئایین

---

جاڵجاڵۆکەیەک دەچێتە گوێیەوە و دێت بۆ لای ئیفلاتونی حەکیم بۆ ئەوەی کە بۆی دەربهێنێت. ئیفلاتون موکێشێک دەهێنێت بۆ ئەوەی کە جاڵجاڵۆکەکە لە گوێی دەربهێنێت، عەرسوی شاگردی دەڵێت بوەستە قوربان، ئەگەر ئەو موکێشە سارده بەکاربهێنێت ئەوا جاڵجاڵۆکەکە قاچ لە پەردەی گوێی کابرا گیر دەکات و کەڕی دەکات، دەڵێت دەبێت موکێشەکە گەرم بکرێت، بۆ ئەوەی جاڵجاڵۆکەکە لاواز بکات و زەرەر بە گوێی کابرا نەگەیەنرێت". ئەوەی کە جێگای سەرنجە چیرۆکەکە بە هیچ شێوەیەک ئاماژە بە فەلسەفەی ئەو دوو کەسایەتیە ناکات، بەڵام ئەوە دەردەخات کە بەهۆی ئەوەی کە سەردەمانێک ئەو دوو فەیلەسوفە لە خوێندنگە کوردیەکان و لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا ناسراو بوون، بۆیە بوونەتە جۆرێک لە داستان و چوونەتە فۆلکلۆری کوردیەوە؛ بە جۆرێک کە ناسنامەی نوێی ڕۆژهەڵاتی (حەکیم) یان پێ دراوە. تەنانەت (ئەرستۆ) کراوتە (عەرەسو) و چیرۆکی سادەی ڕۆژانەیان بە ناوەوە دروست کراوە.

دادەنران، بەڵام لە کوردستان و ئێرانی ئەمڕۆدا بانگهێشت دەکران و دەپارێزران، بەو جۆرە سەردەمانێک ئەو ئاینە ڕۆڵێکی سیاسی گەورەی لە ناوچەکەدا دەبینی.

**هاتنی ئیسلام**

ساسانیەکان لە سەدەی سێهەمی زاینەوە هەتاوەکو سەدەی حەوتەمی زاینی و هاتنی ئیسلام حوکمڕانی ناوچەکەیان کرد و دەسەڵاتیان لەلایەن عەرەبە موسوڵمانەکانەوە کۆتایی پێ هێنرا. پێش هاتنی ئاینی ئیسلام بۆ ناوچەکە، کوردستان چەندین ئاینی ناسراوی وەک کریستیان، جو، ئێزدی، یارسانی و چەندین تەریقەت و ئاینی تری تێدا بوو کە بنەچەیان بۆ سەردەمی هوری و سۆمەری دەگەڕایەوە. بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام جیاواز بوو لە ئاینەکانی تر، بۆ نموونە ئاینی کریستیان یان یارسان لە ڕێگای شاگردەکانی ئەو ئاینانەوە یاخود لە ڕێگای بازرگانی و تێکەڵبوونی خەڵکەوە بڵاودەکرایەوە. بەڵام بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام بەشێک بوو لە بڵاوکردنەوەی دەسەڵاتی عەرەبی و زۆربەی جار عەرەبەکان لە ڕێگای سوپا، توند و تیژی و سەپاندنەوە ئاینەکەیان لە ناوچەکەدا بڵاودەکردەوە. عەرەبەکان کە هاتنە ناوچەکە دووهەڵبژاردەیان دەدایە خەڵکەکە؛ وازهێنان لە ئاینی خۆ و، چوونە سەر ئاینی ئیسلام یان مانەوە لەسەر ئاینی خۆ و دانی باج یاخود شەڕکردن. بۆ کەسێک کە هەڵگری ئاینی تر بووبێت و لەسەر خاکی خۆیدا ژیابێت، قبوڵ کردنی هەردوو حاڵەتەکە شتێکی گران بوو، بۆیە لە سەرەتادا بڵاوکردنەوەی ئاینەکە زۆربەی جار لە ڕێگای جەنگەوە بوو.

(وێنەی ٤١) لیستی کتێبەکانی زانا و سۆفیگەری کورد، ئیبراهیم شارەزووری کوردی گۆرانی (ابراهیم الشهرزوري الكردي الكوراني) کۆچکردووی ساڵی ١٦٨٩ ز، کە ژمارەیان ٥٧ کتێبە و لەلایەن قوتابیەکەی، عەبدولقادر کوڕی ئەبوبەکر لە ساڵی ١٧١٠ ز دا نووسراوە.

نەتەوەکانی وەک کورد، ئارامی، کلدانی و فارسەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان داکۆکیان لە دەسەڵاتی خۆیان دەکرد، کوردیش وەک نەوەتەوەیەکی ڕەسەنی مێسۆپۆتامیا و کورستان، لە پێشەوەی جەنگەکاندا بوو. ئەو جەنگانەی کە لە عێراقی ئەمڕۆدا دەستی پێکرد زۆربەی ناوچە کورد نشینەکانی وەک کرماشان، هەمەدان، موسڵ، خانەقین، جەلەولا، گەرمیان، تکریت، جەزیرە، بەغدا، هتد. ی گرتبوەوە. مێژوونوسە ئیسلامیەکانی وەک ئیبن ئەسیر و ئیبن خەلدون و ئەوانی تر، باسی جەنگێکی زۆر، لە نێوان سوپای موسوڵمانە عەرەبەکان و خەڵکی ناوچەکانی کوردستاندا دەکەن. ئەم جەنگانە هەر لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایین و بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلامەوە هەتاوەکو سەدەی سازنزەهەم بەشێوەی جیاواز بەردەوام بووە. ووردە

وورده کورد لە شارە گەورەکاندا دەبوونە موسوڵمان، بەڵام لە ناوچە شاخاویەکاندا لەسەر ئاینی خۆیان مابوونەوە. یەکەم کورد لە مێژوودا کە بووە ئیسلام، ئەسحابەیەک بووە بە ناوی جابانی کورد (جابان الكردي)[185] کە یەکێک بووە لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر.

(وێنەی ٤٢) دوو پەڕە لە کتێبی(الجواهر النقية)، کە کتێب و دەستنوسی ئەحمەدی کوڕی ئیبراهیم کوردی (احمد بن ابراهيم الكردي) یە و لە سەدەی پانزەی زاینیدا ژیاوە.

کە عەرەبەکان گەیشتنە ناوچەکە، کورد خاوەنی چەندین بیرو باوەڕ و ئاینی جیاواز بوو و لە ڕووی زانستەوە کێبڕکێی لەگەڵ کلدانیە بابلیەکاندا دەکرد و خاوەنی زانستەکانی ئەستێرەناسی، ماتماتیک، فەلسەفە، کیمیا، ڕومک زانی و کشتوکاڵ، هتد. بووە (بڕوانە تێکستی کوردی). بۆیە پاش ماوەیەک بەشێک لەو کوردانەی کە چوونە ناو ئاینی ئیسلام، مۆرکی تایبەتیان خۆیان دەستنیشان کرد، بە هەڵبژاردنی مەزهەبی شافعی وەک مەزهەبی سەرەکی کوردە موسوڵمانەکان و لە سەدەکانی دواییشدا تەریقەی سورەوەردی، قادری و نەقشبەندی بە شێوەیەکی بەرفراون لە ناو کورد دا باو بووە. ئەمڕۆ کتێبخانەکانی سعودیە، میسر، تورکیا، تۆکیۆ، بەرلین و لەندەن بە سەدان کتێبی زانا کوردەکانی ئەو سەردەمەی تێدایە کە هێشتا لیکۆڵینەوەیان لەسەر نەکراوە. بە سەدان کەسایەتی ئاینی و سۆفیگەری کورد کتێبیان لەسەر بابەتی ئاینی و

---

[185]. (جابان الكردي) ناوێکی کوردیە و لەبەر ئەوەی کە لە سەرچاوە ئیسلامیەکانەوە وەرگیراوە کراوەتە عەرەبی و زەحمەتە بنەچە کوردیەکەی بدۆزرێتەوە. ئەگەر چیش لەوانەیە ئەو ئەسحابەیە بە ناوی خێڵەکەیەوە ناونرابێت کە خێڵێکی کوردی مێژوویی بوون بە ناوی (جاوانی/گاوانی). وا دەردەکەوێت ناوە کوردیەکەی ئەوە بووبێت و عەرەبەکان نازناوی کوردیان خستبێتە سەر و کردبێتیانە (جابان الكردي). جابان یەکێک لەو ئەسحابانە بووە کە کەمتر شتی لەسەر پێغەمبەر گێراوەتەوە و پێی وابووە کە گێڕانەوەی حەدیسی زۆر لەوانەیە هەندێک جار ببێتە هۆی ئەوەی کە شتی هەڵە بە ناوی پێغەمبەرەوە دروست بکات، بۆیە جابان ڕێچکەی (ابو هريرة) ی نەگرتووە کە زیاتر حەدیسی پێغەمبەری گێڕاوەتەوە. بەپێی هەندێک سەرچاوە لە مەیمونی کوڕی جابان (ميمون الكردي) پرسیار کراوە سەبارەت ئەوەی کە باوکی چی سەبارەت پێغەمبەر گێراوەتەوە کە هاوەڵی بووە، مەیمون لە وەڵامدا گوتوویەتی "باوکم باسی پێغەمبەری بۆ نەدەکردین لە ترسی ئەوەی کە زیاد و کەم بە قسەکانیەوە بنێ" (الطبراني، ١٩٨٥، پ.١٤٧).

زانستی نووسیوە و شارەکانی کوردستان سەنتەری گرنگی خوێندن و زانین بوون. بۆ چەندین ساڵ موفتی مەزهەبی شافیعی لە شاری مەدینە لە خێزانی بەرزنجیەکان بووە و هەتاوەکو سەردەمانێکی درەنگ هەر لە ناو ئەواندا مابووەوە (البرزنجي، ١٣٩٣ الهجري، پ.١٩٤)[186]. تەنها یەک زانای کوردی وەک ئیبراهیم کوردی گۆرانی (ابراهيم الكردي الكوراني)[187]، خاوەنی پەنجاو حەوت کتێبی سۆفیگەری بووە (بڕوانە وێنەی ٤١).
تەنانەت لە زانکۆی ئەزهەردا لە میسر، زانا کوردەکان هێندە زۆر بوون، شوێنێکی تایبەتیان هەتاوەکو پەنجاکانی سەدەی بیستەم مابوو بە ناوی (رواق الاكراد). یەکێک لە کتێبە هەرە ناودارە ئیسلامیەکانی ئەندەنوسیا کە لە کاتی لەدایکبوونی پیغەمبەردا تێکستەکانی دەگووترێتەوە، بریتیە لە مەولودنامەی بەرزنجی و بە چەندین جۆر و مۆسیقای جیاواز دەگووترێتەوە و لەدایکبوونی پێغەمبەر لەو وڵاتەدا بەستراوە بە تێکستەکانی بەرزنجیەوە (Gade, 2004, p.11 and 12).
لە کاتێکدا کە وردە وردە خەڵک چوونەتە سەر ئاینی ئیسلام و کورد ڕۆڵی گەورەی تێدا بینیوە، لە هەمان کاتدا ئاینە کوردیەکانی وەک ئێزدی، یارسان (ئەهلی حەق)، عەلەوی و دروز، بەشێوە دێرینەکەیان، هەر بەردەوام بوون و ژمارەیەک لە کوردیش لەسەر ئاینی کریستیان و جو مانەوە؛ هەتاوەکو ئەمڕۆ تێکستە ئاینیەکانی هەندێکیان هەر ماوەنەتەوە. تەنانەت چەندین مەزهەبی جیاوازی کریستیانی لە ناو کوردستاندا هەبووە وەک یەعقوبی و نەستۆری، هتد.
سەرەتا عەرەبەکان زۆربەی ناوچەکەیان خستە ژێر باجەوە بەڵام پاش ماوەیەک دەسەلاتە کوردیەکان زیندوو بوونەوە و لە ناوچەکانی کوردستاندا چەندین دەوڵەتی بەهێزی وەک حەسنەوی، حەمیدی، هەزەبانی، سالاری، شەدادی، عەنەزی، مەروانی، ئەیوبی، ڕەوادی، هتد. دروست بوون. دەوڵەتی حەسنەوی لە هەمەدانەوە هەتاوەکو شارەزووری بە دەستەوە بووە؛ هێزێک بوو کە خەلیفەی ئیسلام حسابی زۆری بۆ دەکرد.
لە سەردەمی ئەیوبیەکاندا، کە بنەماڵەیەک بوون لە تیرەی ڕەوەندی (ڕەوادی)[188] ی سەر بە خێڵی گەورەی هەزەبانی، دەسەڵاتی کورد لە بەشێکی کوردستان هەتاوەکو میسر دەڕۆشت و هەر لە میسرەوە هەتاوەکو کوردستان و وڵاتی یەمەنیان حوکمڕانی دەکرد؛ سەلاحەدین لە دوای هوریەکانەوە، گەورەترین ئیمبراتوریەتی کوردی دامەزراندەوە.
زۆر لە سەرچاوەکان دەرک بەو ڕاستیە ناکەن کە هێز و فراوانی دەسەڵاتی سەلاحەدین لە شەو و ڕۆژێکدا دروست نەبووە، بەڵکو سەرچاوەی لە ڕابوردویەکی مێژوویەوە وەرگرتبوو؛ خەڵکی ئەو ناوچانە هەتاوەکو میسر، بەشێکی زۆریان هەر کورد بوون. لە ڕاستیدا هەزەبانیەکان هەزاران ساڵ پێش سەلاحەدین دەسەڵاتیان هەتاوەکو میسر ڕۆیشتبوو و لە سەدەکانی یەکەمی زاییندا لە ناوچەرگەی ئیسرائیلدا لەگەڵ ڕۆمەکاندا شەڕیان دەکرد (بڕوانە هەزەبانیەکان). بە درێژایی سەردەمی ئیسلام، کورد دەسەلاتداری گەورەبوون لە وڵاتی سوریای ئەمڕۆدا و زۆربەی جار پاشا ناوچەییەکانی سوریا کورد بوون. پێشتریش هوریەکان لەو ناوچانەدا بوون و میرە کوردەکان لە کوردستانی ئەمڕۆ هەتاوەکو میسر دەسەڵاتیان هەبوو.

---

[186]. بەرزنجی و شارەزووریەکان کاریگەری گەورەیان لەسەر ئیسلام هەبووە و هێشتا شتێکی ئەوتۆ لە کارەکانیان کۆنەکراوەتەوە. یەکێک لە بەرزنجیە بەناوبانگەکان ناوی محەمەدی کوڕی عەبدول ڕەسوڵی بەرزنجیە کە لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمدا لە ناوچەی بەرزنجە لەدایک بووە و سەرەتا هەر لەوێ خوێندوویەتی. پاشتر چوەتە سوریا و میسر وئەمجا لە شاری مەدینە نیشتەجێ بووە؛ بەرزنجی خاوەنی ٥٢ بەرهەم بووە (Azra, 2006, p.209).
[187]. ساڵی لەدایکبوونی ئیبراهیم شارەزووری کوردی گۆرانی نازانرێت، بەڵام لە ساڵی ١٦٨٩ ز دا کۆچی دوایی کردووە، بۆیە پێ دەچێت کە لە سەرەتای سەدەی حەڤدەی زاینیدا لە دایکبووبێت. گۆرانی کەسایەتیەکی گرنگی شافعی و سۆفیگەری کورد بووە کە لە شاری مەدینە نیشتەجێ بووە، هەندێک لە مامۆستاکانی هەر کوردی نیشتەجێی مەدینە بوون و نازنای گۆران-یان هەبووە. ئەم کەسایەتیە خاوەنی ٥٧ کتێب بووە کە لیستی کتێبەکانی لەلایەن قوتابیەکەی عەبدولقادری کوڕی ئەبوبەکرەوە کۆکراونەتەوە و لە ئەرشیفی زانکۆی ڕیاز لە سعودیە هەڵگیراوە و زۆربەیان سەبارەت سۆفیگەری و ئایین بوون.
[188]. ناوی ئەو خێڵە بە هەردوو جۆر نووسراوە بەڵام زیاتر وا دەردەکەوێت کە (ڕەوەندی) بێت، لەبەر ئەوەی کە لە کوردیدا مانای (کۆچەری) دەدات.

بە دڵنیایی گرتنی میسر و کردنی بە پایتەختی دەوڵەتەکەی هەر لە سەر بناغەی ئەو دەسەڵاتە کۆنە دروست کراوە. کەچی هەندێک سەرچاوە هەتاوەکو ئەمڕۆ نەک هەر ئەو ڕاستیە نازانیت، بگرە گومانیش دەخاتە سەر کورد بوونی سەلاحەدین.

(وێنەی ٤٣) قەڵای کوردان (حصن الاکراد) کە دەکەوێتە وڵاتی سوریای ئەمڕۆ و سەر دەریای سپی.

هیچ کەس وێنەی ئیبن خەلەکان کە کورد بووە، ئەو ڕاستیەی نە خستوتە ڕوو کاتێک لە گێڕانەوەی بەهێز بوونی دەسەڵاتی سەلاحەدیندا باس لەوە دەکات کە سەلاحەدین شێخ عیسای هەکاری، کە سەرکردەیەکی سوپایی و کەسایەتیەکی ئاینی و دیپلۆماسی کورد بووە و هاوکاری سەلاحەدین بووە، ناردووە بۆ لای ئەمیرە کوردەکان و دەڵێت "ئەمجا چووە لای شەهابەدینی حارمی و پێی گوت، سەلاحەدین کوڕی خوشکتە و موڵکو سامانی هی تۆیە؛ کاری بۆ مەیسەر بووە و نەبیتە یەکەم کەس کە هەوڵی لابردنی بدەیت لە دەسەڵاتێک کە بۆ تۆ نابێت. بەو جۆرە شێخ عیسا وازی لێ نەهێنا هەتاوەکو هێنای و ئەویش سوێندی بۆ خوارد و ئەمجا چوو بۆ لای قوتبەدین و پێی گوت خەڵک گوێڕایەڵی سەلاحەدین ئەکەن و تەنها تۆ و یاروقی ماون و بە هەر حاڵ تۆ و سەلاحەدین هەردووکتان کوردن با دەسەڵات لە دەست ئەو دەرنەچێ و بچێتە دەست تورکەکان، بەو جۆرە گفتی پێدا و دەسەڵاتی زیاتری پێ دراو و ئەویش گوێڕایەڵی سەلاحەدینی کرد" (ابن خلکان، ٢٠١٠). بەو جۆرە سەلاحەدین لە سەردەمی ئیسلامدا زۆربەی ناوچەکانی دەسەڵاتی هەزمبانیە کۆنەکانی پێش هەزار ساڵ و باوباپیرە هوریەکانی وەرگرتەوە و بگرە زیادیشی کرد.

هەتاوەکو هاتنی مەغۆلەکان لە ناوەراستی سەدەی سیانزەهەمی زاییندا، دەسەڵاتی ئەیوبیەکان بەردوام بوو. دوای هاتنی مەغۆلەکانیش میرە ئەیوبیەکان لە هەندێک ناوچەدا، بە تایبەتی لە سوریا، وەک میری ناوچەیی حوکمڕانیان دەکرد و بەشی زۆری وڵاتی سوریا لەلایەن میرە کوردەکانەوە حوکم دەکرا. ئەمڕۆ قەڵای کوردان (حصن الاکراد) (بڕوانە وێنەی ٤٣) هێشتا لە وڵاتی سوریا لە قەراخ دەریای سپیدا هەر ماوە کە ئەو کاتە هەر لەلایەن کوردەوە حوکم دەکرا و هەتاوەکو هاتنی فەرەنسیەکانیش لە سەدەی بیستەمدا کورد بەهێزترین دەسەلات بوو لە سوریادا لە ژێر ناوی دروزەکاندا.

پێش هاتنی مەغۆلەکان و لە سەدی یانزەی زاییەوە خێڵە تورکەکان بە ڕێژمیەکی ئێجگار زۆر ڕوویان دەکردە خۆرهەڵاتی ناوەراست و هەندێک ناوچە لە وڵاتی ئێرانی ئەمڕۆ و کوردستاندا لە لایەن تورکەکانەوە حوکم دەکران. هاتنی تورکەکان هەندێک جار دەبووە هۆی شەڕ و پێکداداان لەگەڵ کورد و لە ساڵی ١١٨٥ ز دا شەڕێکی قورس لە نێوان کورد و تورکدا هەڵگیرسا کە ناوچەکانی سوریا و کوردستانی ئەمڕۆ و ئازەربایجانی گرتەوە. بۆ ماوەی دوو ساڵ بەردەوام بوو. هاتنی ئەو تورکانە بە جۆرێک توند و تیژی لە نێوان کورد و ئەم خێڵانەدا دروست کردبوو، دوای ئەو مێژووەش تەنها لەسەر کچێکی تورکومانی

جەنگێکی گەورە لە نیوان کورد و تورکوماندا روویدا و هەموو ناوچەکانی موسڵ و جەزیرەی گرتەوە (زەکی، ١٩٦١،پ.١٤٧).

(وێنەی ٤٤) حوکمڕانی ئێران، کەریم خانی زەند، سەدەی هەژدەیەمی زاینی.

هاتنی مەغۆلەکان هەموو خۆرهەڵات و بە تایبەتی کوردستانی بۆ ماوەیەک خستە بارێکی زۆر ناهەموارەوە و کورد و تورکمان و تورک و عەرەب بەرامبەریان جەنگین. مەغۆلەکان زۆر توند و تیژ بوون و دەستیان لە کەس نەدەپاراست؛ بەشێوەیەک کە هەندێک ناوچەی کوردستان تا ڕادەیەکی زۆر چۆڵکراوە و دوو خێڵی گەورەی کوردییە ناوی (لوین و باپیر)، ڕوویان کردۆتە وڵاتی مەغریب و بە تەواوی ناوچەی باوباپیرانیان بەجێهێشتووە (ابن خلدون، ٢٠٠٠، پ. ١٤٩). سەرەڕای ئەوەش، دوای ماوەیەک لە هاتنی مەغۆلەکان دەسەڵاتی کوردی لە ناو نەچووە و زۆر ناوچەی کوردستان دیسان کەوتۆتەوە ژێر دەسەڵاتی میرە کوردەکان.

(وێنەی ٤٥) وێنەیەکی دەستکردیی حەمامێکی شاری کرماشان کە لە نێوان ساڵی ١٧٧٦ز-١٨٥٩ز دا کێشراوە.

لە دوای هاتنی مەغۆلەکانەوە سەرەڕای ئەوەی کە کوردستان وەک زۆر دەوڵەتی تری جیهانی ئەو سەردەمە بە شێوەیەکی یەکگرتوو بەڕێوە نەدەچوو، بەڵام هەمیشە لەلایەن ئیمارەتی ناوچەییەوە حوکم کراوە و بە

دەیان ئیمارەتی جیاواز حوکمڕانیان کردووە. لە دوای سەدەی شانزەهەمەوە دوو هێزی سەرەکی لە خۆرهەڵاتدا دروست بوون، کە پێکهاتبوون لە دەوڵەتی سەفەوی و دەوڵەتی عوسمانی. لە ئەنجامدا ناوچەکە بە شێوەیەکی فەرمی و لە ڕێکەوتنامەیەکدا لە نێوانی عوسمانی و سەفەویەکاندا دابەشکرا. بەو جۆرە ئیمارەت و دەسەڵاتە ناوچەییەکانی وەک لوڕ، کەلهوڕ، سۆران، بابان، ئەردەلان، بادینان، بەدرخان، بدلیس، هەکاری، بۆتان، جەزیرە، هتد. هەریەکە لە سەردەمی جیاواز و لە ناوچەی جیاوازدا حوکمڕانی دەکرد. زۆر جار ئەم ئیماراتانە دەکەوتنە جەنگ لەگەڵ هێزی سوڵتانی عوسمانی و دەسەڵاتە جیاوازەکانی ئێران و هەندێک لەم ئیمارەتانە دەبونە نیمچە سەربەخۆ و هەندێک جار هەوڵی سەربەخۆیی تەوایان داوە. لە سەدەی هەژدەهەمدا بنەماڵەی زەندیە کوردەکان بە سەرۆکایەتی کەریم خانی زەند، بووە حوکمڕان و لە نێوان ١٧٥٠ز- ١٧٩٤ز دا حوکمی هەموو ئێرانی دەکرد.

(وێنەی ٤٦ و ٤٧) لە ڕاستەوە بۆ چەپ، وێنەی دەستکردیی فەرمانبەرێکی دەوڵەتی بابان لە سلێمانی لە نزیکی ساڵی ١٨٢٠ز و سەلیم پاشای ئامێدی (عەمادیە) ساڵی ١٨٤٣ز.

کوردستان بەو جۆرە بەردەوام بوو هەتاوەکو کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم. لە ساڵانی بیستی سەدەی بیستەمەوە، فەرەنسا و بەریتانیا نەخشەیەکی نوێیان بەسەر ناوچەکەدا سەپاند کە کوردستانی تێدا کرایە چوار بەشەوە. لەو کاتەوە هەتاکو ئێستا، کوردستان لەلایەن سێ نەتەوەی بێگانەوە حوکمڕانی دەکرێت لەناو نەخشەیەکەی بێ ڕابووردوی سەپێنراوەدا کە لە لایەن هێزە دەرەکیەکانەوە کێشراوە و شەرعیەتێکی نێودەوڵەتي پێ داوە. لە سەرەتای سەپاندنی نەخشە نوێکەوە، چەندین جار کورد لە بەشە دابڕاوەکانی کوردستاندا هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی داوە؛ ئەم هەوڵانە هەتا ئێستاش هەر بەردەوامن. ڕەگی قوڵ و دێرینی فەرهەنگ و زمان و مێژووی کورد، یارمەتی دەرێکی گرنگ بووە لە بەردەوامیدان بە بەرهەڵستیکردنی سیاسەتی هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەکە لەلایەن داگیرکەرانیەوە. هەتا ئێستا، لەگەڵ ئەو هەموو فشار و هێرشانەدا، داگیرکەران نەک هەر نەیان توانیوە ئارەزوی سەربەخۆیی گەلی کورد دابمرکێننەوە بەڵکو ئەو ئارەزوە ڕۆژبەڕۆ پتەو تر و فراوان تر دەبێت. بە دڵنیایی بە سەربەخۆ بوونی گەلی کورد، بەشێک لە ڕابوردوی شارستانیەتی مرۆڤایەتی کە لەو ناوچەیەدا سەری هەڵداوە، زیندو دەبێتەوە و دەپارێزێت لە فەوتان.

# سەرچاوەکان

## سەرچاوەی کوردی، فارسی و عەرەبی

-ابن الأثير (٢٠١٠) *الكامل في التاريخ* [ئەنتەرنێت]، موقع الوراق. دەست دەکەوێت لە:
<http://www.4shared.com/office/JmKBp7sX/___.htm> [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/١٢/١]
-ابن المستوفي (١٩٨٠) *تاريخ اربل*، دار الرشيد للنشر، الجمهورية العراقية.
-ابن النديم البغدادي (٢٠١٠) *الفهرست* [ئەنتەرنێت]، موقع يعسوب، دەست دەکەوێت لە:
<http://www.4shared.com/rar/dcQWcv6p/___.htm > [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/٩/٣]
-ابن بطوطة (٢٠١٠) *رحلة ابن بطوطة* [ئەنتەرنێت]، موقع الوراق. دەست دەکەوێت لە:
<http://www.4shared.com/get/hUwGQPbA/___online.html> [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/٧/١]
-ابن حوقل (١٩٩٢) *صورة الارض* ، منشورات دار مكتبة الحياة، لبنان، بيروت.
-ابن خلدون (٢٠٠٠)، *تاريخ ابن خلدون*، دار الفكر، بيروت.
-ابي الهيجاء، الامير عز الدين محمد بن ابي الهيجاء ابن محمد الهذبانني الاربلي (١٩٩٣) *تاريخ ابي الهيجاء*، رياض الصالحين، مصر.
-الإصطخري (٢٠١٠) *المسالك والممالك* [ئەنتەرنێت]، موقع الوراق. دەست دەکەوێت لە:
<http://search.4shared.com/q/CCAD/1/+%D8%A7%D9%84%D9%85%D8%B3%D8%A7%D9%84%D9%83+%D9%88%D8%A7%D9%84%D9%85%D9%85%D8%A7%D9%84%D9%83++> [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/٩/٥].
-امين زكي، محمد (١٩٦١) *خلاصة تاريخ الكرد و الكردستان*، مطبعة صلاح الدين، بغداد.
-البرزنجي، *الشريف محمد بن رسول الحسيني* ( ١٣٩٣ الهجري) الاشاعة لاشراط الساعة، دار الكتب العلمية، بيروت.
-البلاذري (٢٠١٠) *فتوح البلدان* [ئەنتەرنێت]، موقع يعسوب. دەست دەکەوێت لە:- < http://al-mostafa.info/data/arabic/depot/gap.php?file=001502-www.a-mostafa.com.pdf> [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/١١/١١]
-بۆرەکەیی، صدیق (١٩٩٦) *مێژووی وێژەی کوردی، بەشی یەکەم و دووهەم*، انتشارات ناجی، بانە.
-بەدلیسی، شەرەفخان (٢٠٠٦)، *شەرەفنامە*، دەزگای ئاراس، کوردستان-عیراق
-جكرخوين (١٩٩٦) *تاريخ كردستان، الجزء الثاني/الجزء الثاني* [ئینەترنێت]، مطبعة أميرال للطبع والنشر والتوزيع، بيروت، لبنان. دەست دەکەوێت لە:
<http://search.4shared.com/q/CCAD/1/%D8%AA%D8%A7%D8%B1%D9%8A%D8%AE+%D9%83%D8%B1%D8%AF%D8%B3%D8%AA%D8%A7%D9%86> . سەردان کراوە لە [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/٩/٣]
-جەلیلیان، عەباس، *فەرهەنگی باشور*، تایبەت بە ناوچەکانی کرماشان و ئیلام و لوڕستان، سنە، ئێران. [ئەم فەرهەنگە ساڵی لەسەر نەبوو].
-الحموي، ياقوت (٢٠١٠) معجم *البلدان* [ئەنتەرنێت]، موقع الوراق. دەست دەکەوێت لە: < http://search.4shared.com/q/CCAD/1/%D9%85%D8%B9%D8%AC%D9%85%20%D8%A7%D9%84%D8%A8%D9%84%D8%AF%D8%A7%D9%86>. [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/١١/١٨]
-حەمە باقی، ئەحمەد (١٩٩٦) *مێژووی مۆسیقای کوردی*، ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەدەب و فەرهەنگی کوردی (سروە)، ئێران.

-الدكتور زرار صديق توفيق (٢٠٠٧) *القبائل و الزعامات القبلية الكردية في العصر الوسيط*، مؤسسة موكريان، كردستان-عێراق.
-الدكتور محمود محمد علي محمد (١٩٩٩) *المنطق الاشراق عند شهاب الدين السهروردي*، العربية للنشر و التوزيع، القاهرة.
-الدينوري، ابو حنيفة احمد بن داود (١٨٨٨) *الاخبار الطوال*، مطبعة بريل، مدينة ليدن.
-ريسمون (٢٠١٢) [ئینتەرنێت]. دەست دەکەوێت لە <http://www.rismoon.com/> [سەردان کراوە لە ٢٠١٢/٨/٢].
-ڕەزازی (٢٠٠٨) *داگیرکردنی کوردستان و تاڵانکردنی هونەری کوردی!* [ئینتەرنێت]. دەست دەکەوێت لە <http://razzazi.se/index.php?id=18> [سەردان کراوە لە ٢٠١٢/٦/٩].
-سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، ١٩٧٨، *ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان*.
-الشهروزوري، شمس الدين محمد بن محمود (٢٠١٠) *نزهة الارواح و روضة الافراح في تاريخ الحكماء والفلاسفة*، دائرة المعارف العثمانية، هند.
-شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٩٩٩) *دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی*، پرۆژەی هاوسەر، کوردستان/عێراق.
-الطبراني، ابو القاسم سليمان بن احمدالمعروف (١٩٨٥)*المعجم الأوسط*، مكتبة العارف الرياض.
-العمري، ابن فضل الله (٢٠١٠) *مسالك الأبصار في ممالك الأمصار* [ئەنتەرنێت]، دەست دەکەوێت لە:
<http://www.sfhatk.com/up/index.php?action=viewfile&id=3953&sitelang=2>
-لغت نامە (٢٠١١) [ئەنتەرنێت]. دەست دەکەوێت لە :
<http://www.loghatnaameh.org/dehkhodaworddetail-c1ccc556c2f74ec7838e10009e5ec08f-fa.html> [سەردانکراوە لە ٢٠١١/١٠/١١].
-المسعودي (٢٠١١) *مروج الذهب* [ئینتەرنێت]. الموسوعة الشاملة. دەست دەکەوێت لە:
<http://islamport.com/d/3/tkh/1/133/2652.html>. سەردان کراوە لە [سەردان کراوە لە٢٠١١/٨/١٣]
-المسعودی (٢٠١٢) *التنبیه و الاشراف* [ئینتەرنێت]. مكتة يعسوب الدين. دەست دەکەوێت لە:
<http://www.yasoob.com/books/htm1/m024/28/no2819.html> . سەردان کراوە لە [سەردان کراوە لە ٢٠١٢/٤/٣].
-المسعودي أبو الحسن علي بن الحسين بن علي (٢٠١٠) *مروج الذهب* [ئەنتەرنێت]. دەست دەکەوێت لە:
<http://al-mostafa.info/data/arabic/depot3/gap.php?file=i000068.pdf> [سەردان کراوە لە ٢٠١٠/١١/١٥]
-مەسعود محەمەد (٢٠٠٨) *زمانی کوردی*، کەرکوک، کوردستان.
-مەسعود محەمەد (٢٠٠٩) *ووردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی*، .www.mamosta.net
-مینۆرسی، ڤلادیمیر (٢٠٠٦) *مینۆرسکی و کورد*، دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی، کوردستان - عێراق.
-اليعقوبي (١٨٨٣) *كتاب البلدان*، مطبعة بريل، مدينة ليدن.
-ئەحمەدی خانی (١٩٨٩) *مەم و زین*، وەشانێن ئینستیتیویا کوردیا پاریس، پاریس.

## سەرچاوەی فەرهەنگەکان

بۆ نووسینی هەر کام لە فەرهەنگەکان، هەندێك جار زیاتر لە سەرچاوەیەک بەکارهاتووە و کۆمەڵێک لە سەرچاوەکان لە لەلایەن دەزگای ئەکادیمی و زانکۆی جیهانیەوە خراونەتە سەر ئەنتەرنێت و هەندێک جار کتێبێک بەکارهاتووە.. لە خوارەوە سەرچاوەی هەر یەک لە فەرهەنگەکان خراونەتە ڕوو:

**١ ـ ناوە مانیەکان**

وشە مانیەکان ژمارەیەکی کەمن و هەمووی لە لێکۆڵینەوەیەکەوە وەرگیراون لە ژێر ناونیشانی "وڵاتی مانیەکان" (Mannea) کە لەلایەن پرۆفیسۆر ڕان زادۆک (Ran Zadok)ەوە ئەنجام دراوە و لە ٢٠٠٦/٠٨/١٥ دا لەسەر ماڵپەڕی www.iranicaonline.org بڵاوکراوەتەوە.

- Zadok, R. (2006) Mannea, Available from: <http://www.iranicaonline.org/articles/mannea>[Acessed 16 January 2011]

**٢. فەرهەنگی زمانی میدی**

سوود لە فەرهەنگێک وەرگیراوە:

- Tavernier, Jan (2007) *Iranica in the Achaemenid period (ca. 550-330 B.C.): lexicon of old Iranian*, Peeters Publishers, Louvian, Belgium.

**٣. فەرهەنگی زمانی هیتی**

سوود لە دووماڵپەڕ و لێکۆڵینەوەیەک وەرگیراوە:

- پرۆژەی ئینستیتیوتی خۆرهەڵاتی سەر بە زانکۆی شیکاگۆ ( University of Chicago's Oriental Institute)

Chicago Hittite Dictionary 'n.d.', University of Chicago's Oriental Institute, Chicago, USA [Internet]. Available from <http://ochre.lib.uchicago.edu/eCHD/> [Accessed 20th May 2012].

- پرۆژەی زمانەوانی سەر بە سەنتەری لێکۆڵینەوەی زمانەوانی (The Linguistics Research Centre (LRC)) سەر بە زانکۆی تەکساسی ئەمریکی.

The College of Liberal Arts 'n.d.', *Hittite Online*, Linguistics Research Centre, University of Texas, USA, [Internet]. Available from <http://www.utexas.edu/cola/centers/lrc/eieol/hitol-0-X.html> [Accessed 13 June 2012].

- Hoffner, Harry A. and Melchert, H. Craig (2008) *A Grammar of the Hittite Language*, Eisenbraus, Winona Lake, USA.

**٤. فەرهەنگی زمانی ئاڤێستا**

سوود لە دوو ماڵپەڕ وەرگیراوە:

- پرۆژەی زمانەوانی سەر بە سەنتەری لێکۆڵینەوەی زمانەوانی (The Linguistics Research Center (LRC)) سەر بە زانکۆی تەکساسی ئەمریکی.

The College of Liberal Arts 'n.d.', *Old Iranian Online, Old Avestan*, Linguistics Research Centre, University of Texas, USA. [Internet]. Available from <http://www.utexas.edu/cola/centers/lrc/eieol/aveol-1-X.html>[Accessed 18 June 2012].

- Peterson, Joseph H (1995), Dictionary of Most Common AVESTA words, Zoroastrian Archives [Internet]. Available from <http://www.avesta.org/avdict/avdict.htm> [Accessed 28 August 2012].

**٥. فەرهەنگی زمانی لوفی**

سوود لە کتێبێک و لێکۆڵینەوەیەک وەرگیراوە:

- Payne, Annick (2010) *Hyroglephic Luwian an Introduction with Original Text*, Harrassowitz Verlag, Wiesbaden, Germany.
- Melchert, H. Craig (1993) *Cuneiform Luvian Lexicon,* Chapel Hill.

**٦- فەرهەنگی زمانی هوری**

سوود لە چوار لێکۆڵینەوە وەرگیراوە:

- Campbell, Dennis R.M.(2007) *Mood and Modality in Hurrian*, The University of Chicago,USA.
- Fournet, Arnaud (2009) *A glossary of Hurrianic* [Internet], *Scribed. Available from:* <www.scribd.com/doc/34142291/Hurrianic-Vocabulary>[Accesed 05 February 2012]
- Wagner, Ilse (2009) *Introduction to the Hurrian Language*, Berlin
- Fournet, Arnaud and Bomhard, Allan R.(2010) *The Indo-European Elements in Hurrian*, LA Garnenne Colombes/Charleston, USA.

**٧. فەرهەنگی زمانی سۆمەری**

سوود لە دوو کتێب و ماڵپەڕێک وەرگیراوە:

- پرۆژەی پێنسلڤێنیای فەرهەنگی زمانی سۆمەری (Pennsylvania Sumerian Dictionary Project (PSD)) کە لەلایەن مۆزەخانەی ئارکیۆلۆژی و ئەنسروپۆلۆجی زانکۆی پێنسلڤانیای ئەمریکیەوە ئەنجام دراوە.

University of Pennsylvania Museum of Anthropology and Archaeology, Babylonian Section 'n.d', *The Pennsylvania Sumerian Dictionary Project*, USA [Internet]. Available from <http://psd.museum.upenn.edu/epsd/index.html> [Accessed 14 July 2012].
-Halloran, John A. (2006) *Sumerian Lexicon Version 3.0*, Logogram Pub., USA.
-Thomsen, Marie-Louise (1984) *The Sumerian language: an introduction to its history and grammatical structure*, Akademisk Forlag. Denmark.

**٨. فەرهەنگەکانی زمانی لیدی (Lydian)، کاری (Carian) و سراسی (Thracian)**

بۆ ئەم سێ فەرهەنگە بچووکە سوود لە ماڵپەڕی www.palaeolexicon.com وەرگیراوە کە پرۆژەیەکە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانە دێرنەکان دانراوە کە هەندێک پەیوەندیان لەگەڵ زمانی یۆنانیدا هەیە.

-Palaeolexicon 'n.d.', *Word study tool of ancient languages* [Internet]. Available from <www.palaeolexicon.com> [Accessed 1st May 2012].

**٩. فەرهەنگی زمانی لاتینی**

سوود لە دوو ماڵپەڕ وەرگیراوە:

- Whitaker, William and Nelson, Lynn 'n.d.', *Latin Wordlist and Grammar Aid*, University of Notre Dame Archives, University of Notre Dam, USA [Internet]. Available from <http://www.archives.nd.edu/cgi-bin/wordes.exe> [Accessed 1st September 2012].
-Babylon 'n.d', *Babylon Latin-Dictionary* [Internet]. Available from <http://www.babylon.com/define/112/Latin-Dictionary.html> [Accessed 15 September 2012].

**١٠. فەرهەنگی زمانی پەهلەوی**

سوود لە یەک کتێب وەرگیراوە:

-MacKenzie, D.N.(1971) *A Concise Pahlavi Dictionary*, Oxford University Press, Oxford.

**١١. فەرهەنگی زمانی سانسکریت**

سوود لە فەرهەنگی یەک ماڵپەڕ وەرگیراوە:

-Narayanaswamy, Ranjini and K.Glashoff (2005), SpokenSanskrit, Kerala, India. [Internet]. Available from <http://spokensanskrit.de/> [Accessed 15 January 2012].

**١٢. فەرهەنگی زمانە نوێکان**

بۆ هەر یەک لەم زمانانەی خوارەوە سوود لە فەرهەنگی ئەکادیمی جیاوازی سەر ماڵپەڕی جیاواز وەرگیراوە:

**-یۆنانی**

-Kypros Net Organization (1997), English - Greek Dictionary and Greek - English Dictionary, [Internet]. Available from <http://www.kypros.org/cgi-bin/lexicon> [Accessed 14 March 2012].

**-فارسی**

لغت نامە دهخدا [ئینەترنێت]. دەست دەکەوێت لە <http://www.loghatnaameh.org/> [سەردان کراوە لە ٢٠١٢/٨/٩].

ریسمون [ئینەترنێت]. دەست دەکەوێت لە <http://www.rismoon.com/> [سەردان کراوە لە ٢٠١٢/٨/٢].

**-فەرەنسی، ئیتاڵی، ئیسپانی، پورتوگالی، ڕوسی، ڕۆمانی، پۆلۆنی، چیکی و ئەڵمانی**

-WordReference.com 'n.d', *Online Language Dictionaries*, Virginia, USA [Internet]. Available from <http://www.wordreference.com/> [Accessed 24 February 2012].

**-کرواتی**

-Croation-English, English-Croatian Dictionary 'nd', [Internet]. Available from <http://www.rjecnik.com/logindict.cgi> [Accessed 28 February 2012].

**-زمانی ئینگلیزی**

-Soanes, Cathrin, Stevenson, Angus (2008) Consice Oxford English Dictionary, Eleventh Editiion, Oxford University Press, Oxford.

